# سەرجەم بەرهەمەکانی





# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی پێنجەم

ئامادەکردنی

دکتۆر جەبار قادر    دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد    دکتۆر کامەران محەمەد

هەولێر ٢٠٢٢

# سەرجەم بەرهەمەکانی
# دکتۆر کەمال مەزهەر

## بەرگی پێنجەم

ئامادەکردنی


دکتۆر جەبار قادر     دکتۆر دڵشاد مەحموود

دکتۆر ئازاد عوبێد     دکتۆر کامەران محەمەد



هەولێر ٢٠٢٢

* ناوی کتێب: سەرجەم بەرهەمەکانی - دکتۆر کەمال مەزهەر- بەرگی پێنجەم
* ئامادەکردنی: لیژنەی کۆکردنەوەی نووسین و بەرهەمەکانی پ. د. کەمال مەزهەر
* گشت کارە هونەریەکان و سەرپەرشتی چاپ: عوسمان پیرداود کواز
* وێنەی سەر بەرگ: هونەرمەند نورەدین جاف
* چاپی یەکەم - هەولێر - ٢٠٢٢
* تیراژ: (١٠٠٠) دانە
* چاپخانە: چاپخانەی دانیشفەڕ- هەولێر
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٩١٨) ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.
* نرخ (٦٠،٠٠٠) دینار

## بەرگی پێنجەم:

ئەم کتێبە لەخۆ دەگرێت:

* کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی بەریتانیادا - بەرگی یەکەم.

## پێشەکی

مایەی شانازی لێژنەی تایبەتی کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی مێژووناسی ناودار و پەروەردەکاری گەورەی کۆچکردوو پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەرە، سەرجەم بەرهەمەکانی لە (١٠) بەرگدا بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بخاتە بەردەستی خوێنەرە بەڕێزەکان. لەو دە بەرگە شەشی یەکەمیان بە زمانی کوردیین و ئەوانی دیکەشیان، واتا لە حەوتەمەوە تا دەیەم بە زمانی عەرەبیین. ئەمە بەشی یەکەمی ئەو پرۆژە گەورەیەیە کە ئامانجەکەی ئەوەیە سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ لە چاپیان بداتەوە.

دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد پێشەنگی لێکۆڵەرانی مێژووی نوێی کورد و کوردستانە و بگرە بە دامەزرێنەری قوتابخانەیەکی تایبەتیی مێژوویی کورد دەژمێردرێت؛ چونکە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە چەندین نەوە بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی ئەوەوە سەبارەت بە کورد و کوردستان ئاشنای میتۆدی زانستی بوون لە بواری مێژوودا، کە پێشتر پێی ڕانەهاتبوون. تا ئەو ڕۆژانە خوێنەرانی کورد بەو چیرۆک و ئەفسانانە ڕاهاتبوون کە باسیان لە مێرخاسی و ئازایی میر و سەرکردە خۆجێییەکانیان دەکرد و ئەوانەیان بە سەرچاوە و بەڵگەی مێژوویی دادەنا. کتێب و وتارە مێژووییەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کارێکی وایان کرد، خوێنەرانی ئاسایی و ڕووناکبیرانی نەوەی نوێی کورد، مێژوویان لە لا خۆشەویست بێت و هەوڵبدەن توانای خۆیان بۆ لێکدانەوەی مێژووی نەتەوە ستەملێکراوەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوە سەرباری ئەوەی کە دکتۆر کەمال دەورێکی گەورەی هەبوو لە هاندانی چەندین خوێندکار لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکان بۆ تەواوکردنی خوێندنی باڵا لە بواری مێژوودا لە ناوەوە و لە دەرەوەی عیراق. جگە لەوەش وانەکانی بۆ قوتابیان کە زۆربەیان کوردیش نەبوون هەمان دەوریان هەبوو لە ڕووکردنە خوێندنی باڵا بۆ خوێندنی مێژوو بە ڕێبازێکی زانستی، ئەو شاگردانە بە درێژایی تەمەنیان و کاروانی زانستییان

بە دڵسۆزی و وەفاداری بۆ مامۆستای گەورەیان مانەوە. ئەم کارانەی تەنیا خوێندکارانی کوردی نەدەگرتەوە، بەڵکو هەموو ئەو خوێندکارانەشی دەگرتەوە کە سەرپەرشتی نامە و تێزەکانی کردوون یان بۆ پرس و ڕاوێژ ڕوویان لێی ناوە بۆ هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە و پرۆژەی توێژینەوە زانستییەکانیان.

دکتۆر کەمال بەردەوام ئەوەی دووپات دەکردەوە کەوا بواری مێژووی کورد وەک کێڵگەیەکی نەکێڵراو و نەچێندراوە، بۆیە ئەو ئەرکە مەزنە پێویستی بە چەندین نەوەی توێژەر هەیە بۆ ئەوەی بەشێکی بەجێبێنن. دکتۆر کەمال زۆر بەوە دڵخۆش بوو کاتێ ئاوڕی دواوەی دەدایەوە بەرهەمی کاری پەروەردەیی خۆی دەبینی، کە چەندین توێژەر و پسپۆڕ لە بواری مێژووی کورددا لەوانەی ڕاستەوخۆ بەشداریی لە پێگەیاندنیاندا کردبوو خەریکی کارکردنن لەسەر مێژووی کورد و کوردستان. ئەوانەی سەرپەرشتی نامە و تێزە زانستییەکانیانی کردبوو یا لە ڕێی کتێب و وتار و توێژینەوە مێژووییەکانییەوە کاریگەری لەسەر دانابوون. بەرهەمی زانستیی دکتۆر کەمال مەزهەر جێی بایەخی کۆڕ و ناوەندی بەرفراوانی خوێنەران و ڕووناکبیرانی کورد و عێراقییەکان بوو.

گومان لەوەدا نییە کە کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانی مێژووناسێکی پڕ بەرهەمی وەک کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر پێویستی بە پاڵپشتی و هاوکاریی چەندین توێژەر و ڕووناکبیر هەیە، تەنانەت ئەوە ئەرکی دامەزراوەیەکی تایبەتمەندە لەگەڵ چەندین کادیری زانستی و کارگێڕی تەرخانکراو بۆ ئەو کارە، نەک ئەرکی لێژنەیەکی خۆبەخشی چوار کەسیی، کە لێرە و لەوێ کار دەکەن و سێ کەسیان لە هەمان کاتدا مامۆستای زانکۆن و دەبێ سەرقاڵی وانە وتنەوەو و کاری زانستیی خۆیان بن.

ئەم لێژنەیە بەر لە کۆچی دوایی زانای گەورەمان بە چەند ڕۆژێک پێکهات، بە مەبەستی کۆکردنەوەی کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی و

پۆلێنکردنیان و پاشان لە چاپدان و بڵاوکردنەوەیان. لێژنەکە پێی باشە کۆی بەرهەمەکانی خوالێخۆشبوو بەم شێوەیەی خوارەوە بەسەر شەش بەشدا دابەش بکات:

**بەشی یەکەم:** کە بە خۆشحاڵییەوە وا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، کە هەموو کتێبە بڵاوکراوەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی لە دە بەرگدا دەگرێتە خۆ. سەرلەبەری لاپەڕەکانی ئەم بەشە حەوت هەزار و دوو سەد و پەنجا لاپەڕەن.

**بەشی دووەم:** ئەو لێکۆڵینەوە زانستی و وتارانەن کە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. لێژنەکەمان بەشێکی لەو وتارانە بەدەستهێناوە و وێنەیانی گرتووە، بەڵام لەم بوارە هێشتا کاری زۆر ماوە، پێویستی بە هاوکاری ژمارەیەکی زیاتر لە ئەندامانی لێژنەی سەرپەرشتیار هەیە.

**بەشی سێیەم:** ئەم بەشە ئەو کارە زانستی و رۆژنامەوانییانەی دکتۆر کەمال مەزهەر دەگرنەوە کە بە زمانی ڕووسی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە و خۆیان لە هەزار و پێنج سەد لاپەڕە دەدەن. ئەمانەیان پێویستە بکرێن بە کوردی، لێژنە هەنگاوی یەکەمی بۆ ئەمە ناوە. لە بەسەرکردنەوەی لیستی دانراو و توێژینەوەکانیدا بۆ لێژنەکە دەرکەوت کە هەندێ لەم توێژینەوە و وتارانە لە کاتی خۆیدا خوالێخۆشبوو کردوونی بە کوردی یان عەرەبی یانیش لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی دواتری خۆیدا بەکاری هێناون.

**بەشی چوارەم:** ئەم بەشەیان تەرخانکراوە بۆ کۆکردنەوەی ئەو پێشەکییانەی بۆ ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێب و دانراوی توێژەرانی کورد و عەرەب نووسیوونی، وێڕای ئەو یادداشتنامانەی کە بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەی کردوون و پێشەکی بۆ نووسیون. ئەو پێشەکییانە زانیاری و لێکدانەوەی گرنگیان تێدان و وا پێویست دەکات بایەخ بە کۆکردنەوەیان بدەین لە زیاتر لە بەرگێکدا.

**بەشی پێنجەم:** لێژنە هەوڵدەدات ئەم بەشە بۆ ئەو دیمانە و دیدار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانیانە تەرخان بکات کە لەگەڵ دکتۆر کەمالدا کراون، کە تێیاندا بیروبۆچوون و لێکدانەوەکانی بۆ زۆر پرسی زانستی و هزری و ڕووناکبیری دەربڕیون. ئەمانە شایەتی بۆ ئەوە دەدەن کە ئاگاداریی بەرفراوانی لەمەڕ پرسەکان هەبووە و ڕاستیی و دروستیی گەلێ لە بۆچوونەکانی و قووڵیی لێکدانەوەکانی دەردەخەن. ئەمەشیان بابەتگەلێکی دەوڵەمەندن؛ بۆ توێژینەوە و لێکدانەوە لە بیروبۆچوونە هزری و ڕووگە ڕووناکبیرەکانی.

**بەشی شەشەم:** بە ئومێدی ئەوەین ئەم بەشەیان هەموو ئەو نووسینانە بگرێتەخۆ کە لەبارەی کۆچکردووەوە نووسراون و بڵاوکراونەتەوە، جا چ کتێب و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا بن یان لێکۆڵینەوە و وتار کە لە سەروبەندی کۆچکردنی یان لە بیرەوەری یەکساڵەی کۆچی دوایی گوتران. پێمانوایە ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانە کە پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد سەرپەرشتی کردوون و بەپێی ڕێنماییەکان توێژینەوەی هاوبەشن، لەم بەشەدا جێیان بکەینەوە. کۆچکردوو لە دارشتنی کاری زانستی خوێندکارانیدا داهێنەر بوو، لە پرۆژەی ماستەرنامە و کارنامەکانی دکتۆرا لە بیرۆکە و ناوونیشانی بابەت و پلانی لێکۆڵینەوە بگرە تا دەگەیشتە لێکدانەوە و ڕێکخستنیان، بۆیە بە پێویست زانرا پێڕستێک بە ناوونیشانی ئەو نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرایانەی کە سەرپەرشتی کردوون و ناوی خوێندکار، و ئاستی کارەکە و مێژووەکەیان لەم بەشەدا جێگە بکرێنەوە. جێی خۆیەتی لێرە ئاماژە بە بەشداریی پرجۆش و دەوڵەمەندانەی دکتۆر کەمال بکەین لە گفتوگۆی دەیان نامەی ماستەر و کارنامەی دکتۆرادا کە پڕ بوون لە زانیاری دەگمەن و بیرۆکەی هێژا. لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیانە بە وێنە و دەنگ تۆمار کراون؛ هەوڵدەدەین پەیوەندی بە لایەنی پەیوەندیدارەوە بکەین بۆ ئەوەی ئەو تۆمارانە دەست بخەین، لە داهاتوودا بخرێنە سەر کاغەز و لە چوارچێوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا

بڵاو بکرێنەوە. هەروەها لیژنەی تایبەت پەیوەندی بە خوێندکارە بەتواناکانی کۆچکردووەوە دەکات بۆ ئەوەی وتاری بابەتیانە سەبارەت بە شێوازی وانەوتنەوەکانی بنووسن.

لیژنەی تایبەت کە لەم بەڕیزانە پێکهاتووە: پرۆفیسۆر دکتۆر جەبار قادر، پرۆفیسۆر دکتۆر ئازاد عوبێد سالح، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر دڵشاد مەحموود عەبدولڕەحمان، پرۆفیسۆری یاریدەدەر دکتۆر کامەران محەمەد حاجی، لە ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بیبلیۆگرافیایەکی سەرەتایی بۆ سەرجەم کارە زانستی و ڕووناکبیرییەکانی کۆچکردوو دکتۆر کەمال مەزهەر ئامادە کردووە، ئەوە وێڕای ئامادەکردنی کتێبە دانراو و وەرگێڕانەکانی بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بۆ چاپ، کە ئەم بەشەیە وا لێرەدا دەیخەینە بەردەستی خوێنەران و توێژەران.

خۆشبەختانە ئەندامانی لیژنەکە دەستیان گەیشت بە بەشێکی گرنگ لە نووسین و بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر کە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیدا پارێزراون. ئەوەی لەوێدا کەوتە بەرچاویان وێنەیان گرتن و هەندێ کاریان لەسەر کراوە. هاوڕێ و دۆستانیش لە دەرەوەی لیژنەکە لە هەبوونی کۆمەڵێ وتار و توێژینەوە و کتێب کە پەیوەندییان بە کۆچکردووەوە هەیە ئاگاداریان کردینەوە. بەشێکیش لەو توێژینەوە، وەرگێڕان، لێدوان یان ئەو نووسینانەی خوێندکارەکانی و مامۆستاکانیان و هەڤاڵانی کۆچکردوو لەبارەی ژیانی تایبەتی و زانستی ئەوەوە نووسیوویانە دۆسیی تایبەتییان بۆ ڕێکخراون. لیژنە ژمارەیەک وتار و توێژینەوەی مامۆستای کۆچکردوویان تایپ کردووەتەوە و بە وردی پێیانداچوونەوەتەوە و هەڵەچنیان بۆ کردوون.

لیژنەکە دوابەدوای بڵاوکردنەوەی سەرجەمی کتێبەکانی بە کوردی و عەرەبی، کە ئەم بەشەی پرۆژەکە پێکدێنن، کۆشش بۆ تەواوکردنی بەشەکانی دیکەی ئەم پڕۆژە زانستی و ڕووناکبیرییە گەورەیە دەکات؛ ئەم کارە بۆ خزمەتی ڕاستی و مێژووە و بەرز ڕاگرتنی بەخششی ئەم مرۆڤە مێژووزان و پەروەردەکارە مەزنەی نەتەوەی کورد کە بەدەگمەن هاوشێوە و هاوتای دووبارە دەبێتەوە. لێرەوە لیژنەی سەرپەرشتیار داوا لە توێژەران

و ئەو خوێنەرانە دەکات کە بایەخ بە بەرهەم و داهێنانەکانی ئەم پیاوە مەزنە دەدەن دەستی یارمەتی بۆ لیژنەکە درێژ بکەن و هەر گۆڤار و ڕۆژنامەیەکیان لە لا پەیدا دەبێ کە لێکۆڵینەوە، وتار یان دیدار و چاوپێکەوتنی ڕۆژنامەوانی بڵاوکراوەی کۆچکردوویان لە لایە، بیخەنە بەردەستی لیژنەکە. بێگومان هاوکاری و یارمەتی هەمووان لەم بارەیەوە دەبێتە بنەما و بناغە بۆ دامەزراندنی کتێبخانەیەکی مێژوویی و مۆزەخانەیەکی تایبەت بە کۆچکردوو کە دەکرێ هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت تێیدا کۆبکرێتەوە و بپارێزرێت. دابەشکردنی کتێب و بەرهەمەکانی کۆچکردووی گەورە لە ڕووی بابەت و ژمارەی لاپەڕەکانەوە بەسەر بەرگەکانی ئەم چاپەدا کێشەیەکی هەندێ ئاڵۆز بوو لە بەردەم لیژنەکەدا، لەم بارەیەوە گفتوگۆی زۆر کرا تا ئەوەی لە کۆتاییدا لەسەر ئەم شێوە دابەشکردنەی خوارەوە گیرساینەوە:

**بەرگی یەکەم:** "کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا"، "مێژوو- کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو"، "خەباتی ڕزگاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێراندا".

**بەرگی دووەم:** "تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا"، "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد – بەرگی یەکەم".

**بەرگی سێیەم:** "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد – بەرگی دووەم".

**بەرگی چوارەم:** وەرگێڕانی کوردیی کتێبی: "وردبونەوەیەکی مێژوویی دەربارەی مەکیاڤیللی و مەکیاڤیللیزم"، "ڕێنیسانس لەگەڵ باسێکی تر بە ناونیشانی ئەدیب و ئەرکەکانی قۆناغ"، "ئافرەت لە مێژوودا- کورتە باسێکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی"، "چینی کرێکارانی عێراق - دروست بوون و سەرەتای بزووتنەوەی".

**بەرگی پێنجەم:** "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا – بەرگی یەکەم".

**بەرگی شەشەم:** "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکوومەتی بەریتانیادا – بەرگی دووەم".

**بەرگی حەوتەم:** وەرگێڕانی عەرەبیی کتێبی: "كردستان في سنوات الحرب العالمية الأولى" و کتێبی "كركوك وتوابعها حكم التأريخ والضمير- دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق".

**بەرگی هەشتەم:** "دراسات في تاريخ إيران الحديث والمعاصر"، "أضواء على قضايا دولية في الشرق الأوسط"، "النهضة".

**بەرگی نۆیەم:** "صفحات من تاريخ العراق المعاصر- دراسات تحليلية"، "الطبقة العاملة العراقية- التكون وبدايات التحرك"، "ثورة العشرين في الإستشراق السوفيتي"، "رأي للمناقشة: الإطار الزمني لتأريخ العراق الحديث والمعاصر".

**بەرگی دەیەم:** "دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية"، "إنتفاضة عام ١٩٢٥ الكردية في تركيا - دراسة تحليلية"، "حول مسألة الإقطاع بين الكرد"، "ميكافيلي والميكافيلية"، "محاضرات في تاريخ الدول الكبرى بين الحربين العالميتين". وەک لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا، شەش بەرگی یەکەمی بە زمانی کوردین و چوار بەرگی دواییش بە زمانی عەرەبیین.

لە کۆتاییدا لیژنەکەمان سوپاسی هەموو ئەو ناوەند و بەڕێزانە دەکات کە ئامادەییان دەربڕی پشتگیری مادی یا مەعنەوی لە پرۆژەکە بکەن، دیارە بە ژمارە زۆرن، لە پێشەوەشیان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی پرۆفیسۆر دکتۆر عەبدولفەتاح بۆتانی، کە ژوورێکی تایبەتی بۆ ئەم لیژنەیە لە ئەکادیمیا تەرخان کرد. هەروەها سوپاسی دۆستی هێژا پرۆفیسۆر دکتۆر عیماد جەواهیری دەکەین کە تێبینی و سەرنجەکانی ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لە زیادکردنی تەوەرێکی نوێ بۆ بەشی شەشەمی پڕۆژەکە. هەروەها سوپاسی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە ئەرکیان کێشا و لیژنەکەیان لە وتار و لێکۆڵینەوەکانی کۆچکردوو ئاگادار کردەوە. هەروەها لیژنەکە سوپاسی مامۆستا جەلال زەنگابادی دەکات کە دڵسۆزانە بۆ سەرخستنی پڕۆژەکە بە باشترین شێوە کار دەکات.

**لیژنەی تایبەت بە کۆکردنەوە و**

**بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی دکتۆر کەمال مەزهەر**

کەماڵ مەزهەر

# کورد و کوردستان

لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا!

بەرگی یەکەم

چاپی دووەم

پوختەکراو

ئامادەکردنی

عەبدولڕەززاق مستەفا

شەماڵ تاهیر حەمیدی

٢٠٠٩

کەمال مەزهەر

# کورد و کوردستان

لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی

حوکمەتی بەریتانیادا

بەرگی یەکەم

چاپی دووەم

پوختەکراو

ئامادەکردنی

عەبدوڵڵا زەنگەنە

شەهلا تاهیر حەیدەری

٢٠٠٩

# کورد و کوردستان

**لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا**

**(بەرگی یەکەم)**

**نووسەر: د. کەمال مەزهەر**

**ئامادەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە - شەهلا تاهیر حەیدەری**

**تایپێست: بنکەی ژین و سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان**

**نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی**

**نەخشەسازی بەرگ: محەمەد زادە**

**چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٩**

**تیراژ: ٢٥٠٠ دانە**

**ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٤٣٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ.**

**چاپخانە: گرین گلۆری، لوبنان**

# ناوەڕۆك

بابەتی پێنجەم



بابەتی شەشەم

بابەتی نۆیەم



پاشکۆی وێنە و بەڵگەنامەکان

# پێشکۆتن

عەبدوڵڵا زەنگەنە

هەموو دەستەو تاقمێك، بە نەتەوەكانیشەوە، ئەگەر گیانی (ئەمانەت) پارێزیان لەلا پیرۆز بوو و بەهەندیان وەرگرت، دڵنیام بەردەوام لە گەشە كردن و بەرەو پێش چوونددا دەبن، بڕواشم وایە هەر كاتێك كە مرۆڤ لەگەڵ یەكدی درێژنگ بوون مانای وایە گیانی (ئەمانەت) پارێزیان لەلا نەماوە، بۆیە ئەوسا گیانی (خۆشەویستی)شیان لەلا كاڵ دەبێتەوە، لەئەنجامدا گیانی هاوكاری و پاڵپشتی كردنی یەكدیشیان لەلا لاواز دەبێت، پێشموایە گیانی (ئەمانەت) پارێزی هەر تایبەت نییە بە میللەت یان خەڵكی وڵاتێكەوە، بەڵكو لەگەڵ بەهۆش خۆدا هاتنەوەی مرۆڤ و دانانی دەستوورو ڕێسا بۆ میللەتانی شارستانی هەر هەبووە، ئەوەتا ئینگلیزەكان، بەرامبەر بە دەستەواژەی (پیاو) و (جوامێر)ی لای ئێمە، دەستەواژەی (گێنتلمان)یان هەیە و لە ژیانی ڕۆژانەشیاندا بەهەندی هەڵدەگرن. لێرەدا دەڵێم با فێمینێستەكان لێمان نەگرن و كەمێك دان بەخۆدا بگرن چونكە ئەو بۆچوونەمان بۆ ڕەگەزی بەرامبەریشە.

هەندێكیش پێیان وایە (ئەمانەت) پارێزی دەبێ هەر سیفەتی پێغەمبەران بووبێ و تەنیا هەر لە خۆیان دێت، بەنموونە پێغەمبەری موسڵمانان، محەمەد (د.خ)، هەر لە منداڵییەوە بە (ئەمین) ناسراوەو تەنانەت ئەم سیفەتەی بۆتە مایەی زیاتر ڕێزگرتنی لەلایەن كافرانیشەوە، كەواتە (ئەمانەت) پارێزی هەڤاڵینیشی بەدوادا دێت. پێمان وایە ئەو جۆرە بۆچوونانە ڕاست نین كە دەڵێن: لەو دنیای وا جەنجاڵ و پڕ لە فڕوفیشاڵ و فرتوفێڵدا بەرپرسیارێتی (ئەمانەت) زۆر قورس بووە، چونكە دیارە گەر مرۆڤ خاوەن كەسێتی و هەڵوێستی خۆی بێ، ئەگەر ژیانی خۆیشی لەپێناو بۆچوون و خەسڵەتە باڵاكان دانابێ، گیان لەلای پەشمەو هەر (ئەمانەت) پارێز دەبێ. بەڵام بەداخەوە ئەوەی ئەمڕۆ لەناو خەڵكدا باوە، هەر

کەسێك (ئەمانەت) پارێز بوو بەچاوێکی نامۆ تەماشای دەکرێت، دیارە (ئەمانەت) پارێزان زۆر لەو خەڵکە هەستیارترن و بەردەوام حیساب بۆ ئێستا و دواڕۆژی هەموان دەکەن، بۆیە ڕۆژانە بەردەوام بەپارێزەوە لەگەڵ ژیان لە ململانێ دان، وەکو دەڵێن: (ئەو کەسانە لەژیانی ڕۆژانەیاندا زۆر لەخەڵکی دیکە هەست ناسکتر دەبن و تەنانەت پێشبینی دواڕۆژی هەموو لایەك دەکەن).

من خۆم بەبیرم نایەتەوە، تەنانەت لەسەردەمی رژێمیشدا، ڕۆژێ لەڕۆژان بەبیرمدا هاتبێ، نەك هەر لەگەڵ خەڵك، بەڵکو لەگەڵ دەسەڵات خۆیشیدا جارێ لەجاران ناپاکیم لە (ئەمانەت) کردبێ، بەڵگەو شاهێدی یەکجار زۆریش لەسەر ئەو سوخەت و هەڵوێستانەم هەن(*) و تاوەکو ئەمڕۆکەش ئەگەر بە زیانی تایبەتی

---

(*) هەر بە نموونە لەساڵی ١٩٨٨–١٩٩٠دا بوو، ئێمە نزیکەی (١٥) ئەندازیاری بەڕێوەبەرایەتی ئەشغالی هەولێر، کە لە دائیرەی ئەشغالی سوپادا، سەربازی یەدەگ (احتیاط)بووین و سەر بە ئەشغالی مەوقعی سەربازگەی هەولێر بووین، ڕۆژێکیان لەسەر بازگە دەرماڵەیەك بۆ ئەندازیاران دابەشکرا، هەموومان چووین وەرمان گرت، بێ ئێوە ناخۆش، پارەیەکی مفتمان وەرگرت، دیارە ئەوانەی سەربازی زەخیرە (احتیاط) بوون، سەرەمانگان دەبا بچین مووچەی خۆمان لە دائیرە وەربگرین، ئەوە بوو سەری مانگ چووینەوە مووچەکەمان وەربگرین، بینیمان هەمان دەرماڵە بۆ دائیرەش هاتبوو و پێچابوویانەوە، هەموو ئەو ئەندازیارانەی لەگەڵم بووە، ئەو دەرماڵەی ئەوێشیان وەرگرت، بەڵام کاتێ ئێمە وەرمان نەگرت، هەموویان گلەییان لێ کردین، گوایە ئەگەر وەری نەگرم گرفت بۆ ئەوان دروست دەبێت و ئاشکرا دەبن، ئێمەش بەدەنگێکی زوڵاڵ، گووتمان: (لەسەربازگە وەرمان گرتووەو نامانەوێ). دەرماڵەکە ئافرەتێك دابەشی دەکرد ناوی "لەیلا" خانەو ئێستاش هەر لەسەر کارەکەی خۆی ماوە، ژمێریارێکی دیکەشی لەگەڵ بوو "زوبێر"ی ناو بوو، دواتر گووتبووی: ئەوە لەدائیرە یەك ببینم کەسێك پارەی بدەنێ و وەری نەگرێ!

بەڵام هەمووی چەند مانگێکی نەبرد (ڕاپەڕین)ی بەسەرداهات، ئافرەتێکی دیکەمان هەبوو ناوی "پەیمان" بوو، لە دائیرە وردبین (مدقق)ی ژمێریاری بوو، ئەوەبوو پارەکەی لەسەر هاوکارانم کردەوە ماڵ و ماوەی چەند مانگ دواتر لە مووچەیان دەگێڕدرایەوە.

جارێکی دیکەش کە سەرۆکی لیژنەی (مشتریات) بووم، کچێکی ژمێریاری مەسیحیمان لەگەڵ بوو "مەنال"ی ناوبوو، کرابووە ئەندامی دارایی لیژنەکەمان، بیرمە ڕۆژێکیان هەندێ پارەی بە دیناری ئەوسای بە سەهوو دابووینێ. ڕۆژی دواتر کە لەدائیرە بینیمانەوە زۆر پەشۆکابوو گووتی: نازانم پارەکە

خۆیشم شکابێتەوە هەر پەشیمان نیم، کەچی بەداخەوە دەبینین لەدوای (راپەڕین)ەوەو لەژێر سایەی حوکمەتی خۆمان وا ڕووی ئاراستەکان بەرە بەرە دەگۆڕێن. ماوەیەك لەمەوبەر دەمەویست، لەبارەی ئەو بڕیارەی کە جاران هەم بووە، خۆم تاقی بکەمەوە تا بزام چەندەم بەبەرەوە ماوە، ئەوەبوو بە برادەرێکی خۆمان گوت: (ئیدی با گلەیی لەخەڵکی دیکە بەس بێ و خۆشمان بکەینە پارسەنگ و قیاس، فەرموو ئەوا من لە خۆمەوە دەست پێدەکەم و پێشتر سەرزەنشتی خۆم دەکەم ئینجا جەنابت، ئەوەتا ئێمەش هەردووکمان گەندەڵ کارین، ئەوە نییە ئێمە دوو مووچە لەحوکمەت وەردەگرین و کەچی هەر گلەییان دەکەین و ناڕازیشین...!)، دیاربوو ئەو، ئەو بۆچوونەی ئێمەی قبوڵ نەبوو و پێی هەزم نەدەکرا، بۆیە نەك هەر زوو زریکەی لێ هەستا، بەڵکو دەشیەویست قەرزارمان بکاتەوە، گوایە دنیا گۆڕاوە ئەو کە شەوو ڕۆژ ئیش دەکات، دەبێ ئەو ماندووبوونەی لەبۆ کێ بێ، ئەگەر مووچەی دیکەی لەپاڵ وەرنەگرێ و قەرەبوو نەکرێتەوە...؟!

"ئازاد عوبێد"ی قوتابی خوێندنی باڵای لای "د.کەمال مەزهەر"، هەروەها "مەسعوود مستەفا"ی پیاوی یاسا لە وەزارەتی ڕۆشنبیری، ئاگایان لێیە هەر لەسەرەتاوە ئێمە نەماندەویست مووچەی ڕێزلێنان وەربگرین، ئەو چەند مانگەش، لەبەر هەر هۆیەك بوو، کە وەرم گرتووە، نەك هەر پێی ناڕەحەت بووم، بەڵکو وەکو بێ قیمەت کردنی خۆم و نووسەرو ڕۆژنامەنووسانم دەهاتە پێش چاو،

---

چۆن کەمی کردووە، هەندێ لێی ورد بوومەوە وام دەهاتە پێش چاو وەکو بڵێی لەپرسەدا بووبێ، پێشتریش نێوانی لەگەڵ ئێمە زۆر خۆش بوو، ڕۆژێ لەڕۆژانیش ئاوەها بەگرژی و مۆنی نەماندیبوو، کەچی ئەو ڕۆژە زۆر بێتاقەت دەهاتە پێش چاو، گوتم: ها "مەنال" خێرە وا بێ تاقەت دیاری، گوتی: (پارەیەکی زۆر زۆرترم لە مووچەی خۆم لە حیساب کەمی کردووە، نازانم چی بکەم)، منیش ڕۆژی پێشتر زانیبووم ئەو پارەی وەرمان گرتبوو (٩٠٠)دیناری زیادە، بۆیە پارەکەمان بەئەسپایی بۆ گەڕاندنەوەو ویژدانی خۆمان ئاسوودە کرد.

وەکو دەڵێن دواتر لای ئەوانە ببووینە (ضرب المثل)، ئێستاش کە دەیانبینین زۆر بەڕێزەوە تەماشامان دەکەن.

هەرجارەی مووچەکەشم وەردەگرت لەشەرمەزارییان ئارەقەم دەکرد و ڕەش و شین هەڵدەگەڕام...!

ئەو سەربوردانە بۆ ئەوە دێنمەوە، تا لەبارەی ئەو ماوەیە قسەتان بۆ بکەم، کە لەکۆتایی ساڵی ١٩٩٨ بەدواوەوە، ماوە ماوە بەنهێنی و بەئاشکرا، بەتایبەتی بۆ لای د. کەمال مەزهەر دەچووینە بەغدا، دەمەوێ بشزانن کە ئەو زاتە چۆن ئەو ڕەوشتە بەرزانەی لەلا قوڵتر کردووینەتەوە، بەنموونە ئەو مووچەیە، کە بەناوی ڕێزلێنان بوو و هەر خۆیشمان بۆ هەندێ کەسمان دابین کردووە، زۆرمان هەوڵ لەگەڵ ئەو بەڕێزەدا، کە ئەوسا ئاگامان لێبوو باری دارایی کەمێك خراپ بوو و هەمووشتان دەزانن مووچەکەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێم بەهاکەی بایی چەند بوو...؟ بەڵام ئەو هەر قبووڵی نەدەکرد وەری بگرێ و دەیگووت: (با لەکوردستان خەرج بکرێ)، کەچی دواتر ئاشکرا بوو گەورەترین دەسەڵاتداری لای خۆمان وەری دەگرن و بەم کارەیان نانی زۆر کەسێ بەسەزمانیشیان بڕی.

زۆرجاریش لەبارەی خەسڵەتە تایبەتییەکانی ئەو پیاوە هەندێك ڕەخنەمان لەملاو ئەولاوە دەبیست، بە نموونە (غەیبەت کردن)، کەچی ئەوسا کە هەرچەند مانگ جارێك هاتووچۆیمان کردووە، ئەوەندەی لە نزیکەوە بینیومانە (ڕۆژێ لەڕۆژان قەت لە خۆیمان نەبیستووە باسی خەوشی یەکێکی دیکە بکات)، ئەوەبوو ڕۆژێکیان هەر بۆ ئەوەی بزانین چ دەڵێ و هەڵوێستیان چی دەبێت؟ قسەی هەندێ لەو کەسانەمان بۆی گێڕایەوە، کەچی ئەو زۆر لەسەرخۆ و بەڕێزەوە باسی ئەو کەسانەی بۆ کردین، تەنانەت هەر لەسەر ئەو هەڵوێستانەی بوو حەزم دەکرد ڕۆژێ زووتر بتوانم خزمەتی بکەم، ئەوەبوو لەکاتی ئامادەکردنی بەرگی دووەمی کتێبی (چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد)، حەزم دەکرد ئەوەندە خۆمی بۆ ماندوو بکەم تا جێ پەنجەم لەسەر کتێبەکە دیار دەبێ، پێشمان وایە لە دوای چاپکردنی کتێبەکە ئەو حەزەم هاتۆتە دی، کتێبەکەش بووە جێی ڕێزی زۆربەی نووسەر و تۆژەران، تەنانەت کتێبەکە ئەوەندە ناو و دەنگی دایەوە برادەرانمان لە پێشانگایەکی کتێب فرۆشتن بەچاوی خۆیان بینیبوویان خەڵك وەك کتێبەکەی "عەبدوڵڵا زەنگەنە" داوایان کردبوو، زۆر کەسیش لەجیاتی دەستخۆشی و

پیرۆزبایی لە دکتۆر خۆی بکەن لە ئێمەیان دەکرد. بیرمە جارێکیان لە سلێمانی بووین کاتێ بە نووسەرێکی ناسراویان ناساندین، راستەوخۆ باوەشی پێدا کردم و گریا، گووتی: ( هەر من دەزانم کارێکی چەندە گەورەت کردووە، د. کەمال چۆن ئەو رەخنانەی ناو کێشەکەی لێ قبولّ کردووی؟)، ئێمەش بۆ ئەوەی هێوری بکەینەوە گووتمان: (کاکە خۆ ئێمە هیچی وامان نەکردووە، ئەوەندەیە د.کەمال کەس نەیدەناسی، وا بەخێری ئێمەوە هەموو خەڵك ناسیویانە !)، هەر لەوێ گووتمان: لەڕەحمەتی کەعبەی ئاڵی کورد "بەشیر موشیر" دەگێڕنەوە، هەمووجار بەنووسەرانی گوتووە: (ئێوە بنووسن و منیش تەئلیفی دەکەم)، بڕوا بکە ئەو پیاوە راستی بۆچووە، ئەوە لە د.کەمال و من قەوماوە، ئەو نووسیویەو ئێمەش تەئلیفمان کردووە.

***

دەستپێکی ئەو قسانەی دیکەشمان بۆ هەڵدانەوەی چەند نهێنییەکی نەزانراوی ئەم کتێبەی بەردەستتانە، کەوا ئێستا خۆتان بۆ خوێندنەوەی ئامادە کردووە. ماوەی شەش مانگ دەبێت (ئامادەکردن)ـەکەیمان بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە پێ سپێردراوە، کاتی خۆی کە دەستخەتەکەیمان گەیشتە دەست و ناوی خۆمان بەخەتی د.کەمال خۆی لەسەر دەستنووسی بەرگەکەی بینی و (ئامادەکردن)ێکی خرابووە پاڵ، بڕوامان نەدەکرد، بەڕاستی لەیەك کاتدا پێمان خۆش و ناخۆشیش بوو، چونکە پێش خەڵکی دیکە، خۆم دەزانم بۆ ئەم جۆرە کارانە چ بابایەکی (موزعیج)م..! ئەوەبوو کە دواتر بەتەلەفۆن قسەمان لەگەڵ جەنابیان کردو پرسیاری کارەکەی خۆمان لێی کرد چی لەسەر ئێمەیە بیکەین و چی نەکەین؟ تەنانەت ڕەخنەشمان لێی گرت کە کاری ئامادەکردنی کتێب زۆر قورس و بڤەیە. بەتایبەتی کە ئێمە تا وەکو ئێستا هیچ کارێکی وامان بۆ ئەم کتێبە نەکردووە تا وەکوو (چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد) شەرەفی ئەو (ئامادەکردن)ەمان بۆ خۆمان حەڵاڵ کردبێ و شەرەفمەندبین ناومان لەسەر بەرگی کتێبەکە بنووسرێ،

دیاره وەڵامی بەڕێزیان زۆر کورت و پڕ مانا بوو: تا زەنگەنەی خۆشەویست دڵنیام و دەزانم ئەم جارەش هەقی خۆت حەڵاڵ دەکەیت...!

دڵنیام کاتی خۆی کە نووسەر ئەو کتێبەی بۆ ناردووین، مەبەستی بووە بە ماوەی دوو مانگێك بخرێتە بەردەست خوێنەر و تۆژەران، پێمانوایە یەك لەحەزەکانیشی لەبەر ئەوە بووە تا خوێنەرانی زوو بیخوێننەوەو ئەویش خۆی بۆ نووسینەوەی بەرگی دووەم ئامادە بکات، بەڵام دڵنیاین و بەداخەوەشین ئێستاکە ئەو، وا بەشی زۆری بەرگی دووەمیشی نووسیوەتەوە، کەچی وا لەکوردستان بەرگی یەکەمی کتێبەکەی هێشتا نەخشەسازی بۆ نەکراوە، پێیشی ناوێ لێرەدا باسی چۆنیەتی دانانی ئەو کتێبەو خوێندنەوەی ناخی دانەرەکەیتان بۆ بکەین، چونکە ئەو خۆی کارێکی وای کردووە کە گێڕانەوەی هەندێ باس لەکۆڵ ئێمە بێتەوە، بۆیە حەز دەکەم باسی پەرۆشی و ئامادەکاری خۆمانتان لەبارەی چاپی ئەم کتێبەکە بۆ بکەین.

کاتێ فۆتۆی بەشی یەکەمی دەستنووسی نووسەرمان بەدەست گەیشت، ڕێکەوت وابوو سەرۆکی (بنکەی ژین بۆ بووژانەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانی کوردی) لەهەولێر بوو، ئێمە لەگەڵ دوکتۆر، جگە لە تێبینیمان لەسەر وردی فۆنتی چاپەمەنییەکانی دەزگای ئاراس، هێشتا بڕیاری خۆمان بەتەواوی نەدابوو و خۆمان یەکلا نەکردبۆوە کە بیدەینە چ دەزگاو لایەنێك بۆمانی چاپ بکات، کەچی ئەو زوو بەزوو فۆتۆی دەستنووس و بەڵگەنامەکانی، دەردی هەولێرییان دەڵێن: لەدەست قەپاندین و لەگەڵ خۆیان بردیانەوە سلێمانی تا لە بنکەی ژین چاپبکرێت، دواتر لەوێ وا دیاربوو ئەوان پێیان وابووە گوایە کارێکی باش دەکەن، ئەگەر زوو بەزوو بەچەند کەسان بکەونە تایپکردنی دەستنووسەکە و سکان کردنی هەندێ لە بەڵگەنامەکانی هاوپێچ، بێ ئاگا لەوەی د. کەمال لە نووسینەکانیدا حیساب بۆ بێ بایەخترین خاڵ و وێرگوڵ دەکات. لەگەڵ هێنانەوەی بەشی یەکەمی کتێبەکە، ئەوەبوو بەشی دووەم و دواتر سێیەمیشمان لە (لەندەن)ەوە بۆ هات. بەڕاستی نایشارمەوە ئێمە پێشتر نەمانپەرژابوو، جگە لەپێشەکی و بابەتی یەکەم، تەماشای ناوەرۆکی بابەتەکانی پۆستەی بەشی یەکەم بکەین، تا بزانین چی تێدایەو باسی

چی دەکات، ئەوەبوو کە بەشە تایپکراوەکانیان بۆ ناردینەوەو خوێندمانەوە، زوو زانیم پاراستنی (ئەمانەت)ی ئەو (ئامادەکردن)ە، زۆر زۆر لەکتێبی پێشوو قورسترە، بەتایبەتی باروزروفی کاتی چاپکردنی ئەو کتێبە لەگەڵ هی (چەند لاپەڕەیەك...)دا وەکو دەڵێن: (ئاسمان و ڕیسمان)ەو (ئەو هەواریشە بەلام نە ئەو بووارە)، بۆیە لەدڵی خۆمدا ئارەزووم لێ بوو، کەسێکی دیکەشمان لەگەڵ بێت و لەگەڵ خۆمان بیکەینە (هاوبەش)، تا بەرپرسیارییەتەکە لەسەر شانی خۆمان سووکتر بکەین. ئەوەبوو قوتابییەکی خوێندنی بالامان هەڵبژارد تا هاوبەشیمان لەگەڵدا بکات، دواتر هەواڵی پێبدەین کە ئەویش لەگەڵ خۆماندا دەبێتە (شەریکەبەش)ی (ئامادەکردن)ی کتێبەکە، بۆیە تەواوی بەشی یەکەممان بەو مەرجە دایە تا هەڵەبژێرییان تێدا بکات، هەر سەرنج و تێبینییەکیشی هەبێت، لەبارەی کارەکانەوە ئاگادارمان بکاتەوە، یا بۆمان بنووسێتەوە، لەهەمان کاتیشدا دەتوانێ بۆ کاری دکتۆرانامەکەی خۆی و کارەکانی دواتری کەڵکیان لێ وەربگرێت، بەلام بەداخەوە ئەو کە لاپەڕە تایپکراوەکانی بۆ هێنایەنەوە ئەوەندەی ئارام نەگرت تا بزانێ چی بۆ دەکەین، بەڵکو دەیەویست زوو بەزوو مەرجی خۆیمان بەسەردا بسەپێنێ، بەوەی هەر سەرنج و تێبینییەکی نووسیبێتەوە بەناوی خۆیەوە بۆی بخەینە پەراوێزی کتێبەکەوە، ئێمە هەر لەگەڵ چاو پێداخشاندنەوەمان بەتێبینییەکانی ئەو، زانیمان مەسەلە چییە! بەتایبەتی کە ئەو یەك دوو تێبینییەی نووسیبوویەوە بایی ئەوەندەی نەدەکرد بخرێتە پەراوێزەوە، بۆیە بووارمان نەدایێ زیاتری لەسەر بڕوات و یەکسەر توانجی خۆمان هاویشت، کە ئەو جۆرە گوناهانە لای ئێمە وەکو بڵێیت بەناوی دەستنوێژ دەشۆردرێنەوە، ئەو دەزانێ هەتا لەگۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)یشدا ئەگەر تێبینییەکمان هەبێت و هەڵەی واش ببینین هیچ پێی سەغڵەت نابین، بەڵکو بەبێ ئەوەی خاوەنەکەیشی هەستی پێبکات، خەتێکی بەسەردا دەهێنین و ڕاستییەکەی دەنووسینەوە. بۆیە لەدڵی خۆمدا زوو بڕیارمدا (شەریکەبەش)ی وا وەلاوەنێین، ناچاربووین دانەیەکی دیکەی تایپکراوی بابەتەکە ڕاکێشینەوە خۆمان بە تەنیا جارێکی دیکە بکەوینەوە پەیجووری هەڵەبژێری لاپەڕەکان. لەگەڵ هەڵدانەوەی هەر لاپەڕەیەك بیرمان

لەقسەی هەندێ کەس دەکردەوە کە گوتبوویان ئەو بەڵگەنامانەی د.کەمال مامەڵەیان لەتەکدا دەکات پێشتر بڵاوکراونەتەوە، ئەم قسەیە سەرەتا ئێمەی زۆر نیگەران کرد، دواتر گەڕاندنییەوە بۆ (١٠) ساڵ لەمەوبەری کاری تۆمارکردنی مێژووی ڕۆژنامەنووسیی، کە بۆ نووسینەوەی کتێبی (ڕۆژنامەنووسیی کوردی لەکوردستانی دوای ڕاپەڕین) بەسەر خۆماندا هاتبوو، ئەوەبوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە لە ساڵی ١٩٩٧دا چەند جارێك لەهەولێرەوە چوو بووینە دهۆك، لەوێشەوە بەنهێنی بەناو ڕژێمدا چووبووینە مووسڵ، پاشان بۆ کەرکووك و ئینجا بۆ سلێمانی، ئەوەشمان هەر لەبەر ئەوەبوو بەڕێگای کۆیەدا نەچینە سلێمانی، نەبادا لەگەڵ خۆشەویستانمان تووشی گرفت ببین، چونکە لەئەنجامی شەڕی خۆکوژی نێوان هەولێرو سلێمانی برادەرانمان ئەوەندە بازگەی ناوخۆیان توند کردبوو و حەشرێکی وایان بەم خەڵکە دەکرد، لە ناو ڕژێمیش شتی وا نەدەبینرا، ئێمەش دەمانەویست بەم حاڵەوە زانیاری لای ئەم و ئەو، ئەو حیزب و ئەم حیزب، کتێبخانە گشتییەکان، بۆ کتێبەکە و مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی کۆ بکەینەوە، تەنانەت کاتێ کە دەگەڕاینەوە هەولێر هاوسەرەکەشم نەیدەزانی چووبووینە ئەم وڵاتە، نەبادا لای یەکێك باسی کردباو بابایەك ڕاپۆرتمان لێبدات. سەرباری هەموو ئەم خەمانە هەندێ کەس پێیان دەگووتین: خۆت بەچییەوە خەریك کردووەو بۆچی ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی وا فلان و فیسار لەهەمان بوواردا کتێبەکەی خۆیان تەواو دەکەن. دیارە ئەوسا وەڵامی ئێمە هەر ئەوەندە بووە: جا قەیدی چی دەکات ئێمە ئیشی خۆمان دەکەین و با خەڵکی دیکەش ئیشی خۆیان بکەن، ئەگەر بەهەردوو لامان دێڕێك بخەینە سەر باخچەی مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی، ئەوا شتێکی تازەمان کردووەو زۆر دەکات. لەسەر ئەم کتێبەی د. کەمالیش، وەڵامێکی وامان داوەتەوە وەکو دەڵێن: دواتر قورقەپمان لێی کردووە. وا کتێبی ئێمە وەکو سەرچاوە بەدوایدا دەگەڕێن و تەنانەت دانەی لای خۆشمان نەماوە، کەچی ئەو کەسانە وا کتێبەکەیان هەروا چاپ دەبێ...! دیارە دوای ئەوە ئەم کتێبەی "د. کەمال مەزهەر"یش دەکەوێتە دەست خوێنەران ئەوسا قسەیەکی دیکەمان دەبێ!

***

لەبارەی گەیشتنەوەی دەستنووسی ئەم کتێبەش بەبیرم نایەتەوە لەو ماوەیەدا چەند کەس لەمامۆستایانی زانکۆ و هونەرمەند و رۆشنبیرانی گەلەکەمان هاریکارمان بوونەو لەسەر راسپاردەی د. کەمال پەیوەندییان پێمانەوە کردوون و بەشەکانی ئەم کتێبەیان بۆ هێناوینەتەوە تا بەم شێوەیە بیخەینە بەردەست خوێنەران، بەڵێ دەبێ هەوڵ بدەم ناوی ئەوانەمان بەبیر بێتەوە و دوعای خێریشیان بۆ بکەین.

لەگەڵ دەستپێکی نووسینەوەی ئەم دێرانە شێوەو ناوی ئەو "هاوڕێ ئەمەلی"یەمان دێتەوە بیر و پێش چاوان کە ماوەیەك لەمەوبەر خۆی کوشتوە، بەدەست خۆمان نییە وا چاوەکان فرمێسکیان تێدا قەتیس دەمێنێ و دەمەوێ بدەمە قولپی گریان، بەڵام زوو بە زوو دەیانسڕمەوە نەبادا، بەم تاریکی نیوەشەوەوە بەم بێ کارەباییە، هاوسەرەکەم لێم بێتەوە ژوور (میزاجی کوردەواریمان تێك بچێ) و ئەویش لەگەڵم دەست پێبکات، کاتێ کارەساتی ئاوەها دەبیستم و دەبینم بەدەست خۆم نییە کە هەندێ جار نەك هەر زۆر لۆمەی خۆمان دەکەم، بەڵکو ورەم دادەبەزێو دەشڵێم: ئێمە دەمانەوێ قوربانییەکی زۆر بدەین تاوەکو فێرە سیاسەت دەبین، دیارە مەبەستیشمان لەو سیاسەتە مانا حیزبایەتییەکە و شیکردنەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژ نییە. ئەو کاتەی "هاوڕێ ئەمەلی" بۆ پاراستنی ئابرووی خۆی، گیانی کردە قوربانی (هەڵوێست) و (ئەمانەت)ی پاراست، بەداخەوە وادیاربوو مۆدەیەکی تازە هێنرابووە نێو بوواری ڕۆژنامەنووسیی کوردی، ئەویش بڵاوکردنەوەی ئەو نامەو ڕاپۆرتانە بوو، کە لەژێر سایەی ئەو ڕژێمەی کە حوکمی عیراقی دەکرد شتێکی زۆر ئاسایی بوو پیاوەکانی ڕژانە ڕاپۆرتی ئاوەها لەسەر هەر کەسێکی ئەم وڵاتە بۆ سەرووی خۆیان بنووسن، نازانم ئەو ڕاپۆرت و قسانە چەندیان ڕاست بوون و چەندیان درۆ، بەڵام دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە زۆربەیان درۆ بوون، تەنانەت هەندێك کەس سوێندیان خواردووە کە ئەو ڕاپۆرتانە چەند ڕۆژێك پێشتر لەکوردستان نووسرابنەوە...! بەهەرحاڵ ژمارەیەکی کەم لەدەستەبژێری نەتەوەکەمان، تەنانەت د.کەمالیش، کە بەم تەمەنەوەو بەو نەخۆشییەوەی کەوا بەناچارییەوە بۆی چۆتە لەندەن وا خەریکی

نووسینەوەی مێژووی ئەو میللەتەیە، لەم نوقورچ و توانجانە بێ بەش ناکەن، ئەو کتێبەی ئەویش نەبووایە ڕۆژێ لەڕۆژان ئێمە قەت ئەو "هاوڕێ ئەمەل"یەمان نەدەناسی، کە ناسیشمان، دەڵێین: هەتا ئەگەر ئەو ڕاپۆرتانەمان بەدەستی خۆمان لەو دۆسیانەدا دەرهێنابایە، نەك وەکو ڕۆژنامەنووسێك هیچمان لەسەر نەدەنووسی، بەڵکو ئەگەر بەڕێوەبەری ئاسایشی کوردستانیش بووباین، لەگوڵیش کاڵترمان پێی نەدەگوت، چونکە پێمان وایە شتێکی زۆر ئاساییە هەر هاوڵاتییەکی کوردی عێراق ناوی لەڕاپۆرتەکانی پیاوانی ڕژێمدا هاتبێ. سەد حەیف و مەخابن ئەو وا گیانی خۆی بەم شێوەیە کردە قوربانی نەتەوەکەی خۆی، هەزاران سڵاو لەگیانت ئەی ئەو "هاوڕێ"یەی یەکەم جارمان بوو بتبینین و تاوەکو ئەمڕۆکەش نەمزانی کوڕی کێ بووی و لە چ خانەوادەیەك بووی، سەد حەیف و هەزار مەخابن...؟!

دوکتۆر "فوئاد بابان"ی ئەندام پەرلەمانی کوردستان، کە ئەویش یەکێکی دیکەیە لەو مامۆستایانەی زانکۆ دەبێ ماندووبوونی لەبەرچاو بگیرێ، چونکە دوای ئەوەی بەشێکی دیکەی کتێبیەکەی لەلەندەنەوە هێنابووەوە، ڕۆژێکیان زەحمەتی کێشابوو و زۆر بەبێ فیزییەوە خۆی بۆی هێنابووینە بارەگای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.(*)

"عەتا موفتی" کە کارگێڕێکی چالاکی (مەڵبەندی ڕۆشنبیری کوردی)یە لەلەندەن، ئەویش بەشێکی کتێبەکەی هێنابووەوە، وەکو د.کەمال هەموو جار دەڵێ : ناوبراو نەوەی موفتی پێنجوێنییە.

ئەی ماندووبوونی "فەرهاد عەونی"ی هاوکارمان و نەقیبی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ئەویش بەشێکی کتێبەکەی بۆ هێناوینەتەوە.

لەنێو ئەو نامانەی کە د.کەمال لەبارەی کتێبەکەیەوە بۆی ناردووین، دوو ناوی وەکو "ئاسۆ" و "سوارە" هەن. بەبیرم نەماوە ئەوانە دوو ناو بوون بۆ

---

(*) بەداخەوە وادیارە ئێمە تەواو سەرچیخ چووبووین و ئەو زاتەمان بەجێگری سەرۆکی زانکۆی کۆیە دانابوو. هەروەها لە چەند دێڕی دواتر لە جیاتی (فەرهاد عەونی) ناوی (شێرکۆ حەبیب)مان، کە هەمووجار لای د. کەمال بە (موزعیج) ناومان دەبا و باسمان دەکات، نووسیبوو – تێبینی بۆ چاپی دووەم – ع. زەنگەنە).

کەسێك یان دووان، چونکە تاوەکو ئێستا بیرم نایەتەوە ئەو دوو بەڕێزەمان دیبێ، ئەوان ئەو بەشەی کتێبەکەیان بردبووە سلێمانی و دابوویانە "جەلالی عومەری سام ئاغا"ی خۆشەویستی د.کەمال، ئەویش دوای ئەوەی لەبارەی ناوەرۆکی ئەو پۆستە تەلەفۆنی بۆ کردبووین، لەسەر ڕاسپاردەی ئێمە بەشەکەی خۆیان بردۆتە (بنکەی ژین). لەژیانی ڕۆژانەمدا هەموو دەم حەزم کردووە، د.کەمال گۆتەنی: (ئەوی دەنکە جۆیەکی مالّی پاشای خواردبێ) ناوی بێنین و لەچاکەی خۆی زیاتر خزمەتیان بکەینەوە، بۆیە لێرەدا بەپێویستی دەزانم، لەجیاتی د.کەمالیش، سوپاسی یەکە یەکەی هەموویان بکەین، دەست و پەنجەیان بگوشین.

***

حەزیش دەکەم بزانن ناوهێنانی ئەو بەڕێزانە هەر بۆ پێشکەشکردنی (سوپاس و پێزانین) نییە، بەلّکو مەبەستمانە لەڕێگەی ئەوانەوە قورسایی ئامادەکردنی ئەو کتێبەشتان پێ بلّێین، جارێ لای هێرووە دەستنووسی هەموو لاپەڕەکانی ئەم کتێبە بەکۆپی گەیشتۆتە دەستمان، دیارە ئەوەش لەبواری ڕۆژنامەنووسیی، مەگەر لەناچارییان بێت، ئەگەرنا زۆر پەسند نییە،وەکوو لەپێشەوەش گووتمان: کتێبەکە بەش بەش گەیشتۆتە دەست ئێمە، کە ئەویش بەپێی پێرستی بابەتەکان نەنێردرابوو، بەلّکو کاتێ د.کەمال زانیویّتی ئەوا یەکێك لەسەر گەڕانەوەیە بۆ کوردستان، پێشتر زوو نامەیەکی بۆ ئامادە کردووین، دوای سلاّو و هەوالّ پرسینێکی بەپەلە، تێیدا ئارەزووی خۆی لەمەڕ کارەکانی بۆ نووسیوین، لەپالّیدا بابەتەکەی تا هەر کوێیەك پاکنووس کردبێت، ئەوەندەی بۆ ناردووین، با بلّێین بابەتی هەشتەم، کە درێژترین بابەتی ناو ئەم کتێبەیە، لەوانەیە بە(٣) بەش گەیەنرابێتە دەست ئێمە، دیارە د.کەمال لەگەلّ دەستپێکی هەر بابەتێك، پەراوێزەکانی بەزنجیرەیەکی نوێ دەستپێکردووە، دواتر کە گەیەنراوەتە دەست ئەوانەی تایپیان کردووە، ئەوا وانەبووە هەرکەسە بەپێی دەستنووسی نووسەرەکەی ڕۆیشتبێ، بەلّکو هەریەکەیان هەر بەشێکی لاپەڕەکانی لابووبێ هەر لەو شوێنە دەستی بەتایپ کردن کردووەو جارێکی دیکە لە ژمارە (١)ەوە زنجیرە

پـەراوێزی نوێیـان بـۆی داناوەتـەوە. بۆیـە کـە دواجـار هـەموو بابەتـەکانمان بەتایپکراوی بۆ هاتەوە، زوو زانیمان کە چ گرفتێکی گەورەمان تووش بووە.[*]

---

(*) ((ئەوەبوو دواتر ماوەی پتر لەچوار مانگان خەریك بووم تا کەمێك ئەو هەڵەت و پەلەتانەمان، وەکو دەڵێن: هێنایەوە سەر سکەی خۆی ئینجا هەواڵمان دایەوە د.کەمال تا خـۆی بـۆ دووبـارە خوێندنـەوەو پێداچوونەوەی کتێبەکە ئامادە بکات، کە لەم ڕۆژانە بەپۆسـتی ئـەلیکترۆنی بـۆی دەینێرینـەوە. دیـارە وەکـو خـەڵکی سـلێمانی دەڵـێن : ئێمـەومانان هـیچ لـەو جیهانـە (پـڕ لەخۆشـی و سـەیرو سـەمەرە)ی کۆمپیوتەر نازانین، بۆیە لەبیرمان نەمابوو بەو برادەرەمان بڵێین، کە کارەکەی بـۆ جێبـەجێ دەکـردین، تا کتێبەکە بە (PDF) بنێرێ. دیارە شتێکی ئاساییە ئەو ڕێگایـەکی ئاسـان وا بۆخـۆی هەڵبـژێرێ، کـە پێمانوایە پێی دەڵێن (وۆرد). دوکتۆر کەمال و شەملا خانیش، کاتێـك لـەبازاڕ کتێبەکـەیان هێناوەتـەوە سەرکاغەز وا دیارە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەوەی ئێمە ناردبوومـان (٣٠٢) لاپـەڕەی فۆلـسکاب بـوو، جگە لەهەندێ بابەتی پاشکۆ، بەپێی ئەو هەڵەبژێرییەی کە د.کـەمال لەسـەر کتێبەکـە کردبـووی و ئـەو (١٠) لاپەڕە هەڵەت و پەڵەتەی تێیدا دۆزیبووەوەو دواتر ناردبوویەوە، وادیاربوو ژمارەی لاپـەڕەکان لای ئەوان گۆڕابوو، ئەوەبوو دوای (١٠ – ١٥) ڕۆژ، ئینجا توانیمـان ئـەو(١٠) لاپەڕەیـە لەگـەڵ ماوکارانمـان لەناو کتێبەکەدا دەربهێنین و بیانهێنینە سەر کاغەز تا لەسەر کۆمپیوتەر هەڵەبژێریان بکەین. بەڕاسـتی بەمەزندەش نەماندەزانی لاپەڕەکانی لای د. کـەمال ئەوەنـدە زیـادبووبن و لـە هـەمان کاتـدا ئەوەنـدە هەڵەمان بەسەردا تێپەڕ بووبێ، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەوان ، زۆر ئاگاداری ئەوە نەبوون کە کتێبەکـە هەندێ قۆناغی دیکەی ماوەو ئەو کارانە هەندێکیان لەکاتی نەخشەسازی بنەبڕ دەکرێن، لەوانەیە ئێستا نەك هەر ئێوە، بەڵکو دکتۆر خۆیشی لای سەیر بێت، ئەگەر بڵێین بەفیرسیچمەیی خۆمان، کـە تەنانـەت گوێـشمان بـەداوای ئـەویش نـەداوەو تـا ئەوەنـدەی خۆمـان دڵنیابووینەتـەوە کـە دوا هەڵـەمان تێـدا دۆزیوەتەوە، ئینجـا بڕیـاری کارەکـانی نەخـشەسازیمان داوە. دوکتـۆر لەنامەیـەکی تایبەتیـدا لـەبارەی پرسێکی ڕۆژنامەنووسیی بۆی نووسیوین: (شا بە تاقەتت) کاتێ لەو (١٠)لاپەڕە هەڵەت و پەلەتانـە ورد دەبوومەوەو ئێرەییم پێی دەبردو دەمگووت: نـەخێر شـا بەتاقـەتی خـۆت کـەوا لـەکارەکانت ئەوەنـدە وردی، بەڕاستی ئەمڕۆ زەمانێکە تێی کەوتووین، زۆر هونەرە نووسەر ئەوەندە لەسەر کارەکانی خـۆی سووربێ و ئاوەها حیساب بۆ بچووکترین خاڵ و وێرگولی نووسینەکانی خۆی بکات، دیـارە ئـەو هـەموو ماندووبوونەش لەبەر جیاوازی لاپەڕەکانی نێوانمان بووە، لەو (١٠) لاپـەڕەیـەی بۆمـان هـاتبووەوە هـیچ کـام لـە لاپـەڕەکانی سـەرەتاو کۆتـایی لاپـەڕەکانی لای ئێمـە لەگـەڵ ئەوانـەی لای ئـەوان تێکـی نەدەکردەوەو جیاوازی گەلێك زۆر لە نێوانماندا بوو، بۆیە ناچاربووین چوار پێنج، بەڵکو شەش جـاریش پێیاندا بچینەوە تا هەموویانمان بەسەر کردوونەتەوەو ئینجا دەتوانم بڵێم بنەبڕمان کردوون.

ئەو هەلاّنەی لێمان گیرابوون، دیارە چەند دانەیەکیان ڕەوا نەبوون، پێدەچوو دوکتۆر هەستی پێ نەکردبێ کە ئێمە پێشتر دەستکاریمان کردبوون، دیارە ئەگەر جێبەجێمان کردبان شتی عەنتیکەو سەیرو سەمەرە بەڵکو خۆشیشی لێ دەکەوتەوە، هەر بەنموونە لەشوێنێکی کتێبەکەداو لەبەڵگەنامەیەکدا باسی پەیمانی سیڤەر کراوە، دوکتۆر پەراوێزێکی بۆ ئەو شوێنە کردبوو و ئاوەهای نووسیبوو: (شایانی باسە سێڤەر هێند لەلای کورد خۆشەویستە کە دایك و باوکی کورد کردوویانەتە ناوی کچەکانیان، یەکێك لەوانە سیڤەری مەحموود زامدارە)، لەکاتی هەڵەبژێریدا، ئێمە ڕێك ئەو دەستەواژەی (کچەکانیان)مان کردبووە (کوڕەکانیان) و ئیمزای خۆشمان لەتەکی دانەنابوو، بەچاوپۆشین لەوەی کچیش هەن ناویان "سیڤەر" بێ، بەلاّم ئەوە هەڵەیەك بووەو ڕاست کراوەتەوە، دوای ئەوەی دوکتۆر یەکەم جار هەڵەبژێریی بابەتەکەی کردبۆوە، وادیارە وای زانیبوو هەڵەی چاپە، بۆیە ڕایسپاردبوو بیکەینەوە (کچەکانیان)، کاتێ بەتەلەفۆن مژدەی ئەوەمان پێیدایەوە، ئەگەر ئەو هەڵەیە بەدڵی ئەو چاك بکەینەوە، دڵنیام نەك هەر سیڤەر خۆی بەڵکو مەحموود زامداری باوکیشی، کە ماڵی بەرامبەر ماڵەکەمانە، دێ دەرگامان لێ دەگرێ و لەوانەیشە تیرۆرمان بکات...!، چونکە سمێڵی سیڤەری کوڕی ئەوەندەی دەسکە کەوەرێکە و وا ئێمەش دەیکەینە کچ. بەم قسەیە مامۆستا زۆر پێکەنی و دڵیشی خۆش بوو، کە ئاوا لەسەر هەڵەبژێری ناو کتێبەکە ئەوەندە ورد بووینە، دوای ئەوەی پاساوی پیری و نەخۆشی بۆ ئەم جۆرە هەلاّنە هێناوەتەوە بەبێزاریشەوە هانی داوین کتێبەکەی زوو لەکۆڵ بکەینەوە...!

***

خاڵێکی دیکەی سەرنج ڕاکێش لەم کتێبەدا، ئەویش نووسینی ناوی، "شەملا تاهیر حەیدەری"یە لەسەر بەرگی کتێبەکە، کە دیارە ئەوان لای خۆیان ناوەکەیان دانەنابوو، لەوانەیە هەندێ کەس هەبن و پێیان وابێت یان وابزانن کە ئەو ناوە هەر ئاوەها لە خۆڕا هاتبێتە سەر بەرگەکە. لێرەدا دەمەوێ ئەو نهێنییە هەڵبدەمەوە کە هەر لە زووێکەوە هەستمان کردبوو و زانیبوومان ئەو خانمە بەڕێزە چ پشت و پەنایەکی د. کەمال بووە، تەنانەت هەر لەسەر ئەو هەڵوێستەی بووە لەساڵی ٢٠٠١دا وێنەکەیم

خستۆته ل(٥٥٧)ی بەرگی دووەمی کتێبی (چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد) و لەژێرەوەیشی نووسیومە: (شەهلا خان، هاوڕازی د. کەمال).

ئەمجارەش کە بینیمان زۆربەی کارەکانی ئەو کتێبەو کارە ڕۆشنبیرییەکانی دیکەی دکتۆر لەسەر شانی ئەم خانمە بەڕێزە بووە، بەڵکو دەتوانین بڵێین ئەو خانمە لەم کارەیدا زۆر لە ئێمە ماندووتر بووە، ئەوەندەی ئێمە و زیاتریش لەم کتێبەدا کاری کردووە کە لێرەدا جێی نابێتەوە باسیان بکرێت....

جا بۆیە دەمانەویست هەوەڵجار شۆڕشێك لەناخی خۆماندا، ئینجا دوکتۆر کەمال مەزهەر و هەموو ئەو کەسانەدا بکەم، کە هاوسەرەکانیان لەماڵەوە ئاوەها بوونەتە پشت و پەنایان و وایان لێ بکەین هەقی خۆیان بدەنەوە، بە تایبەتیش ببێتە عیبرەت بۆ کاکە (محەمەی مەلا کەریم) کە هەموو جار شانازی بە خۆیەوە دەکات گوایە کارێکی باشی کردووە دوای ژن گواستنەوەی بابەتی ڕۆژنامەنووسیی و نووسینەکانی خۆی بردۆتە ژووری زاوایەتی لە ئوتێل و کاری هەڵەبڕی بەو "شیرین خان"ـەی هاوسەری و دایکی (ژیوار) و (بیارە) و (پیران) کردووە کە ئێمە وێنەکەی ئەمیشمان لە هەمان لاپەڕەو لەپاڵ وێنەی "شەهلا خان" داناوەو لەژێر وێنەی ئەمیشدا نووسیومانە: (شیرین خان، مافناسی ڕۆشنبیران ..!) خۆ هەر هیچ نەبێت د.کەمال لەزۆربەی نووسینەکانیدا، کە ناوی ئافرەتی تێدا هاتبێ، هەتا لە پێشەکی ئەم کتێبەشدا، باسی ماندووبوونی شەهلا خانی کردووە، بەڵام دیسان دەیڵێینەوە لەپێش چاومە کە چەند بە کتێبخانەو کتێبەکانییەوە ماندووە، هەروەها بۆ ئەم کتێبەش چەندە هاوکاری کردووە، باشیش دەزانم "سەعدیە خان"ی دایکی "میدیا" و هاوسەری "د. مارف خەزنەدار" لەم بووارەدا تاقانەیە، ئومێدەوارم مەزەندەکانم لەشوێنی خۆیان و بەقەد کارەکان بن.

***

د. کەمال، لە پێشەکی و بابەتی یەکەمی کتێبەکەیدا، باسی دەروون حەساوەیی و دڵخۆشی بەم کارەی خۆیەوە دەکات، ئومێدەوارین هەر ئاوەها لە پاڵ نەتەوەکەی خۆیدا بەدڵخۆشی و ئاسوودەیی ببینین، بەڵام لە هەمان کاتدا لە دووتوێی ئەم کتێبەیدا داخ بۆ ئەوە دەخوات کە لە کتێبخانەکەی خۆی دوور بووە

بۆیە، نەیتوانیوە پەراوێز بۆ هەندێ لە بابەتەکان بکات، ئەگەرچی ئێمە هەوڵمان داوە کەمێك لەم بۆشاییە پڕ بکەینەوە، بەڵام قەت پێمان وانییە کارەکەمان جێگەی شێوەو شێوازە تایبەتییەکەی ئەو بگرێتەوە. ئەگەر چی لەم کارەی ئێمەشدا هەست بە هەندێ خۆ بەپەسندزانی بکرێت، بەڵام ئومێدەوارین ئەوەندە لەسەرمان نەیکەنە ماڵ، چونکە ئێمەش حەز دەکەین لە خۆتان بپرسن و بزانن لە خۆڕایی نییە لە نێو ئەو ژمارە زۆرەی قوتابیان، د. کەمال نیمچە خوێندەوارێکی وەکو ئێمەی بۆ (ئامادەکردن)ی کارێکی وا گرنگی خۆی هەڵبژاردووە.

هەروەها د. کەمال خۆی وای فێر کردووین ئەوەندەی بۆمان بکرێت و بۆمان بلوێت لەگێڕانەوەی ڕاستیی ڕووداوەکاندا ڕاستگۆ و ورد بین، تەنانەت لەنامەیەکیدا بۆی نووسیوین و ئەو هەقەی داوینەتێ ئاگاداری هەموو بەرهەمەکانی بین، دیارە ئێمەش، وەکو پێشتر گوتوومە مردنی خۆمان لەناپاکی کردن لە (ئەمانەت) پێ خۆشترە...!

***

لەلایەکی دیکەش کە ئێمە پێمان وانییە لە ژیانی خۆماندا ئەوەندە بابایەکی ناسك و گرینۆك بووبین، بەڵام هەموو جاریش نامانەوێ هەستی خۆمان بشارینەوە ئەگەر بە چەند دێڕێك ڕای خۆمان لەسەر ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بدەین. ئەوەتا بە زۆر لەسەربووردەو گێڕانەوەکانی ناو ئەم کتێبە گریاوین، هەر بە نموونە پیاوێکی وەکو "د. وەلید حەمدی" نووسەری کتێبی (الكرد وكردستان في الوثائق البريطانية)یە، هەرچەندە دەمێك بوو بەکارو ناوەکەیدا مەزەندەمان وا بۆ دەچوو کە ئەو زاتە کورد بووبێ، بەڵام دەبێ گلەیی لە هەر ڕۆشنبیرو ڕۆژنامەنووسێکی شاری هەولێر بەتایبەتی و کوردستان بەگشتی بکرێت، کە لەوانەیە بەهەق لەگەڵ هیچ کەسێك هەڵ نەکەن، باشە چۆن دەبێ تاوەکو ئەمڕۆ نەزانین "د. وەلید حەمدی"، کە کتێبێکی ئاوەها گرنگی لەسەر کورد و کوردستان نووسیوە، چ کەسێکە و خەڵکی کوێ بووە و چ کارە بووە؟ ئەوەتا لە بابەتەکەی ئەم کتێبەدا د. کەمال زۆر بە ئاسانی بۆی ئاشکرا کردووین، بە سەد حەیفو مخابنەوە ئینجا تێدەگەین، د. وەلید حەمدی کوردێکی خەڵکی هەولێرە، وەکو زۆر لە ڕۆشنبیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی رابردووی ئەم شارە وا پێدەچێ ئەویش ناچاربووبێ

شارەکەی خۆی جێ هێشتبێ و ئاکنجی بەغدا بووبێ، بڕوا بکەن لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم هەواڵە، بەشێوازە نووسینە تایبەتییەکەی د.کەمال، بەدەست خۆم نەبوو دامە پرمەی گریان.

ئەگەر ئەو کتێبە هەندێك دواکەوتبێ، هەرچەند بەتەنیا گوناهی منی تێدا نییە، بڕوا بکەن نابێ هەر بە تەنیا داوای لێبووردن لە د. کەمال و ئێوەی بەڕێز بکەم، بەڵکو دەبێ بەرایی زۆر داوای لێبووردن و گەردەن ئازادی لە "رەحیمە مەلا زادە"ی هاوسەرم و ئینجا "فاتیمە سالح ئەحمەد"ی دایکم بکەم، کە ئەو ماوەیە بەتەواوی ژیانم لە یەکەمیان ئاڵۆز کردبوو و ئەوەندەش ئاگام لەدووەمیان نەمابوو، ئەوەش، هەر بۆ ئەوەبوو کارێکی بێ هەڵەو پوخت و رێك و پێکتان بخەینە بەردەست، شەوو رۆژ خەریك بووینە، لەوانەیە لاتان سەیر بێت ئەگەر بڵێم تەنانەت لەو کاتانەدا کە چوومەتە میوانداری، یان ماڵە باو و خەزووران‌م، وەکو هەر قوتابییەکی سەرەتایی، ئەو کتێبەمان لەگەڵ خۆمان بردووە، لەو ساتانەدا کە خەڵکی دیکە خەریکی کات بەسەربردن دەبوون، ئێمەش کارمان لەم کتێبەدا دەکرد.

لێرەدا دەبێ سوپاسێکی تایبەتی "ئەیوب محەمەد بابەکر"ی کارمەندی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان بکەین، چونکە دەتوانم بڵێم هاریکاری ئەو نەبووایە قەت پێم وانییە ئەو (ئەمانەت)یەم پێبگەیشتبووایە شوێنی خۆی.

دواجاریش دەڵێم دە تۆخوا (مێژوو) گیان ئەوەشمان بۆ تۆمار بکە: واڵەسەدەی بیست و یەکەم دلین و دوای (١٧) ساڵ لەحوکمی خۆماڵی، کە نامەوێ بڵێم لە شانسی ئەم کتێبە بووە، بەم زستانە وشکە ساڵییە هەندێ جار، بۆ ماوەی مانگێکیش پتر، شەو و رۆژ تەنیا بۆ تاقە سەعاتێکیش چییە رووناکایی کارەبامان تێدا نەبینیوە...! لەکاتژمێر ٢,٣٥ شەوی ٢٠٠٨/٥/٥دا، ئەو چەند لاپەڕانەی ئەو (کەشکول)ەمان، کە لێرەدا ناوونیشانی (پێشکۆتن)مان داوەتێ، لەبەر رووناکایی لایتێکی دەستی نووسیوەتەوە.

لەگەڵ رێزی زۆرم بۆ هەموو لایەك، لەخوا دەپاڕێمەوە کە ئاواتەکانی هەریەك لە ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و ئەوانی دیکەمان بۆ بێنیتەدی و وڵات ئاوەدان.

# پێشەکی

دەمێ ساڵ بوو تامەزرۆی ئەوە بووم بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتەکانی هەندەران و جەنگ و موستەعمەرات و فڕۆکەوانی و هتد و دەزگا فەرمییەکانی بەریتانیا، دەربارەی کورد و کوردستان، بە چاوی خۆم ببینم، بەر لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو ئەوە یەکێك لە هاندەرە سەرەکییەکانم بوو بۆ داواکردنی ساڵێك تەفەروغی زانستی لە ئینگلتەرە، بەڵام لەناو مامۆستایانی تردا، کە دووانیان وەك من کورد بوون، من تاکە کەس بووم وەزارەتی خوێندنی باڵا لە عیراق داواکەی ڕەت کردمەوە.

لە ناوەندی ساڵی ڕابردووەوە، بەهۆی نەخۆشییەوە، بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ڕێگەم کەوتە ئەم وڵاتە، چەند مانگێکم لە مانچستەر بە هاتوچۆی نەخۆشخانەو لای ئەم پزیشك و ئەو پزیشك بردەسەر، دوای ئەوە هاتمە لەندەن بەو نیازەی لە ئەرشیفی نیشتمانیی بەریتانیدا کار لەو بەڵگەنامانە بکەم. ئەوەی لەم ماوە کورتەدا دیومن گەلێك لەوە زۆرترو دەوڵەمەندترن کە چاوەڕوانی بووم، بە ڕاستی ئەو ئەرشیڤە زەریایەکی بێ بن و دانسقەیە، تا لێی هەڵێنجی کەمە، لەگەڵ شەهلای هاوسەرمدا هەموو بەیانییەك، یەکشەموان نەبێ[1]،لە سەعات نۆ بەدواوە تا دەوروبەری سەعات پێنج، یا شەشی ئێوارێ لەوێ دەبەینەسەر بێ ئەوەی کەم و زۆر، یەکێکمان وەڕس بین یا هەست بە ماندوێتی بکەین، هەموو ڕۆژ بە هەگبەیەکی پڕو دڵێکی خۆشەوە دەگەڕێینەوە.

---

(1) تەنها یەکشەموان ڕۆژی پشووی دەزگای بەڵگەنامەکانە، لە کاتێکدا دەزگا فەرمێکانی تری میری حەفتانە دوو ڕۆژ پشوویان هەیە، دوو شەموان و چوار شەموان و پێنج شەموان و هەینی لە سەعات نۆی بەیانییەوە دەرگەی دەزگاکە لەبەردەم صەدان توێژەردا ئاواڵە دەکرێ، سێ شەموان لە سەعات دەوەو شەموانیش لە سەعات نۆو نیوەوەو دووشەموان و چوارشەموان و هەینی و شەموان تا سەعات پێنج و سێ شەموان و پێنجشەموانیش تا سەعات حەوتی ئێوارە کار دەکات، واتا ئەوەی بیەوێ دەتوانێ بە لایەنی کەمەوە حەوت سەعات لەگەڵ ئەو بەڵگەنامانەدا خەریك بێ.

لە ڕۆژانی یەکەمەوە بیرم هاتەسەر ئەوەی دەربارەی ئەم کارەم، بۆ یەکێك لە گۆڤار یا ڕۆژنامەکانی لای خۆمان، وتارێکی گشتی بنووسم، بەڵام کار بە وتارەوە نەوەستا، چونکە هەر ساتەی شتێکی ئەوتۆ دەدۆزیتەوە، کورد واتەنی: لە قوتوی هیچ عەتارێکدا نیین. لێرەدا وەك بەڵگە تەنها دوو نموونەی چاوەڕوان نەکراو دەخەمە بەرچاو، یەکەمیان ئەوەیە کە سەرجەمی بەڵگەنامە نهێنییەکانی فایلێکی سەربەخۆی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا تەرخان کراوە بۆ بابەتی هێرشێکی کورد، لە ڕۆژی دوازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤١دا، بۆ سەر گوندی سندوری جوولەکان لە ناوچەی دهۆکدا[2]، هێرشەکە بۆتە هۆی کوژرانی حەوت جوولەکەو برینداربوونی پێنجی تریان. من بەش بەحاڵی خۆم هیچم دەربارەی ئەم بابەتە نەبیستبوو، هەرچەندە ڕووداوەکانی کوردستانی باشووری چلەکانی ئەو سەدەیە، لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە، سەرنجیان ڕاکێشاوم و لە بەرهەمەکانی خۆمدا، چ بە کوردیو چ بە عەرەبی یان بە ڕووسی، باسیانم کردووە، تەنانەت ئەو ڕووداوانە بەشێکی سەرەکیی بەرگی دووەمی تێزی دوکتۆرا نامەکەم پێك دێنن کە کۆتایی ساڵی ١٩٦٩ لە مۆسکۆ موناقەشە کراو کەسێکیش لە بەشدارارانی سەرەکی ئەو موناقەشەیە، کە دووانیان جوو بوون[3]، نە لە

---

(2) N.A., F.O., 371/27099, Kurdish attak on Jewish village 1914, Iraq, File No. E627

(3) مەبەستم هەردوو ڕۆژهەڵاتناسی ناسراوی سۆڤێتی میرسکی و دانتیگە، کە هەردووکیان بەرهەمی بەنرخیان دەربارەی مێژووی هاوچەرخی عیراق بڵاوکردۆتەوە.

(*) ((سندور: گوندێکی پڕ لەڕەزو باغ و داروبارە، بەچەند کیلۆمەترێك کەوتۆتە سەرووی دەربەندەکەی دهۆك، کە ئێستا ناوڕێژی دهۆکی لەسەر دروستکراوەو بۆتە شوێنێکی گەشت و گوزار. لەولاوە تری ڕێگا سەرەکییەکەی ئێستای سندور ئەشکەوتی (چارستێن)ی دیرێکییە، تۆزێك لەولاوە تر، هەر لەسەر ڕێگاکەی سندور، گوندی بادێیە، بۆیە لەبارەیەوە پەیوەندیم بە(ئیسماعیل بادی)ی ڕۆژنامەنووسی هاوکارمەوە کرد، ئەویش گوتی: سندور ئێستاکە لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بەشارەدێی (زاوێتە)یە، کاتی خۆیشی ئێمە لەسەر شەڕەفی (د.محەمەد عەلی سوێرەکی)ی کوردیی ئوردنی و هاوکارانمان ڕەفیق و سەدیق ساڵح، بەخت یاوەرمان بوو و هەموومان بەناو ئەو گوندەدا تێپەڕ بووین، ئای کە گوندێکی خۆش بووە، نازانم بۆ هەموو ئەو ئاواییانەی لەکوردستان جووەکان تێیدا دانیشتبوون ئەوەندە خۆش بووە؟ ـــ ع. زەنگەنە)).

دووړو نـه لـه نزیکـەوه، ئاماژەیـان بـەوه نـەکرد، هەرچـەنده ئەوسـاکه بابـەتی فەلەستین‌و زایۆنیزم به گەرمی له ئارادا بوو. وێڕای ئـەوه، بـەش بـەحاڵی خـۆم، نـاوی گونـده کوردسـتانییەکەم بـه دروسـتی نـەدەزانی، بۆیـەکا ناچـار بـووم لـه لەندەنەوه تەلەفۆنم بۆ برای بەڕێز مامۆستا سەلاح سەعدوڵلا کرد، کـه بـۆ خـۆی خـەڵکی شارۆچـکەی زاخـۆی سـەر بـه دهۆکـه، نـەبا بکەومـه هەڵـەوه، کەچـی ئینگلیزەکـان بـەوردی کەوتوونەتـه سـۆراخی کوشـتاری جووەکـانی سـندور[*]، تەنانەت ئەدمۆندسی خـاوەنی ((کـورد و تـورك و عـەرەب))، کـه ئـەو ڕۆژانـه لـه عـیراق کارمەنـدێکی دەسترۆیـشتوو و ڕاوێـژکاری وەزارەتـی نـاوخۆ بـوو، ڕۆژی یازدەی شوباتی ۱۹٤۱ ڕاپۆرتێکی سەربەخۆی لەمەڕ ئەو کارەساته بۆ کاپتەن ڤ. هۆڵت (V.Holt)[4] ناردووه. یەکێکی تر له بەڵگەنامەکانی ناو فایلەکه بـه ڕوونـی بایـەخی بەسـەرهاتی سـندور نیـشان دەدات، چـونکه وێنـەی لێ نێـردراوه بـۆ کاربەدەستانی ئینگلیز له قودس[5].

بەو جۆره ئینگلیز دەچنه بنج‌و بناوانی ڕووداوەکه تا لەوه دڵنیا دەبن که هیچ بزووێنێکی سیاسی له ئارادا نییـه، بـەڵکو کۆنـەقین‌و دووبـەرەکی نێـوان شـوان‌و گاوانی کـورد و جووەکـانی ئـەو ناوچـەیه تـەنها لەسـەر لـەوەڕو لـەوەڕگا بـووه. شایانی باسه ئەدمونـدس لـه ڕاپۆرتەکـەی خۆیـدا بەتایبـەتی ئامـاژەی بـۆ نـاوی سـەعید ئاغـای دۆسـکی کـردووەو دەڵـێ: ئـەو ئـاگری بـن کـای سـەرجەمی گۆبەنـدەکانی ناوچـەکەیه، بـەڵام ئـەمجارەیان ((نامەیـەکی تایبـەتیی بـۆ خـۆم ناردووەو تێیدا ناڕەزایی خۆی دەربارەی کوشتارەکەی سندور دەربڕیـوه)). لـه ڕاپۆرتەکەیدا ئەدمۆنـدس لەسـەری دەڕواو دەڵـێ: ((هیـوادارم ئـەم هەڵوێـستەی سەعید ئاغا ڕاست بێ نەك یاری))[6].

---

(4) مەبەست ڤیڤیان هۆڵته که له ناوەندی بیستەکانی سەدەی ڕابردووەوه جێگەی مس بێڵی بەناوبانگی گرتەوەو ماوەیەکی زۆر وەك کارمەندێکی دەسترۆیشتوو له عیراق کاری دەکرد.

(5) N.A., F.O., 371/27099, Kurdish attak on Jewish Village 1941, Iraq, File No. E627, P.4, Ministry of the interior, Baghdad, 11th. February, 1941.

(6) Ibid, P.4.

زۆر بە کورتی باسی نموونەی دووەم دەکەم، پێم وایە ئەمیشیان تا ڕادەیەکی زۆر شتێکی چاوەڕوان نەکراوە. باڵوێزخانەی بەریتانیا لە ئەنقەرەی پایتەختی تورکیاوە ڕۆژی پازدەی مارتی ساڵی ١٩٥٢ ڕاپۆرتێکی بەم ناونیشانەوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا لە لەندەن ناردووە:

((پێوەندییە سیاسییەکانی نێوان تورکیاو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.
کارتێکردنی ئێزگەی دەنگی ئەمەریکا لە کورد و ئەرمەن))[7].

ناوەرۆکی ئەم بەڵگەنامەیە بە وردی باسی ئەوە دەکات کە ئێزگەی ((دەنگی ئەمەریکا)) پرۆگرامەکانی بە کوردیو ئەرمەنیش بڵاودەکاتەوەو ئەوەیش بۆتە هاندەرێکی تری بزووانەدنی هەستی نەتەوەیی کوردو ئەرمەن و ڕیسواکردنی سیاسەتی شۆڤێنییانەی حوکمەتی تورکیا، وێڕای ئەوەی ئێزگەی ناوبراو دەیەوێ لە ڕێگەی پرۆگرامەکانییەوە بەرهەڵستیی نفوزی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا بەگشتیو لەناو کوردو ئەرمەندا بە تایبەتی بکات.

ژمارەیەکی زۆر کەم، لە دڵسۆزانی کورد، دەستیان گەیشتۆتە بەشێك لەم گەنجینە گەورەیە، هی وەك خوالێخۆشبوو "محەمەد ڕەسوڵ هاوار" بۆ بەرگی دووەمی شێخ مەحموودەکەیو ئەو بەرگەی لەسەر سمکۆی شکاك نووسیویە، پێشتریش د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر لە دووتوێی کتێبی کوردستان لەسەردەمی ئاشتیدا کۆمەڵێك بەڵگەنامەی بڵاوکردبۆوە، هەروەها بەڕێز کاك "سەباحی غالب"یش وێنەی چوار هەزارێك لەو بەڵگەنامانەی گرتۆتەوە کە دەربارەی سیاسەتی بەریتانیان بەرامبەر چارەنووسی کوردستانی باشوور تایبەت لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، بەڵام هێشتا کورد پێویستیی بە دەیان دڵسۆزی تری وەك ئەوان هەیە تا لەڕێگەی سامانی بێشوماری ئەو بەڵگەنامانەوە وردترو قووڵتر لە مێژووی نوێو هاوچەرخی کوردستانو دۆستو دوژمنی گەلەکەمان تێبگەین، پێم وایە ئەم بەرهەمەی منیش بەڵگەیەکی سەلمێنەری ئەو بۆچوونەیە.

---

(7) N.A., F.O., 371/101855, Political relations between Turkey and US, effect of ((Voice of America)) broadcasts in Kurdish and Armenian, 1952, British Embassy, Ankara, 15th march 1952.

بێگومان دەبوو تا ئێستە دەیان ڕووناکبیری کورد بە پەرۆشەوە ڕوویان لەم دەزگایە بکردایە، هەی وەك پسپۆڕانو خزمو کەسوکاری ڕابەرانی کوردو ئەو کەسانەی مێژووی باووباپیرانیان شێوێنراوە، پتر لە هەمووانیش ئەو برایانە گلەییان دێتە سەر، کە سالآنێکە لە بەریتانیا دەژینو ئینگلیزییەکی باش فێر بوون، کەچی ئەوانەیان کە بەتایبەتی لێم پرسیون، لە برایانی خۆشەویست "سەباحی غالب" و "ئەنوەری سولتانی" و "شێرکۆ حەبیب" بەولاوە پێموایە کەسێکیان زیارەتی ئەم پەرستگا کەم وێنەیان نەکردووە، هەرچەندە هەی وایان تێدایە، بەپێوانەی لەندەن، تەنها چەند بستێك لەولای باڵەخانەی ئەرشیفەکەوە دەژین.

لەوەیش زۆرتر سەرم لەوە سووڕ دەمێنێ چۆن ئەرمەنەکان تا ئێستە وەك پێویستە بەو جۆرە کەلکیان لە بەلگەنامەکانی ئەم ئەرشیفە، بۆ تۆژینەوەی مێژووی نوێو هاوچەرخی گەلەکەیان، وەرنەگرتووە، هەرچەندە ئەوان لە سەدەی نۆزدەوە بە دەیان هەزاریان لە ڕۆژئاوا دەژینو شارەزاو خوێندەواریان لە ناودا یەکجار زۆرە، بۆ خۆیشیان، وەك گەلێکی زۆرلێکراو، زۆر بایەخ بە سەرجەمی قۆناغەکانی مێژووی گەلەکەیان دەدەن. وێڕای ئەوە پێم وایە دیپلۆماسییەکانی بەریتانیا بایەخیان بە بەسەرهاتی هیچ وڵاتێکی ڕۆژهەلات نەداوە بە ڕادەی ئەو بایەخەی بە ئەرمینیایان داوە، بۆیەکا بە خەروار بەلگەنامەی دەگمەنیان لەو بارەیەوە هەیە. ئەوەی لە گەلێك لە لاپەڕەکانی ئەم بەرهەمەیشدا ڕەنگی داوەتەوە. شایانی باسە ناوەڕۆکی چەند بەلگەنامەیەکی ناو ئەو ئەرشیفەم بۆ هاوڕێی بەڕێزم "هەمبەرسۆم ئۆگانیسیان" خوێندۆتەوە کە بەڕاستی بە هەموویان حەپەسا، هەرچەندە بۆ خۆی یەکێکە لەو کەسانەی کتێبخانەیەکی مێژوویی دەولەمەندی دەربارەی ڕۆژهەلاتی نزیكو ناوەڕاست هەیەو تەنانەت پردی پێوەندیی نێوان ئەوو من، بە گۆڕەپانی مێژوودا تێپەڕی.

باوەڕ ناکەم هیچ کارێکی لەم بابەتە بێکۆسپو تەگەرە بچێتە سەر، جاری وا هەیە بەلگەنامەکە هێند کالە لەوانە نییە بخوێندرێتەوە چ جای ئەوەی وێنەی لەسەر بگیرێتەوە. لێرەدا یەك نموونەی ئەو ڕاستییە دەخەمە بەرچاو. ڕۆژی

بیستو نۆی نیسانی ۲۰۰۷ لە فایلێکدا کارمان دەکرد، کە بۆ بەشێك لە هەڵوێستی حوکمەتی بەعس لە ڕۆژانی یەکەمی دوای کودێتاکەی هەشتی شوباتی ساڵی ۱۹٦۳ تەرخان کراوە، لەو فایلەدا ڕاپۆرتێکی زۆر گەورە هەیە[8] دەربارەی ئەو وەفدەی بە سەرۆکایەتی مام جەلال کە دوای کەوتنی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم بە چەند ڕۆژێك بۆ بەغدا چووە، بایەخی نهێنییەکانی ناو ئەو ڕاپۆرتە لە نرخاندن نایەت، بەڵام وێنەکانی سەرجەمی لاپەڕەکانی ڕاپۆرتەکە هێند کاڵ دەرچوون کە تەنانەت بە زەرەبینیش زۆر بە زەحمەت توانیمان شتێکی کەمیان لێ هەڵبکرێنین‌و ناچار بووین یەك دوو سەعات بە وێنەگرتنی لاپەڕەکانییەوە خەریك بین، چونکە لاپەڕەی وایان تێدایە بەش بەش نزیکەی دە وێنەمان لەسەری گرتۆتەوە[9] (*).

وێڕای ئەوە بەڵگەنامەی بایەخدار هەن کە بەداخەوە لەبەر هەر هۆیەك بێ فەوتاون. لێرەیشدا نموونەیەك دەهێنمەوە. کاتێك بەدووی بەڵگەنامەکانی سییەکانی سەدەی ڕابردوودا دەگەڕام لە لاپەڕە ٤۳۷ی بەرگی دووەمی ئەو پێڕستەی بۆ نامەو پێوەندییەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا لەساڵی ۱۹۳۸دا تەرخان کراوە[10] ئەم ناونیشانە سەرنجی ڕاکێشام: ((عیراق... باری ئێستەی شیوعی، ئیجرائاتی یاسایی دژی کۆمۆنیستەکان))[11]. ئەو هەوڵە زۆرەی بۆ دۆزینەوەی ئەو بەڵگەنامەیە دام هەمووی بە فیڕۆ چوو، بۆیەکا

---

(8) N.A., F.O., 371/170447,

((المذكرة التي قدمها الطالباني باسم الوفد الكردي الى مفاوضات القاهرة بتأريخ ۸ نيسان ۱۹٦۳))، ص۱٥+۸.

(9) دەربارەی زانیارییەکانی ناو ئەو ڕاپۆرتە بڕوانە: بابەتی هەشتەمی ئەم بەرهەمە.

(*) ((لەبەر گرنگی ئەم بەڵگەنامەیە، هەرچۆنێك بوو دەقەکەیان وەکو خۆی بە ڕێنووسی نوێ نووسیوەتەوە و لەگەڵ پاشکۆی ژمارە (۱۰)ی ئەم کتێبەدا دامان ناوە–ع.زەنگەنە)).

(10) ((Index to the Correspondence of the Foreign Office for the year 1938)), Part II, London, 1969, P.437.

(11) Iraq- Communist Situation, Penalties against communists: Penal Code amendments, E8843/ E6358 /47/93.

ناچاربووم پەنا بۆ کارمەندانی ئەرشیفەکە بەرم، دوای هەوڵێکی زۆری ئەوانیش، دەرکەوت بەڵگەنامەی ناوبراو نەماوە، جا ئیتر یا دزراوە یا لەبەر هەر هۆیەکی تر، وەك گەلێك بەڵگەنامەی تر، فەوتاوە.

بەڕاستی کە کارمەندانی ئەرشیفەکە باسی ئەوەیان بۆ کردم چۆن لە بارەگا کۆنەکەی ئەرشیف ژمارەیەکی زۆر بەڵگەنامە دزراوە، ئەوساکە تێگەیشتم بۆچ بارەگا نوێیەکەی بەو هەموو کامێراو ئەمرازی ئەلکترۆنییە تەنراوەو بۆچ سەرجەمی خوێنەران بەر لە چوونە ژوورەوەیان و دوای تەواوکردنی کارەکانیان و ڕۆیشتنیان وا بەوردی لەلایەن کارمەندانی دەزگاکەوە دەپشکنرێن.

لە وەرگێڕانی بەڵگەنامەکاندا هەوڵم داوە لە دەقی ناوەڕۆکیان لانەدەم، بەڵام وەرگێڕان هونەرێکی دژوارو سەختە، لە وێژەی هەموو کەسێکیشدا نییە، بەتایبەت ئەگەر وەرگێڕانەکە لە زوبانی ئینگلیزییەوە بێت، کە زوبانێکی گەلێك دەوڵەمەندو فراوانە، فەرهەنگی ئێستەی، دەیان و دەیان هەزار وشەو زاراو دەبێ و لە دەوڵەمەندیدا زوبانی یەکەمی جیهانە، چونکە قۆناغی سەرمایەداری لە وڵاتی ئینگلیز دەستی پێکردو لە ئەمەریکایش کۆتایی سەدەی نۆزدە گەیشتە لقەپۆپە، زوبانی فەرمیی ئەو وڵاتەش دیسانەوە ئینگلیزیە– جا ئەگەر کۆتایی سەدە ناوەنجییەکان ژمارەی وشەو زاراوی ئینگلیزی خۆی دابێت لە نزیکەی دوو سەدو پەنجا هەزارێك و لە ڕۆژگاری "شکسپیر"یشدا گەیشتبێتە دەورووبەری چوار سەد هەزارێك، ئەوا ئیمڕۆکە "شکسپیر"ی گەورە، بۆ خۆیشی زیندوو بێتەوە، نیوەی شاگردێکی ناوەندیی وڵاتەکەی ئینگلیزی نازانێت، هەرچەندە ئەو شاگردەیش هەروا بە ئاسانی لە چیرۆکە بەرزەکانی "شکسپیر" تێناگات[12]. نووسەری بەناوبانگی تری وەك "هـ. ج. وێلز" و "برناردشۆ" هێندەی تر زمانی ئینگلیزییان دەوڵەمەند کرد. جگە لەوە وشەی ئەوتۆ هەیە دەیان مانای هەیەو بە دەیان

---

(12) بە هەمان دەستوور شاگردێکی قرگەی لای خۆیشمان ئیمڕۆکە دەتوانێت گەلێك وشەی بەکارهاتوو لە زمانی کوردیدا لە شەرەفخانی بدلیسیو ئەحمەدی خانیو نالیو مەلای جزیریو سالمو کەڵە شاعیرو نووسەرەکانی ئەوسای لای خۆمان بپرسێت بێ ئەوەی بتوانن وەڵامی بدەنەوە، هی وەك تەلەفۆن و شەمەندەفەرو فڕۆکەو ئۆتومبیلو مەترەلیۆز، تا دەگاتە مۆبایلو ئینتەرنێت.

شێواز بەکار دەهێنرێت، ئەوەی ئەرکی وەرگێڕ دژوارتر دەکات، وەك بەڵگە لە چەند شوێنێکی بابەتەکانی ئەم بەرهەمەدا ژمارەیەك نموونەم خستۆتە بەرچاو. جگە لەوە قۆناغ لەدوای قۆناغ بە هەزاران وشە لەکار کەوتوون، تەنانەت کاتێك لە ئەرشیفەکە داوا لە یەکێك لە شارەزایانی زمان دەکەیت، زاراوێك یا وشەیەکت بۆ لێکداتەوە، یەکسەر لێت دەپرسێت ئەو زاراوە یا ئەو وشەیە هی چ چاخێکە؟ دوای ئەوە ئینجا لە ((فەرهەنگی ئۆکسفۆرد))دا بە دوایدا دەگەڕێت.

مەبەستم، لەم باسە دوورو درێژەدا، ئەوەیە نیشانی بدەم وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە کارێکی هەروا ئاسان نییە، بە تایبەت ئەگەر بێتو ئەوەی دەتەوێت وەری بگێڕێت بەرهەمی خامەی ئەو دیپلۆماسییە لێهاتووانە بێت کە سەرجەمیان لەوسەری زمانەکەیان دەهاتنەوە. هەر بۆ ئەوەی مەبەستە دوورو نزیکەکانی بەڵگەنامە نهێنییەکان وەك خۆیان ڕابگەیێنم زۆرو کەم سڵم لە بەکارهێنانی وشەو زاراوی ئینگلیزی و تایبەت عەرەبی نەکردۆتەوە، چونکە ڕاگەیاندنی ناوەرۆکی بەڵگەنامەکان مەبەستی سەرەکیی ئەم بەرهەمەیە.

ماوەتەوە سەر چەند خاڵێك کە دەبێ بەر لە کۆتایی ئەم پێشەکییە ئاماژەیان بۆ بکەم. بە دەستووری زمانی ئەم بەرهەمە زۆر پابەندی هاوسەنگیی بابەتەکانی نەبووم، دوای ئەمانەتی زانستی بایەخم داوە بەو پرسانەی ڕەوایی خەباتی نەتەوەی کوردو ئەوپەڕی کورتبینی دوژمنانی دەخەنە ڕوو، بۆیەکا ئەو بابەتانەی پێوەندییان بە سیاسەتی فەرمانڕەوایانی شۆڤێنی ناوچەکەوە هەیە، لە سەروو هەموویشیانەوە توندڕەوانی تورك و عەرەب، درێژتر دەرچوون لەوانی تر. هەروەها نیازم بوو ڕۆژانەکانی[13] "مێجەر نۆییڵ"یش تێهەڵکێشی دوا بابەتیان بکەم، بەڵام گەورەیی ئەو مرۆڤ دۆستە خۆی داسەپاندو بابەتێکی سەربەخۆی بۆ تەرخان کرا. بە هیچ جۆر گومانم نییە کە قوتابییەکی کوردی گەر ئینگلیزی بزانێ دەتوانێ بە نامەیەکی دوکتۆرای گەورەو بەکەڵك کتێبخانەی کوردی بڕازێنێتەوە.

---

(13) وابزانم وشەی ڕۆژانەی کوردی واتای (يوميات)ی عەرەبیو (Diary)ی ئینگلیزی دەبەخشێ، کورد دەڵێن: ڕۆژانەی منداڵ، یا ڕۆژانەی کرێکاران کە دەقاودەق بەرانبەر (يومية العمال)ی عەرەبی بەکار دەهێنرێت.

بێگومان خوێنەر بەئاسانی هەست دەکات چۆن لەم بەرهەمەدا بایەخێکی تایبەتی بە خەباتی نەتەوەیی کوردی تورکیا دراوە، هەرچی لەو بەڵگەنامانەدا دەربارەی ئەو خەباتە گوتراون پتر ئەو بیرۆکەیە دەچەسپێنن کە گەلێك جار لە نووسینەکانمدا دەربارەی بایەخی بێئەندازەو دواڕۆژی گەشی کوردستانی باکوور گوتوومن، هەر لەبەر ئەوەیشە لە داڕشتنی لایەنە جیاوازەکانی ئەم بابەتەیشدا ئاوڕمان لە هاوسەنگی نەداوەتەوە، چونکە شتی دڵخۆشکەر لەم بووارەیشدا زۆر زۆرە، حەز دەکەم لێرەدا شتێك بگێڕمەوە: ڕۆژێکیان بەڵگەنامەیەکی بێئەندازە بایەخدارم دەربارەی ئەم بابەتە دۆزییەوە، بە ڕاستی دیسانەوە چاوەڕوان نەبووم ئینگلیزەکان بەو ڕادەیە بایەخ بدەنە هەموو شتێك، ئەو ڕۆژە بەر لە هەمووان برای دێرین و هاوبیرم (جەلالی عومەری سام ئاغا)م بیرکەوتەوە، هەر کە گەڕامەوە ماڵێ یەکسەر لە لەندەنەوە تەلەفونم بۆی کردو ئەو مژدەیەم دایێ و دوورودرێژ باسی ناوەڕۆك و بایەخی بەڵگەنامەکەم بۆی کرد. دڵنیام ئەگەر کاتی خۆی وەك ئێستە بەڵگەنامەکانی ئەم ئەرشیڤەم لەبەر دەست بوایە، ئەوساکە سەرجەمی بەرهەمە بڵاوکراوەکانم گەورەترو بەسوودتر دەبوون، وەك بەڵگەیش ڕەنگبێ هێندە بەس بێت گەر بڵێم تا ئێستە دەیان بەڵگەنامەی بایەخدارم دەربارەی کوردستانێتی کەرکوك دۆزیوەتەوە، کە بەشێکیان ڕاپۆرتی گەورەو سەربەخۆن، هەڵبەت کاتی خۆی ئەوانەم بدیبایە بەرگی یەکەمی کتێبەکەم، دەربارەی کەرکووك و دەوروبەری، دەوڵەمەندتر دەبوو.

بە نیازی ڕوونکردنەوەی هەمەلایەنیی دەقی بەڵگەنامەکانیش بە پێویستمان زانی، چ لە ناوەڕۆکداو چ لە پەراوێزدا، بە کورتی یا تێرو تەسەل، بەپێی سروشتی بابەتەکە، ڕوونکردنەوە پێشکەشی خوێنەر بکەین و گەلێك جار پێوەندیم بەزۆر کەسی وەك برایان: دوکتۆر ئەمین موتابچی و محەمەد سەعید خەفاف و دوکتۆر ئیبراهیم داقوقی(*) و دوکتۆر عەبدولڕەحمان

(*) ((د.ئیبراهیم داقوقی، دوای ئەو نووسینەی د. کەمال لە ٢٠٠٨/١/١٧، لە (ڤیەننا)ی پایتەختی نەمسا کۆچی دوایی کردووە. ناوبراو ڕۆشنبیرێك بوو لەسەر تورکمانان حیساب بوو، چەند کتێبێکی

مەعرووف[*] و عەبدوڵڵا زەنگەنەو شێخ ئەحمەدی نەقشبەندیو بابەکر پشدەرییو تاهیر حەیدەری[**] و کەسانی ترەوە کردووە، بۆ ئەوەی هەڵە نەکەوێتە نێو ئەو روونکردنەوانەوە کە هەموو کات بوونەتە هۆی زۆربوونی ژمارەی پەراوێزەکانو دووپات بوونەوەی ڕستەی روونکەرەوە کە بەناوی خۆمەوە لە ناوەرۆکی بەڵگەنامەکاندا خستوومنەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە.

بەر لەوەی کۆتایی بەم پێشەکییە بهێنم، حەز دەکەم ئەوەیش بڵێم: بە درێژایی خەریکبوونی ئەمجارەم لەگەڵ بەڵگەنامەکانی حوکمەتی بەریتانیادا بە پەرۆشەوە عەودالی هەر شتێك بووم لەوانەبێ ببێتە وانەیەکی مێژوویی بەکەڵكو پێویست بۆ نەتەوەی کورد بەگشتیو بۆ ڕابەرانی ئیمڕۆو دواڕۆژی نەتەوەکەمان بە تایبەتی.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم سوپاسی هەریەك لە بەڕێزان: مام جەلال و دوکتۆر طاهر البکاء[14] و دوکتۆر فوئاد مەعصوم و دکتۆر بەرهەم ساڵح و

---

لەبواری ڕاگەیاندن هەیە، پێموایە بڕوانامە باڵاکەیشی هەر لەم بووارەدا بووە، زیاتر لە ٣٠ کتێبی چاپکراوی بە زمانی عەرەبی و تورکمانی هەیە، بەر لە کۆچی دواییشی کتێبێکی لە بارەی گەلی کورد نووسیوە، ئەوەی من بیستوومە لەسەر ئەو کتێبە دەسەڵاتدارانی تورکیا هاتووچۆی ئەو وڵاتەیان لێ قەدەغە کردبوو. بەم دواییانەش وەزارەتی ڕۆشنبیری بە تەمابوو و لە بەرنامەی دابوو ئەو کتێبەی بۆ چاپ بکا. ناوبراو نەك هەر دۆستێکی نزیکی کورد بوو، بەڵکو پیاوێکی متمانەپێکراوو زاوای کوردو د.ئەمین موتابچی بووە، ئیسماعیل عەلی هاوکارمان ڕۆژی کۆچی دواییەکەی بۆ دیارکردووین – ع. زەنگەنە)).

(*) ((دیارە مەبەستی د. ئاوڕەحمانی حاجی مارفە، کە ئەویش ئەم کتێبەی د. کەمالی بەچاوی خۆی نەبینی، ئەوەبوو لە ٢٠٠٧/٨/٧ دا لە شاری سلێمانی، بەکارەساتی ئۆتۆمبیل کۆچی دوایی کرد — ع. زەنگەنە))

(**) ((تاهیر حەیدەری: هەمان ئەو تاهیر شەهباز حەیدەرییەیە، کە د. کەمال لەشوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا ناوی هێناوە، دەکاتە باوکی شەملاخانی (هاویەش)م لە ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا، کاتی خۆیشی زۆر وەزیفەی میری بینیوە– ع. زەنگەنە)).

(14) دکتۆر طاهر البکاء بە لایەنی کەمەوە حەفتەی چوار جاران، لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوە تەلەفۆنم بۆ دەکات تا بزانێ کارەکەم لە ئەرشیفی بەڵگەنامەکان بەکوێ گەیشتووە.

دکتۆر ئەمین موتابچی[15] و جەلالی عومەری سام ئاغاو فاروقی مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسووڵ و زرنگی کوڕی و کاکە زێزگی نەوەی نەقشبەندێکان و کاکە ئاریی نەوەی بەرزەنجی و بابان و قەزازەکان بکەم، کە لە بەڵگەنامەکاندا ناوی باووباپیرانیان زوو زوو دووپات دەبێتەوە، بە ڕاستی یاریدەو پشتگیریی دڵسۆزانەو هەمەجۆری ئەو زاتانە نەبووایە ئەم بەرهەمە لەدایک نەدەبوو، لە وێنەیان هەر زۆر بێ.

لە کۆتاییشدا جارێکی تر پەنا دەبەمەوە بەر نەقشی بەردێکی باوکی گەورەی مێژوونووسیی کوردی شەرەفخانی بدلیسیو لە زمان ئەوی پایە بڵندەوە منیش دەڵێم:

((لە زانایانی پیاوچاک و دڵپاکو بەوەج دەپاڕێمەوە زۆر بە وردی لە نووسینەکەم وردببنەوەو ئەگەر پەشێوییەکیان بەرچاو کەوت بەشێوەیەکی مەردانە بەراوردی بکەن. خۆ ئەگەر هەڵەو لەبیرچوونێکم لەسەر دەدۆزنەوە هەر بە گاڵتە پێکردنو تیزو تەشەر لێم نەقۆزنەوە، پیاوەتیم لەگەڵ بکەنو بە پارچەیەکی چاکترو بزگوڕێکی تازەترو پاکژ بۆم پینە بکەن))[16].

---

(15) دوکتۆر ئەمین موتابچی، کە بۆ خۆی لە لەندەن دەژی، هەموو شەوێك دوای گەڕانەوەمان بە ماوەیەك تەلەفونم بۆ دەکات تا پوختەی ئەنجامی کارەکانی ئەو ڕۆژەمانی پێبڵێم، پێموایە خەو لەچاوی دەپەڕێ گەر شەوێك لە شەوان سەرگوزشتەی خەباتی کوردی بەپێی ئەو بەڵگەنامانە بۆ نەهۆنمەوە.

(16) بڕوانە: کەمال مەزهەر، مێژوو. کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو، بەغدا، ١٩٨٣، ل٢٦٠.

ئینگلیز، وەك پێشرەوی ڕژێمی سەرمایەداری و شارستانییەتی نوێ، بەر لە هەمووان کەوتنە بایەخدان بە بەڵگەنامە فەرمییەکانیان و کۆکردنەوەو پۆلێن کردنیان بۆ ئەوەی کاربەدەستو شارەزاو شاگردانی خوێندنی باڵاو کەسانی تر سوودیان لێ وەربگرن.

ئەوەبوو ساڵی ١٨٣٨، بەپێی فەرمانێکی باڵای میریی، دەزگایەکی سەربەخۆ بەناوی ((Public Record Office)) (دایەرەی فایلە گشتییەکان– دائرة السجلات العامة)ەوە لە لەندەن دامەزرێنرا کە ساڵی ٢٠٠٣ ناوەکەی گۆڕدرا بە (( The National Archives)) (ئەرشیڤی نیشتمانیی)، هەر ئەو ساڵەیش مەڵبەندی دەزگای ناوبراو لە ناوەڕاستی شارەوە گوێزرایەوە شوێنێکی دڵگیرو هێمنی قەراغ شار.

لەم دەزگایەدا چەندان ملیار بەڵگەنامەو دەستنووسو ڕاپۆرتو نامەی دیپلۆماسیو بڕیاری دادگا بەرزەکانو نەخشەی وڵاتانو وێنەی ڕابەرانو کتێبی دانسقەو دەگمەن بەشێوازێکی زانستی هەڵگیراون، بە تەنها ژمارەی فایلو ئەو پاکەتە گەورانەی بەڵگەنامەکانیان تێدا پارێزراوە، نزیکەی دە ملیۆنە، گەلێك لەو فایلانە لە چەند بەشێك پێکهاتوون، هەر فایلەو هەر پاکەتەی سەدان بەڵگەنامەیان تێدایە، ژمارەی ناوی کتێبو دەسنووسو گۆڤارە کۆنو دەگمەنەکانی کتێبخانەی ئەرشیڤەکە خۆی لە ٦٥ هەزار ناو دەدا، وێڕای نزیکەی ١٥٠ هەزار مایکرۆفلیم، کە هۆڵێکی گەورەو سەربەخۆی تەنراو بە دەیان کارمەندو کۆمپیوتەرو نوێترینو پێشکەوتووترین ئامێری تری بۆ تەرخان کراوە. جارجارە ناوی کوردیش لەو مایکرۆفلیمانەدا دێ کە باسی عیراقو تورکیاو بەتایبەت ئێران دەکەن. شتی ئەوتۆ لەناو بەڵگەنامەکانی ئەم دەزگایەدا هەن کە لەوانەیە کەس بە بیریدا نەیەت، هی وەك مێژووی خواردنەوەو دروستکردنی جۆرەکانی ویسکیو شەرابو بیرەو شەمپانیا لە ئینگلتەرە لە نێوان ساڵانی ١٦٩٠و ١٩٢٠دا.

مەڵبەندە قەشەنگەکەی ئەم دەزگایە، کە لە سەیرانگەیەکی کەم وێنەی ئەم دونیایە دەکات، کەوتۆتە شوێنێکی ڕازاوەو دڵگیری لەندەنەوە، ڕۆژانە پۆل پۆل توریستی بیانی ڕووی تێدەکەنو بە هۆڵەکانیدا دەیانگێڕن بێئەوەی ورتەیان لێوە بێ، لەوە دەکات بۆ نوێژ چووبنە ناو مزگەوت یا کڵێسەوە.

یەکشەموان‌و ڕۆژانی جەژن نەبێ، ئیتر ساڵ دوازدەی مانگ دەروازەی ئەم دەزگایە لە سەعات نۆ یا دەی بەیانییەوە تا سەعات پێنج، یا حەوتی ئێواریێ بۆ پسپۆرو شارەزایان‌و ئەو خوێندکارانەی تەمەنیان لە چواردە ساڵ کەمتر نەبێ کراوەیە، هەریەکەیان بۆی هەیە ڕۆژانە سێ دانە سێ دانە چەندی بویێ‌و هێند فایل وەربگریێ‌و بێدەنگ کاریان لەسەر بکات‌و بە پارە چیی بویێ وێنەی بۆ بگرنەوەو مافی ئەوەشت هەیە بۆ خۆت کامێرای تایبەتی لەگەڵ خۆتدا بەری‌و بە خۆڕایی وێنەکان بگریتەوە. بە سەدان کارمەند لەم دەزگایەدا کار دەکەن کە بەشێکیان بۆ یاریدەدانی خوێنەران تەرخان کراون، چیت بویێ ئاسانکاریت بۆ دەکەن‌و بە روویەکی خۆشەوە یاریدەت دەدەن. شوێنێك تەرخان کراوە بۆ پێشکەش کردنی فەرهەنگ بۆ ئەوانەی پێویستیان پێیەتی، لەو بەشەی ئەرشیڤەکەدا ٤٤٠ فەرهەنگی هەمەجۆری تێدایە بۆ وەرگێڕانی زوبانی ئینگلیزی بۆ سەر ژمارەی هەرە زۆری زوبانەکانی دونیا، تەنها چەند زوبانێك نەبێ کە بەداخەوە زمانی کوردیش یەکێکیانە، کارمەندانی ئەو بەشە پێیان سەیر بوو کە باسی دوو فەرهەنگە ناوازەکەی دوکتۆر شەفیق قەزازو مامۆستا سەلاح سەعدوڵلام[*] بۆیان کردو پێم ڕاگەیاندن کە (شارەزوور)ەکەی یەکەمیان ساڵی ٢٠٠٠ چاپکراوەو نزیکەی شازدە هەزار وشەو زاراوی تێدایە، ئەوەی دووەمیشیان لە ((المورد))ی بەناوبانگی عەرەبی گەورەترەو تا ئێستە دووجاران چاپکراوەتەوەو ئیزگە بەناوبانگەکەی خۆیان، واتا ئیزگەی لەندەن، کاتی خۆی باسی دەرچوونی کردووە[1].

---

(*) (("سەلاح سەعدوڵلا" لە ٢٠٠٧/١٠/١٨دا کۆچی دوایی کردووە، بەداخەوە ئەویش ئەم کتێبەی بەچاوی خۆی نەبینی، جارێکیان باسی ئەم پەراوێزەی د. کەمالم بۆی کردبوو زۆر دڵی پێی خۆش بوو، بەداخەوەم مەرگ مەودای ئەویشی نەدا فەرهەنگەکەی بۆ ئەم ئەرشیفە بنێریێ ـ ع. زەنگەنە)).

(1) دڵنیام لەوەی کاك سەلاح‌و دوکتۆر شەفیق بەمە بزانن بۆ خۆیان بێ دواخستن ئەو دوو فەرهەنگەیان بۆ دەنێرن. شایانی گوتنە میرزا توفیق قەزاز یەکێکە لەو ڕابەرانەی دەیان جار ناوی لە بەڵگەنامەکانی تایبەت بە شەڕی بەردەرکی سەراو ئەنجامەکانی هاتووە، بۆ خۆم چەند ساڵێك لەمەوبەر بە پشتیوانی بەڵگەنامەیەکی نهێنی وتارێکی سەربەخۆم دەربارەی هەڵوێستێکی کوردانەی ئەو زاتە بڵاو کردەوە، وێڕای ئەوەی چەند جارێکی تریش ناوی لە نووسینەکانمدا هاتووە. بە وێنە بڕوانە: کەمال



**کەمال مەزهەر لەنێو مەڵبەندی ئەرشیفی بەریتانیا لە کاتی ئیشکردندا...**

ئەوانەی روو دەکەنە ئەم ئەرشیفە بۆ کارکردن لە بەڵگەنامەکانیدا لە رۆژی یەکەمەوە پێناسەیەکی تایبەتییان لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا بۆ دروست دەکەن کە وێنەکەی سەر پێناسەکە خۆیان بە کامێرای ئەلکترۆنی بێپارە بۆتی دەگرن‌و ژمارەو نیشانەی تایبەتیی لەسەر دادەنێن کە ئەمرازە ئەلیکترۆنیەکان بەچرکەیەك دەیخوێننەوەو رێگەی چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەت بۆ ئاسان دەکەن، ماوەی ئەو پێناسەیە سێ ساڵەو هەموو کەس، دوای تەواوبوونی ئەو سێ ساڵە، زۆر بەئاسانی دەتوانێ پێناسەکەی نوێ بکاتەوە.

چێشتخانەیەکی دڵگیرو فراوان، کە پتر لە سەد کەس دەگرێت، تەرخان کراوە بۆ نان خواردن‌و چاو قاوەو شیرینی‌و ساردەمەنی خواردنەوە بێ ریز بەستن،

---

مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ل١٦٠، ١٦٨، ٢١٠، ٣٧٤–٣٧٥، ٣٧٧، ٣٧٩.

وێڕای ئەوە لە بەیانییەوە تا ئێوارێ ئاوی مەعدەنیو شیری سارد لە تێرمۆزدا بە خۆڕایی وا لەبەردەم هەمووان‌دا. پێم وایە خەڵکەکە وا تێکەڵ بە کارەکەیان دەبن کە هیچ هەست بە کات نەکەن، ماڵیان هەزار جار ئاوا.

ڕۆژانە ژمارەیەکی زۆر لە توریستی بیانی، دەستە دەستە خەڵکی خۆیشیان، روو دەکەنە ئەم ئەرشیڤەو لە تەك یەکێك لە کارمەندان ماوەیەکی زۆر بە گەڕانێکی بێ چرپە بە هۆڵەکانیدا دەسووڕێنەوە، جاری واش هەیە شاگردانی فێرگەکان، لەگەڵ مامۆستاکانیاندا، دێنە سەردانی، تەنانەت ڕۆژێکیان ژمارەیەك کچ و کوڕی کەڕو لاڵیشم دی هاتبوون بۆ زیارەت، بە ئیشارەتەکانیاندا هەستت دەکرد هەم دڵخۆشن، هەم حەپەساون.

لەبەر دەم باڵەخانەی ئەرشیڤەکەدا زەریاچەیەکی نازداری پڕ لە تەیرو تواڵ هەیە، وێڕای چەند ڕیزە قەنەفەیەك بۆ حەوانەوەی ئەو کەسانە تەرخان کراون کە دەیانەوێ بەدەم جگەرەکێشانەوە، یا بێ جگەرەش، کەمێك بای باڵی خۆیان بدەن. سەد مەترێك لەولای زەریاچەکەوە دوو پارکی گەورەو خاوێنی ئوتومبیل ڕاگرتن هەیە، یەکەمیان تایبەتە بە ئوتومبیلی کارمەندانی ئەرشیڤەکە، ئەوی تریشیان بۆ ئوتومبیلی توێژەرو توریستو کەسانی ترە کە دەتوانن چەندیان بوێ هێند ئوتومبیلەکانیانی لێ ڕاگرن بێ ئەوەی پولێك بدەن، ئەوە لەکاتێکدا وەستانی ئوتومبیل لە وێستگەکانی تری لەندەندا بە سەعاتەو یەکجار گران لەسەر خاوەنەکانیان دەکەوێ. هەمان کات ژمارەیەك پاس و میترۆ لە زۆر ناوچەی لەندەنەوە روو دەکەنە ئەرشیڤی نیشتمانی. کۆگایەکی قەشەنگیش تەرخان کراوە بۆ فرۆشتنی قەڵەمو کاغەزی هەمە جۆرو دەفتەرو زەرفو زەرەبینو ڕۆژنامەو گۆڤارو ئەو جۆرە شتانە بە نرخی بازاڕ، ئەو کۆگایە کەوتۆتە نزیك دەروازەی دەرەوەی دەزگاکەوە.

بەیانی کە چوویتە ژوورێ پێویستە هەر شتێکی زیادت پێ بێت بیانبەیتە مەخزەنێك کە ژمارەیەکی زۆر دۆڵابی تێدایە، بە دڵی خۆت یەکێکیان هەڵدەبژێریتو شتەکانی تێدەخەیتو دەرگاکەی دادەخەیتو کلیلە تایبەتییەکەی لەگەڵ خۆتدا دەبەیت، ئینجا کاغەزو قەڵەمو چاویلکەو ئەو شتانەی پێویستت دەبن،



دەبێ چ بەڵگەنامەیەکی نوێی دیکەی دۆزیبێتەوە...!؟

هی وەك دەرمان، دەیانخەیتە ناو کیسەیەکی نایلۆنی سپیی تەنکەوە کە خۆیان بۆیان داناویتو دوای ئەوەی بە ڕێزەوە دەیپشکنن سەر دەکەوێتە نهۆمی دووەم، لەوێش لە ژوورێکی درێژکۆلەی شووشەدا دۆلابی تایبەتیی خۆتت هەیە ئەو فایلانەت تێدا داناوە کە هێشتا کاریان لەسەر دەکەیت، وەك وتمان سێ لەو فایلانە دەبەیتو ئینجا دەچیتە هۆڵی خوێندنەوە کە مێزی گەورەی تێدایەو هەر مێزەی دابەش کراوە بەسەر هەشت مێزی پانو بەرینی بچووکتردا بۆ هەشت توێژەر، هەموو مێزێکیشیان ژمارەی خۆیان لەسەرە، منو شەهلا لەسەر مێزی ژمارە یەك ئەلفو ژمارە یەك بێ لە تەنیشت یەکەوە کارمان دەکرد.

هەمیشە لەو هۆڵەدا ژمارەیەك کارمەندی پیاوو ئافرەت، بە بەرگی تایبەتیی دەزگاکەوە، زۆر لەسەرەخۆ ماوە نا ماوەیەك دێنو دەچن نەبا یەکێك لە توێژەران پێویستی بە یاریدە بێ. ڕۆژی بیستو چواری نیسانی ۲۰۰۷ کاتێك کارم لە

بەڵگەنامەکانی ناو یەکێك لە فایلەکاندا دەکرد کە بەشێکی زۆریان تەرخان کراون بۆ بابەتی پرسی کورد لەبەردەم کۆنگرەی ئاشتیی پاریسی ساڵی ۱۹۱۹دا، دیم سێ بەڵگەنامەیان بە زوبانی فەرەنسین‌و زۆریش مەبەستم بوو بۆ ئەم کتێبەم لە ناوەرۆکیان تێبگەم، پەنام بردە بەر یەك دوو ئینگلیز کە لە نزیکمەوە کاریان دەکرد، بەڵام بەداخەوە کەسیان فەرەنسییان نەدەزانی، بۆیەکا ناچار بووم لە یەکێك لە سەرپەرشتکەرانی هۆڵەکە بپرسم کە ئایا لە حاڵەتی وادا ئەوان دەتوانن یاریدەم بدەن، لە وەڵامدا گوتی ئاسانەو ڕۆی، پاش پێنج شەش دەقیقە کارمەندێکی تر هات‌و بە ڕوویەکی خۆشەوە لە ناوەرۆکی بەڵگەنامەکانی گەیاندم[2].

ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەکانی ئەم ئەرشیڤە بە زوبانی فەرەنسین، بە نیسبەت کوردەوە بەدرخانییەکان بەشی هەرە زۆری نامەو یادداشتەکانی خۆیان بە فەرەنسی نووسیوە، بێگومان سەدان سەرچاوەی تری فەرەنسی دەربارەی گەلێك بابەت لە کتێبخانەو مایکرۆفلیمەکانی دەزگاکەدا هەیە. هەر لەم ڕۆژانەیشدا دوای ئەوەی برایان مامۆستا عەبدوڵلا زەنگەنەو دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلا لە پاریسەوە تەلەفۆنیان بۆ کردم بەوەم زانی کە دکتۆر نەجات کاتی خۆی بەتایبەتی لە پاریسەوە هاتۆتە لەندەن‌و ماوەیەك لە بەڵگەنامە فەرەنسییەکانی ئەرشیڤەکەدا، کە دەربارەی کوردن، کاری کردووەو لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاوی کردۆتەوە کە بەداخەوە من تاوەکو ئێستە ئەو کتێبەم نەدیوە، هەرچۆن بێ ناوی دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلاش دەچێتە سەر ئەو ناوە دەگمەنانەی ئەو کوردانەی کەڵکیان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی ((ئەرشیڤی نیشتمانیی حوکمەتی بەریتانیا)) وەرگرتووە.

دوکتور وەلید حەمدیش، ساڵی ۱۹۹۲ کتێبێکی ٤٣٢ لاپەڕەیی بەکەڵکی بەم ناونیشانەوە بڵاوکردۆتەوە ((الكرد وكُردستان في الوثائق البريطانية...دراسة تأريخية وثائقية))[3]. دوکتۆر وەلید بە یاریدەی بەشێك لە بەڵگەنامەکانی

---

(2) ئەو کارمەندە فەرەنسی زانە ناوی میخائیل برێین (Michail Brien)ە، گەلێك منەتبارم.

(3) لەسەر کتێبەکە نەنووسراوە لە کوێ چاپکراوە، تەنها لە کۆتایی ناوەرۆکیدا نووسراوە ((مطابع سجل العرب))، لە کۆتایی پێشەکیی دانەریشدا نووسراوە: لەندەن، ۱۹۹۱.



لەگەڵ دوو کارمەندی ئەرشیفی بەریتانیا، دوو دۆستی دیکە بۆ کورد...

وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا بابەتەکانی کتێبەکەی نووسیوەو هەڵیسەنگاندوون‌و زۆر لایەنی ڕەوای خەباتی کوردی نیشان داوەو لەسەر بەرگی یەکەمی نەخشەیەکی کوردستانی، بەپێی یەکێك لە بەڵگەنامە بەریتانییەکان داناوە، لەسەر بەرگی پشتەوەیشی وێنەی ئەو ئاڵایەی کوردستانی چاپکردووە کە ساڵی ١٩٢٧ ((کۆمەڵەی خۆیبوون)) (جمعية الاستقلال) دایناوە، وا دیارە هەردوو بەڕێزان کاك جەمال عەلەمدارو کاك ناجی کەتانی دەوریان لە بڵاوکردنەوەی ((کورد و کوردستان))ـەکەی دوکتۆر وەلید حەمدیدا گێڕاوە چونکە خاوەنی پێشکەشی ئەو دوو رووناکبیرە کوردەی کردووە.

ئەوەی دەربارەی دانەری ئەم کتێبەوە نەمدەزانی، لەو باوەڕەیشدام کەم کەس ئاگای لەو ڕاستییەیە، ئەوەتە کە دوکتۆر وەلید حەمدی کوردەو خەڵکی شاری هەولێرەو ناوی دروستی وەلید محەمەد سەعید ڕەئووفەو بەشی هەرە زۆری ژیانی لە بەغدا بردۆتە سەرو کۆلێجی سەربازیی لەوێ تەواو کردووەو تا پلەی ڕائید لە

سوپادا ماوەتەوەو ئینجا چۆتە ئینگلتەرەو لە لەندەن ژیانی بردۆتە سەرو تێکەڵی چالاکیی ڕێکخراوگەلی سیاسیی کوردی نەبووەو چەند بەرهەمێکی تری دەربارەی سنووری وڵاتانی کەنداوی وەك سعودییە و کوێت و قەتەر و بەحرەین هەیە، بە داخەوە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە لەندەن بووە بەژێر ئوتومبیلەوەو کۆچی دوایی کردووە[4].

جارجارە لە ((ئەرشیڤی نیشتمانیی حوکمەتی بەریتانیا))دا توێژەر تووشی شتی ناخۆشی چاوەڕواننەکراو دێ، کە لەوانەیە ئێمەومانان بەهیچ جۆر بە بەشێکیان ڕانەهاتبین، بە وێنە لە قەڵەمی ڕەش بەولاوە نابێ هیچ جۆرە قەڵەمێکی جاف یا پاندانێك لەگەڵ خۆتا بەریتە ژورێ، نابێ نە لاستیك، نە گوێزان، نە مەرەکەبی سپیی هەڵەکوژێنەوە، تەنانەت نابێ قەڵەم دادانیشت پێ بێ، جا خوای دەکرد هەزارو یەك هەڵەت دەکرد، خۆ ئەگەر هاتو قەڵەم دادانت[*] پێویست بوو ئەوساکە پێویستە لە هۆڵی خوێندنەوە بچیتە دەرێ، چونکە لە پرسگە ژمارەیەك قەڵەمدادانی هەمە جۆر بۆ ئەو کەسانە دانراون کە قەڵەمە ڕەشەکانیان کول بوون.

لەوەیش خراپتر: جاری وا هەیە هەڵەی زۆر زەقی چاوەڕواننەکراو کەوتۆتە ناو بەڵگەنامەکانەوە، لێرەدا نموونەیەکی سەیر دەهێنمەوە کە کەس بە بیریدا نایەت دیپلۆماسییەکی بەریتانی لە سەدەی بیستەمدا بکەوێتە هەڵەیەکی واوە– ڕۆژێکیان لەسەر فایلێکی گەورەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا بەم ناونیشانەوە کارم دەکرد ((ڕاپۆرتی کارگێڕیی ساڵی ۱۹۲۰ دەربارەی ناوچەی هەولێرو دەوروبەری)). ژمارەی لاپەڕەکانی ئەو فایلە ۲٤۷ لاپەڕەی گەورەیە، کە بەشێکیان هەردووك دیویان زانیارییان تێدایە. ڕاپۆرتەکە ٤١ لاپەڕەی گەورەیە

---

(4) لە لەندەن ئەم زانیارییانەم لە بەڕێز کاك هوشیار کەریمەوە پێگەیشت، گەلێك سوپاسی خۆی و هاوسەری و دوکتور نامیق محەمەد عەلی ڕەشیدی هاوڕێی نزیکیو دوکتورە رووپاك محەمەد عەلی ئەربیللیو نەوەیان دەکەم بۆ ئەو هەموو بابەخەی پێیان داین. شایانی باسە کاتی خۆی دوکتور نەجدەت نەزمەتی هاوڕێی نزیکی خوالێخۆشبوو دوکتور وەلید ئەو زانیاریانەی بۆ کاك هۆشیار گێڕاوەتەوە.

(*) ((دیارە مەبەستی قەڵەم تراشە–ع.زەنگەنە)).

دەربارەی زانیاری ئابووریو کۆمەلایەتیو سیاسیو خوێندنو تەندروستیو ئەوقافو شارەوانیی هەولێرو ناوچەکانی سەر بە هەولێر، بە کویسنجەقو قووشتەپەو کەندیناوەو مەخموورو گوێڕپشەوە، وێڕای گەورە پیاوانو ناودارانی هەموو ئەو ناوچانە، بەلام هەلە کەوتۆتە ناونیشانەکەیەوە کە لە بەرگەکەیدا لە بریتی ((ڕاپۆرتی کارگێڕیی سالی ١٩١٩...)) نووسراوە ((ڕاپۆرتی کارگێڕیی سالی ١٩٢٠...))[5]، ئەوەی زۆر ڕێی تێدەچێ بە شێوازێکی ئۆتۆماتیکی بەسەر تەنانەت خوێنەری وردیشدا تێپەڕێ.

هەلبەت لە شارێکی گەورەی وەك لەندەندا، کە ژمارەی دانیشتوانی حەوت ملیۆنە[6] و لە هەر چوارگۆشەی دونیاوە خەلکی رووی تێدەکەن، پیاوی عالی جەنابو ڕەسەنو زاناو بەخشندەو خواپەرست زۆرە، بەرانبەر بەوانیش پیاوخراپو فیلبازیش کەم نین، بە تایبەت لەناو ڕەشپێستو بێگانەکاندا بە کوردیشەوە، بەلام ئەوانەی لە ئەرشیڤی نیشتمانیی حوکمەتی بەریتانیادا کار دەکەن لەوە دەچێ سەرجەمیان دەستەبژێری ئەم ولاتە بن، هەرچەندە ژمارەیەکی وەبەرچاو ڕەش پێستو هندیو پاکستانیو بیانیی تریان تێدایە، لە هیچ بەشێك لە بەشەکانی ئەم دەزگایەدا رووگرژیم، نە لە پیاویانداو نە لە ئافرەتیاندا نەدیوە، بێگومان ئەوە کاری نەشارەزاو کەم شارەزایانی توێژەران تا ڕادەیەکی زۆر ئاسان دەکات، ئەوانەی تەنانەت نەوەت سالەو کەم ئەندامیشیان تێدایە. بۆیەکا بەئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم بەر لەوەی کۆتایی بەم بابەتە بهێنم زۆر بە گەرمی، لە قوولایی دلەوە سوپاسی سەرجەمی کاربەدەستو کارمەندانی ((ئەرشیڤی نیشتمانیی)) حوکمەتی بەریتانیا بکەم کە بەڕاستی نموونەنو هەمیشە خۆم بە قەرزارباریان دەزانم، هەموویان ببوونە هاوڕێمو بەدل حەزیان دەکرد دەستی یاریدەم بۆ درێژ بکەن، هی وەك ئیمتیاز

---

(5) ((N.A., F.O., 371/5069, Administration Report on the Arbil division for the year 1920)), Baghdad, printed at the Government Press, 1920.

(6) بەپێی ئامارە فەرمییەکان، ژمارەی دانیشتوانی هەموو ئینگیلتەرە، تا سالی پار، گەیشتۆتە ٦٠ ملیۆنو لەندەنیش ٧ ملیۆن.

ڕەفیع[7] Imtiz Rafi و میخائیل لیتل Michael Littleو سارا لی Sarah Leeو هێلین پای- سمیث Helen Pye- Smithو ڕێبیکا ویتال- ولیەمس Rebecca Whittal-Williamsو ئێمیلی وارد Emily Wardو میخائیل برێین Michail Brienو لاکمی غادە Lakmi Gadha[8] و گەلێکی تری وەك ئەوان کە هەرگیز نە خۆیان‌و نە هاوکارەکانیان لەیاد ناکەم.

هەمان کات لەناو ئەو توێژەرانەدا، کە زوو زوو دێنە ئەرشیف، ژمارەیەك هاوبیرو هاوکاری نوێم بۆ دروست بوون کە لەکاتی حەوانەوەدا من باسی کوردو کوردستان‌و عیراق‌و ئەوانیش باسی ولاتی خۆیانیان بۆ دەکردم، یەکێکیان بالوێزێکی بەناوبانگی ژاپۆن‌و یەکێکی تریشیان مامۆستای زانکۆیەکی کەنەدی بوو[9]. وێرای ژن‌و مێردێکی ئێسك سووکی ئوستورالیی، کە هەردووکیان پرۆفیسۆر بوون‌و تەنانەت شەوی بەر لە گەڕانەوەیان بۆ ولاتی خۆیان دانیشتنێکی ماڵئاوایی گەرمیان بۆ شەهلاو من کرد، هیوادارم ئەو کوردانەی لەمەودووا بۆ کاری زانستیی، وەك ئەمەی من، روو دەکەنە ئەم جۆرە ولاتانە شتێك شڕو شیتاڵی کوردەواریی لەگەڵ خۆیاندا بهێنن کە نرخیان لای ئەو جۆرە کەسانە زۆر بەرزە.

---

(7) پیاوێکی بە ساڵادا چووە، ئەندازیارە، چارەکە سەدەیەك دەبێت لەم ئەرشیفەدا کار دەکات، بە دڵ کوردی خۆش دەوێت.

(8) ئەمیش ئافرەتێکی قەرەیە، بیست ساڵ دەبێت کارمەندی ئەرشیفە، خەڵکی تۆگەندەی ڕۆژهەلاتی ئەفریقایە.

(9) ئەمیان موسڵمانەو ناوی ئەحمەد ئەمینو یووسفە Ahmed Aminu Yusuf.

بـه کـەوتنی ئەڵـەمانیاو هاوپەیمانـەکانی، لـە کۆتـایی جـەنگی یەکـەمی جیهانـدا، هـەروەها سـەرکەوتنی شۆڕشـی ئۆکتۆبـەری سۆشـیالیزمی لـە رووسـیاو فـەوتانی دەسـەڵاتی ئیتحادییـەکان لـە تورکیـاو لاوازبـوونی قاجارییـەکانی ئێـران، قۆنـاغێکی مێژوویی نویێ سەری هەڵداو گەلە ژێر دەستەو چەوساوەکانی وەك: کـوردو عـەرەب و ئازەرو ئەرمەن و ئاشووری و کلدان هیـوای ئـەوەیان پەیدا کـرد ئاواتـە نەتەوەییـە دێرینەکانیان بێنە دی. کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس، کە لە ڕۆژی هـەژدەی کـانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۱۹ەوە دەستی بەکارەکانی کرد، بووە مژدەبەخشی یەکەمی ئەو ئاواتەو هێندەی تر هەستی نەتەوەیی هەمووانی وروژاند.

نوێنەرانی کورد زۆر چالاکانە هاتنە ئەو گۆڕەپانـەوەو بـە شـێوازێکی نـەزانراو لـە مێژووی رابردوویاندا هەنگاوی چاکیان بەرەوپێش نا، ئەوەی سـەرنجی دیپلۆماسـی و ڕۆژنامەنووسـە بیانییـەکانی بـە لای خۆیـدا راکێـشاوەو لـە سەرەتایـشەوە بـووە بابـەتێکی پـڕ لـە زانیـاریی ئـەو بەڵگەنامـە دیپلۆماسـییە نهێنییانـەی حوکمـەتی بەریتانیا کە لە پاریس و ئەنقەرەو بەغداو تاران و واشنتۆن‌و شـوێنی تـرەوە پـەیتا پـــەیتا دەیاننـــاردە دەزگـــا فەرمییـــەکانی بـــەریتانیا لـــە لەنـــدەن، لەســـەروو هەموویشیانەوە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران.

بەو جۆرە لەسەرەتاوە کورد لای هەمووان بووە ژمارەیـەکی سـەنگدار، تـا کـار دەگات بەوەی ئینگلیزەکان لە ناوەندی ساڵی ۱۹۱۹دا پێشنیازی دانـانی والییـەکی کورد دەکەن بۆ شاری وان، یا لە شاری بدلیس، ئەوەی بووەتە ناونیشانی لاپەڕە هەشتی فایلی ژمارە ۱/۹٦/٦۰۸ی وەزارەتـی هەنـدەران، لاپـەڕە یـەکی ئـەو فایلـە گەورەیە، کە ژمارەی لاپەڕەکانی ٤۸۱لاپەڕەیە، بەم ناونیشانە دەست پێ دەکات ((بارودۆخی وان))و بەشی هەرە زۆریشی دەربارەی کوردو ئەرمەنە لەو ڕۆژگارە پڕ لە ئاڵوگۆڕەدا[1].

---

(1) N. A., F. O., 608/96/1, Peace Conference, British Delegation, Files 365/1/5 to 371/1/7, PP.1,8.

هەروەها ئەوسا فایلێکی گەورەی تری وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا بۆ چوار راپۆرت دەربارەی کوردستان و عێراق و ئێران تەرخان کراوە، ئەمە ناوونیشانی راپۆرتی دووەمیانە:

((٢. کوردستان ساڵی ١٩١٩، نهێنی، ناودارانی کوردستان)). لەو راپۆرتەدا ناوی ٢٣٠ ناوداری کورد هاتووە، وێڕای ٣٥ ناوداری تر لەبەشێکی تەواوکەری هەمان راپۆرتدا. بەڵگەنامەکە تیشکی خستۆتە سەر ژیاننامەی پیاوانی وەك: شەریف پاشا و دەستەو دایەرەکەی شێخ مەحموودو سمکۆو ئەو جۆرە رەهبەرانەی کورد کە شتیان لە باردا بوو، شتی ئەوتۆ لەوانەیە کەسمان تائێستا هیچیمان نەبیستبێ، وەك:

((١. عارف پاشا، ئەندامی (کۆمیتەی سەربەخۆیی کورد)ە لە میسر، سەرەتا لەگەڵ داواکانی جەنەڕاڵ شاریف پاشا نەبوو، بەڵام لە رێگەی نامەی محەمەد ساڵح حوسنییەوە پێوەندییان پەیدا کردو بەو هۆیەوە تا رادەیەك ناوی هاتە ناو ناوانەوە))[2].

((٢. محەمەد ساڵح حوسنی، زڕکوڕی جەنەڕاڵ شەریف پاشایەو لە میسر کاروباری موڵکەکانی ئەوو شازادە ئامینەخانی[*] هاوسەری بەڕێوە دەبات و بۆ

---

(2) N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan, June 1919, Published by Civil Commissioner's Office, Baghdad, 1919, P. 107.

(*) ((لەهەندێ سەرچاوەدا بە "أمینە" ناوی هاتووە، ئەوەی شایەنی باسە شەریف پاشا لەساڵی ١٨٦٥دا لەگەڕەکی ئوسکوداری ئەستەنبوڵ لەدایك بووە، لەژێر دەستی سەعید پاشای باوکی پێگەیشتووە. لە قوتابخانەی (گالاتەسەرای) خوێندوویە کە پێشتر باوکیشی تێیدا خوێندبووی...

ئەو قوتابخانەیەش تایبەت بووە بەمنداڵانی میرو پاشاکانی عوسمانی. شەریف پاشا خوێندنی سەربازی لەفەرەنسا بووە، ماوەیەك رۆژنامەی (مەشروتە)ی دەرکردووە، ناوبراو بەهاوسەرگیری لەگەڵ "أمینە خان" ئەوەندەی دیکە ناوبانگی دەرکردووە، چونکە ئەو ژنە کچی "عەباس حیلمی پاشای خدێوی میسر (١٨٤٨ – ١٨٥٤)) ی نەوەی "محەمەد عەلی پاشای گەورەی" والی میسر بووە، ئەو ئافرەتە جگە لەوەی کە کچی خانەوادەیەکی پلەو پایە کۆمەڵایەتی لێوەشاوە بووە، خۆیشی لێهاتوو و رۆشنبیر بوو. چەند زمانێکی زانیوە، لەو کۆمەڵانەدا کاری کردووە کە لە سوێد بەرگریان لەمافی ئافرەت کردووە،

خۆیشی لە میسرو بەسرە موڵکی هەیە، ماوەیەك نەقیب بوو لە لەشکری تورکداو دەڵێن سەرەتای جەنگ (جەنگی یەکەمی جیهان–ك.م.) لە پاریس لەگەڵ شەریف پاشای باوەپیارەیدا بووە کاتێك تورکێکی کوشتووە کە گوایە نێردرابوو بۆ تیرۆر کردنی شەریف پاشاو لەسەر ئەوە تورکەکان حوکمی لە سێدارەدانیان بۆی دەرکردووە. وا دیارە ئێستا (واتا ساڵی ١٩١٩–ك.م.) ئەندامی (کۆمیتەی سەربەخۆیی کورد)ە لە شاری ئەسکەندەرییە. مانگی مایسی ساڵی ١٩١٩ نامەی دەربارەی پرسی کورد ناردووە بۆ جەنەڕاڵ شەریف پاشا و پێی ڕاگەیاندووە وا چاکە ئەو هەنگاوانە بنرێن بۆ ئەوەی شەریف پاشا وەك میری کوردستان ناوزەد بکرێ. ئەو هەمان کات لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ عارف پاشادا هەیە، کە ئەویش لە میسرە، وا پێ دەچێ محەمەد ساڵح حوسنی برازای غالب بەگ بێ))[3].

((٣. عەلی غالب بەگ، سکرتێری شەخسیی شەریف پاشا بوو، واپێ دەچێ مامی محەمەد ساڵح حوسنی بێ. شەریف پاشا حەزی دەکرد بینێرێتە کوردستان بۆ ئامادەکردنی هۆزەکان بۆ هاوکاریی هاوپەیمانەکان و ڕاوێژیان بکات بۆ ئەوەی چۆن پێویستە وا بە باشی ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن، تایبەت لەگەڵ بەریتانیای گەورەدا.

---

تەنانەت "ڕۆهات ئالاکۆم" وا باسی دەکات لەساڵی ١٩١٩دا بووبێتە ئەندامی فەخری (کۆمەلا پێشکەتنا پیرەکێن کوردان) لە ئەستەنبوڵ.

"شەریف پاشا" لە "ئامینە خان" سێ کچی بووە، گەورەترینیان "شەریفە" بووە کە لەساڵی ١٨٩٣دا لەئەستەنبوڵ لەدایك بووەو دواتر شووی بە ئەو "ساڵح بەگ"ە کردووە کە هەر لەم کتێبەدا باسی کراوەو سکرتێرو پاسەوانی شەریف پاشا خۆی بووە. دووەمیشیان ناوی "سەعیدە" بووەو لەساڵی ١٨٩٩دا لەسوێد لەدایك بووە. هەرچی سێیەمیانە لەساڵی ١٩٠٢دا هەر لەسوێد لەدایك بووە. ئەوەی شایانی باسە (ژیانی شەریف پاشاو ڕۆڵی سیاسیی ئەو) لەلایەن "ساڵح محەمەد بادی"یەوە بەزمانی عەرەبی وەکو نامەی ماستەر پێشکەش بەزانکۆی دهۆك کراوە، ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین دواتر لەلایەن دەزگای (سپیرێز) چاپ و بڵاو کراوەتەوە – ع. زەنگەنە))

(3) Ibid, P. 130.

پێشنیازیشی بۆی کردووه بچێته میسر بۆ دیدەنیی مێجەر نۆییل و لەگەل بچێته حەڵەب وکوردستانی ڕۆژئاوا. وا پێ دەچێ ئەوەیشی خستبێته ئەستۆی عەلی غالب بەگ کە هۆزەکان هان بدات تا داوا بکەن شەریف پاشا بکرێتە میری کوردستان))[4].

٤. پتر لەوەی خوێنەر چاوەڕوان بێ بەڵگەنامەکان بە وردی عەودالی هەواڵەکانی سمایل ئاغای شکاک (سمکۆ) بوون، دەربارەی دەڵێن (بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان–ک.م.) دەیتوانی نزیکەی دوو هەزار چەکداری سوارەو پیادە کۆ بکاتەوە، بەڵام لەوانەیە ئێستا (واتا دوای نزیکەی پێنج ساڵان–ک.م.) ژمارەی پیاوەکانی نەگاتە لە صەدا دەی ئەو ژمارەیە..

لە ڕێگەی پۆستەوە بۆمبایەك بۆ سمکۆ نێردرا، وەك دەڵێن ئەو کارە پیلانی کاربەدەستانی حوکمەتی ئێرانی بوو، کاتێك ڕزمەکە دەکەنەوە ٢٥ کەس لە پیاوەکانی دەکوژرێن و ژمارەیەکی لەوەیش پتریان لێ زامدار دەبێ....

سمکۆ هەمیشە لە گوتەکانیدا خۆی وەك لایەنگری بەریتانییەکان نیشان دەدات[5].

پاش چەند ساڵێك بەڵگەنامەیەکی نهێنی تری حوکمەتی بەریتانیا بەهەمان دەستوور دێتەوە سەرباسی سمکۆی شکاك و دەڵێ: ((ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ) ڕەهبەرێکی کوردی بەناوبانگە، ساڵ و نیوێك دەبێ ناوی زۆر لە نێو ناواندا نییە، بەڵام هەرچۆن بێ هەموو دەم لەوانەیە بێتەوە مەیدان و هێندەی شێخ مەحموود لە سلێمانی و باشوور گێرمەو کێشە بۆ حوکمەتی ئێران و تەنانەت عێراقیش بنێتەوە))[6].

لەبەر ئەوەی شێخ مەحموود هەوڵی دابوو پێوەندیی بە کۆنگرەی ئاشتیی پاریسەوە بکات، دەبوو بەریتانیەکان لەم ڕووەوە پتر بایەخی پێ بدەن.

---

(4) Ibid, P. 113.

(5) Ibid, P. 118.

(6) N. A., F. O., 251/93, G. Jebb Report, 11th July, 1926, Part IV, Memorandum on Iraq-Persian Border, PP. 3, 234.




**کارتی نوێنەرایەتی ڕەشید زەکی کابان بۆ کۆنگرەی ئاشتی ١٩١٩ لەپاریس**

**سەرچاوە: دیاریی خالید ڕەشید کابان بۆ کتێبی (ئەلبوومی شێخ مەحموودی حەفید).**

**لە ڕاپۆرتەکەی ساڵی ١٩١٩یاندا کە بۆ ناودارانی کورد تەرخان کراوە دەربارەی شێخی بەردەقارەمان دەڵێن:**

**((سەید ئەحمەدی بەرزنجی خزمی شێخ مەحموودە، لەلایەن شێخەوە وەك وەفدی کوردستانی باشوور نێردرا بۆ لای جەنەڕاڵ شەریف پاشا بە نیازی ئەوەی عەرزی نیدی کوردی باشوور بۆ کونگرەی ئاشتی (لە پاریس–ك.م.).بکات، لە میسر، بەهۆی یاخیبوونەکەی شێخ مەحموودەوە، ڕێگەی پێ نەدرا بچێتە پاریس. سەید ئەحمەد (لەو سەفەرەیدا–ع.زەنگەنە) ڕەشید زەکی بەگی لەگەڵ بوو))(7)(*).**

**بەر لەوە بە دوو لاپەڕە دەربارەی ڕەشید زەکی بەگ، دەڵێ:**

---

(7) N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan.., PP. 39,140.

**(*) ((ئەو ڕێ پێنەدانە لە بێروت بووە نەوەك لە میسر، بەم دواییانە هاوکارمان د. نەجاتی عەبدوڵلا ئەو بەڵگەنامانەی لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا دۆزیوەتەوە کە لەسەر ئەم پرسەن، هەموو ئەو بەڵگەنامانە لە دووتویێ کتێبێکدا بەناونیشانی (شێخ مەحموودی حەفیدزادە لە بەڵگەنامەی فەرەنسیدا) لە (بنکەی ژین) بڵاوکراونەتەوە –ع.زەنگەنە)).**

((خزمی شێخ مەحموودە. لەلایەن شێخەوە وەك وەفدی كوردستانی باشوور لە تەك سەید ئەحمەددا ناردی بۆ لای شەریف پاشا بەو نیازەی دیدی كوردی باشوور عەرزی كۆنفرانسی ئاشتی بكەن. لە ڕێگە، لە میسر بە هۆی یاخی بوونەكەی شێخ مەحموودەوە، ڕێگەی پێ نەدرا بچێتە پاریس))[8].

بە دەستووری سمكۆ و هەر دوای ناوی ئەو، بەڵگەنامەیەكی نهێنیی تری حوكمەتی بەریتانیا پاش چەند ساڵێك دێتەوە سەر ناوی شێخ مەحموودو بە بایەخێكی تەنانەت لەوسایش زووترەوە دەربارەی دەڵێ:

((حوكمەتی عیراق و بەریتانییەكان بەردەوام هەوڵ دەدەن بۆ قایل كردنی حوكمەتی ئێرانیو خودی ڕەزاشا بۆ هاریكاریی لەگەڵیاندا بۆ بەدیل گرتنی شێخ مەحموود كە هۆزە كوردەكانی ئێرانیش هاریكاریی دەكەن وێڕای میری قاجاری شێتۆكە[9]، سالار الدولە..فڕۆكەوانێك و میكانیكییەكی ئینگلیز لەلایەن پیاوەكانی شێخ مەحموودەوە بە دیل گیراون و بردوویاننەتە ناو خاكی ئێرانەوە))[10].

لەبەر گەلێك هۆ دەبوو ئەوەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بە شێوازێكی تایبەتیی سەرنجی نووسەرانی ئەو ڕۆژگارەی ڕاپۆرتە نهێنییەكانی بەریتانیا ڕابكێشن. ڕاپۆرتەكەی ساڵی ١٩١٩ ئەمەی دەربارەی شێخ عوبەیدوڵڵا خۆی گوتووە:

((لەشكری شێخ عوبەیدوڵڵا، سەرەتای هەشتاكانی سەدەی نۆزدە، خۆی دەدا لە ٣٠ هەزار چەكدار، دوای نوشوستی هێنانی ڕاپەڕینەكەی دوورخرایەوە بۆ ئەستەموول و تا كۆچی دوایی لەگەڵ شێخ عەبدولقادری كوڕە گەورەكەیدا لەوێ

---

(8) Ibid, PP. 37,138.

(9) لە دەقی بەڵگەنامەكەدا وا هاتووە mad Qajar Prince Salar-ed-Dowleh شایانی گوتنە سالار ئەلدەولەی قاجاری، كە لە دایكەوە كورد بوو، چاوی بڕیبووە تەختی پاشایی قاجاری و كوردستانی ئێرانیشی كردبووە یەكێك لە بنكەكانی كۆششی بۆ جێبەجێكردنی ئەو ئاواتەی، ژمارەیەك سەرەك هۆزی كوردیش لەو بووارەدا هاریكارییان دەكرد.

(10) N. A., F. O., 251/93, G. Jebb Report, 11th July, 1926, Part IV, Memorandum on Iraq-Persian Border, PP.5, 235.

مایەوە[*]. عەبدولقادر، دوای کۆچی باوکی، لە ئەستەموول مایەوەو بووە ئەندامی پەرلەمانی ڕژێمی نوێی ئەو وڵاتە (مەبەستی ڕژێمی ئیتیحادییەکانە—ک.م.). ئێستایش (واتا ساڵی ١٩١٩—ک.م.) ئەندامێکی ناسراوی ئەو کۆمەڵە کوردییەی ئەستەمووڵە، کە بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێدەکۆشێ. پێوەندیی لەگەڵ سەید تەهادا خراپە))(11).

لێرەدا بەڵگەنامەکە زانیارییەکی بایەخداری بۆ تۆمار کردووین دەربارەی کەڵەکەبوونی سەرمایە (تراكم الرأسمال) لە کوردستان، کەڵەکەبوونی سەرمایەش دیاردەیەکی ئابووری—کۆمەڵایەتی—سیاسیی گرنگەو یەکێکە لە ئەنجامەکانی تێکەڵبوونی کوردستان بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهانەوە. بەڵگەنامەکە لەو بارەیەوە دەڵێ:

((شێخ صدیقی کوڕە پچووکی عوبەیدوڵڵا لە کوردستان مایەوە (واتا وەك عەبدولقادری برای لە ئەستەمۆل لەگەڵ باوکیدا نەبوو— ک. م) و لە جێگەی باوکی کە دوورخرابۆوە بووە سەرۆکی هۆزەکەیان. وەك دەڵێن گەورەترین قاچاغچیی تووتنە لە سەرانسەری جیهانداو حسێبی بانقی خۆی هەیە لە ئینگلتەرە لە ((National and Provincial Bank)) ، کۆشکێکی لە نەهرییو یەکێکی تری لە قارتوونە دروست کردووە، ساڵی ١٩٠٧ کۆچی دوایی کردووە))(12).

هەمان بەڵگەنامە ئەم زانیارییە وردو دەگمەنانەی دەربارەی سەید تەها بۆ تۆمار کردووین:

((سەید تەها پیاوێکی زۆر کەتەو قەڵەوە، تەمەنی نزیکەی بیستوهەشت ساڵە، بەڵام گەورەتر دیارە. بەرگی ئەورووپی دەپۆشێ، وا دیارە مرۆڤێکی خۆش مەشرەبەو دانیشتن لەگەڵی زۆر خۆشە. بەر لە جەنگی (یەکەمی جیهان—ک.م.) پێوەندیی گەلێك نزیکی لەگەڵ رووسەکاندا هەبوو، جارێکیان میوانی شەرەفی کونسوڵی رووسی بوو، بۆ خۆی دەڵێ تەنانەت لەو ڕۆژانەیشدا هەر بۆ دامەزراندنی

---

(*) ((بۆ ئەم پرسە لە بابەتی چوارەمدا پەراوێزمان نووسیوە— ع.زەنگەنە)).

(11) N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan, PP. 40, 141.

(12) Ibid.

دەوڵەتی کورد کاری کردووەو هەستی بەوە کردووە کە پڕۆژەیەکی وا بۆی هەیە تەنها بەحیمایەتی رووسیا سەر بگرێ، چونکە رووسەکان دەریانخستووە ئەوان دەتوانن گەلێك لە ئێرانییەکان پتر نیزامپارێز بن. لەم ڕۆژانەدا دەنگوباوێك هەیە گوایە سەید تەها بوویێتە گاور[*]، ئەو لە ڕاوبۆچوونە ئاینییەکانیدا بە هیچ جۆر توندڕەو نییە هەرچەندە بۆ خۆی نەمەشروب خۆرەو نەجگەرەش دەکێشێ.

کە کۆبەندەکەی ورمێ هەڵگیرسا هەموو ئەڵەمانەکانی ئەو شارە پەنایان بردە بەر سەید تەها، ئەویش باش پێشوازیی لێ کردن. ئێستاکە ئەو دوای فشارێکی زۆرو درێژخایەنی تورك و رووسی (بۆلشەفیك–ك.م.) سەرچاوەی ژیانی بە جارێك کۆرِدراوەو هێزو دەسەلاتی تا ڕادەیەکی زۆر لاواز بوون، کۆشکەکەی لە نەهری کاول کراوە، شەمدینانیش لەلایەن رووسە (سپییەکانەوە–ك.م.) تالاَن کراوە، نیوەی پیاوەکانیشی یا بڵاوەیان لێ کردووە یا کوژراون، لەلایەکی ترەوە ئەم دیاردەیە سەرجەمی کوردستانی گرتۆتەوە، بەڵام ئەو ژمارە کەمەی ئێستا لەگەڵی ماون لە جاران باشتر چەکدارن، بەشێکیش لە پیاوەکانی باوکی وان لەژێر کاریگەریی شێخ عەبدولقادری (مامیدا–ك.م.) کە پێوەندییان خۆش نییە. لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا هێشتا نفوزی سەید تەها زۆر گەورەیەو دەتوانێت ئەو ناوچەیە دابین بکات کە کەوتۆتە نێوان باش قەڵاو ڕەواندزو ئوشنۆ (شنۆ– ك.م.) و ورمێوەو بەگشتی لە کوردستاندا پیاوێکی ڕێزدارەو قەدری ئایینی هەیە. ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ)ی ڕەهبەری شکاك لەرێی ژنخوازییەوە خزمێکی نزیکی سەید تەهایەو هەمان کات دوو هاوڕێی گیانی بەگیانین.

---

(*) ((بەپێی نامەیەك، کە سەید تەها بۆ حوزنی موکریانی ناردووەو من خۆم لای خانەوادەی مامۆستا گیوی موکریانی دیومە، دەبێ سەید تەها دۆستی زۆر نزیکی ئەو (دکتۆر سەعیدی کوردستانی)یە بووبێ کە لەچارەگی یەکەمی سەدەی ڕابردوودا لەئیسلام هەڵگەڕاوەتەوەو ببووە دیان، تەنانەت دواتر کە سەید تەها، لەکۆتایی سییەکاندا، وازی لەوەزیفەی قائیمقامی ڕەواندز هێناو چووە تاران، لەوێ هەڵسان و دانیشتنی زۆرتر لەگەڵ ئەو کەسە بووە. تەنانەت لەنامەکەیدا باسی ئەوەی کردووە کە د. سەعید حەزی کردووە خەڵك بکاتە کریستیان. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوە بووبێ ئەو دەنگ و باوە بڵاوبووبێتەوە – ع. زەنگەنە)).

سەید تەها موڵکێکی زۆری لە دەشتی ورمێ هەیەو بەپێی نەریتی بنەماڵەکەی دژ بە ئێرانەو بەرژەوەندییەکانیشی توندو تۆڵ بەستراوەتەوە بە کوردەکانی ئازەربایجانەوە.

زۆر زەحمەتە بتوانین بە وردی وێنەی دەروونی (سەید تەها–ک.م.) بکێشین. دوکتۆر ویگرام[13]، بەکەسێکی نزمی کەم وێنەی لە قەڵەم داوە. هەرچۆن بێ ویگرام بۆ خۆی سەید تەهای نەدیوەو بۆچوونەکەی لەسەر بنچینەیەکی زۆر لایەنگرانەی بەسەرهاتێکی گاورەکان داڕشتووە.

مایسی ساڵی ١٩١٩ کاتێك سەید تەها سەردانی ڕەواندزو بەغدای کرد هیچ نەبێ لە رووکەشدا خۆی باش نواندو مەودای نەدا بەهیچ جۆر گومانی لێ بکرێ، بێ ئیدیعاو ترۆفیز ئامادەیی خۆی دەربارەی کۆمەك کردن (لەگەڵماندا–ک.م.) نیشان دا. ئەگەر ئەمەی پۆز بوویێ ئەوا بێ ئەندازە سەرکەوتوو بوو لە نواندنی ڕۆڵەکەیدا. بیرویۆچوونی وردی هەیە، خوێندەوارێکی چاکە، کوردیو عەرەبی و کەمێك رووسیش دەزانێ. پێی وایە هەرچۆن بێ زۆر زەحمەتە هیچ بیرێکی ورد دەربارەی سیاسەتی دواڕۆژ داڕێژێ. لەوانەیە ئەوەی کۆسپە لەبەردەم کەڵك وەرگرتن لێی لە کوردستان پێوەندیی نزیکی بێ لەگەڵ بزووتنەوەی دژ بە فارس لە ئازەربایجان، سەرباری پێوەندیی نزیکیشی لەگەڵ کوردی ئەو هەرێمەدا))[14].

---

(13) کتێبەکەی ویگرام و براکەی بەم ناونیشانەیە:
W. E. Wigram and Edgar T. E. Wigram, The Cradle of Mankind (Life in East Kurdistan),
مامۆستا جەرجیس فتح الله کردوویە بە عەرەبی و ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا بە ناونیشانی ((کُردستان مهد البشرية))ەوە بڵاوی کردۆتەوە.

(14) N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan, PP. 40, 141.



له راسته‌وه: سه‌ید ته‌های نه‌هری، شێخ عه‌بدوللای شێخ محه‌مه‌دی مه‌ده‌نی (له بنه‌ماڵه‌ی شێخ عوسمانی بیاره)یه، فه‌قێ حه‌سه‌ن (مقام بێژی سه‌ید ته‌های نه‌هری)یه

هه‌ڵبه‌ت ده‌بوو ڕۆژئاواییه‌کان، له‌سه‌روو هه‌موویشیانه‌وه ئینگلیز، بایه‌خێکی تایبه‌تی به به‌درخانێکان بده‌ن له‌به‌ر مێژووی دێرینیان له خه‌باتی کوردایه‌تیداو چالاکیی فراوان و هه‌مه‌جۆری سوره‌یا عالی به‌درخان و جه‌لاده‌ت به‌درخان و دوکتۆر کامه‌ران عالی به‌درخان که له‌و ڕۆژانه‌دا له پێناو دواڕۆژی نه‌ته‌وه‌که‌یاندا ده‌یاننواند.

جا بەڕاستی لەو قۆناغە ناسکە پڕ لە ئاڵ وگۆڕەدا کەم کورد هەبوون بتوانن بەو زوبانە هاوچەرخییەی ئەو برایانە بدوێن و وەك ئەوان هەستی دەستەبژێری ڕۆشنبیران (ئینتیلیگێنسیا)ی کوردی دەربڕن و بێ ئەندازە بایەخ بدەنە ڕێکخراوی سیاسیی و چاپەمەنیی کوردی، لەبەر ئەوانەیشە کوردێك نییە لە تۆماری بەڵگەنامە نهێنییەکانداو لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکانداو لە بوواری باسی مێژووی ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکانی ئەو ڕۆژگارەدا ناوی وەك ئەوان و بەڕادەی ئەوان دووپات بووبێتەوە.

بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونانە بە پێویستی دەزانین لێرەدا چەند نموونەیەك لەخودی بەڵگەنامەکان خۆیان بهێنینەوە. نموونەی یەکەمیان هەڵسەنگاندنێکی مێجەر نۆییێلە کە باوەڕ ناکەم کەس لە ئەفسەرانی ئەو ڕۆژگارەی ئینگلیز، بە مێجەر سۆنیشەوە، بە ڕادەی ئەو ئاگاداری کوردو داب و نەریتیان بووبێت و وەك ئەو حەزیان کردبێ ئینگلیز دەستی یاریدەیان بۆ درێژ بکات. ئەمەی لای خوارەوە دەقی ئەو قسانەیە کە ئەدمیراڵ کالثرۆپ ڕۆژی دەی تەمموزی ساڵی ١٩١٩ لە ئەستەموڵەوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا لە لەندەن:

**((نیشانە بە بروسکەی ژمارە ١٤٣٠ی خۆم و بە بروسکەی ژمارە ٥٣ی ڕۆژی دوازدەی مایسی مەندوبی سامیی بەریتانی لە بەغداو ئەو نامەیەی خۆتان کە ژمارەکەی ٧٧٦٧٦ەو ڕۆژی بیستونۆی مایس ناردوتانە بۆ وەزارەتی هند. مێجەر نۆییێل پێی وایە لە هەموو ڕوویەکەوە دەتوانرێ کەڵکێکی زۆر گەورە لە ڕەهبەرە کوردەکانی ناوچە شاخاوێکانی باکوور، کە کەوتوونەتە سەر سنووری میسۆپۆتامیا، وەربگیرێ. ئەوانەیشیان کە ئێستا لە ئەستەموڵن بریتین لە:**

**١. سەید عەبدولقادر کە ناوچەی (نفوزی–ك.م.) کەوتۆتە ئەوپەڕی ڕۆژهەلاتەوە.**

**٢. بەدرخانێکان[15] کە بەناوبانگترین و ڕێزدارترین بنەماڵەی کوردستانن))[16].**

---

(15) شایانی باسە دەمێکە لە نزیکەوە پێوەندیم بە سینەم خانی کچی خوالێخۆشبووان جەلادەت عالی بەدرخان و ڕەوشەن بەدرخانەوە هەیە، ساڵی ١٩٧٢ لە نزیکەوە ڕەوشەن خانم ناسیوە، لە دیمەشق ئەو

**لە هەمان فایلیشدا ئەم بەڵگەنامەیە هەڵگیراوە کە دەڵێ: ((ڕۆژی بیستویەکی تەمموز وەفدی کوردی بە شەمەنەفەر لە ئەستەموڵەوە چوونە حەڵەب بۆ دیدەنیی مێجەر نۆییل، وەفدەکە لەکامەران عالی بەدرخانو جەلادەت عالی بەدرخان[17] و.. پێکهاتبوو))[18].**

**لە ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییل خۆیدا زوو زوو ناوی جەلادەت عالی بەدرخان و دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان دووپات دەبێتەوە. لەو ڕۆژانەیەیدا، کە بابەتی داهاتووی ئەم بەرهەمەمان بۆی تەرخان کردووە، مێجەر نۆییل گەلێك وێنەی دەگمەن و ڕازاوەی بڵاوکردۆتەوە، یەکەم وێنەیان هی جەلادەت و دوکتۆر کامەران ئەمین عالی بەگی بەدرخانە، دووەم وێنەیشیان هی ئەکرەم بەگی جەمیل پاشایە کە ئەمەی لەسەر نووسراوە:**

**((ئەکرەم بەگی جەمیل پاشازادەی خەڵکی دیاربەکر، تورکەکان فەرمانی گرتنیان بۆ دەرکرد چونکە ڕاسپێردرابوو بە ناوی (یانەی کوردان)ەوە لە کاتی گەیشتنمدا بۆ دیاربەکر لە مانگی حوزەیراندا پێشوازیم لێ بکات))[19].**

---

بە بەڕێزان مەمدووح سەلیم و قەدری جەمیل پاشاو قەدری جانی شاعیرو گەلێك کوردی تری تورکیاو سووریای پێ ناساندم، وێڕای هەموو ئەوانەیش سینەم خان هاوسەری هاوڕێی نزیکم سەلاح سەعدوڵلایە، بۆیەکا دەمێ ساڵە پێکڕا یادی لەدایکبوونی سینەم خان دەکەینەوە کە ڕێکەوتی ڕۆژی نەورۆزە، واتا بیستویەکی مارت، ئیمساڵ وا ڕێکەوت ئەو ڕۆژە ئێمە لێك دوور بین بۆیەکا سەر لەبەیانیی بیستویەکی مارتی ٢٠٠٧، ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەنامەیەم کردە چەپکە گوڵی ڕازاوەی شەهلاو خۆم بۆ بەڕێزی، دڵنیام لە هەموو دیارییەکانی ئەو ڕۆژە زۆرتر دڵی بە ناوەڕۆکی ئەو بروسکەیە ڕوون بووبێتەوە.

(16) N. A., F. O., 608/95, Peace Conference 1919, British Deligation, Files 365/1-1 to 365/1-4, P. 604.

(17) بە پێی بەڵگەنامەکە وەفدەکە لە سێ کەس پێکهاتبوو، ناوی سێیەمیان بەم جۆرە تۆمار کراوە Seid Moins، بۆم ساغ نەبۆوە ئەو کەسە کێ بووە.

(18)N. A., F. O., 608/95, Peace Conference 1919, British Deligation, Files 365/1-1 to 365/1-4, P. 618.

(19) ((Diary of Major E. M. Noel)), C.I.E., D. S.O., on special duty in Kurdistan, from June 14th, to September 21st, 1919, PP.4-5.



**ئەحمەد جەمیل پاشا (١٨٣٧–١٩٠٢)**

**(دیاریی: فەردا جەمیل پاشا)**

**لە فایلێکی تری هەمانساڵی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیادا[20]، دیسانەوە لەبەڵگەنامەیەکی سەربەخۆدا، باسی ناوی ڕەهبەرە هەرە چالاکەکانی ئەوسای کوردو ((کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان)) بەم جۆرە دەکات:**

**((ئەم دەستەیە کۆشش بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکەن لەژێر حیمایەی بەریتانیادا. پرۆپاگەندەی ئەم پارتە لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی**

---

(20) یەکێکە لە فایلە گەورەکان، چوارسەدو هەشتاو یەك لاپەڕەیە، لە لاپەڕە یەکییەوە تاوەکو لاپەڕە چوار سەدو حەفتاو دووی تەرخان کراوە بۆ بابەتی سمیرناو داگیرکردنییەوە لەلایەن گریکەکانەوە، کە ئەویش یەکێك بوو لە پرسە ئاڵۆزەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهان، دوا هەشت لاپەڕەی ئەو فایلە تەرخان کراون بۆ پرسی کورد، بەڵام بایەخی ناوەرۆکی ئەو لاپەڕە کەمانە لە نرخاندن نایەن، پێم وایە ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە بۆ سەلماندنی ئەوەی کارکردن لە نێو بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا کارێکی ئاسان نییە.

((سەربەستی))[*] ڕادەگەیێنرێ. ژمارەی ئەندامانی ((کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان)) لە کوردی ئەستەموول بە دە هەزار کەس تەقدیر دەکرێ کە نیوەی کوردی ئەو شارە دەبن. مەڵبەندە سەرەکییەکانی ئەم پارتییە لە ئەستەموڵن، لقەکانیشی لە دیاربەکرو دەرسیم و سعردو خەرپووت و مەلاتیەیە کراونەتەوە.



ڕاوەستاوان لە ڕاستەوە: قەدری جەمیل پاشا، هەمزەیێ مۆکسی، ئەکرەم جەمیل پاشا
دانیشتوو: حاجۆ ئاغای هەڤێرکی

---

(*) ((ئەم ڕۆژنامەیە هیچ پەیوەندییەکی وای لەگەڵ ئەم ڕێکخراوەدا نەبووە، خاوەن و سەرنووسەری مەولان زادە ڕەفعەت بووە، بەڵام ڕۆژنامەکەی وەکو ڕۆژنامەیەکی کوردی لەمێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی تۆمار نەکراوە، خاوەنەکەی یەك لەو (١٥٠) کەسە بووە، مستەفا کەمال ئەتاتورك دووری خستبووەوە، لەدوای جەنگی جیهانی زۆر بەشداری لە چالاکی کوردایەتی کردووە- ع.زەنگەنە)).

سەید عەبدولقادر، سەرۆکی ئەنجوومەنی دەوڵەت و هەمان کاتیش سەرۆکی ئەم پارتییەیە، ئەندامە دیارەکانیشی ئەمانەی لای خوارەوەن:



مستەفا زهنی پاشای بابان (١٨٥٠-١٩٢٦)

١. بەدرخان زادە مستەفا ذهني، والیی پێشووی حیجاز.[*]
٢. بەدرخان ئەمین عالی بەگی کوڕی ناوبراوو مودیری عەدلییەی ئەدریانۆپل.
٣. سەید محەمەد ئەفەندیی کوڕی سەید عەبدولقادر.
٤. سەید عەبدوڵڵا ئەفەندیی کوڕی سەید عەبدولقادر.
٥. محەمەد عەلی بەگی بەدرخان زادە.
٦. سەید شەفلیق Sheflick (؟) ئەفەندی کە ئێستا لە بدلیسە(شەفیق ئەرواسی زادەیە- ع. زەنگەنە).
٧. حەمزی (حەمدی) بەگی موتەسەریفی پێشووی مونتەفیك[21].
٨. مێجەر (رائد) سلێمان نوری بەگ، مەلاتیـیە.

---

(*) ((پێمانوایە ئەو زاتە، هەمان ئەو کەسەیە کە وێنەکەی لەسەرەوە دانراوە، واتە بابان زادە بووە نەوەك بەدرخان زادە – ع. زەنگەنە))

(21) دوور نییە مەبەستی حەمدی بەگی بابان بێ.



٩. مێجەر (رائد) ئەمین بەگ.

١٠. حەمبی (؟) زادە، لە ئەشرافە.

١١. دکتۆر محەمەد شوکری بەگ[22][*].

١٢. حاجی عەلی ڕەزا ئەفەندی.

١٣. عەلیشان بەگ، لە ئەشرافی قۆچگیرییە.

١٤. عەلی حەیدەر بەگ، کوڕی مستەفا پاشای بەگزادەیە.

١٥. ئەحمەد عارف ئەفەندی، کوڕەزای کیاحەیا(؟) ئەحمەدە.

١٦. محەمەد نوری ئەفەندی، پرۆفیسۆری لاهوتە.

١٧. جەنەڕال حەمدی پاشا.

١٨. جەنەرال مستەفا پاشا، ئەندامی مەجلیسی عورفی[23].

١٩. مەولان زادە رەفعەت بەگ، خاوەنی ڕۆژنامەی سەربەستی[24].

دەقی پرۆگرامی کاری ((کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان)) لە چوار لاپەڕەی دواتری ئەم فایلەدا تۆمارکراون کە لە سی و سێ بەند پێکهاتووە[25][*]، وا دەقی

---

(22) مەبەستی دوکتۆر محەمەد شوکری سەگبانە، کە ئەوسا کوردایەتیی دەکردو دوایی دایە پاڵ کەمالییەکان.

(*) ((لە ساڵی ١٩٣٢دا نامیلکەیەکی پاکانەی نووسی و گەڕایەوە تورکیا، ئەوەبوو رەفیق حیلمی بە نامیلکەیەك، بە تورکی و عەرەبی، رەتی دایەوە، ناوبراو کاریگەری زۆرتر بووە بەسەر چالاکی قوتابیان و دامەزراندنی (جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان) کە لە ساڵی ١٩١٢ (رۆژی کورد) و دواتر (هەتاوی کورد)یان دەرکردووە– ع.زەنگەنە)).

(23) دیارە مەبەستی مستەفا پاشا یامولکییە کە سەرۆکی ئەو دادگە سەربازییە بوو کە بڕیاری حوکمی لەسێدارەدانی مستەفا کەمال ئەتاتورکی دەرکرد، بە (نەمروود)یش ناو دەبرا.

(24) N. A., F. O., 608/104, Peace Conference, Brithish Deligation, 1919, P.477.

(25) Ibid, PP. 477-480.

(*) ((تەواوی دەقە ئۆریژناڵەکەی ئەو پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆیەی ئەو کۆمەڵەیە لە کتێبەکەی (الاحزاب والمنظمات)ی (د. عەبدولسەتار تاهیر شەریف) بڵاوکراوەتەوە، سەیر ئەوەیە ئەو هەردوو دەقەکەی بە

وەرگێڕاوی بەندی یەکەمی وەك خۆی تۆمار دەکەین کە تیشك دەخاتەسەر هەموو بەندەکانی تری ئەو پرۆگرامە:

((بەندی یەکەم– کۆمەڵەیەك بە ناوی (کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان)ـەوە دامەزرێنراوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی کوردو تا ئەپەڕی مەسەلەی نەتەوەیی. بنکە سەرەکییەکانی (کۆمەڵە–ك.م.) وان لە ئەستەمۆڵ، لقەکانیشی لە کوردستان و ئەگەر پێویست بوو لە شوێنی تریش دادەمەزرێنرێن. ئەم کۆمەڵەیە هاریکاریی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە دەکات کە کۆشش بۆ جێبەجێکردنی هەمان ئامانج دەکەن))[26].

ئینجا با بێینە سەر دەقی ئەو ڕاپۆرتە سەربەخۆیانەی کە تایبەتن بە خودی پرسی کورد لەبەردەم کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس و شەریف پاشاو هاوەڵەکانییەوە. تا ئێستا گرنگترین فایلێك لە ((ئەرشیفی نیشتمانی)) دەربارەی ئەم بابەتە من دیبێتم فایلی ژمارە (٥٠٦٨/٣٧١)ە کە ئەم ناونیشانەی بۆ دانراوە: ((سیاسی، ڕۆژهەڵاتی تورکیا، فایلی ١١، ١٩٢٠)). فایلەکە ٢٥٠ لاپەڕەیەو بەشی هەرە زۆری دەربارەی کوردو ئەرمەنە، وێڕای ئەو ڕۆژانە حەفتاو شەش لاپەڕەییەی مێجەر نۆییێل بۆی کردو وەك پاشکۆیەکی سەربەخۆ لەناو فایلەکەدا دانراوە.

یەکەم بەلگەنامەی ناو ئەم فایلە بەم ناونیشانەوەیە: ((دواڕۆژی کوردستان. یادداشتی کۆمیتەی سەربەخۆیی کوردستان دەربارەی

---

پرۆگرامی دوو کۆمەڵەی جیا، کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان و کۆمەڵەی کوردستان، داناوە، کاتی خۆی لە ژمارە (٦–٧)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) هەموو ئەو هەڵانەمان ڕاست کردۆتەوە، هەروەها دیارە هەردوو دەقەکەی ئەو پەیڕەوو پرۆگرامەی کە لای (د.عەبدولسەتار) بووە، کاتی خۆی بەزمانی تورکی عوسمانی بەنامیلکە بڵاو کراوەتەوە، دوای بەستنی کۆنگرەی (جەمعیەتی تەعالیی کوردستان) لەساڵی ١٩١٩دا دانەیەکی هەموار کراو لەدیوی ناوەوەی هەردوو بەرگی ژمارە(٧)ی ئەو گۆڤاری (کوردستان)ە بڵاوکراوەتەوە کە (محەمەدی میهری) لە ساڵی ١٩١٩–١٩٢٠دا لەئەستەنبۆڵ دەری کردووە، ئێمە کاتی خۆی لە گۆڤاری ناوبراودا کارمان لەسەر ئەم دەقە کردبوو–ع.زەنگەنە)).

(26) Ibid, P. 477.

داخوازییەکانی کورد)). ئەم یادداشتە حەوت لاپەڕەیەو بە زوبانی فەرەنسی نووسراوەو ڕۆژی چواردەی مارتی ساڵی ١٩٢٠ سورەیا بەدرخان وەك ((سکرتێری گشتیی کۆمیتەی سەربەخۆیی کوردستان)) لە قاهیرە پێشکەشی باڵوێزخانەی حوکمەتی بەریتانیای کردووە بۆ ئەوەی بینێرن بۆ سەرەك وەزیرانی ئەو وڵاتە[27].

ڕۆژی شازدەی مارتی هەمان ساڵ باڵوێزی حوکمەتی بەریتانیا لەمیسر یادداشتەکەی سورەیا بەدرخانی ناردۆتە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن[28].

لە لاپەڕە دوازدەی هەمان فایلدا ئەم بەڵگەنامەیە دەخوێنینەوە:

((دوا ڕۆژی کوردستان. نیشانە بە بروسکەی وەزارەتی هەندەران (ژمارە ٢٥٤، بیستوشەشی مارتی ١٩١٩-إی ١٧٧٦/١١/٤٤). گومانێکی زۆر لەوە دەکرێ هیچ شتێك دەربارەی سەربەخۆیی یا خودموختاری کوردستان لە ئارادا بێ، بە هەرحاڵ ڕایەکی گشتیی یەکگرتوو لە ناو کوردستان خۆیشیدا نییە. زۆرینەی کورد وا چاوەڕوانن لەلایەن دەسەڵاتێکی ژوورووەوە حوکم بکرێن[29]. ئەو ژمارە کەمەی کورد کە لە دەرەوەی کوردستان دەژین بیروبۆچوونی جوداخوازییان هەیەو موبالەغە دەکەن لەمەڕ مەودای نفوزیان. هەرچی شەریف پاشایشە بەهۆی مەیلی ئێستەیەوە بەرانبەر بە تورك زۆر شایستەی بایەخ پێدان نییە، لەگەڵ ئەوەیش پێشنیاز دەکەم دەربارەی نوێنەرانی یانەی کوردی[*] ئیستیفسار بکەن، واش بە

---

(27)N. A., F. O., 371/5068, Future of Kurdistan, Memorandum by the Kurdish Independence Committee setting forth claims of the Kurds, PP. 1-8.

(28) Ibid, P. 10.

(29) ئەمە دەقی ئەو هەڵسەنگاندنەیە بە زوبانی ئینگلیزی و بەو جۆرە لە خودی بەڵگەنامەکەدا دارێژراوە:

((Great majority of Kurds expect to be ruled from above)).

(*) ((مەبەست لە (یانەی کورد)ی کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان بووە-ع.زەنگەنە)).

باش دەزانین حوکمەتی خاوەن شکۆ لەگەڵ فەرەنسییەکاندا دەربارەی ئەم بابەتە هاوکاری (یا ڕاویێژ—ک.م.) بکات))[30].

لە لاپەڕە پەنجاوە تا لاپەڕە پەنجاو حەوتی بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە دێنە سەر باسی ڕێککەوتننامە بەناوبانگەکەی نێوان شەریف پاشا بە ناوی کوردەوەو بۆغۆس نۆبار پاشا بە ناوی ئەرمەنەوە کە دەنگێکی زۆری بە دوو شێوازی جیاواز دایەوە—دژی یا لەگەڵی. ((بۆچوونی ڕای گشتیی لە تورکیا دەربارەی ڕێککەوتننامەی کوردی—ئەرمەنی)) ناونیشانی یەکەم بەڵگەنامەی ئەم فایلەیە دەرحەق ئەو بابەتە کە دەقی وەرگێڕانەکەی دەڵێ:

((بۆچوونی ڕای گشتی لە تورکیا دەربارەی ڕێککەوتننامەی کوردی—ئەرمەنی. لە ئەدمێرال دی ڕۆبێکەوە[31]، ئەستەموول، ژمارە ٣٧٩، پازدەی مارتی ١٩٢٠، نیشانە بە نامەی نهێنی و پەلەی ئەستەمووڵی ژمارە ٣٠٦ی ڕۆژی دووی مارت (إيل ٤٤/١١/٧٧٦).

ڕاپۆرتەکان دەربارەی ڕێککەوتننامەکەی نێوان شەریف پاشاو بۆغۆس نۆبار پاشا وا ڕادەگەیێنن کە بۆتە هۆی دروستبوونی دوو بیروبۆچوونی زۆر جیاواز.

لەگەڵ ئەم نامەیەدا (وەك پاشکۆ—ک.م.) ئەو بەشەی ڕۆژنامەی ((بسفۆر)) (Le Bosphore)تان بۆ دەنێرم کە سەرنجی ڕەخنەیی گومان لێنەکراوی ئەرمەن دەردەبڕێ.

هەرچی کوردە جوداخوازەکانی ئەستەمووڵن بە ڕێککەوتننامەکە بەختەوەرن. ئەو کوردانەی (ئەستەمووڵیش—ک.م.) کە دژن زۆربەیان لە ئەندامانی بنەماڵەی بابانن[32]. موناقەشەی (کوردی ئەستەمووڵ بۆ ئەم بابەتە—ک.م.) دەربارەی

---

(30)N. A., F. O., 371/5068, Future of Kurdistan, Memorandum by the Kurdish Independence Committee setting forth claims of the Kurds, P. 12.

(31) مەندوبی سامیی حوکمەتی بەریتانیا بوو لە تورکیا.

(32) لێرەدا بە داخەوە میکرۆبی ناجسنی دەردە کوردەکە بزوواوە.

شەریف پاشایە، وا لەگەڵ هاوپێچی ئەم نامەیەمدا لیستی ئیمزای ئەو بروسکانەت بۆ دەنێرم کە دژی شەریف پاشا دراون))[33].

لە هەمان فایلدا، دوا بە دوای ئەم نامەیە، یەکسەر پاشکۆکانی نامەکە هەڵگیراون، یەکەمیان لەشەش خاڵ پێکهاتووە، کە یەکەم و دووەم و پێنجەمیان دووبارەکردنەوەی دەقی قسەکانی ئەدمیراڵ دی ڕۆبێکە دەربارەی هەڵوێستی ئەرمەن بەرانبەر ڕێککەوتننامەکەی شەریف پاشاو بۆغوص نۆبار پاشا، بەڵام سێ خاڵەکەی تریان زانیاریی زۆرتریان سەبارەت هەڵوێستی کورد تێدایە، بۆیەکا وا لە خوارەوە دەقەکەی بە کورتی پێشکەش دەکەین:

((۳. سەردارە کوردە جوداخوازەکانی ئێرە بەختەوەرن بە ڕێککەوتننامەکە، بەڵام (هەمان کات-ک.م.) هەوڵ دەدرێ لە نێوان کوردی تردا هەستی دژایەتیی بۆ دروست بکەن. لە ئەستەمووڵ دژایەتی کردنی ڕێککەوتننامەکە بەستراوەتەوە بە ناوی ژمارەیەك لە ئەندامانی بنەماڵەی بابانەوە، تایبەت مستەفا پاشای بابان زادەو نەعیم پاشای بابان زادە. دەشێ یەکەمیان (واتا مستەفا پاشای بابان-ک.م.) بکرێتە نموونەی ئەو توێژە خوێندەوارە زۆرەی کوردی ئێرە کە ماوەیەکی دووردرێژ کارمەندی فەرمیی تورکیا بوون بۆیەکا بە ڕاستی بوونەتە جوداخوازی دڵسۆز[34]. دووەمیشیان (واتا نەعیم بەگی بابان-ک.م.) نوێنەری ئەو توێژەی (کوردە-ک.م.) کە ئیسلام بەلایانەوە لەسەروو هەموو شتێکی دییەوە دێ.

٤. لە کاتێکدا ژمارەیەك لە ڕەهبەرانی (ئەم جۆرە-ک.م.) جوداخوازییە هەڵوێستی گشتیی ئەم دواییانەی شەریف پاشایان بە دڵ نییە، هەمان کات لە خۆیانم بیستووە کە شەریف پاشا بۆ خزمەتی تورك کار دەکات، ئەوەی ئەو گومانەی لە دڵمدا چەسپاند کە خۆیشم هەمبوو[35]. بەوەیشم زانی کە زۆر نییە

---

(33) N. A., F. O., 371/5068, Public opinion in Turkey in regard to Kurdish-Armenian Agreement, From Admiral de Robeck, Constantinople, Registry Number E. 2786/11/44, March 15th, 1920, P. 50.

(34) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێ: become really sincere Separatists کە مەبەستی لەوەیە بوونەتە نیمچە تورك و لە کۆمەڵگای کوردەواری دابڕدراون.

(35) لە دەقی ئینگلیزیی بەڵگەنامەکەدا وەها هاتووە:

شەریف پاشا بۆتە سەرۆکی لقی پاریسی ((کۆمەڵەی ئیسلامی)) کە دەرچوو زۆر نزیکە لە ((کۆمەڵەی ئیسلامی ناوەندی))یەوە کە وا لە خانووبەرەی ژمارە ١٥٦ لە سەر شەقامی فلیێت[36].

٦. لەگەڵ ئەم نامەیەمدا لیستی ئەو ناوانە و ئیمزاو مەڵبەندی ئەو زاتانەتان بۆ دەنێرم کە دژی هەڵوێستی شەریف پاشا بە بۆنەی مۆرکردنی رێککەوتننامەی نێوان ئەرمەن و کوردەوە بە بروسکە بۆ منیان ناردووە))[37].

دوا بەدوای ئەم بەڵگەنامەیە لە لاپەڕە پەنجاو سێی فایلەکەدا ئەو وتارەی رۆژی پێنجی مارتی ساڵی ١٩٢٠ی رۆژنامەی (Le Bosphore)ی فەرەنسیی تێدایە کە لە پاریس دەردەچێ و ئەدمیراڵ دی رۆبێك لە نامەکەی پێشوویدا بە تایبەتی ئاماژەی بۆی کردبوو. چوار لاپەڕەی دواتری هەمان فایل بۆ ناوو شوێن و رۆژی ئەو بروسکانە تەرخان کراون کە خاوەنەکانیان دژی رێککەوتننامەکەی شەریف پاشاو بۆغۆس نۆبار پاشا ناردوویانە بۆ ئەدمیراڵ دی رۆبیکی مەندوبی سامیی بەریتانیا لە تورکیا. ژمارەی ئەو کەسانەی بروسکەکەیان ناردووە نزیکەی سەدو چل کەس دەبن، دەورووبەری سەدو دەیان سەرەك هۆزن و پیاوی بەناوبانگی وەك مەحموود پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشا زادەی میللییان تێدایە کە بیستوحەوتی شوباتی ساڵی ١٩٢٠ بە ناوی ((لیژنەی پاراستنی ماف))ی وێرانشەهرەوە بروسکەکەی ناردووە.

وێڕای ئەوە پێنج ((لیژنەی پاراستنی ماف))، دووانیان لە دیاربەکرەوەو ئەو سیانەکەی تریشیان لە سیڤەرەك و سیلڤان و میدیاتەوە بروسکەیان ناردووە. جگە لەوە دە سەرۆکی شارەوانیی، شارانی ئەرزنجان و میدیات و نەسیبەین و ئەرغەنی و سیڤەرەك و دیریك و سیلڤان و دیسانەوە میدیات و دەرسیم و ماردێن، بروسکەیان ناردووە، سێ پشکنەر (موفەتیش)یش، هی هەریەك لە شرناخ و

---

((and what I hear from them confirms my impression that Cherif Pasha has been won over the Turkish interest)).

(36) فیلیێت ستریت Fleet Street یەکێکە لە شەقامە ناسراوەکانی لەندەن.

(37) N. A., F. O., 271/5068, British High Commission, Constantinople, 15th March, 1920, No. 379/M. 1743/4, PP. 51-52.

سیڤەرەك و میدیات. بە هەمان دەستوور بروسکەیان ناردووە هەڵبەت ئەمانەی لای خوارەوەش کە بروسکەیان ناردووە. هەر یەکەیان بە جۆرێك سەرنج رادەکێشن:

١. حسەین و یوسف بە ناوی دانیشتوانی قورەتچایەوە.

٢. حسەینی سەرۆکی ((کۆمەڵەی پێشرەو (طلیعة)ی کوردی)) لە ئەلعەزیز.

٣. لیوا ڕوکن بەگزادە کەریم، خەڵکی بایەزید.

٤. مێجەر (رائید) ئیبراهیمی سەرەك هۆزی جەلیلی لە بایەزیدەوە، کە لەوانەیە لە ئەفسەرانی تیپەکانی حەمیدییەی ڕۆژگاری سولتان عەبدولحەمیدی دووەم بێ(*).

٥. عوسمان، سەرۆکی هێزە نیشتمانییەکانی میدیات[38].

لاپەڕە دوو سەدو شەشی هەمان فایل تەرخان کراوە بۆ چەند لایەنێکی تری ئەو ناکۆکییانەی کەوتبوونە نێوان ڕەهبەرانی ئەوسای کوردەوەو وازهێنانی شەریف پاشا لە نوێنەرایەتی کورد لەبەردەم کۆنفرانسی ئاشتیی پاریسدا. لەوێدا باڵوێزخانەی بەریتانی لەپاریس بەرزترین دەزگاکانی حوکمەتی بەریتانیی لەلایەنە جیاوازەکانی ئەو ڕووداوە ئاگادار دەکات[39]. لەو لاپەڕەیەدا نووسراوە:

| ناوو ڕۆژ | بابەت |
|---|---|
| جەنەڕاڵ شریف پاشا ڕۆژی حەوتی نیسانی١٩٢٠ | وازهێنانی لە سەرۆکایەتی وەفدی کوردی بۆ کۆنفرانسی ئاشتی و لە سەرۆکایەتی بیرۆ (مکتب)ی ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە پاریس |

---

(*) ((سوارەی حەمیدی: لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدو لەساڵی ١٨٩١دا دامەزراوە، دوای هاتنی سوڵتان ڕەشادیش لەساڵی ١٩٠٩ بەدواوە هەر مابوون، ئەوەندە هەیە دواتر ناوەکەیان گۆڕی بوون، بەڵکو تا ساڵی ١٩١٨ هەر مابوون، کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی بۆ نیازە خراپەکانی خۆیان و دژایەتی کردنی ئەرمەنەکان بەکاری دەهێنان ــ ع. زەنگەنە)).

(38) Ibid, PP. 54-57.

(39) Ibid, British Embassy, Paris, may 3th, 1920, P. 206.

لە لاپەڕەی دواتردا دەقی ئیستیقالەکەی شەریف پاشای تێدایە کە بە زوبانی فەرەنسییەو ڕۆژی بیستوحەوتی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ پێشکەشی کردووە[40].

هەموو ئەمانە لە ئەستەمووڵ دەنگ دەدەنەوە، ئەدمیراڵ ویب ڕۆژی سێی مایسی هەمان ساڵ لە ئەستەمووڵەوە ئەم ڕاپۆرتە دەنێرێتە وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا لە لەندەن:

((دوو بەرەکی لەنێو کۆمەڵگەی کوردیی ئەستەمووڵدا.

نیشانە بە بروسکەی ژمارە ٤٠١ی ئەستەمووڵ، ڕۆژی شازدەی نیسانی ١٩٢٠ (تۆماری ئی/٤٠١/١١/٤٤)، بەپێی ڕاپۆرتەکان ناکۆکیکان دوای ئەوەی بە مەرجەکانی ناو ڕێککەوتننامەکەی نێوان شەریف پاشا و بۆغۆس نۆبار پاشا زانرا دەستیان پێکرد. سەید عەبدولقادر ڕەزامەندیی خۆی بە خودموختاریی کوردستان لەژێر سایەی تورکیادا ڕاگەیاند، بەدرخانییەکانیش (لەسەر ئەوە-ك.م.) سەید عەبدلقادریان لەسەرۆکایەتی ((یانەی کوردان))[*] دەرکرد، عەبدولقادریش بەرانبەر بەوە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی لیژنەی (بەڕێوەبردنی یانەکەی-ك.م.) ڕاگەیاند.

بەپێی ڕاپۆرتەکانیش شەریف پاشا هەمان کات وازی لە نوێنەرایەتی (کورد لە کۆنگرەی ئاشتیی-ك.م.) پاریس هێناوە...))[41].

---

(40) Ibid, P. 207, Villa Keifim 24, Boulevard de L`Ouest, Monte-Carlo, Le 27 avril 1920, Signe Cherif.

(*) ((ئەوە بەدرخانی و بابانییەکان بوون کە لەسەید عەبدولقادر و (یانەی کوردان)، واتا کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان، هەڵگەڕاونەتەوەو (کرد تشکیلات اجتماعیە جمعیتی)یان دامەزراندووە، زۆربەی سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە هەر ئەو کۆمەڵەیە بووە ئاڵای ئەمڕۆی کوردستانیان نەخشاندووە، ئەو کۆمەڵەیە جگە لەناوە دیارەکانی ئەو بنەماڵانە، کۆمەڵێك لەڕۆشنبیرە دیارەکانی ئەو دەورو زەمانەیان بەگەڵ کەوتن. سەیر ئەوەیە دوای تێکشکانی شۆڕشەکەی دیاریەکر بەسەرۆکایەتی شێخ سەعیدی پیران، کەمالییەکان سەید عەبدولقادری ئەمەری و محەمەدی کوڕی و کۆمەڵێك لەئەو ڕۆشنبیرانەی لە سێدارە دان کە لەسەید عەبدولقادر جیابیوونەوە، لەوانە کەمال فەوزی و زیا وەهبی، نازانم کورد تا چەند دەرس لەم ڕووداوانەی مێژوو وەردەگرێ و وەکوو دەڵێن بەمستە ئاوێك ناکەوێتە مەلە، لەمەودوا بەهەڵوێستی تاکە کەسیی خۆیان تووشی پەرتەوازەیی ناکەن - ع. زەنگەنە)).



قەیدکرنا سوارێن حەمیدی ل دیاربەکرێ/ ۱۸۹۵، بنۆڕە: ل۷۲ی ئەم کتێبە

لاپەڕەی دواتر دەقی درێژەی ئەو هەواڵانەی تێدایە کە مەندوبیی سامیی بەریتانیا لە ئەستەمووڵەوە ناردوویە بۆ خودی وەزیری هەندەران لۆرد کێرزن[42]، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوەکەیەتی:

((مەندوبییەتی سامیی بەریتانیا،

---

(41) Ibid, From Admiral Webb, Constantinople 620, Registery Number E5063/11/44, 3rd May, 1920, P. 218.

(42) جۆرج ناثانێل کێرزن: ڕۆژی یازدەی کانوونی دووەمی ساڵ ۱۸۵۹ لە دایکبووە، دووەم منداڵ بوو لە یازدە منداڵی خێزانەکەی، دایکی لە تەمەنی سی و حەوتساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. کێرزن دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆرد بوو، یەکێك بوو لە دیپلۆماسییە هەرە بەناوبانگەکانی ئینگلیزو جیهان لە دوا دواکانی سەدەی نۆزدەوە تا کۆچی دوایی ڕۆژی بیستی مارتی ساڵی ۱۹۲۵ بە هۆی تەمەن و هیلاکیی کارەوە، لە ساڵی ۱۹۱۹ەوە بووە وەزیری هەندەرانی وڵاتەکەی لە کابینەکەی لۆید جۆرجدا، یەکێك لە کارە زووەکانی، کە دەنگی دایەوە، ڕێککەوتننامەی ئابی ۱۹۱۹ بوو لەگەڵ ئێران. دەربارەی ژیان و کارەکانی بڕوانە:

((Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 14, Oxford University Press, 2004. PP. 792-802.

ئەستەموول،
٣ی مایسی ١٩٢٠،
ژمارە ٦٢٠/م. ١٧٤٣ه،
گەورەم،

١. نیشانە بە بروسکەی ژمارە ٤٠١ی ڕۆژی شازدەی نیسانم شەرەفمەند دەبم ئەمانەی خوارەوە دەبارەی ئەو دوو بەرەکییەی لەنێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا لێرە (لە ئەستەموول-ك.م.) ڕووی داوە بینێرمە خزمەتتان.

٢. هەندێك ناکۆکی لە ڕیزەکانی (یانەی کوردان)دا لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە ڕاستەوخۆ دوای موتارەکە (هودنە) دروست بووبوو، بەڵام هەرچۆن بێ ئەو ناکۆکییە تا شوباتی ئیمساڵ نەگەیشتبووە ڕادەی پێکدادانی ئاشکرا، واتا تا خەڵکی لێرە بە مەرجەکانی ڕێککەوتننامەکەی شەریف پاشا-بۆغوس نۆباریان زانی.

بڵاوکردنەوەی ئەو ڕێککەوتننامەیە بارێکی دژواری بۆ یانەی (کوردان-ك.م.) خوڵقاند، چونکە بەر لەوە هەمیشە (لایەنەکان-ك.م.) خۆیان دوورەپەرێز دەگرت لە داواکردنی سەربەخۆیی تەواوی کوردستان. تەنانەت ئەو ئەندامانەی (یانەکەش-ك.م.) کە بەڕاستی لەگەڵ بیرۆکەی ئەو سەربەخۆییەدا بوون هەرگیز ئەوەیان بە ئاشکرا دەرنەدەبڕی تا لەوە دڵنیا بوون، کە کۆنگرەی ئاشتی، کوردستان لە حوکمی تورك قوتار دەکات.

٣. دوای بڵاوکردنەوەی ڕێککەوتننامەکەی شەریف پاشا-نۆبار، سەید عەبدولقادر وەك سەرۆکی (یانەی کوردان) لە دیدەنییەکیدا کە ڕۆژنامەی (ئیقدام)ی تورکی لەگەڵی کردبوو گەلێك لە بایەخی ڕێککەوتننامەکەی کەم کردبۆوەو دانی بەوەدا نەنا کورد هیچ جۆرە دوژمنایەتییەکی لەگەڵ تورکدا هەبێ و گوتی (خودموختاری) ئەوپەڕی ئاواتی کوردە. هەر لەو دەورووبەرەیشدا لە ئەنجوومەنی پیرانی تورکیادا هەندێك وتووێژ دەربارەی هەمان بابەت کرا. لە ئەنجامی ئەوەدا ژمارەیەك لە ئەندامان، کەبەشێکیان لە بنەماڵەی بابان بوون، لە یانەی کوردان کشانەوەو سەرباری ئەوەیش لەناوخودی یانەدا بەدرخانییەکان و ئەندامە

ڕۆشنبیرەکان کەوتنە خەبات دژی سەید عەبدولقادر ئەفەندی. ئەم دەستەیە عەبدولقادر ئەفەندییان بەوە تاوانبار کرد کە پشتی کردۆتە پرسی کوردو داوای خودموختارییەکی تەسك لەژێر سایەی تورکدا دەکات، لە کاتێکدا پێیان وایە ئەوەی ئاواتی کورد جێبەجێ دەکات سەربەخۆیی تەواوە. ئەوان (واتا بەدرخانێکان و هاوبیرانیان—ك.م.) هەمیشە ئەو ڕستەیەیان دەدایەوە بە رووی عەبدولقادردا کە گوایە بە ئاشکرا گوتبووی کورد حەز ناکەن تەنانەت (لەهیچ گەورێکی (حضیرة اغنام) مەڕو ماڵاتی عوسمانیش وەدەرچن)[43].

٤. سەرەتای نیسان سەید عەبدولقادر ئەفەندی ڕاگەیاندنێکی لە نەقابە کوردییەکانی ئەستەمووڵ وەرگرتبوو، کە نوێنەری ژمارەیەکی زۆر لە کوردی سەر بە چینە هەژارەکان بوون، دەربارەی ئەوەی کە ئەو تاکە کەسە بتوانێ بە ناوی کوردەوە قسە بکات. بەرانبەر بەوە یەك دوو حەفتە لەمەوبەر دەستەی بەدرخانی ڕۆشنبیرەکانی یانە سەید عەبدولقادریان لەسەرۆکایەتی و ئەندامەتی یانە دەرکرد، عەبدولقادریش لەلای خۆیەوە هەڵوەشاندنەوەی لێژنەی یانەو بریاری هەڵبژاردنێکی نوێی ڕاگەیاند.

٥. شان بە شانی ئەوە هەموو هەڵوێستی ئەم دواییانەی شەریف پاشا لە پاریس زۆر سەرنجی ناوەندە کوردییەکانی ئێرەی ڕاکێشا. هاوکات لەگەڵ هەواڵی دەرکردنی سەید عەبدولقادر دەستەی بەدرخانی و ڕۆشنبیرەکان ڕایانگەیاند کە شەریف پاشا ئیتر نوێنەری (یانەی کوردان) نییە لە پاریس. رووداوی دوای ئەمە لەم بووارەدا ئەو بروسکەیەی شەریف پاشا بوو دەربارەی وازهێنانی لەسەرۆکایەتی وەفدی کوردی بۆ کۆنفرانسیی ئاشتیی پاریس.

٦. هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەدا وەرگێڕاوی وتارەکەی ((ئەقشام))ی ڕۆژی بیستوحەوتی شوبات کە هەڵوێستی سەید عەبدولقادر ئەفەندیی نیشان دەدات،

---

(43) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((Kurds not wish to leave the one fold of Ottomanism))
N. A., F. O., 371/5068, British High Commission, Constantinople, 3rd may, 1920, No. 260/M. 1743/5, PP. 220-221.

لەگەڵ وێنەی ئەو دوو نامەیەی (یانەی کوردان) کە لە سەرەوە ئاماژەیان بۆ کراوە، وێڕای وێنەی بروسکەکەی شەریف پاشاتان بۆ دەنێرم.

٧. نەمتوانیوە بچمە بنج و بناوانی گشت ناکۆکییەکان، بەڵام سەرنجی گشتیم ئەوەیە کە ناحەزانی سەید عەبدولقادر ئەفەندی بریتین لە دەستەیەکی زۆر وێکنەچوو (موتەناقین) کە تەنانەت هی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نییەو زۆر لەوە زیاتر لەگەڵ تورکدا ڕۆیشتوون وەك لەوەی عەبدولقادر هەرگیز ڕێگەی خۆی دابێت بەو ڕادەیە لەگەڵیان بێ. دەتوانرێ ئەم ناکۆکییەی نێو ڕیزەکانی کوردی ئێرە تەنها بە قازانجی تورك لە قەلەم بدرێ و لەو قازانجە دەکات کە تورك لە دوورکەوتنەوەی شەریف پاشا لە پرسی کورد وەدەستیان هێناوە.

٨. هەر وەك چۆن لە بروسکەی ناوبراومدا ئاماژەم پێی کردووە عەبدولقادر ئەفەندی وێنەیەکی بەرزتری لە زۆربەی ناحەزەکانی هەیەو لە کوردستان لای زۆر کەس لەوانی تر پتر حسێبی بۆ دەکرێ. هەڵوێستی ئیمڕۆی کە لە گفتوگۆیدا لەگەڵ ئەوانەی لێوەی نزیکن دەریدەبڕێ بریتییە لە هەوڵدان بۆ مسۆگەرکردنی چاودێری بەریتانیا، ئەگەر ئەمەیش وەدی هات ئەوساکە جیابوونەوە لە تورکیا پێویستە. کەی حوکمەتی بەریتانیا بە ئاوەتەکانی خۆی گەیشت و دەسەڵاتی بڕیاردانی بۆ دواڕۆژی کوردستان هەبوو ئەو کات خۆی کەی ویستی دەتوانێ سەربەخۆیی بداتێ. ئەو بە هیچ جۆرو لە پێناو هیچ شتیکدا ئامادە نییە مساوەمەی بکات، بێگومان خەلیفەی (موسوڵمانانیش—ك.م.) لەبەر ئەو کارە گەورەیەی دوعای خێری بۆ دەکات[44].

٩. ژمارەیەکی زۆر لەبەشدارانی ئەو دووبەرەکییە ئەوانەی سەرەوەیان بۆ گێڕاومەتەوە. هەمیشە هەوڵم داوە (لە پێوەندییەکانمدا—ك.م.) دوورە پەرێز بم لەوەی هەر شتێك لەهەر ڕێگەیەکەوە تەنها ئەوە نەبێ کە بەشێوازێکی ناڕاستەوخۆ

---

(44) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا واهاتوو:

Meanwhile he does not wish to compcomise himself unduly and he is undoubtedly actuated a great deal by veneration for the Caliphate.

گوتوومە پرسی کورد بایەخێکی زۆری لەلایەن کۆنفرانسی ئاشتییەوە پێ دراوەو من پێم وایە ئاواتەکانی کورد بە هەدەر ناڕوات. ئاماژەیشم بۆ ئەوە کردووە کە هەر کارێك بەو ڕادەیە پێشکەوێ هەڵبەت ئەوساکە هەزار دەرگەی ڕەحمەتی دەکرێتەوە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو دووبەرەکییەی لە نێو ڕیزەکانی ڕەهبەرانی کورددا لێرە دروست بووە. ئەم شێوازی قسانەی من یاریدەی ئەوە دەدەن بۆ دروست بوونی کۆششێك لە پێناو نزیك خستنەوەی تاقمە دووبەرەکەکاندا. کاتێك بە ئامادەکردنی ڕەشنووسی ئەم نامەیەوە خەریك بووم هەڵبژاردنی لیژنەیەکی نوێ بە ڕەزامەندیی گشت لایەنەکان دەستی پێ کرد. گەورەم هەمیشە بەختەوەر دەبم خزمەتکاری دڵسۆزی ئێوە بم.

ئیمزا

جێگری مەندوبی سامی)) [45].

لە لاپەڕەی دواتری هەمان فایلدا (واتا ل ٢٢٣) وەرگێڕدراوی ئەو وتارەی تێدایە کە ڕۆژی بیستوحەوتی شوباتی ١٩٢٠ ڕۆژنامەی ((ئیقدام))ی تورکی دەربارەی ناکۆکییەکانی نێوان دەستەو دایەرە کوردییەکانی ئەستەموڵ چاپی کردبوو، ئەمەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو وتارەیە:

((کورد و عوسمانیزم، ڕاگەیاندنەکانی ئەندامی ئەنجوومەنی پیران سەید عەبدولقادر ئەفەندی.

بیروبۆچوون و تێبینی کارمەندو کۆمەڵگای کوردی لەمەڕ ڕێککەوتننامەکەی نێوان شەریف-نۆبار کە لە پاریس مۆریان کرد، لە ڕێگەی ئەو ڕاگەیاندنانەوە زانران کە لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان دەنگیان دابۆوە.

ڕێکخراوی ((سەرکەوتنی کوردستان)) [46](*) بەیاننامەیەکی لە کاتی ڕاگەیاندنی هەواڵی ڕێککەوتننامەکەدا بڵاوکردەوە کە هیوای خۆی دەربڕیبوو ئامانجە

---

(45) N. A., F. O., 371/5068, British High Commission, Constantinople, 3rd May, 1920, No, 620/M. 1743/5, PP. 219-222.

(46) دیارە دەبێ مەبەستی ((یانەی کوردان))بێ.

سەرەکییەکانی (ڕێککەوتننامەکە–ک.م.) لەمەڕ پرسی جیابوونەوەی (کوردو ئەرمەن لە دەوڵەتی عوسمانی–ک.م.) بێنە دی.

بە مەبەستی زانینی بیروبۆچوونی سەید عەبدولقادر ئەفەندی، کە ئەندامێکی کوردی ئەنجوومەنی پیران و سەرۆکی ئەنجوومەنی دەوڵەتە (Counsil of State) لە وەزارەتەکەی فەرید پاشادا، واتا فەرمانبەرێکی عوسمانییە، یەکێك لە پەیامنێرەکانمان نارده لای بۆ ئەوەی دیدەنی لەگەڵ بکات.

عەبدولقادر ئەفەندی هەمان کات پشتگیرو بەرگریکەری یانەی کوردەکانە. هەرچەندە ئەو جۆری وەفدەکەی شەریف پاشای بەدڵە[47]، بەڵام لەگەڵ سەرجەمی ئەو داواکارییانەی پەیوەندیدارن بە (پرسی–ک.م.) سەربەخۆیی کوردستانەوە نییە بەو جۆرەی لەو ڕێککەوتننامەیەدا هاتووە کە شەریف پاشا (لەگەڵ بۆغوس نۆبار پاشادا–ک.م.) بەستوویە. عەبدولقادر تەنها داوای ئۆتۆنۆمی دەکات. واتا دیارە تاکە مەبەستی ڕێککەوتننامەکە دیاریکردنی سنوورە لە نێوان کوردستان و ئەرمینیادا.

---

(*) ((لەساڵی ١٩٨٨دا د. عەبدولستار تاهیر شەریف کە کتێبی (الجمعیات والمنظمات والأحزاب الکوردیة في نصف قرن ١٩٠٨–١٩٥٨)ی لە بەغدا بڵاوکردەوە، کۆمەڵێك ناوی وەکو (جمعیة کوردستان و جمعیة تعالي کوردستان، النادي الکوردي و جمعیة الاستقلال الکردي) تیا بڵاوکردبووەو ناوی هەر یەکەیان بۆ کۆمەڵەیەکی سەربەخۆ دانابوون، تەنانەت دوو نیزامنامەی بڵاوکردبۆوەو وەکو (النظام الداخلي) بۆ ئەو هەردوو کۆمەڵەیە (جمعیة کوردستان و جمعیة تعالي کوردستان) دانابوون، ماوەیەك بوو تۆژەران لەسەر ئەو هەڵەیە دەڕۆیشتن، ئەوەبوو دواتر ئێمە بە بەڵگەی ڕاست و دروست سەلماندمان ئەو دوو نیزامنامەیەی د. عەبدولستار لە ل (٢٣–٢٩) (٣٠ ، ٣٥)ی کتێبەکەی وەك دوو (النظام الداخلي) بڵاوی کردۆتەوە، ئەوە بە هەردووکیان (المنهج والنظام الداخلي) یان بۆ (جمعیة تعالي کوردستان) پێکدەهێنا، هەروابێتەوە لەزۆر لە بەڵگەنامەکان، تەنانەت لە گۆڤاری (ژین)ی ئەستەنبۆلیش هەندێ جار ناوی بە (نادی کوردی) دێت. بۆ ئەو زانیارییانەو کۆمەڵێك زانیاری تر لەم بارەوە، بنۆڕە: گۆڤاری ژین و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، ڕۆژنامەڤانی، ژمارە ٦–٧ ل ١٧٧–٢٠٩، بە ئیمزای نووسەری ئەم دێڕانە– ع.زەنگەنە))

(47) لە دەقی دیدەنییەکەدا وا هاتووە:

Although he admits the quality of Kurdish delegate of Sherif Pasha.

هەرچەندە عەبدوڵڵا جەودەت بەگ[48]، کە یەکێکە لە ئەندامانی ((یانەی کوردان))، پێی وایە یەکگرتنی کوردو ئەرمەن کارێکی زۆر پێویستە، بەڵام بەلای عەبدولقادر ئەفەندییەوە کە ئەویش لایەنگری ئامانجەکانی هەمان یانەیە، یەکگرتنێکی لەو جۆرە لەنێوان کوردو ئەرمەندا مەحاڵە.

لەگەڵ ئەوەیش کە شەریف پاشاو عەبدوڵڵا جەودەت بەگ، کە وتەبێژی ((یانەی کوردان))ـە، حەز بەسەربەخۆیی یەکجارەکیی (کوردستان—ک.م.) دەکەن و کار بۆ جێبەجێکردنی دەکەن، بەڵام عەبدولقادر ئەفەندی هەرچەندە خۆی بە پارتیزانی (پێشمەرگە—ک.م.) ((یانەی کوردان)) دا دەنێ لەگەڵ ئەوەیشدا زۆر میانڕەوەو داوای تەنها ئۆتۆنۆمی دەکات.

وا لە خوارەوە ئەو قسانەی سەید عەبدولقادر لەگەڵ پەیامنێرەکەماندا کردوونی وەك خۆیان وشە بە وشە بڵاویان دەکەینەوە:

**پرسیار: ئایا دەتوانن سەرنجی خۆتانمان دەربارەی ئەو رێککەوتننامەیە پێ بڵێن کە شەریف پاشاو بۆغۆس نۆبار لە پاریس مۆریان کردووە؟**

وەڵام: ئێمە بیروبۆچوونی خۆمانمان دەربارەی ئەو بابەتە لە شێوازی بەیاننامەیەکدا بڵاوکردۆتەوە. لە وەڵامی ئەوەی پێی دەڵێن ماڤ ئەرمەن لە شەش ویلایەتدا ئێمە سەرنجمان بۆ ئەوە ڕاکێشاون کە زۆرینەی دانیشتووانی ئەو شەش ویلایەتە کوردن و ئەو ناوچانەش لە هەموو ڕوویەکەوە تەواو کوردین. ئێمە داوامان کرد ئەم مەسەلەیە لە رێگەی لیژنەیەکی هاوبەشەوە چارەسەربکرێ، بە مەرجێك پرسی دانیشتووانی (ئەو شەش ویلایەتە—ک.م.) وەبەر چاو بگرێ. بۆغۆس نۆبار پاشایش ئەم پێشنیازەی لاپەسند بوو. ئەمەیش (پوختەی—ک.م.) ئەو رێککەوتننامەیەیە کە قسەی دەربارە دەکرێت. بۆغۆس نۆبار، بەوە قایل بوو کە کۆمیتەیەك بچێتە ئەو ویلایەتانەی لە سەرەوە وتمانن بۆ ئەوەی سەرژمێری

---

(48) عەبدوڵلا جەودەت: کوردی عەرەبگیرە، یەکێك بوو لەو پێنج قوتابییەی کۆلێجی پزیشکیی ئەستەموڵ کە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا بە نهێنی ((کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی)) یان دامەزراند، دوای ئەوەی رووی شۆڤێنیی ڕاستەقینەی ئیتحادییەکان دەرکەوت چ ئەوو چ ئیسحاق سکوتیی خەڵکی دیاربەکریش، کە وەك ئەو یەکێك لە دامەزرێنەرانی ((ئیتیحاد وتەرەقی)) بوو، کەوتنە کوردایەتی.

دانیشتووانەکانیان بکرێو نیشان بدرێ کێ زۆرینەیە، هەروەها لەوەیش دڵنیای کردین کە لەمەودوا دژی کورد نابێ.

پرسیار: ئایا ڕاستە کوردو ئەرمەن سەرەجنسی ئارین و هەردووک لایان سەر بە یەک لقن؟

وەڵام: گەلێك ڕاو بۆچوون دەربارەی ئەم بیرۆکەیە هەیە، هەن وا ئیدیعا دەکەن کە گوایە کورد عەرەب یا فارسن. من بۆ خۆم پێم وایە کورد لە ڕەسەنی پەهلەوین، کەوابێ ئەوان هیچ جۆرە پێوەندییەکیان بە ئەرمەنەوە نییە.

پرسیار: ئایا ئەو یەکیەتییەی نێوان کوردو ئەرمەن کە باسی لێوە دەکرێ کارێکی مومکینە؟

وەڵام: ئەو یەکێتییە هیچ جۆرە بنەمایەکی نییە بۆیەکا قابیلی ڕوودان نییە. ئێمە حەز دەکەین سنووری نێوانمان بە شێوازێکی عادیلانە دەسنیشان بکرێ. ژێرخانی یەکیەتییەکی لەو جۆرەی (لە ڕێککەوتننامەکەی شەریف پاشاو بۆغوس نۆبار پاشادا هاتووە—ك.م.) لەوانە نییە بە شێوازێکی سروشتی دروست ببێت.

پرسیار: ئایا شەریف پاشا نوێنەری نەتەوەی کوردە؟

وەڵام: شەریف پاشا لەلایەن تەعالیی (یانەی کوردان)ـەوە نێردراوەتە پاریس، بە پێی بیری بەندەش تەعالیی (یانەی کوردان) نوێنەری نەتەوەی کوردە.

پرسیار: بیرو بۆچوونت دەربارەی پێوەندییەکانی نێوان کوردو تورك چییە؟

وەڵام: تورك برای خۆشەویست و هاوئاییمانن، لەبەر ئەوەیش کە هەردووک لامان ئۆمەتی محەمەدین بۆیەکا دووبەرەکیی لە نێوانماندا مومکین نییە. تاکە ئاواتی ئێمە بریتییە لەوەی مافی بەرەو پێشچوونی ئازادمان پێ بدرێ. دەنگو باوی ئەوەی ڕێککەوتننامەیەکی دژ بەتورکیا لە نێوان شەریف پاشاو بۆغۆس نۆباردا مۆر کراوە ڕاست نییە.ئێمە تەنانەت گفتوگۆ سەبارەت شتێکی لەو بابەتە ناکەین. سەرجەمی ئەو دەنگوباوە لەو پرۆپاگەندەیە بەدەر نییە کە بۆ مەبەستی دیار دەکرێت.

پرسیار: ئایا داخوازییە ڕاستەقینەکانی کورد چین؟

وەڵام: ئیمرۆکە پێنج شەش ویلایەتی کوردنشین هەن، با حوکمەت ئۆتۆنۆمی بداتە ئەو ویلایەتانە، وازیشمان لێ بهێنن با لە پێناوی پێشکەوتنماندا بۆ خۆمان کارمەندانی خۆمان لە کەسانی دادوەرو شەر..فمەند هەڵبژێرین. وەك لەسەرەوە گوتم ئێمە بە هیچ جۆر هەستی دوژمنایەتیمان بەرانبەر بە تورك نییە، با ئەوانیش بەشداریمان بکەن لە بەڕێوەبردنی ئەو حوکمەتە ئۆتۆنۆمییەدا کە دایدەمەزرێنین))(49).

دوا بە دوای ئەم دیدەنییەی ڕۆژنامەی (ئیقدام) لەگەڵ سەید عەبدولقادر ئەفەندیدا، لەهەمان فایلدا، سێ بەڵگەنامە بە زوبانی فەرەنسی دەربارەی هەمان بابەت هەڵگیراوە، بەڵگەنامەی یەکەمیان: ئیمزای جێگری سەرۆکی (یانەی کوردان) لە ئەستەموڵ ئەمین عالی بەدرخان و دووەمیشیان ئیمزای حەمدی سکرتێری گشتیی ئەو یانەیەیە کە دوور نییە حەمدی بەگی بابان بێ کە ڕۆژی چواردەی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ دەربارەی فەسڵی سەید عەبدولقادر ئەفەندی لە سەرۆکایەتی یانە دەریان کردووە.

دووەم بەڵگەنامەیشیان ڕۆژی ١٢–١٤ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ی بە سەرەوەیەو دیسان بە ئیمزای ئەمین عالی بەدرخان و حەمدییەوەن و بۆ پشتگیریی کردنی هەنگاوەکانی شەریف پاشا لە پاریس تەرخان کراوە.

سێیەم بەڵگەنامەیشیان بروسکەیەکی شەریف پاشایە کە ڕۆژی بیستوسێی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ ناردوویەو تێیدا ڕێزی خۆی بۆ خەلیفەی موسڵمانان، سوڵتانی عوسمانی، دەردەبڕێ چونکە، وا دیارە، ڕێککەوتننامەکەی لەگەڵ بۆغۆس نۆبار پاشادا وا لێکدراوەتەوە کە کارێك بێ دژی بەرژەوەندیی ئیسلام(50).

لەلاپەڕە دووسەدو هەشتی هەمان فایلدا بەڵگەنامەیەکی بە ناونیشانی (دوارۆژی کوردستان) ەوە تێدایە کە باسی یادداشتێکی ڕۆژی بیستی مارتی ساڵی ١٩٢٠ی بەڕێوەبەرانی (یانەی ناوەندیی کوردستان) دەکات کە تێیدا بە ناوی ئەندامانی یانەوە

---

(49) N. A., F. O., 371/5068, Translation of an article published in the Turkish newspaper ((Ikdam)) on 27th February 1920, PP. 223-225.
(50) Ibid, PP. 226-228.

داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکەن و ناڕەزاییش دەربارەی پێشنیاری بەرفراوان کردنی سنووری ئەرمینیا دەردەبڕن[51].

لەلاپەڕە دووسەدو نۆی هەمان فایلدا مەندوبییەتی سامیی بەریتانیا لە ئەستەموولْ نامەیەك دەربارەی هەمان بابەت بۆ کێرزنی وەزیری هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا لە لەندەن دەنێرێ کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((مەندوبییەتی سامیی بەریتانیا،

ئەستەموولْ،

٢٠ی نیسانی ١٩٢٠،

ژمارە ٥٥٩/م ٢٥٧٠.

گەورەم

١- شەرەفمەند دەبم بۆ ئاداگاریتان وێنەی یادداشتێکتان بۆ بنێرم کە ڕۆژی بیستی مارت لە (یانەی ناوەندیی کوردستان)ـەوە پێم گەیشتووە، یادداشتی ناوبراو داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکاتو ناڕەزاییش دەربارەی پێشنیازی بەرفراوان کردنی سنووری ئەرمینیا دەردەبڕێ.

٢- وێنەیەکی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ نوێنەری مەدەنیی خاوەن شکۆ لە میسۆپۆتامیا.

لۆردی بەڕێزم بەوە من شەرەفمەند دەبم.

ئیمزا

جێگری مەندوبیی سامی))[52].

دەقی یادداشتەکەی ((یانەی ناوەندیی کوردستان)) کە بە زوبانی فەرەنسییەو حەوت لاپەڕەی گەورەیە لەگەلْ نەخشەیەکی گەورەی کوردستاندا لە هەمان فایلدا هەلگیراوە[53].

---

(51) Ibid, P. 208.
(52) Ibid, British High Commission, Constntinople, 20th April, 1920, No. 559/M. 2570, The Earl Curzon of Kedleston, P. 209.
(53) Ibid, PP. 210-217.

بێگومان سەرجەمی ئەو کوردانەی ڕۆژانی کۆنفرانسیی ئاشتیی پاریس دڵسۆزانە هەوڵیان دا لە ڕێگەی ئەو کۆنفرانسەوە شتێك بۆ نەتەوەکەیان بکەن، لەسەرووی هەموویشیانەوە بەدرخانییەکان و شەریف پاشای خەندان، بەشیاوی ناویان چووە ناو تۆماری مێژووی کوردەوەو وایان لێ هات لەوساوە لای دۆست و دوژمنی کوردیش سەنگی خۆیان هەبێت و لە هەموو درەفەتێکی داهاتوودا هەوڵ بدەن هەمان ڕێگە بگرنەوە بەر، ئەو ڕاستییەی زۆر بە ئاسانی لەو ڕووداوانەدا هەستی پێ دەکەین کە لەگەڵ نزیکبوونەوەی تەواو بوونی جەنگی جیهانیی دووەمداو تایبەت لە ڕۆژانی سەر هەڵدانی کۆماری مەهاباد(کوردستان)دا بوونە یەکێك لە دیاردە گرنگەکانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست بەگشتی و خودی کوردستان بەتایبەتی[54].

بەر لەوەی کۆتایی بەم بابەتەی ئێستەمان بهێنین بە پێویستی دەزانین بەکورتی ئاماژە بۆ هەڵوێستێکی زۆر سەیری حوکمەتی قاجاری ئێران لەهەمان بوواردا بکەین. بەپێی بەڵگەنامە دیپلۆماسییە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیا، تاران هەوڵی داوە کەڵك لە دۆڕاندنی عوسمانییەکان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا وەربگرێ و داوای لە کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس کردووە هەموو ئەو پارچانەی کوردستان، کە لە نێو سنووری ئیمپراتۆریی عوسمانیدا بوون، بخرێنە سەر ئێران، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو بابەتە کەم زانراوە پەنا دەبەینە بەر پوختەکەی بە پێی ئەو بەڵگەنامانە.

یەکێك لە فایلە گەورەکانی تری وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا، کە بۆ کۆنفرانسی ئاشتیی پاریس تەرخان کراوە، بریتییە لە ٥٩٥ لاپەڕەی گەورە، بەڵام بەشی هەرە زۆری بەڵگەنامەکانی دەربارەی چارەنووسی فەلەستین و چالاکیی بێ ئەندازە فراوان و هەمەڕەنگی زایۆنیستەکانە، تایبەت هی وایزمان، کە پێم وایە دەبێت کوردیش زۆریان لێوە فێر بن. لە کۆتاییشدا بەڵگەنامەکانی ناو هەمان فایل باسی ڕۆڵی ئێرانی قاجاری لە کۆنفرانسی ئاشتیدا دەکەن و بە تایبەتی ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە شا داوای کردووە هەموو پارچەکانی کوردستانی ژێر دەستەی عوسمانییان

---

(54) لە بابەتی حەوتەمی ئەم بەرهەمەدا دێینەوە سەر ئەم باسەو هەوڵ دەدەین ، بە پێی توانا، لەبەر ڕۆشنایی ژمارەیەکی تر لەبەڵگەنامە دیپلۆماسییە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا ڕوونی بکەینەوە.

بخرێته سەر وڵاتەکەی[55]. شایانی باسە تاران وەفدێکی تایبەتیی ناردۆتە پاریس بۆ ئەوەی بە ناوی ئێرانەوە لە کۆنفرانسەکەدا بەشدار بێت، وەفدی ناوبراو ڕۆژی بیستوچواری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ بۆ ئەو مەبەستە گەیشتۆتە پاریس[56].

دوا گووتەم دەربارەی پرسی کورد لەبەردەم کۆنفرانسیی ئاشتیی پاریسدا لە چوارچێوەی بابەتی دووەمی ئەم کتێبە بریتییە لەم زانیارییانە کە دەربارەی گەورەترین فایلی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیایە کە من تاوەکو ئێستە لە بواری کارەکەمدا دیومە. ژمارەی ئەم فایلە (٩٥/٦٠٨)ە کە بریتییە لە ٦٧٣ لاپەڕەی قەوارە گەورەو لە دێری یەکەمی لاپەڕەی یەکەمییەوە تا دوا دێری دوا لاپەڕەی تەرخان کراوە بۆ پرسی کورد لەبەردەم کۆنفرانسی ناوبراودا، بۆیەکا دەیان و دەیان بەڵگەنامەی تێدایە دەربارەی شەریف پاشاو بەدرخانێکان و سەید عەبدولقادر ئەفەندی، وێڕای ژمارەیەکی زۆر یادداشتی هەمە جۆری دیسان ئەوان کە بە ئینگلیزی و فەرەنسی داویانەتە کۆنفرانسی ئاشتیی لە پاریس، یا بە وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیا لە لەندەن، یا بە شوێنی تر، وێڕای دەقی دیدەنییەکی گرنگ لەگەڵ سەید عەبدولقادر ئەفەندیدا کە ڕۆژنامەی ((Le Moniteur Orental)) بە فەرەنسی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژی حەڤدەی مایسی ساڵی ١٩١٩یدا بڵاوی کردۆتەوە.

لێرەدا ئاماژە بە بەڵگەنامەیەك دەکەم، کە مەندوبی سامیی بەریتانیا لە ئەستەموولەوە ڕۆژی بیستودووی نیسانی ساڵی ١٩١٩ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتەکەی لە لەندەن، کە بریتییە لە دوو لاپەڕە سەرنجی وردی خۆی دەربارەی پرسی کورد لەو ڕۆژگارە ناسکەدا، لە یەکێك لە خاڵەکانی ئەو بەڵگەنامەیەدا ئەدمیراڵ کالثرۆپ دەقاو دەق دەڵێت:

((من ئێستاکە تەواو لەوە دڵنیام کە عەبدوڵڵا جەودەت لە هەمان کەشتییەکەی عەبدولقادر دایە))[57].

---

(55) N. A., F. O., 608/100/11, Peace Conference, British Deligation, 1919, PP. 499-500, 534.

(56) Ibid, P. 578.

(57) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا، دەڵێ:


دیاربکر استقلال محکمه‌سنده

عبدالقادر ایله اوغلی، حاجی آختی، سعدی،
کمال فوزی و خواجه عسکری اعدامه محکوم!

ڕۆژنامە تورکییەکان ئاوەها هەواڵی لە سێدارەدانی شێخ عەبدولقادری نەهری و هەڤاڵەکانیان بڵاوکردۆتەوە..؟

هەڵبەت کالثرۆپ کاربەدەستێکی شارەزاو لێهاتوو نەبووایە، لەو ڕۆژگارە هەرە ناسکەدا، سەرجەمی هاوپەیمانەکان قایل نەدەبوون ئەو پۆستە بەرزەی بدرێتێ[58].

دوای هەموو ئەمانە پێم وایە زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێم بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە بە تەنها بەشی نامەیەکی دوکتورای ڕەسەن و دەگمەن دەکەن.

---

((I am now fairly satisfied that Abdulla Jevdet is in same boat as Abdulkadir))

بڕوانە:

N. A., F. O., 608/95, Peace Conference, British Deligation, Turkey, Political, Admiral Calthrope, Constantinople, April 22nd, 1919, No. 832, P. 88.

(58) کالثرۆپ: بیست‌وسێی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٦٤ لە لەندەن لە دایکبووە، لە دایك و باوکەوە لە بنەماڵەیەکی سەربازیی ناسراو بوو، بەشی دەریاوانیی کۆلێجی سەربازیی تەواو کردووە، دوای ئەوەی ساڵی ١٩٠٢ بووە کاپتەن لە ماوەی سێ ساڵدا بەڕێز بووە مولحەقی دەریاوانیی وڵاتەکەی لەهەر یەك لە ڕووسیا و نەرویج و سوید، یەکێك بوو لە ئەفسەرە دیارەکانی بەریتانیا لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا، دوای تەواو بوونی جەنگ بووە مەندوبی سامیی بەریتانیا لە ئەستەمووڵ، پلەی ئەدمیراڵ و نازناوی (سێر)ی هەبوو، ڕۆژی بیستوحەوتی ئەمووزی ساڵی ١٩٣٧ بە وەجاغ کوێری کۆچی دوایی کرد، بڕوانە:

((Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 9, Oxford University Press, 2004, PP. 563-565.

## کورته پێشه‌کییه‌ک:

له پێشه‌کی و هه‌ردووك بابه‌تی یه‌که‌م و دووه‌می ئه‌م کتێبه‌دا چه‌ند جارێك ئاماژه بۆ گه‌وره‌یی ناوو شۆره‌ت و نووسینه‌کانی مێجه‌ر نۆیێل کراوه. له شه‌سته‌کانی سه‌ده‌ی بیسته‌میشه‌وه، له به‌شێکی زۆری به‌رهه‌مه‌کانمدا ده‌رباره‌ی کوردو کوردستان، به یاریده‌ی به‌ڵگه‌نامه بڵاوکراوه‌کانی حوکمه‌تی به‌ریتانی[1] و گه‌لێك سه‌رچاوه‌ی تری ده‌گمه‌نی وه‌ك ((نوتق–نطق))ه‌که‌ی مسته‌فا که‌مال ئه‌تاتورك[2] و نووسینی کاربه‌ده‌سته ئاگاداره‌کانی ئینگلیزو مێژوونووسانی شاره‌زا، باسی ئه‌و زاته‌م کردووه. باوه‌ڕ ناکه‌م کوردێکی ئاگاداریش هه‌بێ به دڵ مێجه‌ر نۆیێلی خۆش نه‌ویستبێت[*]، له‌وانه مه‌مدووح سه‌لیم و قه‌دری و ئه‌کره‌می جه‌میل پاشاو ڕه‌وشه‌ن به‌درخان، که بۆ خۆم ساڵی ١٩٧٢ له دیمه‌شق دیده‌نیی تایبه‌تیم له‌گه‌ڵیان کردووه، وێڕای کورده نیشتمانپه‌روه‌ره‌کانی لای خۆمان، هی وه‌ك ڕه‌فیق حیلمی‌و ئه‌حمه‌د خواجاو ئه‌حمه‌د ته‌قی و ئیسماعیل حه‌قی شاوه‌یس‌و پارێزه‌ر ئه‌حمه‌د فایه‌ق تۆفیق (فایه‌قی تاپۆ) که له نزیکه‌وه مێجه‌ر نۆیێلیان ناسیوه‌و ته‌نانه‌ت فایه‌قی تاپۆ له سلێمانییه‌وه به‌شداریی کردووه له گه‌شته‌که‌ی

---

(1) تایبه‌ت ئه‌وانه‌یان که له به‌رگی چواره‌می (به‌ڵگه‌نامه‌کانی سیاسه‌تی ده‌ره‌وه‌ی به‌ریتانیا له نێوان ١٩١٩–١٩٣٩)دا ئاماژه‌یان بۆ کراوه، ئه‌و به‌رگه له په‌نجاکانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا له له‌نده‌ن چاپکراوه.

(2) ((نوتق))، بریتییه له خوتبه‌و دیده‌نییه‌کانی مسته‌فا که‌مال ئه‌تاتورك که وه‌رگێردراوه‌ته سه‌ر زوبانی رووسیش، له ڕێگه‌ی ئه‌و کتێبه‌وه له نزیکه‌وه تێگه‌یشتم ئه‌تاتورك چه‌ند ڕقی له نۆیێل بووه، چونکه به هانده‌ری یه‌که‌می کوردی له قه‌ڵه‌م داوه. بڕوانه: مسته‌فا که‌مال ئه‌تاتورك، نوتق، چاپی رووسی، به‌شی یه‌که‌م، ل ١١٧، ١٣٢، ٢٤٨–٢٥٢ و هی تر.

(*) ((له ل ١٨٨ی ژماره (٦–٧)ی ساڵی دووه‌می گۆڤاری (ڕۆژنامه‌ڤانی) ساڵی ٢٠٠١–٢٠٠٢دا نووسیومه: ئه‌و گه‌شته‌ی مێجه‌ر نۆیێلیش له‌گه‌ڵ فائیقی تاپۆ بۆ کوردستانی باکووری ئه‌وسای کردووه‌و له‌وێ له‌گه‌ڵ جه‌لاده‌ت به‌درخان و ئه‌کره‌می جه‌میل پاشاو هی دیکه سه‌ردانی هه‌ندێ ناوچه‌ی کوردستانی کردووه، وادیاره له هه‌موان پتر سه‌رنجی عه‌بدولڕه‌حیم ڕه‌حمی هه‌کاری ڕاکێشاوه، بۆیه به‌تایبه‌تی بۆ ئه‌و زاته شیعرێکی له‌ژێر ناونیشانی (جه‌نابی نووه‌ل) نووسیوه‌و له‌سه‌ره‌تاکه‌یدا ده‌ڵێ: کرمانجی هه‌می جڤات مه‌حفه‌ل رازی نه ژ ته جه‌نابی نووه‌ل!–ع. زه‌نگه‌نه)).

نۆیێلـداو لـه دیاریـهکریش لهگـهڵ کـوردی ناسـراوی تورکیـا جـهلادهت بـهدرخان و دوکتۆر کامهران بهدرخان و ئهکرهمی جهمیل پاشا داویانهته پاڵیان.

بێگومان ئهوانه به گشتی هۆی سهرهکین که ناوی مێجهر نۆییێل جارههای جـار لهبهرگی چوارهمی ئهو کتێبهدا هاتووه که له لهندهن ساڵی ۱۹۵۲ بهم ناونیشانهوه بڵاوکراوهتـهوه: ((بهڵگهنامـه دهربـارهی سیاسـهتی دهرهوهی بـهریتانیا ۱۹۱۹-۱۹۳۹)) که گهورهترین بهرگی ئهو زنجیرهیهیه[3]، که بۆ ڕێکخستن و پۆلین کردنـی بهڵگهنامه تایبهتییهکانی وهزارهتی ههندهرانی بهریتانی تهرخان کراون[4].

لهوانهیه ههبن پێیـان وابێـت کاربهدهسـتی ئینگلیـزی تـریش هـهبوون کـه وهك مێجهر نۆئیل له ڕهوایی پرسی کورد گهیشتوون و وهك ئهویش نووسینی بـهنرخیان دهربـارهی کـوردو وڵاتهکـهیان بڵاوکردۆتـهوه، مێژوونووسـیی عیراقیـی ناسـراو خوالێخۆشبوو عهبدولڕهزاق حهسهنیی، مێجهر سۆنی به مامۆستاو هانـدهری کـورد دادهنا، بهڵام وهك به خۆیم دهگوت نابێ ههرگیز ئهوه له یـاد بکـهین کـه سـۆن بـه خوێنی سهری شێخ مهحموود، له ڕۆژگارێکی زۆر ناسـکی بزووتنهوهکانیـدا، تینـوو بوو، ئهوهیشم عهرز دهکرد خوا ئهوانه بگرێ که کورد ناچار دهکهن پهنا بهرنه بـهر ئینگلیزو غهیری ئینگلیز.

ههرچۆن بێ دوای ئهوهی لـه ((ئهرشـیفی نیـشتمانیی)) لـه لهنـدهن ((ڕۆژانـهکانی مێجهر نۆیێڵ))م خوێندهوه له جاران زۆرتر له ڕادهی دڵـسۆزیی ئـهو پیـاوه بـۆ کـورد تێگهیشتم، ههڵبهت ئهو دهبێ بهرژهوهندییهکانی وڵاتهکـهی خـۆی مهبهسـت بووبێـت، ههر کهسێکیش وا نـهبێت نـاتوانێ گـهلانی تـری خـۆش بوێـت، بـا خودپهرسـتیش لـه ههڵوێستهکانیدا ههبێت و حهزی کردبێت ناوی ئهویش وهك ناوی ((لۆرانسی عـهرهب)) له سهرانسهری دونیادا دهنگ بداتهوه، ئاخۆ کهسێك ههبێ لهم جیهانه پان و بهرینـهدا حهز نهکات بناسرێت و ناوی به چاکه لهناو ناواندا بهێنرێت؟

---

(3) ژمارهی لاپهڕهکانی ئهو بهرگه بریتییه له ۱۲۷۸ لاپهڕه.

(4) ((Documents on British Foreign Policy 1919-1939)), Edited by E. L. Woodward, Professor of Modern History in the University of Oxford, First Series, Vol. 1V, 1919, London, 1925, PP. 678-680, 693-696, 733-736, 742-743, 782.

هـــەموو ئـــەم ڕاســـتییانە بوونـــە هانـــدەرم عـــەودالّی گـــشت کـــارو ڕاپـــۆرت و سەرنجەکانی مێجەر نۆییێل بم، هەر ئەوەندە لە یەکێك لە کارتەکانی ئەرشیڤدا ناویم بەرچاو کەوت یەکسەر داوای ئەو فایلەم کردو کەوتمە سۆراخی، فایلەکە زۆر گەورە دەرچـووە–٥٨١ لاپـەڕە–کـە بەشـی هـەرە زۆری لاپـەڕەکانی لـە هـەردووك دیـوی نووسین و بیروبۆچوونی کارمەندانی وەزارەتی هەندەرانیان تێدایە، بەو جۆرە کۆی لاپەڕەکانی خۆی دەدات لە نزیکەی هەزار لاپەڕە کە سەرجەمیان دەربارەی لایەنـە کارگێڕییـــەکانی ناوچـــە داگیرکراوەکـــانی میـــسۆپۆتامیا، لەلایـــەن هێزەکـــانی ئینگلیزەوەو بۆ کارەکەی من شتی بەکەڵکیان تێدا بوو، بەڵام نـاوی مێجـەر نۆییێـل یەکجارو تەنها لەخشتەی مووچەی فەرمانبەرانی ئینگلیز لە لاپـەڕە ١٨٨دا هـاتووە کە مووچەی مانگانەی ١٢٥٠ ڕوپیێ بووە[5].

هـەر لـەو بەڵگەنامانـەدا هەسـت بـەوە دەکـەیت چـۆن مێجـەر نۆییێـل زۆر بـە پەرۆشەوە بۆتە پارێزەری کورد لە بواری کوشـتاری ئەرمەنـدا، چـونکە لـە هـەموو دەرفەتێکی ڕەخساودا باسی ئەوەی کردووە کە کورد نەك هەر بە هیچ جۆر تۆباڵی ئـەو کوشـتارەیان ناکەوێتـە ئەسـتۆ، بـەڵکو هـەمان کـاتیش ((داڵـدەی هـەزاران ئەرمەنییان داوە)) و بەو جۆرە لە قڕکردن ڕزگاریان کردوون[6].

دوای ئەم کورتە پێشەکییە پوختەیەکی ((ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییێل)) دەخەمـە بەرچاوی خوێنـەران و ئـیتر ئـەوانیش بۆخۆیـان بیروبۆچـوونەکانی دەرحـەق کـورد هەڵسەنگێنن کە بە داخەوە دۆستی کەم و دوژمنی زۆر بووە، ئەوەی وای لە گەلێك کوردو نووسـەری بیـانی کـردووە تـەنها شـاخ و داخـە سـەختەکانی کوردسـتان بـە دۆستی کورد لە قەڵەم بدەن.

---

(5) N. A., F. O., 371/4151, Plolitical, Turkey 1919-1920, File 144, Office of the Civil Commissioner, Baghdad, the 24th September, 1919, PP. 185, 188.

(6) ((Documents on British Foreign Policy 1919-1939)), First Series, Vol IV, 1919, PP. 678, 693, 782..etc.

## پوختەی پێناسەی نۆیێل

ناوی تەواوی مێجەر نۆییێل بەم جۆرەیە: ئێدوارد چارلس ولیام نۆییێل، سەرەتا کاپتەن بووەو دوایی مێجەر. ئەوانەی لە نزیکەوە دیویانە دەڵێن پیاوێکی زیرەك و چوست و چالاك و گورج و گۆڵ و رووخۆش بووە، لە قووڵایی نەفسییەتی رۆژهەڵاتییەکان، بە تایبەت سەرەك هۆزەکانیان ، باش تێگەیشتبوو، بەر لەوەی بێتە کوردستان لە ناو بەختیارییەکانی باشووری ئێراندا کاری کردبوو، لە ساڵەکانی جەنگی جیهانیی رۆڵی دیاری بینیوە لە بزواندنی هۆزەکانی ئێراندا دژی ئەڵەمان و خزمەتی زۆری گەیاندۆتە ((کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزیی–ئێرانی)) لە باشووری ئەو وڵاتە.

لە دوا قۆناغی جەنگی یەکەمدا نۆییێل توانیی لە نزیکەوە پێوەندیی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە سەرەك هۆزی دەسەڵاتداری کورددا دابمەزرێنێت و لەوساوە دەستی کردە فێربوونی زوبانی کوردی و بە پێی ئاگادارانی کورد، وەك لە رۆژانەکانیشیدا دەبینین، زۆر باش فێری کوردی ببوو.

مێجەر نۆییێل چەند ساڵێکی لە کوردستان بردەسەرو خزمەتێکی دیاری کوردی کرد، هەڵبەت وا نەبووایە یەکێکی وەك رەفیق حیلمی لە خۆڕا نەبوو دەیگوت ئەگەر نەخشەو پێشنیارەکانی نۆییێل سەریان بگرتایە کورد بە گشت ئاواتەکانی خۆی دەگەیشت.

بەریتانییەکان مێجەر نۆییێلیان لە کوردستانەوە گواستەوە قەفقاس و لە گەڕانەوەیدا لەلایەن جەنگەڵییەکانەوە، کە لە گەیلان دژی بەریتانیا خەباتیان دەکرد، دەسگیر کراو ئیتر جارێکی دی[*] کوردستان نەدییەوە.[**]

---

(*) ((دوای تایپکردنەوەی ئەم بەشەی کتێبەکە لە بنکەی ژین، پاشان ناردنەوەی، بە مەبەستی هەڵەچنی، بۆ لای من ئەو تێبینییەی خوارەوە بەبێ ئیمزا لەم پەراوێزەی دەستنووسەکەدا سەرنجی راکێشام: (ئەمە هەڵەیە، نۆییێل دوای بەریوونی لای جەنگەلییەکان، لە ۱۹۱۸ هاتە سلێمانی و شوباتی ۱۹۱۹ بە جێی هێشت، ۱۹۲۲یش لەگەڵ شێخ مەحموودا هاتەوە بۆ سلێمانی، تا سەرەتای ۱۹۲۳ پەیوەندی هەبوو) دواتر بۆم دەرکەوت ئەوە هاوکارم سەدیق ساڵح بووە ئەم تێبینییەی نووسیوە، لەبەر ئەوەی تێبینییەکانی ئەو لای من شایانی بایەخ پێدانن، بۆیە دەقەکەیم بە تەلەفۆن بە د. کەمال گووت و هەردوولا پێکهاتین لێرەدا بیخەمە بەردەم تۆژەران–ع.زەنگەنە)).

(**) ((بڕوا بکە زەنگەنە مەبەستم کوردستانی ئێرانە، ئەگینا کوردناسێك نییە نەزانێ دوای ئەوە چەند ساڵێك نوئێل لە کوردستانی باشوور کاری کردووە و لە هەردوو نامەی دکتۆراکەمدا لەگەلێك نووسینی دیکەمدا بەدرێژی ئاماژەم بۆ ئەو راستییانە کردووە – کەمال مەزهەر)).

((ئەو تێبینییەی سەرەوەی دوکتۆر بۆ چاپی دووەمی ئەم کتێبە نووسراوە – ع. زەنگەنە))

## ڕۆژانەی یەکەمی مێجەر نۆیێل

یەکەم ((ڕۆژانەکانی مێجەر نۆیێل)) لە فایلی ژمارە ٦٠٨/٩٥ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیادا دانراوە[7]. کۆی لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژانەیە چواردە لاپەڕەی قەوارە گەورەی چڕوپڕەو باسی پوختەی سەرنجەکانی دەکات لە ماوەی ئەو گەشتەیدا لە کوردستان کە ڕۆژی حەوتی نیسانی ساڵی ١٩١٩ دەستی پێکردووەو ڕۆژی بیستوسێی نیسانی هەمان ساڵ تەواوی کردووە، واتا ماوەی گەشتی یەکەمیان زۆر کورت بووە بۆیەکا هەڵبەت ئەنجامەکانیشی زۆر لە گەشتی دووەمیان کەمتر بوون، وێڕای ئەوەیش نۆیێل لەگەڵ گەشتی یەکەمیدا هیچ وێنەیەکی بڵاونەکردۆتەوە، بەڵام لە ڕووی چاپەوە ئەمیان ڕێکوپێکترە لەویان[8].

مێجەر نۆیێل لە موسڵەوە گەشتی یەکەمی دەست پێ دەکات، لە حەوتی نیساندا لەو شارەوە ڕووی کردۆتە ئەو هێڵەی دوایی بووە سنووری نێوان عێراق و تورکیا، لە دوازدەی نیسانیشەوە گەیشتۆتە ناوچەکانی سەر بە قەزای نەسیبەین و باسی هۆزە کوردەکانی و دوا وێستگەی هێڵی شەمەندەفەری بە ناوبانگی بەغدا-بەرلین دەکات کە ئەڵمانەکان لەوێ دروستیان کردووە (ل١). نۆیێل، لاپەڕەی دواتری ڕۆژانەکانی یەکەمی تەرخان کردووە بۆ هەمان بابەتی نەسیبەین لە چواردە تاحەڤدەی نیسانی ١٩١٩(ل٢).

بایەخی دیموگرافیی ئەو خشتەیەی مێجەر نۆیێل، کە لاپەڕە سێی بۆ تەرخان کردووە، زۆرە، چونکە شتی وردی کەم زانراوی دەربارەی هۆزەکانی قەزای نەسیبەین تێدایە کە وەك دەڵێت، هەشتیان کوردو تەنها دووانیان عەرەبن، بەڵام عەرەبەکان بە ژمارە پێنج هەزارو کوردەکان چوار هەزارو هەشت سەد کەسن(ل٣).

ڕۆژی حەڤدەی نیسان، مێجەر نۆیێل ڕاپۆرتێکی بایەخداری بەم ناونیشانەوە تەواو کردووە ((ڕاپۆرت دەربارەی ژیانی ئابووریی قەزای نەسیبەین)) کە دوو لاپەڕەی ڕۆژانەکەی بۆ تەرخان کردووە (ل ٥-٦). لاپەڕەی دواتریشی تەرخان

---

(7) N. A., F. O., 608/95, Sitiuation in Nisibin Qaza, Transmits diary of Major E. Noel on special duty from April 7 to April 23, P. 665.

(8) Ibid, ((Diary of major E. Noel on Special Duty)), PP. 667-673.

کردووه بۆ ڕاپۆرتێکی دانسقەی تر بەم ناوونیشانە ((ڕاپۆرت دەربارەی هێڵی تەلگرافی نێوان موسڵ و نەسیبەین)) (ل٧).

مێجەر نۆییڵ، بەشێکی زۆری ڕۆژانەکانی یەکەمی تەرخان کردووە بۆ باسی گاورەکانی قەزای نەسیبەین کە لە ڕۆژگاری سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە سەرنجی ڕای گشتی و دەزگا دیپلۆماسییەکانی ڕۆژئاوایان ڕاکێشابوو، سەرەتای لاپەڕە چواری ڕۆژانەکانی تەرخان کردووە بۆ بابەتی ((بارودۆخی گاورەکانی قەزای نەسیبەین)) (ل٤)، لە لاپەڕە نۆیشیدا باسی ئەو کۆبوونەوەیەمان بۆ دەکات کە بیستودووی نیسان لە ماردین لەگەڵ سەرۆکی تایفە گاورەکاندا–یەعقووبییەکان و سریانە کاسۆلیکەکان و کلدانەکاندا[9] سازی کردووە، ئەوەی لەم بووارەدا سەرنج ڕادەکێشێت ئەو تێبینییەی مێجەر نۆییڵە دەربارەی پێوەندیی باشی نێوان موسڵمان و کلدانەکانی ناوچەکەیە بە پێچەوانەی پێوەندیی موسڵمانەکان بە تایفە گاورەکانی ترەوە (ل٩). ڕۆژی بیستوپێنجی نیسانیش، واتا لە دوا ڕۆژی گەشتی یەکەمیدا، مێجەر نۆییل ڕاپۆرتێکی گرنگ دەربارەی کوشتاری ساڵی ١٩١٥ی ئەرمەن لە ڕۆژگاری ئیتحادییەکاندا بەم ناوونیشانەوە تەواو دەکات ((کوشتاری گاورەکانی ویلایەتی دیاریەکر لەساڵی ١٩١٥دا)) (ل ١٠–١٢).

وێڕای هەموو ئەوانەی سەرەوە نۆییل لە هەمان ڕۆژانەدا زانیاریی تری دەربارەی شوێنی ژیانی کارمەندانی پێشووی هێڵی شەمەندەفەری بەغدا–بەرلین لە باکووری شاری نەسیبەین و ڕۆڵی پیاوەکانی سەرەك هۆزی کوردی ناوچەکە حەمە ئاغای محە لە پاراستنی ئەو شوێنە دەکات جگە لەوەسفی هێزەکانی بەریتانیا لە نەسیبەین. کە نۆزدەی نیسانیش نەسیبەین بەجێ دەهێڵێ و ڕوو دەکاتە شاری ماردین باسی هۆزەکانی ئەو ناوچەیەشمان بۆ دەکات و خشتەیەکی کردووە دەربارەی ئەو لایەنانەی لەو ڕۆژانەدا سەرانەیان دەداو بەکێیان دەدا(ل٨).

مێجەر نۆییل، ڕۆژی بیستی نیسان دەگاتە شاری ماردین و لەوێ زەکی بەگی پارێزگاری نوێی شار زۆر سەرنجی ڕادەکێشێت، چونکە پیاوێکی دنیادیدەی سەر

---

(9) ئەرمەن لە نەسیبەین و ماردینیش دەژیان، بەلام وەك مێجەر نۆییل دەڵێت: ئەرمەنەکان لەو ناوچانە سەرەك تایفەی خۆیان نەبووە.

بە ئینگلیزەو بە دڵ دەیەوێ یاریدەی گاورەکانی ناوچەکە بدات (ل ٨). وەك گوتمان نۆییڵ بەشێکی زۆری لاپەڕەی دواتری یەکەم ڕۆژانەکانی بۆ پێوەندیی نێوان موسڵمان و گاورەکانی ماردین تەرخان کردووە، بەڵام لە دوا بابەتی ئەو لاپەڕەیەدا سەرنجەکانی خۆیمان دەربارەی هۆزەکانی هەمان ناوچە بۆ باس دەکات (ل٩).

بەو جۆرە لە چواردە لاپەڕەدا مێجەر نۆییڵ زنجیرەیەك زانیاریی دەگمەنمان دەربارەی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان دەداتێ، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی ئاماژەمان پێ داون ڕۆژانەکانی گەشتی دووەمی مێجەر نۆییڵ لە هەموو ڕوویەکەوە بایەخیان، چ بۆ خوێنەری ئاسایی و چ بۆ شارەزایان، زۆرترە. با ئەوەیش بڵێین نۆییڵ زاراوەی کوردستانی بۆ ناونیشانی ڕۆژانەکانی یەکەمی بەکار نەهێناوە.

## ڕۆژانەی دووەمی مێجەر نۆییڵ

دووەم ((ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییڵ))، وەك پاشکۆ لەگەڵ فایلی ژمارە ٣٧١ ڤ٥٠٦٨ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیادا دانراوە. کۆی لاپەڕەکانی ئەو ڕۆژانەیە حەفتاو شەش لاپەڕەیە[10] و باسی پوختەی سەرنجەکانی دەکات لە ماوەی ئەو گەشتەیدا لە کوردستان کە ڕۆژی چواردەی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ دەستی پێی کردووەو ڕۆژی بیستویەکی ئەیلوولی هەمان ساڵ تەواوی کردووە[11].

(10) N. A., F. O., 371/5068, Political, Eastern Turkey, File 11, 1920, ((Diary of Major E. M. Noel)), C. I. E., D. S. O., on special duty in Kurdistan, from June 14th, to September 21st, 1919.

(11) بەختەوەر بووم کە زانیم ژمارەیەك ڕووناکبیری دڵسۆزی وەك سەباحی غالب و دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلا ئەو ڕۆژانەیان دیوە، ئەوی ڕاستی بێ زۆر لە دڵم گران هات کە ئەم زانیبوو ئەم بەرهەمەیش شەش ساڵ لەمەوبەر لە سلێمانی چاپکراوەو تاوەکو ئێستایش نەمدیوە، ئەگینا بێگومان بە پێی توانا هەڵدەسەنگاند (مێجەر نۆییڵ، سەرنجدانێکی بارودۆخی کورد، وەرگێڕانی: سدیق سالح، سلێمانی، ٢٠٠١). هەر لەم ڕۆژانەیشدا لە ڕێگەی کاك سەربەست کەرکووکییەوە بەوەم زانی کە لە ((مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد))، لە لەندەن نزیکەی ٥٠٠ دانە لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا هەیەو تا ئێستا ژمارەیەك قوتابیی کوردو ئینگلیز کەڵکیان لێ وەرگرتووە.



مێجەر نوییێل

وێنەکانی ناو ئەم ڕۆژانەیە یەکجار ڕازاوەو پـر مانـان، زۆر سـەیرە لـەو ساڵەداو لـەکاتی گەشـتێکدا لـە وڵاتێکـی دواکـەوتووی وەك کوردسـتاندا نۆییێـل تـوانیبێتی وێنەی وا ڕێکوپێك بگرێت[12].

(12) لە چەند شوێنێکی باسەکانی بەر لە نێستەی ئەم کتێبەدا ئاماژەمان بۆ ئەو وێنانە کردووە، وا لێرەشدا چەند نموونەیەکی تر دەربارەیان دەهێنینەوە.

کورد واتەنی دووەم ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییل بە زانیاری و سەرژمێرو سەرنجی زۆر دەگمەن و زۆر بەسوود تەنراون، گەلێکیان بریتین لەشتی نوێ، تەنانەت بە نیسبەت شارەزایانیشەوە، وێڕای شتی ئەوتۆیش کە هەمیشە مایەی شانازین، وەك ئەوەی لەژێر لاپەڕە هەشتدا نووسیویە: (لە هەر قزلباشێك بپرسی تۆ کێی یەك وەلامی هەیە – ئەم کرمانجین). لەژێر وێنەی عومەر ئاغای سەرۆکی گوڕێجیك Gurrejik یشدا نووسیویە: ((هەستی دژ بە حوکمەت لەناو ئەندامانی ئەم هۆزەدا زۆر بەهێزە. خانوویەرەی هەزاران لە سەربازە هەلاتووەکان (لە لەشکری تورك– ك.م.) سووتێنران و لەگەل زەویدا تەخت کراون. ئافرەت و منداڵ لە برسانا دەمرن و لەسەرمانا رەق هەلدێن)) (بڕوانە: ژێر وێنەی بەرانبەر لاپەڕە ١٨).

لەژێر وێنەیەکی تریشدا دەقی ئەم قسانە دەخوێنیتەوە: (ساندوگ Sandug) ژنە ئەرمەنییەکە کە کوردێك کیلۆس (Kilos)ی کوڕی لەمەرگ قوتار کردووە. ساندۆگ، زۆر بە ڕاشکاوی رایگەیاند کوڕەکەی هەر هیچ لەوە دوو دڵ نییە ئەو ماڵە کوردە بەجێ بهێلێ کەوا باش رەفتاریان لەگەل کرد، مەبەستی لەوەیە دلنیایە کەس هیچی لێ ناکات (بڕوانە: ژێر وێنەی لاپەڕە ٢٧).

شتی بایەخداری نێو دووەم ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییل زۆر زۆرن، تایبەت دەربارەی هۆزە کوردەکان و داب و نەریت و پێوەندییان بە دراوسێکانیانەوە. بە وێنە بەش بە حاڵی خۆم لە یادم نییە لە وێنەی زانیارییەکانی مێجەر نوییلم دەربارەی هۆزی ئاتمی (Atmi) لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا خوێندبێتەوە کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەی ئەو زانیارییانەیە:

ڕاپۆرت دەربارەی کوردی ئاتمی کە لەناوچە شاخاوییەکانی نێوان مەرعەش و مەلاتییەدا دەژین. وشەی ئاتمی لەلایەن حوکمەتەوە گۆڕدراوە بۆ ئاتمیللی(Atmilli )

(١) مێژوو:

ئاتمییەکان، چەند سەدەیەك لەمەوبەر، لە گومش مەدێن ( Gumish Madden)ی نزیك خەرپوتەوە هاتوونەتە مەلبەندی ئێستەیان، گەلێك زەحمەتە هیچ زانیارییەك یا پاشماوەیەك دەربارەی مێژووی ڕابردوویان بزانرێ.

(٢) سەرژمێر:

ئـەم هـۆزە لـە ١٥٦٥ خێـزان پێکهـاتووە کـە ١٥٠٥ خێزانیـان دەوارنـشینن. ئەندامانی هۆزی ئاتمی لەم قەزایانە دەژین:

| قەزا | ژمارەی گوند | ژمارەی خانووبەرە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| بازارجیك Bazarjik | ٨ | ١٠٤٠ | ١٣٠ خێزانیـــان بەیـــەکجارەکی لەدەشتایکاندا ماونەتەوە. |
| بێهەسنیٚ Behesne | ٧ | ٦٨٠ | ٨٥ خێزانیـــان بەیـــەکجارەکی لـــە دەشتاێکاندا ماونەتەوە. |
| ئەلبستان Albistan | ١١ | ٦٥٥ | گونـــدەکانیان کەوتوونەتـــە ناوچـــە شاخاوێکانەوە، دەواری |
| ئاقچەداغ Akchadagh | ٢ | ١٨٠ | دەواری هاوینـــەیان کەوتۆتـــە نزیـــك گوندەکانیانەوە. |
| **کۆی ژمارە** | ٢٨ | ٢٥٦٥ | |

لیستی تەواوی گوندەکان لە پاشکۆی ژمارە یەکدایە. هاوینەهەوارەکانیان بریتین لە سیرکلی (Sirkili) و نوکراخ داغ (Nukrakh Dagh)کە کەوتوونەتە سەرهێڵی پانی (خـط العـرض) ٣٨و هێڵـی درێـژی (خـط الطـول) ٥ر٣٧، هاتووچـۆ لـەنێوان هـاوین و زسـتانە هەوارەکانیانـدا بـە پـیٚ سـیٚ ڕۆژ دەخـایێنیٚ، ناوەنـدی مـایس بـەرەو هاوینـە هەوارەکانیان سەردەکەون و ئەیلوولیش بەرەو زستانە هەوارەکان دێنەخوار.

چەند بەشێکی تریش لە هۆزی ئاتمی سەربەخۆن، لە گومشی نزیك خـەرپوت و لە ئەرەبگیرو ئیسلاحییەو کلس و مەرعەش دەژین.ئەم هۆزانە ٢٠٠ چەکدار دەدەنە لەشکری تـورك، لەوانـە نزیکـەی سـی کەسـیان ناگەڕێنـەوە. ئـەم زیانـە سـەرباری ئەوانەی بە ئەنفلۆنزای ئیسپانی Spanish Influenza و لە برسـاناو بـە هـۆی تـرەوە دەمرن بوونەتە هۆی کەم بوونەوەی لەسەدا دەی ژمارەی ئەندامانی هۆزی ئاتمی.

**(٣) زوبان[13]:**

کوردی و تورکی بەکار دەهێنن، کرمانجییەکەیان زۆر لە زمانی گفتوگۆی دانیشتووانی دیاربەکر نزیکە ، ڕەنگبێ جیاوازی لە نێوانیاندا لەشەش تا حەوت دەرسەد تێپەڕ نەکات.

**(٤) جل و بەرگ:**

هاوینان شەڵوار (Sholwar) لەبەر دەکەن، کە پانتۆڵێکی کراوەی ڕەنگاوڕەنگە، لەگەڵ زەبووم (Zabum) کە بریتییە لە چاکەتێکی سەربازی، بە پشتێن دەبەسترێ و لەکاتی شەڕدا بەکاری دەهێنن، لەگەڵ ساکۆ (Saku) کە ئەمەیش چاکەتێکە بە تەرزی چاکەتی ئەورووپی بڕدراوە (ل ٣٨). زستانانیش شاڵو شەپك لەبەر دەکەن، کە جل و بەرگێکی نەتەوەیی کوردە. فێسێکی سوور[14] یا کولیك (Kullik) (کڵاو–ك.م.)ی سپی، کە لەلباد دروست کراوە، لەگەڵ پۆگاریێ (Pugarree )[15] لەسەر دەنێن.

**(٥) ئایین:**

لەوانەیە نیوەی ئەندامانی ئەم هۆزە شیعە بن (کە بە عەلەوی ناسراون)، نیوەکەی تریشیان سوونەن، هەستی ئایینی (مەبەستی جیاوازی و دووبەرەکییە– ك.م.) لەنێوان شیعە و سوونەکانیاندا نییە، ژن و ژنخوازی لایان ئاساییەو نە ژنەکەو نە منداڵەکانی پابەندی هیچ شەرتو شروتێك نابن، هەر بەچاوی موسڵمان سەیری سوونە و شیعەیان دەکەن، هەست بە جیاوازیی نەریتی ئایینی ناکرێ، ڕاستە مەلاو سەیدو ئەو جۆرە کەسانەیان لەناودا هەیە، بەڵام ڕۆڵیان زۆر کەمە.

---

(13) لە دەقی ڕۆژنامەکاندا بۆ جلوبەرگ لە بریتی ژمارە چوار ژمارەی (٣أ) دانراوە کە دیارە ئەوە بەهۆی باری سەختی چاپەوە رووی داوە، ئێمە زنجیرەی ژمارەکانمان نەپچراندووە، بۆیەکا لێرەوە ژمارەی ناونیشانەکانی ئەم بابەتە لەگەڵ دەقی ئینگلیزییەکەدا یەك ناگرنەوە.

(14) شایانی باسە فێست بە ئینگلیزی Fezی پێ دەڵێن، نۆییل بۆ خۆیشی ئاماژەی بۆ ئەو لەیەکچوونە کردووە.

(15) لێرەدا نۆییل وشەی Puggarree ی بەکارهێناوە کە لە هەموو فەرهەنگێکدا نییە، لە ((فەرهەنگی ئینگلیزیی ئۆکسفۆرد))دا Oxford English Dictionary دەڵێت پۆگاریێ شتێکە لەسەر دەکرێ و لەناو کەلانی ڕۆژهەڵاتدا، وەك هندییەکان، باوە.

(٦) سەرۆکەکانیان:

سەرۆکی ئێستایان یەعقوب پاشای[16] کوڕی سلێمان ئاغای کوڕی محەمەد ئاغای کوڕی باز ئاغای کوڕی ناصیف ئاغای کوڕی ئیبراهیم ئاغایە، برایەکی هەیە ناوی شێخ محەمەدە، خێزانیشی کچی تاپۆ ئاغایە.

یەعقوب پاشا، پیاوێکی لاوازە، بالای پێنج پێ و نۆ ئینجە[17]، تا ڕادەیەك مەنگ و چاو بەگومانە، دوور نییە ئەوەیش ئەنجامی ئەو کارەی تورکەکان بێ کە ساڵی پار بۆ ماوەی نۆ مانگ، بە تۆمەتی یاریدەدانی چەند دەستەیەك چەتەی یاخیبوو، بەندیان کردبوو.

پاشا پیاوێکی دونیادیدەیە، بەڵام جاروبار زوو هەڵدەچێ و زۆر دەڕوا، هەمان کات بەخشندەو چاکەخوازە، خوو و ڕەوشتی تری باشی زۆرە، بێ ئەندازە دژی تورکەو نیشتمانپەروەرێکی کوردی ڕەسەنە.

(٧) لە رووی سەربازی و سیاسییەوە:

ئەندامانی هۆزی ئاتمی وەك شەڕکەری لێهاتوو ناوبانگیان دەرکردووە، گەلێك زەحمەتە ژمارەی چەکی ئەم هۆزە مەزەندە بکرێ، یەعقوب پاشا جارێك بە نهێنی بە نوێنەرێکی کوردی گوتووە ئەو خاوەنی دوو هەزار تفەنگە.

نرخی تفەنگێکی تورکی دەگاتە هەشت لیرەی تورکی، نرخی سەد گوللەش خۆی دەدات لە پێنج تا دە مەجیدی، ئەو هۆزە پەنجا سوارەیشی هەیە.

پێوەندیی هۆزی ئاتمی لەگەڵ کوردی بەلیامی (Balliam) قەزای مەلاتییە باش نییە، پار لەسەر کچێك شەڕ لە نێوانیادا قەوما، دەڵێن لەوانەیە ئەم زستانەیش دووبەرەکیی لە نێوانیاندا بتەقێتەوە، لەگەڵ ئەوەیشدا دوژمنایەتی لە نێوان ئەم دوو هۆزەدا دیاردەیەکی هێند کاریگەر نییە. ئابی ساڵی ١٩١٩ ئاتمییەکان بە هیچ جۆر نەکەوتنە ژێر کاریگەریی پرۆپاگەندەی دژ بە بەریتانیا، یا

---

(16) نۆیێل وێنەیەکی گەورەی یەعقوب پاشاو مەجلیسەکەی لەگەڵ ڕاپۆرتەکەیدا بڵاوکردۆتەوە، لە وێنەکەدا یەعقوب پاشا وەك سەرەك هۆزێکی بە جەوهەرو لێهاتوو دەرچووە.

(17) پێ، واتا Foot ، دوازدە ئینجە، بە وێنەکەشیدا دیارە یەعقوب پاشا کەڵەگەت نییە.

هی پان ئیسلامییەکان، زۆر زەحمەتیشە پرۆپاگەندەیەکی لەو بابەتە بتوانێت هیچ کارێکیان تیٚ بکات.

دوای هەموو ئەمانە لە نۆ خاڵی سەرەکیی تردا (ل٣٩) بە هەمان دەستوور باسی سەنگ و پێوانە و نرخ و پارەو پووڵ و کشتوکاڵ و مەڕو ماڵات و بەرهەمی سروشتی و هونەرو بازرگانی و ژیانی ئابووریی و زەوی‌و زارو باری تەندروستی و جۆری نەخۆشییە بڵاوەکانی ناو هۆزی ئاتمی و شێوازی ساکاری بەرەنگاربوونەوەیان دەکات و هەموویشیانی بە پاڵپشتی نموونەو ژمارەی زۆر تۆمار کردووە. بە وێنە دەربارەی مەڕو ماڵات دەڵیٚ:

((بەر لە جەنگ (جەنگی یەکەمی جیهان—ک.م.) خێزانی دەوڵەمەند دوو سەد سەر مەڕو بزنی هەبوو و خێزانی نەداریش بیستوپێنج سەر ، دوای جەنگ ئەو ژمارانە بە ڕێژەی لە سەدا پەنجا هاتنە خواریٚ))[*] (ل٤٠).

## دیسانەوە بنەماڵەی بەدرخانێکان

بەر لە ئێستە دەیان جار ناوی ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانی لەم کتێبەدا هاتووە، کە بەشێکیان پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییڵەوە هەیە. نۆییل، لە دووەم ڕۆژانەکانیدا بەشێکی سەربەخۆی بۆ بەدرخانییەکان تەرخان کردووە کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

(*) لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بۆ بۆچوونی کوردێکی شارەزا بکەم، کە لەپێشەکیی ئەو کارەمدا لەبارەیەوە گوتوومە دوکتۆر ئەمین موتابچی هەموو شەوێك دوای سەعات حەوت تەلەفۆنم بۆ دەکات تاوەکو بزانێت دەستکەوتە نوێکانی کاری ئەو ڕۆژەم چین، هەموو جارێکیش زۆر بەگەرمی پیٚ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە پێویستە ڕۆژێك زووتر ئەم بەرکوڵە بخەمە بەردەمی خوێنەرانی کورد، ئێمشەو، پازدە لەسەر شازدەی نیسانی ٢٠٠٧، دوای ئەوەی پوختەی ئەم بەشەی ڕاپۆرتەکەی مێجەر نوێڵم بۆی خوێندەوە گەلێك حەپەساو لە قسەدا لەگەڵ سەفەرنامەکەی ناسر خوسرەودا بەراوردی کردو وەك شارەزایەك فەرمووی ئەم ڕاپۆرتەی نۆییل هەزار بەردی داوە بە پشتی ئەو سەفەرنامە دانسقەیەدا!



مالباتا بەدرخانییان نیڤ دەولەتەك

دانیشتووان (لەڕاستەوە بۆ چەپ): بەحری بەگ، عەلی شامیل پاشا، ئەمین عالی بەدرخان (باوکی سورەیا و جەلادەت و کامەران بەدرخان)

ڕاوەستاوان (لەڕاستەوە بۆ چەپ): کامیل، میقداد میدحەت، حەسەن، موراد ڕەمزی بەگ (ئەم وێنەیە لەساڵی ١٨٨٠ دا گیراوە).

((ئەم بنەماڵەیە دەچنەوە سەر خالید کوری وەلیدی بەناوبانگ[*] کە یەکێك بوو لە سەرکردە هەرە لێهاتووەکانی ئیسلام، بۆیەکا جاروبار بە بنەماڵەی خالیدیش ناو دەبرێن..باپیرە گەورەی بەدرخانێکان هەر زوو دوای هیجرەت لە عەرەبستانەوە کۆچیان کردە کوردستان و شاری جەزیرەی ئیبن عومەریان دروست کرد. دەسەلاتی ئەو بنەماڵەیە بە عەزیزی ناسراو تا ساڵی ١٨٤٧ حوکمرانییان کرد. حوکمەتی عەزیزی تا ڕۆژگاری فەرمانرەوایی سوڵتان سەلیم تەواو سەربەخۆ بوو...))(ل ٥٣).

---

(*) ((لە شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا پەراوێزمان بۆ ئەو بۆچوونە کردووە - ع.زەنگەنە))

((ساڵی ١٨٣٩ میر بەدرخان (لەلایەن سوڵتانەوە—ك.م.) کرایە سەرکردەی فەخریی لەشکری عوسمانی و لەجەنگی (Nisib) دا بەشدار بوو، لەو شەڕەدا تورکەکان لەلایەن ئیبراهیم پاشای (کوڕی محەمەد عەلیی گەورەوە—ك.م.) زۆر خراپ شکێنران. میر بەدرخان هێزەکەی خۆی کشانەوە دیاربەکرو لەوێشەوە بۆ جزیرو کەڵکی لەشکاندنی تورك وەرگرت بۆ ئەوەی سنووری دەسەڵاتی بگەیێنێتە هەکاری و لێرەیش (خەڵکی ناوچەکە—ك.م.) بەگەرمی پێشوازییان لێی کرد.

ئەمە ئینزارێك بوو بۆ دەروازی بالا کە لەوە ترسا ناوچەکانی تری کوردستانیش بێنە ژێر سایەی دەسەڵاتی بەدرخان. عومەر پاشا کرایە مارشالی ئەنادۆڵ و فەرمانی درایێ لەشکرێك پێکەوە بنێ و دژی میری کوردان بکەوێتە ڕێ.

تورکەکان لە دیاربەکر کۆبوونەوەو لەوێوە دژی میری کورد کەوتنە ڕێ. شەڕی بێ ئەنجام[18](**)، دەستی پێکرد، بەڵام بەدرخان ناچار بوو بکشێتەوە قەڵای ئێڤراك (Evrak)، دوای چەند مانگێك بەرگریش قەڵاکە کەوت و لەوێ دەورووبەری شەش مانگ مایەوەو ئینجا دوورخرایەوە (دورگەی —ك.م.) کریت.

ڕێگەدرا بە میر بەدرخان دوو سەد کەس لە پیاوەکانی لەتەك خۆیدا بەرێتە کریت، ئەوانەی ڕۆڵێکی گەورەیان لە دامرکاندنەوەی ڕاپەرینی ساڵی ١٨٥٦ی گرێکەکاندا بینی. لە پاداشتی ئەوەدا بەدرخان هێنرایەوە ئەستەموول و ڕێگەی پێدرا لەوێ نیشتەجێ بێت.

ساڵی ١٨٦٦، واتا دوای دە ساڵ، بەدرخان تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٨٧٠دا لە دیمەشق نیشتەجێ بوو. بەدرخان پاشا، لە گوندی ساڵحییە، کە سەعاتێك لە دیمەشقەوە دوورە، بەخاك سپێردرا، گۆڕەکەی نزیك گۆڕی بەناوبانگترین کوردە کە سەلاحەددینی ئەیوبییە.(**)

---

(18) ئەو زاراوەیە لە دەقی ڕۆژانەکەدا بەم جۆرەیە Battle was indecisive کە واتای ((المعارك غير الحاسمة)) دەگەیێنێت.

(*) ((ڕاستتر قەڵای ئارۆخ بووە. تێبینی: عەبدولفەتاح بۆتانی (دکتۆر) لەسەر چاپی یەکەمی ئەم کتێبە— ع. زەنگەنە))

(**) ((ڕاستتر بەدرخان لە ساڵی ١٨٦٩دا کۆچی دوایی کردووە، گۆڕەکەیشی نزیك گۆڕی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە، کە ئەویش هەر کوردە. تێبینی: عەبدولفەتاح بۆتانی (دکتۆر) لەسەر چاپی یەکەم— ع. زەنگەنە))

بەدرخان نەوەت کوڕی دوای خۆی بەجێ هێشت. ئەم بنەماڵە گەورەیە هەمیشە بە نانەوەی بزووتنەوەی دژ بە حوکمەتی عوسمانییەوە خەریك بوون. شفرەیەکی تورکیی تایبەت بە بەدرخان هەیە (کە دەقەکەی دەڵێت-ك.م.) گشت بەدرخانییەکان، پایەو مەقام و توانایان هەرچییەك بێت، گیرۆدەی دوورخستنەوەو بەندیو ئەسارەت بوون))[19]. (ل ٥٣).

بەپێی زانیارییەکانی مێجەر نۆییل بەدرخان پاشا ((لە دوا ساڵی ژیانیدا لە پێناو یەکگرتنی وڵاتەکەیدا رووی کردە رووسیا. ئەو دوو بەدرخانییەی بە گەرمی دووی ئەم شەپۆلە کەوتن کامیل بەگ و عەبدولڕەزاق بەگ[20] بوون، ساڵی ١٩١٧ ئەو دووانە لەلایەن رووسیاوە کرانە والیی بەدلیس و ئەرزڕۆم. ساڵی ١٩١٨ عەبدولڕەزاق بەگ لەلایەن تورکەکانەوە دەزگیرکراو لە موسڵ بەندکرا، دەڵێن کامیل بەگیش لە تفلیسی (جۆرجیا-ك.م.) یە)) (ل ٥٤).

لە هەمان لاپەڕە پەنجاو چواردا نۆییل ئەم زانیارییانەی دەربارەی بەدرخانییەکان لە دوای شۆڕشی تورکە لاوەکانی ساڵی ١٩٠٨ەوە بۆ تۆمار کردووین.

((ساڵی ١٩١٠ حسەین پاشاو حەسەن بەگ بوونە نوێنەری کوردستان لە پەرلەماندا، یەکسەر دوای هەڵبژاردنیان فەرمانی گرتنیان دەرچوو، ئەوانیش پەنایان بردە بەر ناوچە شاخاوییەکان و لەوێ شەش مانگیان بە ئاوارەیی بردەسەر. تورکەکان حسەین پاشایان دەزگیرکردو بە دزییەوە کوشتیان[*]. یەکێك لەوانەی

---

(19) لە دەقی ڕۆژنامەکەدا وەها هاتووە:

((There is a special group for Badr Khan in the Turkish cypher. All Badr Khans of any ability and energy have suffered exile and imprisonment)), -((Diary of Major Noel on Special Duty in Kurdistan))P.53.

(20) شایانی گوتنە عەبدولڕەزاق بەدرخان بەر لە جەنگی یەکەمی جیهان مەشخەڵی کوردایەتیی بنەماڵەکەی بەسەرکەوتوویی گەیاندە کوردستانی ڕۆژهەڵات و یەکەم کۆمەڵەو یەکەم قوتابخانەی کوردیی لە شاری خۆی دامەزراند، قوتابییانی ئەو قوتابخانەیە بە پیتی لاتینی دەیاننووسی.

(*) ((دیارە ئەم بۆچوونەی کوشتنی حسێن پاشا لێرەدا راست نییە، بەڵکو ئەو زاتە دوای نەشتەرگەریی بە مردنی خۆی کۆچی دوایی کردووە، ئەو هەواڵەو وێنەکەی لەژمارە (٢) و (٣) گۆڤاری (ڕۆژی کورد) بڵاوکراوەتەوە-ع.زەنگەنە)).

لەشاخ لە گەڵیدا بوون و ناوی سلێمان بەگەو ئەویش بەدرخانییە، سێ ساڵ دوای ئەو دەربەدەرییەی مایەوەو ئەنجام لە دەرگوڵ لەلایەن سیخوڕەکانی ئەوڕەحمان ئاغای شەڕناخەوە، کە دوژمنی باوەکوشتەی بەدرخانییەکان بوو، دەزگیر کرا)) (ل٥٤).

لەلاپەڕەی دواتری ڕۆژانەکانیدا مێجەر نۆییڵ دەربارەی عەبدولڕەحمان بەگی بەدرخان، کەوا دیارە یەکێك بووە لە هەرە مۆدێرینەکانی ئەو بنەماڵەیە و ماوەیەك سەرنووسەری (کوردستان)ی یەکەم ڕۆژنامەی کوردیی و یەکێك لە ئەندامانی وەفدی کوردیی بووە بۆ یەکەم کۆنفرانسی تورکە لاوەکان کە ڕۆژی چواری شوباتی ساڵی ١٩٠٢ لە پاریس بەسترا، دەربارەی دەڵێت:

((عەبدولڕەحمان بەدرخان یازدە ساڵان لە سویسرە ژیاو هەر لەوێش ژنێکی سویسرەیی هێنا(**)، دەڵێن پیاوێکی زۆر دووربین و دونیادیدە و خاوەن دیدو بۆچوونی پێشکەوتنخوازە، لە کاتی شەڕی نێوان تورك و یۆنانییەکاندا کرایە موتەسەریفی ئایدن، لەوێش زۆر باش ڕەفتاری کردووە))(ل ٥٥).

بەر لەوەیش نۆییڵ ئەم هەواڵە نەبیستراوەمان پێ ڕادەگەیێنێت: ((حوکمەتی تورکی بەرانبەر ئەو زەرەرو زیانە زۆرەی بەر ماڵ و موڵکی بەدرخان کەوتووە بڕیاری داوە مانگانە دوو سەد لیرەی تورکی تەقاویتی بۆ بنەماڵەکەی ببڕێتەوە))(***) (ل ٥٤).

---

(**) ((ئەو ژنە سویسرییە ناوی (ئیلیزابێت) بووەو لە مالباتێکی ئەریستوکرات بووە، بنۆڕە: ڕۆژنامەنووس (گۆڤار) ژمارە (٨) ٢٠٠٦ – دیدارەك دگەل مالمیسانژ–ع.زەنگەنە)).

(***) ((لەبارەی ئەو بڕە پارەیەو چۆنیەتی دابەش کردنی لەنێوان میراتگرانی بەدرخان پاشا، بنۆڕە: مالمیسانژ، بدرخانیو جزیره بوتان، ترجمة: شوکر مصطفی، اربیل ١٩٩٨ – ع.زەنگەنە)).



عەبدولڕەحمان بەدرخان (١٨٦٨–١٩٣٦)

خاوەنی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لەگەڵ ئیلیزابێتی هاوسەری و منداڵەکانیان

(ئەم وێنەیە دیاریی مالمیسانژە و لە ژمارە ٨ی "گۆڤاری ڕۆژنامەنووس" دا بڵاوکراوەتەوە)

دوا بەشی ڕاپۆرتەکەی مێجەر نۆیێل تەرخان کراوە بۆ بابەتی شێوازی سەرژمێرکردن لەلایەن تورکەکانەوە کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٠٥دا دەستی پێکردووە، ناونیشانی ئەو بەشە بەم جۆرەیە:

((ڕاپۆرت دەربارەی سەرژمێرو ژماردن لای تورک))[21] (ل ٥٦–٥٧).

---

(21) ((Report on Turkish Census Figures)), ((Diary of Major Noel on Special Duty in Kurdistan)), PP. 56-57.

## پاشکۆی دووەم

### ڕۆژانەکانی نۆییێل

ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییێل، دوای نۆزدە لاپەڕەی دووەم، بۆ پاشکۆکانی تەرخان کراون (ل٥٨-٧٦). ((ڕۆژمێری کوردی Kurdish Galendar)) ناوونیشانی یەکێك لەو پاشکۆیانەیە کە لەسەرەتادا ناوی مانگەکانی بە ئینگلیزی و تورکی و کوردی بەم جۆرە تۆمار کردووە[22]:

| کوردی | تورکی |
|---|---|
| کانون پاشی | کانونی ئەوەل |
| گایجوك[23] | شوبات |
| ئادار | مارت |
| نیسان | نیسان |
| گوڵان | مایس |
| حزەیران | حەزیران |
| تیرماه | تەموز |
| تەباخ | ئاوستۆس |
| ئیلول یا ئێلول | ئەیلوول |
| چریا باری | تەشرین ئەوەل |
| چریا پاشی | تەشرین ثانی |
| کانونا باری | کانون ئەوەل |

بەهار، بەلای کوردەوە، لە یەکی مارتەوە، واتا لە سێزدەوە بە پێی شێوازی نوێ[24]، هاوینیش لەیەکی حوزەیرانەوە، واتا لە سێزدەوە بەهی نوێ، پایزیش

---

(22) بەپێویستمان نەزانی ناوی مانگەکان بە ئینگلیزیش بنووسین.

(23) Gaijuk.

(24)ئەو جیاوازییە لە جیاوازی کۆنی ڕۆژمێری گاورەوە هاتووە.

لەیەکی ئەیلوولەوە، واتا لە سێزدەوە بەهی نوێ و زستانیش لە یەکی کانونی یەکەمەوە، واتا لە سێزدەوە بە پێی شێوازی نوێ دەست پێ دەکەن.

کورد مەبەستیان لە چلەی زستان ساردترین ڕۆژانی زستانە، مەبەستیان لە چلەی هاوین گەرمترین ڕۆژانی هاوینە...)) (ل ٦١). دوا بە دوای ئەوە نۆیێل ئەو فۆلکلۆرە کوردییە باوانەی دەربارەی کەش و هەوا تۆمار کردووە کە لەناو کوردەواریدا باون و کردووشنی بە ئینگلیزی.(ل٦١–٦٢).

ئینجا مێجەر نۆیێل نزیکەی یازدە لاپەڕەی پاشکۆکانی دووەم ڕۆژانەکانی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردووە: ((خوو و ڕەوشتی کوردان چۆن لە پەندو قسە دانسقەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە))[25] لەو بەشەدا نۆیێل سەدو یەك پەندو قسەی نەستەقی کوردیی هێناوەتەوە، هەر یەکەشیانی وەرگێڕاوەتە سەر زوبانی ئینگلیزی، هی وەك:

١. مرۆڤ خوێندار بت ( واتا دوژمنی هەبێت–ك.م.) قەردار نەبت، هەڵبەت مەبەستی ئەم پەندە ئەوەیە بڵێت ئەوی غیرەتدار بێت هەرگیز رێگە نادات قەرزدار بێت.

٢. جانا مرۆڤ دەرکەویت، ناڤا مرۆڤ نا دەرکەویت (واتا باشتر وایە مرۆڤ گیان لەدەست بدات نەك ناوی بزڕێت–ك.م.).

٣. دژمنا بابێ نابتە دۆستا کوڕێ.

٤. ئەگەر دۆست هەزار با کەمە، ئەگەر دوژمن یەك با زۆرە (لای خۆمان دەڵێن: هەزار دۆست کەمە، دوژمنێك زۆرە–ك.م.).

٥. مرن میوانێ هەمی کەسێیە.

٦. مرن مرنە خرە خڕ چییە (لای خۆمان دەڵێن: مردن مردنە لنگەفرتێ چییە–ك.م.).

٧.هەر پێغەمبەرەکی دوعا ل جانا خوە کرییە (واتا هەموو پێغەمبەرێك بەر لە هەمووان دوعای بۆ گیانی خۆی کردووە–ك.م.).

---

(25) ((Diary of Major Noel on Special Duty in Kurdistan)), PP. 63-73.

٨. وەکی هیرچ پیر دبت قوتەیلە[26] پێدەکەنین (واتا کاتێك مام ورچ پیر دەبێت مشکۆلە پێی پێدەکەنێ. لای خۆشمان دەڵێن: گورگ کە پیر بوو دەبێتە مەسخەرەی سەگان–ك.م.).

٩. تو دەرا کەسێ نەکوتی کەس دەرا تە ناکوتێ (واتا ئەگەر تۆ دەرگەی کەس نەکوتی کەسیش دەرگەی تۆ ناکوتێ–ك.م.).

١٠. بولبل دانان قەفەزا زێڕ کرە گازی ئاخ وەلات ئاخ وەلات (واتا: گەر بولبول بخەیتە ناو قەفەزی زێڕەوە هەر دەخوێنێ ئاخ وڵات ئاخ وڵات–ك.م.).

١١. شام شەکرە وڵات شیرینترە (واتا: وڵات–نیشتمان شیرنترە وەك لە شام بە شەکرەوە–ك.م.)

١٢. وڵاتا من نینا

نیزاما قانونا وەلاتا زێرینا

کەسەرا دلا من وەلاتا ژوورینا

(واتا: ئەم وڵاتە وڵاتی من نییە، چونکە نیزام و یاساکەی هی وڵاتی ژێرین، یا نزمە، بەڵام قەڵای دڵی من وڵاتی ژوورینە، واتا وڵاتی شاخاوییە کە دیارە مەبەستی کوردستانە–ك.م.)

١٣. بیانی بدێ گۆشتێ جانێ عاقیبەت پەشیمانی.

١٤. ژن ستوونا مالێیە (لای خۆیشمان دەڵێن ژن کۆڵەکەی ماڵە–ك.م.).

١٥. ژن و مێر تەڤرو بەیر (واتا ژن و مێرد، تەورو خاکەناز، دیارە مەبەستی ئەم پەندەش ئەوەیە بڵێ ژن و مێردی تەبا مەگەر گۆڕ لێکیان بکا، چونکە تەورو خاکەناز بۆ گۆڕ هەڵکەندن بەکار دێن–ك.م.)[27].

(26) لە دەقی ڕێژانەدا وشەی قوتیلە هاتووەو هەر لەوێشدا مێجەر نۆییل بەم جۆرە ئەو پەندە کوردییەی کردۆتە ئینگلیزی:

((When the bear grows old the cubs laugh at him)), Ibid, P. 65.

وشەی cub یش لە فەرهەنگدا مشکۆلەیە.

(27) بە پێی وەرگێڕان و لێکدانەوەکەی مێجەر نۆییل وشەی Bair خاکەنازی لای خۆمان دەگەیێنێت. Ibid, P. 68

**١٦. مێر چەمە، ژن گۆمە.**

**١٧. ل ژنا نەگەڕا ل خزما بگەڕا (مەبەستی ئەوەیە خزم و کەسوکار چۆن بن هاوسەریش وەك ئەوان دەردەچێت، پەندێکی لای خۆشمان هەیە، دەڵێت: پێم بڵێ باوکت کێیە پێت دەڵێم تۆ خۆت کێیت–ك.م.).**

**١٨. ژن قەڵایە مێر فەلایە (واتا ژن قەڵایە، مێرد شوورایە–ك.م.)[28].**

**١٩. هندی ژنن هندی ژانن**

**هندی مەڵحەما دلانن**

**هند خانما کوپو ڕانم**

**(فۆلکلۆرە دەربارەی هاوسەر کە هەیانە ژین و هەشیانە ژانن، هەشیانە دەرمانی دلانن، هەشیانە تەنها بۆ ئەوە دەست دەدەن بیانخۆیت، دیارە مەبەست لەوەیە بەتاڵن، بەڵام لەبەر ئەوەی شۆخن بۆ هاوسەر دەبنە میوانی شەوان–ك.م.)[29].**

**لێرەدا، واتا لە هەمان لاپەڕە شەستونۆی ڕۆژانەکانیدا، مێجەر نۆییل دەربارەی سێکس (کاری سەرجێ) لەناو کوردەواریدا ئەم تێبینییەی بۆ تۆمار کردووین:**

**((لەناو کورددا ئافرەتی خراپ و وشەی (قەحپە) نییە، کە بیانەوێ ئەو وشەیە بەکاربهێنن، وەك ڕەمز بە تەوسەوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان وشەکە بە فارسی و لە باکووریش بە رووسی و لە باشووریش بە عەرەب و لە ڕۆژئاواش بە تورکی))[30].**

**٢٠. میڤان میڤانا خودێنە.**

**٢١. رزقێت میڤانان ل سەر خودێیە.**

---

(28) دەقی پەندەکە لە ڕۆژانەکاندا بەم جۆرەیە: ((A woman is a castle, men the besiegers))
نۆییل بەرانبەر وشەی (فالی) (besiegers) داناوە کە لە وشەی besuege ەوە هاتووە، یەکێك لە واتاکانی besiege یش ئابلۆوقە یا چواردەورە دانە. Ibid, P. 80

(29) Ibid, P. 69.

(30) Ibid, P. 69.

٢٢. میڤانـا درەنـگ شـیو لەسـەرا خویـا (واتـا میـوانی دەرنگـانیٚ شـیوی لەسـەر خۆیەتی–ك.م.).

٢٣. خزمەتی بکە ژ پیران ڕا وەکی پیر دبی خزمەتیٚ ببینـی (واتـا خزمـەتی پـیران بکە تا کە خۆیشت پیر بووی خزمەت ببینی–ك.م.).

بە پێی نۆبێـل گـەلێك لـە پەنـدی کـوردی لەگـەڵ پەنـدە ئەوروپاییەکانـدا وێـك دەچن و ئەم نموونانەی خوارەوە دەهێنێتەوە:

((نە پلەنگ دشێت خلقەتا وە بگۆڕێت نـە عەبـدی ڕەش))، یـا ((کـەنگی پـشك لەماڵ نییە، مشك بە کەیفا خەوایا–ك.م.))، لای خۆیشمان دەڵێن ((پشیلە لە مـاڵ نییـە مـشکان تلیلیانـە–ك.م.)) یـا (مـوش تـەگبیر کـرن گـوتن زەنگەلـەك بکەنـە ئەستۆی پشك) (واتا گەر مشك تەگبیرکەر بێت دەڵێت زەنگۆڵە بکەنە ملی پشیلە–ك.م.)، یا ((من دارەك دایە ناو چەرخا وی)) (واتا من دارێکـم خـستە نـاو چـەرخی ئەوەوە –ك.م.).

بـۆ سـەرنجی کـوردیش دەربـارەی دراوسـێکانیان مێجـەر نۆبێـل ئەمـەی هێناوەتەوە:

((گەردیٚ هەبوویا پادیشـاه بێك
لایق بدیبیا خودیٚ کـولاهـەك
ئەڵبەتە دەبوومە ژیٚ بەختێـك
ڕۆم و عەرەب و عەجەم تـەمامەن
هەموویان ژ مەڕا دکر غولامیی)) (ل ٧٢).

واتا:

(ئەگەر هەمانبووایە پادیشـایەك
خودا لایقی بدیبایـە تاجێك
هەڵبەت دەکرایەوە چارەی بەختم
ڕۆم وعەرەب و عەجەم تەمامـەن
هەموویانم دەکردنە غولامـی

(ئەمەیش دەبێت بەیتەکانی ئەحمەدی خانێ بن و وەك پەند کەوتبنە سەر زاری خەڵکی کوردستانی باکوور–ك.م.)[*].

دوا بەدوای ئەمە مێجەرنۆیێل بە جیا هەڵوێستی کوردمان بەرانبەر نەتەوە دراوسێکانیەوە، لە گۆشە نیگای پەندەکانیانەوە، بەم جۆرە بۆ باس دەکات و دەڵێت:

## هەڵوێستی کورد بەرانبەر تورك

کورد لە قووڵترین و ئەستوورترین ڕق بەولاوە هیچیان بەرانبەر تورك و هەموو کارەکانیان نییە، بۆیەکا دەڵێن:

١. وەکی خەبەرا ڕۆمییان (واتا وەکو وتەی تورك–ك.م.).

٢. خودێ چ کەسێ نەکان بەندا ڕۆمییان.

٣. وەکی دیرافێ ڕۆمی (واتا وەك باج و سەرانەی تورکەکان، کە کورد بۆ شتی بێ فەڕو بێ نرخ بەکاری دەهێنێت–ك.م.)(ل ٧٢).

## هەڵوێستی کورد بەرانبەر فارس

مێجەر نۆیێل، لەم بەشەی ڕۆژانەکانیدا، دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرانبەر فارس، دەڵێت: ڕقیان لە دووڕوویيان دەبێتەوە، بۆیەکا دەڵێن:

---

(*) ((دەقی شیعرەکانی خانی بە پچڕپچڕی و شێوێنراوی وەرگیراوە، ئەمانەی خوارەوە ڕاستییەکەتی:

| | |
|---|---|
| گەردێ هەبوویان مە پادشاهەك | لائیق بدی یا خودێ کولاهەك |
| تەعیین ببویا ژبۆ وی تەختەك | زاهر ڤەدبوو ژ بۆ مە بەختەك |
| حاسل ببوا ژ بۆ وی تاجەك | ئەلبەتە دبۆمە ژی ڕەواجەك |

لەشوێنێکی دیکەدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| گەردی هەبوویا مە ئیتیفاقەك | ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەك |
| ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی | هەمیا ژ مە ڕا دکر غولامی – ع.زەنگەنە)). |

١. وەکی شێری عەجەمان (مەبەستیان ئەوەیە کە شێری عەجەم هەردووك لای تیژە، بۆیەکا ئامادەیە وەك یەك، هەمان کات و بێ جیاوازی دۆست و دوژمنیش بپێکێت—ك.م.).

٢. وەکی عەسکەرا عەجەمان (بۆ هەمان مەبەست بەکاری دەهێنین—ك.م.).

٣. وەکی عەجەم قەڵەوە (دەبێ مەبەستیان ئەوە بێ لەسەرحسێبی خەڵك باش دەڵەوەڕێن—ك.م.)(ل٧٢).

## هەڵوێستی کورد بەرانبەر عەرەب

مێجەر نۆییل بۆ عەرەب دەڵێت: کورد رقیان لەوەیانە، کە بە چاوی ئاغاو نۆکەر، رەفتار لەگەڵ خەڵکی دیدا دەکەن، بۆیەکا لە پەندەکانیاندا لەبارەیانەوە دەڵێن:

١. دبێژن بۆ عەرەب ئەو دەڕێنە سەر عەبا.

٢. عەرەب وەك مێش هەندێ کش دەکەن هەر دێنە پێش (ل٧٢–٧٣).

## هەڵوێستی کورد بەرانبەر گاورەکان(*)

دەڵێت هەستی کورد بەرانبەر ئەرمەن لە هەستی دانیشتووانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ئەوبەری ڕۆژهەڵاتی لەندەن بەرانبەر جوو دەکات، بۆیەکا دەربارەیان دەڵێن:

١. نینۆك فەڵە، مەبەستیان ئەوەیە بڵێن ئەرمەنی وەك نینۆکی پەنجە پیسەو جێگەی بڕوا نییە.

٢. هەسپێی قولەسییە، توولە مارە، فەلە لای مەبە ئەوڵە، دەڵێ مەبەستیان لەوەیە بڕوایان پێ نەکەیت. (ل٧٣)

بەپێی ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییل کورد وەك خۆیان دەڕواننە نەستوورەکان بۆیەکا دەڵێن:

---

(*) ((پێموایە دەبوو ناوونیشانی ئەم بەشە، هەڵوێستی کورد بەرامبەر (ئەرمەن) بووایە، چونکە لە دەقی تێکستەکاندا دیارە مەبەستیان لە (فەلە) ئەرمەن بووە، نەوەکا گاورەکان. —ع.زەنگەنە)).

٣. ناڤبەینا مە موویەکە، ناڤبەینا مە فەلا چیایەکە، دەلـێ مەبەسـتییانە بڵـێن تاکە موویەك ئێمـەو نەسـتوورییەکان لێك جـودا دەکاتـەوە، بـەڵام شـاخێك ئێمـەو ئەرمەن لێك جودا دەکاتەوە.

٤. هێجەتا سێرگینان[**]، د.چنە گوندا ماخینان.

واتا ئەگەر یـەکێك بیـەوێ بـۆ شـتێك سـووتەمەنی بـچێتە گونـدێکی نەسـتووری لەوانەیە بشیەوێ کیژێك ببینـێ.

لە کۆتایی ئەم بەشەی ڕۆژانەکانیدا مێجەر نۆییڵ[*] دەڵێت کـوردی سـوونەی توندڕەو مافی ئەوەیان نییـە کـچە گـاور بهێـنن، ، ەڵام چـونکە یـەك دەچـن بۆیـەکا دڵداری لە نێوانیاندا باوە (ل٧٣).

---

(**) ((سێرگین: ریخی چێڵ (مانگا) کاتێ کە وشك بوویێتەوە، لەلای ئێمە پێی دەگوترێ (سـەرگین)، ئەوە جاران بۆ سووتەمەنی بەکاردەهێنرا، ژنان دەچوون لەچۆڵەوانی کۆیان دەکردەوەو بـۆ نـان کـردن بەکاریان دەهێنا، پێموایە لەسلێمانی و دەوروبەری پێی دەڵێن (تەپاڵە)، ئـەو پێناسـەیە ڕەحیمـە مـەلا زادەی هاوسەرم بۆی کردووم ـ ع. زەنگەنە)).

(*) ((هەروەها کتێبی "یادداشتەکانی مەیجەر نۆئێل لە کوردستان" وەرگێڕدراوی (حسین ئەحمەد جاف و حسێن نێرگسەجاڕی)یە، کە دیار نییە کتێبەکە کەی چاپکراوە، بەڵام مۆڵەتی ساڵی ١٩٨٤ی پێوەیە، زۆربەی ئەو پەندە پێشینانەی سەرەوەم لەگەڵ پەندەکانی ناوەرۆکی ئەم کتێبە بەراورد کردووە.

لەلایەکی دیکەوە لەناوونیشانی ئەم کتێبەدا، دووخاڵ سەرنجی ڕاکێشاوم، یەکێکیان سەرەتای ناوونیشانی کتێبەکە، بەیادداشت تۆمارکراوە، دیارە ئەمەشیان هەڵەیەو وەکو د.کەمال مەزهەر لێکی داوەتەوە (Diary) مانای ڕۆژانە دەگەیەنێت، نەوەك یادداشت. لەلایەکی دیکەوە ناوەکەی "نۆییڵ"یان بە "نۆئێل" نووسیوە، ئەمەشیان ئێمەی خستە گومانەوە، بۆیە لەم بارەیەوە پرسمان بە کاك "حسێن فەیزوڵلا جاف" کرد، کە ئەویش شارەزاو ئینگلیزی زانێکی لێوەشاوەیەو بابەتێکیشی بەناوونیشانی (البدرخانیون في یومیات المیجر نویل) لە هەرسێ ژمارەی (١٦٦٨، ١٦٧٠، ١٦٧٣)ی ڕۆژنامەی (الاتحاد)ی ڕۆژی ٢٩/٩-١/١٠-٦/١٠/٢٠٠٧ بڵاوکردۆتەوە، دیارە ئەویش ناوەکەی وەکو نێو ئەم کتێبەی ئێمەی پێ ڕاستتر بوو-ع.زەنگەنە)).

## دوا وشه

باوەڕ ناکەم هەر ڕووناکبیرێکی بە ویژدانی کورد یا بیانی، ئاگاداری ڕۆژانەکان و گەشت و یادداشت و بۆچوونەکانی بەڵگەنامە نهێنییەکانی مێجەر نۆییل بێت دەربارەی پرسی کوردو دواڕۆژی کوردستان بەدڵ ڕێزی ئەو پیاوە نەگرێت. لێرەدا پەنا دەبەمە بەر نموونەیەکی لەبار. بێگومان نەوەی بەدرخان بێ ئەندازە خزمەتی نەتەوەکەیانیان کردووەو تا ئێستا بەڵگەی زۆرمان دەربارەی ئەو ڕاستییە هێناوەتەوە. یەکێك لە بەرهەمە بڵاوکراوە بەنرخەکانی میر جەلادەت بەدرخان (هەرەکوڵ ئازیزان) ئەو کتێبەیەتی کە ساڵی ۱۹۳۰ لە قاهیرە بە ناوی خواستەنیی بلەچ شێرکۆوە بە عەرەبی و فەرەنسی بە ناونیشانی (پرسی کورد..ڕابردووی کوردو ئێستایان)[31] بڵاوی کردۆتەوە، بۆ خۆم دەربارەی بایەخی ئەو بەرهەمە لە ((مێژوو))دا گوتومە:

(القضية الكُردية)، یەکێکە لە بەرهەمە بەهادارەکانی جەلادەت بەدرخان کە ساڵی ۱۹۳۰ بە فەرەنسی و عەرەبی بە ناوی دوکتۆر بلەچ شێرکۆوە بڵاوی کردۆتەوە. لەو کتێبەدا کە عەرەبییەکەی ۱۱۲و فەرەنسییەکەی ٥٦ لاپەڕەیە، جەلادەت بەدرخان بە جۆرێکی ڕێکوپێك پوختەی مێژووی کۆنی کوردو بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە کوردستانداو دەوری گەلی کورد لە ژیانی ژیاریی ئیسلام و زمان و ئەدەبی کوردو خەبات و ڕاپەڕینەکانیانی تۆمار کردووە. ئەو کتێبە کە بۆ خۆی یەکێکە لە بڵاوکراوەکانی ((کۆمەڵەی خۆیبوون)) هەمان کات سەرچاوەیەکی ڕەسەن و نایابە دەربارەی ئەو ڕێکخراوە کە جێگای لە خەباتی نەتەوەیی گەلی کوردو چالاکییەکانی ڕووناکبیرانی کوردستاندا دیارە[32].

---

(31) الدكتور بلەچ شيركو، القضية الكُردية، ماضي الكُرد وحاضرهم، القاهرة، ۱۹۳۰.
Docteur Bletch Chirguh, La Question Kurde. Ses origines et ses causes, Le Caire, 1930.

(32) کەمال مەزهەر، مێژوو. کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کوردو مێژوو، بەغدا، ۱۹۸۳، ل ۱۸۹.



وێنەی جەلادەت و کامەران بەدرخان وەکو لە ئەرشیفی رۆژانەکانی نوبێلدا هەلگیراوە

جا دلنیام ئەگەر جەلادەت بەدرخان فریا بکەوتایە هەموو نووسینەکانی مێجەر نۆبێل بخوێنێتەوە، بێگومان ئەو کتێبە ناوازەیەی ناوازتر دەبوو[*].

---

[*] ((بەر لە کۆتایی ئەم بابەتە بە پێویستی دەزانم ئەمەیش بۆ مێژوو تۆمار بکەم. ڕۆژێکیان لە گەرمەی هەڵسەنگاندنی دووەم ڕۆژانەکانی نۆبێلدا بووم کاتێك شاعیری هەڵکەوتووی نەتەوەکەمان عەبدوڵڵا پەشێو بە تەلەفۆن لە سویدەوە قسەی لەگەڵ کردم، بە دڵ پێم گووت:
پەشێو، مێجەر نۆبێل شایانی ئەوەیە تاوێك سەرت لەژێر بستە ئاسمانێکی شینی لەندەندا دانەوێنێت و تاجەگوڵینەی رازاوەی وەفای کورد لەسەر گڵکۆی ئەو سەربازە ونە دابنێی!))

## هەولێر

## سەرەتای ساڵی ١٩٢٠ لە ڕۆژانەیەکی تردا

لاپەڕە ٢٣٣-٢٤٢ی هەمان فایل کە دووەم ڕۆژانەکانی مێجەر نۆییلی تێدا هەڵگیراوە بۆ بەشێك لە ڕۆژانەکانی ئەفسەرێکی تری حوکمەتی بەریتانیا تەرخان کراوە. ئەو ڕۆژانەیە هی ئەفسەری سیاسیی بەریتانییە لە هەولێرو بریتییە لە دە لاپەڕەو باسی هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەو ناوچەیە دەکات، کۆتایی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٠ ئەفسەری ناوبراو ناردوویە بۆ مەندوبی سامیی بەریتانی لە بەغداو ئەمیش ڕۆژی پێنجی مارت دوو وێنەی لێ ناردووە بۆ وەزیری هند لە لەندەن[33]، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ئەو ڕۆژانەیەیە:

**(وەرگیراو لە ڕۆژانەی ئەفسەری سیاسیی هەولێر[34]، مانگی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٠):**

کاتێك کێشەی سوورچی لە ناوچەی ئاکرێ (عەقرە) قەوما خۆشبەختانە سەرۆکەکانی هەرکی و زراری لە هەولێر بوون، تا تەواو بوونی کێشەکە لەوێ مانەوە. لەوە ناچێ ئەوان بە ئاشکرا هەستی لایەنگیریی خۆیان بۆ سوورچییەکان دەربڕیبێ، خودی ئەمەیش بەشێکی مەسەلەکە نەبوو. هەموو ئەو سەرۆکانە لایەنگریی خۆیان بۆ میری دەربڕیو ئامادەییەکی زۆریان نیشان دا بکەونە بەینەوە یا لە ڕێگەی سوورچێکانەوە، یا لە ڕێگەی شێخ ئەحمەدی بارزانەوە.

بێگومان پێویستە حوکمەت هەر ماوە نا ماوەیەك مەودای تەقینەوەی ناوخۆ بۆ ئارەزووی شاردراوەی شەڕ لای کورد بڕەخسێنێ ئەگینا لەوانەیە ئەو ئارەزووە بەرووی حوکمەت خۆیدا بتەقێتەوە[35].

---

(33)N.A, F.O., 371/5068, Political, Eastern Turkey. File 11, 1920, Extract from the Diary of the Political Officer, Arbil, for the month of January 1920, PP. 233-242.

(34) لە دەقی ڕۆژانەکەدا ئەربیل هاتووە نەك هەولێر.

(35) لە دەقی ئینگیزییەکەدا وا هاتووە:

**هۆزەکانی هەولێر:**

سەرۆکەکانی دزەیی دوژمنایەتیی چەکداریی نێوان خۆیان وەلا ناوەو ئێستاکە بە کاریز لێدان و چاککردنی زەوی‌و زارەکانیانەوە خەریکن. ئەوان لە بریتی ئەوەی خۆیان بە شەڕەوە خەریك بکەن یەکیان یاریدەی ئەوی دیيان دەدا بۆ لێدانی کاریز، یا دروستکردنی بەربەست و هەڵکەندنی جۆگە. جاران وەك چەتەو ڕێگر ناوبانگیان دەرکردبوو، بەڵام ئێستا شانازی بەوەوە دەکەن کە پارێزگاریی ئاسایشی ناوچەکەیان دەکەن و بە دڵ پشتی سیاسەتی میری دەگرن بۆ قەدەغەکردنی یەکجارەکیی هەڵگرتنی چەك لە ناوچەکەیاندا.

دزەییەکان ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی بۆ یاریدەدانی حوکمەت دژی سوورچییەکان، بەڵام مەیلی زۆریان دەربارەی چاکسازییە کشتوکاڵییەکان دەرنەبڕی. ئەوان دەتوانن لە ماوەی چوار ڕۆژاندا سەدو پەنجا تا دوو سەد سوارە ئامادە بکەن، بەڵام پتر حەز دەکەن وەك دەشتەکی بژین وەك لەوەی بەو کردارە ناساکارانەوە (موعەقەدانەوە) خەریك بن کە لە کاتی هەڵمەتەکاندا بۆ دابینکردنی خۆراك و ئامادەکردنی پەناگە دەکرێن.

ئێستەیش کە هێڵی شەمەندەفەر گەیشتۆتە شەرقات ژمارەیەکی زۆر لە لادێیەکان دەچنە بەغدا و لەو سەرەوە کەمێك شتومەکی بازرگانیی لەگەڵ خۆیاندا دەهێننەوەو لە بازاڕی گوندەکاندا بەنرخێکی هەرزانتر دەیفرۆشن وەك لەوەی لە بازاڕی هەولێردا دەفرۆشرێت. ڕاستییەکەی ئێستە لە گوندەکاندا بازاڕی خۆیان هەیە، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا دەرفەتێکی لەبار بۆ پەرەسەندنی بازرگانیی ڕێکوپێك دەڕەخسێنێت.

زیارەتی ئەم دواییانەی ئەحمەد پاشای (دزەیی–ك.م.) و حاجی پیرداود ئاغای (دزەیی– ك.م.) بۆ بەغدا کارێکی یەکجار کاریگەری تێکردن. ئەوان دەڵێن تەنانەت لەندەنیش ناتوانێت لە بەغدا جوانتر بێ و سوێند دەخۆن ڕۆژی جەژنی

---

The hill Kurd undoubtedly likes a crap from time to time and if the Government does not give him achance fighting with it, he will probably fight against it, ((Extract from the Diary of the Political Officer, Arbil, for the month of January 1920)), P. 233.

سەری ساڵ پتر لە سەد هەزار سەربازیان لەناو بازاڕی بەغدادا بەچاوی خۆیان دیوە. هەموو هەڵوێستیان گۆڕدراوەو هەستی ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن بۆ جێبەجێکردنی هەچ شتێك حوكمەت ئارەزووی لێ بێت شتێكی زۆرباش دەبێت، بێتو قەناعەت بە سەردارانی ناوچەكان بكرێت بچنە سەردانی بەغدا ئەوان ئەمانەیان دوای خۆبەدەستەوەدانی ڕەهبەرانی دزەیی لە ئەنجامی یاخیبوونەكەی تەمموزی (ساڵی ١٩١٩دا–ك.م.) بۆ ڕەخسا، تایبەت پاش ئەوەی شەش مانگ دەسبەسەرییەكەیان بەسەر چوو.

**گەردی:**

جەمیل ئاغای گەردی، بەرانبەر ئەو یاریدەیەی لە ڕەواندز پێشكەشی منی كرد، خەڵات كرا، وەك دزەییەكانیش لەناو هۆزەكەیدا دەسەڵاتی ڕەهبەریی پێ بەخشرا.

**هۆزەكانی ڕەواندز:**

لەماوەی مانگی ڕابردوودا هیچ ڕاپۆرتێك دەربارەی ڕوودانی هیچ هەراو بگرێك لە ڕەواندز نەدراوە، دەسەڵاتی ئیسماعیل بەگیش[36] هیچ موونافیسێكی نییە. هێمنییەكی گشتیی باڵی بەسەر ناوچەكەدا كێشاوەو بازرگانییش گەشەی

(36) مەبەست ئیسماعیل بەگی ڕەواندزییە كە یەكێك بوو لە ڕووناكبیرە دونیادیدە ناسراوەكانی كورد، (هامیلتن)ی ئەندازیار لە كتێبە شاكارەكەیدا ((ڕێگەیەك بە ناو كوردستاندا)) لە هەر كوردێك زۆرتر بە شانوباهوی ئەویدا هەڵداوە، یەكێك بوو لەوانەی زۆر زوو ڕادیۆی هێنایە كوردستان، نوێنەری هەولێر بوو لە پەرلەمانی عیراقیداو یەكێك بوو لەو شەش نوێنەرە كوردەی ڕۆژی چواری نیسانی ساڵی ١٩٢٩ یادداشتێكی سەربەخۆیان، دەربارەی مافەكانی كوردی عیراق، دایە سەرەك وەزیرانی ئەوسا عەبدولموحسین سەعدوون، ئەوەی نەتەوەپەرستە توندڕەوەكانی شێتگیر كرد، ئەوانەی بوونە گاڵتەجاڕی پیرەمێردی گەورە، زۆر بە داخەوە ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی بووە قوربانیی دوو بەرەكیی هۆزایەتی.

((بۆ پتر زانیاری لەبارەی ئیسماعیل بەگ، بنۆڕە: پەراوێزی تەك ژمارە (٦)ی بابەتی پێنجەم لە ل١٥٣ی ئەم كتێبەدا هەرچی عەبدولموحسین ئەلسەعدوون بوو لە ڕۆژی چوارشەممەی ١٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٢٩دا خۆی كوشت– ع.زەنگەنە))

سەندووە. بەفر ڕێگەی ئێرانی گرتووە. دەڵێن حاجی نەورەس لەگەڵ برایانی یوسف بەگدا بە پیلانگێڕانەوە خەریکە.

**باڵەك:**

حاجی محەمەد ئاغا، لە کاتی زیارەتیدا بۆ هەولێر، خەڵات کرا. دانیشتووانی مەرگەش نەبوونەتە هۆی دروستبوونی هیچ کێشەیەکی تر بۆ من و بەشێك لەو شتومەکانەی تالانیان کردبوون گێراندیاننەوە. قادر ئاغایش، کە جاران هاوپەیمانی یوسف بەگ بوو، دەزگیر کرا، بەڵام دوای ئەوەی بەڵێنی دا لەمەودوا خراپەکاریی نەکات ئازاد کرا.

**ناودەشت:**

دەڵێن برایانی دایك و باوکیی یوسف بەگ هەر یەك لە ڕەشید بەگ و بێگۆك دەستیان لە یاریدەدانی سوورچییەکان هەڵگرتووەو وا چاوەڕوان دەکرێت پێوەندییان بە شێخ ئەحمەدی (بارزان—ك.م.) و تورکەوە کردبێت. بەڵام هیچ مەترسییەك لەو جووتە ناکرێت. هەرچی بەکر بەگیشە کە زڕبرای یوسف بەگە پشتگیریی میری دەکات.

**سوورچی:**

ڕۆژانی هەراکەی عەقرە، سوورچییەکانی دەشتی هەریر، هیچ جۆرە کێشەیەکیان نەنایەوە، جگە لە دوو موختاریان کە یەکێکیان ئێستا لە هەولێر بەندە، ئەوی دیکەیشیان کە برایەتی بە خۆی و خاووخێزانییەوە لە زێ پەڕیونەتەوە.

**هەرکی:**

ئێستە هەرکییەکان لە دەوروبەری دێرە نیشتەجێ بوون و وا پێناچێت نیازی خراپەکارییان هەبێت. ئەحمەد خان، پەنجا لیرەی تورکیی دا لە بریتی ئەو کەلوپەلانەی پیاوەکانی بە تالانی بردبوویانن:

هەرچی یاهو ئاغایشە پێشنیاری کرد یاریدەی حوکمەت بدات کاتێك هێزەکانی میری هێرشیان بردە سەر ناوچەی بارزان.

**خەیلانی:**

عزیـزی هـودیAziz-i-Hudi ، کـە سـەرۆکی لقێکـی هـەرکی و خزمـی شـێخ عوبەیدوڵڵای بجیلە لەگەڵ برازایەکی لە کاتی بۆمبابارانی یەکەمی بجیلـدا کـوژران. بە ڕاستی شێخ عوبەیدوڵڵا پیاوێکی خراپ بوو.

خەیلانییەکان هەستیان بـە تالآنییـەکانی کردبـوو. بەشـێك لـە هـۆزی خـەیلانی ئێستا لـە دەشـتی حـەریر نیـشتەجێ بـوون و ئـەو بەشـەکەی تریـان لـە ناوچـەی هەولێرن.

**شێروان:**

جەمیل ئەفەنـدیی کـاتبی ئیـسماعیل بـەگی (ڕەوانـدزی-ك.م.) لـەم چـەندانەدا چـەند ڕۆژێکـی لـەناو هـۆزی شـێرواندا بـردە سـەر، بـە پێـی ڕاپـۆرتی ئـەو ئێـستا شێروانییەکان هەموویان هێمنن و هـیچ مـەیلێکیان دەرنـەبڕیوە بدەنـە پـاڵ شـێخ ئەحمەدی (بارزان-ك.م.) یا فارس ئاغای (زێبـاری-ك.م.).بـەپێی قـسەی جـەمیل ئەفەندی، ئەحمەد ئاغای شێروانی، تا وەکـو بتوانێـت داهـاتی مـیری خـڕ بکاتـەوە داوای جەندرمەی کردووە، لە ئەحمەد ئاغا خۆیـشییەوە نامەیـەکمان پێگەیـشتووە کە تێیدا دەبێژێ: فارس ئاغا بە یاریدەی ژمارەیەك لە مزوورییەکان چۆتە یاریدەی سوورچییەکان.

**برادۆست:**

نامەیەك لە محەمەد سەعید بەگەوە گەیشتووە کـە هـەواڵی بـەدیل گیرانـی نامەبەری ئیسماعیل بەگی بۆ سەید تەها تێدایە. محەمەد خزمی یوسـف بەگـە، بـە پێی ڕاپۆرتەکان ئەو پردی پێوەندیی بوو لە نێوان یوسف بەگ و تورکەکاندا.

**بارزان:**

تا ئەو کاتەی شێخ ئەحمەدی بارزان بە توندی سزا نەدرا هەمیـشە لـە ناوچـەی ڕەواندزدا ئەگەری ڕوودانی هەراو بگرەو بزووانـدنی خەڵکەکـەی لـە ئـارادا بـوو. بـە هۆی باری کەش و هەواوە تاوەکو مانگی مارت ناتوانرێت هێرشی بکرێتە سەر.

## یاسا و هێمنی و بارودۆخی ناوچەی هەولێر

دەورووبەری ناوەندی مانگی (کانوونی دووەم-ك.م.) لە گوندی تەل کوشاف، لە نزیك ئەو شوێنەی زێی گەورەی تێدا دەرژێتە دیجلەوە کوشتار رووی‌دا. موختاری بەشی کوردیی تەل کوشاف میوانێکی لە پەنجەرەی دیوەخانی (ماڵی موختار-ك.م.)ەوە لەلایەن بکوژێکی نەناسراوەوە[37] کوژران. وا گومان دەکرێت بکوژەکە پیاوێکی عەرەب بێت کە ماوەیەکی دوورودرێژ خوێن کەوتبووە نێوانی ئەوو موختارەوە، بەڵام هیچ بەڵگە، یا شایەتێکی عەمەلی لە ئارادا نییە.

لە کۆیەش دوو سێ کاری جەردەیی سووك لەنزیك سنووری ناوچەکەوە روویدا. تاوانبارەکان نەناسراون، بەڵام لەوانەیە لەو دوو سێ گوندە نزیکانەوە بێن کە بلباسەکانی تێدا دەژین.

وێرای ئەمانە یەك دوو سووکە دزیش روویان داوە، هیچ راپۆرتێکیش دەربارەی رووداني تاوان، نە لە هەولێرەوەو نە لە ناوچەی رەواندزەوە، نەدراوە.

داهات:

مەڕو ماڵاتی هەرکیو خەیلانی لەلایەن مودیری دێرەوە سەرژمێر کراون. هەرکییەکان، چونکە پار باجیان نەداوە، دوو باجیان لێ دەسێندرێ، ئەنجامی سەرژمێرەکەش بەم جۆرەیە:

هەرکی۲۳٦۷۳ سەرمەڕ.

خەیلانی ۳٤۳٦ سەرمەڕ

---

بە هەردووکیان ۲۷۱۰۹ سەرمەڕ.

ئەوەی پێویستە بۆ دەستبەکاربوون لە یەکی شوباتەوە بۆ سەرژمێریی مەڕوماڵات لە هەولێرو لە رەواندز جێبەجێ کراوە. فەرمانبەرانی ناوچە لەو سەرژمێرییە بەرپرسیار دەبن ، بەڵام بۆ هەر یەکەیان یاریدەدەرێك دادەنرێ.

---

(37) لە دەقی رۆژنامەکەدا وا هاتووە: ((by an anknown assailant))

**داهاتی زەوی و زار[38]:**

پارەیەکی کەم لە داهاتی زەویو زاری ناوچەی هەولێر کۆنەکراوەتـەوە، نزیکـەی یەك دەرسێی کۆی قەرزی داهاتی زەویوزاری ڕەواندزیش تا کانوونی یەکەمی (ساڵی ١٩١٩-ك.م.) کۆکراوەتەوە، وەرگرتنی ئەو داهاتە لە ناحییەی دێرەش باش بـەڕێوە دەچێ.

**کارگێڕیی:**

دوای داخستنی دایەرەی سیاسیی باتـاس، دێرەو دەشـتی حـەریر (هـەریر) بـە هەمان شێوازی ناحییەکانی تری ناوچەی هەولێر ئەوانیش کرانە ناحیە. یەحیا بـەگ، بە مودیری مایەوەو کاتبێك و سێ قۆڵچیش بۆ یاریـدەدانی دانـران. پـەیمانیش دراوە پشکنەرێکی داهات بۆ ناوچەکە دابنرێ، هیوادارین بەم زووانە بگاتە جێ.

**وەقف:**

بەڕێوەبـەری وەقـف نییـە، بـەڕێوەبردنی سـەرجەمی کاروبـاری وەقـف خراوەتـە دەست موفتی کە مووچەیەکی باش وەردەگرێ و هیچ کارێکیش نییە بیکات.

**خوێندن:**

نەخۆشخانە کۆنەکەی (هەولێر-ك.م.) چۆڵ کراوەو بیناکەی دەکرێتە قوتابخانـە. هەرچی بەشە سـەرەتاییەکەی قوتابخانەکەیـە لـە شـوێنەکەی خـۆی، واتـا لـە قـەڵا، دەمێنێ چونکە زۆربەی قوتابییەکانی لەو نزیکانە دەژین و بـۆ منداڵـە بـچکۆلەکانیش هەر وا ئاسان نییە بێنـە خـوارێ بـۆ دامێنـی گردەکـە، بـەڵام بەشـە ئیبتیدائییەکـەی دەچێتە خانووبەرەیەکی نوێوە.

بەڵام ئەو خانووبەرە نوێیەی بیرمان لێ کردۆتەوە گەلێك نزمەو تەڕوتووشیشی زۆرە، بۆیەکا ژمارەیەك پێشنیازی جیاواز بۆ چاك کردن پێشکەش کراوە، بەڵام تا ئێـستا هـیچ بڕیارێکی کۆتایی دەربارەی ئەو بابەتـە نـەدراوەو دەبـێ گفتوگۆ لـەم بارەیـەوە لەگـەڵ کارمەندێکی بەشی خوێندندا بکرێ کە چاوەڕوانین بەم نزیکانە بگاتە هەولێر.

---

(38) جێگۆرکێمان بە هێڵەکانی ناو ڕۆژنامەکانی ئەفسەری سیاسیی هەولێر نەکردووە، واتا لە دەقی ڕۆژنامەکاندا چۆن و لە کوێ، لە کەنار، یا ناوەندی لاپەرەکەدا هاتوون ئێمەیش وەهامان داناون.

سەربازیی:

ڕۆژی بیستوسێی کانوونی دووەمی (ساڵی ١٩٢٠—ك.م.) بارەگای هەشتاو حەوتی (سەربازە—ك.م.) پەنجابییەکان لە هەولێر کشاونەتەوە، ئێستاکە تەنها حامییەیەك ماوە کە لەسێ فەوج پێکهاتووە.

شارەوانی:

ڕۆژی بیستوچواری (کانوونی دووەمی١٩٢٠—ك.م.)، ئەنجوومەنی شارەوانیی هەولێر بۆ دانانی بودجەی ساڵی داهاتوو کۆبۆوە.

ئەو بابەتە سەرەکییانەی سەرنجیان ڕاکێشا دەربارەی ڕێگەوبان بریتین لە جۆگەلەیەکی بەرین کە لە ناوەندی شەقامەکە دڕ دەدات، پێشنیار کراوە ئەو جۆگەلانە پڕ بکرێنەوەو ڕێگەوبانەکان لە هەردووك سەرەوە بەرەو ناوەڕاست خوار بکرێنەوە تا باراناوی تێدا گیر نەخوا.

ئەفسەری تەندروستیی موسڵ لە کاتی هاتنی ئەم دواییانەیدا بۆ هەولێر نەخشەیەکی داڕشت سەبارەت بە پڕۆژەی ئاوی خواردنەوەی شار. ئەو پڕۆژەیە بریتییە لە دامەزراندنی تانکییەکی ناوەندیی (مەرکەزی گەورە)، وێڕای ژمارەیەك تانکیی پچووك لەهەر یەکێك لەگەڕەکەکانی شاردا بە قەڵاوە، ئاویش لە تانکیّ گەورەکەوە ڕاگوێزرێتە تانکییە گچکەکان، هەڵبەت ئەم کارەیش لەلایەن دانیشتووانی شارەوە بەرز دەنرخێنرێت. ژمارەیەکی زۆر لە ڕێگەوبانیش لە قۆناغی دروستکردن دان، بەڵام ئەم کارە بە هۆی بارانی زۆری ئەم دواییانەوە دواکەوت.

نەخۆشخانە:

بەهۆی گەلێك ئاڵوگۆڕی سەربازییەوە کە بوونە هۆی کەم بوونەوەی ژمارەی ئەو ئەفسەرانەی لێرەن، بۆیەکا ئەو باڵەخانەیەی ئەوانی تێدا دەژیان ئێستا چۆڵە. کەڵك لەم دەرفەتە وەرگیرا بۆ گواستنەوەی نەخۆشخانەی (هەولێر—ك.م.) بۆ ئەوێو بەو جۆرە قوتابخانەکەش دەچێتەوە شوێنەکەی جارانی وەك ڕۆژانی تورك.

باڵەخانە نوێیەکەی نەخۆشخانەکە لە بارێکی باشدایەو زۆر لەو خانووە باشترە کە ئێستا تێیدایە، هەرچۆن بێ کەوتۆتە قەراغ شارەوەو ئەوەیش بە باشتر زانرا لەباری تەندروستییەوەو بۆ ناساغانی دەرەوەی شار[39].

(39) N. A., F. O., 371/5068, Extrat from the Diary of the Political Officer, Arbil, for the month of January 1920, PP. 233-242.

هەڵبەت ئینگلیزەکان، لەگەڵ تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهاندا، مەبەستیان بوو نزیکتر لە جاران ئاگاداری ئەوە بن کێ لە کوردستاندا دەستی دەڕوات و سەنگو ڕەنگی ئەو کەسانە چەندن و چین و هەواداری چ هێزو لایەن و دەوڵەتێکن و بۆ؟ لەبەر ئەوەیە ژمارەیەکی زۆر بەڵگەنامەو ڕاپۆرت دەربارەی کەسایەتییەکانی کوردەواری لە ئەرشیڤی نیشتمانیی حوکمەتی بەریتانیدا پارێزراون، کە بێگومان سەنگی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییان زۆر زۆرە، چونکە ڕۆڵی تاك یا کەسایەتی، بەپێی هەموو پێوانەیەك، لە نووسینەوەی مێژووی گشت نەتەوەیەکدا ڕۆڵێکی دیارو وەبەرچاوە.

فایلی ژمارە ٩٣/٢٥١ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، یەکێکە لە فایلە گەورەکانی ساڵی ١٩١٩، ژمارەی لاپەڕەکانی ٢٤٢ لاپەڕەیەو لەم چوار بەشە سەرەکییە پێکهاتووە:

(١) ئێران، ڕاپۆرتەکانی ساڵی ١٩٠٦و ١٩٠٧، واتا دەربارەی گەرمەی سەرەتای شۆڕشی دەستووریی بەناوبانگە (١٩٠٥–١٩١١).

(٢) کوردستان، ساڵی ١٩١٩.

(٣) کۆمیتەی سەربازیی ساڵی ١٩٢٠ کە تەرخان کراوە بۆ بابەتی یەکێك لە کۆمیتە جەنگییە گرنگەکانی بەریتانیا کە لەو ڕۆژانەدا گەلێك دەزگای بەریتانی سەرقاڵی ئەوە بوون چۆن ڕۆژێك زووتر بتوانن عیراق بکەنە بنکەیەکی سەربازیی سەرەکیی وڵاتەکەیان لەسەرانسەری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

(٤) ڕاپۆرتی جێب Jebb دەربارەی عیراق، کە یەکێك بوو لەو ڕاپۆرتە بایەخدارانەی پێوەندی بە خاڵی سێیەمەوە هەبوو.

کەوابێ برگە یا خاڵی دووەمی هەمان فایل، کە دەربارەی کوردستانە، هاوسەنگی سێ خاڵەکەی تری ئەو فایلەیە. درێژەی ناونیشانی ئەو بەشە بەم جۆرەیە:

((نهێنی، ناوداران یا کەسایەتییەکانی کوردستان، حوزەیرانی ١٩١٩)) کە لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەمیان پەنجاو یەك لاپەڕەی چڕوپڕە و ناوی ٢٣٠

ناوداری کوردی تێدا تۆمار کراوە[1]، بەشی دووەمیشیان تەواوکەری بەشی یەکەمەو بەم ناوونیشانەوەیە:

(کەسایەتییەکانی کوردستان، خستنە سەرو ڕاستکردنەوە، تەمموزی ساڵی ١٩١٩)[2]. ئەم بەشەیان لە حەوت لاپەڕە پێکهاتووە و ناوی (٣٥) ناوداری کوردی تری تێدا تۆمار کراوە.

لەم لیستە دوورودرێژەدا، کە لەوانەیە کەسمان تاوەکو ئێستا شتێکی ئەوتۆیمان نەبیستبێ، گەلێك زانیاریی گرنگ دەربارەی ناودارانی کوردی ئەو ڕۆژگارە ناسکە تۆمارکراوە.

بێگومان باس و توێژینەوەی ژیننامەی ٢٦٥ کەسایەتی بەناوبانگ پێویستی بە کتێبێکی گەورەی سەربەخۆیە، هیوادارم دڵسۆزێکی کورد، لەدواڕۆژێکی نزیکدا، کتێبخانەی کوردیی پێ ئاوەدان بکاتەوە، تایبەت دوای ئەوەی هەموو بەڵگەنامەکانی ((ئەرشیڤی نیشتمانی)) لەسەر کوردو کوردستان بە شێوازێکی مەنهەجی دەخرێنە بەردەست شارەزایان. جا وا لە خوارەوە پوختەی چەند نموونەیەکی پێویست وەك بەڵگەی ئەم بۆچوونە دەخەمە بەرچاو.

١. عارف پاشا:

ئەندامی ((کۆمیتەی سەربەخۆیی کورد))ە لە میسر، سەرەتا لەگەڵ داواکانی جەنەڕاڵ شەریف پاشادا نەبوو، بەڵام لە ڕێگەی نامەی محەمەد ساڵح حوسنییەوە ئەو دووانە پێوەندییان پەیدا کردو بەو هۆیەوە تا ڕادەیەك ناوی عارف پاشا هاتە ناو ناوانەوە[3].

(٢) محەمەد ساڵح حوسنی:

---

(1) N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan, June 1919, Published by Civil Commissioner's Office, Baghdad, 1919, PP. 98-148.
(2)Ibid, P. 107, Personalities in Kurdistan, Additions and Corrections, July 1919, PP. 149-154.
(3) Ibid, P. 107.

نزیکوڕی جەنەڕاڵ شەریف پاشایە، لە میسر کاروباری موڵکەکانی ئەوو شازادە نامینە خانی هاوسەری بەڕێوە دەبات، بۆ خۆیشی لە میسرو بەسرە موڵکی هەیە، ماوەیەك لە لەشکری تورکدا نەقیب بوو، دەڵێن سەرەتای جەنگ (جەنگی یەکەمی جیهان-ك.م.) لە پاریس لەگەڵ جەنەڕاڵ شەریف پاشای باوە پیارەیدا بووە کاتێك تورکێکی کوشتووە کە گوایە نێردرا بوو بۆ تیرۆرکردنی شەریف پاشاو لەسەر ئەوە تورکەکان حوکمی لە سێدارەدانیان بۆی دەرکردووە. وا دیارە ئێستا ((واتا ساڵی ۱۹۱۹-ك.م.)) ئەنــدامی ((کۆمیتـــەی ســـەربەخۆیی کـــورد))ە لـــە شـــاری ئەسکەندەرییە. مانگی مایسی ساڵی ۱۹۱۹ نامەی دەربارەی پرسی کورد ناردووە بۆ جەنەڕاڵ شەریف پاشاو پێی ڕاگەیاندووە: وا چاکە ئەو هەنگاوانە بنرێن بۆ ئەوەی شەریف پاشا وەك میری کوردستان ناوزەد بکرێت. لە هەمان کاتدا محەمەد ساڵح حوسنی پێوەندی نزیکی لەگەڵ عارف پاشا هەیە، کە ئەویش لە میسر دەژیت. وا پێ دەچێت محەمەد ساڵح حوسنی برازای غالب بەگ بێت[4].

(۳) عەلی غالب بەگ:

سکرتێری شەخسی جەنەڕال شەریف پاشا بوو، وا پێ دەچێت مامی محەمەد ساڵح حوسنی بێت. شەریف پاشا حەزی دەکرد بینێرێتە کوردستان بۆ ئامادەکردنی هوزەکان بۆ هاوکاری هاوپەیمانەکان و بۆ ئەوەی ڕاوێژیان بکات چۆن پێویستە وا بە باشی ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن (واتا لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا-ك.م.)، تایبەت لەگەڵ بەریتانیای گەورەدا، پێشنیاریشی بۆی کردووە بچێتە میسر بۆ دیدەنی مێجەر نۆییل و لەگەڵی بچێتە حەلەب و کوردستانی ڕۆژئاوا. وا دیارە ئەوەیشی خستۆتە ئەستۆی عەلی غالب بەگ کە هۆزەکانی کورد هان بدات داوا (لە هاوپەیمانەکان-ك.م.) بکەن شەریف پاشا بکرێتە میری کوردستان[5].

---

(4) Ibid, P. 130.

(5) Ibid, P. 113.



(٤) حەمدی پاشای بابان:

گەلێکمان ناوی حەمدی بەگی بابانمان بیستووە، کە وەك میرێکی لووت بەرز لە بەغدا ژیانی بردۆتەسەر، هەر چەندە نووسەرانی لیستەکە تەنها چەند دێڕێکیان دەربارەی حەمدی بەگ نووسیوە، بەڵام زانیارییەکیان تۆمار کردووە، کە من بەش بەحاڵی خۆم دەربارەی ئەو پیاوە نەمدەزانی، ئەو زانیارییەش دەربارەی کبریای حەمدی بەگە، ئەمەیش دەقی قسەکانە:

((حەمدی پاشای بابان[*]: لە ڕۆژگاری تورکەکاندا موتەسەڕیفی عەممارە بوو، کاری تری کارگێڕی کردووە، بەڵام دەمێ ساڵە خۆی تەقاویت کردووەو لە بەغدا نیشتەجێ بووە. دوای داگیرکردنی بەغدا پێشنیارمان کرد تەقاویتییەکەی بەردەوام بێت، بەڵام قەبوڵی نەکرد، گوتی هیچی نەکردووە تا شایانی ئەو تەقاویتییە بێت. پیرەمێردێکی نێسك سووکە))[6].

---

(*) ((حەمدی بابان (١٨٧٠ ــ ١٩٦٠): جەمال بابان لە کتێبی (اعلام الکرد)دا بەزمانی عەرەبی لەبارەیەوە نووسیویە: کوڕی محەمەد ڕەشید پاشایە، کە بەخدێوی ناسراوە، ڕەچەڵەکی دەچێتەوە

**(٥) سمکۆی شکاک:**

**هەمان فایلی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی کەم باسی سمکۆی شکاکیش ناکات، لێرەدا چەند نموونەیەکی ماناداری ئەو قسانە دەخەینە بەرچاو کە شایانی وردبوونەوەو لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنن، کە دەڵێت:**




**سمکۆی شکاک (؟– ١٩٣٠)**

**((بەر لە جەنگ (جەنگی یەکەمی جیهان–ک.م.) سمکۆ دەیتوانی نزیکەی دوو هەزار چەکداری سوارەو پیادە کۆ بکاتەوە، بەلام لەوانەیە ئێستا (واتا دوای نزیکەی پێنج ساڵان–ک.م.) ژمارەی پیاوەکانی نەگاتە لە سەدا دەی ئەو ژمارەیە)).**

**هەروەها دەڵێت:**

**((لە ڕێگەی پۆستەوە بۆمبایەك بۆ سمکۆ نێردرا، وەك دەڵێن ئەو کارە پیلانی کاربەدەستانی حوکمەتی ئێران بوو، کاتێك زەرفەکە دەکەنەوەو دەتەقێتەوە بیستوپێنج کەس لە پیاوەکانی دەکوژرێن و ژمارەیەکی لەوەیش پتریان لێ زامدار دەبێت)).**

---

سەر خالید پاشای بابان. خوێندنی لەئەستەنبوڵ تەواوکردووە، لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید دا بانگەوازی ئازادی کردووە، بۆیە ماوەیەك خراوەتە زیندان، دوای مەشروتەی ساڵی ١٩٠٨ ئازاد کراوە، دواتر گەڕاوەتەوە بەغدا تا موڵکەکانی باوکی لەحارسیە و شوێنەکانی دیکە بەڕێوە ببات. دوای ئەوەی ئینگلیز لێی دڕدۆنگ دەبن ، شا فەیسەڵی یەکەم دەستی بەسەر موڵکەکانیدا دەگرێت، پارێزەری لەلەندەنیشەوە بۆ هێنا، بەلام سوودێکی ئەوتۆی نەبوو، بۆیە بەغدای جێهێشت و چووە لەندەن دانیشت، دوارۆژەکانی ژیانی زۆر بەناخۆشی بەسەر بردووە–ع.زەنگەنە)).

(6) Ibid, P. 115.



دیسانەوە دەڵێت:

((هەمیشە لە قسەکانیدا خۆی وەک لایەنگری بەریتانییەکان نیشان دەدات))[7].

بەر لەوەی کۆتایی بەم بابەتە بهێنین جارێکی تر دێینەوە سەر باسی سمکۆی شکاک، چونکە ناوی ئەوو ژمارەیەک کەسایەتیی کوردی تری وەک شێخ مەحموودو یاوەرەکانی لە ڕاپۆرتەکەی گ. جێبدا، کە لە هەمان فایلدا هەڵگیراوە، هاتووە.

---

(7)Ibid, P. 118.

## شێخ مەحموود و یاوەرەکانی



کەم سەرداری کورد بە ڕادەی شێخی بەردەقارەمان ناوی لەناو بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا هاتووە، تایبەت لە بەڵگەنامەکانی هەردووك وەزارەتی هەندەران و موستەعمەراتی ئەو حوکمەتەدا، بۆیەکا دەبوو شێخ و هاوەڵ و هاودەمە نزیك و دڵسۆزەکانی شوێنی تایبەتییان لە ناوەڕۆکی لیستەی ناوەکانی ناو ئەم ڕاپۆرتەدا هەبێت، وا لە خوارەوە پۆختەیەکی ئەم باسەیش پێشکەش دەکەین:

(٦) مەحموود خانی دزلی:

یەکێك بوو لە یاریدەرە نزیکەکانی شێخ مەحموود، لەگەڵ پیاوەکانیدا لە هەورامانەوە بۆ یاریدەی شێخ هاتە سلێمانی، دەربارەی دزلی دەڵێت:

((مەحموود خان خەڵکی هەورامان و لە بنەماڵەی ڕەزاوە..ژمارەی لایەنگرانی سێ سەد تا چوارسەد سوارە دەبن، لەکاتی یاخیبوونەکەی شێخ مەحموودا (ساڵی ١٩١٩–ک.م.) دایە پاڵ شێخ، بەڵام زوو لێی تەکییەوەو بە پارەیەکی زۆرو ژمارەیەك وڵاخ و تاڵانییەوە گەڕایەوە ناو سنووری ئێران))[8](*).

---

(8) Ibid, P. 25.

(*) ((مەحموود خانی دزلی: (١٨٧٠ – ١٩٤٦): کوڕی "عەزیز خان" ی کوڕی "بارام بەگ" ەو دایکی

ناوی "پیرۆزە"یەو کچی "حەسەن سوڵتان" ی گەورەی هەورامانە، دایکی بەبنەماڵە دەچێتەوە سەر شێخانی (عەبابەیلێ).
مەحموود خان، لەساڵی ١٨٧٠دا، لەئاوایی (دزڵی)ی ناوچەی (هەورامانی تەخت) لەدایك بووە، دوای کۆچی دوایی باوکی دەبێتە جێنشینی ئەو، لەبەر لێهاتوویی و پڕ دەسەڵاتی، ئەوەندە نابات، وەکو پیاوێکی ئەو سەردەمەی کورد و سەرۆك عەشیرەتێکی بەدەسەڵاتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەناسرێت.
لەژیانی خێزانیدا چەند هاوسەرێکی هەبووە، دواترینیان "نازیف خان"ی کچی"مەحموود خدر"ی سەرداری هەمەوەند بووە، لەسەرجەمی هاوسەرەکانی پانزە کوڕو شەش کچی بووە، زۆربەیان کۆچی دواییان کردووەو هەندێکیشیان ماون.
ناوبراو لەئەنجامی تێکۆشان و گیانی بەرهەڵستکاریدا، لەساڵانی جیاوازدا چەندین جار دەربەدەر کراوەو خراوەتە گرتووخانەکانی (هیندستان، سنە، قەسری قاجار، هنێدی، ڕومادی، سلێمانی، کەرکووك، بەغدا)، زۆر جاریش بەدەستبەسەری ڕەهەندی شارەکانی ئێران و عێراق کراوە.
خانی دزڵی، پیاوێکی قسە خۆش و دڵتەڕو بێ فیز و تا بڵێی نان بدەو بەخشندە بووە، لەسەردەمی ئەودا ئاواییەکانی ئەو ببوونە پەناگەو داڵدەی ئەو کەسانەی کە لەدەست ڕژێمە داگیرکەرەکان هەڵاتوون و لەم مەڵبەندەدا حەساونەتەوە، خۆیشی چەندین جار بەرەو ڕووی ڕژێمی قاجاری و ڕەزا شاو حەمەی کوڕی بووەتەوە، لەباشووری کوردستانیش پەیوەندییەکی بەتین و دانەبڕاوو برایانەی لەگەڵ زۆر لە سەرکردەکانی کورد هەبووە، لەوانە "سمکۆی شکاك" و دواتریش "مەلا مستەفای بارزان" لەگەڵ "شێخ مەحموودی حەفید زادەی بەرزنجی"دا پەیوەندی تایبەتی وای هەبووە، تەنانەت نووسەرو مێژوونووس "ڕەفیق حیلمی" لە یادداشتەکانیدا (بە پاڵەوانی یەکەمی شێخ مەحموودی داناوە)، ئەوەبوو شکستی بەداروودەستەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز هێناوە، لەدوای شەڕی دەربەندی بازیان و لەسەر داوای ئینگلیزەکان خانی دزڵی گیراوەو نێردراوە بۆ تاران و ئینجا بۆ بەغداو لەوێشەوە بۆ هیندستان، لەساڵی ١٩٤٦یشدا لەئەنجامی فڕوفێڵ و تەڵەکەبازی فەرمانڕەوایی ئێران، بەدەستی ئەفسەرێکی ئێرانی لەکەلی "ملە خورد"، کە دەکەوێتە سەر سنووری ئێران و عێراقەوە، دەرمان خوارد دەکرێ و دوای نۆ ڕۆژ بەو ڕووداوە پڕ لەناسۆرە کۆچی دوایی دەکات.
بۆ هەموو ئەو زانیارییانەو هی تریش، بنۆڕە: مەحموود خانی دزڵی – شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، عومەر مارف بەرزنجی، چاپی دووەم، چاپخانەی نووسینگەی ئازاد بۆ چاپەمەنی، سلێمانی ٢٠٠٠ – ع. زەنگەنە))



(٧) سەید ئەحمەد[*]:

((خزمی شێخ مەحموودە. لەلایەن شێخەوە وەك وەفدی کوردستانی باشوور نێردرا بۆ لای جەنەڕاڵ شەریف پاشا بە نیازی ئەوەی عەرزی دیدی کوردی باشوور بۆ کۆنگرەی ئاشتی (لە پاریس–ك.م.) بکات، بە هۆی یاخیبوونەکەی شێخ مەحموودەوە لە میسر ڕێگەی پێ نەدرا. سەید ئەحمەد، ڕەشید زەکی بەگی لەگەڵ بوو))[9].

---

* سەیید ئەحمەدی بەرزنجی ١٨٨٨–١٩٦٦/٦/٥: ئەندامێکی وەفدی کوردستانی جنووبی بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس بووە بۆیە نازناوی (مەرەخەس)ی هەڵگرتووە، هەروەها رەئیسی ئەمنییەتی عومی دووەم (حکوومەتی کوردستان)، رەئیسی مالییەو گوومرگ و یاوەر و سەر کاتبی شێخ، سێهەم حکوومەت نوێنەری تایبەتی شێخ بۆ دانوستان و گفتوگۆ تا هەزارو نۆسەدو بیست و حەفت. سەرچاوەی ئەم پێناسەیەو وێنەکەی کتێبی (ئەلبوومی شێخ مەحموودی حەفید)ە کە لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین) و ئامادەکردنی (سدیق ساڵح)ە وێنەی ناوبراویشی لە ئەلبوومی بەدریە خانی سەیید ئەحمەدی بەرزنجی وەرگرتووە– ع. زەنگەنە.

(9) Ibid, P. 140.



**(٨) ڕەشید زەکی بەگ(*):**

**(( خەڵکی سلێمانییە، شێخ مەحموود لە تەك سەید ئەحمەددا وەك وەفد ناردی بۆ لای شەریف پاشا بەو نیازەی دیدی کوردی باشوور عەرزی کۆنفرانسی**

---

(*) ((ڕەشید زەکی کابان (١٨٧٦ - ١٩٤٠): کوڕی مەعروف کوڕی عەزیزە، لەشاری سلێمانی لەدایك بووە، لەئەستەنبۆڵ خوێندنی تەواو کردووە، دواتر بۆتە ئەندازیار لەسەردەمی دامەزراندنی حکوومەتی کوردستانی جنوبی لەساڵی ١٩١٨ - ١٩١٩ دا وەکو نوێنەری حکوومەتەکەی شێخ مەحموودو خەڵکی کوردستان، بەمەبەستی داواکردنی هەقی کورد، لەگەڵ سەیید ئەحمەدی نەقیب ناردوویانە بۆ پاریس تا لەوێ پەیوەندی بە (شەریف پاشا)وە بکەن و دەنگی خۆیان بدەن بە ئەو، بەڵام بەداخەوە دوای ئەوەی ئینگلیزەکان نێوانیان لەگەڵ شێخ تێکچوو - ئەوەبوو فەرەنسییەکان لەگەڵ سەیید ئەحمەدی هاوڕێی لەبەیرووت گرتیان و دواتر لەمووسڵ حوکمیان داو ماوەیەك لەوێ بەدەست بەسەری مایەوە، جگە لەوە ڕەشید کابان نەك پەروەردەکارێکی ناسراوی منداڵانی کوردی سەردەمی خۆی بووە، بەڵکو کۆمەڵێك لە پیاوانی عیراقیش لەسەر دەستی ئەو پێگەیشتوون.

ڕەشید کابان جگە لە زمانی کوردی، چەند زمانێکی دیکەی وەکو عەرەبی و تورکی و فارسی و فەرەنسیشی زانیوە، جگە لەکتێبی (اعلام الکرد) و (سدیق سالح)ی هاوکارمان لە (گۆڤاری پەیڤین)یش لەسەری نووسیوە، هەروەها یەك لە ژمارەکانی گۆڤاری (سلێمانی)یش وێنەکەی بڵاوکردۆتەوە، مۆری نوێنەرایەتییەکەیمان بۆ پاریس لە ل٥٥ی ئەم کتێبە داناوە ـ ع. زەنگەنە)).

ئاشتی بکەن، لە میسر بە هۆی یاخیبوونەکەی شێخ مەحموودەوە ڕێگەی پێ نەدرا))[10].

(٩) دۆکتۆر میهران:

((ئەرمەنییە و نیشتەجێی بەغدایە، دەڵێن دژی ئێمە (واتا ئینگلیز-ک.م.) پیلانی لەگەڵ شێخ مەحمووددا گێڕاوە))[11].

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەم ڕاستییە تۆمار بکەم: کاتێ کەوتمە خوێندنەوەی ئەم لیستەی ناودارانی کوردستانی ساڵی ١٩١٩ە، زۆر بەخێرایی بە دووی ناوی موشیری حەمەی سلێمانی هەمەوەندا گەڕام، چونکە ئەگەر خیانەتی ئەو پیاوە ڕاست بێت ، گوایە ڕێگەی دەربەندی بازیانی نیشانی جەنەڕاڵ فرێزەر داوە، ئەوەش بۆتە هۆی شکاندنی شێخ، ئەوا دەبوو موشیر شوێنێکی دیاری لەو لیستەیەدا بۆ تەرخان بکرایە، چونکە ڕێی تێناچێت ئەگەر ئەو دەنگوباوە ڕاست بێت ناوی موشیری حەمەی سلێمان لە کوولەکەی تەپیشدا، نەك لە ڕاپۆرتێکی نهێنیدا نەهێنرێت. لە کاتێکدا باسی دوکتۆر میهرانی ئەرمەنیی، کە باوەڕ ناکەم کەسێکمان ناویمان بیستبێت، لە لیستەکەدا تۆمار بکرێت تەنها لەبەر ئەوەی پێوەندیی بە شێخ مەحموودەوە هەبووە.

(١٠) شێخ مەحموود:

ناوی شێخ مەحموود، بە پێی سروشتی ڕووداوەکانی کوردستان و ڕۆڵی کەسایەتییەکانی ، لە لیستەکەدا زوو زوو دێتە پێشەوە، وێڕای ئەوەی شوێنێکی تایبەتی بۆ ناوی خۆی تەرخان کراوە. لەوێدا نووسەرانی بەڵگەنامەکە بە چڕوپڕی باسی دەسەڵاتی زۆری شێخ و دوژمنایەتیی بەرانبەر حوکمەتی عوسمانیو کوشتنی شێخ سەعیدی باوکی، لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٠٩دا، لە موسڵ و هەڵوێستی لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانداو شەڕی دەربەندی بازیان و یەخسیرکردنی بە

---

(10)Ibid, P. 138.

(11) ئەمە دەقی ئینگلیزییەکەیەتی:
((Dr. Mihran... An Armenian, resident in Baghdad, said to be conspiring with Shaikh Mahmoud against us)). (Idia, P. 131).

برینداری لەگەڵ شێخ محەمەد غەریبی ئامۆزایدا دەکەن جۆری. دارشتن و زاراوەکانی ئەو بەشەی کە باسی دانانی شێخ مەحموود بە بەرپرسی کوردستان دەکات سەرنج رادەکێشێت، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی ئەو بەشەیە:



**((کە کەرکووکمان گرتەوە[12] (شێخ مەحموود–ک.م.) هاتە لامان و لە ئەنجامدا کانونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ بە یەکجاری کرایە سەرۆکی کۆنفیدرالیی کوردی))[13].**

**شایانی باسە شێخ مەحموود دووەم ناوی لیستەکەی گ. جێبە، بۆیەکا ئەویش، وەك سمکۆی شکاك، بەر لە کۆتایی ئەم بابەتە دێینەوە سەری.**

---

(12) لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهاندا هێزەکانی بەریتانیا دووجاران شاری کەرکووکیان داگیرکرد، جاری یەکەمیان لەژێر فشاری عوسمانییەکان ناچار بوون بۆ ماوەیەکی کورت پاشەکشێ بکەن و تورکی نەخایاند داگیریان کردەوە.

(13) ئەمەیش دەقی ئینگلیزییەکەیەتی:

((When we re-occupied Kirkuk he came in to us and **was finally appointed head of the Kurdish confederacy in December**, 1918)) (P. 143).

## بەدرخانییەکان و نەوەی شێخ عوبەیدوڵلا

یەکێك لەو لایەنانەی ئەم لیستەیە کە سەرنج ڕادەکێشێت یەکیەتی خاکی کوردستان و تێکەڵاویی پرسی کوردە تێیدا، شێخ مەحموودو شەریف پاشای کوردستانی باشوور شان بە شانی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری و سمکۆی شکاکی کوردستانی ڕۆژهەڵات و بەدرخانیو نەوەی جەمیل پاشای کوردستانی باکوورو ڕۆژئاوا پێکڕا ناویان لەسەر لاپەڕەکانی دێن.

بە وێنە لەلاپەڕە شەشی (تەواوکەری لیستەکە)دا زانیاریی وردو بەنرخ دەربارەی بەدرخانییەکان، تایبەت سورەیا بەدرخان، تۆمار کراوە، هەر لەوێشدا ناوی زوبەیدی کوڕی بەدرخان پاشای گەورە هاتووە کە من بۆ خۆم تا ئێستا ناویم نە لە هیچ سەرچاوەیەکدا دیوەو نە لە کەسیشم بیستووە[14]. لە لیستەکەدا دەربارەی زوبێد بەدرخان، دەڵێت:

((لە دیمەشق دەژی، شەخسییەتی زەعیفە، پیاوێکی کۆمە))[15]. بەر لەوە، بە سیازدە لاپەڕە، لیستەکە باسی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری و نەوەکانی دەکات، تایبەت سەید تەهای بەناوبانگ، دەڵێت:

((سەرەتای هەشتاکانی سەدەی نۆزدە لەشکری شێخ عوبەیدوڵلا خۆی دەدا لە ۳۰ هەزار چەکدار، دوای نوشوست هێنانی ڕاپەڕینەکەی دوورخرایەوە ئەستەموڵ و تا کۆچی دوایی لەگەڵ شێخ عەبدولقادری کوڕە گەورەیدا لەوێ مایەوە(*). عەبدولقادر لە ئەستەموول مایەوەو بووە ئەندامی پەرلەمانی ڕژێمی نوێی ئەو وڵاتە. عەبدولقادر ئەندامێکی ناسراوی ئەو کۆمەڵە کوردییەی ئەستەمۆڵە کە بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێدەکۆشێت. پێوەندیی لەگەڵ سەید تەهادا خراپە)).

لێرەدا یادداشتەکە زانیارییەکی بایەخدارو دەگمەنی بۆ تۆمار کردووین دەربارەی کەڵەکە بوونی سەرمایە (تراکم رأسمال) لە کوردستاندا کە دیاردەیەکی

---

(14) تەنها لەبەڵگەنامەیەکی تری هەمان وەزارەتدا دەقی ئەو ڕستەیە دەربارەی زوبەید بەدرخان دووپات بۆتەوە. بڕوانە: د. وليد حمدي، الكُرد وكُردستان في الوثائق البريطانية، ص ٤٤٥، الملحق ج.

(15)N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan, June 1919, P. 154.

ئابووریی–كۆمەڵایەتیی– سیاسیی گرنگەو یەكێكە لە ئەنجامەكانی تێكەڵبوونی كوردستان بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهانەوە، لەو بارەیەوە دەڵێت:

((شێخ سدیقی كوڕە پچووكی عوبەیدوڵلا لە كوردستان مایەوە (واتا وەك عەبدولقادری برای لە ئەستەمولٚ لەگەڵ باوكیدا نەبوو–ك.م.)، لە جێگەی باوكی، كە دوور خرابۆوە، بووە سەرۆكی هۆزەكەیان ..وەك دەڵێن گەورەترین قاچاغچیی تووتنە لە سەرانسەری جیهانداو حسابی بانقی تایبەتیی خۆی هەیە لە ئینگلتەرە لە (بانكی نیشتمانی و ناوچەیی) (National and Provincial Bank)، كۆشكێكی لە نەهریو یەكێكی ترە لە قارتۆنە دروست كردووە، ساڵی ١٩٠٧ كۆچی دوایی كرد)).

دەربارەی سەید تەهاش دەڵێت:

((سەید تەها: پیاوێكی زۆر كەتەو قەڵەوە، تەمەنی نزیكەی بیستوهەشت ساڵە، بەڵام گەورەتر دیارە، بەرگی ئەورووپایی دەپۆشێت، وا دیارە مرۆڤێكی خۆش مەشرەبە، دانیشتن لەگەڵی زۆر خۆشە.بەر لە جەنگی (یەكەمی جیهان–ك.م.) سەید تەها پێوەندیی گەلێك نزیكی لەگەڵ رووسەكاندا هەبوو، جارێكیان میوانی شەرەفی كۆنسوڵی رووسی بووە، بۆ خۆی دەڵێت تەنانەت لەو ڕۆژانەیشدا هەر بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی كوردی كاری كردووەو پێی وا بووە كە پڕۆژەیەكی لەو بابەتە تەنها بە حیمایەی رووسیا سەردەگرێت، دیار بوو رووس گەلێك لە ئێرانییەكان نیزامپارێزتر بوون. لەم ڕۆژانەدا دەنگوباوێك هەیە گوایە سەید تەها بۆتە گاوور[*]، لە ڕاو بۆچوونە ئاینییەكانیدا بە هیچ جۆر توندڕەو نییە، سەید تەها نە دەخواتەوەو نە جگەرەیش دەكێشێت. ڕۆژانی هەراكەی ورمێ هەموو ئەڵەمانەكانی ئەو شارە پەنایان بردە لای ئەوو باش پێشوازیی كردن.

بە هۆی فشاری زۆرو درێژخایەنی رووس و توركەوە ئێستا باری دەرامەتی سەید تەها بە جارێك پەرێشانەو هێزو دەسەڵاتی جارانی نەماوە، كۆشكەكەی لە نەهری كاول كراوە، رووسیش شەمدینیان تاڵان كرد، نیوەی پیاوەكانی سەید تەها یا بڵاوەیان لێ كردووە یاخود كوژراون، ئەم دیاردەیە سەرجەمی كوردستانی

---

(*) ((بۆ لێكدانەوەی ئەم پرسە بنۆڕە: پەراوێزمان لەبابەتی دووەمی ئەم كتێبەدا–ع.زەنگەنە))

**گرتۆتەوە، بەڵام ئەوانەی لە مەرگ قوتار بوون ئێستا باشتر چەکدارن، بەشێك لە غوڵامەکانی باوکی لەگەڵ شێخ عەبدولقادری برایدان[*]، پێوەندیی نێوان سەید تەها زۆر فراوانە و دەتوانێت کۆنترۆڵی ئەو ناوچەیە بکات کە کەوتۆتە نێوان باش قەڵاو ڕەواندزو ئۆشنۆ (شنۆ) و ورمێوە، هەرچۆن بێت سەید تەها بەگشتی لە کوردستاندا پیاوێکی ڕێزدارەو سەنگی ئایینی خۆی هەیە. ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ)ی ڕەهبەری شکاك لە ڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە خزمێکی نزیکی سەید تەهایەو هەمان کات دوو هاوڕێی گیانی بە گیانین. سەید تەها موڵکێکی زۆری لە دەشتی ورمێ هەیەو بە پێی نەریتی بنەماڵەکەی دژ بە ئێرانەو بەرژەوەندییەکانی توندو تۆڵ بەستراوەتەوە بە کوردی ئازەربایجانەوە.**

---

(*) ((لەبابەتی دووەمی ئەم کتێبەدا کە باسی سەید تەها کراوە، لەناو جووت کەوانەیەکدا د. کەمال کە باسی پەیوەندی ئەو زاتەی لەگەڵ شێخ عەبدولقادر کردووە بە (برا)ی ئەو زاتەی دانابوو، بەبێ سێ و دوو ئەم وشەیەم کردبووە (مام)، بەڵام وەکو لێرەدا دەبینین ئەو هەڵەیە وادیارە لەئەسڵی بەڵگەنامەکەدا هەیە بۆیە کەوتمە گومانەوە، لەسەر ئەو پرسە پەیوەندیم بە "**عبدالرحمن الشیخ علاء الدین النقشبندی**"وە کرد، ئەویش کتێبی (**السادات النقشبندیة**)یەکەی خۆی بۆ ناردووم کە لەساڵی ١٩٩٨دا لەهەولێر چاپ و بڵاوکراوەتەوە، لەناو کتێبەکەشدا پەڕە کاغەزێکی بۆ دانابووم، سەرچەڵەی خانەوادەکەی "سەید تەها"ی تیادا نووسرابۆوە، ئەوەبوو دڵنیا بوومەوە کە سەید تەها کوڕی ئەو (شێخ محەمەد سەدیق)ەیە کە لەبەڵگەنامەکەدا بەپیاوێکی سەرمایەدار ناوی هاتووە، وا دیارە هەر لە زووەکەوە پەیوەندی لەگەڵ شێخ عەبدولقادردا خراپ بووە، بەڵگەشمان بۆ ئەو بۆچوونە ئەوەیە ئەوەتا لەبیرەوەرییەکانی ئەو کەسانەی بەشداری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیان کردووە ئەو پرسە باسکراوە، لەوانە زنار سلۆپی دەڵێ: (**حاجی مووسا بەگ سەرۆکی خێڵی کارچکان لەگەڵ سەید تەهای برازای سەید عەبدولقادر ئەفەندیدا هاتبووە ئەستەنبۆڵ کە لەلایەن ئەندامانی جەمعییەتی ئیتیحادو تەرەقیدا بۆ ئاشتکردنەوەی لەگەڵ مامۆیدا هێنابوویانە ئەم شارە**)، کەواتە شێخ عوبەیدوڵڵا تەنها دوو کوڕی هەبووە، شێخ عەبدولقادر، کە لەساڵی ١٩٢٥دا لەدیاربەکر لەگەڵ محەمەدی کوڕی لەسێدارە درا. "شێخ محەمەد سەدیق"یش کە ئەو سەرمایەدارەی لێ هەڵکەوتووە کە بەڵگەنامەکە باسی دەکات، ئیتر هیچ گومانی نامێنێ ئەو زاتەی دواییان باوکی سەید تەهایە، وا پێدەچێ ئەو ناخۆشییەی "سەید تەها"ش لەگەڵ شێخ عەبدولقادری مامی لەبەر ئەو موڵك و سامانە بووە کە باوکی ئەو پێکیەوەی نابوو - ع. زەنگەنە))

گەلێك زەحمەتە بتوانین بە وردی وێنەی دەروونیی سەید تەها بکێشین، دوکتۆر ویگرام[16] بە کەسێکی نزمی کەم وێنەی دادەنێت. هەرچۆن بێت ویگرام بۆ خۆی سەید تەهای نەدیوە، بڕیارەکەشی لەسەر بنچینەیەکی زۆر لایەنگرانەی بەسەرهاتێکی گاورەکان داڕشتووە، مایسی ساڵی ۱۹۱۹ کاتێك سەردانی ڕەواندزو بەغدای کرد سەید تەها هیچ نەبێت بە رووکەش وەك سەردارێکی باش و گومان لێ نەکراو هاتە بەرچاو، بێ هیچ جۆرە ئیدیعاو ترۆفیزیك ئامادەیی خۆی بۆ یاریدە دانی (بەریتانییەکان—ك.م.) دەربڕی، خۆ ئەگەر ئەمەی شانۆگەریی (تەمسیل) بووبێت ئەوا بێ ئەندازە سەرکەوتوو بوو لە نواندنی ڕۆڵەکەیدا.

سەید تەها: بیروبۆچوونی وردی هەیە، خوێندەوارێکی چاکە، کوردی و فارسی و تورکی و کەمێکیش رووسی دەزانێت. پێی وایە، هەرچۆن بێت، ناتوانێت (لە گێژاوی ئەم ڕۆژگارەدا—ك.م.) بیرێکی بە کەڵك دەربارەی سیاسەتی دوارۆژ دابڕێژێت. لەوانەیە ئەوەی کۆسپ بێت لەبەر دەم کەڵك وەرگرتنمان لە سەید تەها لە کوردستاندا پێوەندییە نزیکەکانییە بە بزووتنەوەی دژ بە ئێران لە ئازەربایجاندا))[17].

پێم وایە ئەگەر ڕەفیق حیلمی و ئەحمەد خواجاو ئەحمەد تەقی ئەم زانیارییە وردانەیان لەبەر دەست بوایە دەیانتوانی قووڵتر تیشك بهاونە سەر ئەو لاپەڕەیەی مێژووی کورد لەو ڕۆژگارەداو باشتر لەوە بگەن بۆچیو چۆن ئینگلیزەکان، دوای ئەوەی هیوایان بە شێخ مەحموود نەما، ویستیان پشت بە سەید تەها ببەستن و هێنایانە رەواندز.

---

(16) دەربارەی ویگرام بڕوانە کتێبەکەی خۆی و براکەی کە جەرجیس فتح الله ساڵی ۱۹۷۱ لە بەغدا بە عەرەبی بە ناوی ((کردستان مهد البشرية))ەوە بڵاوکردۆتەوە. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس چاپی دووەمی لە ساڵی ۱۹۹۹ دا لە هەولێر بڵاو کردۆتەوە.

(17) N. A., F. O., 251/93, Maclean Report, 1919, Secret, Personalities in Kurdistan, June 1919, P. 141.

## سمكۆ و شێخ مەحموود لە ڕاپۆرتەکەی گ. جێبدا

وەك بەر لە ئێستا ئاماژەمان پێ داوە بەشی چوارەمی هەمان فایلی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی بۆ یادداشتەکەی گلادواین جیب تەرخانکراوە، کە بەلایەنی کەمەوە شەش ساڵ دوای لیستەی ناودارانەکەی کوردستان ئامادە کراوە. وەك گوتمان: ئەو یادداشتە پازدە لاپەڕەییە سێزدە لاپەڕەی بۆ کورد تەرخان کراوە. مەبەستی سەرەکیمان، لە پێشکەش کردنی پوختەی ئەو ڕاستییانەی گلادواین جیب دەربارەی سمکۆی شکاك و شێخ مەحموود تۆماری کردوون، ئەوەیە تیشك بهاوینە سەر بەشێك لەوانەکانی مێژووی کورد، هەڵبەت مایەی نیگەرانییە تواناو دەسەڵاتی یەکێکی وەك سمکۆ ڕۆژ بە ڕۆژ رووی لە نشێوی بووبێت تا وای لێهات ڕەزا شا بتوانێت بە ئاسانی زەفەری پێ بهێنێت.

دوای پێشەکییەکی کورت سمکۆ یەکەم ناوی لیستەکەی گلادواین جێبە کە دەربارەی دەڵێت:



عەسکەری کوردستان

ریزی دانیشتووی ناوەڕاست: ٤. فایەق کاکەمین ٥. رەشید عەبدولکەریم؟ ٦. قادر ئەفەندی قەرەداخیی ٧. رەزا بەگی ئیسماعیل بەگ؟ ٨. ساڵح ساحێب قران ٩. مەلا پیسکەندی؟ ١٠. یوونس عەبدولقادر ماهی ١١. ئەحمەد فەهمی؟

رلوەستاو: ریزی یەك لە چەپەوە سێهەم کەس ئەمین رەواندزی

سەرچاوە: دیاریی جەمال بابان بۆ کتێبی ئەلبومی شێخ مەحموودی حەفید، ئامادەکردنی سدیق ساڵح، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ژین.

((ئیسماعیل ئاغا (سمکۆ) ڕەهبەرێکی کوردی بەناوبانگە، ساڵ و نیوێك دەبێت ناوی زۆر لە ناو ناواندا نەماوە، بەڵام هەرچۆن بێت هەموو کات لەوانەیە بێتەوە مەیدان[*] و هێندەی شێخ مەحموود لە سلێمانی و باشوور گێرمەو کێشە بۆ حوکمەتی ئێران و تەنانەت عێراقیش دروست بکات))[18].

ناوی شێخ مەحموود دووەم ناوی نێو لیستەکەیە، بەشێکی زۆری زانیارییەکانی گلادواین دەربارەی هەوڵی بەردەوامی هەردووك حوکمەتی عێراقی و بەریتانیایە بۆ قایل کردنی حوکمەتی ئێرانی و خودی ڕەزا شا بۆ هاریکاریی لەگەڵیاندا بۆ بەدیل گرتنی شێخ. هەروەها گلادواین باسی هاریکاریی ژمارەیەك هۆزی کورد لەگەڵ شێخ مەحموودا دەکات وێڕای پێوەندیی نێوان شێخ و میری قاجاری سالار ئەلدەولە[19] کە وەك پیاوێکی شێت ناوی دەبات[20].

دوا بە دوای ئەوانە گلادواین دێتە سەرباسی ئەو فڕۆکەوان و میکانیکییە بەریتانیانەی کاتی خۆی فڕۆکە جەنگییەکەیان لەلایەن لایەنگرانی شێخ مەحموودەوە خراوەتە خوارێ و خۆیان بە دیل گیراون و براونەتە ناو خاکی کوردستانی ئێرانەوە[21].

گلادواین جیب لەلاپەڕەی دواتری یادداشتەکەیدا، باسی جافەر سوڵتان و کۆچ و ڕەوی بەشێك لە هۆزە کوردەکانی وەلەد بەگی و قوبادیو بابەجانی بۆ لەوەڕگەکانی کوردستانی عێراقمان بۆ دەکات[22].

لە بەشەکانی تری یادداشتەکەیدا گلادواین دێتەسەر باسی ڕووداوەکانی خانەقین و مەندەلی و کەسایەتیی مەجیدی قادر ئاغاو پێکدادانی سەنجاوییەکان و یاساوڵانی سنووری عێراق و هەندێ وردە هەواڵی دی[23].

---

(*) ((وەکو لە ڕاپۆرتەکەدا پێشبینی کراوە، دوای دوو ساڵێك، سمکۆ هاتەوە مەیدان و ورمێی ئازاد کردو ڕۆژنامەی (کورد)ی لەوێ بڵاوکردەوە، لە ساڵی (١٩٢٣)یشدا چووە سلێمانی و لەوێ سەردانی مەلیك مەحموودی کرد.—ع.زەنگەنە)).

(18) N. A., F. O., 251/93, Memorandum. Iraq – Persian Border, P. 234.

(19) سالار ئەلدەولە، نەوەی فەتح عەلی شای قاجارییە کە وەك دەڵێن سەدان ژنی لە هۆزو نەتەوە جیاوازەکانی ئێران هێناوە، نەوەشی هێند زۆر بوون بۆ خۆی نەیناسیونەتەوە، یەکێك لەهاوسەرەکانی کورد بووە کە کوڕێکی لێی بووە بە ناوی سالار الدەولەوە ناوبانگی دەرکردووە، لە دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی قاجارەکاندا یەکێك بووە لەوانەی داوای تەختی پاشایی ئێرانی کردووەو کوردستانی خاڵوانی کردۆتە مەڵبەندی چالاکییەکانی بۆ وەدی هێنانی خەونەکانی.

(20) لە دەقی یادداشتەکەدا دەڵێت: ((mad Qajar Prince, Salar-ed-Dowleh))

(21) N. A., F. O., 251/93, Memorandum. Iraq-Persian Border, P. 235.

(22) Ibid, P. 236.

(23) Ibid, PP. 237-239.

# بابەتی پێنجەم

## شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانی و ئەنجامەکانی

**سەرەتایەک:**

سلێمانی، یەکێکە لەو شارانەی کوردستان کە هەمیشە شوێنی دیاری لە خەباتی رزگاریخوازیی نوێ و هاوچەرخی نەتەوەی کورددا هەبووە، ئەوەی تا ئێستە زۆر جاران لە سەرجەمی بابەتەکانی تری ئەم کتێبەدا بە روونی ڕەنگی داوەتەوە. ئەو ڕاستییە مێژووییەیە کە لە خۆڕا نەهاتووە، شێخ رەزا واتەنی (سلێمانی دار الملکی بابان) بوو، حوجرە زۆرەکانی، لە سەرەتای دروستکردنییەوە، بوونەتە سەرچاوەیەکی زیندووی لە دایکبوونی چەکەرەی دەستەبژێری نوێی کوردی باشوور، تەنانەت سروشتیش بەخشندە بووە لەگەڵی، لە هەر چوار لاوە سەدان سەنگەری لە رووی دوژمنی دڵڕەقدا بۆ ڕەخساندبوو.

هەموو کورد، وەکو زۆر جاری دیکە، وا چاوەڕوان بوون کەوتنی ئیمپراتۆریی عوسمانی و هاتنی ئینگلیز ببێتە سەرچاوەی خێرو بەرەکەت بۆ نیشتمانەکەیان، هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبوون ڕۆژێك لە ڕۆژان تانك و فڕۆکەی ئەوانیش بکەونە دروێنەی گوڵ و گوڵزارو پیرو زارۆکی کوردەواری، بۆ خۆیشمان هەڵەمان کەم نەبوو، ئەوەندە شارەزای پەتپەتێن و فڕوفێڵەکانی سیاسەتبازی نەبووین.

لەگەڵ ئەوەیشدا ڕەوڕەوەی مێژووی کوردایەتی کۆڵی نەداو بێوچان تەکانی خۆی بەرەو ئاسۆی رزگاری و سەرفرازی دەدا. یەکێك لە بەڵگەکانی ئەو ڕاستییە شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانییە کە دڵسۆزانی کورد بۆ خۆیان بەهەڵە ناویان لێ ناوە (ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوول)، ئەو ڕۆژە نەك هەر ڕەش نەبوو، بەڵکو وەك گوڵاڵە سوورەکەی ئەحمەد موختار جاف سوور سوور بوو ، چونکە بە خوێنی جگەری نەمرانی کورد ئاو درابوو.

لەندەن، بەرەبەیانی ڕۆژی بیست و پێنجی حوزەیرانی ٢٠٠٧.

## هۆکانی تەقینەوەی شەڕی بەردەرکی سەرا
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

لە ڕێگەی ناوەرۆکی بەلگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانییەوە دەتوانرێت، زۆر بە ئاسانی و بە قـووڵی، هەست بـە هۆکـانی نـاڕەزایی کـوردو ئـەو مەترسـییە زۆرەی بەر لە مۆرکردنی پەیمانی سـاڵی ١٩٣٠ی نێـوان عـێراق و بـەریتانیادا تـەنگی پێ هەڵچنیبوون بکرێت، دەبوو ئـەو بابەتـە زوو لـە هۆڵـەکانی پەرلـەمانی عێراقیـدا دەنگ بداتەوە، چونکە لەوێ، بەر لـە شـەڕی بـەردەرکی سـەرا بـە چـەند مانگێـك، پرۆژەی پەیمانی نوێی نێوان عێراق و بەریتانیا خرایە بەر باس و لێکۆڵینـەوە. ئـەم نوێنەرانەی کورد لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٠وە چەند جارێك پرسی دواڕۆژی کوردیان لەم قۆناغە نوێیەدا وروووژاند:



مەعرووف جیاووك

پروغرام فرقهٔ متظاهیرن کوردان که له روژی

۱۶ - تموزی ۹۳۰ دا اجرا اکری

۱ - آمال و مقصد لەم مظاهرەته صرف لە ری‌یکی مشروعەوه طلبی حقوق معلومه‌ی کوردانه که وختی خوی عصبة‌الامم پی بخشیوه و قراری له سر دراوه .

۲ - فرقه‌ی متظاهیرن بە عموی مجبوره تبعیتی هەمو قوانین و نظامات حکومتی بکات و حق‌الامکان میدان بەهەرکێك نەدات کە ببی بە سەبەبی اخلال امنیت و آسایش .

۳ - محل اجتماع له بر دەمی سرای حکومتی و له باغی بلدیه‌دا ابی .

٤ - عموم اشراف مملکت و رؤسای عشائر و اهالی امرو که مصادفی ۱۶ تموز ۹۳۰یه ساعت له نوی عربی له ناو باغی بلدیه‌دا اجتماع اکات .

۵ - سلسله‌ی جولانی فرقه‌ی متظاهرین لەبەردەمی سرای حکومتی‌یەوه هتا بردی درگای کوره و لەم منطقه محدوده‌دا ئەبی .

٦ - له ساعت ( ۳۰ - ۹ ) عربی‌دا فرقه‌ی متظاهرین له حال سکونت و اعتدال دا له محل اجتماع دا حرکت اکات واچیته بردی درگای کوره .

لەو بدا به ناوی عمومەوه ( له طرف رمزی افندی حاجی فتاح ) وه کونفرانسیك ئەدریت .

۷ - لەدوای کونفرانسەکەله ساعت دەی عربی‌دا فرقه‌ی متظاهرین بلاو ابیتەوه

۸ - هیئت ممثله‌ی فرقه‌ی متظاهرین ئەم ذاتانه‌ی لای خوارەوەن :

عبدالرحمن اغای احمدپاشا عزت بك عثمان پاشا ،سعید زاده شیخ قادر افندی حمه اغای عبد الرحمان اغا

رمزی افندی حاجی فتاح میرزا توفیق قزاز مجید افندی حاجی رسول اغا

سلیمانی : ۱٦ تموز ۱۹۳۰

سەرچاوە: سدیق سالّح، ئەلبومی شێخ مەحموودی حەفید. ئەم بەڵگەنامەیەی بە دیاری لە محەمەد شوان باباڕەسوول بەرزنجی وەرگرتووە — ع. زەنگەنە.



حازم شمدين آغا

ئیسماعیل ڕەواندزیی نوێنەری هەولێرو محەمەد جاف نوێنەری کەرکووك و حازم شەمدین ئاغای[٥] نوێنەری موسڵ و محەمەد ساڵحی نوێنەری سلێمانی و مارف جیاووکی نوێنەری هەولێر. لە فایلی ژمارە ٥/١٥٧/٧٣٠ی وەزارەتی موستەعمەراتدا ژمارەیەکی یەکجار زۆر بەڵگەنامەی پڕ لە زانیاریی دەربارەی ئەم بابەتە لەو بەشەی فایلەکەدا کە بەم ناونیشانەوەیە (کورد لە عیراق، بەشی یەکەم) هەڵگیراون[1]. وا لە خوارەوە پوختەی ناوەڕۆکیی ئەو بەڵگەنامانە دەربارەی داخوازییەکانی کوردو هەڵوێستی هەردووك حوکمەتی عیراق و بەریتانیا دەخەینە بەرچاو.

---

(٥) ((حازم شەمدین ئاغا (١٨٩٥ – ١٩٥٤): کوڕی یوسف پاشای کوڕی شەمدین ئاغایە، لەشاری زاخۆ لەدایك بووە، ئەوەندەی من بیزانم هەندێ لەئەندامانی خانەوادەکەیان گەیشتوونەتە سودان. حازم شەمدین ئاغا لەساڵی ١٩٢٥ دا کراوەتە نوێنەری موسڵ، دواتریش بەردەوام بەنوێنەری ئەم لیوا (پارێزگا)یە هەڵبژێردراوەتەوە. لەساڵی (١٩٤٦ – ١٩٥٤) کراوەتە ئەندامی ئەنجوومەنی پیاوماقولانی عیراق، لەساڵی ١٩٥٠ دا وەزیرێکی بێ وەزارەت بووە، هەر لەحوزەیرانی ئەم ساڵەدا لەموسڵ کۆچی دوایی کردووە– ع. زەنگەنە))

(I) N. A., C. O., 370/157/5, Kurds in Iraq, Part 1.

ڕۆژی سیازدەی شوباتی ساڵی ١٩٣٠ کۆنترین مێژووە کە یەکێك لە بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە تێیدا باسیی هەڵوێستێکی نوێنەری هەولێر مارف جیاووکمان بەم جۆرە بۆ دەگێڕێتەوە:

**((لە بەغدا مارف جیاووکی نوێنەری هەولێر یەك دوو هەوڵی خۆنیشاندەرانەی[2]دا بۆ وروژاندنی مەسەلەی کورد لە (ئەنجوومەنی نوێنەران)دا، ڕۆژی سیازدەی شوباتی (ساڵی ١٩٣٠یش–ك.م.) زۆر بە ڕاشکاوی[3] ئەم پرسیارەی کرد: ئایا مافەکانی کورد لەو پەیمانە نوێیەدا دەپارێزرێ کە لەگەڵ بەریتانیادا مۆر دەکرێت؟))[4](*).**

دوا بەدوای ئەمە هەمان بەڵگەنامە دێتە سەر باسی ئەوەی چۆن **((دەوروبەری کۆتایی مارتی هەمان ساڵ ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ[5] بوونی پشکنەری کارگێریی (مفتش إداری– ك.م.) لیواکانی هەولێرو موسڵ و کەرکووکی لە بەغدا بە دەرفەت زانی بۆ ئەوەی دەربارەی بارودۆخی ئێستەی کورد گفتوگۆیان لەگەڵ**

---

(2) لەدەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((made one or two sporting efforts))

(3) بەڵگەنامەکە لێرەدا وشەی (outright)ی بەکارهێناوە کە بە واتای صەراحەت یا مونافیقانە دێت.

(4) N. A., C. O., 370/157/5, Kurds in Iraq, Part 1, PP. 185-186.

(*) ((نەك هەر ئەوەندە، مارف جیاووك لەو مشت و مڕو دانوستانەشیدا کە لە ١٩٣٠/٨/٨دا لە شاری هەولێر کردبووی، هەڵوێستی کوردانەو بوێری خۆی بەرامبەر بەو وەفدە، کە لەو ڕۆژەدا هاتبوونە شارەکە، نیشاندابوو، دیارە وەفدەکە جەعفەر عەسکەری وەکیلی سەرۆك وەزیرانی ئەوسا، هەروەها وەکیلی مەندوبی سامی و چەند کەسێکی دیکەی لەگەڵدا بووە، مارف جیاووك داوای جێبەجێکردنی بڕیاری ئەوسای (عصبة الأمم) لەمەڕ کێشەی کورد لە عیراق کردووە. جیاووك لە بڕگەیەکی قسەکانی لەبەرامبەر وەفدەکە دەڵێ: جەعفەر پاشا چاکی ئەزانێ ئێمە لەگەڵ عەرەبا مومکین نییە بە سورەتی تەوحید (جیاووك پەنجەکانی خستە ناو یەکتر) گوتی بەم سورەتە بژین، فەقەت بە سورەتێکی (ئینجا ئەمجارە پەنجەکانی جووت کرد) گووتی: قابیلە بەم نەوعە وەکو نوستریاو مەجارستان بژین).

لەم بارەیەوە بنۆڕە: ژیان (ڕۆژنامە) ژمارە ٢٥٧ی ١٩٣٠/٨/١٤.–ع. زەنگەنە)).

(5) لەو ساڵانەدا لە هەموو وەزارەتێکدا ڕاوێژکار (موستەشار)ێکی دەسترۆیشتووی ئینگلیزی وەك ئەدمۆندس هەبوو.


ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی

بکات. ئەوان هەرسێکیان لەو باوەڕەدان کە وا باشە حوکمەتی عیراق ژمارەیەک چاکسازیی لە کاروباری ناوخۆو پەروەردەدا لە ناوچە کوردییەکاندا بکات، بۆ جێبەجێ کردنی ئەو گفتانەی لە ڕابردوودا دراونەتە کوردو بۆ ڕەواندنەوەی ئەو مەترسییانەی دەربارەی دواڕۆژیان لە ئارادان. ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆو مەندوبی سامی وای بە باش دەزانن لەگەڵ حوکمەتی عیراقیدا لەو ڕاسپاردانە بکۆڵنەوە کە هەرسێك پشکنەری (هەولێر و موسڵ و کەرکووك —ك. م.) پێشکەشیان کردوون. هەمان کات ئەو هەواڵەی ڕۆژنامە عەرەبییەکان دەربارەی دەستپێکردنی گفتوگۆی بەستنی پەیمانی نوێی نێوان عیراق و بەریتانیا لەیەکی نیسانەوە بۆتە هۆی قەناعەتی کورد کە ماوەیەکی یەکجار کورتیان لە بەردەمدایە بۆ ئەوەی بکەونە کار ئەگەر بیانەوێت کاریگەرانە بێنە دەست. لە ئەنجامی ئەوەدا پێنج ئەندام پەرلەمانی کورد ئەم عەریزەیەیان پێشکەش بە مەندوبی سامی کرد

کە وا لە خوارەوە ناوەڕۆکیی دەکەینە ئینگلیزی))[6]. ئەمەیش ناوی ئەو پێنج نوێنەرە کوردەیە کە بەم جۆرە ڕیزکراون:

١. ئیسماعیل ڕەواندزی – نوێنەری هەولێر.(*)

٢. محەمەد جاف – نوێنەری کەرکووك.

٣. حازم شەمدین ئاغا – نوێنەری موسڵ.

٤. محەمەد ساڵح – نوێنەری سلێمانی.

٥. مارف جیاووك – نوێنەری هەولێر.

---

(6) N. A., C. O.,370/157/5, Kurds in Iraq, Part 1, P. 186.

(بەپێویستمان نەزانی دەقی ناوەڕۆکیی ئەو عەریزەیە، کە لە لاپەرە ١٨٦–١٨٨ی هەمان فایلدا کراوەتە ئینگلیزی، دیسانەوە وەری گێڕینەوە سەر زمانی کوردی، چونکە تا ئێستە زۆر جاران، ج بە کوردی و ج بە عەرەبی، بڵاو کراوەتەوە.)

(*) ((ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی (١٨٩٧–١٩٣٣): کوڕی سەعید بەگی کوڕی عەبدوڵڵا موخلیس کوڕی ڕەسول ئاغایە، لەڕەواندز لەدایك بووە، بەڕەچەڵەك لەبەگزادەکانی بنەماڵەی پاشای کورە یا گەورەیە، ڕەسول ئاغای باپیرە گەورەی برای محەمەد پاشای میری سۆرانە، لەساڵی ١٩٢٠دا، دوای ئەوەی ئینگلیز دێنە ئەم وڵاتە، دەکرێتە حاکمی ڕەواندز. دوای دامەزراندنی مەملەکەتی عیراق، لەهەڵبژاردنی ساڵی ١٩٢٥دا، لەئەنجوومەنی نوێنەران (مجلس النواب)دا دەبێتە نوێنەری هەولێر، لەساڵی ١٩٢٨دا جارێکی دیکە هەڵبژێردراوەتەوە، لەنێو کوردەواریدا ناوەکەی وەکو سمایل بەگ گۆ دەکەن، گۆڤاری (ڕۆژ) لەبارەیەوە نووسیویە: (لەبەر ئەوەی هەڵوێستێکی جوامێرانەی لەبەرامبەر شۆڕشی بارزان دەبێ، بۆیە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەوسای عیراق گومانی دەکەوێتە سەر)، ناوبراو دژی سەرباز گرتنی بەزۆرەملێ بووە، لەساڵی ١٩٣٣دا لەبۆسەیەکی نەیارانی، لەدۆڵی (نیشاوێ)ی نزیك (خەلیفان) غافلگیر دەکرێت، هەندێ دەڵێن هەواڵی کوژرانی دڵی پاشای عیراقی خۆش کردووە، چونکە مرۆڤێکی کورد پەروەرو بەهەڵوێست بووە.

فۆلکلۆر پەروەر (ئەحمەد عەدل) تەواوی داستانی کوژرانی سمایل بەگی لەکتێبێکی فۆلکلۆریدا زیندوو ڕاگرتووە. بەداخەوە نەکەوتمەوە سەری تا زانیاری دیکەتان بخەمە بەردەست، لەکتێبی (اعلام الکرد)ی جەمال بابان دا ساڵی لەدایك بوونی بە ١٨٩٥ نووسراوە، ئەم وێنەیەی لێرەدا بڵاومان کردۆتەوە لە ژمارە (١)ی کانوونی دووەمی ١٩٩٩ی گۆڤاری (ڕۆژ)ی سیاسی ڕۆشنبیری گشتی وەرگیراوە – ع. زەنگەنە)).

دوا بە دوای ئەوە بەڵگەنامەکە پێمان ڕادەگەیەنێت کە زۆر لایەن پشتگیریی ئەم عەریزەیەیان کردووە، هی وەك پشدەرییەکان و جافو داودەو هەمەوەندو شێخ بزێنی و شوان و قەڵاسێوکەو گەلێك هۆزی تری کوردستان[7].

هەمان بەڵگەنامە راستییەکی بایەخداری کەم زانراوی بۆ تۆمار کردووین دەربارەی ئەوەی ڕۆژی هەشتی نیسانی ساڵی ١٩٣٠ مەندوبی سامی لە بەغدا دیدەنیی لەگەڵ ئەو پێنج پەرلەمانتارە کوردەدا کردووە. بە پێی ناوەرۆکی بەڵگەنامەکە پەرلەمانتارە کوردەکان لەو دانیشتنەدا **((هەمان سکاڵاکانی جارانیان دووپات کردۆتەوە، هی وەك مەترسییان لەوەی عەرەب وەك جاران بە چاوی هاووڵاتییەکی نزم سەیری کورد لە دەوڵەتی عیراقیدا بکەن و نیشانیان دا کە حەز ناکەن ژمارەی فەرمانبەرانی عەرەب لە ناوچە کوردنشینەکاندا زۆر بکرێن، کە ئەوەیش خۆی لە خۆیدا پێچەوانەی ڕاسپاردەکانی (کۆمەڵەی گەلان)ـە، هەروەها بێزاریی خۆیانیان دەربڕی دەربارەی ئەو جۆری پەروەردە (تعلیم)ەی لەگەڵ کورددا پەیڕەو دەکرێت و ئەو هەوڵە ئاشکرایانەی عەرەبەکان دەیدەن بۆ خامۆش کردنی هەستی کوردایەتی لە فێرگەکاندا))**[8].

لە کۆتاییدا بەڵگەنامەکە دەڵێت: **((مەندوبی سامی زۆر بە بایەخەوە گوێی لە قسەکانی ئەو پەرلەمانتارانە ڕاگرت، لەوەیش دڵنیای کردن کە دەتوانن پشت بەو ببەستن و هەرچی لە توانایدا بێت دەیکات بۆ جێبەجێ کردنی داوا یاساییەکانیان. ئەوەیشی گوت کە ئامانجی سیاسەتی بەریتانیا ئەوەیە کوردو عەرەب و گشت نەتەوەکانی تری پاشانشینی عیراق پێکڕا، بە یەکگرتوویی و تەبایی بژین...))**[9].

**شایانی باسە دوا نەوەت و حەوت لاپەڕەی هەمان فایل تەرخان کراوە بۆ ناوو شوێن و سروشتی کاری فەرمانبەرانی کوردستانی باشوور**[10].

---

(7) Ibid, P. 188.

(8) Ibid, P. 188.

(9) Ibid, PP. 188-189.

(10)Ibid, PP. 139-236

هەڵوێستی ئەو پەرلەمانتارانە وەك پوشووی بن كا گڕی بەردایە ڕقی پیرۆزی پەنگ خواردووی ناو ناخی دەروونی كوردی باشووری[11] لە هەر چوار لای ئەو پارچەیەی كوردستانەوە پەیتاپەیتا نامەو بروسكەو یادداشتی دەمڕاستانی ئەوسای ناوچەكە ئاراستەی (كۆمەڵەی گەلان) و لێپرسراوانی بەغداو لەندەن دەكران بێ ئەوەی هیچ هەنگاوێك بۆ چارەسەرێكی عادیلانەی كێشەی كورد بنرێت. عەزمی بەگی بابان و حەمەی ئەوڕەحمان ئاغاو شێخ قادری برای شێخ مەحموودو عیزەت بەگی وەسمان پاشاو تۆفیق قەزاز[*] و حەمە ساڵح بەگ و ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمەد پاشاو مەجید بەگی حاجی ڕەسوڵ بەگ (بنۆڕە: پەراوێزمان لە ل١٦٣–ع. زەنگەنە) و ڕەمزی مەلا مارف و فایەق بابان و دوایی شێخ مەحمەدی گوڵانیش لەم بووارەدا لە گشت ڕوناكبیرو ناسراوانی شاری سلێمانی گەرمتر لەو ڕۆژانەدا هاتبوونە دەست، هەر ڕۆژەی بروسكەیەك یا یادداشتێك یا نامەیەكیان، دەربارەی داخوازییەكانی كورد، بۆ سەرەك وەزیران و وەزیرانی هەندەران و موستەعمەراتی بەریتانیاو مەلیك فەیسەڵی یەكەم و سەرەك وەزیرانی عیراق و ((كۆمەڵەی گەلان)) و دەزگا گرنگەكانی تر دەنارد. لەو فایلەی سەرەوەی وەزارەتی موستەعمەراتدا وێنەی ژمارەیەكی زۆر لەو بروسكەو یادداشتانە هەڵگیراون كەوا لە خوارەوە چەند نموونەیەكیان لێ دەخەینە بەرچاو.

---

(11) شایانی باسە شاعیرانی كوردی ئەو ڕۆژگارەیش درێغییان نەكردووە، تایبەت بێكەس و پیرەمێرد، ئەمیان،واتە پیرەمێرد، لەو ڕۆژانەدا دوو پارچە شیعری ناوازەی دژی توندڕەوە عەرەبەكان و تایبەت ڕۆژنامەی سەر بە حوكمەتی (العراق) گوتووە كە دەرفەتی بڵاوكردنەوەیان نەبووە بۆیەكا لەناو شیعرە بڵاوكراوەكانی پیرەمێرددا نین، بەڵام وێنەیان لە فایلە نهێنییەكانی حوكمەتی بەریتانیادا هەڵگیراوە. بڕوانە: كەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی كورد، بەرگی دووەم، ل ٥١٧–٥٢٦.

(*) ((تۆفیق قەزاز (١٨٩٨ – ١٩٥٥): كوڕی حاجی حەسەنی قەزازە، بەخزمایەتی دەبێتە مامی سەعید قەزازی دوا وەزیری ناوخۆی بوێر و ئازای سەردەمی پاشایەتی، ئەو زاتە، جگە لەوەی د. كەمال هەواڵی مژدەی دۆزینەوەو هەبوونی كۆمەڵێك بەڵگەنامەی لەبارەوە ڕاگەیاندووە، لای خەڵكی شاریش نەك هەر بەنیشتیمانپەروەرێكی كوردلیەتی ناوو دەنگی داوەتەوە، بەڵكو كارە بازرگانییەكانیشی هەر لەزوونێكەوە سەرنجی هەموو لایەكی بۆخۆی ڕاكێشابوو، ئەوەبوو لەخووڵی حەوتەمی پەرلەمانی ئەوسا وەكو نوێنەر هەڵبژێردرا، ئەو زاتە باوكی (د. شەفیق قەزاز)ی سەرۆكی ئێستای (ئەكادیمیای كوردی)یە، لەكوڕەكانی دیكەی: ناوی فائیق و نامیق و ڕەفیق و سەرچل و سامان و سەریەست هاتووە، (زەكیە قەزاز)ی كچیشی هاوسەری (سەعید قەزاز) بووە، بۆ زانیاری زیاتر بنۆڕە: جەمال بابان، اعلام الكرد، ص ١٩٢، مطبعة شڤان ، السليمانية – ع. زەنگەنە)).




(١) ڕۆژی بیست و شەشی تەمموزی ساڵی ١٩٣٠ عەزمی بەگی بابان و هاوبیرەکانی لە ڕێگەی مەندوبی سامیی بەریتانییەوە یادداشتێکیان بۆ ((کۆمەڵەی گەلان)) ناردووە، تێیدا پەرۆشیی خۆیانیان بەرانبەر برایەتی کوردو عەرەب دەربڕیوەو گوتویانە: پتەوکردنی ئەو برایەتییە بەر لە هەرشت پێویستی بەوەیە مافی خودموختاری بدرێتە کوردو فەرمانڕەواو کاربەدەستانی عەرەب لەناوچە کوردنشینەکاندا بگۆردرێن بە کورد، چونکە بەشی هەرە زۆری ئەو فەرمانڕەواو کاربەدەستانەی ئێستای کوردستان عەرەبن. لێرەدا نێرەرانی یادداشتەکە خاڵێکی زۆر گرنگیان تۆمارکردووە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((ڕەفتاری کاربەدەستانی حوکمەتی عەرەب لەگەڵ کورددا، لەکاتێکدا کە هێشتا قەیمومەت (ئینتیداب)ی بەریتانی بەسەر عیراقەوە بەردەوامە، وامان لێ دەکات بیرمان بۆ ئەوە بچێت کە لەگەڵ نەمانی ئینتیدابدا ئەو ڕەفتارە لە ڕەفتاری ڕابردوو و ئێستای تورك دژی کورد باشتر نەبێ، ئەوەی بۆتە هۆی دروستبوونی دوژمنایەتی و لێکدابڕانی یەکجارەکی لە نێوان کوردو توركدا.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییانەی سەرەوەدا دوابڕیاری قەطعیی کورد داواکردنی دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردییە لە ژێر سەرپەرشتیی (کۆمەڵەی گەلان)دا.

تکای یاریدەتان لێ دەکەین بۆ جێبەجێکردنی داخوازییە ڕەواکانمان))[12].

(٢) ڕۆژی سێی ئابی ساڵی ١٩٣٠ دیسانەوە عەزمی بەگی بابان و هاوبیرانی ئەم یاداشتەیان بۆ مەندوبی سامیی بەریتانی لە بەغدا نارد:

((سلێمانی، کوردستانی باشوور، ڕۆژی سێی ئابی ١٩٣٠، بۆ پایەبەرز مەندوبی سامیی بەریتانی لە عیراق، بەغدا.

سێری بەڕێز– شەرەفمەند دەبین شکۆدارتان ئاگادار بکەین کە بەر لە ئێستە ئێمەی کورد گەلێك داخوازیمان لە ڕێگەی پۆست یا بروسکەوە ناردووە بۆ (کۆمەڵەی گەلان)، دوێنێ وەڵامنامەیەکی بەڕێوەبەری بەشی ئینتدابمان پێگەیشت کە دەڵێت: بە پێی پەیڕەوە کارگێڕییەکانی ئەنجوومەنی (کۆمەڵەی گەلان) هەموو داواکارییەکانی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی دەکەونە ژێر رکێفی ئینتیدابەوە پێویستە لە ڕێگەی دەوڵەتی مونتەدەبەوە پێشکەشی سکرتارییەتی کۆمەڵە بکرێن. بۆیەکا وا وێنەی ئەو داخوازییانە دەنێرینە خزمەت شکۆدارتان، تکایە بەڵکو ئێوەیش بیانگەیێننە شوێنی مەبەست))[13].

(٣) دوای ماوەیەکی کورت (تۆ کەس لە ئەشرافی سلێمانی) بروسکەیەك دەنێرن بۆ خودی وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن کە ئەمە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((لە سلێمانییەوە بۆ وەزیری موستەعمەرات–لەندەن. پەیمانی نوێی نێوان هەردووك حوکمەتی شکۆداری بەریتانی و عیراقی دانی نەناوە بەو مافانەی دراونەتە کوردو خراوەتە ئەستۆی مەندوبی سامیی لە عیراق، بۆیەکا داوا لە بەڕێزتان دەکەین فەرمان بدەن کە (ئەو مافانە–ك.م.) بخرێنە ناو پەیمانەکەوەو بمانپارێزن و ئەو مافانەی پێمان دراون جێبەجێیان بکەن و داخوازییە نەتەوەییەکانمان مسۆگەر بکەن.

ئەشرافی سلێمانی عەزمی بابان[14]، عەبدولقادر حەفید[15]، حەمە ئاغا[16]، عیزەتی عوسمان پاشا، حەمدی ڕەشید پاشا، شەفیق ڕەشید پاشا، عەبدولڕەحمان ئەحمەد پاشا، فایەق بابان، تۆفیق قەزان))[17].

---

(12) N. A., C. O., 370/157/5, Kurds in Iraq, Part 1, P. 78.

(13) Ibid, P. 76.

(14) چۆن لە بروسکەکەدا هاتووە وەك خۆیان دەیاننووسین.

(٤) وا دیاره لەو ڕۆژانەدا شان بە شانی ئەو پیاوماقوڵانەی کورد ژمارەیەك هەرزەکاریش هەبوون

کە دوور نییە دڵسۆز بووبن، بەڵام بە شێوازێکی ناشی و گێرەشێوێن کاریان کردووە، بۆیەکا زیانیان زۆرو کەڵکیان هیچ نەبووە، ئەوەی بە ئاسانی لە ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەنامەیەوە هەستی پێدەکەین.

((چەند کۆمەڵەیەکی نهێنی کە ژمارەیەکیان هەم کۆن و هەم لەگیانەڵادان و بەشێکیشیان نوێن و لەوە دەکەن هاتبنەوە هۆش خۆیان، یا وەك قارچك هەڵتۆقیبن، گشتیان نهێنین و دەستیان داوەتە بڵاوکردنەوەی پەخشەو نامیلکە. شێوازی داڕشتنی ئەو پەخشەو نامیلکانە گەلێك ناشییانەیە، تیراژیشیان کەمەو بۆ ژمارەیەکی کەم لە کاربەدەستی بەریتانی گەورە بەرپرسیارو سیاسییە عیراقییەکان نێردراون. ئەو پەخشەو نامیلکانە وەك ئامرازێکی پڕۆپاگەندە بێ بایەخن، بەڵام وەك بەڵگەی بوونی کێشەیەك ئەوەندە بێ بایەخ نین))[18].

(٥) بەر لەو قۆناغە هەرگیز هاودەنگیی سەرەك هۆزانی کوردستانی باشوور نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە بەرزەی ڕۆژانی بەر لە تەقینەوەی شەڕی بەردەرکی سەرا. لە لاپەڕە سەدو حەفتاو دووی هەمان فایلدا وێنەی بروسکەیەك هەڵگیراوە کە بیستوچوار سەرەك هۆزی بەناوبانگ ڕۆژی بیستی تەمموزی ساڵی ۱۹۳۰ ناردوویانە بۆ وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن دژی ئەوەی ماف کورد لە پەیمانی نوێی نێوان عیراق و بەریتانیادا خراوەتە پشت گوێ، لە کۆتایی بروسکەکەیاندا ئەو سەرەك هۆزانە دەڵێن: ((کورد خودموختارییان دەوێت، تکایە دڵنیامان بکەن)). ئەمەیش ناوی ئەو بیستوچوار سەرەك هۆزەن، چۆن لە بەڵگەنامەکەدا نووسراون بەو جۆرە تۆماریان دەکەین:

((لە جاف: حسەین بەگ و حەسەن بەگ و عەبدوڵڵا بەگ و ئەحمەد بەگ و داود بەگ و عەلی بەگ و شێخ ڕەشیدو عەبدوڵڵا ئەوڕۆڵی.

لە هەورامانەوە: مستەفا جافەر سوڵتان و ئەفراسیاو سوڵتان.

---

(15) دیارە مەبەستی شێخ قادری برای شێخ مەحموودە.

(16) حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا.

(17)N. A., C. O., 370/157/5, Kurds in Iraq, Part 1, PP. 180-181.

(18) Ibid, P. 185.

**له پشدەرەوە:** حەسەن ئاغاو حەماغاو ئەمین بەگ و حەسەن بەگ و ئەحمەد هاوار ئاغاو رەشید ئاغاو مستەفا بەگ و سەعید بەگ و هەمزە ئاغاو محەمەدی حاجی عەبباس ئاغاو محەمەد ئاغا.

**له هەمەوەند:** فەتاح ئاغاو سەلمان ئاغاو ئەمین محەمەد ئاغا))[19].

(٦) دوای مانگێك و چوار ڕۆژ سەرۆکانی هۆزی داودەی کەرکووك دێنە دەنگ و لە ڕێگەی مەندوبی سامیی بەریتانییەوە لە عێراق مەزبەتەیەك دەنێرن بۆ سەرۆکی **((کۆمەڵەی گەلان))** لە جنێڤ و تێیدا، بەر لە هەر شت، بە توندی بەرپەرچی ڕەفعەت بەگی ئیسماعیل بەگیان(*) داوەتەوە کە ئەویش یەکێکە لە سەرۆکانی داودەو بەر لەوان بروسکەیەکی پشتگیریی بۆ حوکمەتی عێراقی ناردووە. سەرۆکانی داودە لە مەزبەتەکەیاندا دەڵێن: **((زۆر بە گەرمی پشتگیریی خۆمان بۆ داخوازییەکانی کورد، تایبەت ئەوانەی سلێمانی، ڕادەگەیێنین))**.

سەرەك هۆزانی داودە بەم جۆرە کۆتاییان بەمەزبەتەکەیان هێناوە **((بە کورتی زۆر بە گەرمی و ئەوپەڕی سۆزەوە داوای مافە نەتەوەییەکانی خۆمان دەکەین تاوەکو بتوانین نیشتمانێکی تەواو ئازاد دامەزرێنین و تێیدا بە هێمنی و ئاسوودە بژین))**.

ئەمانەیش ناوی سەرەك هۆزەکانی داودەن بەو شێوازەی لە بەڵگەنامەکەدا تۆمار کراون:

**حەمە ئەمین ئاغای خورشید ئاغا، عەلی ئاغای مستەفا ئاغا، ئیبراهیم ئاغای مەدحەت ئاغا، ئەحمەد ئاغای حەمە ئاغا، نامیق ئاغای قادر ئاغا**[20].

(٧) فایلێکی تری وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانی کە ژمارەکەی (٦/١٥٧/٧٣٠)ە تەرخان کراوە بۆ بابەتی **((کورد لە عێراقدا ساڵی ١٩٣٠، بەشی دووەم))**[21]. ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم فایلە ١٨١ لاپەڕەیەو زانیاریی زۆر بایەخداری تێدایە دەربارەی کوردستانی باشوور لە ساڵی ١٩٣٠دا، تایبەت ئەوانەیان کە پێوەندییان بە شەڕی بەردەرکی سەراوە هەیە. ئەوەی لەم خاڵەدا مەبەستمانە

---

(19) Ibid, P. 172.

(*) ((ئەو زاتە، لەگەڵ شێخ مەحموددا، بەشداری لەشەڕی شوعەیبەدا کردووە، بنەماڵەکەشیان، بەدرێژایی بیستەکان ناحەزی ئینگلیزو پشتیوانی شێخ مەحموود بوون. بنۆڕە: بابەتی شەڕی شوعەیبە، بەرگی دووەمی چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ل ٢٠ – ع.زەنگەنە)).

(20) Ibid, P. 50.

(21) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II.

**ئامارژەی بۆ بکەین ئەوەیە کە تەنانەت نوری سەعیدی دووربین و بە ڕەگەز کورد[22]، لەبەر خاتری عیراق لەو ڕۆژە ناسکەدا هیچ هەوڵێکی نەداوە بۆ ئەوەی ئاو بکات بە ئاگرەکەی شەڕی بەردەرکی سەرادا. بە پێی ڕاپۆرتێکی دوورو درێژی جۆرج کلێرکی باڵوێزی بەریتانی لە ئەنقەرە[23][*] کە ناردوویە بۆ ئارثەر هێندێرسۆنی وەزیری هەندەرانی بەریتانیا[24] نوری سەعید هەر خەریکی ئەوە بووە فەرمانڕەوایانی تورکیا لە سیاسەتی حوکمەتەکەی بەرانبەر کورد دڵنیا بکات، تەنانەت، وەك کلێرك نووسیویە، ((پەیمانی تەواوی داوە حوکمەتەکەی پشتگیریی هیچ گۆبەندێکی کوردیی لەسەر سنووری (نێوان عیراق و تورکیادا —ك.م.) نەکات))[25].**

---

(22) گاڵمانی باڵوێز لەو کتێبەیدا، کە دوای کەوتنی ڕژێمی پاشایی عیراق، بە ناوونیشانی: ((Iraq Under Nuri as-Said"، بڵاوی کردۆتەوە دەڵێت نوری سەعید بە خوێن کوردو بە زوبان تورك و بە هەست عەرەب بوو.

(23) مەبەست سێر جۆرج ڕەسێل کلێرك (Sir George Russell Clerk) ە کە بیستونۆی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨٧٤ لە هندستان لە دایك بووە، تاقانەی جەنەڕال سێر کلێرکی باوکی بووە، لە ساڵی ١٨٩٨ەوە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەران، لە کانوونی دووەمی ١٩٢٦ەوە بۆتە باڵوێزی بەریتانی لە تورکیا، تورکییەکی چاك و گەلێك زوبانی تری زانیوە، بڕوای بە ئەتاتورك نەبووەو دژی بەلشەفیزمیش بووە، ڕۆژی هەژدەی حوزەیرانی ١٩٥١ کۆچی کردووە. بڕوانە:
(Oxford Dictionary of National Biography), Volume 12, Oxford, 2004, PP. 43-45.

**(*) (لە بابەتی داهاتووی ئەم کتێبەدا دەقی وەرگێڕاوی ئەو ڕاپۆرتە بڵاو دەکەینەوە)**

(24) **ئارثەر هێندەرسۆن** Arthur Henderson: ڕۆژی بیستی ئەیلوولی ساڵی ١٨٦٣ لە دایك بووەو پیاوێکی لیبراڵی بوو، زوو بووە ڕەهبەرێکی بەناوبانگی **((پارتی کرێکاران))** و یەکێك لە ئەندامانی لە **((ئەنجوومەنی گشتیی))** (مجلس العموم)ی بەریتانیدا، کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ بووە وەزیری ناوخۆ، حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٩یش بووە وەزیری هەندەران و لەم پۆستەیدا تەواو ناوبانگی دەرکرد، ڕۆژی بیستی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:
((Oxford Dictionary of national Biography)), Volume 26, Oxford, 2004, PP. 297-302
شایانی باسە داڤیدی کوڕە گەورەی هێندێرسۆن لە شەڕی سێمی ناو خاکی فەرەنسەدا کوژراوە، لەو شەڕەدا بۆ یەکەم و دواجار ئەڵمانەکان چەکی کیمیاوییان بەکارهێنا. ناوی هێندێرسۆن چۆتە ناو دیوانی شیعری سیاسیی هاوچەرخی کوردییەوە، فایەق بێکەسی شاعیر کاتێك ڕەخنە لە هەڵوێستی **((کۆمەڵەی گەلان))** بەرانبەر بە کورد دەگرێت کۆمەڵە دەشوبهێنێت بە **((کوتەکی دەستی میستەر هەندرسن))**.

(25) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 92-93.

# بیاننامە بو کوردەکانی لوای سلیمانی

---

بە پی اتفاقنامە یك کە لە سال ١٩٢٧ دا امضای کردوە شیخ محمود تعهدی کرد بوکە لە دەرەوەی عراق دانیشێ بو یکدالە خارج حدود عراق دا اقامت بکا و بە بی اذنی حکومت داخلی عراق نە بیتەوە و بە هیچ وسیلە یك لە لە لوای سلیمانی و نە لە هیچ جیگایەکی تری عراق دا مداخلە لە ادارەی حکومت عراق نەکا .

شیخ محمود ام شرطانەی عمو شکاندوە و هرچند امری پی کراوە کە خاکی عراق بجی بیلی اطاعت او امرانەی نەکردوە کە درلوجی ز لە چند هفتە راپوردوە دا لە مناطق لوای سلیمانی دا دستی کردوە بە سورانەوە و لوینا تشبثی کردوە کە لە ضد حکومت شورش برپا کا لبراوە امری پی کراوە فوراً خاکی عراق بجی بهیلی و اگر اطاعت ام امرە نکا لە حق خو و اتباعی اجرا آت لازمە اتخاذ اکری .

بناء علیە و ا اخطارتان اکە ین کە هرکس پنا بدا بە شیخ محمود و اتباعی و یا معاونتیان بکا خوی تووشی جزای شدید اکا .

١٩٣٠ / ١٠ / ٢٠

سەرچاوە: ئەکرەمی مەحموودی سالحی رەشە، شاری سلێمانی، دەزگای رۆشنبیری بڵاوکردنەوەی کوردی، کتێبی ژمارە ٢٣١، لاپەڕە (٣٦٢)، ساڵی ١٩٨٩.

## دوارۆژەکانی
## بەر لە تەقینەوەی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوول

بەم جۆرە تا دەهات هۆکانی کاملبوونی تەقینەوەی شەڕی بەردەرکی سەرا زۆرتر کەلەکە دەبوون، شەقامەکانی شاری سلێمانی بۆنی خوێنیان لێ دەهات. بۆ روونکردنەوەی ئەم راستییە پەنا دەبەینە بەر بەلگەنامەیەکی یەکجار گرنگی وەزارەتی موستەعمەرات، کە لە هەمان فایلدا شوێنێکی وەبەرچاوی بۆ تەرخان کراوە.

بەلگەنامەی ئاماژە بۆکراو راپۆرتێکی چوارده لاپەڕەیی گەورەی ئاخنراو بە وردترین زانیاریی هەمەجۆر، ((دایەرەی پشکنەری کارگێڕیی ئینگلیز لە سلێمانی ((Office of the Administration Inspector, Sulaimani Liwa)) ئەو راپۆرتەی ئامادە کردووەو سێ دانەی لێ ناردووە بۆ راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ لە بەغدا، کە ئەویش ئینگلیز بووەو لەسەریشی نووسراوە نهێنی و بە پەلە ((Secret and Urgent))؛ بابەت: راپۆرت دەربارەی یاخیبوونەکەی شاری سلێمانی ڕۆژی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠)).

((Subject: Report on Riot at Sulaimani Town on 6th September 1930)).

ئەمانە پوختەی ئەو زانیارییانەن، کە لەو بەشەی راپۆرتەکەدا تۆمارکراون؛ لە سەرەتاکەیدا دەڵێت:

((لە نامەی ڕۆژی یەکی تەمموزی ساڵی ١٩٣٠مدا ئاماژەم بەوە کردووە کە بزێوی لە ئارادایە، ئەوەی پێویستە، بۆ دابینکردنی مەرجەکانی هەڵبژاردن کردوومانە ، بەلام زۆربەی هەرە زۆری خەلکەکە رەفزیان کرد هیچ جۆرە بەشدارییەك لە هەڵبژاردنەکەدا بکەن تا چارەسەری مەسەلەی کورد نەکرێت..ئەمانەی لای خوارەوەیش دیارترینی موعاریزەکان بوون[26].

(26) لە دەقی بەلگەنامەکەدا دەڵێت:
((The most prominent of the objectors were the following))

شێخ قادر، میرزا تۆفیق قەزاز، ڕەمزێ فەنی (مەبەست ڕەمزی فەتاحە ك.م.)، حەماغا، عەزمی بەگی بابان، عیزەت بەگی وەسمان پاشا، ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا، محەمەد سالْح بەگ، مەجید ئەفەندیی کانێسکان (مەبەست مەجید بەگی حاجی ڕەسولْ بەگە ك.م.)[*]، فایق بەگی بابان، شێخ محەمەدی گولانی.

ئەم یازدە کەسە پێکڕا، لەگەلْ ئەفسەرێکی تۆپچیی لەشکری عیراق بە ناوی عیزەتەوە[27]، کە بە ئیجازە هاتبۆوە سلێمانی، کۆمەلْەیەکیان پێکهێنابوو بۆ هاندانی (جەماوەر– ك.م.) دوای بلاوکردنەوەی ناوونیشانە سەرەکییەکانی پەیمانی ١٩٣٠ لە ڕۆژی یەکی تەمموزەوە. عیزەت بۆ خۆی ئیمزای هیچ کام لە بروسکەو مەزبەتە زۆرەکانی نەکردووە کە لەلایەن کۆمەلْەکەیانەوە نێردراونەتە ((کۆمەلْەی گەلان)) و بۆ وەزیری موستەعمەرات و مەندوبی سامیی و سەرەك وەزیرانی عیراق.

لەلایەکی ترەوە ژمارەیەك ئامادەی ئەو دوو کۆبوونەوەیە بوون کە هەلْبژاردنیان کرد، خەلْکەکە ناڕەزاییەکی زۆریان بەرانبەریان دەربڕی، بەلاّم ئەوان هەر لایەنگیریی خۆیانیان بۆهەلْبژاردنەکە نیشان دا. دیارترین کەسی ئەم دەستەیە حاجی مەلا محیالدینە، کە یەکێکە لە بازرگانە هەرە دەولْەمەندەکانی سلێمانیو پیاوێکی خاوەن مەوقیفە[28]، وێڕای حاجی مستەفا پاشا[29] کە کاتی خۆی جەنەڕال بوو لە سوپای تورکدا[30].

لە لاپەڕەی دواتردا پشکنەری ناوبراو بەم جۆرە باسی یەکێك لەو خۆنیشاندانانەی شاری سلێمانی دەکات کە ڕۆژی یازدەی ئاب ڕووی داوەو بە

---

(*) ((د. کەمال بە تەلەفۆن، لەسەر داوای (نەجات خان)ی خوشکی ڕایسپاردووە، ئەو ناوەی (مەجید بەگ حاجی ڕەسول بەگ) هەلْبگرم و ڕاستییەکەی بنووسم: مەجید بەگی کانیسکان لە خانەوادەی فوئاد مەستی باوکی نەوشیروانە، باپیری دوکتۆر یادگار حیشمەتە– ع. زەنگەنە)).

(27) مەبەستی عیزەتی فاتەیە کە بە عیزەتی تۆپچیش ناسراو بوو.

(28) لە دەقی بەلْگەنامەکەدا دەلْێت: (a man of some local standing)

(29) مەبەستی مستەفا پاشای یامولکییە کە دوژمنی باوەکوشتەی مستەفا کەمال بوو، چونکە کاتی خۆی، کە سەرۆکی دادگای عورفیی تورکیی بوو، فەرمانی لە سێدارەدانی دژی ئەتاتورك دەرکردبوو.

(30) N. A., C. O., 730/156/6, Kurds in Iraq, 1930, Part II, P. 111

ڕێخۆشـــکەرێکی شـــەڕی بـــەردەرکی ســـەرای لـــە قەڵـــەم دەدات، دەڵێـــت: ((خۆنیشاندانەکانی پێشوو، تایبەت ئەو خۆنیشاندانەی سەر لە بەیانیی ڕۆژی یازدەی ئاب رووی دا دژی ئەو کۆبوونەوەیەی جێگرانی سەرەك وەزیران و مەندوبی سامیی[31] و ئەشرافی سلێمانی و سەرۆکەکانی سازیان کردبوو. لەو شوێنەیشدا ژمارەیەك قوتابی لەلایەن مامۆستاکانیانەوە، بە تایبەت عەلی ئاغا[32] و محەمەد سالح قەفتان[33][*] و ڕەفیق ئەفەندییەوە[34] هێنرا بوون، وێڕای شاگردانی فێرگەی شەوی زانستی کە کەریم بەگ[35] مامۆستایان بوو. هەموو ئەوانە هاندران بۆ ئەو خۆنیشاندانە کە پیاوە شەلاتییەکانی شێخ قادرو هاوڕێکانی دایانە پاڵیان.

---

(31) لەو ڕۆژانەدا سەرەك وەزیران و مەندوبی سامیی بەریتانی لە دەرەوەی عیراق بوون، بۆیەکا جێگرەکانیان هاتنە سلێمانی، جەعفەر عەسکەریی جێگری نوری سەعید بوو، کۆبوونەوەکەش هەر لەبەردەرکی سەرادا سازکرابوو، ئەو ڕۆژە ڕەمزی فەتاح زۆر پیاوانە هاتبووە دەست.

(32) بە عەلی ئاگا ناوبانگی دەرکردبوو، مامۆستایەکی ڕوو خۆش و سەرکەوتوو بوو، ماڵەکەیان تەنیشت مزگەوتی دوو دەرگای سەردەشتی ئەحمەدی ساغا، لەسەر ڕێگەی نێوانی سلێمانی–هەڵەبجە بوو، حۆریی عەلی ئاگا ساڵی ١٩٥٧ بەشی ئینگلیزی (دار المعلمين العالية)ی تەواو کرد، چەپڕەو بوو، شووی کرد بە ئەفسەرێکی عەرەب، کە یەکێك بوو لە یاریدەدەرانی عەبدولکەریم قاسم و بەعسییەکان ساڵی ١٩٦٣ لە سوپا دەریان کرد.

(33) مەبەستی مێژوونووسی ناسراومان سالح قەفتانە، نازەنین قەفتان دووەم کچییە، هاوپۆلی من بوو لە بەشی مێژووی (دار المعلمين العالي)، چەپڕەو بوو، هاوسەری خوالێخۆشبوو مستەفا جاف حامید بەگە، دەمێ ساڵە لە لەندەن دەژی.

(*) ((لە ساڵی ١٨٨٤دا لە دایك بووە، دەرچووی قوتابخانەی جەنگیی (ئەستەنبۆڵ) بووە، لە ساڵی ١٩٣٧دا ماوەیەك سەرپەرشتی ڕۆژنامەی (ژیان – زیان)ی کردووە. خاوەن و بەڕێوەبەری ئەو گۆڤاری (زانستی)یە بووە کە ژمارە ١ی لە ٢٥ی شوباتی ١٩٣٨دا لە شاری سلێمانی بڵاوکراوەتەوە، لە ٣٠ ئابی ١٩٦٨ لە شارەکەی خۆی کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ لە گۆڕستانی (گردی سەیوان) نێژراوە – ع. زەنگەنە)).

(34) مەبەستی ڕەفیق حیلمییە.

(35) مەبەستی کەریم سەعید بەگە، کە لەبەر ڕۆڵی گەورەی لە قوتابخانەی زانستیدا، بە کەریم زانستی ناسراوە، گێلاسی کچی ساڵی ١٩٥٧ بەشی جوگرافیای لە (دار المعلمين العالية)ی تەواو کرد، هاوسەری خوالێخۆشبوو دادوەر جەلیل هوشیارە کە لە نزیکەوە دەمناسی، لە کوردە هەرە دڵسۆزەکان بوو، گێلاسی کەریم بەگیش دەمێکە لە ئینگلتەرە دەژی.



ڕۆژنامەنووس و مێژوونووس ساڵح قەفتان

ڕۆژی دووی ئەیلوول هەڕەشەیەکم نارد بۆ ڕەشید ئەفەندیی[36]، بەڕێوەبەری خوێندن و مامۆستا سەرەکییەکان، کە یەکێکیان لە ناوبراوانی سەرەوەن، پێم ڕاگەیاندن کە خۆنیشاندان ئیتر قەدەغەیەو سزای توندی هەر کەسێك دەدرێت هەڕەشە بکات، یا ڕێگە بگرێت لەوانەی دەیانەوێت بەشداریی بکەن لە هەڵبژاردنەکەداو پێویستە گشت تواناکانیان بخەنە گەڕ))[37].

لێرەدا دوو پرسیاری مێژوویی ڕەوا خۆیان فەرز دەکەن، یەکەمیان، ئایا دەتوانین ئەم هەموو چالاکی و بەشدارییانەی قوتابیانی سلێمانی لەو ڕۆژانەدا کە ڕێگەیان بۆ بەرپابوونی شەڕی بەردەرکی سەرا خۆش کردو ڕۆژی شەڕەکەیش خۆی کە یەکێك لە بریندارەکانی شاگردێکی زانستی بوو بیانکەینە سەرەتا، یا بەردی بناغەی لە دایکبوونی بزووتنەوی قوتابیانی کوردستانی باشوور کە هەمیشە

(36) لە ڕێگەی بەڕێز دکتۆر ئەمین موتابچییەوە زانیم کە مەبەستی ڕەشید کابانە.

(37) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 92-93.

شوێنی دیاری هەبووە لە گشت قوناغەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی باشووردا لە مێژووی هاوچەرخدا، دووەمیشیان: ئایا رۆڵی دیاری قوتابیان لە شەڕی بەردەرکی سەرادا بەلایەنی کەمەوە نامەیەکی ماجستێری سەرکەوتووی لێ دەرناچێت؟.

دوای ئەم ناوبرە دەگەڕێینەوە سەر سەرگوزشتەکەی شەڕی بەردەرکی سەرا لە راپۆرتەکەی ((پشکنەری کارگێڕیی ئینگلیز لە سلێمانی)) کە لەلاپەڕەی داهاتووی راپۆرتەکەیدا دەگاتە سەر باسی رووداوەکانی رۆژی پێنجی ئەیلول، واتا بیستوچوار سەعات بەر لە هەڵگیرسانی شەڕی بەردەرکی سەراو، دەڵێت:

((رۆژی پێنجی ئەیلوول ناردم بەدووی ئەو یازدە رەهبەرەدا، کە لەسەرەوە بە درێژی باسیانم کردووە[38]، شێخ قادر و حەمەی ئەورەحمان ئاغا و شێخ محەمەدی گوڵان نەبێت، کە لە سلێمانی نەبوون ئیتر ئەوانی تریان هەموویان هاتن و پێم گوتن ئەوانە بۆ خۆیان ئازادن بەشداری لە هەڵبژاردنەکە دەکەن یا نایکەن، بەڵام بۆیان نییە رێگە لە کەسیش بگرن بەشداریی هەمان هەڵبژاردن بکەن))[39].

## لابردنی تۆفیق وەهبی

تۆفیق وەهبی، لەو قۆناغە ناسکەدا، موتەسەریفی سلێمانی بوو، لەبەر ئەوەی کوردێکی دڵسۆز بوو، حوکمەتی عیراقی هەزارو یەك بوختانی بۆی هەڵبەست تا رۆژی حەڤدەی ئابی ساڵی ١٩٣٠، واتا نۆزدە رۆژ بەر لە هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی بەردەرکی سەرا، بەپێی ((ئیرادەیەکی خاوەن شکۆ))، بڕیاری لەسەر کار لابردنی تۆفیق وەهبی کوڕی مەعروف دەرچوو. ئەو بڕیارە لە ژمارە ٨٩ی رۆژی ٢٨ی ئابی ساڵی ١٩٣٠ی ((الوقائع العراقية))دا بە ئیمزای شەریف عەلی و جەعفەر عەسکەریی جێگری سەرەك وەزیران لە هەمان فایلدا هەڵگیراوە[41]. ئەو بڕیارە دەبێتە هۆیەکی نوێی تری تەشەنەسەندنی نارەزایی کورد، چونکە بەڵگەنامەیەکی ناو هەمان فایل بە تایبەتی باسی ئەوەی کردووە کە رەهبەرانی

(38) مەبەستی عەزمی بەگی بابان و هاوەڵەکانییە.

(39) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 113-114.

(41) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, P. 147.



تۆفیق وەهبی، موتەسەریفی ساڵی ١٩٣٠

بە توندی دژی بڕیاری لابردنی تۆفیق وەهبین و داوا لە حوکمەت دەکەن بیّ دواخستن بیگێڕێتەوە سەر پۆستەکەی خۆی[42].

## ڕۆژی شەشی ئەیلوول

لەژێر ناونیشانی ((ڕۆژی شەشی ئەیلوول)) دا پشکنەر بۆ خۆی زۆر بە وردی بەم جۆرەی لای خوارەوە، باسی تەقینەوەی شەڕی بەردەرکی سەرای بۆ تۆمار کردووین:

((ڕۆژی شەشی ئەیلوول))، بڕیارم دا لە دیوانی موتەسەڕیفییەت لەسەرا کۆبوونەوەیەك بۆ لیژنەی پشکینینی (هەڵبژاردنەکە ك. م.) ساز بکەم. بەیانیی شەشی ئەیلوول دەعوەتنامەمان نارد بۆ حاجی محیی الدین و نزیکەی ٣٠ کەسی

(42) Ibid, P. 153.

تر له ئەشراف شار کە نوێنەری گەڕەکەکان بوون و دەستکرا بە هەڵبـژاردن[43]، لـە کاتی دیاریکراودا ئامادە بوون و هەڵبژاردنەکە بەسەرپەرشتی سـەرۆکی شـارەوانی دەسـتی پێکـرد.. تـا ئـەو کاتـە بـارودۆخی شـار، بـەپێی ئـەو راپۆرتانـەی بۆمـان دەهاتن، ئاسایی بوو، هیچ نیشانەیەکی هەراو بگر لە ئارادا نەبوو.

ژمارەیەکی زۆر لە پـۆلیس لـە بـەردەرکی سـەرا و بـەناوبازاردا بڵاوکرانـەوە بـۆ ئەوەی نـەهێڵن دوکانـدارەکان دوکانـەکانیان دابخـەن و هـەروەها رێگـەیش نـەدەن خەڵکەکە لە نزیك سەراوە کۆ ببنەوە. هەمان کات لەبەر ئەوەی هەڕەشە لە هـەموو ناسـراوەکان[44] کرابـوو، نزیکـەی سـەد پۆلیـسی تایبـەتی لـەناو خـودی سـەرادا ئامادەکران، پێمان وابوو ئەو کارانەمان بەسن بۆ دابین کردنی هێمنی.

## یاخیبوونەکە

زۆری نەبرد ئاگادارکراین کـە نزیکـەی پـەنجا قوتـابی شـەلاتی بەسـەرکردایەتی فایقە فەنی[45] کەوتوونەتە هاندانی دوکاندارەکان بۆ ئەوەی دوکانـەکانیان دابخـەن و کۆببنەوە. زۆری نەبرد بەرەو پێش هـاتن تـا گەیـشتنە لای قوتابخانەکـە[46] کـە هێزێکی پۆلیس دەیپاراست. حەشاماتەکە بە هۆی ژمارەیەك شەلاتی و بازاڕییـەوە تا دەهات زۆرترو یاخیگەرتر دەبوون. لێرەدا هێنانی هێزی تـر بـە پێویـست زانـرا،

---

(43) هەڵبژاردنی نوێنەرانی سلێمانی بۆ ((ئەنجوومەنی نوێنەران))ی نوێ کە دەبوو دەنگ لەسەر پەیمانی ساڵی ١٩٣٠ بدات.

(44) مەبەستی لە ناسراوەکان، ئەشرافەکان لایەنگرانی هەڵبژاردنەکەیە، ئەوان هەڕەشەیان لێ کرابوو کە نابێت بەشداریی ئەو هەڵبژاردنە بکەن.

(45) مەبەست فایەق بێکەس (١٩٠٥-١٩٤٨)ی شاعیری ناودارە، بۆ زانیاری پتر: نەوشیروان مستەفا ئەمین، کوردستانی عیراق لە سەردەمی قەڵەم و موراجەعەت (١٩٢٨-١٩٣٠)، زنجیرە کتێبی دەزگای سەردەم، (٣٣) سلێمانی، ١٩٩٩، ل٦١.

(46) مەبەستی قوتابخانەی بەناوبانگی فەیسەڵییەیە کە یەکێك بوو لە قوتابخانە هەرە بەناوبانگەکانی شاری سلێمانی و بەناوی مەلیك فەیسەڵەوە ناونرابوو، قوتابخانەی ناوبراو دوو نهۆم بوو، کەوتبووە ناوەڕاستی شار، بەرانبەر سەرا.

فەرماندەی حامییەی سوپای عیراقی داوای سەد سەربازی بێ چەکی کرد بۆ یاریدەدانی پۆلیسەکان. هێزی پۆلیس لەگەڵ یەدەکەکان (ئیحتیاتەکان)دا شەقامەکەی لای سەرایان پاك کردەوە، بەڵام بارودۆخەکە تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوو، زۆری نەبرد بەشێك لە جەماوەرەکە کەوتنە بەکارهێنانی کورسییەکانی چایخانەکەی (بەردەرکی سەرا- ك.م.) وەك کوتەك دژی پۆلیسەکان کە ژمارەیەکیان بریندار بوون. لێرەدا دەرکەوت کە بەکارهێنانی هێز کارێکی پێویستەو بەو جۆرە یەکەم دەستەی چەکداری لەشکر داوا کرا زۆری پێ نەچوو کاتێك حەشاماتەکە دریان بە پۆلیس دا، ئەوساکە ئەوانیش لەسەرخۆ کشانەوە ناو باخچەکەی سەراوەو سەراکەیش خۆی کە کردبوویانە سەنگەرو پەناگەی خۆیان. لێرەدا بەشێکی یاخیبووەکان رژانە سەر ئەو شەقامەی کەوتۆتە نزیك چایخانەکەی حەماغا لە تەنیشت باخچەکەی سەراوە، لە کاتێکدا ژمارەیەکی کەم لە چاونەترسەکانیان هاتبوونە ناو خودی باخچەکەوە، ژمارەیەکی تریشیان لەسەر شەقامەکەوە لەباڵەخانەی سەراکە نزیك کەوتبوونەوە. لەم ساتەوە یاخیبووەکان بێ پەروا کەوتنە بەردەبارانی چ سەراو چ پۆلیسەکان. لێرەدا داوا لە فەرماندەی حامیەکرا بەتالوێنێك بنێرێت بۆ پشتگیریی ئەو هێزەی تر کە بەڕێوە بوو.

بەردەباران تا دەهات تەشەنەی دەسەند، هێرشبەران کەوتنە بەکارهێنانی ژمارەیەك قۆچەقانی، هەروەها ژمارەی دارو گۆچان بە دەستی (خۆنیشاندەران - ك.م.) تا دەهات پەرەی دەسەند. لەو کاتەدا هەواڵ گەیشت کە بەشێکی تری حەشاماتەکە چوونەتە سەر سەربانی بەندیخانەکە کە کەوتبووە شوێنێکی تری ناو سەراکەوەو بەو جۆرە ئەویشیان خستە مەترسییەوە.

زۆری نەبرد کاتێك هێزی پیادە گەیشتە جێ، چوار چوار بە ئەوپەڕی نیزامەوە چوونە ناوەندی باخچەکەی سەراوە، ئەوساکە بەردەباران وەستاو یاخیبووەکان لە باخچەکە کشانەوە، هەستیش کرا ئەوانەی پشتەوەی حەشاماتەکەش وردە وردە کەوتنە پاشەکشێ. هێزەکان نێزەکانیان بەسەر چەکەکانیاندا کرد و فەرمانیان پێدرا بڵاوە بە خۆنیشاندەرەکان بکەن. هێزەکە دەستبەکار بوو، بە پێی فەرمان رژانە سەر شەقامەکان، بەڵام حەشاماتەکە دەستبەرداری شوێنەکانی خۆیان

نەبوون و دەبینرا چۆن یاخیبووەکان بە تەوژم هێرشیان دەبردە سەر سەربازەکان و چەند بەرەو پێش دەهاتن هێند زۆرتر بەردەبارانیان دەکردن و کورسی و شتی تریان تێدەگرتن، بەو جۆرەیش کار گەیشتە ئاستی خوێنڕشتن.

لەو دەمەدا گوێمان لە تەقەیەك بوو، سەربازێکی عیراقی کوژرا، ئینجا دەمانچەی ئۆتۆماتیك یا دەمانچەی تر خرایەکارو دوو سەرباز بریندار بوون، ئەوساکە هێزەکان یەکسەر کەوتنە دەسرێژ، ژمارەیەکی زۆر لەسەربازەکان بە ئەنقەست تەقەیان بە ئاسماندا دەکرد. حەشاماتەکە دەستوبرد کشانەوەو دیار نەمان و دوای خۆیان ژمارەیەك کوژراوو زامداریان لەسەر شەقامەکان جێ هێشت، بەوەیش تەقە یەکسەر وەستێنرا. زۆری نەبرد بەتالیۆنەکەش گەیشتە جێ و بەپێی فەرمانێکی خۆم دەست گیرا بەسەر سەرانسەری شارداو لە هەر چوار لا ئاسایش دابین کرا، ئەو کارەیش بە خێرایی و بێ هیچ تەگەرەیەك جێبەجێ کرا.

## پێکراوەکان

بەر لە گەیشتنی سوپا، پۆلیس دە پێکراوی کۆکردەوە، نۆیان بە بەردو تێلا بریندار کرابوون، یەکێکیشیان بەخەنجەر، سەدو پەنجاو سێ پەنجەرەی سەراو حەڤدە گلۆپی سەر شەقامەکانیش شکێنرا بوون.

## پێکراوانی سوپا

١. یەك نەفەر سەربازی کوژراو.
٢. دوو نەفەر سەربازی بریندارکراو بە گوللە.
٣. یەك نەفەر سەربازی بریندارکراو بە بەرد.

## پێکراوی یاخیبووەکان

١. سیازدە کوژراو، پێنجیان بە نێزەو هەشتیشیان بە گوللە، دە لەو سیازدەیە یەکسەر گیانیان لە دەست دا، ئەو سیانەکەی تریان پاشتر مردن.

٢. بیستو سێ بریندار کە دوازدەیان لە نەخۆشخانە کەوتوون.

سەرجەمی پێکراوە مەدەنییەکان سەر بەچینەکانی خوارەوەی کۆمەڵن، شاگردێکی فێرگەیش بریندار کراوە.

## کۆمیتەی هەڵبژاردن

بەر لەوەی ئاژاوەکە بگاتە لقەپۆپە ئەشرافی شار دەنگیان بۆ کۆمیتەی پشکنین داو دەنگەکانیان خرانە سندوقی تایبەتی دەنگەکانەوە، دوای ئەوە ئەو ئەشرافانە هاتنە لام و گوتیان پێویست بوو حوکمەت ئەو کەسانە بپارێزێت کە یاسایان پێشێل نەکردووە، وێڕای ئەوانەی هاتبوون بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکێکی کۆمەڵایەتی (واتا ئەوانەی بۆ دەنگ دان هاتبوون—ك.م.)، گوتیشیان تا ئاژاوەچییەکان بە تەواوی دانەمرکێنرێنەوە، تا شێخ قادرو هاوەڵەکانیشی دەستگیر نەکرێن، ئەمان ناتوانن لەسەر کارەکانی خۆیان بەردەوام بن. منیش پێم ڕاگەیاندن کەوا هێزەکانی سوپا خەریکی بڵاوە پێکردنی خەڵکەکەن و فەرمانی دەستگیرکردنی هاندەرە سەرەکییەکان دەرچووە.

## گرتنی ڕەهبەرەکان

بە پێی ئەو فەرمانەی دەرمکرد، لەگەڵ خۆر ئاوابووندا، ڕۆژی شەشی ئەیلوول دە کەس لەو یازدە ڕەهبەرەی لەسەرەتای ئەم ڕاپۆرتەمدا ناویانم تۆمار کردووە دەستگیرکران، یازدەمینیشیان: شێخ محەمەدی گوڵان کە لە سلێمانی نەبوو(47)،

(47) شێخ محەمەدی گوڵانی، کە ماڵەکەی لە گەڕەکی کانێسکان بوو، لە ڕاپۆرتەکەدا ناوی هەر بە گوڵان هاتووە، وا دیارە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە هەڵهاتووە بۆ ناوچەی هەڵەبجەو دواجار ناچار بووە خۆی بدات بە دەستەوە، وەك دەڵێن پیاوێکی چوست و چالاك بووە، ئەفسەری پۆلیس شێخ ڕەزای گوڵانی کوڕی ئەوە، پیاوێکی کەڵەگەتی بۆشناغە، زوو دایە پاڵ شۆرش.

له ناوچەی هەڵەبجە ڕۆژی ١٠ی ئەیلوول خۆیدا بە دەستەوە. وا بە باش زانرا ئەو دە سەرکردەیەی کە شەشی ئەیلوول گیران بێ دواخستن لە سلێمانی دوور بخرێنەوە، بۆیەکا شەوی شەش لەسەر حەوت گوێزرانەوە بەندیخانەی کەرکووك.

هەمان کات پۆلیس چالاکانە کەوتوونەتە سۆراخی ئەو کەسانەی بەشداریی ئاژاوەکەیان کردووە تا بیانگرن و ڕەوانەی دادگای تاوان (المحكمة الجنائية) بکرێن[48].

دوا بە دوای ئەم سەرگوزشتە دوورو درێژو وردە پشکنەر لە دوو خاڵی سەرەکیی ڕاپۆرتەکەیدا گەلێك بە شانوباهووی هێزە چەکدارەکانی میریدا هەڵ دەدات و وای نیشان دەدات ئەگەر ئەو هێزانە ناچار نەکرانایە هەرگیز دەستیان لە دانیشتوانی شاری سلێمانی نەدەکردەوە. لە نیوەی دووەمی لاپەڕە نۆی ڕاپۆرتەکەیشەوە: بە پیشەی ڕۆژئاواییەکان، پشکنەر لەژێر سەرناوی پوختە (خلاصة Summary)دا بە هەمان دەستوور تا کۆتایی ڕاپۆرتەکەی لە لاپەڕە چواردەدا باسی ڕووداوەکان بە کورتی دەکاتەوە، هەروەها ئەو هەنگاوانەش دەخاتەڕوو کە لەناو شارو قەزاکانی سەر بە لیوای سلێمانی بۆ تەواوکردنی هەڵبژاردنەکە نراون[49].

## هەڵسەنگاندنێکی سەرپێیی

من بەش بە حاڵی خۆم، تاوەکو ئیمڕۆکە و لە هیچ سەرچاوەیەك و بە هیچ زوبانێك، پانۆرامایەکی وا فراوان و وردو پڕ لە زانیاریی ئەوەها دەگمەنم دەربارەی شەڕی بەردەرکی سەرا نەدیوە، بڕواش ناکەم لە دواڕۆژیشدا ببینم. ئەو ڕاپۆرتەی پشکنەر دەچێتە خانەی ئەو بەرهەمانەوە کە خوێنەر خواخوایەتی کۆتاییان نەیەت.

وێڕای ئەوە گەلێك لایەنی ناو ڕاپۆرتەکە یاریدەی مێژوونووس دەدەن وردتر لە دیاردەکانی ئاڵوگۆڕی هاوچەرخی کوردەواری تێ بگات. لێرەدا هەر وەك نموونە،

(48) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 110-119.

(49) Ibid, PP. 120-123.

ئاماژە بۆ ئەو تێبینییەی ناو ڕاپۆرتەکە دەکەم کە دەڵێت ((سەرجەمی پێکراوە مەدەنییەکان سەر بەچینەکانی خوارەوەی کۆمەڵن))، بڕوانە: ئەو بەشەی پشکنەر ناوی لێ ناوە ((پێکراوی یاخیبووەکان))، بە داخەوە هەن ئەو بۆچوونەیان پێ هەزم ناکرێت کەپێیان وایە: کۆمەڵانی خەڵك پوشووی دروستکەری ڕووداوی مێژوویین.

بە پێویستی دەزانین سەرنج بۆ چەند لایەنێکی تری ناو ڕاپۆرتەکە ڕابکێشین. پشکنەر، مافی خۆیەتی بەشان و باهووی هێزەکانی میریدا هەڵ بدات، بەڵام ئەوە، هەڵبەت، ڕێگە لە مێژوونووس ناگرێت هەست بەوە بکات کە زۆربەی ئەفسەرەکان زۆر درندانە ڕەفتاریان دەکردو کەڵکیان لە بێ ئاگایی سەربازەکانیان وەردەگرت بۆ ئەوەی ئەوانیش بە چاوی دوژمن سەیری کوردەکە بکەن. تاوەکو ئێستا چەند جارێك لەبەڕێز لیوای خانەنشین "فوئاد عارف"م بیستووە کە یەکێك لەو ئەفسەرانەی سلێمانی خەڵکی سووریا بووە، ئەو بە یەك چاو سەیری کوردو جووی دەکرد، شەڕی بەردەرکی سەرای بە هەل زانی بۆ دروێنەی گیانی ئەو لاوە کوردە دلسۆزانەی زۆر کەمتریان بۆ نەتەوەکەیان دەویست وەك لەوەی ئەو بۆ عەرەبی دەویست.

بێگومان قوربانییەکانی کورد لە شەڕی بەردەرکی سەرادا ژمارەیان لەوە زۆرتر بوو کە پشکنەر لە خاڵی ((پێکراوی یاخیبووەکان))دا ئاماژەی بۆ کردووە، وا دیارە هەر ئەو ژمارانەیشن چوونەتە ناو تۆماری فەرمیی حوکمەتی عیراقییەوەو بەرهەمی مێژوونووسە عەرەبە ناسراوەکانی وەك عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی. بەر لە هەر شت هیچ گومان لەوەدا نییە کە ژمارەی زامدارەکان لەو ژمارەیەی ناو ڕاپۆرتەکە زۆرتر بوون، چونکە گەلێك زامداری تر لەو ڕۆژەدا لە ترسی گرتن و تۆڵە خۆیان شاردبووەوە، ئەوەیش دیاردەیەکی گشتییە نەك تایبەتی.

وێڕای ئەوەی گوتمان بەڵگەی تەواو سەلمێنەر هەیە کە کوژراوەکان زۆرتر بوون لەو ژمارەیەی ڕاپۆرتەکە ئاماژەی بۆ کردووە. بۆ ئەمەیان پەنا دەبەینە بەر بەڵگەنامەیەکی زۆر بایەخداری تری خودی وەزارەتی موستەعمەرات کە بۆ بابەتی قوربانییەکانی شەڕی بەردەرکی سەرا سەرچاوەیەکی، نەك کەم هاوتا، بەڵکو بێ وێنەیە. ئەو بەڵگەنامەیە بریتییە لە نامەیەکی سێ لاپەڕەیی جێگری مەندوبی سامیی بەریتانی دەربارەی شەڕی بەردەرکی سەرا کە ڕۆژی هەشتی تەشرینی

دووەمــی ســاڵی ١٩٣٠ لــە بەغـداوە ناردوویــە بـۆ شەخــسی پاســفێڵدی وەزیــری موستەعمەرات[50]. نامەکە دوازدە خاڵ لەخۆ دەگرێت، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی خاڵی نۆیەمیە کە ئێمە مەبەستمانە:

((٩–سێ منداڵ (بەڵێ سێ منداڵ –ك.م.) لەناو کوژراوەکاندا هــەبوون، یەکـەمیان تەمــەنی نـۆو دووەمیــان تەمــەنی دەو سێیەمیـشیان تەمــەنی دوازدە ســاڵان بـوو. هەرسـێکیان لــەناو جەماوەرەکــەدا بــوون، یــەکێکیان، هەرچــۆن بێــت، لەبــەرد هاوێژەکان بوو. هیچ بەڵگەیەکیش بـە دەسـتەوە نییـە نیشانی بدات، یـا بکرێتـە بنەمای بۆچوونێکی سـەلمێنەر کـە سـەربازەکانی عێراقـی مەبەسـتیان بـووە ئـەو منداڵانە بکوژن))[51][*].

بەم بۆنەیەوە ئاماژە بۆ ئەوەیش دەکەین کە لە هەمان نامەدا جێگری مەنـدوبی سامیی دەڵێت کوردەکان ((ڕۆژی شەشی ئـەیلوول کاتێـك هێرشـیان هێنایـە سـەر سەرا ویستیان بەندیخانەکەی ناو سەرا بشکێنن بۆ ئەوەی بەندەکانی ناوی

---

(50) بارۆن سیدنی جێمس وێب پاسفیلد Baron Sidney James Webb Passfield: ڕۆژی سیازدەی تەمموزی ساڵی ١٨٥٩ لە لەندەن لە دایك بووە، خۆی و پێترایس وێبی هاوسەری لە فابییە ناسراوەکانی بەریتانیا و ئەندامی (پارتی کرێکاران) بوون، یاسای لە زانکۆی لەندەن خوێندووە، ساڵی ١٨٩٥ ڕۆڵی دیاری بینی لە دامەزراندنی (قوتابخانەی ئابووریی لەندەن)دا، ساڵی ١٩١٢و بۆ ماوەی پازدە ساڵان کرایە پرۆفیسۆری کارگێڕی گشتی، لەنێوان ساڵانی ١٩٢٢و ١٩٢٩دا ئەندامی پەرلەمان بوو، لە نێوان ساڵانی ١٩٢٩و ١٩٣١دا وەزیری موستەعمەرات بوو، سیازدەی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٩کۆچی دوایی کرد، پێنج کتێبی بە تەنها و سیازدە کتێبیشی لەگەڵ پێترایس وێبی هاوسەریدا دەربارەی بیروباوەڕی سۆسیالیزمی فابی نووسیوە. بڕوانە:

((Oxford Dictionary of National Biography)), Volume 42, Oxford, 2004, P. 982.

(51) N. A., C. O., 730/157/7, Kurds in Iraq 1930, Part III, From: Acting High Comissioner issioner for Iraq, The Residency, Baghdad, 8. October 1930, To: Lord Passfield P.C., Secretary of State for the Colonies, London, PP. 26-28.

(*) ((''ئازاد عوبێد''ی هاوکارمان لەکاتی هەڵەچنی ئەم بەشەدا ئاگاداری کردینەوە: لە ژمارە (٨٢٨)ی (التآخي) ئەیلوولی ١٩٧١دا هاتووە ٤٥ کوژراو، ٢٠٠ بریندار، ١٠٠ گیراو– ع. زەنگەنە)).



عەولە سیس

شەهیدی راپەڕینی بەر دەرگی سەرا



فایەق بێکەس



ئاپۆڕای خەڵك لە رۆژی ٦ی ئەیلوول لە سلێمانی

ئازاد بکەن کە ژمارەیان چل کەس بوو))[52] ، ئەو قسەیەش ڕاستە چونکە ئەو چل
کەسە هەموویان نیشتمانپەروەری کوردو زۆربەیان لایەنگری شێخ مەحموود بوون.

(52) Ibid, P. 27.

## مەترسیی

## دووپاتبوونەوەی ڕاپەرینێکی وەک شەشی ئەیلوول

دامرکاندنەوەی شەڕی بەردەرکی سەرا لە هەرەس هێنانێك بەو لاوە شتێکی تر نەبوو، مێژووی گشت نەتەوەیەکی خەباتگێریش، بەمێژووی کورد خۆیەوە، پڕە لە هەرەس هێنان و پاشەکشێی ناچاری کە دەرسەکانیان هەمیشە ڕێگەیان خۆش کردووە بۆ لە دایکبوونی ڕاپەڕینی گەورەتر، ئەو ڕاستییە فەرمانڕەوایانی عیراقی ڕۆژگاری پاشایی باش دەرکیان کردبوو، بۆیەکا دوای ئەوەی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولیان لە خوێنی کورددا گەوزاند بە دوو ڕۆژ جەمیل مەدفەعیش وەزیری ناوخۆ (نامەیەکی زۆر نهێنی)، دەنێرێت بۆ موتەسەڕیفەکانی هەر چوار لیوای باکوور —موسڵ، کەرکووك، هەولێر، سلێمانی‌و وێنەیشی داوەتە نوری سەعیدی سەرەك وەزیران. وەزیری ناوخۆ لەو نامەیەیدا کە ژمارەکەی (سی/٢٩٥٢)ە بە گەرمی داوا لەو چوار موتەسەڕیفە دەکات ((بەهیچ جۆر ڕێگە نەدەن جارێکی دی ڕووداوێکی وەك ئەوەی سلێمانی روو بداتەوە))[53].

## ڕەنگدانەوەی

## شەڕی بەردەرکی سەرا لە ڕۆژنامەو گۆڤارە ئینگلیزییەکاندا

گەورەیی شەڕی بەردەرکی سەرا لە گەلێك دیاردەی تردا خۆ دەنوێنێت، یەکێ لەو دیاردانە بایەخ پێدانی ڕۆژنامەو گۆڤارە جیهانییەکانە، بە ڕۆژنامەو گۆڤارە ئینگلیزی و عەرەبییەکانەوە، کە دەشێت بکرێتە ناونیشانی وتارێکی مێژوویی ڕەسەن و بەنرخ. لێرەدا تەنها دوو نموونە دەهێنینەوە، یەکەمیان دەربارەی ڕۆژنامەی ((تایمس))ی لەندەنیی بەناوبانگە[54] و دووەمیان دەربارەی گۆڤاری

---

(53) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, very secret, No., C./2252, Ministry of the Interior, Baghdad, the 8th September, 1930, PP. 126-127.

(54) تایمس: یەکێکە لە ڕۆژنامە هەرە دێرین و بڵاوو سەنگینەکانی دونیا، ساڵی ١٧٨٨ لە لەندەن دامەزرێنرا، ئێستا تیراژی ڕۆژانەی ٣,٢٧٤,٨٥٥ دانەیە.

((**ڕۆژهەڵاتی نزیك و هیندستان**))ە[55] كە لە هەموو ژمارەیەكیدا، بە پێی بۆچوونی خۆی، تیشكی دەخستەسەر سیاسەتی دەوڵەتە گەورەكان و هەڵوێستی گەلانی ڕۆژهەڵاتی نزیك[56] بەرانبەر بەو سیاسەتە.

ڕۆژنامەی ((تایمس)) ڕۆژی دوازدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لەژێر ناونیشانی ((**شەڕی كورد لەگەڵ هێزە چەكدارەكانی عێراقدا. سیازدە كوژراو**))[57] ئەمەی لای خوارەوەی بڵاوكردۆتەوە:

لە هەواڵنێرمانەوە،

بەغدا، یازدەی ئەیلوول.

لەشەڕێكی قورسدا لە نێوان پۆلیس و سوپای عێراقی و خۆنیشاندەرانی كورددا لە سلێمانی، كە زۆرینەی دانیشتووانی كوردن، سیازدە كەس كوژران كە یەكێكیان پۆلیسە، ٣٥ كەسیش بریندار بوون، چواریان سەربازو تۆیان پۆلیسن.

هەراكە بە خۆنیشاندانێكی دوو هەزار كەسی دژی ئەو كوردانە دەستی پێكرد كە بەشداریی ئەو هەڵبژاردنە گشتییەی ئێستای عێراقیان كردووە. چەكی خۆنیشاندەران بریتی بوو لە دەمانچەو خەنجەر، ئەوان ئابلۆوقەی دایەرەكانی حوكمەتیان دابوو، هاواریان دەكرد ((**بڕووخێت هەڵبژاردن**)) و ((**هەڵبژاردنێكی ئازاد لە ناوچە كوردەوارییەكاندا مەحاڵە**)). پۆلیس بەدار بەربوونە گیانی خۆنیشاندەران، بەڵام كاتێك كاربەدەستان لەوە دڵنیا بوون كە چارەسەری بارودۆخەكە لەوێزەی پۆلیسدا نییە داوای لەشكریان كرد، لەشكر ناچاری دەسرێژ بوو.

حاڵی حازر دەست بەسەر وەزعدا گیراوە، نۆ لە ڕەهبەرە نەتەوەییەكانی كورد گیراون و بۆ توێژینەوە لەگەڵیاندا نێردراونەتە كەركوك[58].

---

(55) **ڕۆژهەڵاتی نزیك و هیندستان**: یەكێك بوو لە گۆڤارە گرنگە ئینگلیزییەكان، لە لەندەن چاپ دەكرا، وتاری بایەخداری دەربارەی هیندستان و بەشی زۆری وڵاتەكانی ڕۆژهەڵات بڵاو دەكردەوە، ژمارەیەكی یەكجار زۆر وتاری بەنرخی دەربارەی كوردو كوردستان بڵاوكردۆتەوە.

(56) **ڕۆژهەڵاتی نزیك**: زاراوەیەكی جوگرافیی –سیاسییە كە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە داهات و هەموو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی بە بەشە ئەوروپایی و ئەفەریقیاییەكانییەوەو ئێرانی دەگرتەوە.

(57) ((Kurds battle with Iraqi troops. Thirteen killed)).

لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ دوو ڕاستیی ناو ڕاپۆرتەکەی ڕۆژنامەی ((تایمس)) بکەین، یەکەمیان ئەوەیە کە دەڵێت: ژمارەی ئەوانەی لە خۆنیشاندانەکانی ئەو ڕۆژەدا بەشدار بوون دوو هەزار کەس دەبوون. لێکدانەوەیەکی خێرای ئەو ژمارەیە ئەوەمان پێ دەڵێت کە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی شاری سلێمانی لەگەڵ ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولدا بوون، چونکە بە پێی هەموو سەرژمێرییە فەرمییەکان ژمارەی دانیشتوانی ئەوسای شاری سلێمانی بە هیچ جۆر لە ٣٠ هەزار کەس تێنەدەپەڕی ئاخۆ لەوانە چەندیان ژن و منداڵ و پیرو پەککەوتە بوون؟.

دووەمیشیان: دروشمەکانی ڕاپەڕینەکەیە کە، بە پێی ((تایمس)) قەناعەتی کوردەکە ئەوە بووە کە هەڵبژاردنێکی ئازاد لە بارودۆخی ئەوسای کوردستاندا کارێکی مەحاڵ بووە، کەواتە کورد هەڵبژاردنێکی ئازادی دەویست نەك ساختە. ئەوەیش هەمیشە داخوازیی گشت نیشتمانپەروەرانی جیهان بووە لەو ڕۆژەوەی ژیانی پەرلەمانیی داهاتووە.

هەرچی گۆڤاری ((ڕۆژهەلاتی نزیك و هندستان))ە، لە ژمارەی ڕۆژی پێنج شەممە، شازدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠یدا، وتارێکی بەم ناونیشانە تێدایە ((عیراق و ناوچەی باکوور))، کە سەرجەمی دەربارەی هەڵوێستی هەردووك حوکمەتی عیراقی و بەریتانیایە بەرانبەر کێشەی کوردو پێوەندیی نێوان کوردو ئاشوورییەکان کە هەبوون کنەیان تێدا دەکرد[59].

---

(58) ((The Times)), September 12, 1930; N. A., C. O., 730/157/5, No. 783/5, Kurds in Iraq 1930, Part II, P. 38.

(59)(Iraq and Its Norther Province), -(The Near East and India), London, Thursday, October 16, 1930, P. 423; N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 174 -175.

## شەڕی بەردەرکی سەراو
## دوارۆژی عیراق لە نێوان جەمیل مەدفەعی و کۆرۆنوالیسدا

دیسانەوە دەگەڕێینەوە سەر بەڵگەنامەیکی یەکجار بایەخدار، نەك تەنها بۆ ڕوون کردنەوەی لایەنە شاردراوەکانی شەڕی بەردەرکی سەرا، بەڵکو بەهەمان ڕادەو بگرە زۆرتریش بۆ تیشك هاوێشتنە سەر دوارۆژی کورد لە چوارچێوەی حوکمەتی عیراقدا کە ئیتر لە ساڵی ١٩٣٢ەوە دەبێتە ئەندامی ((کۆمەڵەی گەلان)) و حوکمەتێکی سەربەخۆ.

سەرچاوەی ئەم بەشەی بابەتەکەمان بریتییە لە ڕاپۆرتێکی نۆ لاپەڕەیی کۆرۆنوالیسی[60] ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ کە ڕۆژی هەژدەی ئابی ساڵی ١٩٣٠، واتا بیست ڕۆژ بەر لە قەومانی شەڕی بەردەرکی سەرا، ناردوویە بۆ جەمیل مەدفەعیی وەزیری ناوخۆ[61] و لە دە خاڵی تێرو تەسەلدا بە وردی بیرو بۆچوونەکانی وەزیر، بەر لە هەرشت لەبەر خاتری دوارۆژی عیراق، هەڵدەسەنگێنێت، بەڵام جەمیل مەدفەعی بە هیچ جۆر بە ڕاکانی کۆرۆنوالیس قایل

(60) سێر کینهان کۆرۆنوالیس (Sir Kinhan Cornwallis): نۆزدەی شوباتی ساڵی ١٨٨٣ لە نیویۆرك لە دایك بووە، باوکی نووسەرو ڕۆژنامەنووسێکی ناسراو بوو، زانکۆی ئۆکسفوردی تەواو کردووە، زوبانی عەرەبیی خوێندوەو ساڵی ١٩٠٦ لە سودان و دوای ئەوە لەمیسرو عەرەبستان کاری کردووەو لە شەڕەکانی وڵاتەکەیدا دژی لەشکری عوسمانی لە سووریاو فەلەستین بەشداریی کردووە. لە ساڵی ١٩١٦ بۆتە کۆلۆنێل و کراوەتە بەڕێوەبەری بیرۆ (مەکتەبی) عەرەبیی بەناوبانگ و لە ساڵی ١٩١٩ەوە پێوەندیی نزیکی لەگەڵ مەلیك فەیسەڵی یەکەمدا هەبووەو حوزەیرانی ساڵی ١٩٢١ لەگەڵیدا هاتۆتە عیراق و لەوساوە بۆ ماوەی پازدە ساڵان بۆتە ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عیراقی، ساڵی ١٩٣٥ خۆی تەقاویت کردووەو بەو بۆنەیەوە مەلیك غازی ویسامی ڕافدینی داوەتێ، لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی گەڕاوەتەوە سەرکارو لە نیسانی ساڵی ١٩٤١ەوە تا مارتی ساڵی ١٩٤٥ بۆتە باڵوێزی بەریتانی لە عیراق، ڕۆژی ٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە. (بڕوانە: وێب سایتی ئەرشیفی نیشتمانی، هەروەها:
((The pominions Office and Colonial Office, List for 1935)), London, P. 644))

(61) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 156-164.

**نابێت بۆیەکا هەردوولایان دێنە سەر ئەو بڕوایەی پۆختەی بیروبۆچوونەکانیان عەرزی ئەنجوومەنی وەزیران بکەن. کۆرۆنوالیس بێ دواخستن ڕاپۆرتە نوێ لاپەڕەییەکەی خۆی ئامادە دەکات و ڕۆژی ١٨ی ئاب دەینێرێت بۆ خودی جەمیل مەدفەعی تا ئەو، بەپێی یاسا، بەرزی بکاتەوە بۆ ئەنجوومەنی وەزیران.**

**کۆرونوالیس، لە خاڵی یەکەمی ڕاپۆرتەکەیدا، بەر لە هەر شت، دەکەوێتە هەڵسەنگاندنی ئەو پێشنیارانەی وەزیری ناوخۆ کە پێی وابووە دەبنە هۆی هێمن کردنەوەی بارودۆخی کوردستان و تایبەت سلێمانی جا با بزانین پێشنیارەکانی وەزیر چی بوون:**

**((أ. بێ دواخستن لابردنی موتەسەریفی سلێمانی تۆفیق وەهبی[*].**

**ب. بێ دواخستن لابردنی مدیری پۆلیسی سلێمانی و عەرەبێکی کوردی زانی بخرێتە جێ.**

**ج. لابردنی دەستوبردی سەرجەمی ئەو قایمقام و مودیر ناحیانەی سلێمانی کە بیروبۆچوونیان لەگەڵ بیروبۆچوونی حوکمەتی ناوەندیدا یەك ناگرنەوە.**

**د. بێ دواخستن هەموو ئەو کەسە ناسراوانەی داوای دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردییان لە سلێمانی کردووە بگیرێن و بدرێنە دادگا، ژمارەشیانی بە دوازدە کەس مەزەندە کردووە.**

---

(*) ((**تۆفیق وەهبی (١٨٩١-١٩٨٤)**: تۆفیق کوڕی مەعروف، لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٨٩١دا لە شاری سلێمانی لە دایك بووە، (وەهبی) نازناوە، ئەویش لەبەر زیرەکی و پێشکەوتنی لە خوێندندا پێ بەخشراوە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی و قوتابخانەی سەربازیی لە ١٩٠٨دا تەواو کردووە. لە سالآنی ١٩٢٥-١٩٢٨مامۆستا بووە لە کۆلیجی سەربازی لە بەغدا، پاشان کراوەتە موتەسەریفی سلێمانی، دوای ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ لە نێوان سالآنی ١٩٤٤-١٩٥٠ چەند جار بۆتە وەزیری ئابووری. لە ١٩٤٨-١٩٥٨ ئەندامی ئەنجومەنی پیاو ماقوڵان بووە. دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ چۆتە لەندەن تا لە ڕێککەوتی ٥ی کانوونی دووەمی ١٩٨٤ لە لەندەن کۆچی دوایی کردووە، لە سەر ڕاسپاردەی خۆی تەرمەکەی هێنراوەتەوە سلێمانی و لە چیای پیرەمەگروون نێژراوە، کۆمەڵێك کتێب و نووسینی لە بواری جیاجیای زمان و مێژوودا هەیە. سەرچاوە: هیوا، (گۆڤار)، پاریس ژمارە ٢ی مایسی ١٩٨٤،- ئازاد عوبێد)).

**هـ. ڕاوەدونانی هەموو ئەو کەسانەی لـە پێنـاو جیابوونـەوەی (کـوردا –ك.م.) چالاکانە تێدەکۆشن))[62].**

**ئەمـەی لای خـوارەوەیش دەقـی وەڵامەکـەی کۆرۆنوالیـسە دەربـارەی ئـەم پێشنیارانەی وەزیری ناوخۆ:**

**((٢. من ناتوانم بۆچوونەکانتان پەسەند بکەم، لەبەر ئەوەیش کە ئەو بابەتە بێ ئەندازە گرنگە واباشە، وەك کارێکی ئوسوڵی، پێشکەشی ئەنجوومـەنی وەزیرانـی بکەین، حەزیش دەکەم بۆچوونەکانم بە تۆمار کراوی عەرزی وەزیرەکان بکرێن بـۆ ئـەوەی ئـەوانیش رای خۆیـان دەربـارەی ئـەو هەنگاوانـە دەربـبڕن کـە جـەنابتان پێشنیاز دەکەن بنرێن.**

**٣. بۆ رەفتارکردن لەگـەڵ بـارودۆخی گشتیدا بـەر لـە هەرشـت ئاشـکرایە کـە دەبێت حوکمەتی عێراق لە دیارکردنی سیاسەتی خۆیدا تەنها نەڕوانێتـە ئیمرۆکـە، بـەڵکو پێویـستە هـەمان کـات بڕوانێتـە ئـەو بارۆدۆخـەی دوای سـاڵی ١٩٣٢ دێتـە کایەوە[63]، دەبێت بڕیاری ئەوە بدات کە نیازییە هەوڵ بدات لیوا کوردییـەکان یـا لەژێر سایەی بەرهەڵستیی دانیـشتوانەکانیاندا بـەڕێوە ببـات، یـا بـە رەزامەنـدیی ئـەوان. ئەگـەر ڕێبـازی یەکـەمیان هەڵبـژێردرێت ئەوسـاکە پێویـستە لـە رێگـەی بەکارهێنانی هێزەوە ئەو خەڵکە دابین بکرێن، ئایا لە بەرژەوەندیی عێراقە بەشێکی دیاری وڵاتەکەی هەمیشە بێزار بێت، یا لە راستیدا گەیشتبێتە ئاستی بـەرپاکردنی شورشێکی ئاشکرا؟**

**٤. لـە وتووێژێکـدا لەگـەڵ بـەڕێزتان هەسـتم کـرد جیاوازییـەکی قـووڵ لـە بۆچوونماندا دەربارەی دەرفەتی پشێوی لە لیوا کوردییەکاندا، هەروەها دەربارەی هەسـتی نەتـەوەیی لـەو لیوایانـەدا هەیـە. بـەڕێزتان لـەو بڕوایـەدان بزووتنـەوەی**

---

(62) Ibid, P. 156.

(63) مەبەستی کۆرۆنوالیس لەو قسانەی ئەوەیە ئەو ڕاستییە لەجەمیل مەدفەعی و وەزیرو هاوبیرەکانی بگەیێنێت کە دوای ئەوەی عێراق لە ساڵی ١٩٣٢ەوە دەبێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ ئینگلیز نیتر وەك جاران بەرپرس نابن لە بەڕێوەبردن و رەفتارەکانیدا، بۆیەکا پێویستە هەر لە ئێستاوە خۆی ئامادە بکات بۆ ئەو بەرپرسییەی دوارۆژی وڵاتی لەسەر وەستاوە.

(کوردایەتی—ک.م.) ئێستا دەستکردی ژمارەیەك گێرەشێوێنن کە ئەگەر دەمکوت بکرێن ئەوساکە بزووتنەوەکە تێکدەچێت. بەڕێزتان پێتان وایە تەنانەت ئەگەر خەڵکی دژی حوکمەت ڕاپەڕن ئەوا سوپای عیراق دەتوانێت بە ئاسانی دایانمرکێنێتەوە. ئێوە پێتان گوتم چۆن لە ڕۆژگاری تورکەکاندا کەتیبەیەکی پەرپووت بەیەك دوو تۆپی شڕەوە بێ هیچ جۆرە تەگەرەیەك دەیتوانی دەرسی هۆزە رق ئەستوورەکان دابدات. گاڵتەهاتنتان بە توانای کورد بۆ بەرهەڵستی کردنی حوکمەتی عیراق بنەمای سیاسەتی ئێوەیە، ئێوە هەموو مەیلێك بۆ رەفتارکردن بە نەرمونیانی لەگەڵ کورددا بە لاوازیی لەقەڵەم دەدەن.

بەپێی بۆچوونی من لە حاڵەتی تەقینەوەی هەر ڕاپەڕینێکی کوردیی گەورەدا پێکڕا هێزەکانی بەریتانیاو عیراق تووشی گەلێك گرفت و کێشە دێن، پێشم وایە دوای ساڵی ١٩٣٢ سوپای عیراق لەو بارەی ئێستا تێیدایە ناتوانێت (وەك پێویست —ک.م.) ڕوو بە ڕووی ئەو ئەرکە بێتەوە. خۆ ئەگەر هاتوو لەم قسانەدا زێدەڕۆیی ببینرێت ئەوساکە دەڵێم لێشاوی پێداویستییە ماڵییەکانی حەرەکاتی سەربازی و مانەوەی هێزێکی فەرمیی گەورە لە لیوا کوردییەکاندا زۆر لەسەر حوکمەتی عیراق دەکەون.

ئەمە لە خۆڕا نالێم، بەڵکو پشت بە تەجروبەی ئەو حەرەکاتە سەربازییانە دەبەستم کە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە ناوچەی سلێمانیدا ڕاپەرموێنران، وێڕای سەرنجی گشت ئەو ئەفسەرو کارمەندە بەریتانییانەی دەربارەی ئەم بابەتە گفتوگۆم لەگەڵیان کردووە.

بەم جۆرە وەك بەڕێزتان دەبینن ئێمە لە دوو سەنگەری جیاوازەوە دەڕوانینە ئەم مەسەلەیە —جەنابتان لەو ڕوانگەیەوە سەیر دەکەن گوایە شتێکی مەترسیدار لە کوردەوە لە ئارادا نییە، لەکاتێکدا من لەو بڕوایەدام ئەوان دەتوانن گەورەترین زیان بە حوکمەتی عیراق بگەیێنن. لە قوڵبنی ئەم باوەڕەوە لە سەرەتاوە من لایەنگیری ئەوە بووم کە پێویستە حوکمەتی (عیراق—ک.م.) سیاسەتێکی ئەوتۆ بگرێتە بەر کە هیچ نەبێت جارجارە لای کورد هەستی دڵنیایی دروست بکات، ئەوەیش پێویستە بە جۆرێك بێت تەنها لای کوردە هوشیارەکان پەسند نەبێت،

بەڵکو لای هەرکەسێکیش هەر جۆرە شارەزاییەکی دەربارەی مەسەلەی کورد هەبێت.

من هەمیشە سڵم لە روودانی گێرمەوکێشە کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو هەر گێرمەوکێشەیەك یەخەی گرتبێت ئەوساکە بێ سێو دوو لایەنی حوکمەتی عیراق دەگرم نەك لایەنی کورد تەنانەت ئەگەر بێتو گێرمەوکێشەیەك ئەنجامی سکاڵایەکی رەوای ئەوان بێت، بەڵام ئەوە رێم لێ ناگرێت بڵێم دوای ئەوەی چوار ساڵ بەسەر ئەو زەماتانەدا کە (دراونەتە پاڵ کورد–ك.م.) تێپەڕین بێ ئەوەی هیچیان بۆ بکرێت پێویستە حوکمەتی عیراق ئەو گوێنەدانییەی ڕابردووی خۆی بە کورد سەرزەنشت بکات))[64].

کۆرۆنوالیس لە سەری دەڕوات و لە خاڵی پێنجەم و شەشەمی راپۆرتەکەیدا دەڵێت:

((ئێستا ئێمە گەیشتووینەتە قۆناغێکی دژوارو بە پێی بۆچوونی بەندە پێویستە حوکمەتی عیراق بە وردی ئاگای لە هەموو رەفتارێکی خۆی بێت (لەگەڵ کورددا–ك.م.) و هیچ هەنگاوێك نەنێت بەبێ هەڵسەنگاندنی ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکانی ...من دەزانم بەرێزتان داخ لە دڵن لە سەرکردەکانی سلێمانی، بەڵام هەمان کات ئەوەیش دەزانم لەگەڵ ئەو بۆچوونەی منیشدا نین کە دەڵێم وەنەبێت حوکمەتیش لەم بارەیەوە هیچ گلەییەکی لێ نەکرێت. کە نوری پاشا کاری گرتە دەست هەستێکی زۆر باشی لای کورد بەو ڕاگەیاندنەی دەربارەی نیازی حوکمەت بۆ بڵاوکردنەوەی یاسای زمانە ناوچەییەکان و جێبەجێ کردنی ئەو گفتانەی دراونەتە کورد دروستکردو بووە هۆی ناردنی بروسکەی عەفەویی سوپاسگوزاری لە سلێمانییەوە، بەڵام زۆری نەخایاند ئەم کارتێکردنە باشە تا رادەیەکی زۆر بەو ڕاگەیاندنەی (نوریی سەعید–ك.م.) شێوێنرا کەتێیدا گوتی زانینی زمان (واتا زانینی زمانی کوردی –ك.م.) نەك نەتەوە[65] مەرجە بۆ دانانی کارمەندان (لە لیوا کوردییەکاندا–ك.م.)، وێڕای ئەوەی هیچیش نەکرا بۆ جێبەجێ کردنی گفتەکانی

---

(64) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 157-159.

(65) مەبەستیان ئەوە بوو هەموو غەیرە کوردێکی عیراقی، دیارە لەسەر هەموشیانەوە عەرەب، مافی ئەوەیان هەیە ببنە کارمەندی میریی لە ناوچە کوردەوارییەکانی عیراقدا.

تریش (کە درابوونە کورد-ک.م.) و پەیمانەکەش[66] بڵاوکرایەوە بێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەکی بۆ مافەکانی کورد تێدا بێت، ئەوساکە ڕەهبەرانی کوردیش هیچ بڕوایەکیان نەماو لەناو خۆیاندا یەکیان گرت. خۆ ئەگەر بهاتایەو جەنابی جێگری سەرەك وەزیران[67] بیتوانیایە زوو بچێتە شاری سلێمانی ئەوساکە مەودای ئەوە نەدەبوو سەردارە کوردەکان فریا بکەون خۆیان کۆبکەنەوە، بەڵام بەداخەوە ئێمە چەند حەفتەیەکمان بە موناقەشەیەکی توندڕەوانە دەربارەی ئەوەی دەبێت چ بدرێت و چ نەدرێت بە کورد بەفیڕۆدا، ئەوەی هەلی بۆ ئەو سەردارانە ڕەخساند تاوی وڵاخەکەیان بدەن. چەند مانگێك لەمەوبەر بەندە مەترسی ئەو جۆرە دواخستن و دوودڵییەم نیشاندا و ئەسەفی خۆیشم دەربڕی لەسەر ئەوەی نوێترینی پێشنیارەکانم لەکاتی پێویستدا قەبووڵ نەکران.

٧. هەرچۆن بێت هیچ کەڵکێك لەوەدا وەدی ناکەم فیکری خۆمان بەوەوە خەریك بکەین کە دەبوو چ بکەین، ئەوەی پێویستە حوکمەت وەبەرچاوی بگرێت سیاسەتی ئێستاو دوارۆژێتی و بەر لەهەر شت بڕیار بدرێت ئایا باشتر وایە هەوڵ بدرێت سەردارە کوردەکان دەمکوت بکرێن یان هەوڵ بدرێت ڕایانکێشێتە ئەو ئاستەی کە نوری پاشا بە بڵاوکردنەوەی یەکەم ڕاگەیاندنەکەی خۆی کردی. لەبەر ئەو هۆیانەی باسم کردن پێم وایە ئەم سیاسەتەی دوایی تاکە ڕێگەی پێویستە بگیرێتەبەر، لەوانەیە ئەوە کارێکی هەر وا ئاسان نەبێت، بەڵام پێم وایە پێویستە هەوڵی بۆ بدرێت. دەبێت هەنگاوی یەکەم بریتی بێت لە وەخستنەگەڕی ئەو گفتانەی وان لە پرۆگرامی حوکمەتدا کە پێویستە بڵاویش بکرێنەوە))[68].

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە کورۆنوالیس لە هەمان خاڵی ڕاپۆرتەکەیدا پێشنیار دەکات بێ دواخستن ناوەرۆکیی یاسای زمانە ناوچەییەکان جێبەجێ بکرێت و بێ هیچ جۆرە دەست تێوەردانێك و دواخستنێك ((یاریدەدەری

---

(66) مەبەستی پەیمانی ساڵی ١٩٣٠یە.

(67) مەبەستی جەعفەر عەسکەرییە کە جێگری نووری سەعیدی سەرەك وەزیران بوو، ئەوە بوو کاتی خۆی لەگەڵ جێگری مەندوبی سامیدا هاتنە سلێمانی.

(68) N. A., C. O., 370/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 159-161.

بەڕێوەبەری گشتیی کارگێڕیی))[69] کە دەبێت کورد بێت دابمەزرێنرێت و دەست ویرد بەڕێوەبەرێتی وەرگێڕان بکەوێتەکار. داواش دەکات هەردووک موتەسەڕیفی کەرکووك و هەولێر ئاگاداربکرێن کە پێویستە هەوڵ بدەن سەردارە کوردەکانی حولکانیان بەلای خۆیاندا رابکێشن و کارێکی ئەوتۆ بکەن نەکەونە ژێر کاریگەریی پروپاگاندەی رەهبەرانی سلێمانییەوە و پێویستە ئەمانیش قایل بکرێن کە جێبەجێ کرینی گفتەکان لەبەرژەوەندیی خۆیانە.

بەندی هەشتەمینی راپۆرتەکەی کۆرنوالیس بەم جۆرەی لای خوارەوە داڕێژراوە:

((٨. ئەگەر هاتوو ئەم هەموو کارانە بۆ جێبەجێ کردنی چارەسەرێکی ئاشتییانە سەریان نەگرت، ئەوساکە حوکمەت دەتوانێت ڕادە بۆ هەر بزووتنەوەیەکی جیاخوازی (حركة انفصالية —ك.م.) دابنێت. لە بارودۆخێکی وادا حوکمەت دەتوانێت لە بوواری سیاسەتیدا بەرانبەر بە کورد لە ئاستێکی باشتردا بێت چونکە ئەوساکە حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانیاو (کۆمەڵەی گەلان) پشتگیریی لێ دەکەن، چونکە (حکومەتی عیراق—ك.م.) بەم جۆرە سنگ فراوانی و لێهاتوویی[70] خۆی نیشان دەدات، کەسیش لاریی لەوە نییە کە حوکمەت دەبێت حوکم بکات. هەمان کات وا چاوەڕوان دەکرێت ئەم فاکتەرانە کار بکەنە سەر کوردە میانڕەوەکان و ببنە هۆی رەواندنەوەی هەر پشێوییەك. دڵسۆزانە هیوادارم حوکمەت هیچ هەنگاوێکی دامرکێنەر نەنێت تەنانەت ئەگەر کوردەکانیش ناڕازی و وەرس بن و هیچ چارەسەرێك بۆ دوارۆژ نیشان نەدەن. بەڵام ئەگەر هاتوو سەرۆکە توندڕەوەکانیان پێیان لەسەر هەڵوێستی خۆیان داگرت تەنات دوای هاتنەوەی وەڵامی (کۆمەڵەی گەلان) یش (لەسەر مەزبەتەکانیان —ك.م.) ئەوساکە پێموایە هیچ بەدیلێك[71] لە ئارادا نامێنێت.

---

(69) واتا "معاون مدير العام الاداري" لە وەزارەتی ناوخۆ.

(70) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا زاراوەی Statesmanship بە کارمێنراوە، ئەم وشەیەش Statesman لەوەوە هاتووە کە دەقاو دەق مانای "پیاوی دەوڵەت"ە.

(71) کۆرنوالیس لێرەدا وشەی Alternative ی بەکارهێناوە.

٩. تێبینیەکانی من دەربارەی ئەو هەنگاوانەی ئێوە پێشنیارتان کردوون و وەك لەسەرەوە وتران، بەم جۆرەن:

ئ. ئەگەر ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ قایل بوو ئەوا مەسەلەی دانانی موتەسەرپفی (سلێمانی—ك.م.) حەل دەبێت و ئەوساکە وەك بڕیار دراوە تۆفیق وەهبی بەگ بە فەرمی ئینفیکاك ناکات تا کاتی دانانی ئەو کەسەی دەچێتە جێگەی ئەو.

ب. پێم وایە لە رووی کارگێرییەوە دروست نییە موتەسەرپفو بەرێوەبەری پۆلیس[72]، لە یەك کاتدا بگۆردرێن، تایبەت چونکە ئەفسەری پشکنەری پۆلیسی (سلێمانی —ك.م.) شیپارد (Mr. Sheppard)، لەسەر رۆیشتنە، موراد بەگیش نیازی هەیە وەك کارمەندێکی حوکمەتی عێراق خۆی تەقاوێت بکات، پێشم وا نییە (موراد بەگ —ك.م.) وەك فەرمانبەرێکی حوکمەت لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیدا قسووری هەبوو بێت. بەلای شەخسی خۆمەوە گۆرینی موراد بەگ بەعەرەبێکی کوردی زان هەڵەیەکی گەورەیە. ئێمە ئەو سیاسەتە نوێیەمان تاقیکردەوە کە دەیەویست زمان نەك نەتەوە بکاتە بنەمای دامەزراندنی (کارمەندان —ك.م.) و گوایە ئەوە لە بەرژەوەندی کوردە، بەڵام لەم بارەیەوە نابێت ئەو راستییە لەبیر خۆمان بەرینەوە ئەو کارە لادانێك بوو لە یاسا کە لەم دواییاندا عەبدولموحسین بەگ[73] تێی کەوت.

ج. پێم وا نییە هیچ گۆرینێکی قایمقام و مودیر ناحییەکان بە شێوازێکی لە رۆتین بەدەر شتێکی پێویستە، تەنانەت دوای ئەوەیش کە وەڵامی ((کۆمەڵەی گەلان)) دێتەوە[74].

د. لەگەڵ ە— هەوڵم دا ئەو کەڵکانە نیشان بدەم کە لەسزا نەدانی رەهبەرەکانی سلێمانی چاوەروان دەکرێن، ئەو زیانانەی (لە سزا دانیان دەکەونەوە—ك.م.) بریتین لەوەی کە لەوانەیە رقی کۆمەڵە (کۆمەڵەی گەلان—ك.م.)، دوور نییە

---

(72) ئەوساکە موراد بەگ بەرێوەبەری پۆلیسی لیوای سلێمانی بوو.

(73) مەبەستی عەبدولمحسن ئەلسەعدونە کە لە ناوەندی بیستەکانی سەدەی رابردوودا سەرەك وەزیران بوو.

(74) مەبەستی ئەوەیە ئالوگۆری کارمەندانی ناوچە کوردنشینەکان پێویستە دوای گەیشتنەوەی وەڵامدانەوەی (کۆمەڵەی گەلان)یش بۆخاوەن مەزبەتە کوردەکان.

حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانیاش، بەکارێکی سەرکێش (متهور—ك.م.) هەڵبسێنێت و کوردیش وەڕس بکات بەر لەوەی چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ کێشەکە بێتە ئاراوە.

لەو بڕوایەدام گرتنی سەرکردەکانی سلێمانی دەبێتە هۆی ئەوەی هەموو کوردە میانڕەوەکان بدەنە پاڵ توندڕەوەکان و ئەوەیش ببێتە هۆی تەشەنەکردنێکی فراوانی یاخیبوون لە لیوا کوردەکانداو هیچ هیوایەکی چارەسەری ئاشتییانەی (کێشەی کورد—ك.م.) لە ئارادا نەمێنێت و حوکمەتی عێراقیش دووچاری دوژمنایەتی و بەرهەڵستییەکی هەمیشەیی بێت.

پێویستە داوای لێبوردن بکەم چونکە راپۆرتەکەم وەها دوورو درێژە، بەڵام پێم وایە بایەخی بابەتەکە پاکانەی ئەوەم بۆ دەکات. ئەگەر بێتو ئەنجوومەنی وەزیران هەڵوێستێکی بەخشندەو دۆستانە بگرێتە بەر، ئەوساکە من بێ هوودە نابم لەوەی بتوانین کێشەکە چارەسەر بکەین. بەڵام ئەگەر هاتوو وەزیرەکان هاوبیر بوون لەگەڵ بەڕێزتاندا کە دەتوانرێت کورد بێ پەروا لە هیچ سزایەك پێشێل بکرێن ئەوساکە من دەتوانم تەنها بۆچوونی قووڵی ناڕەزایی خۆم تۆمار بکەم.

وێنەی ئەم راپۆرتەم دەنێرمە خزمەت بەڕێزان جێگری مەندوبی سامی و جێگری سەرەك وەزیران.

ئیمزا

ك. کۆرنوالیس

راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆ

((١٩٣٠/٨/١٨))[75] [*].

---

(75)N.A., C.O., 370/157/6, kurds In Iraq. 1930, part II, PP. 146-161.

(*) ((تێبینی بۆ چاپی دووەم: سەرنجی تۆژەرو خوێنەران، لە بارەی (شەڕی بەر دەرکی سەرای سلێمانی)یەوە، بۆ کتابێك رادەکێشین. کە لەلایەن: ئەحمەد حسین ئەحمەد بە هەمان ناونیشان و لە ساڵی ٢٠٠٢دا لەلایەن هەفتەنامەی (سلێمانی نوێ)ی سەر بەشاری سلێمانی بڵاوکراوەتەوە. کتێبەکە کۆمەڵێك بابەتی لە خۆگرتووە کە لەلایەن نووسەرو تۆژەرو سیاسەتوانانی کوردی وەکو: (مام جەلال، نەوشیروان مستەفا ئەمین، عەلائەدین سجادی، مەلا عەبدوڵلا زێوەر، شاکیر فەتاح، میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی، د. ئاورەحمان عەبدوڵلا، ئەحمەد خواجە، سدیق سالح، ئەکرەم مەحموود سالح رەشە، رەشید کەریم)ی نووسراوە، بەبەراوردکردنی ئەو بابەتانە لەگەڵ بەڵگەنامەکانی حوکمەتی بەریتانی زۆر لایەنی دیکەی راپەڕینەکە روون دەبێتەوە. — ع. زەنگەنە)).

هیوادارم زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێم هەر شارەزاو ئاگادارێك بە وردی بیر لە ناوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتە ناوازەیەی کۆرۆنوالیس بکاتەوە دەگاتە ئەو سەرئەنجامەی ئەگەر بهاتایە فەرمانڕەوایانی ئەوسای عیراق بە گوێی کۆرۆنوالیسیان بکردایە زۆر ڕێی تێدەچوو نە شەڕی بەردەرکی سەرا، تەنانەت شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨یش، روویان بدایە. ئەو ڕۆژەی لەخوێندنەوەی ئەم ڕاپۆرتە بوومەوە بەڕێز دوکتۆر طاهر البکاء، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە، تەلەفۆنی بۆ کردم، کە لە وەڵامی ئەو پرسیارەیدا کە هەموو جارێك دەربارەی کارەکەم لەگەڵ بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا لێمی دەکات ئەو بۆچوونەی سەرەوەم پێ گوت حەپەسا. لەگەڵ ئەو ڕایەی دوکتۆر طاهر دام کە دەڵێت کارکردن لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا ڕاگەیاندنی ئەرکێکی نیشتمانییە.

ئەم بۆچوونە بە هیچ جۆر مانای نکۆڵی کردن نییە لەوەی کە دیپلۆماسییە بەریتانییەکان بەر لە هەر شت خزمەتی بەرژەوەندییەکانی وڵاتەکەی خۆیانیان نەکردووە، ئەوەیش مافێکی ڕەوای خۆیانە، پێویستە هەموو دڵسۆزێك بەر لە هەرشت بیر لە نیشتمانەکەی خۆی بکاتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەوان دووربین بوون لە بیرکردنەوەکەیاندا و پەناشیان بردۆتە بەر عەقڵ بەر لە عاتیفە. وێڕای ئەوە و، هەر لەبەر ئەوەیش لە ناو کاربەدەستانی ئینگلیزی ئەو قۆناغەدا هی وا هەبوون کە بە چاوی گومانەوە سەیری پرسی کوردو تایبەت ژمارەیەك لە ڕەهبەرانی کوردیان دەکرد، ئەو ڕاستییەی تا ئێستا چەند جارێك لە بابەتەکانی ناو ئەم بەرهەمەدا هەستمان پێی کردووەو دواییش هەستی پێ دەکەین.

بەر لەوەی کۆتایی بەم بەشەی بابەتەکەمان بهێنین بە پێویستی دەزانم، زۆر بە کورتی، ئاماژەیش بۆ ئەوە بکەم کە کۆرۆنوالیس بەر لەو ڕاپۆرتەی سەرەوەی بە ماوەیەك چەند هەڵوێستێکی بایەخداری تری نواندووە کە لە سەرجەمیاندا بە گەرمی و لەسەر ئەساسی مەنتیق ویستوویەتی قەناعەت بە فەرمانڕەوایانی ئەوسای عیراق بکات کە کورد نەتەوەیەکی جیاوازن لە عەرەب و مافی ڕەوای خۆیانە ناوچە کوردنشینەکان بەڕێوە بەرن و دەبێت ئەوی پێویستە لەم بوارەدا

حوكمەتی بەریتانی وەك خاوەن ئینتیداب و حوكمەتی عیراق وەك دەوڵەتێك لەژێر سایەی ئینتیداب دا جێبەجێی بكەن بۆ راكێشانی هەستی كورد. یەكێك لەو پێشنیارانەی كۆرنوالیس كردوونی دانانی سیمبولێكی كوردیی بووە لەناو ئاڵای فەرمیی عیراقدا[76]، ئەوەی دوایی جێبەجێنەكراو بووە هۆیەكی پتەوكردنی پێوەندیی نێوان كوردو عەرەب و دوای كەوتنی رژێمی بەعس و هەڵوێستی كاربەدەستانی نوێی عیراق بەرانبەر ئاڵاكەی صەدام حسەین ڕەهبەرانی كورد زوو زوو ئاماژەیان بۆی دەكرد.

**سەرەنجامی گیراوەكان:**

ئەو كوردانەی سلێمانی كە لەسەر شەڕی بەردەركی سەرا گیران و ڕەوانەی بەندیخانەی كەركووك كران دوای مەینەتییەكی زۆر ئینجا ئازادكران. دیسان بەڵگەنامە نهێنییەكانی حوكمەتی بەریتانی پڕن لە زانیاری دەگمەن دەربارەی ئەم مەسەلەیە كە لەم بەشەدا چەند نموونەیەكیی لێ دەخەینە بەرچاو.

دیسانەوە هەڵوێستی ئینگلیزەكان بەرانبەر گیراوەكان گەلێك باشتر بوو وەك لە هەڵوێستی فەرمانڕەوایانی عیراق، بە شەخسی نوری سەعیدی سەرەك وزیرانەوە كە وای بە باش دەزانی لەو بووارەدا پشتی وەزیرە توندڕەوەكانی ناو كابینەكەی بگرێت، تایبەت یاسین ئەلهاشمی كە تنۆكێك خوێنی عەرەب لە گیانیدا نەبوو. نوری سەعید لەو رۆژانەدا پێویستی بە یەك دەنگیی كابینەكەی بوو لە هەڵوێستی ئەندامەكانیدا بەرانبەر پەیمانی ساڵی ١٩٣٠، بۆیەكا لەو رۆژانەدا پشی پشیی بۆ یاسین ئەلهاشمی دەكرد هەرچەندە لە زۆر شتدا لە دوو سەنگەری جیاوازدا بوون.

هەر چۆن بێت لە وتووێژێكی نێوان نوریی سەعیدو سێر فرانسیس هەمفرایزی[77] مەندوبی سامیدا دەربارەی ((وەزعی كورد))[78]، نوری سەعید بە

---

(76) N. A., C. O., 730/157/5, No. 183/5, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 2, 10.

(77) سێر فرانسیس هێنری هەمفرایز Sir Francis Henry Humphrys: ڕۆژی بیستوچواری نیسانی ساڵی ١٨٧٩ لەدایك بووە، كۆلێجی سەربازیی تەواو كردو وەك كۆلۆنیل سەرەتای سەدەی بیستەم لە شەڕی ئەفەریقادا بەشداریی كردووە، ماوەیەكی زۆر لەهندستان و ئەفغانستان كاری كردووە، كۆتایی جەنگی

**توندی دژی دوو پێشنیاری مەندوبی سامی وەستاوە، یەکەمیان دەربارەی دادگایکردنی ((ئاژاوەچییە کوردەکان))[79]، کە هەمفرایز پێشنیاری کردووە ئاسانکارییان لەگەڵدا بکرێت و دووەمیشیان: دەربارەی بڵاوکردنەوەی ((یاسای زمانە ناوچەییەکان)) کە نوری سەعید لەگەڵ ئەوەدا نەبووە زوو بڵاوبکرێتەوە[80].**

**ئەم بێنەو بەرەیە ماوەیەکی زۆر دەخایەنێت بێ ئەوەی هیچ کام لە گیراوەکان بڕوخێت، یا ورە بەر بدات، زوو پێکڕا نامەو یادداشت دەنێرن بۆ کاربەدەستانی ئینگلیزو ((کۆمەڵەی گەلان))، بەڕاستی و بە پیشەی خۆی تۆفیق قەزاز لە هەموو ماوەڵەکانی دڕتر دەهاتە دەست[81]. لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی موستەعمەراتیشدا نامەیەکی دایکی رەمزی فەتاح هەڵگیراوە کە ناردوویە بۆ مەندوبی سامیی بەریتانی، هەر کە نامەکە دەگاتە بەغدا سکرتێری مەندوبی سامی یەکسەر نامەیەك ئاراستەی نوری سەعید دەکات کە تێیدا داوای روونکردنەوەیەکی کردووە دەربارەی چارەنووسی گیراوەکان ((چونکە ئەوە بابەتێکە کە حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانی بایەخی پێدەدات))[82].**

---

یەکەم لە شەرگەکانی ئەورووپادا بەشدار بوو، لە ساڵی ١٩٢٩ەوە بووە مەندوبی سامیی بەریتانی لە عیراق، لە نێوان ساڵانی ١٩٣٢و ١٩٣٥ەوە هەر لە عیراق بووە باڵوێزی بەریتانی، دوایی لە چەند کۆمپانیایەکی گەورەی وڵاتەکەیدا کاری کردووە بە کۆمپانیای نەوتی عیراقەوە. ئەفغانستان ساڵی ١٩٢٨و عیراق ساڵی ١٩٣٣خەڵاتی فەرمیی بەرزیان داوەتێ، رۆژی بیست و هەشتی ئابی ساڵی ١٩٧١کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:

((Who was who)), Volume VII, 1971-1980, London, 1981, P. 392; ((The Dominions Office and Colonial office List for 1932)), London, P. 693.

(78) ((Kurdish Situators)).

(79) ((Kurdish agitations)).

(80) N. A., C. O., 730/157/5, No. 783/5, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 18-23.

(81) گەلێك بەڵگەنامەی دەگمەنم دەربارەی هەڵوێستەکانی تۆفیق قەزاز هەیەو تا ئێستا چەند جارێکیش لە نووسینەکانمدا ئاماژەم بۆیان کردووە. بە وێنە بڕوانە: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ل ١٦٠، ١٦٨، ٢١٠، ٣٧٤–٣٧٥، ٣٧٧، ٣٧٩.

(82) N. A., C. O., 730/157/5, No. 783/5, Kurds in Iraq 1930, Part I, P. 15.



حەمەی ئاوڕەحمان ئاغا



عەزمی بەگی بابان

ئەم فشارانە بێ ئەنجام نەبوون، ڕۆژی شازدەی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠، واتا دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ و حەفتەیەك بەسەر شەڕی بەردەرکی سەرادا، عەبدولقادر ڕەشیدی سکرتێری ئەنجوومەنی وەزیران نامەیەکی ((نهێنی و پەلە))، دەربارەی ئەم بابەتە بۆ یاریدەدەری سکرتێری مەندوبی سامیی دەنێرێت کە ئەمەی لای خوارەوە خاڵە سەرەکییەکانین:

((١. ئەو یازدە کەسەی کە لەسەر شەڕی بەردەرکی سەرا گیراون وان لە بەندیخانەی کەرکووك:

ئـ. ڕۆژی شازدەی تەشرینی دووەمی ١٩٣٠ بڕیار درا ئەم ناوانەی لای خوارەوە هەر یەکەیان بە کەفالەتی سێ هەزار ڕۆپیە بەردرێن، بەمەرجێك لە ماوەی ساڵێکی تەواودا هیچ کێشەیەك نەنێنەوە:

١. عەزمی بابان[83]، ٢. فایق بابان، ٣. محەمەد ساڵح بەگ، ٤. حەماغا، ٥. عیزەت بەگ،٦. مەجید ئەفەندی، ٧. شێخ محەمەد قەلاتی[*]؟ Kilati، 8. عەبدولڕەحمان ئاغا.

---

(83) ناوەکان وەك خۆیان دەنووسینەوە.

(*) ((دیارە دەبێ (گولانی) بێت–ع. زەنگەنە)).



کەریم بەگی زانستی



مەجید بەگی کانێسکان

ب. هەروەها بریار درا شێخ قادری حەفید نەدرێتە دادگا، بەڵام هەمان کات بە باش نازانرێت رێگەی بدرێتێ بگەڕێتەوە شاری سلێمانی، بۆیەکا بڕیارمان داوە دلوا بکەین رێگەی پێ بدرێت لە شاری ناسرییە بژیو ماف ئەوەشی بدرێتی سەردانی بەغدا بکات و کەفالەتی پێنج هەزار ڕوپیی لێ وەربگیرێت کە لە ماوەی ساڵێکی تەواودا هیچ کێشەیەك نەنێتەوە.

ج. دانی ڕەمزی ئەفەندی و تۆفیق قەزاز بە دادگە، دادگای باڵای کەرکووك ڕۆژی بیستوسێی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ لەو تاوانەی کۆڵییەوە کە ئەو دوانەی پێ تۆمەتبار کرابوون و بریاری دا هەردووکیان بێ تاوانن و پێویستە ئازاد بکرێن، هەردووکیان ڕۆژی بیستوچواری تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ گەڕانەوە شاری سلێمانی.

٢. ئەو هەشتاوحەوت تۆمەتبارەی (شەڕی بەردەرکی سەرا–ك.م.) کە لە سلێمانی گیران نۆ کەسیان هەر لەوێ بە کافالەت بەردران........[84]، ئەوانی تریان ڕۆژی هەژدەی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٠ بریاری بەردانیان بۆ دەرچوو

---

(84) بەداخەوە دوادێری ئەو لاپەڕەیەی بەڵگەنامەکە دڕاوە، بۆیەکا نەمانتوانی رستەکە وەك خۆی تەواو بکەین.

بەو مەرجەی لە ڕۆژی دیاریکراودا بۆ دادگایی کردنیان ئامادە بن، ئەنجام ئەوانیش پاش چەند ڕۆژێك ئازاد دەکرێن))[85].

بەو جۆرە کێشەی گیراوەکانی شەڕی بەردەرکی سەرا کۆتایی هات و دوای ئەوە زۆربەی یازدە ڕەهبەرەکەی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولی ۱۹۳۰ لە سیاسەت دوور کەوتنەوە، بەڵام بە خاوێنی مانەوە.

## بروسکەیەکی دەگمەنی
## حەپسەخانی نەقیب

کەم ئافرەتی کوردی باشوور بە ڕادەی حەپسەخانی نەقیب و عادیلەخانی جاف لە مێژووی هاوچەرخی نەتەوەکەیاندا چالاك بوون، بۆیەکا هەردووکیان ناویان لە تۆماری مێژووی کوردو بەرهەمی گەشتیارە ڕۆژئاواییەکان و بەڵگەنامە نهێنییەکان و دەکومێنتەکانی ((کۆمەڵەی گەلان))دا دیارە. هەڵبەت لەبەر گەلێك هۆ ئافرەتێکی وەك حەپسەخانی نەقیب نەیدەتوانی لە ڕووداوەکانی شەڕی بەردەرکی سەرا دوورە پەرێز بووەستێت. شانازییە بۆ حەپسەخانی نەقیب و بۆ کورد ئەو یەکەم کەس بوو لەسەر خوێنی شەهیدانی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوول بە شێوازێکی کەم وێنە هاتە دەنگ.

حەپسەخان ڕۆژی حەوتی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۳۰، واتا تەنها یەك ڕۆژ دوای شەڕەکەی بەردەرکی سەراو گرتنی شێخ قادری هاوسەری، بروسکەیەکی ناردووە بۆ مەندوبی سامیی بەریتانی و بێ سڵاو بەم جۆرە دەست بە قسە پڕ لە شانازییەکانی دەکات:

((لە نقیب زادە حەفصەوە،
بۆ شکۆدار مەندوبی سامیی بەریتانی،
ڕۆژی حەوتی ئەیلوولی ۱۹۳۰،
لە سلێمانییەوە.

(85) N. A., C., O., 730/157/5, No. 783/5, Kurds in Iraq 1930, PartI, PP. 10-12.



حەپسەخانی نەقیب ١٨٨١-١٩٥٣

هەڵبژاردنەکان بە شێوازێکی دڕندانەی بێزراوی ئەوتۆ ڕادەپەڕمویێنرێت کە هیچ گەلێکی جیهان لە ڕۆژگاری بەربەرییەکاندا لە وێنەیان نەبینیووە. کام یاسا ڕێگە دەدات گەلێك لە کاتی هەڵبژاردندا تیرۆر بکرێت. کێ لە ئێوە یاساپارێزو کێش لە ئێوە یاسا دەخاتە ژێر پێوە؟، کام یاسا ڕێگەی داوە چەك دژی جەماوەر لە کاتی هەڵبژاردند بەکار بهێنرێت؟. ئیمڕۆ شاری سلێمانی گەێێندراوەتە دۆخێکی دژواری بەربەری ئەوتۆوە کە بۆی هەیە سەرتاپای مێژووی هەرکەسێکی بەرپرس لەکەدار بکات.

لیژنەکەتان (لیژنەی سەرپەرشتیکردنی هەڵبژاردنەکە-ك.م.)، کەوتە وتووێژ لەگەڵ کەسانێکدا کە هیچ سەنگێکیان لەم وڵاتەدا نییە.جەماوەر کاتێك بەمەیان زانی بۆ دەربڕینی ناڕەزایی خۆیان کۆبوونەوە، ئەمەیش بێگومان ماف یاسایی خۆیانە. کاتێك ئەوان (واتا پیاوانی میری-ك.م.) دییان زۆریەی هەرە زۆری خەڵکەکە دژیانن پەنایان بردە بەر سەربازو ڕەشاش و دەسرێژیان لێکردن، شەست حەفتایەکیان لێ کوشتن و

بریندار کرد. کام یاسا رێگەی ڕەفتارێکی وەها دەدات؟، ئەی چۆن ئەوانەی وایان کرد دەتوانن پاکانە بۆ کارەکەیان بکەن؟. ئێمەی کورد بێزاری خۆمان بەرانبەر بەم کارە ترسنۆکانەیە دەردەبڕین و هەتا خوێنی کوردایەتی لە دەمارەکانماندا بجمێت هەر باسی دەکەین و دەکەین، ئێوە یاساپارێزن، ئەگەر وابێت کێن ئەوانەی یاسایان پێ شێل کرد؟. هێزە چەکدارەکانی (میری—ک.م.) بەوەوە نەوەستان کە بە جەماوەرەکەیان کرد، بەڵکو رژانە ناو ماڵەکەی منیشەوەو کەوتنە پشکنین و رووی چەکەکانیان کردبووە سنگی ئافرەتەکان. ئەم پشکنینە بووە هۆی فەوتان و تالانکردنی شتومەکە بەنرخەکانم. من داوای مافە ڕەواکانی خۆم لەسەرجەمی ئەو کەسانە دەکەم کە یاسایان پێ شێل کردو رێزی ماڵەکەمیان نەگرت. دوای ئەم هێرشە جانەوەرییە هێزە چەکدارەکان کەوتنە گرتنی پیاوە ناسراوەکانمان، ئەوانەی بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ڕەوانەی بەغدا کران[86].

تکا لە شکۆدارتان دەکەم ئەم بروسکەیەم وەرگێڕنە (سەر زوبانی ئینگلیزی—ک.م.) و وێنەی پێشکەشی (کۆمەڵەی گەلان) لە جنێف بکەن))[87].

پێم وایە کەس باوەڕ ناکات ناوەرۆکیی بروسکەیەکی وا بەسۆزی ئافرەتێکی رۆژهەڵاتی ناخی دەروونی گشت ئازادیخواهانی جیهان نەهەژێنێت، بە ڕاستی ناوەرۆکی ئەم بروسکەیەی حەپسەخانی نەقیب لە هیچ روویەکەوە هیچی لە بەڵگەنامە بەناوبانگەکانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە کەمتر نییە. ئەوەی لە ناوەرۆکیی ئەم بروسکەیەدا بە شێوازێکی تایبەتی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە نۆ جاران وشەی (یاسا)ی تێدا دووپات بۆتەوە. وێڕای ئەوە زۆر پێم سەیرە کە لەهەمان فایلدا سێ جاران وێنەی ئەم بروسکەیەی حەپسەخانی نەقیب هەڵگیراوە[88]. من بۆ خۆم تا ئێستا لە هیچ فایلێکدا شتی لەو جۆرەم بەرچاو نەکەوتووە.

بێگومان دەبوو شێخی بەردە قارەمانیش خۆی لە ئاستی رووداوەکانی شەڕی بەردەرکی سەرادا پێ نەگیرێت و بێتە دەنگ.

---

(86) وادیارە سەرەتا وا زانراوە گیراوەکان رەوانەی بەغدا کراون.

(87) N. A., C. O., 730/157/6, Kurds in Iraq 1930, Part II, PP. 84-85.

(88) Ibid, PP. 88-89, 90-91.

## هەڵوێستی شێخ مەحموود

دوای خەباتێکی دوورو درێژی بێوچان و هەوڵێکی زۆری بێ ئەنجام لەگەڵ ئینگلیزو تورك و سۆڤیەتدا، شێخ مەحموود، لە ژێر فشاری فرۆکە و تۆپ و تانکی ئینگلیزدا، ساڵی ١٩٢٧ ناچار بوو بەوە ڕازی بێت لەناو خاکی کوردستانی ئێراندا بمێنێتەوەو دەستیش نەخاتە ناو کاروباری کوردستانی باشوورەوە. لە بەڵگەنامە نهێنییەکانەوە دیارە شێخ مەحموود ڕۆڵێکی ڕاستەوخۆی لە ئاڵوگۆڕو ڕووداوەکانی پایزی ساڵی ١٩٣٠ی کوردستانی باشووردا، تایبەت لە هەڵگیرسانی ئاگری شەڕی بەردەرکی سەرادا نەبووە. بەڵام دوای ئەوەی کار لەکار ترازاو ڕاپەڕینی شەشی ئەیلول هەڵگیرسا ئیتر شێخ نەیدەتوانی دوورەپەرێز بووەستێت، ئەوە بوو. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر شەڕی بەردەرکی سەرادا، خۆی و پێشمەرگەکانی سنووری دەستکردیان بەزاندو هاتنەوە ناو خاکی کوردستانی باشوور، بەو جۆرە شەڕی بەردەرکی سەرا بووە هۆی سەرەکیی دەست پێکردنی قۆناغێکی نوێی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بە ڕەهبەریی شێخ مەحموود.

بەپێی بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانی، ئینگلیزەکان لەو ڕۆژگارەدا بە پەرۆشی ئەوە بوون لەیەك کاتدا لە هەردووك ناوچەی بادینان و سۆراندا شۆڕشی کورد نەتەقێتەوە، بۆیەکا هەوڵێکی زۆریان دا بۆ ئەوەی چەند دەتوانن ڕۆژێك زووتر ڕاپەرینە نوێکەی شێخ مەحموود دابمرکێننەوە، تایبەت لەبەر ئەوەیش ئاگادار بوون ناوچەی بارزانیش لەسەرڕێیە[(89)].

دوای ئەوەی گلۆڵەی دەکەوێتە لێژیو دیسانەوە ناچار دەبێت پەنا بەرێتەوە بەر خاکی کوردستانی ئێران شێخ مەحموود بە ناچاری ڕووی دەمی دەکاتە بەریتانییەکان و نامەیەکی تایبەتی دەنێرێت بۆ جێگری مەندوبی سامیی لە عێراق، ئەمیش یەکسەر

---

(89) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە بابەتی سێیەمی بەرگی دووەمی ((چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد))، کە بەم ناونیشانەوە نووسیومە ((گاڵتەو گەپ و گەمەکانی نێوان شێخ مەحموودو فرۆکەوانە ئینگلیزەکان)). ئەو بابەتە کە پەنجا لاپەڕەیە بە پشتیوانی دەیان بەڵگەنامەی نهێنی حوکمەتی بەریتانی نووسراوە کە سەرجەمیان بەوردی باسی ئەو تەقەڵلا فراوانەی هێزی ئاسمانیی بەریتانی دەکەن کە بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموود دایان.

ڕۆژی هەشتی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۳۰ ئەم نامەیەی لای خوارەوە دەنێرێت بۆ ((نوری پاشای سەرەك وەزیران)):

((خۆشەویستم سەرەك وەزیران.

١. لە تەك ئەم نامەیەمدا دەقی ئەو نامەیەی شێخ مەحموودتان بۆ دەنێرم کە بۆ منی ناردووە.

٢. لەسەرەتاوە دەڵێم نیازم نییە وەڵامی (نامەکەی شێخ—ك.م.) بدەمەوە تا لەوە دڵنیا دەبم گەڕاوەتەوە ناو خاکی ئێران، وێڕای ئەوە پێم وایە دەبێت سێر فرانسیس (مەندوبی سامی—ك.م.) وەڵامی بداتەوە نەك من.

٣. هەرچۆن بێت حەز دەکەم بەر لە گەڕانەوەی سێر فرانسیس چەند بتوانم هێند ئاگاداری ئەو شتانە بم کە لەسەریان (دەربارەی شێخ مەحموود—ك.م.) ڕێککەوتوون، هەڵبەت ئەو کاتیش سێرفرانسیس بەختەوەر دەبێت لەگەڵ بەڕێزتاندا لەسەر ئەو وەڵامەی کە دەینێرێتەوە بۆ شێخ مەحموود ڕێك بکەون.

٤. بەلای منەوە پێویستە ئەم خاڵە سەرەکییانە لەوەڵامەکەدا وەبەرچاو بگیرێن، هەی وەك ئەوەی نابێت شێخ مەحموود دەست بخاتە ناو کاروباری شاری سلێمانییەوەو سووربوونی حوکمەت لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو گفتانەی دراونەتە کورد، لەوانە دامەزراندنی کوردێك وەك یاریدەری کارگێڕیی گشتیی وەزارەتی ناوخۆ و دامەزراندنی بیرۆی وەرگێڕان و دانانی پشکنەرێکی پەروەردەی کوردو یاسای زمانە ناوچەییەکان..

پێویستە ئەوەیش نیشان بدرێت کە ساڵانی ڕابردوو عەرەب و کورد بە تەبایی پێکەوە ژیاون، وێڕای ئەوەی کورد پێی خۆشە لەگەڵ نەتەوەیەکدا بژی کە زمانەکەی زمانی قورئانە..

هەمان کات دەبێت سەرنجی شێخ مەحموود بۆ ئەو قسانەی مێجەر یونگ ڕابکێشرێت کە لە سلێمانی کردنی، تایبەت ئەو بەشەی تێیدا گوتی: حوکمەتی بەریتانی گوێ ناداتە هیچ جۆرە چالاکییەکی وەك جوداخوازی لەناو کورددا، ئەوەیش نیشان بدرێت کە بیرکردنەوە لەسەربەخۆیی خەیاڵ پڵاوییەو بەرژەوەندیی گشتیی

کورد بە بەرژەوەندیی عیراقەوە بەستراوەتەوەو تاکە هیوای گەشەسەندن و بەختەوەریی کورد لەوەدایە بدەنە پاڵ حوکمەتی عیراق نەك دژی بووەستن.

دڵسۆزتان

ئیمزا

ر. برووك-پۆپهام((90)) (91)

ئینجا با لێرەدا بە دەقی نامەکەی شێخ مەحموود خۆی کۆتایی بە بابەتی شەڕی بەردەرکی سەرا بهێنین کە ئەویش نامەیەکی (بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (١)- ع. زەنگەنە) دانسقەی بڵاونەکراوەی شێخی نەمرەو هەڵبەت تیشك دەهاوێتە سەر گەلێك لایەنی باری سەخت و دژواری بزووتنەوەی رزگاریخوازیی نەتەوەیی کورد.

((١٩٣٠/٩/١٧. سەعادەتی مەندوبیی سامیی بەریتانی لە عیراق. دوای سڵاو

گومان لەوەدا نییە کە سەعادەتتان باش ئاگاداریی باری کارگێریی ئێستای کوردستانن، ئەو کارە پڕ لە شەرمەزاریانەی لە کوردستان کران[92]. ئەو کارە درندانانەی عەرەبەکان لە سلێمانی ئەنجامیان دا کوردستان هەرگیز لە وێنەیانی

(90) سێر هێنری ڕۆبێرت موور برووك پۆپهام (Sir Henry Robert Moore Brooke Popham): ڕۆژی هەژدەی ئەیلوولی ساڵی ١٨٧٨ لە دایك بووە، ساڵی ١٩٠٤ بووە کاپتانی فڕۆکەوان، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە بەرەکانی فەرەنسەدا بەشدار بوو، دوای جەنگ بۆ ماوەیەکی کورت گوێزرایەوە رووسیا، ساڵی ١٩٢٤ نازناوی یاریدەری مارشاڵی پێدرا، لە ساڵی ١٩٢٧ەوە گوێزرایەوە عیراق، ساڵی دواتر بوو بە بەڕێوەبەری هێزی ئاسمانیی بەریتانی لە عیراق، یەکەم فڕۆکەوان بوو کرایە جێگری مەندوبی سامی و کە ئەو لەوێ نەدەبوو ئەرکەکانی بەڕێوە دەبرد، دوای عیراق لە کەنەداو باشووری ئەفەریقا وکینیاو سەنغافوورەو هۆنگ کۆنگ و و شوێنی تر کاری کرد، ڕۆژی بیستی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٣ لە لەندەن کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:
((Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 5., PP. 1-6, ((Who was who 1951-1960)), Vol. V, London, 1964, P. 883.

(91) N. A., C. O., 730/157/7, Kurds in Iraq 1930, Part III, Secret, No., P.O. 225, The Residency, Baghdad, 8 October 1930, His Excellency Nuri Pasha al-Sa`id President of the Council of Ministers, Baghdad, PP. 23-25.

(92) مەبەستی شەڕی بەردەرکی سەرایە.

بەخۆیەوە نەبینیوە، دوای ئەوە هەڵبەت لای سەعادەتتان تەواو ئاشکرایە تا چ رادەیەك ئیتر کوردو عەرەب ناتوانن پێکرا بژین. کورد هەمیشەو بێ هیچ جۆرە شەرتوشروتێك ئێستاو دوارۆژیش خۆیان بە قەرزداری حوکمەتی بەریتانی دەزانن. کورد وەك ئەرکی سەرشانی خۆیان هەرگیز درێغییان نەکردووە لە دەربڕینی دۆستایەتی و ملکەچییان بۆ بەریتانییەکان چ ئیمڕۆکەو چ لەدوارۆژیشدا. بەڵام بە داخێکی گرانەوە دەڵێم ئەم دۆستایەتیو ملکەچییە تاوەکو حاڵی حازر لە کێشەو نەهامەتی بەولاوە هیچی بۆ کورد لێ نەکەوتۆتەوەو بۆ عەرەبیش بوونەتە هۆی خێرو بێر.

بەپێی ئەو نامەو سەرەخۆشییانەی پێم گەیشتوون لەوە گەیشتم کە کوردەکانی دراوسێشمان هیچ هیوایەکیان نەماوەو ئەوانیش تەواو بێ هوودە بوون[93]. بەردەوام لەهەر چوار لای کوردستانەوە هەواڵی ئەوەم دەگاتێ کە دوای خوێنڕشتنە پڕ لە شەرمەزارییەکەی عەرەب لەگەڵ کوردی لای خۆماندا (واتا کوردی کوردستانی باشوور-ك.م.) کردیان ئیتر حەقی هیچ ماف و ئیدیعایەکیان نییە.

بەناوی ئەم نەتەوە ئارییەوە (دەڵێم-ك.م.) هەموو داوای کورد ئەوەیە ئێوە لە چنگی عەرەب رزگاریان بکەن و جودایان بکەنەوە. کورد زۆر بە پەرۆش و بڕواوە داوا دەکەن هەمیشە لەژێر حیمایەی بەریتانییەکاندا بن.

ئیمزا

مەحموود))[94]

دوا سەرنج:

سەرگوزشتەی شەڕی بەردەرکی سەرا ئاو زۆر دەکێشێت و وەك گوتمان ئەو کارەساتە وەرچەرخانێکی بایەخدار بوو لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگایخوازی هاوچەرخی نەتەوەی کورددا، تایبەت لە بوواری شێوازی سەرکردایەتی ئەو بزووتنەوەیەدا، هەڵبەت لە خۆڕا نەبوو کە سەرجەمی ڕەهبەرانی شەڕی بەردەرکی

(93) دەبێت شێخ مەبەستی کوردی تورکیاو ئێران بێت کە ئەوانیش جاران وەك کوردی عیراق هیوایان بە بەریتانیا بوو.

(94)N. A., C. O., 730/157/7, Kurds in Iraq 1930, Part III, P. 25.

سەرا بە پێوانەی کات و شوێن و بۆ ڕۆژگاری سییەکانی سەدەی ڕابردوو خوێندەواری چاك و لێهاتوو بوون، لە خۆڕاش نەبوو کە نە لە دوورو نە لە نزیکەوە ناوی شێخ مەحموود لەو ژمارە زۆرەی مەزبەتە یەك لە دوای یەکەکانی ئەو ڕەهبەرانەدا نەهاتووە، هەروەها شێخ مەحموود بۆ خۆیشی درەنگ لەسەر شەڕی بەردەرکی سەرا هاتە دەنگ. ئەوانە هەموویان ئالوگۆڕی نوێ و پێویست بوون و هیچیش لە سەنگی قورسی شێخ لە تۆماری کوردایەتی‌و لە ناخی دەروونی دڵسۆزانی کورددا کەم ناکەنەوە، بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە خەرمانێکن، وا مشتێکی کەمی بۆ ئەم دوا سەرنجە لێ دەکەینە نموونە.

بەر لەهەر شت پەنا دەبەینە بەر هەڵسەنگاندنی بەرپرسیارێکی گەورەی ئینگلیز لە عیراقی ئەو ساڵانەدا کە بە تایبەتی و نهێنی لە ڕاپۆرتێکدا ئامادەی کردووە بۆ وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانیی، ئەو بەرپرسیارە ڤیڤیان هۆڵتە[95]، کە ڕۆژی سیازدەی مایسی ساڵی ١٩٣١، واتا دوای دوا خۆبەدەستوەدانی شێخ مەحموود، ئەو بیرویۆچوونەی خۆی دەربارەی نووسیوە، گرنگیش ئەوەیە کە ڤیڤیان هۆڵت بۆ خۆی لە پێنجوین بە ناوی هەردووك حوکمەتی عیراق و بەریتانییەوە وتووێژی ئەو خۆبەدەستەوەدانەی لەگەڵ شێخ مەحموددا کردووەو بۆ خۆیشی لەگەڵ شێخی

---

(95) سێر ڤیڤیان هۆڵت: ڕۆژی بیستوپێنجی کانونی دووەمی ساڵی ١٨٩٦ لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩١٩ەوە لە عیراق کاری کردووە، کە ساڵی ١٩٢٦ مس بێڵی بەناوبانگ کۆچی دوایی کرد ئەو جێگەی گرتەوەو لەوساوە بووە سکرتێری ڕۆژهەڵاتیی مەندوبی سامیی بەریتانی لە عیراق کە پۆستێکی بەرێز کاریگەر بوو، ڤیڤیان هۆڵت لەو کارەیدا هێند سەرکەوتوو بوو کە ئیتر دەروازەی بەرەوپێش چوون لە ڕوویدا کرایەوە، لە ڕۆژگارێکی ناسکی وەك دوای جەنگی دووەم بووە باڵوێزی بەریتانی لە ئێران و لە نزیکەوە ئاگاداری گشت ڕووداوەکانی کۆماری مەهاباد (کوردستان) بوو، ساڵی ١٩٤٩ کرایە باڵوێزی وڵاتەکەی لە کۆریا، واتا لە ڕۆژگارێکی سەختی سەرەتاکانی ((جەنگی سارد)) لە نێوان هەردووك بەرەی سۆسیالیزمی و سەرمایەداریدا کە کۆریا بۆ خۆی یەکێك لەبەرە سەرەکییەکانی ئەو جەنگە بوو، ئەو سەرکەوتنانەی ڤیڤیان هۆڵت ڕێگەیان خۆش کرد بۆ ئەوەی نازناوی بەرزی سێری پێ بدرێت، ڕۆژی بیستونۆی تەمموزی ساڵی ١٩٦٠کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:

((Who was Who)), Vol. V, 1951-1960, London, 1964, PP. 536-537.

بەخسیرداو لەژێرچاودێری هێزەکانی میریدا لە پێنجوینەوە تاوەکو بەغدا لە تەنیشتییەوە بووە. ڤیڤیان هۆڵت لە ڕاپۆرتە نهێنییەکەیدا دەڵێت:

((شێخ مەحموود ئازایانە، خاوێن و مەردانە دەجەنگی..دۆڕاندنی لەشەردا ناوی لەناو کوردی باشووردا نەزڕاند. دوای ئەوەی لە پێنجوین خۆی دا بە دەستەوە بە دەستبەسەری گواستمانەوە، کوردی گوندەکانی دامێنی چیاکان بە لێشاو بە سەریا دەڕژان، بە پەرۆشەوە دەستیان ماچ دەکرد، گەلێکیان بەچاوی پڕ لە فرمێسک و هەنسکەوە ماڵ ئاواییان لێی دەکرد..باسی دڵ ڕەقیی دەکەن، بەڵام کێ شایەتە؟، لەناو لادێیەکاندا شایەتێکی وا نییە، ئەوان لە کاتی بەزینیدا پاڵەپەستۆیان بوو تا فریا بکەون دەستی ماچ بکەن. شایەتێکی وا لەناو فڕۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانیی مەلەکیشدا، کە دژی جەنگین، چنگ ناکەوێت، دوانیان لای شێخ دیل بوون، ئەوانیش بە دڵ دەیانویست لەو کاتی شکستییەیدا دڵ نەوایی بکەن. کەس لاریی لەوە نییە شێخ طەموح و خاوەن کیبریا بوو، بەڵام هەردووکیان بۆ نەتەوەکەی بوون نەك تەنها بۆ خۆی، زۆر کەسی تریش وەك ئەو طەموح و خاوەن کیبریا بوون و ئەوەیان پێ شەرم نەبوو. با نازناوی چەتەو یاخیگەریی لە ئاستی یاسادا پێ ببەخشین، ئەی غاریبالدی ومستەفا کەمالیش وەك ئەو نەبوون؟. خۆ ئەگەر بێتو هەردووك لایەنی مەسەلەکە وەبەرچاو بگرین ئەوساکە دروستترین حوکم بە سەریدا ئەوەیە کە گەورەترین هەڵەی شێخ بریتی بوو لەوەی سەدەیەك درەنگتر لەوەی دەبوو لە دایك بوو))[96].

دوای دە ساڵی ڕەبەق دەربەدەریی لە سەماوەو ناسرییەو عانەو بەغدا، شێخ مەحموود ڕاپەڕینەکەی ڕەشید عالیی گەیلانیی ساڵی ١٩٤١ی بە هەل زانی و لە بەغداوە بە نهێنی گەڕایەوە کوردستان و ئیتر بە پێی دوا ڕێککەوتننامەی لەگەڵ حوکمەتدا گوندی داری کەلی بووە مەڵبەندی خۆی و پەناگەی ژمارەیەك نیشتمانپەروەرانی کورد. لەوساوە هەر کاتێك بۆ زیارەتی گلکۆی حاجی کاك

(96) N. A., C. O., 730/163/88069, XM 08533, 1931, Shaikh Mahmud, Part II, Appendix A, Biographical Note on Shaikh Mahmud by Captain V. Holt.

هەروەها بڕوانە: کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی دووەم، ل ٦٥-٦٦.



ئاپۆرای خەڵکی کورد لە دەوری ئۆتۆمبێلی شێخ مەحموود، لەکاتی هاتنی
مەلیک فەیسەڵی دووەم بۆ سلێمانی، لە ساڵی ١٩٥٢دا
سەرچاوە: ستۆدیۆ رەفیق – سلێمانی

ئەحمەدی شێخی باپیرە گەورەی، یا بۆ پرسەو هەر بۆنەیەك رێگەی بکەوتایە سلێمانی بە ئەوپەڕی رێزو تەقدیرەوە پێشوازیی لێ دەکرا. بۆ خۆم زۆر باشم لە یادە کە ئەمین زەکی بەگی مێژوونووس سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٤٨ هاتەوە سلێمانی، شێخ مەحموود بە تایبەتی لە داری کەلییەوە هات بۆ زیارەتی، هەرچەندە شێخ لە رێبازی کوردایەتیی ئەمین زەکی بەگ رازی نەبوو، ئەو ئازادیی کوردستانی لە لوولەی تفەنگەوە وەدی دەکرد. بە هەمان دەستوور ساڵی ١٩٥٢یش شێخ بۆ پێشوازیی مەلیک فەیسەڵی دووەم هاتەوە سلێمانی، بەڵام لە قەراغ شار حەشاماتەکە، لە بریتی ئەوەی روو بکەنە ئۆتۆمبیلەکەی خاوەن شکۆ، پاڵەپەستۆیان بوو تا بگەنە لای شێخی بەردە قارەمان و ئۆتۆمبیلەکەیان وەك تەختی پاشایی خستە سەر شانیان. کە لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٦ یشدا شێخ بۆ دواجار ماڵئاوایی لە چیا سەرکەشەکانی کوردستان کرد رەش و رووت و جامانە بەسەرەکانی ناوبازاڕو شاگردان و مامۆستایانی قوتابخانەکان و ئەفەندییەکانی دایەرەکان بە خوێنی گەشی ئەختەری شۆخ و شەنگ رێگەی تەرمەکەی شێخیان گوڵاوپژێن کرد.

# بابەتی شەشەم

## دیاردە سەرەکییەکانی قۆناغی نوێی خەباتی رزگاریخوازیی کورد دوای تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

## سەرەتايەك

تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهان، تایبەت لەو وڵاتانەدا کە ئیتر بەناوی جیهانی سێیەمەوە ناسران، سەرەتای قۆناغێکی نوێی لە مێژووی هاوچەرخی گشت جیهاندا دارشت. گەلانی ئەو جیهانی سێیەمە، بەر لە هەموانیش گەلە چاوساوەو بێ مافەکانی، دوای ئەوەی هیچ هیوایەکیان بە ڕۆژئاوا نەما ڕوویان کردە وڵاتی شوورەوی. ئەم دیاردەیە لەناو کورددا زۆر زەق دیاربوو، تەنانەت زۆربەی هەرە زۆری دەستەو ڕێکخراوە نەتەوەییەکانیش بەئاشکرا ئەو سەنگەرەیان هەڵبژارد. دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی ئەو ڕۆژگارە بەوردی کەوتوونەتە سۆراخی هەموو لایەنەکانی ئەم ئاڵوگۆڕە بایەخدارە کە ((پارتی رزگاریی کورد)) یەکێك لە دیاردە گرنگەکانی بوو.

## پارتی رزگاریی کورد لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

ڕووناکبیرانی کورد، بە ماوەیەك بەرلەوەی جەنگی جیهانیی دووەم کۆتایی بێت، کەوتنە خۆو ژمارەیەك کۆمەڵەو ڕێکخراوی نوێیان دامەزراند، ئەوانەی ڕۆڵێکی گەورەیان لە هاندانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا بینیو بوونە هۆی ئەوەی شار ببێتە ناوەندێکی کاریگەری تری خەباتی کورد، ((پارتی رزگاریی کورد))یش یەکێك لەو ڕێکخراوە چالاکانە بوو کە لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە سەرنجی دیپلۆماسییە ئینگلیزەکانی ڕاکێشا. هەر ئەوەندە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی بە هەواڵی دامەزراندنو بیروڕاکانی ((پارتی رزگاریی کورد))یان زانی یەکسەر ڕۆژی بیستو شەشی تەمووزی ساڵی ١٩٤٦ بە نامەی ژمارە ٤٦/١٢/٢٢١ داوا لە باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا دەکات چی دەزانێت دەربارەی ئەو پارتییەو ڕێبازو شێوازی کاریو ئەندامە چالاکەکانی بیکاتە ڕاپۆرتێكو بۆی بنێرێت، باڵوێزخانەی بەریتانیش داوا لە ئەفسەری پاراستنی ئاسایش و (د.دەبل یو ئۆوین) دەکات دەستوبرد ئەو فەرمانە جێبەجێ بکات، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ڕاپۆرتەکەی ئۆوینە:

((نهێنی،

ئەفسەری ئاسایشی گشتی،

بەغدا،

بۆ: باڵوێزخانەی خاوەن شکۆ لە بەغدا،

بابەت: پارتی رزگاریی کورد

١- وەڵام بـۆ نامـەی ژمـارە ٢١١/١٠/٤٦ی ڕۆژی دوازدەی تـەمموزی سـاڵی ١٩٤٦تان وا لە خـوارەوە پوختەیـەکی ئـەو زانیارییانـەتان بـۆ دەنێـرین کـە ئێمـە دەربارەی ئەو پارتییە هەمانن. ل

٢- قوتابیـانی کـۆلێجی یاسـاو دارالمعلمـین العالیـة ((پـارتی رزگـاری))یـان دامەزراند، رزگاری داوای یەکگرتنی سەرجەمی نیشتمانپەروەرانی کورد دەکات، بە ناو قوتابیـانی کـەرکوك‌و هـەولێرو سـلێمانی‌و کویـسنجەق‌و ڕەوانـدزو عەمادییـەو زاخۆدا بڵاوبۆتەوە، هەمان کـات پێوەندیـشی لەگـەڵ ئـەو بارزانییانـەدا هەیـە کـە ئێستە لە ئێران پەنابـەرن. ئـەو ڕۆژنامانـەی پـارتی کۆمەڵـە لـە مـەهاباد (ئێـران) پەخشیان دەکـات لـە ڕێگـەی عـەلی عەبـدوڵڵای خـاوەنی کتێبخانـەی ڕەواندزەوە دەینێرن بۆ ((پارتی رزگاری)) تا ئەو لە عێراق بەنهێنی دابەشیان بکات.

٣- لە هەولێر بەهۆی ئەو چالاکییانەوە کە ژمارەیەك لە قوتابی‌و فەرمانبەرانی شار لە هەڵسوڕاندنی ئاهـەنگی نـەورۆزی (ئیمـساڵدا- ك.م.) نوانـدیان هەسـت بـە بوونی ((پارتی رزگاری)) کراو بەوەیش زانرا کە کتێبخانەی شێخ محەمەد شـوێنی کۆبوونەوەی ئەندامانی رزگارییە، وێڕای ئەوە نەخشەیەکی ئەو پارتییە دۆزرایەوە کە دابەش کردنـی کوردسـتان بەسـەر عـێراق‌و تورکیـاو ئێـران‌و سـووریادا نیـشان دەدات.

٤- زۆر نییە وێنەی مەلا مستەفای بارزان بە بەرگی جەنەڕاڵیی رووسییەوە لـە سلێمانی دابەش کراوە[1]، دەشڵێن حوکمەتی ناوەندیی عێراق توانیویە لە هـەولێر گوڕزی باش لە ((پارتی رزگاری)) بووەشێنێت.

---

(1) بەر لە رووخانی ڕژێمی پاشایی دابەش کردن‌و باربوو کردنی هێزە نیشتمانییەکان لە ڕێگەی فرۆشتنی وێنەی بارزانی بە بەرگی جەنەڕاڵیەوە دیاردەیەکی بەربڵاو بوو، خوالێخۆشبوو فارسی برینپێچ



مەلا مستەفای بارزان بەجلی جەنەڕاڵییەوە

٥- وا پێدەچێت لە بەغدا ناكۆكی هەبێت لەنێوان باڵی چەپڕەوی قوتابیانی (سەر بەم ڕێكخراوە- ك.م.) سەبارەت ئەوەی ئایا پێویستە ((ڕزگاری)) بداتە پاڵ ((پارتی تەحەڕوڕی نیشتمانی))[2] یا وەك دەستەیەكی كۆمۆنیستیی سەربەخۆ بمێنێتەوە. بەپێی دیاردە هەستپێكراوەكان لایەنگرانی سەربەخۆیی ڕزگاری زۆرترن، هەرچەندە ژمارەیەك كورد تاوەكو ئێستەیش وەك دەزگایەكی جیاواز لەگەڵ تەحەڕوڕ كار دەكەن. هەروەها ئەو ڕاپۆرتانەی باسی پڕۆژەی

---

كە هەر بە دكتۆر فارس ناسرابوو هەمیشە دەستەیەك لەو وێنەیەی بارزانیی لە بەریاخەڵدا بوو كە بە ئێمەو مانانی دەفرۆشت.

(2) تەحەڕوڕ: پارتییەكی چەپڕەوی سەر بە حیزبی شیوعیی عیراقی بوو، لە كۆتایی چلەكاندا لە كوردستان لایەنگری زۆر بوو، بەداخەوە دووبەرەكییەكی توندوتیژ كەوتبووە نێوان ((پارتی دیموكراتی كوردستان)) و ((پارتی تەحەڕوڕی نیشتمانی))، تەنانەت زۆر جاران بەجیا خۆنیشاندانیان دەكرد.



عەلی عەبدوللا ناسراو بە (عەلی مەکتەبە)



شێخ محەمەد ناسراو بە (شێخە شەل)[*]

پێشنیارکراوی یەکگرتنی ((پارتی نیشتمانیی دیموکراسی)) (الحزب الوطني الديمقراطي) و ((پارتی یەکیەتیی نیشتمانی)) (حزب الاتحاد الوطني) و ((پارتی گەل)) (حزب الشعب) دەکەن دەڵێن ((رزگاریی کورد))یش حەز دەکات بداتە پاڵ ئەو رێکخراوانەی سەرەوە بەپێی پەیڕەو کردنی مەرجەکانیان کە بریتین لە وەستاندنی سەرجەمی چالاکییە نهێنییەکان و بانگدانی وەرگرتنی ئاشکرای ئەندامەتی.

٦- بەلای ساڵح حەیدەرییەوە کە قوتابیی ((کۆلێجی یاسای بەغدا))یە کارکردن لە رزگارییەکی چەپڕەوی سەربەخۆی وەك ئەوەی ڕۆژانی پشووی (سەری ساڵی- ك. م.) رابردوو دامەزرێنرا گەلێك باشترە لەو رزگارییەی باسی دەکەن. شایانی باسە ساڵح حەیدەری خزمی داود پاشای حەیدەرییە.[**]

ئیمزا

د. دەبلیو. ئۆوین))[3]

---

[*] ((لەسەردەمی منداڵی ئێمەدا، لە دوای ١٤ تەمموزی ١٩٥٨، دروشمێك لە ناو منداڵان دەگوترایەوە بژی گەل، رۆڵەی گەل، مام رەحمان و شێخە شەل- ع. زەنگەنە)).

[**] ((ساڵح حەیدەری: ئامۆزای داود حەیدەرییە. تێبینی د. جەمشید حەیدەری لەسەر چاپی یەکەم - ع.زەنگەنە)

(3)N.A., F.O., 371/52369, Kurdish Problems, Iraqi Kurdistan Relations, Secret, From: D.W. Owen, Defense Security Office, To: His Majesty Embassy, Baghdad, P.8.



بە کامێرای د. جمشید حەیدەری

ڕۆژی بیستو شەشی تەموزی ساڵی ١٩٤٦سکرتێری باڵوێزخانەی بەریتانیی لە بەغدا ئەو زانیارییانەی سەرەوە دەربارەی ((پارتی ڕزگاریی کورد)) بە نامەیەکی تایبەتیی دەنێرێت بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن، ئەمەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو نامەیەیە:

((باڵوێزخانەی بەریتانی، بەغدا،

ژمارە ٢٢١/١٢/٤٦، ٢٦ی تەموزی ١٩٤٦،

بەشی ڕۆژهەڵاتی خۆشەویست!

تکایە سەیری نامەی ژمارە ٢٢١/٥/٤٦ی بیستو نۆی کانوونی دووەمی ڕابردوومان بکەن.

وا پێدەچێت هیچ گومانێك لەوەدا نەبێت کە (پارتی ڕزگاریی کورد) ڕێکخراوێکی بە ڕووکەش، یا بەڵکو تەنانەت لەوانەیشە دەستکردی کۆمۆنیست بێت، وا وەك هاوپێچ وێنەی ڕاپۆرتەکەی ئەفسەری پاراستنی ئاسایشتان بۆ دەنێرم کە ئەو زانیارییە نوێیانەی تێدایە کە دەستمان کەوتوون.

ئیمزا

دڵسۆزی هەمیشەییتان

سکرتێر))[4].

(4) Ibid, British Embassy, Baghdad, No. 221/12/46, 26th July, 1946, To: Eastern department, Foreign Office, London.

## کوردی سووریا و ئەرکەکانی قۆناغی نوێ
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

تا ئێستا، لە زۆر لاپەڕەی ئەم کتێبەدا، ناوی کوردی سووریاو خەباتو کۆششی دیاریان لە گەلێك بوواردا هاتۆتە پێشەوە. بێگومان دەبێت هۆی سیاسیو کۆمەڵایەتیی کاریگەر پاڵی بەو ژمارە کەمەی کوردی سووریاوە نابێت ئەو ڕۆڵە دیارە ببینین. ساڵی ١٩٧٢ بەناوی ((کۆڕی زانیاری کورد))ەوە چوومە دیمەشق. لەوێ بە تایبەتی سەردانی خوالێخۆشبووان: ڕەوشەن بەدرخانی هاوسەری جەلادەت بەدرخانو قەدریو ئەکرەمی نەوەی ـ ەمیل پاشاو مەمدووح سەلیم[5] کرد، بەر لەوەیش قەدری جانی شاعیرو عیسمەت شەریف وانلیم لە بەغدا دیبوو. بەڕاستی گشتیان نموونەی کوردی دڵسۆزو ڕەسەن بوونو هەریەکەشیان بە جۆرو شێوازێك کاریان کردبووە سەر هەستی نەتەوەیی ئێمەو مانان.

بەڵام ڕاستێکەی نەمدەزانی نیشتمانپەروەریو دڵسۆزیی کوردی سووریا تا ئەو رادە زۆرە سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی ڕاکێشاوە تا ئەوکاتەی لە نزیکەوە ئاگاداری ناوەرۆکی فایلەکانی ئەرشیڤی نیشتمانیی بەریتانی بووم. پوختەی لێکدانەوەیەکی سەرپێی هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە بەلای ئێمەوە بریتین لە:

١- سووریا وڵاتێکە هەموو بەشی ڕۆژئاوای کەوتۆتە سەر دەریای سپیی ناوەڕاست، بۆیەکا بازرگانی لەدێر زەمانەوە بۆتە پیشەی بەشێکی زۆری دانیشتووانی[6]، هەر لەو ڕێگەیەشەوە پڕیشکی شارستانیەتیی جیهانی

---

(5) شایانی باسە دوکتۆر مەمدووح سەلیم خەڵکی سووریایە، ((ڕاستتر، ئەگەر ئەوەیان کەسێکی دیکە نەبێ، خەڵکی (وان) بووە، ناوبراو دوکتۆر نەبووە، بەڵکو ڕۆژنامەنووسێکی لێهاتوو بوو، لە ساڵی ١٩٢٥دا، دوای شکستی شێخ سەعید، ئاکنجی سووریا بوو و لەلاپەڕەکانی داهاتوودا پەراوێزێکی دیکەی لەسەر دەنووسین-ع.زەنگەنە))، خوالێخۆشبوو مەسعود محەمەد هەر لەو دەورووبەرەدا مەمدووح سەلیمی دیبوو، وەك کوردێکی دڵسۆزو دووربین بێئەندازە سەرنجی ڕاکێشا بوو، وتارێکی نازدارو قووڵی دەربارەی بڵاو کردەوە. مەمدووح سەلیم لە خانوویەکی پەڕپوتدا دەژیا کە بە هەمەجۆر سەرچاوەی نایاب دەربارەی کوردو کوردستان ئاخنرا بوو، تەنانت لەسەر ئەرزی ژووری میوانەکەشی ژمارەیەك لەو سەرچاوانە کەڵەکە کرابوون.

(6) کەس نەبوو شان لەشانی فینیقییەکانی سووریا بدات لە بوواری بازرگانیی جیهانیی دێریندا.



دوا وێنەی مەمدووح سەلیم

(دیاریی: د. جەمشید حەیدەری)

سەرمایەداری، بەر لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست شەوەزەنگی سەدە ناوەنجییەکانی سووریای ڕەواندەوە.

٢- سووریا بە درێژایی مێژووی نوێو هاوچەرخ، لەبەر گەلێك هۆ، بۆتە پەناگەی نیشتمانپەروەرانی کوردی تورکیا، ئەوانەی خۆیانو نەوەیان چاکی خەباتیان لێ کرد بە لاداو ڕۆڵێکی دیاریان لە بوواری دروستبوونی بنکەیەکی پتەوی کوردایەتیدا لە سووریا بینی.

٣- لاوازیی پێوەندیی دەرەبەگیو هۆزایەتی لەناو خودی کوردی سووریاداو ئەوەی ژمارەیەکی زۆریان نیشتەجێی دیمەشقی پایتەخت بوون کە ناوی یەکێك لە گەڕەکە بەناوبانگەکانی (حي الاكراد) بوو، دەمێکە دیمەشقیش بۆتە ناوەندێکی سیاسیو فیکریی دیار.

٤- بوونی گۆڕی سەلاحەددینی ئەیوبی لە دیمەشق لە قوڵایی دەروونی کوردی ئەو وڵاتەدا جۆرە شانازیەکی دروست کردووە کە ئەوان هیچیان لە کەس کەمتر نییە.



دانیشتوو: حەسەن ئاغا حاجۆ، جەلادەت عالی بەدرخان، حەجی عەبدولکەریم (نوێنەری پەرلەمان)

راوەستاوان: حاجۆ حاجۆ، جەمیل حاجۆ، جگەر خوێن، مەجید حاجۆ

(دیاریی: سینەم خانی جەلادەت بەدرخان)

٥- توندڕەویی بزووتنەوەی نەتەوەپەرستانی عەرەب، تەنانەت میشێل عەفلەق ((پارتی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیزم))ی لە سووریا دامەزراند، ئەو جۆرە بزووتنەوە توندڕەوانە لە هەموو شوێنێك پاڵ بە کەمینەکانەوە دەنێن بە پەرژینێکی پۆلایین چواردەورەی داب و نەریتی نەتەوەیی خۆیان بدەن. جووەکان باشترین نموونەن بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە.

وا لە خوارەوە لە زمان زنجیرەیەك بەڵگەنامەی نهێنیی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانییەوە باسی لایەنە جیاوازو کەم، یا هەر نەزانراوەکانی ئەو ڕۆڵە دەکەین کە کوردی سووریا لە سەرەتای قۆناغی دوای جەنگی دووەمی جیهانیدا بینیویانە.

ت- کوردی سووریا و کۆماری مەهاباد (کوردستان):(*)

دامەزراندنی کۆماری مەهابادو کەوتنی ئەو کۆمارە بە ڕادەیەك لەناو کوردی سووریەدا دەنگی داوەتەوە تەنانەت سەرنجی خودی سەرەك کۆماری بەناوبانگی سووریای ئەوسا شوکری قوەتلییو کاربەدەستە گەورەکانی ئەو وڵاتەی ڕاکێشاوە، ئەمەیش هانی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی داوە هێندەی تر بە گەرمی بکەونە سۆراخی لایەنە دیارو شاراوەکانی ئەو بابەتە، بۆیەکا وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیا بەم ناونیشانەی لای خوارەوە فایلێکی سەربەخۆی بۆی تەرخان کردووە:

(ئەرشیفی نیشتمانی، وەزارەتی هەندەران، ٦٢١٤٥/٣٧١، ڕۆژهەڵات ١٩٤٧، سووریا، فایلی ژمارە ١٣٠١)[7].

((هەڵوێستی کورد لە سووریا)) ناونیشانی بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلەیە. لە چەند لاپەڕەیەکی ئەم بەڵگەنامەیەدا سەرنجو لێکدانەوەی ژمارەیەك کارمەندی دیپلۆماسیی بەریتانیی دەربارەی ئەم بابەتە دەگمەنە تۆمار کراوەو ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕاویی تێبینییەکانی یەکێك لەو کارمەندانەیە کە ناوی گ. هـ. بێکەر (G.H. Baker)ەو ڕۆژی سیازدەی شوباتی ساڵی ١٩٤٧ی بەسەرەوەیەو بە چاپکراوی لەناو فایلەکەدا هەڵگیراوە:

((ئێمە زۆر باش ئاگاداری جۆری بیرکردنەوەی کورد نین چ لە سووریاو عێراق، یا لە ئێران، یا (ئەوەندەی من ئاگادارم)[8] لە تورکیاش، وا دیارە پرسیاری سەرەکیش بریتییە لەوەی ئایا کورد ئێستەکە ئاتاجی هیچ ڕاوێژێك یا ڕێگە نیشاندانێکن لەلایەن بەریتانییەکانەوە. پێموایە هیچ هۆیەك لە ئارادا نییە وام لێ بکات بڵێم بەڵێ ئەوان ئاتاجن، هەموو[9] ئەوەی ئێمە دەتوانین لەسەری بڕۆین

(*) ((دەستەواژەی (کۆماری مەهاباد)، لەهەر کوێیەکی ئەم کتێبەدا دانرابێ، لەناو دووکەوانەدا ناوی (کوردستان)مان لەپاڵ داناوە، دیارە بۆ ئەم کارەشمان پاساوی خۆمان هەبووە، لەپەراوێزێکی دیکەی لاپەڕەکانی دواتردا بنۆڕە: ل(٤١٠-٤١٥) ئەم کتێبە، بەوردی باسیمان کردووە ـ ع. زەنگەنە)).

(7) N.A., F.O., 371/62145, Eastern- 1947, Syria, File No. 1301.

(8) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: ((as far as I am aware)).

(9) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەم ڕستەیە لە وشەی (هەمووەوە) تا وشەی (ڕووسیا) خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە.

تێبینییەکەی سکرتێری شوکری قوەتلییە کە دەڵێت حوکمەتی سووریا بە پەرۆشەوە دەڕوانێتە مەیلی کورد بەلای رووسیادا. بە پێویستی دەزانم ڕاو بۆچوونی باڵوێزخانەی خاوەن شکۆ لە دیمەشق سەبارەت ئەم خاڵە بزانین. ئەگەر کوردی سووریا پێویستییان بە ڕایەك، یا ڕاوێژێکی مەعقول هەبێت ئەوا کۆلۆنێل ئێلفینستۆن[10] کەسێکی تەواو لەبارە بۆ ئەو کارەو چوونیشی بۆ سووریا لەوانەیە ئەنجامی باشی لێ بکەوێتەوە، پێشم وانییە ئێلفینستۆن هیچ جۆرە گومانێك لای سوورییەکان بوورووژێنێت تایبەت لەو گۆشەنیگایەوە کە سکرتێری قوەتلیی بە خۆمی گوتووە، تێش ناگەم بۆچ تورکەکان دەبێت لە چوونی کۆلۆنێل بکەونە گومانەوە. بە هەرحاڵ ئەگەر کۆلۆنێل ئێلفینستۆن بیری گۆڕیو بڕیاری دا بچێت بەش بەحاڵی خۆم لەو باوەڕەدا نیم زیارەتەکەی بۆ هیچ لایەنێك زیانی لێ بکەوێتەوە.

ئێمە لەم ڕۆژانەدا گەلێك شت دەربارەی ئەوەی کورد پتر لە جاران چاویان بڕیوەتە رووسیا دەبیستین، بەڵام من بۆ خۆم شتێکی وا لە ئارادا نابینم پاڵم پێوە بنێت پشتگیری بۆچوونێکی لەو جۆرە بم.

بروسکەی روونکردنەوە بۆ دیمەشق.

ئیمزا

١٣ی شوباتی ١٩٤٧))[11].

---

(10) کۆلۆنێل ئێلفینستۆن (Colonel W.E. Elphinston) یەکێکە لەو ئەفسەرە بەریتانییانەی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە لە نزیکەوە ئاگاداری پرسی کورد بەگشتیو کوردی سووریا بەتایبەتی بووە، ساڵی ١٩١٩ کراوەتە یاریدەری ئەفسەری سیاسیی بەریتانی لەناوچە کوردەوارییەکانی باکووری سووریا، بە ئینگلیزی وتاری لەسەر کورد بڵاو کردوەتەوە، پێموایە یەکێك لە وتارەکانی کراوەتە کوردیو لە گۆڤاری ((گەلاوێژ))دا بڵاوکراوەتەوە.

(11) N.A., F.O., 371/62145, Eastern- 1947, Syria, File No. 1301. Kurdish Situation in Syria, Minutes, G.H. Baker, February, 1947.

ڕۆژی بیستی شوباتی ساڵی ١٩٤٧ وەزارەتی هەندەران بیروبۆچوونی هاو[12] دەربارەی ئەم بابەتە دەنێرێت بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە دیمەشق، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ئەو بەڵگەنامەیەیە:

((إی ١٥٠١/١٣٠١/٨٩،

نهێنی، شفرەی و. ت. پ،

لە: وەزارەتی هەندەرانەوە،

بۆ: دیمەشق،

ژمارە ٨٨، ٢٠ی شوباتی ١٩٤٧،

وێنەی بۆ:

بێروت، ژمارە ٦،

دایەرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە قاهیرە، ژمارە ٥٥،

ئەنقەرە، ژمارە ٧.

ئەمەی لای خوارەوە لە هاوەوەیە

١- کۆلۆنێل ئێلفینستۆن پێوەندیی لەگەڵ ژمارەیەك کورددا هەبوو لەو ڕۆژانەوەی ساڵی ١٩١٩ کرایە یاریدەری ئەفسەری سیاسیی (بەریتانی- ك. م.) لە ناوچە کوردییەکانی باکووری سووریادا، لەم چەندانەی دواییشدا لەلایەن موحسین بەرازییەوە[13] کە سکرتێری سەرکۆماری (سووریایە- ك. م.) بانگهێشت کراوە بۆ زیارەتی دیمەشق بۆ ئەوەی (ڕاوێژی مەعقول) بداتە کوردی سووریا.

---

(12) وا دیارە سێر ڕۆبەرت جۆرج هاو (Sir Robert George Howe) فەرمانبەرێکی گەورەی ئەوسای وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی بووە، ڕۆژی نۆزدەی ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٣ لەدایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریج بوو، لە ساڵی ١٩٢٥وە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەران، لە چین و کۆمارەکانی بەڵتیك و حەبەشەو سوودان کاری کردووە، لە ساڵی ١٩٤٥وە بۆتە یاریدەری وەزیری هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، ڕۆژی بیست و دووی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨١ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە:

((Who was Who))، Vol. V،|‌|| London، 1991، P.370.

(13) موحسین بەرازی یەکێکە لە کوردە ناودارەکانی سووریا.

حوکمەتی سووریا ترسی ئەوەی لێ نیشتووە کە کوردی ئەم وڵاتە مەیلی داوەتە رووسیا. لەو کاتەوەی موحسین گەڕاوەتەوە سووریا کۆڵۆنێل ئێلفینستۆن دەعوەتنامەیەکی نووسراوی لە مستەفا شاهینەوە بۆ هاتووە، کە یەکێکە لە ڕەهبەرە بەناوبانگەکانی کوردە بەرازییەکان، بۆ ئەوەی زیارەتی سووریا بکات.

٢- کۆلۆنێل ئێلفینستۆن لە ئێمەی پرسی ئاخۆ هیچ هۆیەك هەیە وامان لێ بکات حەز بکەین ئەو دەعوەتنامەیە قەبوڵ بکات، تا ئەگەر وا نەبێت لەوانەیە ئەویش دەعوەتەکە قەبوڵ نەکات. بەختەوەر دەبم ئەگەر زوو بەزوو بە بروسکە وەڵامم بدەنەوە تا بزانم ئایا ئێوە هیچ هۆیەك پاڵتان پێوە دەنێت لەو بڕوایەدا بن کوردی سووریا، بە تایبەتی ئێستە، ئاتاجی (نەسیحەتێکی مەعقول[14] بن))[15].

لێکۆڵینەوەی دیپلۆماسییە بەریتانییەکان لە لەندەنو دیمەشق دەربارەی ئەم بابەتە بەردەوام بوو، ڕۆژی ١٠ی مارت لە دیمەشقەوە ئەم بروسکەیە دەنێرن بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن:

((شفرە/ و.ت.پ،

لە: دیمەشقەوە،

بۆ: وەزارەتی هەندەران،

میستەر ئایرێس،

ژمارە ٦٧،

١٠ی مارتی ١٩٤٧.

بروسکەی ژمارە هەشتاو هەشتتان، ئەمەی لای خوارەوە بۆ سێر ر.گ. هاوە.

١- موحسین بەرازی هیچ هۆیەك لە ئارادا نابینێت بۆ ئەوەی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن زیارەتی کوردستان نەکات، تایبەت کە لە سەرەتاوە پێشنیاری زیارەتەکە لە خودی کۆلۆنێلەوە بووە نەك لە بەرازییەوە.

---

(14) خودی بەڵگەنامەکە ئیمزای بەسەرەوە نییە.

(15) N.A., F.O., 371/62145, Eastern- 1947, Syria, File No. 1301, E1501/1301/89, Secret, Cypher/ OTP, from: Foreign Office, To: Damascus, No.88, 20th February, 1947, Reported to Beirut, No.6, British Middle East Office, No.55, Angora, No.7.

٣- هەرچەندە باشتر وایە ڕاپۆرتێکی ڕاستەوخۆمان دەربارەی ناوچە کوردییەکان بۆ بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەڕاستی ناتوانم بڵێم کوردی سووریا بە جۆرێکی تایبەتی ئێستە پێویستییان بە (نەسیحەتێکی مەعقولە). ڕاستە رادیۆی رووسی پشتی پشتی بۆ کورد دەکات، بەڵام ڕووداوەکانی ئازەربایجان نەبوونەتە هۆی ئەوەی بڕوای کورد بە رووس پەرە بسێنێت، بۆیەکا بە پێویستی نازانم ئێمە کۆلۆنێل ئێلفینستۆن هان بدەین دەعوەتنامە کوردییەکە قەبوڵ بکات.

وێنەی بنێردرێت بۆ سێر ر. هاو))[16].

ئەم بێنەو بەرەیە ماوەیەکی تر دەخایێنێت تا ڕۆژی نۆزدەی مارت هاو نامەیەکی تایبەتیی، بەناوی وەزارەتی هەندەرانەوە، دەنێرێت بۆ کۆلۆنێل ئێلفینستۆن کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

((وەزارەتی هەندەران،

١٩ی مارتی ١٩٤٧،

لە: سێر ر. هاوەوە،

بۆ: کۆلۆنێل ئێلفینستۆن،

ناوچەی ٣٤ هەرلینگهام، س. دەبل یو. ٦.

سوپاستان دەکەم بۆ نامەی ڕۆژی حەوتی مارت کە دەربارەی زیارەتتان بوو بۆ لای هۆزە کوردەکانی سەر سنووری نێوان سووریاو تورکیا کە بۆ خۆت لە نزیکەوە شارەزایانی. داوای لێبوردنت لێ دەکەم کە زووتر وەڵامم نەداونەتەوە. بەپێی بۆچوونی من بەر لەوەی هیچ بڕیارێك بدەیت باشتر وایە بیروبۆچوونی باڵوێزخانەی بەریتانی لە دیمەشق بزانیت.

هیچ هۆیەك لە ئارادا نابینین فشارتان بخەینە سەر بۆ کردنی ئەو گەشتە، بەڵام ئەگەر بڕیاری چوونیشتان دا هیچ ئیعتیرازێکمان نییە ، هەڵبەت لەو حاڵەتەیشدا،

(16) Ibid, Cypher/ OTP, from Damascus, To: Foreign Office, Mr. Eyres, No.67, 10th March 1947.

بێگومان، حەز دەکەم ڕاستەوخۆ لە یەکێکی وەک تۆوە هەواڵی ناوچە کوردییەکان ببیستم.

لەگەڵ ئەم نامەیەدا نامەکەی مستەفا شاهینت بۆ دەنێرمەوە))[17].

هەواڵەکانی کوردی سووریا ئەنقەرە دەوروژێنن، ئەوەی لەندەن ناتوانێت بیخاتە پشت گوێ، دوو بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل تیشکمان بۆ دەخەنە سەر لایەنەکانی ئەم بابەتە. بەڵگەنامەی یەکەمیان بریتییە لەم نامەیەی لای خوارەوەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن:

((شفرەی و.ت.پ،

لە: ئەنقەرەوە،

بۆ: وەزارەتی هەندەران،

سێر د. کێللی،

ژمارە ٢٥٧

٥ی نیسانی ١٩٤٧،

وێنەی بۆ دیمەشق و بێروت و دایەرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە قاهیرە، نهێنی.

١- نیشانە بە بروسکەی ژمارە ٨٨ إی بۆ دیمەشق دەربارەی زیارەتی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن.

ئەگەر ئێلفینستۆن بچێتە سووریا بێگومان تورکەکان لەرێگەی کۆنسوڵخانەی تورکییەوە لە حەڵەب پێی دەزانن. ئەگەر ئەو زیارەتە سەری گرت ئەوکاتە حەز دەکەم دەسەڵاتدارانی تورک بە شێوازێکی نهێنی دەربارەی چوونەکەی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن، بەو جۆرەی لە پەرەگرافی یەکەمی بروسکەی ئامارەبۆکراوتاندا هاتووە، ئاگادار بکەم. ئەگەر وا نەکەم ئەوساکە بەئاسانی ئەو گەشتەی ئێلفینستۆن لەلایەن تورکەکانەوە خراپ لێك دەدرێتەوە.

---

(17)Ibid, : Foreign Office, S.W.1, 19 March, 1947, Registry No.E 2195/1301/89, From: Sir R.Howe, To: Colonel Elphinston, 34 Hurlingham Court, S.W.6.

- لەبەر ئەوانە زۆر بەختەوەر دەبم ئەگەر ئاگادارم بکەن لەوەی ئایا کۆلۆنێل ئێلفینستۆن دەچێت بۆ سووریا یا ناچێت، ئەگەر دەچێت کەی نیازییە ئەو سەفەرەی بکات؟

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم وێنەی ئەم نامەیەم بنێرن بۆ دیمەشق، هەروەها بروسکەی ژمارە هەژدەشم))[18].

پاش ماوەیەك وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی ئەم وەڵامەی لای خوارەوە دەنێرێت بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە ئەنقەرە:

((وەزارەتی هەندەران،

س. دەبل یو. ١،

٢١ی نیسانی ١٩٤٧،

ژمارە إی ٨٩/١٣٠١/٢٨٩٧.

سکرتێری خۆشەویست.

نیشانە بە بروسکەی ژمارە ٢٥٧ی ڕۆژی پێنجی مارتتان دەربارەی ئەگەری زیارەتی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن بۆ لای هۆزە کوردەکان.

کۆلۆنێل ئێلفینستۆن نیازی نییە ئێستە ئەو زیارەتە بکات.

وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە دیمەشق و بێروت و دایەرەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەریتانی.

هەمیشە دڵسۆزتان

بەشی ڕۆژهەڵات))[19].

---

(18)Ibid, Cypher/ OTP, from: Angora, To: : Foreign Office, Sir Kelly, No. 257, 5th April, 1947, Reported to Damascus, Beirut, British Middle East Office Cairo, Secret.

(19) Ibid, : Foreign Office, S.W.1, 21st April, 1947, No. E2897/1301/89, to the Chancery, British Embassy, Angora.

ب- ڕاپۆرتی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن دەربارەی پرسی کورد:

لێرەدا ئیتر وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی داوا لە کۆلۆنێل ئێلفینستۆن دەکات بیرو بۆچوونەکانی خۆی دەربارەی کوردو کوردستان بە گشتیو لەمەڕ کوردی سووریا بەتایبەتی بکاتە ڕاپۆرتێکی سەربەخۆو بۆیانی بنێرێت. ئێلفینستۆن دەستوبرد ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی دە لاپەڕەیی ئامادە دەکاتو ڕۆژی هەشتی مارتی سالّی ١٩٤٧ دەینێرێت بۆ وەزارەتی هەندەران. ڕاستە ژمارەیەك هەڵەی ئاسایی وەك هەڵەی ناوو شوێنو سالّ کەوتوونەتە ناو ئەو ڕاپۆرتەوە، ڕاستیشە بەئاسانی هەست بە دژایەتی سۆڤێتو کۆمۆنیزم بەگشتیو کۆمۆنیزم لەناو کورددا بەتایبەتی لە هەندێك شوێنی ڕاپۆرتەکەدا دەکرێت، بەلاّم نە ئەوانەو نە غەیری ئەوانەیش هەرگیز لە بایەخی سیاسیو کۆمەلاّیەتیو مێژوویی ڕاپۆرتەکە کەم ناکەنەوەو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ناوەرۆکی ئەو ڕاپۆرتەیە کە بە چاپکراوی لە فایلی ژمارە ٦١٦٨٧/٣٧١ی وەزارەتی هەندەراندا هەلگیراوە، ((کێشەی کورد سالّی ١٩٤٧))یش ناونیشانی ئەو فایلەیە[20].

((کێشەی کورد

کورد وەك دێرینترین ئەرستۆکراتیی جیهان وەسف کراون[21]. دەڵێن لەوحە سۆمەرییەکانی دوو هەزار سالّ بەر لە زایین باسی کوردیان کردووە، هیرۆدۆتس[22] و زەینەفونیش[23] باسی کوردیان کردووە. کەواتە کورد گەلێکن وەك قارچك لەبن زەوییەوە هەڵنەتۆقیون. ئەگەر کورد توانیبێتیان بۆ ماوەی چوار هەزار سالّ وەك

---

(20) N.A., F.O., 371/61678, The Kurdish Problem, 1947.

(21) لە دەقی فایلەکەدا ئەم ڕستەیە بەکەم دێری ڕاپۆرتەکەیە:

((The Kurds have been described as the oldest aristocracy in the World))

(22) هیرۆدۆتس: گەورەترینو کۆنترین مێژوونووسی گریکو جیهانە، زۆر دەمێکە ((باوکی مێژوو)) بۆتە نازناوی.

(23) زەینەفون یا کسەنەفون: سەرکردەیەکی سەربازیی گریکی کۆنە، سالّی ٤٠١ی بەر لە زایین لەڕێگەی کوردستانەوە بەرەو ولاّتی خۆی گەڕاوەتەوەو لەو بەرهەمەیدا کە ناوی ((ئەناباسیس))ە باسی کوردی کردووە.

جنسێکی[24] یەکگرتووی ڕاستەقینە هەبووبن، ئەی ئایا بۆچ ناتوانن وەك گەلێکی جیاوازی خاوەن کێشەی خۆی بمێنن. من پێموایە هۆی سەرەکیی ئەوەیش ئەوەدایە کە کورد گەلێکن مل بۆ تواندنەوە کەچ ناکەن.

هۆزێك هەیە ژمارەی ئەندامەکانی چوار سەد کەس دەبن، لە سەدەی حەفدەوە لەناوچەی مەسایفی غەزەی عەلەوێکانی سووریادا دەژین، ئەو هۆزە لە هەر چوار لاوە بە عەرەب چواردەورە دراون، کەچی هەر بە کورد ماونەتەوە، تەنانەت جل‌و بەرگیشیان کوردییە.

یەکێك لە کوردە هەرە ناسراوەکانی مێژوو سەلاحەددینی ئەیوبییە کە ناوی بە ناوی خاچ هەڵگران (صلیبی)یەوە بەستراوەتەوە، ئەو باشترین نموونەیە بۆ کوردێکی هاوچەرخ کە چۆن دەتوانێت کاری باش لە چوارچێوەی ڕژێمێکی عەرەبیدا راپەرمووێنێت.

بە درێژایی سەدەی حەفدەمین کورد بوونە بەشێك لە خەباتی نێوان تورکە هاتووەکان‌و سەفەوییەکانی ئێراندا. بە دەستووری کوردی ئیمڕۆکە ئەوسا کوردەکان پێوەندییان لەگەڵ حوکمەتی ئێراندا زۆرباش نەبوو بۆیەکا، هیچ نەبێت زۆریەیان، دایانە پاڵ حوکمەتی عوسمانیی زەوتکەر دژی حوکمەتی ئاریی ئەو وڵاتەی تێیدا دەژیان، چونکە کورد بۆ خۆیشیان ئارین.

کەس ناتوانێت چاو لە ئاستی ئەو وێکچوونەدا بنوقێنێت کە ئیمڕۆ لەنێوان ئازەربایجان‌و ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا هەیەو خۆی لەوە گێل بکات کە ئەگەر هاتوو کورد جارێکی دی یاریدەی هێرشهێنەرێکی لە باکوورەوە دژی ئەو وڵاتانەی تێیاندا دەژیت دا ئەوە خۆی لە خۆیدا ڕەفتارێکی لە نموونە بەدەرە[25].

---

(24) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ((as a social entity)) چاپ کراوە، بەڵام یەکێك، کە زۆر لەوە دەچێت خودی ئێلفینستۆن خۆی بێت، وشەی (Social)ەکەی بە خەتی خۆی کوژاندۆتەوەو کردوویە بە (racial)، خەتەکەش دەقاو دەق لە خەتی ناوو ئیمزاکەی دوا لاپەڕەو هەموو وشە چاککراوەکانی ڕاپۆرتەکە دەکات.

(25) مەبەستی نووسەر ئاشکرایە کە دەیەوێت بڵێت هاریکاریی کورد لەگەڵ سۆڤیەتەکان کە لە باکوورەوە لە ساڵەکانی جەنگی دووەمدا هاتنە ناو خاکی ئێرانەوە ڕەفتارێکی بێ وێنە نییەو ئەوەتا ئازەرییەکانیش هەمان هەڵوێستیان هەبوو.

دوای مۆرکردنی پەیمانی ساڵی ١٦٣٩ لەنێوان سوڵتان موورادی تورکیاو شا عەبباسی دووەمی ئێران سنووری ئەو دوو وڵاتە دەستنیشان کراو بێگۆڕین وەك خۆی تاوەکو ساڵی ١٩١٨ مایەوەو بەو جۆرەیش کورد لە ڕێگەی سنوورەوە لێك جیاکرانەوە بە هەمان دەستووری جیاکردنەوەی هۆزە (کوردییەکانی– ك.م.) باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیاو سووریا کە بەپێی ڕێککەوتننامەی فرانکلین– بوویبیت[26] ئەیلوولی ساڵی ١٩٢١ لێك دابڕێندران.

سوڵتان موراد، گەلێك ئیمتیازی بەخشییە کوردەکانی تورکیا، بەرانبەر ئەو یاریدەیەی دژی ئێرانییەکان پێشکەشی سوڵتانیان کرد، بڕیاری دامەزراندنی یازدە ئیمارەتی کوردی دراو تاوەکو ساڵی ١٨٢٦ ژیانێکی بەختەوەریان لەناو خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا دەبردە سەر، لەو ساڵەدا سوڵتان محەمەدی دووەم بەنیازی لێدانی دەسەڵاتی بارۆنەکان، واتا سەرکردە دەرەبەگەکان، سیاسەتی نوێخوازیی گرتە بەر تاوەکو بتوانێت لەو ڕێگەیەوە دەزگای کارگێڕیی سیڤیلو مۆدێرن دابمەزرێنێت.

یاخیبوونی محەمەد عەلی لە میسرو هێرشی ئیبراهیم پاشای (کوڕی محەمەد عەلی– ك. م.) بۆ سەر سووریاو تورکیا دەرفەتی بۆ کورد ڕەخساند بە سەرکردایەتی بەدرخانی میری بۆتان کۆنفیدراسیۆنێکی سەربەخۆی کوردیی دابمەزرێنن کە لەساڵی ١٨٣٠وە تاوەکو ساڵی ١٨٤٥ ژیا. ساڵی ١٨٤٧ تورکەکان بەدرخانیان لاداو دەسەڵاتی خۆیانیان داسەپاندەوە. بەدرخان دوور خرایەوە دورگەی کریتو ساڵی ١٨٦٨ لە دیمەشق کۆچی دوایی کرد.

هەرچەندە ئەو ڕاپەڕینەی بەدرخان دامرکێنرایەوە بەڵام بناغەی بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد داڕشت کە لەوساوە لە تورکیا درێژەی کێشاو ئێستاکەیش لەلایەن (کۆمەڵەی خۆیبوون)ەوە لە سووریا ڕەهبەریی دەکرێت. یەکەم سەرۆکی (خۆیبوون) جەلادەت بەدرخان بوو کە ڕاستەوخۆ نەوەی ئەو پیاوەیە کە سەرکردەی شۆڕشی ساڵی ١٨٣٠ بوو.

---

(26) مەبەست ئەو ڕێککەوتننامەیەیە کە ئەیلوولی ساڵی ١٩٢١ لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسەدا مۆرکرو بەناوی نوێنەری بەریتانیا فرانکلین (Franklin)، نوێنەری فەرەنسا بوویین (Bouillon)ەوە ناسراوە.

کۆمەڵی کوردیی سووریا لە سێ دەستە پێکهاتووە، یەکەمیان هۆزە کوردەکانی باکووری جەزیرو کورداغی باکووری- ڕۆژئاوای حەلەبن کە ژمارەیان خۆی دەدات لە دوو سەد هەزار کەسێك، دووەمیان کوردی دیمەشقە کە ژمارەیان بیست هەزارێك دەبێت‌و سێیەمیشیان پەنابەرە سیاسییە کوردەکانی تورکیان کە لە ناوچەی جیاوازی سووریاو لوبنان نیشتەجێ بوون.

ئەمانەی دوایی (واتا کوردە پەنابەرەکانی تورکیا- ك.م.) هێزی بزوێنی کۆمیتەی نەتەوەیی کوردیی- (خۆیبوون) پێك دەهێنن‌و هەر (خۆیبوون) بۆ خۆیشی پێوەندیی لەگەڵ بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەندا لەڕێگەی ئەندامانی (تاشناق)ەوە کە سەر بە (خۆیبوون)ن، دامەزراند.

بەدرخانییەکان ئێستا ئەندامی (خۆیبوون) نین، کۆمەڵەکە لەلایەن لیژنەیەکی پێنج کەسییەوە بەڕێوە دەبرێت، دوانیان- قەدری‌و ئەکرەم کوڕەزای جەمیل پاشای دیاربەکرن، وێڕای دوو دوکتۆر (پزیشك)- یەکەمیان مەمدووح سەلیمە کە خەڵکی حەسەکەیەو دووەمیان نافیز بەگە کە خەڵکی قامیشلییە، جگە لە نیشتمانپەروەرێکی خوێن گەرم کەناوی عوسمان سەبرییە[*]، ڕەهبەرانی کوردی دیمەشق بایەخ دەدەنە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، تایبەت عەلی زلفۆ، بەڵام وای بۆ دەچم ئەوانە بۆ ناوو شۆرەتی خۆیان ڕێگەی کوردایەتییان هەڵبژاردووە، یا ئەوەی ئاخۆ خەڵکی چییان پێ‌بڵێن ئەگەر وا نەکەن.

---

(*) ((عوسمان سەبری (١٩٠٥-١٩٩٣): لە گوندی نارنجەی ناوچەی کوختەی ویلایەتی (ئادیامان) لە کوردستانی باکوور لە دایك بووە، دوای دامرکاندنەوەی شۆڕشەکانی باکوور ڕووی لە سووریا کردووە و لەوێ ئاکنجی بووە، لە گۆڤاری (هاوار) و دواتر لە گۆڤاری (ڕۆناهی) و ڕۆژنامەی (ڕۆژا نوو) بابەت و نووسینی بڵاوکردۆتەوە، لە ڕێکخراوی (خۆیبوون)یشدا کاری کردووە و دواتر لە ساڵی ١٩٣٨دا بەشداری لە دامەزراندنی (نادی کوردستان) لە دیمەشق کردووە. لەگەڵ حەمید دەروێش و چەند تێکۆشەرێکی دیکە بەشداری لە دامەزراندنی (پارتی)ی لە سووریا کردووە، لە دوای کەرت بوونی ئەو حیزبە لە ساڵی ١٩٦٥دا خۆی بۆتە سکرتێری باڵێکی، ڕێنووسێکی کوردیشی بە لاتینی داناوە و بە (ڕێنووسی عوسمان سەبری) ناسراوە، لە ژیانیدا خەڵك نازناوی (ئاپۆ)یان داوەتێ. چەند جارێك لە عیراق و سووریا و لوبنان گیراوە، جارێکیش سرگوونی مەدەغەشقەر کراوە، چەند دانراوێکی هەیە. لە ١٩٩٣/١٠/١١ دڵی لە لێدان کەوتووە لە گوندی (برکەفەر) لە پارێزگای حەسەکە نێژراوە - ع. زەنگەنە)).

سەرەك هۆزەكانی (كورد– ك.م.) دوای ئەوە ڕۆڵێكی گەورەیان بینی، ئەولن پیاوەكانیان و كۆمەكیان دەنارده توركیا بۆ یاریدەدانی یاخیبوونەكانی ١٩٢٥و ١٩٣٠، وێڕای ئەوەی ڕۆڵێكی باشیان گێڕا لە بوواری ئاڵوگۆڕكردنی نامەكانی (ڕەهبەرانی كورددا– ك.م.) لەنێو توركیاو ئێرانداو لەپشت بەرەكانی شەڕەوە.

هەمان كات (خۆیبوون) پێوەندیی بە بزووتنەوەی كوردی توركیاو عیراقو ئێرانەوە هەبوو، بەپێی تواناش دەستی یاریدەی بۆ ئەو كوردە نیشتمانپەروەرانە درێژ دەكرد كە ئاتاجی پارە بوون، ماوەیەكیش (خۆیبوون) مانگانەی بۆ ڕەهبەری یاخیبوونەكەی ساڵی ١٩٣٠ ئیحسان نوری[27] بڕیبۆوە، ئیحسان نوری زۆر بە هەژاری لە تاران دەژیا.

هەرچەندە بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد وەك ئەنجامێكی پرۆتێست دژی هێرشی توركیی بۆسەر بەرژەوەندییە دەرەبەگایەتییەكان دەستی پێكرد، بەڵام دەكەوینە گێژاوی هەڵەیەكی گەورەوە ئەگەر بێتو هۆی بزووتنەوەی كوردایەتی نوێ تەنها بۆ خەونی دەرەبەگەكان بە دەسەڵاتو سەنگی ڕابردوویانەوە بگێڕینەوە. ڕاستە ژمارەیەكی زۆر لە ڕەهبەرانی (بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد– ك.م.) دەرەبەگن، بەڵام لە هەمان كاتدا گەلێكیشیان دەرەبەگ نین، ئەو

---

(27) لە دەقی بەڵگەنامەكەدا نووسراوە (Isman Nuri)و ڕاستیش نەكراوەتەوە، دیارە مەبەست ئیحسان نوری پاشایە. شایانی باسە ناوەندی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوو لە تاران داوام لە خوالێخۆشبوو مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی كرد بمباتە خزمەت ئیحسان نوری پاشا كە دیاربوو ڕۆژبەیانی زوو زوو سەردانی دەكرد، چەند سەعاتێكم لە خزمەت خۆیو خانمی هاوسەریدا بردە سەر، خانم كە ئافرەتێكی شۆخو شەنگی تورك بوو، هەر زوو لەگەڵ ئیحسان نوریدا حەزیان لە یەك كردبوو، ڕۆژانی ڕاپەڕینەكەی ئاگری داغیش خانم بە بەرگی پیاوانەی كوردییەوە شان بەشانی شۆڕشگێڕان دەجەنگی. هەردووكیان زۆر قۆزو یەكجار قورس بوون، لە قەراغ شاری تاران لە شوققەیەكی پچووكدا دەژیان، بە داخەوە وەجاخیان كوێر بوو. پوختەی ئەو دیدەنییەم تۆمار كردو كە ساڵی ١٩٧٥ شۆڕش نوشوستی هێنا لەگەڵ گەلێك نووسراوی تردا لە ڕێگەی برای بەڕێز ((فەرهاد عەونی))یەوە ناردمە نەغەدەو ئەویش لەوێ بە ئەمانەتەوە لای برادەرێك بۆی دانابووم، خۆم درەنگ هاتمە ئەودیو، بە داخەوە هەموو ئەو نووسراوانەم فەوتان.

میلریدەیەی لەنێو ڕیزی سەرکردەکانی ئیمڕۆکەی عەرەبی فەلەستینیشدا وەدی دەکرێت. سەرکردە سروشتییەکانی کورد ئەو دەرەبەگانەن کە هەمیشە بە چاوی ڕەمبەر، یا سەرکردە سەیریان کراوە. هەمان بۆچوون عەرەبی فەلەستینیش دەگرێتەوە[28].

هۆکانی ئەو سێ یاخیبوونەی لەنێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمدا (لە کوردستانی تورکیا- ك.م.) بەرپا بوون- یاخیبوونی ساڵی ١٩٢٥ بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران و یاخیبوونی ساڵی ١٩٣٠ بە سەرکردایەتی ئیحسان نوری و یاخیبوونی دەرسیمی ساڵی ١٩٣٧- لەوە قووڵتر بوون کە بکرێنە ئەنجامی هاندانی سەرکردە دەرەبەگەکان.

ساڵی ١٩١٩ بۆ ماوەی هەشت مانگ لەنێو هۆزێکی کورددا ژیام و توانیم زۆر لە نزیکەوە ئەندامەکانی بناسم. دەزانم ئەو هۆزە لەنێو هەموو حوکمەتەکاندا گەر بیانتوانییایە حوکمەتی تورکیان هەڵدەبژاردو زۆریش دژی سەربەخۆیی کورد بوون.

کورد هەر ئەوەندە بەرهەمێکی کشتوکاڵیی ئەوتۆی هەبێت نانەکەی مسۆگەر بکات و کاوڕێکی هەبێت بۆ میوانەکەی سەری ببڕێت و بوتڵێ عەرەقی بۆ شەو هەبێت و گوللەی تەواوی بۆ تۆڵەو بەرگریی هەبێت ئیتر باکی ئەوەی نییە سەر بە کام حوکمەتە، هەمان کات تورکی دەزانێت و بەڵەدی ئەو ڕێگەیەیە کە ڕۆژی تەنگانە دەیگەیێنێتە هەوارگەی هۆزەکەی، ئیتر عەوداڵی هیچ گۆڕینێك نییە.

لەم دواییانەدا خوێندەواری ژیانی کوردی گۆڕیوە، کوڕە گەورەی سەرەك هۆزەکە[29]، یا وەك خۆیان پێی دەڵێن ئاغا، ئێستا زانکۆی ئەمەریکایی بێروتی تەواو کردووەو ئینگلیزییەکی زۆر باش دەزانێت. هۆزەکە بۆ خۆیشی ئێستا ئاگاداری بەسەرهاتەکانی جیهانی دەرەوەیە، پتر کەڵکی شارستانەتی نوێ و

---

(28) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە دەستخەت ئەم ڕستەیە نووسراوە: ((The Same Argument)) (P.4) ((applies the Arabs in Palestine)) کە دەقی وەرگێڕانەکەی دەبێتە ((هەمان بۆچوون عەرەبی فەلەستینیش دەگرێتەوە)).

(29) مەبەستی ئەو سەرەك هۆزە کوردەی سووریایە کە ساڵی ١٩١٩ بۆ ماوەی هەشت مانگ لە ناویاندا ژیاوە.

کردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانە تێدەگات و دەشزانێت ئەو کارانە لە وێزەی سەرکردە دەرەبەگەکانیاندا نییەو هەستی پێویستیی لاواز کردنی فەرمانڕەوایی دەرەبەگی لە نێوانیاندا لە پەرەسەندندایە. ئاخۆ هۆی ئەمە چی بێت ؟. پێموایە ئەوە ئەنجامی شانازی کردنیانە بە ئەسڵی خۆیانەوە. کورد گەلێك شانازی بەخۆیانەوە دەکەن کە کوردن، شانازی بە ئەسڵی دێرینی خۆیانەوە دەکەنو سوورن لەسەر ئەوەی نە لە بۆتەی تورکو نە عەرەبو نە فارسدا نەتوێنەوە.

ئەو سیاسەتی تواندنەوەی مستەفا کەمال پەیڕەویی کرد، بە تایبەت ئەو یاسا دژ بە کوردانەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٧ بڵاو کرایەوە، بوونە هۆی بەرپ بوونی یاخیبوونەکانی کورد لەنێوان هەردووك جەنگی جیهانیدا.

هەستی کوردایەتی، لە عیراقو ئێران، شێوازێکی تری هەیە. کورد حەز لەوە ناکەن ژێردەستەی حوکمەتێکی عەرەب یا فارس بن، بەڵام ئەوان ئامادە بوون حاڵەتێکی وا پەسەند بکەن بەو مەرجەی بە چاوێکی یەکسان ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت. کورد لەو بڕوایەدان کە لە ئێران عادیلانە مامەڵەیان لەگەڵ ناکەن، هەرچی دەربارەی عیراقە دان بەوەدا دەنێن کە بە گشتی خراپ مامەڵەیان لەگەڵ ناکەن. بەڵام باش لەوە گەیشتوون کە ئەوە ئەنجامی دەست تێوەردانی بەریتانییەکانەو لە بەرژەوەندیی ئەوانە، ئەگینا هیچ بڕوایەکیان بە حوکمەتی عەرەبیی بەغدا نییە.

ئاخۆ لەوەدا چ بەرژەوەندییەکی حوکمەتی بەریتانیو گەلی بەریتانی وەدی دەکرێت ؟. من وای بۆ دەچم کە ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو پێوەندیی ڕێکوپێك لەگەڵ گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا یەکێکن لە بەرژەوەندییە هەرە سەرەکییەکانمانو پێویستە بەوردی ئاگاداری ئەو هەڵوێستانە بین کە دەبنە هۆی ئاژاوە نانەوە، تایبەت هەوڵی هێزە دەرەکییەکان بۆ تێکدانی ئاشتیو ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تا بەو جۆرە ڕێگە بۆ دزە کردنی بیروبۆچوونی ڕوخێنەر خۆش بکەن[30].

---

(30) دیارە مەبەستی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن لێرەدا بیروباوەڕی لیبرالیو چەپڕەوە، تایبەت کۆمۆنیزم.




بڵاوکراوەیەکی خۆیبوون لە ساڵی ١٩٢٨دا وێنەی ڕەنگاورەنگی ئاڵای کوردستانی بەسەرەوەیە

وەك گوتمان سەدەی حەڤدەمین کورد دژی ئێرانییەکان یاریدەی تورکیان دا، تۆ بڵێی لە دوارۆژێکی نزیکدا ئەوان بە هەمان دەستوور ئامادە بن دژی فارس‌و تورك یاریدەی رووسەکان بدەن؟.

بەڵگەی تەواوی ئەوە بە دەستەوە نییە کە رووسەکان دەیانەوێت بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد ئاراستەی خزمەتی ئامانجەکانی خۆیان بکەن، بەڵام بەڵگەی تەواوی ئەوە بە دەستەوەیە کە کۆی پارچەکان بەڕاستی وێنەیەکی دڵگیر پێك دەهێنێت[31].

---

(31) مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە برایەتی‌و پێکەوە ژیانی نەتەوە جیاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تەبایی ئامانجێکی بەرزی ئەوتۆیە کە دەتوانرێت بهێنرێتە دی.



راوەستاوان: حەسەن ئاغا حاجۆ، مقداد جەمیل پاشا، محەمەد جەمیل پاشا، مەمدووح سەلیم، عومەر ئاغا شەمدین، جەلادەت عالی بەدرخان، کامەران عالی بەدرخان، عەلی ئاغا زولفۆ، جەمیل حاجۆ، د. ئەحمەد نافز، کوڕێکی دیکەی جەمیل پاشا، پاسەوانێك.

دانیشتووان: حاجۆ ئاغا هەڤێرکی، خەلیل رامی، قەدری جەمیل پاشا.

دانیشتووانی ڕیزی پێشەوە: ئەکرەم حاجۆ، منداڵەکەی دیکەی لای چەپ نەوەی جەمیل پاشایە

(دیاریی سینەمخانی جەلادەت بەدرخان)

دوای تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهان (١٩١٤–١٩١٨) ئاڵوگۆڕە سنوورییەکان بوونە هۆی ئەوەی بیست هەزار کوردێك ببنە هاوولاتیی کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەتی[32]. رووسەکان توانییان لەناو ئەم کۆمەڵگا بچووکەدا هەستی

---

(32) لە دێر زەمانەوە کورد لە ئەرمینیا دەژین، زۆربەی کوردی ئەرمینیا ئێزیدین کە لە دەست زوڵمو زۆری موسڵمانان بەگشتیو عوسمانییەکان بەتایبەتی پەنایان بردە بەر ئەو بەشەی ئەرمینیا کە لەناو خاکی رووسیای چارەکان (قەیسەرەکان)دا بوو بۆیەکا دەستی عوسمانییەکانیان نەدەگەیشتنو دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ ئەو بەشەی ئەرمینیا بووە یەکێك لە کۆمارەکانی ناو یەکیەتی سۆڤیەتو کوردیش بە بەشێکی زۆر لە مافەکانی خۆی گەیشت.

نەتەوەیی کورد لە هەموو ڕێگەیەکەوە گۆش بکەن‌و ناوەندێکیان بۆ هەستی نەتەوەیی کورد پێکەوە نا کە لە سەرانسەری جیهانی کوردەواریدا هەست بە ڕەنگدانەوەی دەکرێت.

کاتێك هاوپەیمانەکان لە ساڵی ١٩٤١دا هاتنە ناو خاکی ئێرانەوە کوردی باکووری ئێران بە گەرمی پێشوازیی رووسەکانیان کرد، بەڵام هەرچۆن بێت دوای ئەو حەماسەی سەرەتا ئەو کوردانە تووشی خەیبەت بوون لەو هەڵوێستە ڕاستەی رووسەکان بەرانبەریان وەریان گرت‌و پێچەوانەی هەڵوێستی حوکمەتی تاران بوو[33].

کوردەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئێران بە هەمان شێوازو هەست پێشوازیی هاوپەیمانانیان کردو کۆتایی بە ڕەوینەوەی خەونەکانیان هات، ئەوان بەڕاستی ئەومیان پێ قووت نەدەچوو چۆن دەشێت بەریتانی‌و رووسەکان دوای ئەوەی شەڕیان دژی جوکمەتی ئێرانی سەر بە نازییەکان کرد[34] و بەریتانییەکان دوای ئەوەی لە عیراق شەڕیان دژی حوکمەتی عەرەبیی سەر بە نازییەکان کرد[35] ئینجا پشتی حوکمەتانی ئێران‌و عیراق بگرن، بەڵام ساڵ‌و گۆڕێکی کەم لە دیدی ئەو کوردانەدا رووی داوە کە جاران هەمیشە دژی گشت جۆرە هاوڕێیەتی (نزیك کەوتنەوە)یەك بوون لەگەڵ بەریتانیاو رووسیادا.

دوای ئەوە (سەرنجی کورد– ك.م.) دەربارەی هەڵوێستی رووس لە ئێران کەمێك داشکا، بەرلەوە رووسەکان زۆر پشتگیریی کوردیان لە ناوچە داگیرکراوەکاندا مەبەست بوو بۆ سەر پێ شۆڕکردنی کاربەدەستانی ئێران‌و لەو

---

(33) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

((after the first burst of enthuasism the Kurds Became rather disappointed at the correct attitude the Russians adopted towards them vis-à-vis the Government in Tehran)) (P.6).

(34) مەبەستی حوکمەتی ڕەزا شای پەهلەوییە کە ساڵی ١٩٤١ لەژێر فشاری سۆڤیەت‌و ئینگلیزدا ناچار بوو خۆی بدات بە دەستەوەو نەفی کراو بە غەریبی کۆچی دوایی کردو پاش چەند ساڵێك تەرمەکەی هێنرایەوە تاران.

(35) مەبەست حوکمەتەکەی ڕەشید عالی گەیلانییە کە ساڵی ١٩٤١ ڕوخێنرا.

بووارەدا لە هەر شوێنێك (ئێرانییەکان– ك.م.) هەستی کوردیان برینـدار بکردبایـە ئەوان یەکسەر بۆ ئەو مەبەستەی خۆیان دەیانقۆستەوە.

کەمێك دوورتر، لە باشوور فەرمانبەرانی کونسولخانەی رووسیا لە کرمانـشا بـە ناوچە کوردەوارییەکاندا گەڕانو هەستی دڵسۆزییان بەرانبەر خەڵکەکەی دەربڕی. ساڵی ۱۹٤۳ سیاسەتی رووسیا بەرانبەر کورد چالاكو ئیجابی تر بوو، لەو ڕۆژانەدا (ژیانا کورد)[36](*) کە ڕێکخراوی نەتەوەیی کوردیو هەستی کۆمۆنیزمیی هەبوو لە کوردستانی رووسیا[37] کەوتە چالاکی.

دەرکەوت مەڵبەندی ئـەو ڕێکخـراوە دەوروبـەری مـەهابادە، واتـا شـاری قـازی محەمەدی بەناوبانگ کە لە نزیکەوە پێوەندیی بەو ڕێکخراوەوە هەبوو[38].

---

(36) لە لاپەڕەی حەوتی دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە (Jiana Kurd) کە دیارە مەبەستی کۆمەڵەی ((ژیانەوە یا ژیانی کورد)) ە کە هەر بە ((ژ.ك.)) ناودەبراو لەو ڕۆژانەدا بە ڕەهبەریی زەبیحی دامەزرا بوو خوالێخۆشبوو مامۆستا زەبیحیم لە نزیکەوە دەناسی، پیاوێکی چوستو چالاكو زمانزان بوو، کورد وتەنی چەشنی دڵنی مار زیرەك بوو، تەنانەت هەر لە زووەوە خەڵکی نارناوی عولەمایان بۆی هەڵبژاردبوو.

(*) ((سەرچاوەکان لەسەر پرسی (ژ.ك) جیاواز و جۆراوجۆرن، هەنـدێ سەرچـاوەی دیکـە بـاس لـەوە دەکەن هەردوو پیتی (ژ.ك) لەبری (ژیانـەوەی کوردسـتان) بوو‌بێـت، لـەم بارەیـشەوە پاساوی خۆیـان هەیە، بەنموونە: "جووتیاری حاجی تۆفیقی هەورامی" لەم بارەیەوە، کە لەبەدوا داچوونی ئـەم جـۆرە بابەتانە زۆر وردە، بابـەتێکی بڵاوکردۆتـەوە، هـەروەها "حامیـدی گەوهـەری" کتێبێکـی بەناوونیـشانی (ژیانەوەی کوردستان) هەیەو بەم دواییانە لەلایەن دەزگای ئاراسەوە بۆی چاپ کراوە. ئەوەی شـایەنی باسە "عەبدولڕەحمان زەبیحی"، کە د.کەمال لەم پەراوێزەدا بەرەهبەری ئەو کۆمەڵەیەی داناوە، خۆی وتارێکی لەڕۆژنامەی (خەبات)ی ئاشکرای شەستەکان نووسیوە، وا دیـارە ئـەو بەرێزانـەش سەرچـاوەی بۆچوونەکانیان هـەر وتارەکـەی ئـەم ژمارەیـەی ڕۆژنامـەی (خـەبات) بـووە. ئـەوەی بـەبیرم مابـێ ئـەو ژمارەیەی ڕۆژنامەکەش (۱۹۰) بووە، چونکە جارێکیان لەسەر ڕاسپاردەی کاك جووتیار خۆم بۆیم فۆتـۆ کردووەو ناردوومەتە سوێد ــ ع. زەنگەنە))

(37) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت (in Russian Kurdistan) (P.7)، هەڵبەت زاراوێکی لەو جۆرە نییە. دیارە مەبەستی ئەو ناوچانەی کوردستانە کە ئەوسا بەدەست هێزەکانی یەکیەتی سۆڤیەتەوە بوون.

(38) زەبیحی دەیزانی کۆمەڵەی ((ژ.ك)) پێویستی بە کەسایەتییەکی وەك قازی محەمەدە تاوەکو بتوانێت باشتر کار بکاتە سەر هەموو چینو توێژەکانی کۆمەڵگای ئەوساکەی کوردستان، بە کۆمەڵانی خەڵکیشەوە.

# آزادی

کۆمەڵە کە بووە هێزێکی بزوێنی دیاری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد دەستی کردە بڵاو کردنەوەی گۆڤاری[39](نیشتمان) کە تەواو بەلای بیروبڕوای سۆشیالیزمیدا دەیشکاندەوە.

دواتر ناوی کۆمەڵەکە گۆڕدرا بە (کۆمەڵا کورد)[40] بۆ جیاکردنەوەی لە (پارتی تودە) کە ئاشکرا سەر بە رووسیا بوو، بەڵام کوردی مەهاباد بە چاوی گومانەوە دەیڕوانییە تودە.

تا دەهات دەنگوباوی یاریدەی رووس بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ پەرەی دەسەندو رووسەکان چاپخانەیەکی کوردییان دایە قازی محەمەد.

ساڵی ١٩٤٤ دوو گۆڤاری کوردیی دەرچوون کە هەردووکیان ئاشکرا رێبازی کۆمۆنیستیان گرتە بەر، یەکەمیان ناوی (ئازادی) و دووەمیان ناوی (یەکیەتی تێکۆشین) بوو[41]. لە کاتێکدا (نیشتمان) کوردی هان دەدا بۆ یەکگرتن لەپێناوی

---

(39) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((it published paper called Nishtman)) (P.7)

(paper)یش لە زمانی ئینگلیزیدا گەلێك مانای هەیە، یەکێك لەو مانایانە بۆ بوواری ڕۆژنامەنووسیی بە واتای ڕۆژنامە نەك گۆڤار بەکار دێت.

(40) هەر بە (کۆمەڵە) نەك (کۆمەڵا) ناو دەبرا.

(41) ڕۆژنامەی ((ئازادی)) و گۆڤاری ((یەکیەتی تێکۆشین)) لەلایەن دەستە کۆمۆنیستەکانی کوردی عیراقەوە، نەك ئێران، دەردەکران.

## یکیتی تیکوشین

داواکردنی مافەکانیانداو داوای لە سەرکردە دەرەبەگەکان دەکرد خۆیان بگەیێننە ئاستی ژیانی هاوچەرخ[42]، (ئازادی) خۆی لە بابەتی نەتەوەیی لا دەداو لە بریتی ئەوە داوای لە کورد دەکرد یەك بگرن دژی کۆنەپەرستی و ئیمپریالیزمو کۆلۆنیالیزم، بە ئاشکرایش دژی بەریتانیا بوو. هەمان کات (ئازادی) پڕوپاگەندەشی بۆ یەکیەتی کوردو عەرەب دەکرد، بەڵام ئەم ڕێبازە بە دڵی زۆربەی خوێنەرانی کورد نەبوو.

ساڵی ١٩٤٥ قازی محەمەد لە مەهاباد، بە ڕەزامەندیی رووسەکان میلیشیایەکی کوردیی دامەزران، وەك دەشڵێن لە ڕێگەی ئەفسەرە کوردە هەڵهاتووەکان لە سوپای عیراق رووسیا دەستی لە ڕاپەڕینەکەی مەلا مستەفادا لە ناوچەی بارزاندا هەبووەو ئەو ئەفسەرانەیش چوون بۆ یاریدەدانی.

لە ڕۆژانی ئەو بێنەو بەرەیەی بەهاری ساڵی ١٩٤٦دا، سەبارەت بە کشانەوەی رووسیا، لە ئازەربایجانی (ئێران– ك.م.) دروست بووبوو قازی محەمەد حوکمەتێکی کوردیی سەربەخۆیی لەژێر سایەی رووسەکاندا دامەزراندو مەلا مستەفایش ببووە (کەسایەتییەکی گەورە)[43] وەك سەرکردەی هێزە

---

(42) مەبەستی لەوەیە بڵێت ((ژ. ك.))و ((نیشتمان)) وەك ((ئازادی)) توندڕەو نەبوون.

(43) تێ نەگەیشتم بۆچ کۆلۆنێل ئێلفینستۆن ئەو دوو وشەیە (کەسایەتییەکی گەورە)یەی خستۆتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە: ((Splendid figure)) تۆبڵێی پیاوانی وەك قازیو بارزانی بەلای ئێلفینستۆنەوە کەسایەتیی گەورە نەبووبن ؟.



جـــەکولەرەکانی مـــەهاباد. هـــەر لـــەو دەوروبـــەرەدا
قەمباچکەیەکی شوومی تر)ی بە گۆبەند[44] لە مەهاباد
بەیدا بوو کە ناوی حەمە ڕەشیدە[45] و پایزی ساڵی ١٩٤٤
دژی حوکمەتی رووسیا یاخی بوو، حەمە ڕەشید،
حوکمەتەوەی لە ئێران دوور خرابۆوە عیراق، لە شاری
سلێمانی لەژێر چاودێریی میریدا دەژیا.

دوا بەدوای ئەوەی رووسەکان لە کەلی شەیتان هاتنە
خوارێو تەنانەت بەر لەوەیش قەوام سەڵتەنە ببێتە سەرەك
وەزیران ڕێگەیان دایە هێزەکانی سوپای ئێران ئازەربایجان
دەگیر بکەنەوە، ئیتر ئەوان دەستیان لە قازی محەمەد
هەڵگرتو لەوساوە نازانم چی بەسەر ئەو پیاوەدا هاتووە.

هەرچۆن بێت ئێمە باش لەوە گەیشتووین کە سیاسەتی
رووس بەو جۆرە دارێژراوە کەی بە پێویستیان زانی
پشمەکشێ بکەنو هەر کاتێکیش دەرفەتیان بۆ هەڵکەوت
سیلەوە بیقۆزنەوە، بەڵام کەم گومان لەوە دەکەین ئەگەر دیسانەوە دەرفەتی
گەڕانیان لە ئێران بۆ هەڵکەوتەوە پیاوێکی تری وەك قازی محەمەد، یا هەر ڕابەرێکی
تری کورد ئامادە دەبێت یاریدەیان بدات بۆ ئەوەی بە مەرامەکانی خۆیان بگەن.

رووسەکان لە عیراق، دوور لە هاندانەکەی مەلا مستەفایش، تایبەت لە ڕێگەی
پڕوپاگەندەوە نفوزی خۆیان هەیە. دەستەیەکی کورد لە بەغدا کە ناوی (پارتی
ڕزگاری)یان لە خۆیان ناوە لە پەخشەکانیاندا دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد
ستایشی رووسیا دەکەنو ڕەخنە لە بەریتانیا دەگرن.

گومان لەوەدا نییە چ کوردی ئێرانو چ عیراقو چ تورکیا تا ڕادەیەکی زۆر
کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی پڕوپاگەندەی رووسیا و حیزبی شیوعی دژی بەریتانیا.

---

44) لە دەقی بەلگەنامەکەدا دەڵێت (P.8) ((another stormy petrel))، (Petrel)یش مەلێکی
دەریاییە کە لە (ئەورەس) دەکاتو مەبەستی ئەو زاراوەیەیە کە بە عەرەبی (طائر الشؤم)ی پێ دەڵێن.

45) مەبەستی حەمە ڕەشید خانی بانەیە.



نیشتمان

بلاوکەرەوەی بیری کومەڵەی ژ-ك

گوڤارێکی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، خوێندەواری و سیاسی کوردییە

ژمارە ١ — ساڵی یەکەم — پوشپەڕی ١٣٢٢ — جولای ١٩٤٣

هەمان کات بەڵگەش هەن کە بیروبۆچوونێکی وا لەناو کوردی سووریاشدا هەیە. تایبەت بەهۆی سەرۆکی حیزبی شیوعیی ئەو وڵاتەوە کە لاوێکی لێهاتووی کوردە بەناوی خالید بەگداشەوە.

ئەی ئێمە لەم بووارەدا چی دەتوانین بکەین؟ جووتیاری کورد کە بە دەست نەخوێندەواریو هەژارییەوە دەناڵێنێت کەرەستەیەکی ئەوتۆ بۆ پڕوپاگەندەی کۆمۆنیزم پێك ناهێنێت. ئەو بایەخێکی ئەوتۆ بە سیاسەت نادات و هەمیشە بیری لای دەغڵو دانو مەڕو ماڵاتەکەیەتی، هەرچی ئاغا، یا سەرەك هۆزە کوردەکانیشە قێزیان لەو شتانە دێتەوە کە دەربارەی بەلشەڤیزم دەیانبیستنو تەواو بە پێچەوانەی ژیانی خۆیان سەیریان دەکەن.

ئەگەر کورد، لە عیراقو باشووری ئێران، رێگەی ئەوەی پێ بدرێت بەرلورد لەنێوان حیمایەی رووسی یا بەریتانیدا بکات دووەمیان هەڵدەبژێرێت، لە سووریاش هەمان وەڵام دەدەنەوە لەگەڵ جیاوازییەکدا کە لەوانەیە هەبن فەرەنسەیان لە هەموان پێباشتر بێت چونکە باشتر دەیناسنو فەرەنسییەکان لە ساڵەکانی قەیمومەتدا (ئینتیداب) زۆر باش رەفتاریان لەگەڵ کردوون.

ئەگەر واز لە کورد بهێڵرێت لەوانەیە ئالوودەی وەرچەرخانێکی گەورە نەبن لە ژیانیاندا، بەڵام کێشە لەوەدایە ئاخۆ وازیان لێ دەهێنن؟ مەترسییەکە لەوەدایە کە گەلێك کورد، تەنانەت دژ بە ئارەزووی خۆیشیان، ناچار بن حەز بکەن رووسی

بگەڕێتەوە. ئەوەی وا لە کورد دەکات بەو جۆرە سەیری رووسیا بکەن بێ هودە بوونیان لە چارەنووسی ڕەشیان. لەوانەیشە کورد هەبن چاویان بڕیبێتە بەریتانیا، لە ڕاستیشدا کوردی وا هەن، بەڵام ئێمە هاندانی کورد بۆ پشت بەستن بە بەریتانیا لە سیاسەتماندا نییە. ئەگەر ئێمە بتوانین قەناعەت بەو حوکمەتانە بکەین کە کورد لەگەڵیاندا دەژین بە سیاسەتێکی باشتر ڕەفتاریان لەگەڵ بکەن‌و دان بەوەدا بنێن کە تواندنەوەی کورد مەحاڵەو پێویستی بە سیاسەتێکی عادیلانەیە ئەوساکە ئەو کوردانە دەبنە هاووڵاتی باشی ئەو وڵاتانەی تیایاندا دەژین‌و ئیتر مەترسیی ئەوەیش کەم دەبێتەوە کە کورد بکەونە ژێر کاریگەریی پڕوپاگەندەی شیوعییەکانەوە.

پێویستە ئامانجی سیاسەتی ئێمە بریتی بێت لەوەی حوکمەتانی تورکیاو ئێران‌و عیراق هان بدەین گوێڕایەڵی سکاڵا ڕەسەنەکانی کوردو ئامادەی چاکسازیی بن لەبەر ڕۆشنایی ئەو سکاڵایانەدا. ئەوە بۆ خۆی باشترین ڕێگەیە بۆ بەرهەڵستی کردنی نفوزی سۆڤیەتی‌و ڕێگە نەدان بەوەی کێشەی کورد ببێتە هۆی شێواندنی ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئایا کەسێك هەیە حەز لە تێکدانی ئەو ئاسایشە بکات[46].

من بۆ خۆم ڕێزی کورد دەگرم، پێشم‌وایە هەموو یەکێك لە ئێمە کە هاوڕێی کوردی هەبێت پێویستە هانیان بدەین خۆیان ئامادە بکەن بۆ جۆرە ڕەفتارێکی وا باش تا جارێکی دی ئەوە بسەلمێنن کە کاتی خۆی سەلاحەددینی ئەیوبی سەلماندی. کورد دەتوانێت بەناوبانگترین هاووڵاتی بێت لە وڵاتێکدا کە کورد بۆ خۆی حوکمی ناکات.

ئیمزا

ئێلفینستۆن

نۆزدەی مارتی ١٩٤٧))[47].

---

(46) لە دەقی ڕاپۆرتەکەدا ئەم دوا ڕستەیە بە دەستخەت نووسراوەتەوە، واپێ دەچێت خەتی ئێلفینستۆن خۆی بێت.

(47) N.A., F.O., 371/61678, The Kurdish Problem, 1947, PP.817.

بەر لەم راپۆرتەو لە لاپەڕە پێنجی هەمان فایلدا دەقی ئەو نامەیە هەڵگیراوە کە وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی ڕۆژی چواردەی مارتی ساڵی ١٩٤٧ ناردوویە بۆ کۆلۆنێل ئێلفینستۆن، ئەمەی لای خوارەوەش دەقی وەرگێڕدراوی ئەو نامەیەیە:

((وەزارەتی هەندەران،

١٤ی مارتی ١٩٤٧،

بۆ: کۆلۆنێل إی. ئێلفینستۆن،

پەیمانگای مەلەکیی پرسە نێو دەوڵەتییەکان،

باڵەخانەی چاتهام ١٠،

شەقامی گۆڕەپانی جێمس،

لەندەن س. دەبل یو ١.

سوپاستان دەکەم لەمەڕ ئەو نامەیەی ڕۆژی هەشتی مارتتان کە وێنەی دەسنووسی وتارەکەتانی دەربارەی کورد لەگەڵدا بوو.

هیچ شتێك لە دەسنووسی ئەو وتارەدا نییە مایەی ئەوە بێت ئێمە لەگەڵیدا نەبین. گەلێك منەتبارمان دەکەن ئەگەر ڕێگەمان بدەنێ جارێکی دی ئەو وتارە کە وا وەك هاوپێچ بۆتانی دەنێرمەوە، ببیننەوە.

ئێمە بە دڵ حەز دەکەین، ئەگەر لێتان زیاد نەبێت، ژمارەیەکی ئەو وتارە لە ئەرشیڤی خۆماندا هەڵبگرین. خۆ ئەگەر هاتوو ئەوەتان پێنەکرا ئەوساکە تکایە بۆ ماوەیەك دەسنووسەکەم بۆ بنێرنەوە تاوەکو بتوانم وێنەی لەسەر بگرمەوە.

ئیمزا

سێر ر. هاو))[48]

---

(48) Ibid, 14th March, 1947, To: Colonel E. Elphinston, Royal Institute of International Affairs, Chatham House 10, St. James Square, S.W.1.

## یادداشتی دوکتۆر ئەحمەد
## نافیز بەگ بۆ بێڤن

ەمر ئەو مانگەی کۆلۆنێل ئێلفینستۆن ئەو ڕاپۆرتە دوورو درێژەی خۆی سەبارەت
ـە پرسی کورد ناردۆتە وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی، کوردێکی دڵسۆزی
ـووریایی، کە ناوی دوکتۆر ئەحمەد نافیز بەگە، بێ ئەوەی هیچ ئاگایەکی لە
ڕاپۆرتە نهێنییەکەی ئێلفینستۆن بێت، یادداشتێکی گرنگی دەربارەی پرسی کورد
ـردووە بۆ سێر بێڤنی[49] وەزیری هەندەرانی بەریتانی کە ئەو کاتە لە مۆسکۆ لە
کۆنگرەیەکی وڵاتە هاوپەیمانەکان بووە.



ـەرلستەوە بۆ چەپ: قەدری جەمیل پاشا، د. نووری دەرسیمی، د. ئەحمەد نافیز، د. نورەددین زازا

(حەڵەب ١٩٤٧/٨/١٦)

---

(49) سێر ئێرنێست بێڤن: ڕۆژی حەوتی مارتی ساڵی ١٨٨١ لەدایك بووە، لە هەڕەتی لاوییەوە پێوەندیی بە نەقابە کرێکارەکانو سۆشیالیزمەکانی وڵاتەکەیەوە هەبووە، ساڵەکانی جەنگی دووەمی جیهانی وەزیری کار (عەمەل) بوو، لە هەڵبژاردنی گشتیی ساڵی ١٩٤٥دا سێر ئێرنێست بێڤن ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا بۆ ئەوەی ((پارتی کرێکاران)) سەرکەوێت بۆیەکا لەوساوە ئەتلی کردییە وەزیری هەندەران لە کابینەکەی خۆیدا، بێڤن، بە دەستووری چەرچل، زۆری دەخواردو زۆری دەخواردەوەو زۆر زۆریش جگەرەی دەکێشاو هیچیش وەرزشی نەدەکرد، لە دوای ساڵی ١٩٤٥وە تەندروستیی خراپ بوو،ڕۆژی چواردەی نیسانی ساڵی ١٩٥١ بە نەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:
((Oxford Dictionary of National Biography)), Vol.5, Oxford University Press, 2004. P.P.601-6011.

شـایانی باسـە ئێلفینـستۆن لـە ڕاپۆرتەکـەی خۆیـدا کاتێـك دێنـە سـەر باسـی ((خۆیبوون)) ناوی ئەحمەد نافیز بەگی هێناوەو وەك گوتمـان دەڵێـت ((کۆمەڵەکە لەلایـەن لیژنەیـەکی پێـنج کەسـییەوە بـەڕێوە دەبرێـت)) کـە دوانیـان دوکتـۆرن ((یەکەمیان مەمدووح سەلیمی[*] خەڵکی حەسـەکەیەو دووەمیـان نـافیز بەگـە کـە خەڵکی قامیشلییە))[50].

یادداشـتەکەی ئەحمـەد نـافیز بـەگ لـە دوو لاپـەڕە پێکهـاتووەو بـە زوبـانی فەرەنسی نووسراوەو[51] بە تەنها لـە فـایلێکی سـەربەخۆی وەزارەتـی هەنـدەرانی

(*) ((مەمدووح سەلیم (١٨٩٣ – ١٩٧٦): ڕۆژنامەنووس و شۆڕشگێڕێکی کوردستانی باکوور بوو، خەڵکی (وان)ە نەوەك (حەسەکە)، ئەمە ئەگەر ئەم ناوەی وەکوو لەم بەڵگەنامەیەی سەرەوەدا هاتووە کەسێکی دیکە نەبووبێت، دوای تێکچوونی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران پەڕیوە سووریاو لەوێ ئاکنجی بووە.
د. کەمال خۆی لەهەندێ لەنووسینەکانی باسـی دەکـات، تەنانـەت خـۆی لـە سـەرەتای حەفتاکانـدا دیویـە. ئامازەشی بۆ ئەوە کردووە مامۆستا مەسعوود محەمـەد بەبۆنـەی کۆچـی دوایـی شـیوەنێکی بەسـۆزی بـۆی کردووە، هەروەها باس لەوە دەکرێ ناوبراو کتێبخانەیـەکی گـەورەی لەماڵـەوە هـەبووێ، ئەسـکەندەر بـەگ ناوێکی دیکەی ئەو زاتە بووەو لەنێو (خۆیبوون) پێی ناسراوە، لەساڵی ١٩١٢ و دواتر ئەندامی (جڤاتی هێڤی تەلەبـەی کـوردان) بـووەو ماوەیـەکیش سـکرتێری ئـەو کۆمەڵـەیە بـووە. لەسـاڵی ١٩١٩ دا، دوای هـەمزەی مۆکسی، لەژمارە (٢١) بەدواوەی (ژین)دا بۆتە خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەری لێپرسراوی ئـەو گۆڤـارە، دواتـر بەرپرسـیارێتی ڕۆژنامـەی (ژیـن)ی هەفتانـەی وەرگرتـووە کـە دوای جیابوونـەوەیان لەکۆمەڵـەی تـەعالی کوردستان بۆتە زمانی (کۆمەڵەی تەشکیلاتی ئیجتیماعییەی کورد) ، لەساڵی ١٩٢٥دا ماوەیەك هاتۆتە بەغدو لەوێ میوانی دوکتۆر محەمەد شوکری سەکبان بووە، تەنانەت دوو وتاریشی لەگۆڤاری (دیاریی کوردستان) بڵاوکردۆتەوە، لەیەکێکیاندا بەرگری لە (جڤاتا هێڤی تەلەبەی کوردان) کـردووە، محەمـەد ئـوزون ڕۆمـانێکی تایبـەتی بەناوونیـشانی (سـییا ئـەڤینێ) لەسـەر ژیـانی نووسـیوە، بەداخـەوە لـەهیچ کـام لەسەرچـاوەکانی ئەنسکلۆپیدیایی ژیانی ناودارانی کورد، کە ئێستا لەبەردەستن، ناوی ئەو زاتە نەهاتووە، ئەوەی شایانی باسـە پێشتر لەنووسـینێکمدا مـن سـاڵی (١٨٨٠)م بـۆ لـەدایك بـوونی (مەمـدووح سـەلیم) دلنـابوو، ئـەوەبوو دواتـر د.جەمشید حەیدەری بەبەڵگەیەکی ڕەسمی ئەو ساڵەی بۆ ڕاست کردمەوەو بۆی سـەلماندوم کـە ئـەو سـاڵە ١٨٩٣ بووە، دیارە بەپێی تەمەن و ساڵی کۆچی دواییەکەی ناوبراویش بێت ئەوەی د. جەمشید ڕاستترە – ع. زەنگەنە)).

(50) N.A., F.O., 371/61678, The Kurdish Problem, 1947, PP.10.

(51) زۆر بە گەرمی سوپاسی برای بەڕێز دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵڵا دەکەم کە دەقی یادداشتە فەرەنسییەکەی ئەحمەد نافیز بەگم بۆی ناردە پاریس‌و ئەویش لە ڕێگەی پۆستەوە دەقی وەرگێڕانەکەی بۆ

حوکمەتی بەریتانیدا هەڵگیراوە[52]. دامێنی لاپەڕەی دووەمی یادداشتەکە ئیمزای دوکتۆر ئەحمەد نافیز[*] و مۆری (کۆمەڵەی کوردیی)ی بەسەرەوەیە، ناوی کۆمەڵەکە لەسەر مۆرەکە بە کوردیو فەرەنسی بەم جۆرە هەڵکەنراوە:

((LIGUE KURDE ،KOMEL E KURDI)). دوکتۆر نافیز لە یادداشتەکەیدا لە ڕێگەی بێڤنەوە داوا لە دەوڵەتە گەورەکان دەکات پشتی کورد بگرن بۆ دامەزراندنی ((کوردستانێکی یەکگرتووی سەربەخۆ))[53] ئەمەیش ناوەڕۆکی یادداشتەکەیە:

((بێروت، یازدەی مارتی ١٩٤٧،

بۆ: جەنابی بەڕێز بێڤن،

مۆسکۆ.

جەنابی بەڕێز

لەوەتی جەنگ کۆتایی هاتووە گەلی کورد ڕۆژانی تەنگانە لە ڕێگەی (کۆمەڵەی کورد)و چەندین ڕێکخراوی هەمە چەشنەوە رووی لە زلهێزەکان ناوە هەوڵ بدەن کۆتاییەك بۆ ئەو رەوشە دابنێن کە هەڕەشە لە بوونی فیزیکی گەلی کورد دەکاتو وەکی دیکە ڕەوشی ئاشتیی جیهانی، بە ئاشتیو ئارامیی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە دەخاتە مەترسییەوە.

ژمارەی گەلی کورد نۆ ملیۆن کەسە، کورد خاوەنی خاكو زەویی خۆیەتی نەك کەمینەیەکی نەتەوەیی لە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتانەدا کە کوردستانیان دابەش کردووە، کورد گەلێکە گشت تایبەتمەندییە پێویستەکانی هەیە بۆ ئەوەی سنوورو سەربەخۆیی خۆی هەبێت.

---

سەر زوبانی کوردی بۆ ناردمەوە لە لەندەن. وا دیارە دوکتۆر نەجاتی عەبدوڵلا یەکێکە لە لاوە هەرە دڵسۆزەکانی کورد بۆیەکا لە قووڵایی دڵەوە نامەزرۆی بینینیم.

(52)N.A.، F.O., 371/61547, Kurdish Situation, 1947, PP.1-4.

(*) ((لە پەراوێزێکی لاپەڕە ٢٦١ی ئەم کتێبەدا د. ئەحمەد نافز بناسە– ع. زەنگەنە))

(53) لە دەقی نامەکەیدا دوکتۆر ئەحمەد نافیز ئەم ڕستەیەی وا دارشتووە:

((United Independent Kurdistan)).

ئەو پرنسیپانەی لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە جاڕ دراون مافی ئەوە دەدەنە کورد داوای گەڕاندنەوەی حەقی زەوت کراویان بکەن. جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەو سێ دەوڵەتە سەرەکییەی کوردستانیان دابەش کردووە، واتە تورکیاو ئێران‌و عێراق، دەوڵەتانێکی خاوەن ڕابردوویەکی خوێناوین. بۆ ئەوەی نەچینە ناو وردەکارییەکانەوە هێند بەسە ئەوە وەبیر بهێنینەوە چۆن تورك لە دەورانی جەنگی گەورەدا ئەرمەن‌و ئینجا، لە ماوەی ئەم چارەکە سەدەیەی دواییدا، کوردیشیان ڕەشەکوژ کردووە، چۆن ئێران بە دەستووری سەدە ناونجییەکان مامەڵەی کوردی کردووەو چۆن لە عێراقیش ئاسووری– کلدانی‌و کورد ڕەشەکوژ کراون.

گومان لەوەدا نییە کورد چۆن لە ماوەی جەنگدا بە وەفا لەگەڵ هاوپەیمانەکاندا مایەوەو بە دەستووری ساڵی ١٩١٨ گشت متمانەو هیوایەکی خۆی خستبووە سەر بیرۆکەی دیموکراسیی‌و ئازادیی هاوپەیمانەکان، ئەوەی لە بەرپاکردنی شۆڕشی جەنەڕاڵ مستەفا بارزانی لە عیراق‌و دامەزراندنی کۆماری کوردیی مەهاباد بە سەرکردایەتی سەرۆکی گەورەیان قازی محەمەد لە ئێران ڕەنگی خۆی دایەوە، وێڕای شۆڕشەکانی ساڵانی ١٩٢٥–١٩٢٦و ١٩٣٠و ١٩٣٨ لە تورکیا. کورد لە هەموو لایەکەوە ئەوەیان بە ڕاشکاوی دەربڕی کە دەیانەوێت بە ئازادی لە وڵاتی خۆیاندا بژین‌و ئەوەیش بە مافێکی سروشتیی خۆیان دەزانن. مافێك کە جاڕنامە یەك لەدوای یەکەکانی هاوپەیمانەکان دانیان پێدا ناوە.

بەڵام ئایا ئەوان (تاوانبارن– ك.م.) لەو هەموو بەرپرسی‌و ئەو هەموو خوێن ڕشتنە بە کوێ گەیشتن ؟، لەکاتێکدا لە نۆرینبورگ[54] و چەندین شوێنی دیکە تاوانکارانی دژە مرۆڤایەتی یا سزا دراون، یا خەریکە سزا دەدرێن. بەرانبەر بەوە بە چاوی خۆمان دەبینین حوکمەتی ئێران هێزەکانی خۆی ناردۆتە سەر کۆماری مەهابادو ئاوایییەکانی کورد بۆمباباران دەکات‌و خەڵکانی بێ‌وەیی چەندین شاری هەمە چەشنە، بە مەهابادیشەوە، دەکوژرێن، فەرمانڕەوایانی عیراقیش شانازی

---

(54) نۆرینبورگ شارێکە لە ئەڵمانیا، دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان هاوپەیمانەکان لەو شارە دادگەیەکی بەرزیان بۆ دادگایی کردنی نازییەکان دامەزراند.

بەوەوە دەکەن تەنانەت مریشکی زیندووش لە ئاواییە کوردییەکاندا نەماون. ئێمە بە ئەوپەڕی نیگەرانییەوە روو دەکەینە (نوێنەرانی– ک. م.) ئەو زلهێزانەی بەرپرسیاریی جیهانو دادپەروەرییو ئازادییان لە ئەستۆدایەو دەپرسین چۆن دەتوانن وا بێ خەم لێی دانیشتوون ؟.

رەوشەکە لە تورکیاش بە هەمان شێوەو شێوازە، وێڕای ئەوەی کە ستاستیکە فەرمییەکان ئەوە بەدیار دەخەن کە چوار ملیۆن دانیشتووی ئەو ناوچانەی وەك کوردستان ناسراون (بڕوانە نەخشەی نی. م. تورك کە لە ماوەی جەنگی جیهانیدا بڵاوکراوەتەوە) کەچی لەوێ (واتا لە تورکیا– ک. م.) کوردەکان ناتوانن تەنانەت بشڵێن ئێمە کوردین، ئەوان لەسەر پچووکترین بیانوو دەگیرێنو زیندانی دەکرێن، فەلاقە دەکرێن، دەکوژرێن، ناوچەکە لەرووی ئابووریشەوە بە جارێك وێرانەیە.

ئەگەر چەند لەبەرچاو گرتنێکی نێو دەوڵەتیی رێگر بن لەوەی دەمو دەست بیر لەوە بکرێتەوە کوردستانێکی یەکگرتوو و سەربەخۆ دروست ببێت، ئەوەی دەشێتو دەبێت دەمودەست بە جێگەی بگەیەنرێت ئەوەیە کە هێزە گەورەکان تەدەخول بکەن بۆ ئەوەی رەوشێکی بەرگە بۆ گیراوو مرۆڤانە بۆ کورد دروست ببێتو دان بە ئۆتۆمییەکەیاندا بنرێت لە چوارچێوەی ئەو وڵاتانەی تێیدان. ئێمە رێگە بە خۆمان دەدەین سەرنجی جەنابی بەڕێزتان بۆ ئەوە راکێشین کە ئەم هەڵوێستەی دەوڵەتانی خاوەن مەسەلەکە کە تەحەدای هەموو بیرۆکەیەکی دادپەروەرییو ماف پارێزی دەکەنو هەڵوێستی خەمساردیی گەورە هێزەکان بەوە کۆتایی دێت کە گەنجانی دڵ گەرمی کورد بێزار بن، ئەوە هانیان دەدات هەموو باوەڕو گشت متمانەیەکیان بە مافو دادپەروەری لەدەست بدەن.

بەلای ئێمەوە پێویستە پێ لەسەر ئەو خاڵە دابگرینو بە ڕاشکاوی بڵێین ئەگەر هاتوو سبەینێ گەنجانی ئاوەها لەناو موعاناتدا لە دایکبوونو دژی ئەم بێ دادییە ڕابوونو چەند چەمکێکی پوچگەراییو بێ هوودەییان کردە هی خۆیانو ئەمانەیان تەرجەمە کرد بۆ کردەوە، چۆن دەکرێت ئەوانە سزا بدرێن ؟. ئەم گەنجە هاوچەرخانەی ئێمەی ئەم تێبینییانەتان بۆ دەنووسین داخۆ چ دەبینن بە چاوی خۆیان ؟، نیشتمانپەروەرانی کورد، ئەفسەرو ئەندازیارو نووسەرو مامۆستا هاوشان

لەگەڵ جووتیارو چیاییە نیشتمانپەروەرو چاکەکاندا یەکیان گرتووەو بە یەك دەنگ بۆ سەربەخۆیی خۆیان خەبات دەکەن، بەڵام لە وەڵامدا زۆر دڵ ڕەقانە بەر ڕەشاش دەدرێن و لە بەرانبەرو لە دیوەکەی دیکە لەیەك کاتدا لە لایەن ئێران و عێراقەوە بۆمباباران دەکرێن.

جەنابی بەڕێز: لەگەڵ سوپاسگوزاری پێشدەستیانەمدا تکایە ڕێزلێنانی لە هەمووان شایانتری ئێمە قەبووڵ بفەرموون.

مۆر:

ئیمزا: د.ئە. نافین)[55]

بێگومان دەبێت لاوانی کوردی سووریا لە هەرکوێ بن، ئەوانەی بە شیرینکی و خاوێن گۆش کراون چاوو دڵی دوکتۆر ئەحمەد نافیز(*) و هاوەڵەکانی لە بەهەشتی بەریندا هێندەی تر رووناك بکەنەوە.

---

55) N.A., F.O., 371/61547, Kurdish Situation, 1947, PP.1-4.

(*) دکتۆر ئەحمەد نافیز بەگ (١٩٠٢–١٩٦٨): ئەویش هەر خەڵکی باکوور بووە، خەباتگێڕێکی ناسراو بووە، بە بنەچە خەڵکی (پاخرمادن)ـە، کە شارێکە دەکەوێتە نێوان (دیاربەکر) و (ئالازیز)ـەوە. تێکۆشەرە وڵاتپارێزە لە باب و کالانییەوە هەر وڵاتپارێز بوونە، (مەلا یوسف)ی باوکیشی کوردپەروەرێکی ژیهاتی بووە. (ئەحمەد نافیز)، دوای خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شارەکانی (مادن) و (دیاربەکر)، بە مەبەستی تەواو کردنی خوێندنی باڵا روو لە ئەستەنبوڵ دەکات و لەوێ خوێندنی پزیشکی تەواو دەکات. هەر لەو شارەشدا تێکەڵی کۆمەڵەو رێکخراوەکانی کوردان دەبێت لەگەڵ بنەماڵەی (جەمیل پاشا) و بەدرخانییان نێوانی خۆش بووە، پەیوەندی بە (کۆمەڵەی ئازادی)یەوە کردووە، کە ڕاپەڕینەکەی (شێخ سەعیدی پیران) دەستپێدەکات، ئەویش بەشداربیەکی کاریگەری تێدا دەکات، ئەوەبوو دواتر بەسەردا دەگیرێ. ساڵی ١٩٢٧ کاتێ هەڵبژاردنی شارەوانییەکان لە تورکیا دەستپێدەکات، ئەوەبوو (دوکتۆر نافیز)یش لەسەر داوای خەڵکی (مادن) خۆی هەڵدەبژێرێ و دەبێتە سەرۆکی شارەوانی، لەوێدا نەخۆشخانەیەك بۆ شارەکە دروست دەکات، بەڵام ئەوەندەی پێناچێ، کەمالییەکان لێی هەڵدەگەڕێنەوەو لێناگەڕێن ئەوەندە لەسەر کارەکەی خۆی بمێنێتەوە ئەوەبوو سەرۆکی هەموو شارەوانییەکانی کوردستان لادەدەن و (تورك) دەخەنە شوێنییان، بۆیە (دکتۆر ئەحمەد نافین) ناچار دەبێ بچێتە (دیاربەکر)، بەڵام لەوێش هەر وازی لێناهێنن، (مستەفا تەلی

## کوردە سوورییەکانی لەندەن

خۆشبەختانە ژمارەیەك لەو لاوە کوردە سوورییانەم ناسیوە کە نیشتەجێی لەندەنن. پیری موغانی ئەو کوردانە دوکتۆر جەواد مەلایە کە هەرئەوەندە ڕاتیبووی من لێرەم پێوەندیی پێوە کردم و بیری خستمەوە چۆن ساڵی ۱۹۷۲ کاتێك هێشتا قوتابی بووەو سەردانی بەغدای کردووە لە ((کۆڕی زانیاری کورد)) هاتۆتە لای منیش. دوکتۆر جەواد بە گەرمی ئامادەیی برایانەی خۆی بۆ هەموو یارمەتیدەیەکی پێویست نیشان داو بەو بۆنەیەشەوە داوای لێ کردم سەردانی مەڵبەندی ((کۆمەڵەی ڕۆژئاوای کوردستان)) لە لەندەن بکەم، تایبەت ڕۆژی حەفدەی تەمووزی ۲۰۰۷ چونکە، وەك گوتی، لەو ڕۆژەدا ((کۆڕێکی ڕۆشنبیری

---

شەرکەسی) کە حاکمی کوردستان دەبێ و سیاسەتی (ئەتاتورك) لەناوچەکە جێبەجێ دەکات، زیاتر تەنگی پێهەڵدەچنێ و فەرمانی دادوەری بۆ دەردەکات، تا بینێرێتە (ئەزمیر)، ئەوەبوو (دکتۆر ئەحمەد نافیز) بە ماڵ و منداڵەوە لەگەڵ (نورەددین زازا)ی برای، کە دواتر لە سوریا پارتی دیموکراتی کوردی دامەزراندووە، سنوور دەبڕن و دەچنە سوریا، لەوێ سەرەتا لە حەلەب جێوار دەبێ، دواتر بەهاوکاری دۆست و برادەرانی دەچێتە دیمەشق و لەوێ ئاکنجی دەبێ. دیارە ئەوسا دەوڵەتی فەرەنسا، کە حوکمی ئەو وڵاتەی دەکرد و نێوانیشی لەگەڵ تورکیا خۆشبوو، نەیدەهێشت ڕۆشنبیرانی کورد لەناوچەی جزیرەو شوێنەکانی دیکەی کوردان بمێننەوە، بۆیە ماوەیەکی زۆری ویست تا ڕێگا بە ئەحمەد نافیز درا بچێتە ناوچەی (عەیندیوەر).

دوای خەباتێکی درێژخایەن، ئەوەبوو لە ساڵی ۱۹٦۸دا ئەحمەد نافیز نەخۆش دەکەوێ و دەچێتە بێروت تا لەنەخۆشخانەی ئەمەریکی چارەی خۆی بکات، بەڵام لەوێ مردن پشتی لێ دەستێنێ و کۆچی دوایی دەکات، لەسەر راسپاردەی خۆیشی دەیبەن لە گوندی (دووگری) دەینێژن، دەڵێن بە هەزاران کەس لە کوردو عەرەب و ئەرمەنی و سریانی ناوچەکە، چووبوونە پێشوازی تەرمەکەی. دکتۆر ئەحمەد نافیز لە ژیانی خۆیدا هەر دۆست و خۆشەویستی خەڵك نیشتمانپەروەرانی کوردی ناوچەکە بووە، لەوانە (حاجۆ ئاغای هەڤێرکی، عەبدولڕەحمان ئاغا عەلی یونس، هەمزە بەگی مۆکسی، حاجی موسا، حەسەن ئاغا حاجۆ، مەمدووح سەلیم)، هەروەها (جەلادەت بەدرخان) گۆشەیەکی لە گۆڤاری (هاوار)دا بۆ تەرخان کردبوو، بەردەوام بابەتی تەندروستی تێدا بڵاودەکردەوە. بەداخەوە لە کتێبخانەکەمدا نەکەوتمەوە سەر ئەو سەرچاوانەی لەبارەی ئەو زاتە نووسیویانە، بۆیە نەکرا چالاکییە سیاسییەکانی دیکە باس بکەم- ع. زەنگەنە)).

دەربارەی پەڕتوکێکی نوێی دوکتۆر ڕەزوان بادینی)) دەبەستن کە بە عەرەبی دوو سالّ لەمەوبەر لە پاریس چاپی کردووە، بەر لەوەیش لە مۆسکۆ بە رووسی بڵاوی کردۆتەوە[56]. بەر لە ڕۆژی کۆڕەکەیان دوکتۆر جەوادو دوکتۆر ڕەزوانم لەو کۆڕەدا بینی کە ئێوارەی پازدەی تەمموز بۆ باسی مێژووی کەرکوكو دەروبەری بۆ منیان ساز کردبوو[57]، هەردووکیان لە بەشدارە چالاکەکانی ئەو کۆڕە بوون.

بەر لە بەستنی کۆڕەکە بە سەعاتێك منو شەهلاو نەجاتی خوشکم گەیشتینە مەڵبەندی ((کۆمەڵەی ڕۆژئاوای کوردستان)) چونکە دوکتۆر جەواد حەزی دەکرد پێشانگای کوردەواریی مەڵبەندەکەیان ببینین کە دڵو چاوی روون کردینەوە، لە نیمچە هۆڵێکدا گەنجینەیەك جلوبەرگو کلاّشو گەلێك کلاّو و کەلوپەلی کوردەواریی تر بە شێوازێکی ڕازاوەی سەرنج ڕاکێش لەنێو ئالاّی کوردستاندا دانرابوون، وەك گوتیشیان، ژمارەیەکی باش لە بیانییەکان سەردانی دەکەن. وێڕای ئەوە هەر لە تەنیشت پێشانگاکەوە کتێبخانەیەکی پچووك، بەلاّم پڕ لە سەرچاوە، دەربارەی کوردی سووریا دانراوە، تایبەت ئەوانەی ((کۆمەڵەی ڕۆژئاوای کوردستان)) بڵاویکردوونەتەوە، وەك کتێبەکەی دوکتۆر جەواد خۆی کە لە لەندەن ساڵی ٢٠٠٥ بەم ناونیشانەوە بڵاوی کردۆتەوە: ((کوردستانو کورد. نیشتمانێکی دابەش کراوو نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت))[58].

لەکاتی دیاری کراودا کۆڕەکە دەستی پێکردو دوکتۆر ڕەزوان بادینی بە کوردییەکی ڕەوان ئەوی مەبەستی بوو ڕایگەیاند، ئینجا ئامادە بووان، کە زۆربەیان کوردی سووریا بوون، کەوتنە وتووێژو پرسیار. دوکتۆر جەواد خۆی کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد، بەرلە کۆتایی داوای لە منیش کرد شتێك بڵێم. سەرەتا بە زوبانی

---

(56) د. رضوان بادينى، أكراد سوريا: موعد مع التأريخ، باريس، ٢٠٠٥، ١٩٥ صفحة.

(57) بەڕێز کاك شێرکۆ حەبیب کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد، ئەویش یەکێکە لەو برا کوردانەی دانیشتووی لەندەن کە زۆر خزمەتیان کردووین، تەنانەت کاتی خۆی بۆ بەسەرکردنەوەم بە تایبەتی هاتبووە مانچستەر بۆ لام.

(58)Dr. Jawad Mella, Kurdistan and the Kurd. A Divided Home and a Nation without State, London, 2005, 296 PP.




کوردی گوتم لەبەر ئەوەی دۆستی نزیکی نەتەوەکەمان عبدلمنعم الاعسم‌و هاوسەرەکەی[59] لێرەن و کوڕەکەیان گەورەتر کردووە، بۆیە من قسەکانی خۆم بە عەرەبی دەکەم. پاش ئەوە زۆر بە کورتی باسی پوختەی ناوەرۆکی ئەو بەلگەنامانەی سەرەوەم، دەربارەی هەلۆێستی ڕەسەنی باوو باپیرانیان، بۆ کردن کە بێ ئەندازە پێیان شاگەشکە بوون، تایبەت لەو شوێنەدا کە سەرنجم ڕاکێشان

---

(59) برادەران گووتیان: عبدالمنعم الاعسم ئامادەی گشت کوڕەکانی کوردان دەبێت، ئەو ڕۆژەیش بەر ئە دەست پێکردنی کوڕەکە بە ماوەیەك هات‌و بێ ئەوەی هیچ لە دوکتۆر ڕەزوان بادینی تێبگات، چونکە وەك گووتم: ئەو بە کوردی قسەی دەکرد، خۆی و هاوسەری بێ ورتە لەپێشی پێشەوە دانیشتبوون، وا دیارە هەندێك جار شتێکی لە قسەکانی دوکتۆر ڕەزوان هەڵدەکڕاند چونکە بەسەر پشتگیریی خۆی دەردەبڕی.




بۆ ئەوەی هەردووك زاراوی ((كوردستانی سووریا))و ((كوردستانی ڕۆژئاوا)) لەو بەڵگەنامانەدا چەند جارێك بەكار هێنراون[60].

ئەو كاتەی خۆری پیرۆزی مەهاباد ئاوا بوو ماتەمینی سەرتاپای كوردستانی گرتەوە، بەڵام ئەوە بۆ خۆی، هەروەك چۆن لاپەڕەیەكی بایەخداری مێژووی نەتەوەكەمان بوو، بە هەمان شێواز وانەیەكی پڕ لە سوودی ئەو مێژووەیش بوو. وەك لە بابەتی داهاتووی ئەم كتێبەدا هەست بە گەلێك لایەنی نەزانراوی دەكەین.

---

(60) شاهۆ ئەمین كوڕەكەی بۆ سەتەلایتی كوردستان تۆمار كرد، زۆرم پێ خۆش بوو كە زانیم هاوسەری شاهۆ كیژە كوردێكی سووریی قەشەنگە، بادینیو سۆرانیش زۆر بە باشی دەزانێت.

# بابەتی حەوتەم

## هەڵهاتن و خێرا ئاوابوونی خۆری مەهاباد

## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

# پێشەکی

لە بابەتەکانی ئەم بەرهەمەدا، کەم ناو بە ڕادەی ناوەکانی مەهابادو کۆماری مەهاباد (کوردستان) دووپات بۆتەوە، هۆی ئەوەش لای هەمووان ئاشکرایە، هەرچەندکرا ئەو باس و خواسانەش لەم بابەتەدا کۆ بکەینەوە، چونکە هاوسەنگیی بوون بەشەکانی کتێبەکە تەواو تێك دەچوو. ئەوەیش کە لەم بەشەدا بڵاوی دەکەینەوە، چمکێکی کەمی ئەو خەرمانە دەوڵەمەندو هەمە جۆرەیە، کە لەناو بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا ڕەنگیان داوەتەوە، ئەو بەڵگەنامانە بێن لە لاپەڕەی نەزانراوو کەم زانراو، کە بێگومان دەتوانن مێژووی نووسراوەی سەرچەرخی کورد دەوڵەمەندتر بکەن، وێڕای ئەو وانە گرنگانەی کە پێویستە ڕابەرانی کورد، بەر لە هەمووان، دەرسیان لێ وەربگرن.

بێگومان لەدایکبوونی هەموو ڕووداوێکی مێژوویی، وەك مەهاباد، پێویستی بە ژنێکی دوورو درێژی کەم هاوتایە، ئەو ژانەی کاتی خۆی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد بە ڕەوایی ناوی ((ژانی گەل)) ی بۆی هەڵبژاردووە. بەر لە هەر شتیش پێویستە ئەوە وەبیر بهێنینەوە کە هۆی دەرەکی ڕۆڵێکی گەورەی لە هەڵهاتنی خۆری مەهاباددا بینی، ئەگەر زۆرانبازیی نێوان زلهێزەکان و توندڕەویی نازییەکان و هەڵەکانی ڕەزا شای پەهلەوی نەبوونایە ئەو خۆرە پیرۆزە بۆی نەدەلوا خۆی لە گەردەلوولی ستەم و زۆرداری قوتار بکات.

لەگەڵ ئەوەیشدا نیشتمانپەروەرانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، لەپێناو ڕزگاریی گەل و نیشتماندا، عەودالی هەر دەرفەتێك بوون و لە هەر کوێیەکەوە بوویێت تا لەپێناو ئەو خەون و ئاواتەیاندا بیقۆزنەوە. بەهۆی هەڵە گەورەکەی هیتلەرەوە ،کە ساڵی ١٩٤١ هێرشی بردە سەر یەکیەتی سۆڤیەت و ڕووداوە گەورە یەك لەدوایەکەکانی ئەو هێرشە- بانگدانی جەنگ دژی ئەڵەمانیای نازیی لەلایەن سۆڤیەتەوەو داگیرکردنی خاکی ئێران لەلایەن هاوپەیمانەکانەوەو کەوتنی ڕەزا شا ڕێگەیان خۆش کرد بۆ هەڵهاتنی خۆری مەهاباد، ئەو ڕووداوە مێژووییە دەگمەنە لەناو کوردی کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا ڕاستەوخۆ دەنگی دایەوەو بووە هۆی شڵەژاندنێکی کەم وێنەی گشت فەرمانڕەوایانی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بە سەردا دابەش کرابوو.

## دەنگدانەوەی مەهاباد لە بەشەکانی تری کوردستاندا و هەڵوێستی بەریتانیاو یەکیەتی سۆڤیەت لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

بەڵگەنامەکانی ناو یەکێك لەو فایلانەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، کە پڕیە لە باس و خواسی دانسقەی ئەم بابەتە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١ەوە دەست پێ دەکات، وا دیارە مەهاباد، بەر لە هەمووان، فەرمانڕەوایانی تورکیای تۆقاندووە. یەکەم بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە، کە هەشتاو سێ بەڵگەنامەی تێدایە، بریتییە لە نامەیەکی ئەنتۆنی ئیدنی[1] وەزیری هەندەرانی بەریتانیا، کە ڕۆژی بیستی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤١، بۆ میخائیل مۆلۆتۆڤی[2] وەزیری هەندەرانی یەکیەتی سۆڤیەت ناردوویە، تیایدا باسی نیگەرانی زۆری تورکیای بۆ کردووە دەربارەی ئەوەی ((کوردەکان نیازیانە دەوڵەتێکی سەربەخۆ

---

(1) ڕۆبەرت ئەنتۆنی ئیدن (Robert Anthony Eden): ڕۆژی دوازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٨٧٩ لەدایك بووە، خوێندنی بەرزی بە سەرکەوتوویی تەواو کردووە، ساڵەکانی جەنگی یەکەم براوە بۆ سەربازی، هەر لەو ساڵانەدا براکەی لەلایەن ئەڵمانەکانەوە دەستگیر کراوە، ئیدن بۆ خۆی لە شەڕگەکانی فەرەنسە بریندار کراوەو ساڵی ١٩١٧ میدالی سەربازیی پێدراوە، لە پاییزی ١٩١٩ەوە دەستی کردە خوێندنی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، تایبەت فارسیو عەرەبی، ساڵی ١٩٢٢ بە پلەی شەرەف خوێندنی تەواو کردو یەکەمی دەورەکەی خۆی بوو، ئەندام پەرلەمانێکی چالاکی حیزبی موحافیزین بوو، لە سییەکانی سەدەی ڕابردووەوە، وەك دیپلۆماسییەکی سەرکەوتوو ناوبانگی دەرکرد، کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥ بووە وەزیری هەندەران، ساڵەکانی جەنگی دووەم وەزیری هەندەرانی وەزارەتەکەی چەرچڵ بوو، ناوەندی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بووە سەرەك وەزیران، گەلێك وتارو کتێبی هەیە، وێڕای یادداشتەکانی، کە لە چەند بەرگێکدا چاپ کراون، ژمارەیەکی زۆر میدالو خەلاتی بەرزی پێ دراوە، ڕۆژی بیستو شەشی تەموزی ساڵی ١٩٦١ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:

(Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 17, Oxford University Press, 2004, PP. 664-679.

(2) میخائیل مۆلۆتۆڤ: وەزیری هەندەرانی ئەوسای یەکیەتی سۆڤیەتو یەکێك لە ڕەهبەرە دەستڕۆیشتووەکانی ئەو وڵاتە بوو لە ڕۆژگاری ستالیندا (١٩٢٤– ١٩٥٣).

نلیمەزرێنن))، مۆلۆتۆف لە وەڵامەکەی خۆیدا، کە ڕۆژی یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ ناردوویە بۆ ئیدن، دەڵێت ((یەکیەتی سۆڤیەت نە ئاگاداری نیازێکی وای کوردەو نە ئاگاداری هەراوبگری کوردی تورکیایە))[3].

سێ بەڵگەنامەی تری هەمان فایل بۆ ئەم بابەتە تەرخان کراون، وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی تورکیا ڕۆژانی دوو و پێنج و یازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ سێ نامە دەنێرێت بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی بارودۆخی کوردستانی ئێران، لەندەن حەزی کردووە مۆسکۆ بۆ خۆی ئەنقەرە دڵنیا بکات دەربارەی وەزعی کوردستان. شایانی باسە ئەو بەڵگەنامانە لەناو فایلەکەدا بەم ناونیشانەوە هەڵگیراون ((چالاکییەکانی کوردو هەڵوێستی حوکمەتی تورکیا))[4].

هەڵبەت حوکمەتی بەریتانی بۆ خۆیشی عەودالی ئەوە بوو لە نزیکەوە ئاگاداری گشت ئاڵو گۆڕەکانی مەهاباد بێت. ڕۆژی نۆی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ بۆلاردی[5] باڵوێزی بەریتانی لە تاران نامەیەکی تایبەتیی دەنێرێت بۆ وەزارەتی

---

(3)N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, Confidential, E 60/21/34, December 20, 1941 and January 1, 1942, PP. 3-9.

(4)Ibid, Kurdish Activities, attitude of the The Turkish Government, PP. 10-12.

(5) سێر ڕیدەر ولیام بۆلارد (Sir Rrader William Bullard): ڕۆژی پێنجی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٨٥ لە لەندەن لەدایك بووە، یەکێکە لە دیپلۆماسییە هەرە بەناوبانگەکانی بەریتانیاو جیهان لە سەدەی بیستەمدا، گەلێك لایەنی ژیانو کارەکانی سەرنج ڕادەکێشن، یەکەم کاری دیپلۆماسیی لە ئەستەموول لە دواڕۆژەکانی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا بووە، دوای ئەوە بۆتە جێگری کونسوڵ لە تەرابزۆنو ئەرزڕۆمو بەو هۆیەوە کوردیشی لە نزیکەوە ناسیوە، کە هاوینی ساڵی ١٩١٤ کراوەتە کونسوڵی بەریتانی لە بەسرە بە کەڵەك لە دیاربەکرەوە بە دیجلەدا هاتۆتە بەغداو لەوێشەوە بە پاپۆڕ چۆتە بەسرە، شەش ساڵ لە عێراق مایەوە، ئینجا تا ساڵی ١٩٣٠ بە ڕیز لە عەرەبیی سعودیو یۆنانو حەبەشە کاری کردووە، دوای ئەوە چوار ساڵی وەك کونسوڵ لە مۆسکۆو لینینگراد بردە سەرو ئینجا تا سەرەتای جەنگی دووەمی جیهان بەڕیز بووە کارمەندی باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە ستراژبورغ و ڕەباتو بێروتو جەددەو لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩یشدا، واتا سەرەتای جەنگی دووەم، بووە وەزیر موفەوەز لە تارانو ساڵی ١٩٤٣ هەر لەوێ بووە باڵوێز، لەو ساڵانەدا تاران شتی گەورەی بە خۆیەوە بینی، هی وەك ((کۆنفرانسی سێ گەورەکە)) (The Big Three) چەرچڵو

هەندەران لە لەندەن دەربارەی هەڵوێستی یەکیەتی سۆڤیەت بەرانبەر بە کوردو بارودۆخی شاری ڕەزائییە (ورمێ)، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕاوی خاڵە سەرەکییەکانی ئەو نامەیەیە:

((لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ر. بۆلارد،

ژمارە ٤٢،

ڕاستەوخۆ.

١- بروسکەی ژمارە ٢٦٨٤تان و بروسکەی ژمارە ٦٠٦ی من بۆ ئەنقەرە.

باڵوێزی تورکیا بروسکەیەکی نیشان دام کە لە کۆنسوڵی تورکیاوە لە ڕەزائییە پێی گەیشتووە، ئەمەی لای خوارەوە ناوەڕۆکییە:

((کوردو ئەرمەن و ئاشووری پارتییەکیان بە ناوی ((ڕزگاری))ەوە دامەزراندوە کە هەڕەشە لە فەرمانبەرانی حوکمەت دەکات بۆ ئەوەی ڕەزائییە بەجێبهێڵن. ئەفسەرێکی پۆلیس و ئەو ئاشوورییانەی کە قەبوڵ ناکەن بدەنە پاڵ ئەم پارتییە کوژراون. باندە چەکدارەکان لە شاری ڕەزائییەو دەوروبەریدا تالانیی دەکەن. ڕۆژی سی و یەکی کانوونی یەکەمی ١٩٤١ سۆڤیەتەکان فەرمانیان داوەتە حاکمی شار ژمارەی پۆلیسی ڕەزائییە لە سەدەوە بهێنێتە خوارێ بۆ چل و پێنج ئەگینا بۆ خۆیان چەکی پتر لە چل و پێنج کەسیان دادەماڵن.

---

ڕۆزڤلت و ستالین، لەو کۆنفرانسەدا چەرچل لەنێوان ستالین و ڕۆزڤلتدا دانیشتبوو، بەرانبەریشیان بۆلارد لە نێوان فۆرشیلۆڤو مۆلۆتۆڤدا دانیشتبوو، لەسەر ڕۆڵی گەورەی لەو کۆنفرانسەدا بۆلارد خەڵات کرا. لەدوای جەنگەوە تەقاوید بوو، بەڵام هەر سەرقاڵی کاری دیپلۆماسیی بوو، لەنێوان ساڵانی ١٩٥١-١٩٥٦دا بووە بەڕێوەبەری ((مەعهەدی دیراساتی کۆمۆنوێلث)) لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، نووسینی زۆرە. ساڵی ١٩٦١ بیرەوەرییەکانی خۆی بەم ناونیشانەوە بڵاو کردەوە ((The Camels must Go (حوشترەکان دەبێت بڕۆن))، ئەدەب دۆست و زمانزان بوو، گەلێك زمانی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتیی دەزانی، ژمارەیەکی زۆر شەهادەی فەخریی پێدرابوو، ڕۆژی بیست و چواری مایسی ساڵی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:

((Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 18, Oxford University Press, 2004, PP.603-605.

٢- وەزیری هەندەرانی (ئێران- ک.م) ئەو هەواڵانەی پێ ڕاگەیاندم، گوتیشی لە ماکۆدا سۆڤیەتییەکان فەرمانیان داوەتە فەرمانبەرە فارسەکان ئەو شارە جێ بهێڵن چونکە ئازەری تاکە زوبانی فەرمیی ئەو شارەیە.

٣- من هیچ کاتێك هەواڵ بە باڵوێزی سۆڤیەتی ڕاناگەیەنم چونکە بڕوام بە ئەمانەتی نییە، وێڕای ئەوەی باڵوێزخانەکەیان گەلێك جێگەی گومانە، تەنانەت خودی وەزیری هەندەرانی (ئێران- ک.م.) بۆ خۆمی گێڕاوەتەوە چۆن باڵوێزی سۆڤیەتی چەند جارێك گلەیی لای وەزیر کردووەو پێی گووتووە: ئێوە هەمیشە لۆمەی سۆڤیەتییەکان دەکەن بێ ئەوەی جارێکیش چییە دژی بەریتانییەکان قسە بکەن. هەرچۆن بێت من، بە ڕەزامەندیی باڵوێزی تورکیا، قسەکانی کۆنسوڵی تورکم کردۆتە بنەمای قسەکانم لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەتدا، ئەو پاساوەیەش کە بۆم هێناوەتەوە ئەوەیە کە جیاوازیی سیاسیی نێوان ئێمەو ئەوان لەوانەیە کێشەمان بۆ دروست بکات، تایبەت ئەگەر بێتو لایەنێکی تر دەست لەو کارە وەردات. ئەوەیشم وەبیر باڵوێز هێنایەوە کە گفتم پێ داوە دەربارەی سیاسەتی خۆمان لەمەڕ کورد ئاگاداری بکەمو پێشم گووت: ئامادەم بە خۆشییەوە سەبارەت ئەوەو هەر لایەنێکی تری سیاسەتمان بەرانبەر ئێران ئاگاداری بکەم. باڵوێز نەیپرسی من چ مافێکم هەیە بابەتی سیاسەتی سۆڤیەتیی لە ئازەربایجان لەگەڵی بووروژێنم، بەڵام پشتی نەگرتم لەوەدا کە گووتم: ئەوە هەڵەی من بوو (چونکە شتێك نییە نهێنی بێت)[6].

٤- باڵوێزی سۆڤیەتی تۆمەتی ئەوەی دایە پاڵ حاکمی ڕەزائییە کە پیاوێکی موالی نییەو وەك نموونە ئەوەی گێڕایەوە کە چەکی داوەتە ژمارەیەك کورد لە گۆشەنیگای ئەوەوە گوایە ئەوانە کوردی (چاکن)[7]. باڵوێز خودی خۆی بەوە موقتەنیعە (چونکە هێشتا تەعلیماتی وەرنەگرتووەتەوە سەبارەت

---

(6) بەو جۆرە ئەو دوو وشەیە (group undec) خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە کە لە پێوەندیی سیتۆماسیدا بۆ حاڵەتێك بەکار دێت کە پێویستی بە شفرە نەبێت.

(7) لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا ئەو وشەیە بەم جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە:
For instance, he had given arms to some of the Kurds on the ground that they were ((good)) Kurds.

پرسیارەکانی لە دەزگا بەرپرسە سۆڤیەتییەکان) کە ئەگەر شتێکی وەك بزووتنەوەی رزگاریخوازیی لە ئارادا بێت ئەوە کارێکی عەفەوییە، یا کردەی حاکمە بۆ مەبەستە تایبەتییەکانی خۆی. لێشم پرسی بەرپرسە سۆڤیەتییەکان پشت بە چ بۆچوونێك بڕیاری کەم کردنەوەی ژمارەی پۆلیس‌و جەندرمەی ڕەزائییەیان داوە، بۆشم روون کردەوە کە بەرپرسانی بەریتانی کارێکی وایان لەو ناوچانەدا نەکردووە کە بەدەست ئەوانەوەن نەبا حوکمەتی ئێران ئەوە بکاتە بەڵگەی بێ دەسەڵاتیی پاراستنی ئاسایشی ناوچەکە. بالوێز گووتی: دەزگاکانی ئاسایش لەگەڵ هاتنی هێزە چەکدارەکانی سۆڤیەتدا هەموویان رووخان، کاتێکیش وەزیری ناوخۆی (ئێران- ك.م.) داوای کرد رێگە بدرێتە حوکمەتەکەی بۆ دامەزراندنەوەی ئەو دەزگایانە لێیم پرسی چەند ژمارەی پۆلیس‌و جەندرمە پێویستن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە، ئەویش ئەو ژمارانەی بۆ ڕەزائییە گووت، بەڵام گووتیشی بۆ هەندێك ناوچە حوکمەت بە پێویستی دەزانێت ئەو ژمارەیە زۆرتر بێت، ئەوەی بەرپرسانی سۆڤیەت ڕازی بوون لەسەری.

٥- وەزیری هەندەرانی (ئێران- ك.م.) وێنەی ئەو تێبینییانەی بۆ ناردووم کە بیدەمە بالوێزی سۆڤیەتی سەبارەت رووداوەکانی ڕەزائییەو ماکۆ، دەشڵێت حوکمەتی ئێران پێشنیاری کردووە لەشکر بنێرێتە ئەو ناوچانە. دواتریش بروسکەتان دەربارەی ئەم بابەتە بۆ دەنێرم))[8].

دوای ئەمە، دەربارەی هەمان بابەت، بروسکەیەکی بێ ئەندازە نهێنی دانراوە کە بەر لە ئەدرێس‌و ژمارەو هەر شتێکی دی ئەم دوو دێرە لەسەری سەرەوەی لاپەڕەکەدا نووسراوە کە تاوەکو ئەو ڕۆژەی ئەم بروسکەیەم دی لەناو ئەو هەزاران بەڵگەنامەو یادداشت‌و بروسکانەدا کە من دیومن، لە وێنەیم بەرچاو نەکەوتووە:

---

(8)N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, from Tehran To Foreign Office, Sir R. Bullard, No. 42, 9th January, 1942, Immediat, PP. 14-15.

((ئەم بروسکەیە یەکجار نهێنییەو پێویستە ئەو کارمەندەی وەری دەگرێت هەڵیبگرێت‌و نەیدات بە کەس))[9].

دوا بەدوای ئەمە ناوەڕۆکی بروسکەکە دەست پێ دەکات کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

((لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ر. بۆلارد،

ژمارە ٤٨،

٩ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی بۆ:

دەلهی‌و ئەنقەرە ژمارە ٦و قاهیرەو بەغدا.

١- بروسکەی ژمارە ١٢٥٨تان.

حوکمەتی ئێران لەو بڕوایە دایە کە بزووتنەوە سەربازییەکانی ئەم دواییانە بۆ ملومیەك ئەو مەترسییەی نەهێشت کە لە کورد لە ئارادا بوو. هەمان کات بڵاوکردنەوەی ئەو ڕاگەیاندنەمان، کە سیاسەتی ئێمە هەوڵ دەدات، هانی حوکمەتی ئێران بدات دەسەڵاتی بگێڕێتەوە کوردستان‌و هەموو سکاڵایەکی ڕەوا چارەسەر بکات قەناعەتی بە دڵسۆزیی ئێمە بە حوکمەتی ئێران کردو ئیدیعاکانی ڕەهبەرە کوردەکانی بە درۆ خستەوە کە گوایە حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا پشتی بزووتنەوەی کوردی دەگرێت، ئەوەی ڕەهبەرە کوردەکان بەوانەیان دەگووت کە دوویان کەوتوون.

٢- وەزیری هەندەرانی (ئێران- ك.م.) دانی بەوەدا نا کە سەرکەوتنەکانی حوکمەتی ئێران بەسەر کورددا چارەسەر نین، بەڵکو پێویستە هۆکانی ناڕەزاییان چارەسەر بکرێن. هەرچۆن بێت لەو بڕوایەدا نیم کە بەرپرسیارە سەربازییە (ئێرانییەکان- ك.م.) لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا بن. داوا لە حوکمەتی

---

(9) ئەمە دەقی ئینگلیزییەکەیەتی:

((This telegram is of particular secret and should be retained by the authorized recipent and no passed on)).

ئێران دەکەم دەربارەی نەخشەی چاکسازییەکانیان (لە کوردستان – ک.م.) ئاگادارمان بکەن چونکە دەمەوێت ئێوە زانیاریتان دەربارەیان هەبێت.

٣- ئەو پێی وایە، ئەوەی لە پەرەگرافی چواری بروسکەکەتدا ئاماژەت بۆ مەترسیی ڕوودانی کردووە ئێستا لەوانە نییە ڕوو بدات، بەڵام من پێش دوازدەی کانوونی دووەم لەگەڵ جەنەڕاڵ قوینان (General Quinan) باسی ئەوە دەکەم. بە داخەوە کوردێك نییە کە ڕێزی گشتیی هەبێت[10] تاوەکو بکرێتە حاکمی کوردستان))[11].

دوای ئەوە نۆرە دێتە سەر باڵوێزی بەریتانیا لە ئەنقەرە وەزیری هەندەرانی تورکیا ببینێتو دەربارەی هەمان بابەت ئاڵو گۆڕی بۆچوونەکانیان بکەن وەك لەم بەڵگەنامەیەدا ڕەنگی داوەتەوە:

((لە تورکیاوە،

لە ئەنقەرەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر هـ. کناتچبوول هۆگێسێن،

ژمارە ٦٩،

١٠ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی بۆ کوییبەشێڤ ژمارە ٣و

تاران ژمارە ٥و بەغدا ژمارە ٩و

بێروت ژمارە ٨و قاهیرە ژمارە ٢٩،

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەین وێنەی بروسکەی ژمارە سێمان بۆ کوییبەشێڤ و وێنەی بروسکەی ژمارە هەشتیشمان بۆ بێروت بنێرن.

١. لە دیدەنی ئیمڕۆمدا لەگەڵ وەزیری هەندەرانی (تورکیادا– ک.م.) باسی پرسی کوردم لە گۆشەنیگای ناوەڕۆکی پەرەگرافی دووەمی بروسکەی ژمارە بیستو

---

(10) دیارە مەبەستی ئەو کوردانەیە کە سەر بە تاران، یا لەندەنن.

(11) N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, from Tehran To Foreign Office, Sir R. Bullard, No.48, 9th January, 1942, Reported to Foreign New Delhi, Angora No.6, Cairo Saving, Baghdad Saving, P.17.

حیتی مۆسکۆوه کرد. پێیم گووت: مۆلۆتۆڤ دەڵێت هیچ ئەساسێك نییە بۆ گومان
ـرـ ـە سیاسـەتی سـۆڤیەت، پێیـشم ڕاگەیانـد کـە جـەنابتان یادداشـتێکتان
حریرەی بابەتەکە داوەتە ستالین، دەبێت تەعلیمات بۆ روونکردنەوەی ئەو باسە
حرچێت، دیارە ئەو کات شتەکان باشتر روون دەبنەوە. هەروەها باسی ئەوەیشم
کرد کە مۆلۆتۆڤ گوتوویە: هیچ هۆیـەکی سیاسـیی گرنگ لـە ئـارادا نییـە بـۆ
حوضیت تا نیازی بێت سیاسەتی خۆی بشارێتەوە و هیچ هۆیەکیش بـۆ نیگـەرانی
حوـ نییە.
- هەروەها وەزیری هەندەرانی تورکیام لـە بروسـکەی ژمـارە دووسـەدو نـەوەتو
ینجی کوییەشێڤ ئاگادار کـرد، لـە وەڵامـدا گـوتی: ئـەویش ئـەو بروسـکەیەی
یگەیشتووە کە پێشنیار دەکات حوکمەتی تورکیا بۆ خۆی راستەوخۆ پێوەنـدیی
ـ حکومەتی سۆڤیەتەوە بکات.
- وەزیری هەندەران قسەکانمی کەمێك بـە گومانـەوە وەرگـرتو گـووتی: گـەلێك
ـی بە وشەی (سیاسەت) دەکرێت. لە وەڵامـدا منـیش پێـیم گـوت: ئـەم وشـەیە
حوستە هـەموو شـتێك بگرێتـەوە بـۆ داپۆشـینیی ئـەوەی نـاو نـراوە پیلانـی
سـەربەخۆیی کـورد، یـان چـالاکیی دژی ئـەو دەوڵەتانـەی کوردیـان تێـدا دەژی.
زیری هەندەران قسەکەی خۆی دووپات نەکردەوە.
- هەرچی دەربارەی کوردی عێراقە، وەزیرم ئاگاداری ناوەڕۆکی بروسکەی ژمارە
هەزارو سێ سەدو شەستو پێنجی بەغدا کرد. ئەوەیشم پێی راگەیاند کە حەفتەی
پێشوو کاتێك لـە بەغدا بـووم قـسەم لەگـەڵ بـاڵوێزی حوکمـەتی خـاوەن شـکۆی
بەریتانیاو سـەرکردەی بـاڵای هێزەکـانی (بـەریتانیا لـە عـیراق- ك.م.) کـردو
هەردووکیان گووتیان: کـوردی عـیراق دابـین کـراونو هەردووکیـشیان پێیـان وایـە
کوردی عیراق سەرچاوە نین بۆ هیچ جۆرە نیگەرانییەك (قەلەق).
- دەربـارەی کـوردی سـووریاش پێـیم گـووت کـە لـە حەڵـەب بـووم کۆڵـۆنێڵ
ستینستۆنم دیو پێی ڕاگەیاندم کە جەلادەت بەدرخان ئەو گفتەی خۆی دووپـات
کـردەوە، کـە لـە ئەسـڵدا دابوویـە جەنـەراڵ وێیگانـد (General Weygand)
دەربارەی ئەوەی کێشە بۆ تورکە هاوپەیمانەکانمان دروست نەکەن.

٦. بە گشتی وەزیری هەندەرانی تورکیا لە بیروبۆچوونیدا دەربارەی کوردی هەموو شوێن، تەنها کوردی ئێران نەبێت، میانڕەو بوو.

٧. ئەو هەمان کات قەڵەقێکی زۆری دەربارەی چالاکییەکانی رووسیا لە ئازەربایجان دەربڕی.

لەگەڵ ئەم بروسکەیەدا بروسکەی ژمارە پەنجاو حەوتیش بنێرن بۆ کویبەشێڤو بروسکەی ژمارە هەشتیش بۆ بێروت))[12].

ژمارەیەك بەڵگەنامەی تریش لە هەمان فایلدا بۆ هەمان بابەت تەرخان کراوە بەڵام بێ ئەوەی شتێکی نوێیان تێدا بێت[13].

لە لاپەڕە بیستو حەوتی هەمان فایلدا ئەم بروسکەیەشی تێدایە کە خودی وەزیری هەندەرانی بەریتانی ئەنتۆنی ئیدن ناردوویە بۆ س. کریپس لە کویبەشێف، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

((نهێنی،

إی ٣٢١/٢١/٣٤،

لە: میستەر ئیدنەوە،

بۆ: سێر کریپس، کویبەشێڤ،

ژمارە ١٦،

وەزارەتی هەندەران،

١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢.

سێر: لە کاتی گفتوگۆی ئەم ئێوارەیەمدا لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەتی لە لەندەن– ك.م.) پێیم گوت: کە لە مۆسکۆ بووم لەگەڵ میخائیل مۆلۆتۆفدا قسەم دەربارەی کورد کردو لەو بارەیەوە تێبینییەکم پێی گووت کە بریتییە لەوەی ئەم مەسەلەیە هێشتا نەچۆتە خانەی بەڵگەنامەیەکی دیپلۆماسییەوە، بەڵکو بریتی بوو

---

[12] Ibid, From Turkey, From Angora to Foreign Office, Sir Knatchbull Hungessen, No. [illegible]. 10th January, 1942, Reported to Kuibyshev No.3, Baghdad, No.9, Beirut No. [illegible], PP. 19-20.

[13] Ibid, PP. 21-26.

ە تێبینییەك كە بۆ من ئامادە كرابوو، بۆیەكا بە شێوازێك دانەڕێژرابوو بشێت بۆ ئەوەی پێشكەشی حوكمەتێكی بیانی بكرێت. ئێمە ئێستە وەڵامی مۆڵۆتۆڤمان بۆ هێناوەتەوە كە تا ڕادەیەك بە شێوازێكی ڕەق داڕێژراوە، دوور نییە ئەوەیش ئەنجامی ئەو هەڵەیەی من بێت كە بەو شێوازە بەڵگەنامەیەكی (فەرمیم– ك.م.) پێشكەش بە حوكمەتی سۆڤیەتی كردووە، لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەیش بێت كە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتی دروست لە مەسەلەكە نەگەیشتووە. م. مایسكی[14] پێكەنیو گوتی: من تەواو بەو جۆرە تێگەیشتمو هەڵبەت میخائیل مۆڵۆتۆڤیش بە هەمان جۆر تێگەیشتووە، گوتیشی هەوڵ دەدات هەموو لایەنەكانی ئەو كارە بۆ حوكمەتەكەی خۆی ڕوون بكاتەوە. دڵسۆزتان ئەنتۆنی ئیدن))[15].

ئەم بەڵگەنامەیەش كە ڕۆژی هەژدەی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی لە لەندەنەوە ناردوویە بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران بە هەمان شێواز داڕێژراوە، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەكەیەتی:

((ئەم بروسكەیە یەكجار نهێنییەو پێویستە ئەو كارمەندەی وەری دەگرێت هەڵیبگرێتو نەیدات بە كەس.

بۆ ئێران،

لە وەزارەتی هەندەرانەوە،

بۆ تاران،

ژمارە ٩٤،

١٨ی كانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی بۆ:

ئەنقەرە ژمارە ١٢١،

كویبیەشێف ژمارە ١٠٦.

---

(14) دیارە مەبەست لە م. مایسكی (M. Maisky) ناوی باڵوێزی سۆڤیەتییە لە لەندەن.

(15)N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, Secret, E 321/21/34 Mr. Eden to Sir S. Cripp (Kuibyshev), No.16, Foreign Office, January 13, 1942, pp. 27-29.

١- كە لە مۆسكۆ بووم تێبینییەکم دەربارەی وەزعی کورد پێشکەشی م. مۆلۆتۆڤ کرد کە ئەساسەکەی بروسکەکانی تۆو سێر هـ. کناچبوول هەگێسێن بوو، ئەو تێبینییەش بۆ بەکارهێنانی من ئامادە کرابوو (واتا نەك بۆ ئەوەی لەگەڵ سۆڤیەتییەکاندا باسی بکەم- ك.م.)، لەبەر ئەوەیش کە بۆ پێوەندی کردن بە حوکمەتی سۆڤیەتییەوە ئامادە نەکرابوو بۆیەکا بە شێوازێکی ڕێکوپێك دانەڕێژرابوو، ئەم عیبارەتەی تێکەوتبوو:

((بەلای سێر بۆلاردەوە گەورەترین تەگەرە لەم بووارەدا ئەوەیە کە سیاسەتی سیاسیی سۆڤیەتی[16] لەو ناوچە داگیرکراوەی (ئێراندا- ك.م.) کە بەدەست سۆڤیەتەوەیە کاروباری لەلایەن دەزگایەکەوە دەبرێت بەڕێوە کە بالوێزی سۆڤیەتی لە تاران کەم قسەی لای دەڕوات)).

یەکسەر ئەم هەڵوێستەم بۆ م. مایسکیو م. مۆلۆتۆڤ روون کردەوەو هەردووکیان دروست هەڵیانسەنگاند، بەلام بۆ ئەوەی هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی نادروست نەیەتە کایەوە، کە لەوانە بێت کار بکاتە پێوەندیی تۆ بە هاوکارە سۆڤیەتییەکەتەوە (واتا بالوێزی سۆڤیەتی لە تاران- ك.م.)، من جارێکی دی ئەوەی ڕوویدا بۆ م. مایسکیم روون کردەوە. پێشم گووت ڕاستێکەی شێوازی توندی داڕشتنی ئەو وەلامەی من لە حوکمەتی سۆڤیەتەوە پێم گەیشت (بڕوانە بروسکەی ژمارە سەدو چوارم بۆ ئەنقەرە) لەوانەیە ئەنجامی ئەوە بێت کە وەزارەتی هەندەرانی سۆڤیەتی دروست لە هەڵوێستەکە نەگەیشتبوو. م. مایسکی جەختی ئەوەی کردەوە کە چ خۆیو چ میخائیل مۆلۆتۆڤ تەواو دروست لە وەزعەکە گەیشتوونو گفتیشی دا هەموو لایەنەکانی (ئەم بابەتە- ك.م.) بۆ دەزگاکانی حوکمەتەکەی بە ڕێکوپێکی روون بکاتەوە))[17].

---

(16) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە ئینگلیزی وا هاتووە:

(The main difficulty is that Soviet Political Policy…))

(17)Ibid, To Persia, from Foreign Office to Tehran, No. 49, 18th January, 1942, Reported to Angora No. 121, Kuibyshev No. 106, PP. 30-31



پێشەوا قازی محەمەد

ئاڵو گۆڕە خێراکانی ئەو ڕۆژانەی ورمێو دەوروبەری، کە سەرەتای وەرچەرخانێکی نوێ بوون، سەرنجی گەلێك لایەنی دەوڵەتییان ڕاکێشا. بەڵگەنامەی داهاتووی ناو هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی سێر ر. بۆلارد کە ڕۆژی چواردەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ لە تارانەوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتەکەی لە لەندەن دەربارەی ئەم بابەتە، وەك لە دەقی وەرگێڕانەکەیدا دەیبینین:

((لە ئێرانەوە،

لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ر. بۆلارد،

ژمارە ٦٨،

١٤ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی بۆ:

حوکمەتی هندو ئەنقەرەو بەغداو قاهیرە، راستەوخۆ.

١- تکایە وێنەی بنێرن بۆ کوییەشێف لەگەڵ بروسکەی ژمارە بیستو دووەمدا. ئەمەی لای خوارەوەمان لە تەورێزەوە پێ گەیشتووە:

نزیکەی چوار سەد کەس لە دانیشتوانی ڕەزائییە کە لە ئەشرافو بازرگانو کارمەندانی میری پێکهاتوون دوێنێکە گەیشتنە ئێرە (واتا تەورێز- ك. م.) کە لەتاو وەزعی ئەوێ هەڵهاتوون. لە رێگەی سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە زانیومە کە چوار جەندرمە پێرێ لەسەر شەقامەکانی ڕەزائییە کوژراون، هەروەها چوار کەسیش لە کارمەندانی کۆمپانیای شەمەندەفەری بەها، وێڕای کوشتنی بێ وچانی خەڵکی بە هاندانی ئەو دەزگا تیرۆرستە بێ بەزەییانەی لە هەموو ئایینو قەومێکیان تێدایەو ئامانجیان تێکدانی تەختو تاراجی سەرجەمی دەزگە کارگێڕییەکانی تارانو دامەزراندنی حوکمەتێکی ناوچەییە لەژێر چاودێری سۆڤیەتدا. سۆڤیەتییەکان دەورووبەری دوو هەزار تا سێ هەزار سەربازیان لەوێ هەیە، بەڵام تەدەخولیان نەکردووە. حاکمی گشتی ڕەزائییەش داوای یاریدەی لە تاران کردووە چونکە ئاسایشی گشتی نەماوە.

٢- پێم وایە ئەو هەواڵانەی سەرەوە ڕاستنو هیچ گەورە نەکراون، وێنەی بۆ کوییەشێف- ژمارە هەشتاو دووی ڕۆژی پازدەی کانوونی دووەمی وەزارەتی هەندەران))[18].

(18) Ibid, From Persia, from Tehran to Foreign Office, Sir R. Bullard, No. 68, 14th January, 1942, Reported to Government of India, Angora, Baghdad, Cairo, Immediat, PP. 32-33.

سوی ئەوە گرنگترین زنجیرەی ئەم فایلە دەست پێ‌دەکات و بریتییە لە حەڤدە
شیەرە (ل ٣٤–٥١) کە سەرجەمیان بەڵگەنامەی بایەخدارن، چونکە بۆ بابەتی
سیسەتی یەکیەتی سۆڤیەت بەرانبەر کوردو ئازەر، لەو قۆناغەی جەنگی دووەمدا،
تەرخان کراون. شایەنی باسە ئەو حەڤدە لاپەڕەیە هێند خوێنراونەتەوەو هێند
سەرنجیان لەسەر نووسراوەو هێند بۆ وێنەگرتن یا بۆ هەر مەبەستێکی تر لە
صیەکە دەرهێنراون کە بەشێکیان پەرپووت بوونو ڕیزی دانانەوەیان لەناو
صیەکەدا تەواو شێوێنرا بوو. وا لە خوارەوە بەڵگەنامە هەرە گرنگەکانیان، تایبەت
تەوتەیان کە لە رووی ناوەرۆکەوە دووپات بوونەوەیان تێدا نییە، وەك خۆیان
سکەینە کوردی، لەبەر دراویی چەند شوێنێکی لاپەڕەکانیش ناچاربووین ئەو
ڕستنە بپەڕێنین کە شوێنەکانیان لە بەڵگەنامەکاندا دراوە.

نووەم بەڵگەنامەی ئەم زنجیرەیە لە باڵوێزخانەی بەریتانییەوە لە تاران ڕۆژی
یەزدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ نێردراوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی
ە ئەندەن، بریتییە لە دوو بەش، بەشی یەکەمیان سەعات یازدەو چل دەقیقە
ێردراوەو بەشی دووەمیشیان سەعات دوو و نیوی هەمان ڕۆژ نێردراوە، وا لە
خوارەوە دەقی وەرگێڕاوی هەردووك بەشەکە پێشکەش دەکەین:

بەشی یەکەم:

بەشی یەکەمی ئەو بەڵگەنامەیە بریتییە لە چوار خاڵ، کە لە لاپەڕەیەکی
گەورەی دوو دیویدا تۆمار کراون، ئەمەیش دەقی وەرگێڕانەکەیانە:

((لە ئێرانەوە،

لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ڕ. بۆلارد،

ژمارە ٧٦،

١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی بۆ:

حوکمەتی هند ژمارە ٣٦،

قاهیرە ژمارە ١٣،

بەغدا ژمارە ٢٣،

ئەنقەرە ژمارە ١١،

زۆر پەلە[19]

تکایە وێنەی ئەم نامەیە لەگەڵ بروسکەی ژمارە بیست و پێنجمدا بنێرن بۆ کویبەشێف.

نیشانە بە هەردووک بروسکەم ژمارە ٤٢و ژمارە ٦٨،

١- باڵوێزی تورکیا (لە تاران- ك.م.) و حوکمەتی ئێران ڕۆژی سیازدەی کانوونی دووەم بە رەسمی پێیان ڕاگەیەندرا کە کوردەکان رەزائییەیان داگیر کردووەو فەرمانبەرە ئێرانییەکان لەوێ هەڵهاتوون. هەردووک لایان بە پێویستی دەزانن (لە ڕەزائییە- ك.م.) ئینزار جاڕ بدرێت، بەڵام بڕواننە ناوەڕۆکی ئەو بروسکەیەی کۆنسوڵی حوکمەتی خاوەن شکۆ لە تەورێزەوە ناردوویەو لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە. بەر لە بینینی ئەو بروسکەیە لە باڵوێزی سۆڤیەتم پرسی کە ئایا ئەو ئاگاداری هەواڵەکانی رەزائییەیە، لە وەڵامدا گوتی: حاکمی شار ئیستیقالەی کردووەو ئەوێی جێهێشتووەو ئەو دەنگوباوێکی وای بڵاوکردۆتەوە، گووتیشی ئێستاکە لەوێ تەواو هێمنە. هەرچی باڵوێزی تورکیاو حوکمەتی ئێرانە لەو بڕوایەدان بارودۆخەکە بەو جۆرە نییە وەك رووس دەڵێن و زۆر بەڵگەش هەن کە ئەوە دەسەلمێنن.

٢- دەمێکە ئاماژەم بۆ ئەوە کردووە کە ئەوەی رووس دەیڵێن گوایە ئەوان دەست لە کاروباری ناوخۆ وەرنادەن تەواو پێچەوانەی ئەوەیە کە ئێمە دەیزانین. سەرەتای ئیحتیلال دوای ئەوەی چەکی جەندرمەو پۆلیسی شاریان داماڵی قایل نەبوون هاریکاریی بکەن بۆ دامرکاندنەوەی ئاژاوەکە. لە ئازەربایجان کاربەدەستی بێ کەڵکیان داناوەو ڕێگەی بەڕەڵاییان داوەو لەوانەیشە هانی بدەن.

٣- بە پێی قسەی وەزیری هەندەرانی (ئێران- ك.م.) باڵوێزی سۆڤیەتی پێی گوتووە تاوەکو ئێستە چەند جارێك بروسکەی ناردۆتە مۆسکۆ دەربارەی ئەو داوایەی ئێران کە ڕێگەی پێ بدرێت ژمارەی جەندمەرکانی لە ناوچەکەدا زۆر بکات، بەڵام تاوەکو ئێستە وەڵامی وەرنەگرتۆتەوە. باڵوێزی (سۆڤیەتی لە

---

(19) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا خەتێك بەژێر (زۆر پەلە)کەدا هاتووە.

ـێـرلن ك.م.) هـيچ ناتوانێـت كـار بكاتـە سـەر بەرپرسـانی سـۆڤیەت لـە
ئۆمەربایجان، تەنانەت وەك پێویستیشە ئاگاداری وەزعەكەی ناكەن، ئەوەیش
ـرتێت كە ئایا مۆسكۆ خۆی ئەو سیاسەتە دادەرێژێت كە پێویستە (لـە
ـوچەكەدا– ك.م.) پەیرەو بكرێت، ئەوان ئامادەن بێ پـەروا وەپـشت گـوێی
ـەن گەر هەڵوێستێكی وا لەگـەڵ دیدیانـدا بگونجێت، بـەڵام بـە هـەر حـاڵ
ـمحەمتـە بەرپرسـیی كاریەدەسـتە ناوچـەییە سـۆڤیەتییەكان (لـەوەی روو
ـسـت– ك.م.) وەپشت گوێ بخرێت.
– یەكەم: بەرپرسە سۆڤیەتییەكان رێگەیان نەدا هێزەكانی سوپای ئێران بنكەی
حۆیلنیان هەبێت نەك لەو ناوچانەی ئێراندا (كە بەدەست ئەوانەوەن) بەڵكو لە
ـەموو ئـەو ناوچـانەی تـریش كـە كەوتوونەتـە بـاكووری قـەزوێن– تـاران–
مەشهەدموە، وێڕای ئەوەی ئێرانییەكان تەنانەت مافی ئەوەشیان نییە خۆیان
ـە تەنها لە رێگەی جەندرمەوە ئاسایشی ناوچەكە دابین بكەن.
دووەم: بە درێژایی چەند حەفتەیەك دوای داگیر كـردن (سۆڤیەتەكان– ك.م.)
ـیەكـین تەدەدایە جەندرمەو پۆلیسی ئێرانـی چـەك هـەڵبگرن. حوكمـەتی ئێرانـی
ـیەكـیتد ئەو شێوازەی سۆڤیەتییەكان لەم بووارەدا پەیڕەویان دەكـرد تـەنها بـە
ـــبـت جەندرمەوە ژمارەیان بـەپێی شـوێنە جیاوازەكـان دەستنیـشان كردبـوو،
ـەچی پۆلیسە هیچ تەحدیدێك بۆ ژمارەیان دانـەنرابوو، زۆریش نییـە فـەرمانیان
ـوە ژمارەی جەندرمە لەو رێژەیە كەمتر بێت كە سەرەتا لەسەری رێككەوتبوون.
ـەرە بـەروای خۆمـە كـە تەحدیـدی ژمـارەی پـۆلیس نـەكرابوو چـونكە هـیچ
ـیەكـوتننامەیـەكی نووسـراوە دەربـارەی ئـەو بابەتـە نییـە لـە چـەند خشتەیەكی
بەـڕووت بەولاوە كە لە چەند شوێنێك ئاماژە بۆ ژمارەیان كـراوە. هەرچۆن بێـت
ـەگەر سۆڤیەتەكان بە ڕاستی بیانەوێت، وەك دەڵـێن، یاریـدەی حوكمـەتی ئێـران
ـــەن ئەوسـاكە هـیچ هۆیـەكی پەسـەند لـە ئـارادا نابێـت رێگـە نـەدرێت ژمـارەی
ـەرمە زۆر بكرێت، تایبەت لـەو ناوچـانەدا كـە هـەموومان دەزانـین هـێمن نـین و
ـرێەشن لە وجـوودی هێـزی سـەربازی، بـە هـەمان دەسـتوور هـیچ ماناشـی نییـە
ـەرمان بدرێت دەربارەی كەم كردنـەوەی تەنانـەت ژمـارەی پۆلیـسیش. فـەرمانی
ـەم كردنەوەی ژمارەی پۆلیسی تەورێز لە چوار سەدەوە بۆ دوو سەدو پـەنجا لـە

کاتێکدا دەرچوو کە بە پێی راپۆرتەکانی کۆنسولی خاوەن شکۆ کوردەکان بێ پەروا بە تفەنگەوەو تەنانەت بە ڕەشاشیشەوە هاتوچۆیان دەکرد.

سێیەم: ڕەهبەرانی کورد بردرانە باکۆ بۆ سەردانێکی ڕۆشنبیریی[20]، وا دیارە زوو زوو دەعوەت و دەعوەتکاری دەکرێت.

چوارەم: هەرچەندە بەڵگەی تەواو دەربارەی ئەم خاڵە بە دەستەوە نییە، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە بەگشتی ئەفسەرو قۆمیسەری سۆڤیەتی ئەوتۆ هەن، ئەگەر دەزگا فەرمییە سۆڤیەتییەکانیش نەبێت، ئەوان هەر کەمینەکان دژی حوکمەتی ناوەندیو کرێکاران دژی پارەداران و باج دەران دژی میریو تورك زوبان دژی فارس زوبان و ڕاستێکە، هەموو مەیلێکی یەکنەگرتن هان دەدەن.

بەشی دووەمیش دێت.

وێنەی لێ نێردراوە بۆ کوییبەشێف بە ژمارە هەشتاو پێنجی وەزارەتی هەندەران)).[21]

بەشی دووەم:

بەشی دووەمی هەمان بەڵگەنامە بریتییە لە پێنج خاڵ کە لە لاپەڕەیەکی گەورەی دوو دیویدا تۆمار کراون و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕدراوەکەیانە:

((لە ئێرانەوە،

لە تارانەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ڕ. بۆلارد،

ژمارە ٧٦، بەشی دووەم،

١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

زۆر بە پەلە

(20) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت:((on a cultural visit)).

(21) N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, From Persia, From Tehran to Foreign Office, Sir R. Bullard, No.76, Reported to Government of India No. 36, Cairo No. 13, Baghdad No. 23, Angora No. 11, Most Immediat, P. 37.

٥- سەرەتا لەو بڕوایەدا بووم کە حوکمەتی سۆڤیەتی گشت کۆششێکی سەرەکیی خۆی بۆ دابەش کردنی ئێران دوا دەخات بۆ دوای قۆناغی کشانەوەو خۆی بە هەڵسەنگاندنی وەزعەکەوەو پەیدا کردنی سیخوڕەوە خەریک دەکات. هەرچۆن بێت ڕووداوەکانی ئەم دواییانەی ئازەربایجان ئاماژە بۆ نیازی دوورتر دەکەن، لەولایەشە ئەوەی من دەیڵێم بە زەبری فشاری چەند هۆیەکی وەك ئەمانەی لای خوارەوە ڕوو بدات:

یەکەم: سەرکەوتن بەسەر ئەڵەمانیادا، ئەوەی نەك تەنها سەنگی ڕووسیا لە ڕێی هاوپەیمانەکاندا زۆر دەکات بەڵکو دەشبێتە هۆی ئەوەی زۆر حسێب بۆ ئێران نەکات.

دووەم: پتەو کردنی جێگە پێی ڕووسیا لە ڕۆژهەڵاتی دوور[22].

سێیەم: لە نزیکەوە زانینی هەرەس هێنانی دەوڵەتی ئێرانی.

چوارەم: دڵسۆزی بەریتانییەکان بۆ حوکمەتی ئێران کە بووە هۆی ئەوەی پشتی کورد نەگرین، ئەوەی دەرفەتی بۆ ڕووسیا ڕەخساندووە کە خۆی بە دۆستیان لە قەڵەم بدات.

٦- هەرچۆن بێت هۆ بزوێنەکانی سیاسەتی سۆڤیەتی بەرانبەر ئازەربایجان بووە هۆی ئاڵۆزکردنی بارودۆخەکەو ئەوەیش بە مەرجێك چارەسەر دەکرێت ئەگەر بێتوو لە باکوور ڕەفتار لەگەڵ حوکمەتی ئێراندا بکرێت بەو شێوازەی ئێمە لە باشوور ڕەفتاری لەگەڵ دەکەین، واتا ڕێگەی بدرێتێ چەند بە پێویست دەزانن هێند جەندرمەو پۆلیسیان هەبێت کە پشت ئەستوور بن بە هێزێکی سەربازیی لەبار. ئەگەر ئەوە بەس بێت بێ هاریکاریی، یا هیچ نەبێت بێ دەست تێوەردانی بەرپرسانی سۆڤیەت...[23]. حوکمەتی سۆڤیەتی حەز ناکات ئەو

---

(22) وەك دەزانین لەو ڕۆژانەدا کۆمۆنیستەکانی چین بە سەرۆکایەتی ماوتسی تۆنگ لە گەرمەی خەباتدا بوون و جێ پێی شان کای شێکیان شلۆق کردبوو.

(23) لێرەدا لەنێو دوو کەوانی گەورەدا نووسراوە (grp. Undec) کە مەبەست لەوەیە بڵێت بۆمان نەخوێندرایەوە، دیارە لە باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران ئەوەی ڕەشنووسی بەڵگەنامەکەی چاپ

دەسەڵاتە کەمەیش بداتە حوکمەتی ئێران، بۆیەکا بە پێویستی دەزانم حوکمەتی خاوەن شکۆ ئەو بابەتە لەگەڵ حوکمەتی سۆڤیەتیدا، لەسەر بنەمای زانیارییەکانی تورك و کۆنسوڵخانەی خاوەن شکۆ لە تەوریز، بووروژێنێت.

٧- هەراو بگرەکەی ئازەربایجان زیانی زۆری بە ئێمەیش گەیاند، بەڵام ئەو ڕاستییەی پێویستە وەبەر چاو بگیرێت ئەوەیە کە حوکمەتی سۆڤیەتی چاوەڕوانی شتێکی وەها نەبوون...[24]. ئەو هەڵوێستەی من پێشنیارم کردووە پشت بەو سەرنجانە دەبەستێت کە لە پەرەگرافی داهاتوودا باسم کردوون لە خاڵی هەشتەمدا- ك.م.).

٨- یەکەم: ماندانی کورد لە باکوور باری سەرشانی بەریتانییەکان لە باشوور قورستر دەکات. بە هەمان دەستوور کاربەدەستە سەربازییە ئێرانییەکان دەترسێن بەردەوام بن لەسەر کارە سەربازییەکانیان بەرەو باکوور نەبا ڕووسەکان بکەونە ماندانی کورد دژیان (زۆر باشە. کورد ئێستا هەست دەکەن کە تەنها ڕووسیا دۆستی ئەوانن)[25].

دووەم: حوکمەتی تورکی تەنانەت لەوەیش پتر نیازەکانی سۆڤیەت شپرزەی دەکەن (هەرچۆن بێت ئێمە لەمەدا ناتوانین پشت بە تورکیا ببەستین، ئێمە شەڕمان لەگەڵ ئەڵمانە بۆیەکا دەتوانین- هیچ نەبێت لەم قۆناغەدا- تورکیا وەپشت گوێ بخەین).

سێیەم: بۆچوونێکی وەك ئەوەی ئازەربایجان، لەلایەن ڕووسەوە، هان دراون بۆ ئەوەی لە ئەنجامدا وڵاتەکەیان بخرێتە سەر ڕووسیا دەبێتە هۆی لەکار خستنی وەزارەتی جەنگی ئێران کە خۆی لە خۆیدا ناتوانێت بەرەنگاری کێشە

---

کردووە لەو شوێنەدا شتێك هەبووە بۆی نەخوێندراوەتەوە بۆیەکا ئەو تێبینییەی داناوە، ئێمەیش بە ناچاری ئەو خاڵانەمان داناوە.

(24) دیسانەوە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا هەمان دوو وشە خراونەتە نێو دوو کەوانی گەورەوە بۆ هەمان ئەو مەبەستەی لە پەراوێزی پێشوودا ڕوونمان کردۆتەوە.

(25) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:
((Excellent. Kurds will now realize that Russia their only friend)).

حوكمییەكانی وەك پاراستنی ئاسایشی هەموو ناوچەكان ببێتەوە (حوكمەتی ... بە هەر حاڵو بەرانبەر بە هەر شتێك تەواو بێ هوودەیە ئیتر بۆچ دەبێت ئێمە ... لەشكرێك بكەین كە لەوانەیە لە دواییدا دژی خۆمان بەكار بهێنرێت).

چوارەم: لەوانەیە هەراوبگر بە جۆرێك تەشەنە بسێنێت كە كار بكاتە هێڵو ... كانی پێوەندیی ئینگلیز– رووسی (ئەم رێگایانە كەمتر بایەخیان بۆ ئەم ... هەیە چونكە سەركەوتنەكانمان لە باكووری رووسیادا دەبنە هۆی ئەوەی ... چەكی زۆرتر لە رێگەی مورمانسكەوە[26] بۆ رووسیا بنێردرێت. هەرچی ... ەوەی هێڵەكانی پێوەندیی ناوچەكەی ئێمەیە دەتوانین وەڵام بدەینەوە. لەم ... مدا تاكە رێگەی بایەخدار كە لەوانەیە بكەوێتە مەترسییەوەو لەوانەیشە ... یستیمان بەو رێگەیە ببێت بۆ پتەوكردنی بەرەی قەفقاس، بەڵام لە ڕاستیدا ... ە ئاتاجی شتێكی لەو بابەتە نیین، خۆ ئەگەر هاتو پێویستیمان پێی بوو ... ساكە سۆڤیەتییەكان كوردەكان ناچار دەكەن هێمن بن).

پێنجەم: هەر گێرەشێوێنییەك لە باكوورو باكووری رۆژئاوای (ئێران– ك.م.) كە ... ە ... وچە هەرە زەنگینەكانی ئەم وڵاتەن، دەبێتە كۆسپ لەبەر دەم هەوڵەكانماندا ... بوژاندنەوەی ژیانی ئابووریی ئێران (چ دەكرێت لە حاڵەتێكی وەهادا ؟، لەوانەیە ... ێكی بە توانا شتێكی باش بێت بۆ بەریتانیا...)[27].

– كاتێك كاربەدەستانی ئێران...[28] ڕازی بن لە سیاسەتی سۆڤیەت بەرانبەر وڵاتەكەیان ئەوساكە بە ئاسانی دەتوانم ئەوەیان وەبیر بهێنمەوە هەر كاتێك پەیمانەكە مۆر بكرێت بۆ ئەوان ئاسانتر دەبێت لەگەڵ سۆڤیەتییەكاندا گفتوگۆ دەربارەی ئەمەو هەر بابەتێكی تر بكەن.. بە داخەوە وەزعی ئازەربایجان كار

---

26) مورمانسك: یەكێكە لە بەندەرە گرنگەكانی باكووری رووسیا، لە جەنگی دووەمی جیهاندا، دوای ئەوەی ... شكری ئەڵمانیای نازی توانیی زۆر لەو ناوچانەی باكوور داگیر بكاتو تەنانەت بشگاتە قەراغ شاری لینینگراد ... پەترسبورگ)و ئابڵۆقەی بدات، سەنگی ئەو بەندەرە هێندەی تر گەورە بوو چونكە بەشی سەرەكیی ... یدەكانی هاوپەیمانان لەوێوە دەگەیێنرانە سوپای سۆڤیەتیو شارە ئابڵۆقە دراوەكانی ئەو وڵاتە.

27) دیسانەوە هەمان دوو وشە (grp. Undec) خراونەتە نێوان دوو كەوانەوە.

28) دیسانەوە هەمان دوو وشە خراونەتە نێوان دوو كەوانی گەورەوە.

ناکاتە سەر بەرژەوەندییەکانی ئێران بە تەنها، بەڵکو کار دەکاتە سەر ئێمەیش.

(وێنەی ئەم بەشی دووەمە دەدرێتە کوییەشێڤش– ژمارە ٨٥).)).[29]

ژمارەیەکی زۆر لە لێپرسراوانو دەزگا فەرمییەکانی حوکمەتی بەریتانی بە بایەخەوە ئەم راپۆرتەی سێر ر. بولارد دەخوێننەوەو راوبۆچوونی خۆیان دەربارەی خاڵەکانو هەڵسەنگاندنو دیدەکانی دەردەبڕن.[30]

هەر هەشت خاڵی دوا بەڵگەنامەی ئەم بەشەی هەمان فایل بایەخیان وەك وەرچەرخانێکی خێرای تر لە بارودۆخی ورمێداو هەڵوێستی بەریتانیو سۆڤییەتەکان بەرانبەری زۆرە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕدراوی ئەو خاڵانەیە:

((اِی ٣٤/٢١/٣٣٢،

شفرە،

بۆ ئێران،

لە وەزارەتی هەندەرانەوە بۆ تاران،

ژمارە ١١٦،

٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی لێ دراوەتە:

ئەنقەرە ژمارە ١٤٩،

کوییەشێڤ ژمارە ١٣٠،

حوکمەتی هند ژمارە ١٣٤٩،

بەغدا ژمارە ٨٤،

قاهیرە ژمارە ٣٨٤.

---

(29) N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, From Persia, From Tehran to Foreign Office, Sir R. Bullard, No.76, (part 2), 15th January, 1942, Most Immediat, PP. 39-40.

(30) Ibid, PP. 41-48.

١- بروسکەی ژمارە حەفتاو شەشتان (دەربارەی رووداوەکانی ئازەربایجان‌و کوردستانی ئێران). ئەمەی لای خوارەوە بریتییە لەو یادداشتەی ڕۆژی بیست‌و یەکی کانوونی دووەم ناردوومە بۆ باڵوێزی سۆڤیەتی (لە لەندەن– ك. م.).

٢- ڕاپۆرتەکان وا ڕادەگەیێنن کە کوردو ئەرمەن‌و ئاشوورییەکانی ڕەزائییە لیژنەیەکیان دامەزراندووە بۆ لابردنی فەرمانبەرەکانی حوکمەتی ئێران‌و دامەزراندنی حوکمەتێکی سەربەخۆی ناوچەیی[31].

٣- حوکمەتی سۆڤیەتی لەگەڵ ئەوەدایە کە زۆر پێویستە هێمنی‌و ئاسایشیی گشتیی هەموو ئێران بپارێزێت. ئەگەر هاتوو بەڕەڵلایی بەردەوام بوو لەوانەیە حوکمەتی هەردوو لامان ناچار بن تەدەخول بکەن بۆ دابین کردنی ئاسایش، ئەو کارەی دەبێتە هۆی خەریکبوونی هێزێکی چەکداری زۆر کە لەوانەیە لە شوێنی تر پێویستمان پێی بێت.

٤- وێڕای ئەوە تەشەنەسەندنی نائارامییەکی لەو جۆرە وەك ئەنجامی بێ دەسەڵاتی حوکمەتی ئێران لە بواری پاراستنی ئاسایشدا لەوانەیە خراپ کار بکاتە سەر ئەو ڕێگایانەی یاریدەی جەنگیی پێویستیان پێدا دەنێردرێت بۆ یەکیەتی سۆڤیەت، ئەگەر نائارامیی ناوچەکانی ئازەربایجان‌و کوردستانی ئێران بگرێتەوە ئەوە، بێگومان، کار دەکاتە سەر هەندێ ئەو کەلوپەلە سەربازییانەی دەگەنە یەکیەتی سۆڤیەت.

٥- لەوەیش پتر حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانی سڵ لەوە دەکاتەوە ئەو ڕاپۆرتانەی باسی نائارامیی تەورێزو ڕەزائییە دەکەن ببنە هۆی ناڕەزایی توندی حوکمەتی تورکیا چونکە ئەو ڕووداوانە لە ناوچەیەکی زۆر نزیك لە سنووری ئەوەوە ڕوو دەدەن. لە گۆشەنیگای ئەو بەرژەوەندیانەشەوە کە ستالین لەکاتی گفتوگۆکانی مۆسکۆدا باسی کردن پێویستە پشتی حوکمەتی تورکیا، وەك سەنگەرێك دژی ئەڵمانیا، بگیرێت، بۆیەکا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە بە پێی مەترسیی سێر هـ. کناتچبوول– هەگێنسێن وەزعی ئێستەی کوردستانی ئێران گەورەترین کۆسپە لەبەردەم چاکبوونی

---

(31) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((and setting up independent local government in their place))

پێوەندییەکانی نێوان تورك‌و سۆڤیەت. تورکیا، لەبەر مەوقیعی جوگرافی، بێ ئەندازە مەبەستیە هیچ ئاڵ‌و گۆڕێك لە وەزعی ئازەربایجانی ئێراندا روو نەدات، بۆیەکا زۆر مەبەستە ئەو مەترسییەی تورکیا کۆتایی بێت، چونکە ئەگەر وا نەبێت ئەوە کار دەکاتە سەر هەموو سیاسەتی ئەو وڵاتە بەرانبەر جەنگو لەوانەیە تەنانەت کار بکاتە سەر هەڵوێستیشی بەرانبەر هێرشی ئەڵەمان.

٦- حوکمەتی خاوەن شکۆ باش هەست بە ئەرکی سەرشانی حوکمەتی ئێرانی دەکات کە پێویستە ئاسایشی ناوخۆی هەموو وڵات بپارێزێت، هەروەها باشیش لەوە گەیشتووە کە حوکمەتی سۆڤیەتی ناتوانێت رێگە بداتە حوکمەتی ئێران هێزەکانی خۆی بنێرێت، یا رێگە بدات هێزەکانی جەندرمە بگەڕێنەوە ئەو ناوچانەی لە لایەن سوپای سۆڤیەتەوە داگیر کراون، بەڵکو فەرمان دراوەتە دەسەڵاتی کارگێڕیی تەوریزو رەزائییە کە ژمارەی پۆلیسی ئەو دوو شارە کەم بکرێنەوە تا نیوەی ژمارەی ئێستەیان.

٧- ئەگەر ئەمە واقیعی حاڵ بێت دەتوانم پێشنیار بکەم کە حوکمەتی سۆڤیەتی ئەوە وەبەر چاو بگرێت کە لەبەر ئەوەی حوکمەتی ئێران پێویستە ئاسایش بگێڕێتەوە بۆیەکا دەبێت رێگەی بدرێت چەند بۆ ئەو کارە پێویستە هێند جەندرمەو پۆلیسیان لە ئازەربایجان‌و کوردستان هەبێت‌و دەبێت رێگەیش بدرێت ژمارەیەکی باش سەرباز بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستە پشتیان بگرن. هەروەها پێویستیشە فەرمان بدرێتە بەرپرسانی سۆڤیەتی بۆ ئەوەی لەو ناوچانەدا، لەپێناوی دابین کردنی ئاسایشدا، هاریکاریی لەگەڵ ئێرانییەکاندا بکەن.

٨- بەرانبەر بەوەی باڵوێزی سۆڤیەتی ئەم پێشنیارانە بگەیێنێتە حوکمەتەکەی دەیەوێت بەڵێنی ئەوە بدرێت کە حوکمەتی بەریتانیش پەیرەویی هەمان سیاسەت بکات لەو ناوچانەی (ئێراندا- ك.م.) کە لەلایەن ئەوەوە داگیر کراون. لە کۆتاییشدا دەربارەی ئەوەی لەم بووارەدا پێوەندیی بە حوکمەتی تورکیاوە هەیە ئەوا تەعلیمات نێردراوە بۆ باڵوێزی حوکمەتی خاوەن شکۆ لە ئەنقەرە کە لەم بارەیەوە پێشنیاری نزیك کەوتنەوەی تورك لە سۆڤیەتیان بۆ بکات))[32].

---

(32)N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, E 332/21/34, Cypher, To Persia, From Foreign Office, To: Tehran, No. 116, 21st January, 1942, Reported

ڕۆژی بیست‌ویەکی شوباتی ساڵی ١٩٤٢ ئەنتۆنی ئیدنی وەزیری هەندەرانی بەریتانی ئەم بەڵگەنامەیە دەنێرێت بۆ وەزیری هەندەرانی سۆڤیەتی، ئەویش بە نامەیەکی تایبەتی سوپاسی ئیدن دەکات[33].

دوا بەدوای ئەمانە لە هەمان فایلدا ئەم نامە دە خاڵیەی باڵوێزی بەریتانی لە ئەنقەرەوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن هەڵگیراوە، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوی ئەو نامەیەیە:

((بە شفرە،

لە تورکیاوە،

لە ئەنقەرەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر هـ. کناتچبوول- هوگیسێن،

ژمارە ٩٤،

١٤ی کانوونی دووەمی ١٩٤٢،

وێنەی لێ دراوەتە:

تاران ژمارە ٦،

بەغداو قاهیرەو حوکمەتی هند.

١- نیشانە بە بروسکەکانم ژمارە ٢٩١٦و ٠٦٩ وەزارەتی هەندەرانی (تورکیا- ک.م.)، ڕۆژی دەی کانوونی دووەم سێیەم یادداشتی وەبیرهێنەرەوەی[34] بۆ ناردووم.

٢- وەك لە پەرەگرافی دووەمی بروسکەی ژمارە ٢٨٣٩مدا سەبارەت بە (سنگ فراوانیی)[35] سۆڤیەتی ئاماژەی پێ کراو لە پەرەگرافی دووەمی بروسکەکەی تێدا دەرهەق تەسریحەکەی م. مۆلۆتۆڤ کە باسی ئەو دەعوەتە دەکات کە

---

to Angora No. 149, Kuibyshev No. 1130, government of India No. 1349, Baghdad No. 84, Cairo No. 384, PP. 49-50.

(33)Ibid, P.51.

(34) Aide- memorie زاراوێکی فەرەنسییە بە واتای (مذكرة تأكيد) دێت.

(35) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی دڵفراوانیی ((toleration)) بەو جۆرە لەنێوان دوو جووت کەوانی بچووکدا هاتووەو مەبەستی جۆرە گاڵتە پێ کردنێك، یا ڕاگەیاندنی پێچەوانەی ئەو وشەیەیە.

سۆڤێتییەکان بۆ سەردارەکانی کوردیان کردووە کە بچنە باکۆو پێنجیشیان بە ناو ناویان هاتووەو وەك دەشڵێن باسی نەخشەی سەربەخۆیی کوردیان کردووەو خەڵاتەکەشیان بریتی بووە لە تفەنگێك و دەستێك جلو بەرگو سێتێك بێتەل (لاسلکی)، دەشڵێن کە گەڕاونەتەوە رەزائییە سەدان کورد بە ئاڵای (کوردستان- ك.م.) و وێنەی ستالین و مۆلۆتۆف و دروشمی (هەر بژی بەلشەڤیزم)ەوە پێشوازییان کراوون.

٣- بە پێی دەنگوباسە دووپات کراوەکان لە باکۆ بڕیار دراوە کۆمیتەیەکی ناوەندیی (رزگاری)[36] دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی ببێتە بنەمای دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد.

٤- وەك دەڵێن کۆبوونەوەی تر لە رەزائییە ساز کراوە بۆ سوێندخواردنی سەربەخۆیی لە لایەن ئەندامە کوردو ئەرمەن و ئاشوورییەکانی کۆمیتەی ناوبراوەوەو دەشڵێن دە هەزار کەس بەشداریی ئەو کۆبوونەوەیەیان کردوەو بڕیاریان داوە ئەگەر (بە خۆشی- ك.م.) دەسەڵات نەدرێتە کۆمیتەی رزگاری ئەوساکە بە زەبری چەك وەری دەگرن. وەك دەشڵێن ناحەزانی ئەو رێبازە تووشی ئەزیەت هاتوون.

٥- دەنگو باسە دووپاتکراوەکان کە لە پەرەگرافی یەکەمی بروسکەی تارانی ژمارە چل و دوودا ئاماژەی بۆ کراوە ئەندامانی هۆزە کوردو ئەرمەنی و ئاشوورییەکانی (رەزائییە- ك. م.) بە لایەنی کەمەوە دە هەزار تفەنگیان هەیە.

٦- دەڵێن بەرپرسانی سۆڤیەتی گوێ نادەنە وەرسبوونی خەڵکی (سەر بە ئێران- ك.م.) و تەنانەت لەوەیش زیاتر ئەو تاوانبارانەیان ئازاد کردووە کە کاتی خۆی لە لایەن حوکمەتی ئێرانەوە بەند کرابوون.

٧- واش باوە کە موخابەراتی سۆڤیەتی[37] لە باکۆ سەردارەکانی کوردیان ڕاسپاردووە کە پەنا بەرنە بەر چەك ئەگەر هاتوو پۆلیسی ئێرانی هەوڵیدا

---

(36) دیسانەوە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی رزگاری ((deliverance)) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە.

تا چەکیان بکەن. دەنگوباوێکی واش هەیە کە دەستە رێگرو جەردەکان بە ناو شاری رەزائییەو دەورو بەریدا بڵاو بوونەتەوە.

٩- وەك دەڵێن هێزە چەکدارە سۆڤیەتییەکان دەسەڵاتی تەواوی پروپاگەندەیان لە ئازەربایجانی ئێران پێ دراوەو بۆ ئەم مەبەستەیش راپۆرتی زۆر بڵاو دەکەنەوە دەربارەی ئەوەی بارودۆخی تورکەکانی ئازەربایجانی رووسیا گەلێك باشە.

- وێنەی یادداشتە دووپات کراوەکانتان لە رێگەی جانتای دیپلۆماسییەوە بۆ دەنێرین.

١٠- تکایە وێنەی بروسکەی ژمارە پێنجیشم بنێرن بۆ کوییەشێف.

(وێنەی بە پێی ژمارە نەوەت و یەکی وەزارەتی هەندەران دەدرێتە کوییەشێف)[38].

بەشی زۆری بەڵگەنامەکانی دواتری ئەم فایلە بۆ بابەتی خاڵی هەشتەمی بەڵگەنامەی پێشوو، واتا بایەخ دان بە پروپاگەندە دەربارەی باری چاکی ئازەربایجانی سۆڤیەت لە ئازەربایجانی ئێران، تەرخان کراون[39]، وێڕای بایەخ دانی تورکیا بە سیاسەتی سۆڤیەت بەرانبەر کوردی ئێران[40].

---

(37) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا G.P.U هاتووە کە لە .K.G.Bی رووسییەوە هاتووە، واتا ((کۆمیتەی پاراستنی ئاسایشی دەوڵەت)) کە لە سەرەتای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧دا وەك دەزگایەکی ئەمنی دامەزرێنرا، لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی ستالیندا بووە دەزگایەکی داپڵۆسێنەری کەم هاوتا لە سەرانسەری جیهاندا.

(38) N.A., F.O., 371/31388, Eastern 1942, Persia File No. 21, Cypher, From Turkey, From Angora to Foreign Office, Sir H. Knatchbull- Hugessen, No.94. January 14th, 1942, Reported to Tehran No.6, Baghdad, Cairo, government of India, PP. 52-53.

(39) Ibid, PP. 54-70.

(40) Ibid, PP. 71-83.

## ڕۆژنامە بیانییەکان چۆن باسی مەهاباد و ڕەنگدانەوەی مەهابادیان کردووە؟

بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی تیشکیان خستۆتە سەر گەلێك لایەنی بایەخداری ئەم بابەتە. یەکەم بەڵگەنامەی فایلێکی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی کە ١٣٢ لاپەڕەیەو تەرخان کراوە بۆ کێشەی کورد لە ساڵی ١٩٤٦دا بریتییە لە نامەی باڵوێزی بەریتانی لە قاهیرە بۆ خودی سێر ئێرنێست بێڤنی وەزیری هەندەران[41] کە تێیدا باسی وتارێکی ڕۆژنامەیەکی میسریی بە زوبانی فەرەنسی دەکات دەربارەی پرسی کورد کە ڕۆژی بیستی مایسی ساڵی ١٩٤٦ بڵاوی کردۆتەوە[42]. شایانی باسە ڕۆژنامەی ناوبراو نەخشەیەکی گەورەی کوردستانیشی لەگەڵ وتارەکەیدا بڵاوکردۆتەوەو هەمووی بەسەر یەکەوە وەك هاوپێچ ناردوون بۆ بێڤن، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی نامەکەی باڵوێزە:

((باڵوێزخانەی بەریتانی،

قاهیرە،

ژمارە ٨٢٦ (٢٢٨/٦/٤٦)،

١٢ی تەموز، ١٩٤٦.

گەورەم

١- شەرەفمەندم لەگەڵ هاوپێچی ئەم نامەیەدا وتارێکتان سەبارەت بە داواکارییەکانی کورد بۆ بنێرم کە ڕۆژی بیستی مایس لە ڕۆژنامەی (Progre's Egyptien)دا بڵاو کراوەتەوە. ئەوەی بەر لەهەر شت لەم وتارەدا سەرنج ڕادەکێشێت دەربارەی سنووری کوردستانە کە بە جۆرێك کێشراوە کانە نەوتەکانی ئینگلیزی- ئێرانی بگرێتەوە، بۆیەکا وتارەکە لەوە دەکات پڕوپاگەندەیەکی سەر بە ڕووسیا بێت هەرچۆن بێت لەوانەیە بیروبۆچوونی نەتەوەیی ئێستەی کورد ببەسترێتەوە بەناوی جەنەراڵ شەریف پاشاوە کە تۆماری پێوەندیی بە بەریتانییەکانەوە

---

(41) دەربارەی پوختەی ژیاننامەی سێر ئێرنێست بێڤن بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٤٩ی بابەتی شەشەمی ئەم کتێبە.

(42) Les Kurdes revendiquent leur autonomie, ((Progre's Egyptien)), 20th May, 1946.

دووردەریژە، بەلام بێگومان لەوانە نییە لە رابردوودا هیچ پێوەندییەکی بە رووسەوە هەبووبێت. من نەمزانی مەبەست لەو دیپلۆماسییە بەریتانییە کێیە کە ناوی لە ستوونی دووەمی وتارەکەدا هاتووە، بەلام بۆچوونەکانی زۆر لەوانە دەکەن کە جەنەراڵ شەریف پاشا تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ بۆ سێر والتر سمارت (Sir Walter Smart)ی دەربڕیونو لەو نامەیەدا کە ژمارەکەی ١٥٧٧و ڕۆژی بیستو نۆی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ بۆم ناردوون لەبارەیان ئاگادارم کردوون.

٢- وێنەکانی ئەم هاوپێچەم بۆ ئەنقەرەو بەغداو تارانیش دەنێرم.

خزمەتکاری هەرە دڵسۆزتان

ئیمزا))[43].

دوای دوو لاپەڕە، لە هەمان فایلدا، نامەیەکی لەوەیش بایەخدارتری باڵوێزی بەریتانی لە یەکیەتی سۆڤیەتی تێدایە کە ڕۆژی شازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەنو ئەمەیش دەقی وەرگێڕاوی ناوەرۆکی ئەو نامەیەیە:

((لە مۆسکۆوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

بەڕێز. م. پێتێرسۆن،

ژمارە ٢١٠٣،

١٦ی حوزەیرانی ١٩٤٦،

بایەخدار (موهیم).

١- تکایە وەزارەتی هەندەران ئەمانە بنێرێت بۆ: تاران ژمارە ١٥٨و ئەنقەرە ژمارە ٥٣و بەغدا ژمارە ١٧و واشنتۆن ژمارە ١٦١.

ڕۆژنامەی (ترود)[44] ڕۆژی پازدەی حوزەیران ستوونێکی بۆ وتاری ڤاسیلێیڤ (Vasiliev) (ئایا پرسی کورد لە تورکیا هەیە ؟) تەرخان کردووە.

---

(43)N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq File No.19, Kurdish Problems: Iraq Kurdistan Relations, British Embassy, Cairo, No. 826 (228/6/46), 12th July 1946, PP. 2-4.

(44) یەکێك لە ڕۆژنامە سەرەکییەکانی ڕۆژگاری سۆڤیەت ناوی ((ترود)) واتا ((کار- العمل)) بوو کە لە مۆسکۆ دەردەچوو.

٢- ناوەڕۆکی سەرەکیی ئەو وتارە بریتییە لەوەی کە نووسەر دەڵێت هەرچەندە سەرژمێرییە فەرمییەکانی تورکیا دان بەوەدا دەنێن کە نزیکەی ملیۆن و نیوێك کورد لە تورکیا دەژین بەڵام تورکەکان دان بە بوونیاندا نانێن و پەنا دەبەنە بەر ئەمرازی داپڵۆسەر دژی ئاواتە نەتەوەییەکانیان. وتارەکە دەشڵێت (کوردەکان تەنها رانەگوێزراونەتە ناوچەکانی ناوەندی تورکیا، بەڵکو راگوێزراویشنە ناوچەکانی قارس و ئەردەهان). دەربارەی ئەوەی (لەودیو شووراى ئاسنین)ەوە[45] روو دەدات شتی گەلێك ستەم دەگێڕنەوە.

٣- لەم رووەوە ڕەخنە لە پەیمانی تورکی- عیراقی دەگیرێت، دەڵێن ئەو راپۆرتە نهێنییانەیش کە باسی ڕەفتاری (حوکمەتی تورکیا- ك.م.) لەگەڵ هۆزەکانی کورد دەکەن زۆر رێگەیان تێ دەچێت. ڕۆژنامەیەکی فارسی بە ناوی (دەریا)وە[46] کە پشتگیری ئاواتەکانی کورد دەکات و (ڕۆژنامەی ترود- ك.م.) شتی لێ وەرگرتووە لەلایەن ڕۆژنامە تورکییەکانەوە هێرشی کراوەتە سەرو بەپێی ئەو ڕۆژنامانە سەرجەمی ئەو شتانە بە هاندانی سۆڤیەت روو دەدەن.

٤- وتارەکە گەیشتۆتە ئەم سەرئەنجامە: بەهۆی پەرەسەندنی هەستی نەتەوەییەوە پرسی کورد لەوانە نییە لە رێگەی دامرکاندنەوە، یا لە رێگەی نکوولی کردنی بوونییەوە چارەسەر بکرێت. وەرگێڕانی وتارەکەتان (لە زوبانی رووسییەوە بۆ سەر زوبانی ئینگلیزی- ك.م.) بە جانتای دیپلۆماسیدا بۆ دەنێرم.

بەم ژمارانەی وەزارەتی هەندەران ٦٣٠و ٣٦٨و ٤٩٦ یەك لەدوای یەك، وێنەی لێ نێردراوەتە تاران و ئەنقەرەو بەغدا، بۆ واشنتۆنیش بە ژمارە ٨١٥ی وەزارەتی هەندەران نێردراوە.

هەروەها وێنەیشی لێ نێردراوەتە بەشەکانی ڕاگەیاندن))[47].

---

(45) واتا (وراء الستار الحديدي)یەوە.

(46) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا سەرەتا بە هەڵە ناوی ڕۆژنامەکە چاپ کراوە، لە بریتی (Darya) نووسراوە (Darka)، لە بەڵگەنامەی دواتری هەمان فایلدا، کە دەربارەی هەمان بابەتە، ناوەکە بە دروستی هاتووە. بەڕێز (دوکتۆر ئەمین موتابچی)یش هەمان بۆچوونی هەیە.

(47) N.A., F.O., 371/52369, Kurdish problems: Iraqi Kurdistan Relations, Departmental No.2, Moscow to Foreign Office, Sir M. Peterson, No. 2103, 16th June, 1946, PP. 9-10.

ـەو لاپەڕەی دواتری هەمان فایل تەرخان کراوە بۆ بروسکەیەکی نهێنیی کە بە ـەرە ڕۆژێك لەوەوبەر، واتا پازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٦، لە مۆسکۆوە نێردراوە ـۆ وەزارەتـی هەنـدەرانی حوکمـەتی بـەریتانی لـە لەنـدەن کـە ئەمـەیش دەقـی ـەرگێڕاوەکەیەتی:

((بە شفرە،

ـە مۆسکۆوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

ـێر م. پێتێرسۆن،

ژمارە ٢١٠٤،

١٥ی حوزەیرانی ١٩٤٦،

بایەخدار.

ئیشانە بە بروسکەی ڕاستەوخۆ نێردراوم. ئەمە یەکەم جارە پرسی کورد لە ڕۆژنامەوانیی سۆڤیەتیدا موناقەشـە دەکرێـت، ئەگـەر (هەواڵـەکانی مۆسـکۆ) (Moscow News)ی لێ دەربکەین، کە گۆڤارێکی پڕوپاگەندەییەو بە ئینگلیزی چاپ ـەکرێت (بڕوانە بروسکەی ژمارە ٣٨٨ی میستەر ڕۆبەرتس Mr. Roberts)[48].

تکا لـە وەزارەتـی هەنـدەران دەکـەم وێنـەی ئـەم بروسـکەیە بنێرێـت بـۆ بەغداو ـەقەرەو تاران و واشنتۆن بەپێی ژمارەی بروسکەکانم ١٨و ٥٤و ١٥٩و ١٦٢))[49].

---

(48) وا دیارە بەر لەوە لە ((هەواڵەکانی مۆسکۆ)) (Moscow News)دا وتارێکی تر دەربارەی پرسی کورد بە ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوەو کاتی خۆی ڕۆبەرتس بە بروسکە وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیی دەربارەی ئاگادار کردووە.

(49) N.A., F.O., 371/52369, Kurdish problems: Iraqi Kurdistan Relations, Cypher. Departmental 2, From Moscow to Foreign Office, Sir M. Peterson, No. 2104, 15th June, 1946, PP11-12.

## دەقی وتارێکی
## ڕۆژنامەی ((ترود))

لاپەڕە چواردەو پازدەی هەمان فایل تەرخان کراون بۆ دەقی وەرگێڕاوی وتارە رووسییەکەی ڕۆژنامەی ((ترود)) بۆ سەر زوبانی ئینگلیزی کە وتارێکی دوورو درێژی بایەخدارەو نەخشەیەکی گەورەی کوردستانیشی لەگەڵدایە، ئەمەیش دەقی وەرگێڕاوی ئەو وتارەیە لە ئینگلیزییەوە بۆ سەر زوبانی کوردی[50]:

ڕۆژنامەی ((ترود))،

پازدەی حوزەیرانی ١٩٤٦،

ئایا پرسی کورد لە تورکیا هەیە ؟،

نووسینی ئای. ڤاسیلێیێڤ.

ئەوەندەی من بیزانم ژمارەیەکی وەبەرچاو یۆنانیو ئەرمەنو جوولەکەو عیساییو کوردو هی دی لە تورکیا هەن. لەگەڵ ئەوەیشدا بەرپرسە فەرمییەکانی تورکو ڕۆژنامە تورکییەکان هەموو دەرفەتێك دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی بڵێن پرسی نەتەوەیی لە تورکیادا نییەو هەموو ئەو کەسانەی لەم وڵاتەدا دەژین تورکن. نووسەری تورك تێکین ئەڵپ (Tekin Alp) باسی ئەوەی لەو کتێبەیدا کردووە کە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦ بە ناوونیشانی ((کەمالیزم))ەوە بڵاوی کردۆتەوە.

بەپێی سەرژمێری فەرمیی، کە سەرژمێرێکی یاساییە، نزیکەی ملیۆنو نیوێك کورد لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەژین[51] کە لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ

---

(50) بە داخەوە لە لەندەنەوە دەستم نەگەیشتە دەقی وتارەکە بە زوبانی رووسی، بەڵام لەوە دڵنیم وتارەکە بە ئەمانەتەوە کراوەتە ئینگلیزی.

(51) ڕۆژی سێیەکی تەممووزی ٢٠٠٧ گەیشتبوومە ئەم ئاستە کاتێك برای بەڕێز مامۆستا مستەفا هیجری سەعات یەكو نیوی نیوەڕۆ بە کاتی لەندەن تەلەفونی بۆ کردم، زۆری پێ خۆش بوو کە عەرزم کرد بە دانانی ئەم کتێبەوە خەریکمو ئیمڕۆ گەیشتوومەتە بابەتی حەوتەمی کە دەربارەی کۆماری مەهابادە. شایانی باسە لەو کۆڕەدا کە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لێرە بۆ کێشەی کەرکووك بۆیان ساز کردم بە شێوازێکی تایبەتیی سوپاسی برا دیموکراتەکانی ئەودیوم کرد چونکە یاریدەی دڵسۆزانەی ئەوان نەبوایە بەرگی یەکەمی کتێبەکەم دەربارەی ((کەرکووك و دەوروبەری)) زەحمەت بوو بەچاپ

تێرێ‌و له باشووری ڕۆژهه‌ڵاته‌وه له‌گه‌ڵ عیراق‌و له باشووره‌وه له‌گه‌ڵ سووریادا هاوسنوورن. ئه‌م ناوچه‌یه به ناوی کوردستانی تورکیاوه ناسراوه.

له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو ڕاستییانه‌ش‌و ئه‌و هه‌موو به‌ڵگه باشانه‌یشدا ئینجا ڕۆژنامه‌ی ((سۆن پۆسته)) (Son Posta)ی تورکی، له ژماره‌ی ڕۆژی شازده‌ی نیسانی ساڵی ١٩٤٠یدا، نووسیویه هه‌رگیز له تورکیا ((نه کوردی نیشته‌جێ‌و نه کوردی کۆچه‌ر نه‌بوون)).

له تورکیا وا بیر ده‌که‌نه‌وه گوایه سه‌رجه‌می که‌مینه‌کانی نه‌ته‌وه‌یی تونرلونه‌ته‌وه‌و گشتیان بوونه‌ته تورك. حوکمه‌تی تورکی ماوه‌یه‌کی دوورودرێژ په‌یڕه‌وی سیاسه‌تی تواندنه‌وه‌ی ده‌کرد. مایسی ساڵی ١٩٢٥ سه‌رکۆماری ئێسته‌ی تورکیا ئینۆنۆ (ئه‌وسا عیسمه‌ت پاشا) له یه‌کێك له گوته‌کانیدا گوتی:

((ئێمه خۆمان به نه‌ته‌وه‌په‌رست داده‌نێین. نه‌ته‌وه‌په‌رستیش تاکه هێزی بزوێنی چالاکییه‌کانمانه. پێویستیشه به هه‌ر نرخێك بێت ئێمه هه‌موو ئه‌وانه بکه‌ینه تورك که له وڵاته‌که‌ماندا ده‌ژین)).

له مێژووی هاوچه‌رخی تورکیاوه دیاره ده‌رچوونی ئه‌و پرنسیپانه هه‌میشه بوونه‌ته هۆی ناڕه‌زایی که‌مینه‌کانی تورکیا. وێڕای ئه‌وه گه‌لێك جار ئه‌و سیاسه‌ته بۆته هۆی ڕاپه‌ڕینی کوردی تورکیاو دامرکاندنه‌وه‌یان به شێوازێکی درندانه له‌لایه‌ن سوپای تورکیاوه. به وێنه هه‌واڵنێری گۆڤاری ((ئیکۆنۆمیست))ی به‌ریتانی له ژماره ده‌ی مایسیدا ئه‌وه‌ی هێناوه‌ته‌وه یاد که ((ساڵی ١٩٣٠ له‌شکری تورك هێرشێکی زۆر فراوانی کرده سه‌ر کورد، ساڵانی ١٩٣٧، ١٩٣٩ له‌شکر ئه‌وه‌ی دووپات کرده‌وه، ئه‌وساکه وه‌زیری ناوخۆی تورکیا ڕایگه‌یاند که ئیتر کێشه‌ی کورد له ناو خاکی تورکیادا نه‌ماوه)). له درێژه‌ی قسه‌کانیدا هه‌واڵنێری ناوبراو گوتی:

((له‌وساوه کورد به ڕه‌سمی نه‌ماون، خۆ به‌ختانه هه‌ندێك جار به ناوی یاخیگه‌ره شاخاوێکان، یا تورکه شاخاوێکان ناو ده‌برێن)).

---

بکات. ((هه‌موو پۆسته نهێنییه‌کانی منیش، له‌سه‌رده‌می ڕژێمی سه‌ددامدا، له‌نێوان هه‌ولێرو به‌غدا زیاتر له‌ڕێگه‌ی براده‌رانی حیزبی دیموکرات له‌هاتووچۆدا بوو-ع.زه‌نگه‌نه)).

هەمان هەواڵنێر، کە زۆر نییە لە گەشتێکی ڕۆژهەڵاتی نزیکەوە گەڕاوەتەوە ڕایگەیاند کە ((شتێکی دیاری کراو دەربارەی چارەنووسی کوردی تورکیا نازانرێت کوردستانی تورکیا بە شوورایەکی پۆلایین چواردەورە دراوە))، ڕاستیەکەشی وایە شتێکی کەم دەربارەی بارودۆخی ئێستەی کوردی تورکیا دەزانرێت، بە زەحمەتیش چاوەڕوان دەکرێت ڕۆژنامەکانی تورك دەربارەی ئەو پرسە بنووسن، نەك تەنها لەبەر ئەوەی بە گشتی نکوڵی بوونی کورد، وەك یەکێك لە نەتەوەکانی تورکیا، دەکرێت ئەوەی هەواڵنێری ڕۆژنامەی ((نیویۆرك پۆست)) (New York Post) ڕۆژی حەڤدەی نیسانی ساڵی ١٩٤٦ دەربارەی نووسیوییە. بەپێی گوتەی ئەو:

((کورد لە تورکیا بە ڕادەیەك یا کوژراون یا نەفی کراون کە حوکمەتی تورکیا ئێستاکە ئیدیعا دەکات گوایە پرسی کورد لە تورکیادا نییە)).

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو هەواڵانەی جار جارە دزە دەکەنە سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە بیانییەکان ئەوە نیشان دەدەن کە پرسی کورد نەك تەنها لە تورکیا هەیە بەڵکو سەرباری ئەوەیش بۆتە هۆی نیگەرانی حوکمەتی تورك.

بەپێی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامە بیانییەکان، تەنانەت ڕۆژنامە تورکییەکانیش، ڕۆژی بیستو چواری مارت پەیمانێکی دۆستایەتی لە نێوان عیراقو تورکیادا مۆر کراوە سەبارەت بە ئەم بابەتە ئەوە ڕاگەیێنراوە کە ((کاری هاوبەش لە بواری کۆششە دژی هۆزەکانی کورد)) لە نێوان هەردووك حوکمەت وتووێژی دەربارە کراوە ئەوەی بەپێی بۆچوونی ژمارەیەك هەواڵنێری بیانی لە پاشکۆکانی پەیمانەکە ڕەنگی داوەتەوە.

ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە زۆر جێگەی بڕوان، چونکە دەربارەی ئەو هەنگاوانەن کە ئاراستە کراون بۆ دامرکاندنەوەی ئاواتە نەتەوەییەکانی کوردی تورکیا. دەربارەی ئەو ئاواتانە ڕۆژنامەی ((دەریا))ی ئێرانی ڕۆژی پازدەی نیسان نووسیوییەو دەڵێت

((بزووتنەوەی کورد لە تورکیاو عیراق لەپێناوی ئۆتۆنۆمیدا دیاردەیەکی تەواو سروشتییە، چونکە کورد لە ڕووی نەژادەوە چ لە تورکو چ لە عەرەب جیاوازن)، ئەوان (( بێگومان مافی خۆیانە داوا بکەن بە زوبانی زگماکی خۆیان بخوێنن)).

رۆژنامە تورکییەکان کاتێك باسی کورد دەکەن هێرشێکی دوژمنانە دەبەنە سەر یەکیەتی سۆڤیەتو ڕەخنە لە کۆمارە سۆشیالیزمە سۆڤیەتییە یەکگرتووەکان دەگرن چونکە وەك دەڵێن کورد بۆ سەربەخۆیی نەتەوەیی هان دەدەن، سەرباری ئەوەی ڕەخنە لە کارەکانی حوکمەتی تورکیا دەگرن، ڕۆژنامە تورکییەکان ئەمە بۆیەکا دەکەن تاوەکو ڕاستیی بارودۆخی کوردستانی تورکیا، کە بریتییە لە وێنەیەکی زۆر ستەم، بشارنەوە.

ڕۆژی سێی نیسان هەواڵنێری ئاژانسێك لە بەغداوە[52] بە پشتیوانی تەعلیقێکی ماجید مستەفا بەگی[53] ئەندامی پەرلەمان دەڵێت ((کورد لە تورکیا گەلێك خراپ ڕەفتار دەکرێن))و داواشی لە ((نەتەوە یەکگرتووەکان کردووە لە باری ژیانی کوردی تورکیا بکۆڵێتەوە)).

لەو ناوچانەدا، کە کوردیان تێدا دەژین، هیچ دەزگایەکی تەندروستی، یا قوتابخانە، یا هیچ جۆرە ڕێکخراوێکی ڕووناکبیری نییە، کورد قەدەغەن لەوەی لە سوپادا یا لە دەزگا کارگێڕییەکاندا هیچ جۆرە پۆستێکیان بدرێتێ، وێڕای ئەوەی ناتوانن هیچ هەستێکی پشتگیریی بەرانبەر هیچ بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی کورد دەرببڕن.

لەوەیش بەولاوە وەك ڕۆژنامەی ((دەیلی ئێکسپرێس)) (Daily Express)ی (لەندەنی) ڕۆژی بیستو یەکی مارت ڕایگەیاندووە ((لە تورکیا کوردەکان لە گوندەکانی سەر سنووری سووریە ڕاگوێزراون))و دوور خراونەتەوە قووڵایی وڵاتەوە. بە هەمان دەستوور ڕاگواستنی دانیشتووانی گوندەکانی ناوچەکانی سەر سنووری ئێرانو عێراقیش بە نیازی تواندنەوەیان کاری کردۆتە سەر باری ژیانیان.

کوردەکان تەنها ڕاناگوێزرێنە ناوچەکانی ناو قووڵایی تورکیاوە، بەڵکو هەمان کات ڕاشیاندەگوێزنە ناوچەکانی قارسو ئەردەهان، ئەو دوو ناوچەیەی هەمان کات

---

(52) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((AP correspondent in Baghdad))، بۆ پیتی A دەزانم کورتکراوەی (Agency)ە، بەڵام بە داخەوە نەمزانی پیتی P ئاماژە بۆ چی دەکات؟.

(53) بە هەڵە، یا بە پێی نەریتی ڕۆژئاواییەکان دەڵێت: مستەفا ماجید بەگ، کە دیارە مەبەستی ماجید مستەفایە، ئەوسا ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران بوو.

ژمارەیەك ئەرمەنیان لێ دوور خستۆتەوەو ژمارەیەکی تریشیان لێ کووشتووە پێیان وایە بەو جۆرە گوایە چارەسەری پرسی ئەرمەنیشیان کردووە. هەر بەو جۆرەیش ئێستا لە تورکیا هەوڵ دەدەن گوایە پرسی کوردیش ((چارەسەر))[54] بکەن. دەیان هەزار کورد لە زێدی باوو باپیرانیان ڕاگوێزراون و ناچار کراون دەست لە ماڵو حاڵیان هەڵبگرنو نازانن چۆن پاروو نانێك پەیدا بکەن، تایبەت دوای ئەوەی هەموو مەڕو ماڵاتیان لە قەراغ شەقامەکان مردار بوونەتەوە، ژمارەیەکی زۆر لە پیرو ئافرەتو منداڵەکانیان لە ڕێگە مردوون، تەنها ژمارەیەکی کەمیان گەیشتوونەتە ئەو هەوارگانەی بۆیان دیاری کراوە.

ئەو کوردانەیش کە نەیانویستووە ڕاگوێزرێن، یا لە ڕیزەکانی سوپادا بینە سەربان، پەنایان بردۆتە بەر کێوە سەختەکانو لەوێ ژیانێکی دژوار بەسەر دەبەن. هەموو ئەمانە ناشێت نەبنە هۆی ناڕەزایی کورد.

ئەم جۆرە نکوڵی کردنەی بوونی کورد لە تورکیاو هەمان کات نەبوونی پرسی کورد وەك ئەنجامی نەبوونی کورد تەنها نیشانەی ئەوەن کە دەسەڵاتدارانی تورك بەو جۆرە دەیانەوێت نیازەکانیان بۆ ((چارەسەری))[55] پرسی کورد بە شێوازی تورکانە لە ڕای گشتی بشارنەوە. چەوساندنەوەو زۆر لێکردنو قەدەغەکاری ئاواتی نەتەوەیی هەرگیز ئەنجامی باشیان لە بواری چارەسەرکردنی پرسی نەتەوەییدا لێ نەکەوتۆتەوە، دوا بەدوای ڕماندنی فاشیزم لە ڕێگەی هاریکاریی هەموو گەلە ئازادیخوازەکانەوە هیواو ئاواتی سەرجەم نەتەوەکانی جیهان بە شێوازێکی بەرچاو پەرەی سەند. ڕاستێکەی هیچ شتێکی سەیر لەوەدا وەدی ناکرێت گەر ئاواتی نەتەوەیی کوردی تورکیا[56] پەرە بسێنێتو بەم شێوە، یا بەو شێوە تەعبیر لە بوونی خۆی بکات. ئەوە نەشارەزاییەکی سیاسییە ئەگەر

---

(54) وشەی ((Solve)) بەو جۆر خراوەتە نێو دوو جووت کەوانی پچووکەوە.

(55) لێرەدا وشەی چارەسەرەکە، وەك جارانی دیکە نەخراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە بەڵکو ئێمە خۆمان بە هەمان دەستوور خستومانەتە نێوان ئەو دوو جووت کەوانەوە، چونکە ئەو کرە بە پێچەوانەوە ئاڵۆزکردنو دژوارکردنی چارەسەری پرسی کوردە لە تورکیا.

(56) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت ((The Turkish Kurds)) واتا کوردە تورکەکان.

ـگوترێت پرسی کورد لە تورکیا لە ڕێگەی تواندنەوەی زۆرەملێی کوردەوە، یا لە ڕێگەی دامرکاندنەوەی ئاواتی نەتەوەییەوە، یا هەر نەبێت لە ڕێگەی نکولی لە بوونی مەسەلەکەوە، بڕوانێتە بابەتەکە))[57].

هەزار هەزار جار ماڵت ئاوا ڤاسیلێێف چونکە، بۆ کورد بێت یا بۆ کورد نەبێت، ـەو ڕاستییانەت گوتووە کە بێگومان خزمەتی هەمووان دەکات، هی تورك ئینجا هی کورد.

نوا بەدوای ئەم وتارە بایەخدارە، کە زیندوویێتی پرسی کورد نیشان دەدات، لە هەمان فایلدا شەش لاپەڕە تەرخان کراوە بۆ هەمان بابەت، بەڵام ئەمجارەیان لە ڕوانگەیەکی جیاوازەوە. چاپەمەنییە ڕۆژئاواییەکان بە هۆی کۆماری مەهاباد کوردستان)ەوە کەمتر عەودالی هەواڵەکانی کوردستان نەبوون. بۆ روون کردنەوەی ئەمە بەر لە هەر شت دەقی وەرگێڕانی نامەیەکی باڵوێزخانەی بەریتانی ـە ئەنقەرە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن پێشکەش دەکەین:

((باڵوێزخانەی بەریتانی،

ئەنقەرە،

٥ی تەموزی ١٩٤٦،

ژمارە ٤٦/٢٦/١٤.

١- خۆشەویستم هایتەر

پێم وایە بەشی (ڕۆژهەڵات- ك. م.) حەز دەکەن ئەم یادداشتە هاوپێچە دەربارەی کورد بخوێننەوە کە بەناو پێوەندیی هەیە بە دوکتۆر بووروەوە (Doctor Burr) و ئەلایەن ئالێن (Allen)ی مولحەقی ڕۆژنامەوانییەوە نووسراوە وەك ڕاگەیاندنێك بە نوێنەرانی ڕۆژنامەی (تایمس) و (دەیلی تێلێگراف) و هەواڵنێرە سویسری و ئەمەریکایی و کەنەدییەکانەوە کە عەودالی زانیاری بوون دەربارەی بابەتەکەی

(57)N.A., F.O., 371/52369, Kurdish problems: Iraqi Kurdistan Relations, Cypher Departmential 2, PP. 14-15.

ئالێن. هەرچی بابەتەکەی دوکتۆر مالکۆلم بووره لە (گۆڤاری کۆمەڵەی ئاسیایی ناوەندیی مەلەکی)دا (ڕۆژی یازدەی مارتی ساڵی ١٩٤٦- ك. م.) بڵاو کراوەتەوە.

٢- لەسەر داوای مولحەقی سەربازی وێنەیەکی تایبەتیی (وتارەکەت- ك. م.) بۆ دەنێرم تا ئێوە بینێرن بۆ وەزارەتی جەنگ کە پێم وایە پێیان خۆشە بیبینن.

ئیمزا

دڵسۆزتان

داڤید ڤـ. کیللی))[58]

چوار لاپەڕەی دوای ئەو نامەیە تەرخان کراون بۆ وتارەکەی مالکۆلم بوور کە، وەك گوتمان، ڕۆژی یازدەی مارتی ساڵی ١٩٤٦ لە ((گۆڤاری کۆمەڵەی ئاسیایی ناوەندیی مەلەکی))دا بڵاوی کردۆتەوە، وا لە خوارەوە ئەوی بە پێویستی دەزانین لە ناوەرۆکی ئەو وتارەو سەرنجی خۆمان دەربارەی بڵاو دەکەینەوە:

((تێبینییەك دەربارەی کورد. نووسینی مالکۆڵم بوور.

بۆ ئەوەی بتوانیت لە کێشەی ئێستەی کورد تێبگەیت پێویستە لەڕوانگەی مێژووییەوە تێی بڕوانیت. کورد گەلێکی دێرینن و هەموو ئەو تایبەتمەندییانەیان پێوە دیارە کە وان لە ژینگە و ئابووریی گەلە شاخاویەکاندا. سەرەتای سەدەی هەژدەمین خوو و ڕەوشتیان زۆر لە خوو و ڕەوشتی ئێسکۆتلەندییە شاخاوێکانی ئێستەیان دەکرد. لەڕاستیشدا ئەو مەڵبەندە سەرەکییانەی وەك دیاربەکر و سنە و مەجلیسی دەرەبەگانی بدلیس و عەمادییە و شارەزوور و داب و نەریتی قەڵاکانی بنەماڵە فەرمانڕەواکانیان گەلێك ئاوەدان و ڕازاوەترن ئەگەر لەڕووی ژیاریشەوە پێشکەوتوتر نەبن وەك لە سەردارە کوردەکانی ناوچە شاخاوێکانی ئیمڕۆ تراجیدیای ڕووی کەڵچەریی ناوچە شاخاوێکان لەدوای ساڵی ١٩٤٥وە لەوەدایە کە سەد ساڵ دواکەوت. لەڕاستیدا تراجیدیاکە لە هەوڵی داسەپاندنی دەوڵەتێکی نوێدایە بەسەر کۆمەڵگایەکی دواکەوتوودا کە هەمان کات گیرۆدەی ئابوورییەکی

58) Ibid, From: David V. Kelly, British Embassy, Angora, 5th July, 1946, No. 426/46, To: W.G. Hayter, Esq. Foreign office, London, P.18.

حرمالّی و فەوزاو لە خۆبایی بوون و پێوەندیی باوکایەتی هاتبێت و قەبوولّی هیچ سیردمیەکی بەرەوپێشچوون نەکات)).

لێرەدا پێویستمان بە ڕوونکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەم بۆچوونانەی مالکوڵم بووره. کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە بوور خوێندەوارێکی پڕو لە جوری بەراوردی مێژوویی و ئەدەبیدا شۆڕە سوارەو تا ڕادەیەکی باش ئاگاداری مێژووی نوێ و هاوچەرخی کوردە و بە سەرکەوتوویی کورد بەراورد دەکات بە گەلە شاخاوێکانی وەك گەلانی ناوچەی ئالپ و بۆسنە و هەرسك، وێڕای ئیمکوتلەندییەکان وەك لە سەرەتادا گوتمان، باسی سوارەی حەمیدی و سیاسەتی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و ئەو دەردەسەرییانەمان بۆ دەکات کە کورد لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهاندا گیرۆدەیان بوو، لەو بووارەدا دێتە سەر باسی هێرشی لەشکری ڕووسیش بە سەرکردایەتی جەنەڕاڵ بەراتۆف بۆ سەر کوردستانی باشوور و پوختەی کوشتارەکەی ڕەواندزمان پێشکەش دەکات کە ئەرمەنیش دەستیان تێیدا هەبوو، دوای ئەوە دێتە سەر ڕاپەڕینەکانی کورد دژی کەمالییەکان و ئاماژە بۆ شێخ سەعیدی پیران وەك ڕەهبەرێکی ئایینی دەکات.

دوا بەدوای ئەوانە (بوور) باسی سەرنجەکانی نەتەوەپەرستانی کورد دەکات ئەوانەی، وەك دەڵێت: ((ژمارەی گەلەکەیان بە ١٠ ملیۆن لە قەڵەم دەدەن و کوردستانیش بە لایانەوە لە شاخی تووروسەوە دەست پێدەکات و دەگاتە سەر دەریای قەزوێن لە باکوورەوە و کەنداوی فارس لە باشوورەوە)) و تەنانەت ((ئەو تورانەی کە کوردیش نازانن ئەوان هەر بە کوردیان دادەنێن))، بەلام بۆ ئێزیدییەکان دان بەوەدا دەنێت کە ((کوردن و بە کوردی دەدوێن هەرچەندە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان کەلچەری ئێزیدی و موسلمانەکاندا هەیە)).

هەرچی مالکوڵم بوور خۆیەتی ژمارەی کورد بە دوو ملیۆن دەخەملێنێت و ئەوەیش، بێگومان، بە هەموو پێواندنێك ژمارەیەکی یەکجار کەمە، بەتایبەت ئەگەر ئەوە وەبەرچاو بگرین کە بوور بۆ خۆی ژمارەی کوردی عیراق بە تەنها بە ٧٠٠ هەزار کەس لەقەڵەم دەدات، بەو پێوانەیش ژمارەی چ کوردی تورکیا و چ کوردی ئێران لە ژمارەی کوردی عیراق کەمتر دەردەچن و هیچیش بۆ کوردی سووریا و لوبنان و ئەرمینیا و ئازەربایجانی باکوور و شوێنەکانی دیکە نامێنێتەوە.

به پێویستی دەزانین دیسانەوە بێینەوە سەر مەبەستی سەرەکیی بوور لە وتارەکەی، ئەو مەبەستەی لەژێر پەردەوە زیرەکانە ئاماژەی بۆ دەکات، وەک ئەوەی دەڵێت ((تەنانەت لە ئیمڕۆی عیراقیشدا)) کورد ((ئەگەر یاریدەی ژیرانەی بەریتانییەکان نەبووایە گەیشتبوونە ئاستی گیانەلا))، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ((دەتوانیت لە ناو کوردی عیراقیشدا خانەوادەی ئەوتۆ وەدی بکەیت کە ڕەفتارو کردەوەیان ئالان برێك ستیوارتو ڕۆب ڕۆی لای خۆمان دەهێننەوە یاد))[59]

کەوابێت مەبەستی سەرەکیی مەڵکۆلم لە وتارە سەنگینەکەی ئەوەیە پێمان بڵێت کورد هەرچەندە گەلێکی دێرینو خاوەن دابو نەریتو هەلۆیستی ڕەسەنە بەڵام مێژوو زوڵمی لێی کردووەو ئێستاکە کاتی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد (کوردستان) بە یاریدەی یەکیەتی سۆڤیەت نییە چونکە ئەوە خۆی لە خۆیدا بازدانە بەسەر قۆناغی مێژوویی ئێستەی کورددا کە لەبارترین ڕژێم بۆی ڕژێمی میانڕەوی عیراقییە لەژێر سایەی بەریتانیدا، بێ ئەوەی دەرگای کەڵك وەرگرتن لە (شۆڕشی کشتوکاڵیی) تورکیا لە ڕوماندا دابخات، چونکە بەم جۆرەی لای خوارەوە کۆتایی بە وتارەکەی دەهێنێت:

**((بەم جۆرە تورك کە قووەتیان لە شۆڕشە کشتوکاڵیەکەی ئەتاتورکەوە هاتووە نموونەیەکیان داچەسپاندووە کە دەست دەدات نەك هەر لە ناوچە کوردنشینەکانی وڵاتە دراوسێکاندا، بەڵکو لە سەرانسەری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستیشدا لاسایی بکرێتەوە))**[60].

---

(59) ئالان برێك ستیوارت (Allan Breck Stewart): سکۆتلەندییە، ساڵی ١٧٥٢ کۆچی دوایی کردووە، ڕۆب ڕۆیش (Rob Roy) سکۆتلەندییە، ساڵی ١٦٧١ لە دایکبووە و ساڵی ١٧٣٤ کۆچی دوایی کردووە، هەردووکیان پاڵەوانی دژ بە یاسا بوون لای قەومی خۆیان چونکە بەخشندەو هەژار پەرە بوونو تا ڕادەیەك دەیانشوبهێنن بە ڕۆبن هوود (Robin Hood)ی بەناوبانگ کە پاڵەوانێکی ئەفسانەیی یاخی بوو، لە کۆتاییەکانی سەدەی دوازدەوە لە بەریتانیا سەری هەڵداوە، لە سەدەی پازدەمینەوە دەیان کتێبیان دەربارەی ڕۆبن هوود داناوە، هی وایان هەیە تەنانەت شوێنی گۆڕەکەشی دەستنیشان کردووە، لە سەدەی ڕابردووەوە ڕۆبن هوود بووە بابەتێکی سەرکەوتووی فلیمەکانی هۆلیوودو دوای ئەویش هی تەلەفیزیۆن. دەربارەی ئەو سێ پاڵەوانە ئەفسانەییە بڕوانە:

(Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 27, Oxford University Press, 2004, PP. 926-929, Vol. 35., Oxford University Press, PP. 440-444.

(60) N.A., F.O., 371/52369, Kurdish Problems: Iraqi Kurdistan Relations, From: David V. Kelly, British Embassy, Angora, 5th July, 1946, No. 14/26/46. To:, W.G.

## شەریف پاشا و مەهاباد

ـ دەستووری مەهاباد شەریف پاشای خەندانیش یەکێکە لەو کوردە ـــروتەی کەم کورد بە ڕادەی ئەو ناوی لەنێو بەڵگەنامە جیاوازە نهێنییەکانی حکمەتی بەریتانیدا دووپات بووەتەوە، بێگومان ڕووداوەکانی مەهاباد ناخی ـــی شەریف پاشایان هەژاندووە، وای بۆ دەچم ئەگەر هەستی شاردراوەی ـ ـسەر سۆڤیەت و کۆمۆنیزم نەبوایە بە گۆچانە ماندووەکەی لەو ڕۆژانەدا بەر لە ـــوونی ڕووی دەکردە مەهاباد.




شەریف پاشا

---

Hayter, Esq. Foreign Office, London, Brace Lenman, The Jacobit Rising in Britain 1689-1746, London, 1980, PP. 11-12, 46-47, 182, 236.

بێگومان مەهابادو شەریف پاشا دوو دیوی یەك لیرەی بێ غەل‌و غەشن، بۆیەش لەو بەڵگەنامە نهێنییانەدا کە بۆ باس‌و خواسی مەهاباد تەرخان کراون گەلێك جار ناوی شەریف پاشا دووپات دەبێتەوەو ئەمانەی لای خوارەوە چەند نموونەیەکی بەڵگەی ئەو بۆچوونەن.

باشترین بەڵگەی ئەم بووارە زنجیرەیەك ڕاستیی نەزانراون کە لەو فایلە گەورەیەدا هەڵگیراون کە سەرجەمی بەڵگەنامەکانی بۆ پرسی کورد لە ساڵی ١٩٤٦دا تەرخان کراون‌و چەند ئاماژەیەکی سەلمێنەریان تێدایە بۆ ئەم بۆچوونە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕاوی ئەو بەڵگەنامەیەیە کە لە لاپەڕە پەنجاو هەشتی ئەو فایلەدا هەڵگیراوە:

((لە قاهیرەوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

لە لۆرد کیللیرنەوە[61]،

ژمارە ٤٢٥،

٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥،

وێنەی بۆ بەغدا، ژمارە ٧٠.

١- بروسکەی ژمارە ١٩٥١تان، ڕۆژی پازدەی کانوونی یەکەمی ١٩٤٥ دەربارەی گفتوگۆی نێوان وەزیری ڕۆژهەڵات‌و شەریف پاشا. ئەمانەی خوارەوە بۆ میستەر هاو (Mr. Howe)ن[62].

---

(61)مەبەست لامپسۆن مایلس وێدێر بووِن کیللیرنە (Lampson Miles Wedder burn Killearn)، ڕۆژی چواری ئابی ساڵی ١٨٨٠ لە دایك بووە. بەشی هەرە زۆری ژیانی دیپلۆماسیی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی دوور، تایبەت لە چین‌و ژاپۆن، هەروەها لە میسرو سودان بردۆتە سەر، پیاوێکی بێ ئەندازە کەتەو قەڵەو بووە، درێژی مەترێك‌و ٩٦ سانتیمەترو کێشی ١١٥ کیلۆ بووە، ڕۆژی هەژدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٤ کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە:

((Oxford Dictionary of National Biography)), Vol. 32, Oxford University Press, 2004, PP. 355-356.

(62) سێر ڕۆبەرت جۆرج هاو (Sir Robert George Howe): ڕۆژی نۆزدەی ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٣ لەدایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریدجە، لە ڕۆژی یەکی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٩وە ژیانی

شەریف پاشا بەر لەم زیارەتەی دواییشی پەیوەندیی بە باڵوێزخانەی بەریتانییەوە لە میسر –ك. م.) هەبوو. شەریف پاشا کە داوای کرد وەزیری دەرەوەی وڵات ببینێت وەزیر نەیدەزانی شەریف پاشا دەیەوێت دەربارەی چی قسەی لەگەڵ بکات. جارێکیان کە پرسی کوردی ورووژاند وەزارەتی ڕۆژهەڵات بۆ ئەو کارە ملی نەدا، ئەوەی شەریف پاشا بۆ خۆیشی لە دوا بڕگەی یادداشتەکەیدا ئاماژەی بۆی کردووە.

– بێگومان ئێوەیش ڕازین کە شتێکی باش نییە ڕێگەی شەریف پاشا بدرێت بەبێ حوکمەتی خاوەن شکۆ تێکەڵ بە چالاکییەکانی خۆی بکات. وەزیری ڕۆژهەڵات ئەم هەڵوێستەی زۆر بە روونی دەربڕی لەکاتی گفتوگۆکەیدا لەگەڵ شەریف پاشا. پێم وایە شتێکی باشە ئێمە تێی بگەیێنین کەوا ئاگاداری گشت چالاکییەکانین. لەم قوژبنەوە هەندێك شت هەیە پێویستە بە شەریف پاشایان بڵێین ئەگەر هاتوو جارێکی دی پەیوەندیی پێوە کردین تا نەهێڵین (بە جارێك– – ) لێمان دوور بکەوێتەوە.

– لە لایەکی ترەوە پێم وایە ئێستە هیچ پێویست ناکات ڕێگە بدەین حوکمەتی عێراق لەبەر هیچ هۆیەك گومان لەوە بکات ئێمە پشتگیریی ئەو کەسانە دەکەین کە کار بۆ سەربەخۆیی کورد دەکەن، خۆ ئەگەر شەریف پاشا بە خودموختاریی کورد قایل بوو وە جارێکی دیکە لە باڵوێزخانەی خاوەن شکۆ پێشوازیی لێ کرایەوە ئەوساکە پێویستە حوکمەتی عێراقی دان بەوەدا بنێت کە شەریف پاشا پاڵنەری ڕەوای خۆی هەیە بۆ ئەوەی (لە هەڵوێستی عێراق– ك. م.) ناڕازی بێت. وێڕای ئەوە هەمیشە لەوانەیە ئەو جۆرە پەیوەندییانە وەك پشتگیرییەکی فەرمی لە لایەن شەریف پاشاوە هەڵسەنگێنرێن.

– وەك جۆرە موازەنەیەك لەوانەیە وا باشتر بێت جارێکی تر پێشوازیی شەریف پاشا لە دەرەوەی باڵوێزخانەی خاوەن شکۆ بکەین‌و هەوڵ بدەین لە ڕێگەی

---

...سیۆمەسیی سێر هاو دەستی پێ کردووە، بە ڕیز لە دانیمارك‌و یۆگۆسلاڤیاو ئەرجەنتین‌و ڕۆمانیاو چین ...ی کردووە تا ڕۆژی یەکی مارتی ساڵی ١٩٣٨ گوێزراوەتەوە خودی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن، ...ومیەکیش لە حەبەشەو سودان کاری کردووە. بڕوانە:

((Who Was Who)), Volume VIII, London, P.370, ((Foreign Office List and Diplomatic and Consuler Year Book)), one Hundered and Twenty –First Publication. London, 1948, P.253.

ترەوە پەیوەندیی پێوە بکەین بۆ ئەوەی بە لایەنی کەمەوە لەوە دڵنیای بکەین کە ئێمە ئاگاداری چالاکییەکانین. ئایا قایلن بە قسەکانم ؟.

وێنەی لێ نێردراوە بۆ میستەر هاوو بۆ سکرتارییەتی بەشی ڕۆژهەلات))[63].

بێگومان ئەو هەموو بایەخدانەی حوکمەتی بەریتانی بە شەریف پاشا ئەنجامی گەورەبوونی پرسی کورد بوو بە هۆی مەهابادەوە، ئەوەی لە گەلێك بەڵگەنامەی نهێنیی تری ئەو ڕۆژگارەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیدا ڕەنگی داوەتەوەو کەر گەیشتووە بەوەی یادداشتێکی سەربەخۆ دەربارەی بنووسن. بەم یادداشتەو بە گەلێك لە بەڵگەنامەکانی دیکەدا دیارە کە مەترسیی یەکەمی بەریتانییەکان لەم بووارەدا لەوەوە هاتبوو کە تەواو لە ڕەنگدانەوەی مەهاباد لەناو کوردی عیراقدا زراوەترەك ببوون، چونکە پێم وایە کوردی عیراق پتر لە هەمووان کەوتبوونە ژێر کاریگەریی کۆماری مەهاباد (کوردستان) کە بۆ خۆیشیان لە ڕێگەی بارزانییەکانو ئەفسەرە کوردەکانەوە ڕۆڵی ڕاستەوخۆی خۆیانیان لە ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژگارەی کوردستاندا بینی، ئەو مەترسییەی بەریتانییەکان تەواو لە پەیوەندییە بەردەوامەکانیان بە شەریف پاشاوە ڕەنگی داوەتەوەو ئەم یادداشتەی لای خوارەوەی سێر واڵتەر سمارت[64] نموونەیەکی سەلمێنەری ئەم

---

(63) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No. 19, From Cairo to Foreign Office, Lord Kill earn, No. 425, 31st December, 1945, Reported to Baghdad No.70.

(64) سێر واڵتەر سمارت ئەلێکسەندەر (Sir Walter Smart Alexander): ڕۆژی دوازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨٩٣ لەدایك بووە، دیپلۆماسییەکی بەریتانیی بەناوبانگە، زۆربەی ساڵانی کاری لە ڕۆژهەلات بردۆتە سەر، تایبەت لە ئێرانو وڵاتە عەرەبییەکان، لە دیمەشقو بێروتو حەڵەبو قاهیرەو تارانو تەورێزو شیراز کاری کردووە، لە ڕۆژئاواش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کونسوڵ بووە. گەلێك نازناو و میدالی بەرزی پێ دراوە، ڕۆژی یەکی ئابی ساڵی ١٩٤٥ کاتێك لە قاهیرە کاری کردووە نازناوی (Plenipotentialy) لە لایەن وەزارەتی هەندەرانی بەریتانییەوە دراوەتێ، بە پێی فەرهەنگی لاتینیی ئۆکسفۆرد ئەو نازناوە پلەیەکی دیپلۆماسیی بەرزو دەگمەنە، لە باڵوێزی (فوق العادة) زۆرترە چونکە مافی ئەوەی هەیە بە پێی بۆچوونی خۆی، بێئەوەی بگەڕێتەوە بۆ وەزارەتی هەندەرانی هەڵوێست وەربگرێت. دەربارەی ژیننامەی سێر واڵتەر سمارت بڕوانە:

The Foreign List and Diplomatic and Consular Book)), London, one Hundred and Twenty –Second Publication, P.346.

حومتییانەیەو لەبەر ئەو بابەخەشییە کە وێنەی یادداشتەکە لە دوو فایلی جیوری وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیادا هەڵگیراوە، یەکەمیان فایلی ژمارە ٤٥٣٤٦ -٣٠)ە کە ئەمە ناوونیشانییە ((ڕۆژهەڵات ١٩٤٥، عیراق، فایلی ـ ٤٤)) (65)، دووەمیشیان فایلی ژمارە (٥٢٣٦٩/٣٧١)یە کە ئەمە ناوونیشانیە ڕۆژهەڵات ١٩٤٦، عیراق، فایلی ١٩))(66). لە فایلی یەکەمیاندا ژمارەیەك نامەی تیمتی دەربارەی هەمان یادداشت لە نێوان ژمارەیەك دیپلۆماسیی بەریتانیادا ەگیرلوە کە گەلێك لایەنی نەزانراوی ئەو بابەتەمان بۆ ڕووناك دەکاتەوە بۆیەکا ـ وەرگێڕانی دەقی گرنگترینی ئەو نامانە دەست پێ دەکەین، کە یەکەمیان ڕتییە لە نامەیەکی باڵوێزی بەریتانی سێر هـ. ستۆنهێوێر بێرد(67) کە ڕۆژی یستی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٥ لە بەغداوە بە بروسکە ناردوویە بۆ وەزرەتی هەندەرانی وڵاتەکەی‌و ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((ئەم بروسکەیە نهێنییە بۆیەکا پێویستە ئەو بەرپرسەی وەری دەگرێت بە شێوازێکی تایبەتی بیپارێزێت‌و نەگاتە دەست کەس.

لە بەغداوە بۆ وەزارەتی هەندەران،

لە سێر هـ. ستۆنهێوێر بێردەوە،

ژمارە ٩٠،

---

ـەریدەی زاراوەی Plenipotentialyیش بڕوانە:

((The Latin Oxford Dictionary)), Oxford, Eight Edition, 1990, P.914.

(65) N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, Iraq, File No. 3229.

(66) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1945, Iraq, File No. 19.

(67) سێر فرانسێس هەف(*) ولیەم ستۆنهێوێر بێرد (Sir Francis Hugh William Stonehwer Bird) ڕۆژی سیازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٨٩١ لەدایك بووە، لە هەرەتی لاوییەوە بۆتە کارمەندی وەزرەتی هەندەران، لە یۆگۆسلافیا و سعودیە و کازابلانکا و ڕۆمانیا و حەبەشە کاری کردووە، ڕۆژی یستو هەشتی مارتی ساڵی ١٩٤٥ بۆتە باڵوێزی وڵاتەکەی لە عیراق، ئینگلیزییەکەی بێ ئەندازە ـولەمەند بووە، با ئەوەیش بڵێین پاش تەنها مانگو نیوێك دوای ئەوەی بووەتە باڵوێزی وڵاتەکەی لە ـەغدا ئەم ڕاپۆرتە چڕوپڕەی وەك شارەزایەکی کۆنو کەلەبەری سەرانسەری عیراق، بە کوردستانی ـشووریشەوە نووسیوە. دەربارەی بڕوانە:

((The Foreign Office List and Diplomatic and Consular Year Book 1947)), London, P. 308

(*) ((وا دیارە ئەو ناوە لە پەراوێزی (٧٣)ی ل٢٩٦دا بە (هەخ) خوێندراوەتەوە – ع. زەنگەنە)).

٢٠ی تەشرینی دووەمی ١٩٤٥،
وێنەی بۆ:
بێروت، ژمارە ٤٧،
تاران، ژمارە ١٨١،
ئەنقەرە، ژمارە ١٣.

١- ئەم بەیانییە کە سەرەك وەزیرانی عیراقم دی بە دەرفەتم زانی دەربارەی رووداوەکانی ئەم دواییانەی باکووری ئێران گفتوگۆی لەگەڵ بکەم‌و پێی بڵێم: ئەو رووداوانە بۆ حوکمەتی عیراقی بەکەڵکن بۆ ئەوەی دیسانەوە هاوولاتییە کوردەکان دڵنیا بکاتەوە کە بەرژەوەندییەکانیان ناخرێنە پشت گوێ‌و ئەوانیش وەك سەرجەمی دانیشتووانی عیراق بەشی تەواوی خۆیان دەبێت لە گشت چاکسازیی‌و بەرەوپێشچوونێکی ولاتدا.

٢- ئەو روونکردنەوەیەی حوکمەتی خاوەن شکۆم دەربارەی هەڵوێستمان بەرانبەر کوردی عیراق هێنایەوە یاد بەڕێزیان، ئەوەی کە رۆژی چواردەی حوزەیران وێنەیم لێ دایە دەست خۆی، هەر وەك چۆن لە نامەی ژمارە ٢٥١میشدا ئاماژەم بۆی کردووە. لە رۆژانی هەراو بگرەکەی ئەم دواییانەی بارزاندا کارێکی وامان کرد هەمووان، بە کوردیشەوە، زۆر بە روونی بزانن بەلای ئێمەوە هەمووان هاوولاتییەکی عیراقیی ئاساییین، بۆیەکا شتێکی بایەخدارە کورد لە هیچ شوێنێك لە دەرەوەی سنووری عیراق بە دوای دۆستدا نەگەڕێن.

٣- سەرەك وەزیران یەکسەر لە مەبەستەکانم گەیشت‌و سوپاسی کردم‌ گفتیشی دا کارێکی ئەوتۆ بکات لە وتاری عەرشدا، کاتی کردنەوەی پەرلەمان لە رۆژی یەکی کانوونی یەکەمی داهاتوو، ئاماژەیەکی لەبار بۆ کوردستان بکرێت‌و تێیدا بگوترێت زۆربەی کوردی عیراق[68] دڵسۆزی ولاتن))[69].

ناوەرۆکی بەڵگەنامەی دواتریش، کە سێر هاو بە ناوی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانییەوە رۆژی پێنجی شوباتی ساڵی ١٩٤٦ ناردوویە بۆ سێر هەف ولیەم

---

(68) بە داخەوە دەستم ناگات بە تۆمارەکانی پەرلەمانی ئەو کاتی عیراقیدا تاوەکو بزانم چی لە وتاری عەرشدا دەربارەی ئەم بابەتە گوتراوە.

(69) N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, Iraq, File No. 3229, From Baghdad to Foreign office, Sir H. Stone hewer Bird, No. 90, 20th November, 1945, Reported to: Beirut No.47, Tehran No. 181, Angora No. 13, P.32.

ستینیر بێردی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا، جارێکی دیکە لایەنەکانی بایەخی ـ یادداشتمان بۆ دەخاتە روو، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ـ ـەکنامەیەیە:

وەزارەتی هەندەران،

س. دەبلیو ١،

ژمارە ٩٣/١٩/١٠٠٨،

شەخسی و نهێنی،

پێنجی شوباتی ١٩٤٦.

گەلێك سوپاستان دەکەم بۆ نامەی ڕۆژی دوازدەی کانوونی دووەمتان دەربارەی ـەکانی سمارت لەگەڵ جەنەڕاڵ شەریف پاشادا دەربارەی پرسی کورد.

من پێم وایە هەمیشە زەحمەتە بۆ وەزیری ڕۆژهەڵات بڕیار بدات ناچارە ـمنیی یەکێکی تایبەتیی بکاتو دەربارەی ئەم حاڵەتە (حاڵەتی بینینی ـەریف پاشا– ك. م.) من پێم وانییە سمارت چاکی کردبێت ڕەفزی بینینی ئەو ـوەی کردبێت. من لەگەڵتام لەوانەیە هۆ بزوێنەکانی شەریف پاشا بۆ ئەوەی ـ باڵوێزخانەی بەریتانیی پێشوازیی لێ بکرێت بریتیی بێت لەوەی بە ـماعەتەکەی ڕابگەیێنێت کە وا ئەو لەو باڵوێزخانەیە پێشوازیی لێ کراوەو ئەوە ـکە سەرمایە بۆ خۆی، بەڵام من لەوە دەترسێم کەس لە ئێمە هەمیشە ـتوانێت بینینێ یەکێك ڕەفز بکات تەنها لەبەر ئەوەی گومان لە ڕادەی خاوێنی هۆ پاڵنێوەرەکانی دەکرێت. بە هەر حاڵ کە جەنەڕاڵ شەریف پاشا پرسی خودموختاریی کوردستانی عیراقی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا ورووژاند، ـمارت حەقی بوو کە نەیویست ببینێت. هەرچەندە (ئۆتۆنۆمیی ناوچەیی) ـبەتێکی یەکجار بڵاوە (لە ئیمرۆی ئێراندا– ك. م.) بەڵام سمارت نەیدەویست شتێك بڵێت کە لەوانە بێت بۆ بەرژەوەندیی عیراق لێك نەدرێتەوە، هەرچەندە ئەو بە ڕاشکاوی لە وەڵامەکەیدا گوتوویە ((ئێمە ناتوانین مانی هیچ بزووتنەوەیەك ـدەین کە لەوانە بێت هاوپەیمانەکانمان لاواز بکات)). بە لای ئێمەوە ئەم وەڵامە تەولو لەگەڵ ڕەوتی ڕاستیدا دەگونجێت.

ئەوەیش[70] کە تایبەتە بە ئایا عەزام[71] کەمتر لە نوری[72] بایەخ دەدلتە پرسی هیجرەتی جوولەکە بۆ فەلەستین بەلای منەوە بابەتێکە هەلناگرێت زۆر لێی بکۆلرێتەوە، وا دیارە نە میسرییەکان و نە عیراقییەکان لە ڕاستیدا پێشنیارەکانی ئێمەیان بە دلە دەربارەی ئەوەی تا ماوەیەکی دیکە ڕێگە لەو هیجرەتە نەگیرێت. ئەوان هەردووکیان دەلێن ئامادەن ئەوەی ئێمە پێمان باشە قەبوولی بکەن، بەلام کێشەکە لەوەدایە کە دەولەتە عەرەبییەکان لەو بووارەدا هەلوێستێکی لەوە ڕەقتریان هەیە.

لەوە دلنیام ئێوە باش دەکەن هیچ جۆرە ڕەخنەیەك لە بالوێزخانەی قاهیرە لە بروسکە دیپلۆماسییەکانتاندا ناگرن. ئەگەر لە دواڕۆژدا هیچ گلەییەکتان هەبوو باشتر وایە ئێمە ئاگادار بکەن، ئەوساکە ئێمەیش، بەو شێوازەی کە لە توانامانداا بێت یاریدەی خۆمان پێشکەش دەکەین.

ئیمزا

دلسۆزتان

ر. گ. هاو

وێنەی بۆ سێر هەخ ستۆنهێوێر بێرد لە بەغدا))[73].

لاپەڕەی دواتری هەمان فایل تەرخان کراوە بۆ دەقی ئەو نامەیەی هاو ناردوویە بۆ سێر هەخ ستۆنهێوێر بێرد دەربارەی شەریف پاشا[74]. بەر لە تۆمارکردنی

---

(70) ئەم دوابابەتەی بەلگەنامەکە پەیوەندیی نییە بە کوردو شەریف پاشاوە، بەلام بە پێویستمان نەزانی لەوێدا ناوەرۆکی بەلگەنامەکە بقرتێنین، هەلبەت فەلەستین و جوولەکەیش بابەتێکی گرنگن.

(71) مەبەستی عەبدولڕەحمان عەزامی ئەمینداری گشتی کۆمکاری عەرەبییە.

(72) مەبەستی نووری سەعیدە.

(73) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No.19, Foreign office, S.W.1., No. 1008/19/93, Personal and Confidential, 5th February, 1946, Sgd. R.G. Howe, Copy to: Sir Hugh Stone hewer Bird, Baghdad, P.77.

(74) Ibid, Registry No. E 1008/19/93, From: Mr. Howe, To: Sir A. Stone hewer Bird, Baghdad, Personal and Confidential. P.78.

...ی یادداشتەکەی سمارت، بالوێزی بەریتانی لە قاهیرە لۆرد کلێرنیش ئەمەی
... وەرمەوەی کردۆتە پێشەکی، یا روون کردنەوەی یادداشتەکە:
...پێوەندییەکانی عیراق بە کوردەوە. نیشانە بە نامەی ژمارە إی
...-٩٢/٣٢٢٩- وێنەی یادداشتی سێر والتەر سمارتە بە بەرواری بیستو
...ی تەشرینی دووەم کە باسی دیدەنییەك لەگەڵ جەنەڕاڵ شەریف پاشادا
...ـکات شەریف پاشا کاتی خۆی سەرۆکی ئەو کۆمیتە کوردییە بووە کە لە
...ی لە رۆژانی وتووێژەکانی پەیمانەکانی ڤێرسایدا دامەزرێنرابوو. شەریف پاشا
...ییە کە لە لایەن ژمارەیەك لە ئەشرافی ناوچەکانی کەرکووكو سلێمانیو
...ـەوە کراوەتە نوێنەریان بۆ داواکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عیراق لە
...وارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا لە کۆنفرانسی ئاشتی))[75].
...ەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی[76] ئەو یادداشتە گرنگەیە:
یادداشت
جەنەڕاڵ شەریف پاشا، ئەوەی من بیزانم، سەرۆکی ئەو کۆمیتە کوردییە بوو
... پاریس کاتی گفتوگۆکانی پەیمانەکانی ڤێرسایدا دامەزرێنراو لەگەڵ سەرۆك
...ـسندا[77] باسی سەربەخۆیی کوردستانی کردووە، ئیمڕۆ بەیانی (واتا رۆژی
...و شەشی تەشرینی یەکەمی ١٩٤٥- ك. م.) بانگی کردم.
لە دانیشتنەکەدا پێی راگەیاندم ژمارەیەك لە ئەشرافی ناوچەکانی کەرکووكو
...سلێمانیو موسڵ[78] داوایان لێی کردووە داخوازییەك دەربارەی ئۆتۆنۆمیی
...کوردستانی عیراق، لە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقیدا، پێشکەش بە کۆنفرانسی

---

(75) N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, Iraq, File No. 3229, Iraqi Relations with K...
From Lord Kill earn, Cairo, No. 1577(1327/3/45), Dated 29th November, 1945, P.33.

(76) شایانی باسە منیش دوو جار ئەو یادداشتەم وەرگێڕاوەتە سەر زوبانی کوردی.

(77) مەبەستی ویدرۆ ویلسنی سەرۆکی بەناوبانگی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە کە سەرۆکی ...ی ولاتەکەی بوو بۆ کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩داو لەو قۆناغەدا چواردە بەندە ...ناوبانگەکەی خۆی بلاو کردەوە.

(78) لە هەموو بەڵگەنامەکانی تری ئەم فایلەدا ناوی هەولێریش لە گشت ئەو شوێنانەدا هاتووە کە ...ی ئەم بابەتە دەکەن.

ئاشتی بکات، گوتیشی ئەوانەی ئەو نامەیەیان بۆی ناردووە دوای ماوەیەکی کورت وەکالەتی تایبەتیی بۆ دەنێرن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کارە. هەمان کات شەریف پاشا هەمیشە لایەنگری بەریتانییەکان بووەو هەرگیز نایەوێت بێ ئاگاداریی ئێمە هیچ هەنگاوێك بنێت، بۆیەکا حەز دەکات لەوە دڵنیابم نەبا راپۆرتی سیخوڕە نهێنییەکانمان ببێتە هۆی ئەوەی گومانی لێ بکەین.

شەریف پاشا ئەوەیشی نیشان دا کە بارودۆخی کوردستان بەرەو قۆناغێکی مەترسیدار دەچێت. هەرچی کوردی تورکیایە هەرگیز ناتوانن لەو سیاسەتی کوشتارو داپڵۆسینەی بیستەکانی تورك خۆش ببن.

(کۆمیتەی کوردی) بە سەرۆکایەتی بەدرخانییەکان لە دیمەشق بۆ سەربەخۆیی کوردی تورکیا خەبات دەکەن. لە ئێرانیش رووس بە پارەو لە رێگەی دیکەوە کورد دەبزوێنن، ئەگەر بەریتانیای گەورە دەستوبرد فریا نەکەوێت شتێك بکات ئەوا رووس بە شێوازێکی غەیرە موباشیر بۆمان دەگەنە کەرکووك‌و تەوقەسەری هەناردنی نەوتی عێراقی[79].

شەریف پاشا ئەوەیشی گێڕایەوە چۆن ساڵی ١٩١٩ بە رەهبەریی ئەو گفتوگۆی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆی پێکهاتوو لە هەر سێ پارچەکەی کوردستانی عێراق‌و ئێران‌و تورکیا کرا. ئەو پێی وایە جێگەی دلخە بەریتانیای گەورە لایەنگیریی ئەو پڕۆژەیەی نەکرد، ئێستەیش، وەك دەڵێت گرنگ ئەوەیە کوردستانی عێراق بە لایەنگری بەریتانیا بمێنێتەوەو ببێتە شوورایەك لەبەردەم پێشکەوتنی رووسدا، بەڵام کوردی عێراق لە لایەن عەرەبەوە باش مامەڵە ناکرێن، دەرفەتی خوێندنیان بە زوبانی زگماکی خۆیان بۆ نەڕەخسێنراوە، فەرمانبەری عەرەب دەنێرن بۆ حوکمڕانیان، زۆر پێویستە کورد دەزگای پەروەردەی تایبەتیی خۆیانیان هەبێت‌و فەرمانبەری کورد وڵاتەکەیان بەڕێوە ببات.

---

(79) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا قسەکەی شەریف پاشا بەم جۆرە دارێژراوە:

((Unless Great Britain did something soon, the Russians would, indirectly, be in Kirkuk and on top of our Iraq oil supplies))- N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, Iraq, File No. 3229, Iraqi Relations with Kurds, From Lord Kill earn, Cairo, No. 577(1327/3/45), Dated 29th November, 1945, P.35.

حەمزال شەریف پاشا گوتیشی حەز دەکات بزانێت هەڵوێستی ئێمە بەرانبەر ...ی دلمەزراندنی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عیراقدا چییە.

لە وەڵامدا پێم گوت: من ناتوانم وەڵامی ئەو پرسیارەی بدەمەوە، بەڵام ... دەزانم ئێمە هاوپەیمانی تورکیاو عیراق و ئێرانین، بۆیەکا نابێت هیچ ...ومیەك هان بدەین کە لەوانە بێت ببێتە هۆی لاواز بوونی ئەو ...میلەتانەمان. لێشم پرسی ئایا گومان لەوەدا هەیە کوردستانێکی ئۆتۆنۆمی ... جۆرە لە عیراقدا نابێتە ناوەندێکی ڕاکێشەر بۆ دروست بوونی ...ومیەکی لەو بابەتە لە کوردستانی ئێران و کوردستانی تورکیادا ؟.

حەمزال شەریف پاشا لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ ڕێی تێ دەچێت شتێکی وا روو ... گوتیشی ئەمە تەنها بۆ روون کردنەوە بوو، ئێمە پێوەندیمان هەر وەك خۆی دەمێنێت[80] و دوای ئەوەی ئەو وەکالەتەی لە سەرەوە ئامادەمان بۆی کرد دەکاتە دەستی دێتە سەردانم.

شەریف پاشا ماوەیەك لەگەڵ تورکە لاوەکان بوو، بەڵام لەگەڵ (کۆمیتەی ...کانی لاو) دا تێکچوو بۆیەکا ناچار بوو لە تورکیا هەڵبێت و بچێتە فەرەنسا، ...یش تورکە لاوەکان هەوڵیان دا تیرۆری بکەن[81]، ئەو لەوساوە بە یەکجاری لە ...رمنسە دەژی. شەریف پاشا خەڵکی سلێمانییەو وەك بیستوومە ڕۆڵێکی گەورەی دیوە لەو کۆششەدا کە دوای جەنگی ئەم دواییە بۆ سەربەخۆیی کوردستان دراوە.

شەریف پاشا هەمیشە خۆی بە دۆستی زۆر نزیکی ئێمە زانیوە، بەڵام لە ڕۆژانی جەنگی (دووەمدا– ك. م.) چەند ڕاپۆرتێکی نهێنی ئامادەیان بۆ ئەوە کردووە کە

---

(80) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەم بەشەی وەڵامەکەی شەریف پاشا بەم جۆرە دارێژراوە:

((He said that this present demarche was merely to keep "au courant", "demarche" us au courant))

...رمنسین و وەك زاراو بە واتای هەر وەك خۆی، یا تا ئێمرۆکەیش دێن. شایانی باسە سێر والتەر ...مارت بە تایبەتی خەتی بە ژێر ئەو دوو وشەیەدا هێناوە.

(81) باسی ئەوەمان لە سەرەتای بابەتی ژمارە چواری ئەم کتێبەدا کردووە کە بۆ (ناودارانی کورد لە ساڵی ١٩١٩)دا تەرخان کراوە.

پێوەندیی بە ئەڵەمانەکانەوە هەبووە[82] وەك بەشێك لە هەستی دژ بە رووسی (بڕوانە ١٦٠٠/٦/٤٢، هاوپێچ). زۆر روونو ئاشکرایە کە جەنەڕاڵ شەریف پاشا هەرگیز دژی بەریتانییەکان نەبووە، بەڵام وەك کوردپەروەرێك هەمیشە ئامادە بووە شتێك بۆ بەرەوپێش بردنی بەرژەوەندییەکانی کورد بکات، لەم بارەیەوە بڕوانە نامەی ژمارە ١١٢١/٣/٤٤ ی دەزگای (ئیستیخباراتی پاراستنی ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست)[83] کە زۆرو کەم ڕۆشنایی دەخاتە سەر ژیاننامەی ئەم پیاوە[84].

ئیمزا

واڵتەر سمارت

٢٦ی تەشرینی دووەمیساڵی ١٩٤٥))[85]

ئەم هەڵوێستەی شەریف پاشا، کە سێر واڵتەر سمارت لە یادداشتەکەیدا باسی دەکات، یەکێکە لە دەیان هەڵوێستی تری هاوشانیو باوەڕیش ناکەم ئەوی بیخوێنێتەوە، چ لە کوردو چ لە غەیری کورد، هەست نەکات ئەو پیاوە تا چ ڕادەیەك دیپلۆماسییەکی هاوچەرخو پڕ و دڵسۆز و شارەزایەکی چاکی پەتپەتێنی سیاسەت

---

(82) شەریف پاشا، هەمان کاتو بۆ هەمان مەبەست، پێوەندیی بە مۆسۆلینیشەوە کردووەو نوو نامەی بۆی ناردووە. بڕوانە: د. فەرهاد پیرباڵ، ژنەڕاڵ شەریف پاشا (١٨٦٥-١٩٥١). یەکەمی سیاسەتمەداری کورد کە داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆی بۆ کورد کرد، سلێمانی، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، ٢٠٠١، ل١٣٦-١٣٩.

(83) تەنها کورتکراوەی ناوی ئەو دەزگایە نووسراوە (S.I.M.E.) کە ئەمە دەقی تەواوی ناوەکەیەتی ((Security Intelligence Middle East)) واتا ((ئیستیخباراتی پاراستنی ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست)) کە دەزگایەکی سیخوڕیی زۆر چالاکی بەریتانی بوو، ساڵەکانی جەنگی دووەمی جیهانی پیاوەکانی بە ڕاستو بە چەپدا لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بە کوردستانەوە، گاڵەیان دەهات.

(84) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((more or less white- washing him)) کە بێگومان ئەوە دەگەیێنێت کە ئاماژەمان بۆی کردووە.

(85) N.A., F.O., 371/45346, Eastern 1945, Iraq, File No. 3229, Iraqi Relations with Kurds, From Lord Kill earn, Cairo, No. 1577(1327/3/45), Dated 29th November, 1945, PP. 34-36.

ـرـ یا لەوە دوودڵ بێت کە بە قووڵی بەرهەمەکانی ماکیاڤیللیی خوێندۆتەوە.
ـ کەم کورد سەری نەوازش بۆ ئەو پیاوە دڵسۆزەی ((قاچی لە پاریس‌و بیری لە
ـێتیا و دڵیشی لە کوردستان)) بوو[86] دانانەوێنێت‌و هەزار ڕەحمەت بۆ گۆڕە
ـکەی لە قاهیرە نەنێرێت، تایبەت دوای ئەوەی بە خامەی پیرۆزی خۆی پوختەی
ـەر بۆ کردووینەتە مۆنۆدرامایەکی[87] دانسقە[88]، بەڵێ کوردێکی وا دڵسۆز دەبێت
ـکە ئەستی ئەوەی ((لە پاریس لە ئوتێلێکی دەرەجە پێنجی ئەرمەنییەك))
ـکێتو پارەی ئوتێلەکەی نەبێت بیدات، بەڵکو ((پارەی ژەمێك خواردنی
ـەوە))یشی لە باخەڵدا نەبووبێت[89].

شایانی باسە دەنگوباوی ئەم هەوڵانەی دوایی شەریف پاشا، هەستی
ـەحمان بەگی بابانی بزواندووەو بەو بۆنەیەوە شیعرێکی ناوازەی بەسەردا
ـەوە[90](*).

ـ لێرەدا بچینە سەر باسی هەڵوێستی چین‌و دەستەیەکی دیکەی کوردستان کە
ـ ـەر رووەوە گەلێك لە شەریف پاشاو ئەوەی بەدرخان‌و جەمیل پاشای دیاربەکر
ـوون، بەڵام تەنانەت ئەوانیش لەبەر ئەوەی بە دەست یەك دوژمنەوە دەیاننالاند
ـ بە گەرمی، هیچ نەبێت لە سەرەتاوە، لە دەوری دروشمەکانی کۆماری مەهاباد
ـوردستان) ئالان‌و لەناو خۆیاندا کەوتبوونە پێشبڕکێی یەکتر لە بواری دەربڕینی
ـۆشەویستیاندا بەرانبەر یەکیەتی سۆڤیەت.

---

(86) بە کەمێك دەستکارییەوە لە مۆنۆدراماکەی وەرگیراوە.

(87) لە وشەی (Drama)وە هاتووە کە مانای هونەری شانۆییە.

(88) بڕوانە دەقی ئەو مۆنۆدرامایە لە: د. فەرهاد پیربال، سەرچاوەی ناوبراو، ل ١٢٤–١٣٣.

(89) هەمان سەرچاوە، ل١٣١.

(90) بڕوانە: محمود أحمد محمد، بەشێك لە دیوانی ئەورەحمان بەگی بابان، بەغدا، ١٩٨٩، ل٨١.

(*) ((شایانی باسە (عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری)یش، لەژێر ناونیشانی: (ژ بۆ شەریف پاشا) شیعرێکی بۆ نووسیوەو لەژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩١٩ی گۆڤاری (ژین) لە ئەستەنبوڵ بڵاوی کردووەتەوە—ع.زەنگەنە))

# هەڵوێستی ژمارەیەك

# دەرەبەگی کورد

فایلی ژمارە ٣٧١/٥٢٣٦٩ی ساڵی ١٩٤٦ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی گەلێك بەڵگەنامەی گرنگی دەربارەی کۆماری مەهاباد (کوردستان) تێدایە کە تەنها دەقی بەشێکی کەمی ڕاپۆرتی کاپتەن هـ.م. جاکسۆنی یاریدەری ڕاوێژکاری سیاسیی هەولێری لێ وەردەگرین کە تەرخان کراوە بۆ ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ سێ سەرەك هۆزی کوردستانی ئێراندا کردوویەتیو ئەمەی لای خوارەوەش دەقی وەرگێڕاوی ئەو بەشەی ڕاپۆرتەکەیەتی:

((١– دەرفەتێکی باش بوو لە نزیك سنووری عیراقی–ئێرانی، لە زینۆی شێخی(*) دیدەنی لەگەڵ سێ گەورە پیاوی کوردستانی ئێراندا بکەم، قەرەنی ئاغای قەڵاڕەشی سەرۆکی پیرانو شێخ موسڵیحی خزمی شێخ عوبەیدوڵلای زینۆ، کە وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی ئاڵوگۆڕەکانی ئازەربایجانی لێ وەدی دەهات... پاش پێشەکییەکی ئاسایی ئەم پرسیارانەم لێ کردن:

کاپتەن جاکسۆن: ئاغا گوندەکەت لە ئێران کەوتۆتە کوێوە ؟

قەرەنی ئاغا: گوندەکەی من قەڵاڕەشە، لێم ببورە ئەو گوندە لە ئێران نییە، بەڵکو لەناو ئازەربایجاندایە.

---

(*) ((زینویێ شێخی: گوندێکە کەوتۆتە نێوان حاجی ئۆمەران و ڕایات، بەدوو کیلۆمەترێك لە (ئازادی)یەوە دوورە، ڕۆڵێکی بەرچاوی لەشۆڕشی ئەیلوولدا هەبووە، وەکو زۆر لەگوندەکانی دیکەی کوردستان کە لەگەڵ گوندێکی دیکە بەجووتە ناویان دێت. زۆرجار ئەمیش لەگەڵ گوندی خەلان، واتە وەکو (زینویێ و خەلان) ناوی هاتووە. لەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول و ڕاگواستنی خەڵکی گوندەکان ئەمیش تێکدرابوو، لەدوای ڕاپەڕین جارێکی دیکە ئاوەدان کراوەتەوە، لەدەقەکەدا ناوی وەکو (زینۆی شێخی) هاتووە، ئەمویست دەستکاری ناوەکە بکەم، لەبیریشم کردبوو پەراوێزی بۆ بکەم، ئەوەبوو لەکاتی هەڵەبڕێری کۆمپیوتەردا (ئەیوب محەمەد بابەکر)ی هاوکارمان، کە بەڕەسەن خەڵکی ئەو گوندەیە، ناوە ڕاستەکەی نووسیبووەوە. کاتێ ئاگاداری سەرکردەوە، سەرەتا دەستخۆشیم لێی کرد، بەڵام کە دواتر جارێکی دیکە هەڵەبڕێری بابەتەکەم کردەوە بینیم لەدووتوێی بەڵگەماندا هاتووە بۆیە وەکو خۆیم داناوەتەوە، ئەوە بەچاوپۆشین لەوەی لە هەندێ سەرچاوەی دیکەش هەر بە (زینۆ) نووسراوە–ع.زەنگەنە)).

کاپتەن جاکسۆن: چۆن وای لێ هات؟ من پێم وابوو ئازەربایجان بەشێکە لە ئێران‌و ...ی باکووری ئەو وڵاتە پێك دەهێنێت.

قەرەنی ئاغا: نا، وا دیارە نەتبیستووە ئێستاکە ئێمە حوکمەتی خۆمانمان هەیە.

کاپتەن جاکسۆن: بەڵێ شتێکم دەربارەی ئەوە بیستووە، وابزانم شەڕێکی زۆر ...یش لەسەر ئەوە قەوماوە.

قەرەنی ئاغا: نەخێر وا نەبوو، سەرکەوتنێکی ئاسان بوو، لە گەلێك شوێن هیچ ...ە شەڕێکیش نەقەوما.

کاپتەن جاکسۆن: کەوابێ ئێوە زۆر باش چەکدارو ئامادە بوون، ئێوە لە کوێوە ...ھەموو چەکەتان دەستکەوت، ئایا کڕیوتانن؟.

قەرەنی ئاغا (بە فیزێکەوە): نەخێر، دڵنیابە نەمانکڕیون، بەڵکو لە رووسەکانی ...ستانەوە بۆمان هاتوون !.

کاپتەن جاکسۆن: بە ڕاستتە؟، من وام دەزانی رووسەکان لە هیچ کام لە ...ومکاندا بەشدار نەبوون، چونکە ئەوان بۆ خۆیان وایان دەگوت.

قەرەنی ئاغا: نۆ، کوڕە بەسییە، ئەوان لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی تەورێزو ...مرتییەش هەمان شتیان گوت، ئەوە تەنها بۆ سەر لێ شێواندنە[91]، ئەوان زۆر زۆر ...ممان دەدەن، بە وێنە پێنج سەد تفەنگ‌و نۆ لۆرییان داوە بە مەهابادی ئێمە، لە ...ھەموو شوێنێکی (کوردستانیش– ك. م.) تفەنگ‌و ئۆتومبیلیان دابەش کردووە، ئەوان ...ۆ ئێمە گەلێك باشن.

کاپتەن جاکسۆن: یەکەم جار هەرا لە کوێ قەوما؟.

قەرەنی ئاغا: ئۆە، لە مەهاباد. ئێمە یەکەم کەس بووین فەرمانبەرو سەربازە ...رسەکانمان لە مەهاباد وەدەر نا، دوای ئەوە ناوچەکانی دیکەش هەمان ڕێبازیان گرتە بەر.

کاپتەن جاکسۆن: کەواتە ئێوە ئێستا حوکمەتی خۆتانتان هەیە، لەوانەیە بگوترێت ...ووتریش.

---

(91) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی (bluff)ی بەکار هێناوە کە بلۆفی کوردی‌و عەرەبیی لەوەوە هاتووە، لە ...عەرەبیدا خراوەتە قاڵبی ڕابردوو و داهاتووشەوە: بَلَفَني، بَلَفْتُهُ...

محەمەد ئەمین ئاغا: نەخێر، بەڵام بەم زووانە بەخێری دایدەمزرێنین. ئێستەکە کێشەیەك لە نێو کورد و تورکماندا (مەبەستی ئازەرەکانە– ك. م.) هەیە، ئەوان دەیانەوێت حوکمەتێکی جیاواز لە تەورێز دابمەزرێنن، کوردیش دەیانەوێت حوکمەتێکی جیاواز بۆ خۆیان لە مەهاباد دابمەزرێنن.

کاپتەن جاکسۆن: ئەو جیاوازییەی نێوانتان چۆن چارەسەر دەکرێت؟.

قەرەنی ئاغا: بەڵێ قازی محەمەد ڕەهبەرمانە، ئەو چۆتە مۆسکۆ بۆ وتووێژ لەگەڵ ستالیندا، ئێمە لەوە دڵنیاین چ وەڵامێك لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتەوە، رووسەکان هەمیشە پشتی ئێمەی کورد دەگرن.

کاپتەن جاکسۆن: وا دیارە قازی محەمەد پیاوێکی گەورەیە، ئایا ئەو پیاوە نییە کە ڕەهبەری کۆمەڵەیە لە مەهاباد؟.

محەمەد ئەمین ئاغا: قوربان کۆمەڵە بەسەر چوو، ئێمە هەمووومان ئێستاکە دیموکراتین ((مەبەستی ئەوەیە بڵێت هەموومان لە (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان)ین– ك. م.))، بەڵام قازی محەمەد هەر سەرۆکمانە، هەڵبەت پیاوێکی یەکجار گەورمیە. ئینگلیزیو فەرەنسیو گەلێك زمانی دی دەزانێت.

کاپتەن جاکسۆن: ئایا ئێوە لە مەهاباد ڕۆژنامەی خۆتانتان هەیە؟.

قەرەنی ئاغا: بەڵێ زۆر نییە دەستی بە دەرچوون کردووە، رووسەکان چاپخانەیەك و کاغەزیشیان داوینەتێ.

کاپتەن جاکسۆن: ئایا ئێوە هیچ پیاوێکی گەورەی تری وەك قازیتان هەیە؟.

قەرەنی ئاغا: ئەی چۆن نیمانە، مەلا مستەفای بارزان کاری سەربازیی بەڕێوە دەبات، رووسەکان زۆریان خۆش دەوێت، قازی محەمەد زەویو زارێکی زۆری لە دەوروبەری شنۆ پێ داوەو نزیکەی نۆ هەزار دیناری عیراقیشی بۆ خۆی و لایەنگرەکانی کۆکردۆتەوە.

کاپتەن جاکسۆن: کەواتە بارزانی و پیاوەکانی لە شەڕەکانی ئێستەدا بەشدار بوون؟.

قەرەنی ئاغا: بەڵێ بەشدار بوون، ئەحمەد ئاغای مێرگەسوورو شێخ ئەحمەدی بارزان بەرپرسی بەرەی ڕەزائییە بوون، مەلا مستەفایش ناوچەکەی بەسەر کردۆتەوە.

یەکسەر بۆ رۆژی دواتر گەیشتە شنۆ کە لێرەوە نزیکەو بێ دواکەوتن لەوێشەوە چووە سەردەشت.

**کاپتەن جاکسۆن:** وا دیارە خەریکن سەردەشتیش بخەنە سەر ناوچەکەتان.

**قەرەنی ئاغا:** بەڵێ نەك هەر سەردەشت، بەڵکو سنەیش!.

**کاپتەن جاکسۆن:** کەی بەخێرێ ئەو کارە جێبەجێ دەکەن؟.

**قەرەنی ئاغا:** هەڵبەت ئەوە کارێکی پێویستەو زۆر ناخایێنێت!.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئایا لەوێ کەس هەیە کار بۆ ئێوە بکات؟.

**قەرەنی ئاغا:** بەڵێ هەمانە، حەمە ڕەشید خان یەکێکیانە.

**کاپتەن جاکسۆن:** بۆ حەمە ڕەشید خان ئێستا لە ئێرانە؟.

**قەرەنی ئاغا:** زۆر نییە لە عیراق هەڵهاتووە، رووسەکان لە رۆژنامەکانی خۆیاندا وایان راگەیاندووە کە بەریتانییەکان یاریدەی حەمە ڕەشید خانیان داوە بۆ ئەوەی هەڵبێت تاوەکو لەوێ (لە سەردەشت– ك. م.) هەرایەك دژی ئێرانییەکان بنێتەوە.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئەگەر ئێوە حوکمەتی خۆتان دامەزراند ئایا کادری تەواوتان هەیە بۆ ئەوەی بیبەن بەڕێوە؟.

**محەمەد ئەمین ئاغا:** ژمارەیەکی زۆر کادرمان هەیە، بەڵام رووسەکانیش گفتیان پێ داوین چی پێویست بێت بۆ ئەوە یاریدەمان بدەن، وێڕای ئەوەش ئێمە رێگەمان داوە سەرجەمی کارمەندە فەرمییە ئازەرییەکان لە شوێنەکانی خۆیان بمێننەوە.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئەی دەربارەی پارە چۆن؟، ئایا تاران دەستی نەگرتووە بەسەر پارەیەکی زۆرتاندا؟.

**قەرەنی ئاغا:** راستە وایە، بەڵام رووسەکان پێیان راگەیاندوین تاوەکو ئەو رۆژەی بەریتانی و ئەمەریکاییەکان دان بە حوکمەتەکەماندا دەنێن ئەوان پارەمان بۆ چاپ دەکەن.

**کاپتەن جاکسۆن:** بەڵام گریمان بەریتانی و ئەمەریکاییەکان ئەوەیان نەکرد، ئەوسا چۆن؟

**قەرەنی ئاغا:** نەخێر دانی پێدا دەنێن، ئەی ئەوە ئەوان نین ئەو هەموو قسانە دەربارەی مافی گەلە بچووکەکان دەجوونەوە؟.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئەی ئاخۆ وەزعی توتنی ئیمساڵتان خراپ نییە؟.

**قەرەنی ئاغا:** بەڵێ خراپە، تاران تا ئێستەکەیش دوو ملیۆن ریاڵی داهاتی ساڵی پارمان قەرزدارە، بەڵام رووسەکان دەڵێن ئەگەر تاران بەرهەمی توتنی ئیمساڵی نەبرد ئەوا ئێمە دەیبەین‌و دوو مایۆن ریاڵەکەی پاریشتان دەدەینێ.

**کاپتەن جاکسۆن:** وا پێ دەچێت رووسەکان حوکمەتەکەتان بەرێوە دەبەن؟.

**قەرەنی ئاغا:** ئای قوربان ئەوان گەلێك خاسن‌و باشترین دۆستی کوردن‌ هەرچییەکیان لێ داوا بکەین بێ سێ‌و دوو دەماندەنێ!.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئەی ئێوە بەرانبەر ئەو چاك یەی ئەوان چییان پێ دەدەن؟.

**قەرەنی ئاغا:** ئەوانیش مافی دەرهێنانی نەوتی (کوردستان– ك. م.)یان پێ دراوە

**کاپتەن جاکسۆن:** ئایا دەستیان بە کار کردووە؟.

**قەرەنی ئاغا:** بەڵێ، ژمارەیەکی زۆر ئەندازیاریشیان لە رووسیاوە هێناوە.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئەی ئاخۆ هەژارانی (کورد– ك. م.) لەم هەموو ئاڵو گۆڕتە چییان پێ دەبردرێت؟.

**قەرەنی ئاغا:** ئەوان زەوییەکانیان لە زەنگینەکانی تاران وەرگرتۆتەوە، وێڕای ئەوە خەریکین قوتابخانەو نەخۆشخانەو رێگەو بان‌و هێڵی شەمەندەفەریان بۆ دروست دەکەین.

**کاپتەن جاکسۆن:** وای بۆ دەچم دوای ئەوەی زەنگینەکانی تاران نەماون، ئاغلیفی (کوردی– ك. م.) وەك بەرێزتان زەوی‌و زار دەدەنە ئەو خەڵکە!.

**محەمەد ئەمین ئاغا بە گەرمی:** نەخێر ئێمە کۆمۆنیست نین، ئێمە دیمۆکراتین!.

**کاپتەن جاکسۆن:** وای بۆ دەچم سەربەخۆییەکەتان زۆر تەواو نەبێت، رووسەکـ حوکمەتەکەتان بۆ بەرێوە دەبەن، وێڕای ئەوەیش هەرچییەکتان پێویستە لە رووسیاوە دەیانهێنن.

**قەرەنی ئاغا:** بەڵێ، ئەوە تا خۆمان دەگرین، رووسەکانیش گفتی ئەوەیان پێ داوین.

**کاپتەن جاکسۆن:** کەواتە ئێوە کەوتوونەتە نێوان دوو ئاگرەوە، چونکە رووسەکـ پەیمانیان داوە لە یەکی مارتەوە ناوچەکە بەجێ بهێڵن !.

**قەرەنی ئاغا:** ئەوە هەر قسەیە، ئێمە دڵنیاین لەوەی ئێمە چەند پێویستمان پێ بێت ئەوان هێند دەمێننەوە.

**کاپتەن جاکسۆن:** چ گەلێکی ترتان لە ئازەربایجان سەندووە؟.

**قەرەنی ئاغا:** ئاشووری و ئەرمەن.

**کاپتەن جاکسۆن:** ئایا ئەرمەنەکان نیازیان نییە بچنە ئەرمینیای سۆڤیەتی تا لەوێ نیشتەجێ ببن؟

**قەرەنی ئاغا:** ئێمە بە رووسەکانمان گوتووە کارێکی خراپە ژمارەی دانیشتووانی ئازەربایجان کەم بکرێتەوە، ئەوانیش تەعلیماتیان دەرکردووە کە دەبێت ئەرمەنەکان هەر لەو شوێنانەی خۆیان بمێننەوە، وێڕای ئەوەیش گفتیان داوە بەم زووانە سێ ناوچەی تورکیاش بخەنە سەر ئازەربایجان.

لەم گفتوگۆیەوە بە روونی دیارە پڕوپاگەندەی رووس لە ئازەربایجان تەواو لەگەڵ بیروبۆچوونی عەشرەتییەکاندا دەگونجێت. بێگومان هەرچی سیاسەتی ئیجابی و ڕاستگۆی بەریتانیشە، وەک ئەو سیاسەتەی لە عیراق پەیڕەوی دەکات، لەوانە نییە لەگەڵ بیروبۆچوونی عەشرەتییە ساکارەکاندا بگونجێت، ئەوانەی هەرگیز بیر لە سبەی ڕۆژێ ناکەنەوە، بەڵام رووسەکان، بە پێچەوانەوە لە رێگەی جۆرە گفتێکی خێراوە کە ئەوانەیە جێبەجێی بکەن یا نا، توانیویانە کارێکی زۆر بکەنە سەر ناوچە کوردییەکان.

لە دوا دواشدا داوا دەکەم بەراوردێك بکەن لەنێوان ئەو شێوازی حەماس و ئاواتەی کوردی ئێران و ئەو ڕەشبینی و بێ هوودەییەی باڵی بەسەر ڕەواندزدا کێشاوە کەولبزانم، ئیمڕۆ یا دواڕۆژ، لەمدیو سنوور (مەبەستی ناو خاکی کوردستانی عیراقە– ك.م.) ڕەنگ دەداتەوە.

ئیمزا

جێگری یاریدەری

ڕاوێژکاری سیاسی

کاپتەن هـ. م. جاکسۆن، هەولێر)[92]

---

(92) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No. 19, Tour Notes: Deputy Assistant Political Adviser, Erbil, Rowanduz- Rayat, 6-9 January, 1946, PP. 65-70.

لەبەر بایەخی زۆری ڕاپۆرتەکەی کاپتەن جاکسۆن، باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا وێنەیەکی دەنێرێت بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی کە ڕۆژی چواردەی شوبات بەم نامەیەی لای خوارەوەی بیروبۆچوونی خۆی دەربارەی دەردەبڕێت:

((وەزارەتی هەندەران،

١٤ی شوباتی ١٩٤٦،

ژمارە ٥٩(إی ٩٣/١٩/٩٨٨)

سێر

١- بە شەوقێکی زۆرەوە نامەی ژمارە سی‌و یەکی هەژدەی کانوونی دووەمی ڕێزدارتان و ڕاپۆرتەکەی کاپتەن هـ.م. جاکسۆنی هاوپێچیشیم خوێندەوە کە دەربارەی کوردی ڕەواندزی کوردستانی عیراقن و وێنەی هەردووکیانم نارده باڵوێزخانەی حوکمەتی خاوەن شکۆ لە واشنتۆن و مۆسکۆ.

٢- بیروبۆچوونتان دەربارەی ئەوەی کە تەنها بەشێکی بچووک لە کوردستانی عیراق کەوتۆتە ژێر کاریگەریی پڕۆژەی سەربەخۆیی بزووتنەوەی (دیموکراسی)[93] لە ڕێگەی سنووری ئێرانەوە سەرنج ڕادەکێشێت، هەروەها زۆر بە گەرمی لەگەڵ ئەو بۆچوونەی بەڕێزتاندام دەربارەی پێویستیی بێ ئەندازەی نانی هەنگاوێکی ڕاستەوخۆ بۆ پاراستنی کورد لە ئەنجامەکانی ئەو ناڕەزاییە ڕەوایەی هەیانە. بەمەش لەوە دڵنیام کە ڕێزدارتان هیچ هەلێك لە دەست خۆتان نادەن بۆ ئەوەی ڕێگەی ڕاست نیشانی کارمەندانی حوکمەتی عیراقی بدەن‌و تێیان بگەیەنن کە وەزعەکە ترسناکەو تەحەمولی هیچ جۆرە دواخستنێك ناکات، بۆیەکا پێویستە لەسەریان دەستوبرد ئەو گفتە باشانەی لە ڕابردوودا داویانەتە کورد هەموویان جێبەجێ بکەن.

لەگەڵ ڕێزی زۆرمدا بۆ جەنابی سێر

لە خزمەتکاری ئەڵقە لە گوێتانەوە

پ. دەبلیو. پاکستەر))[94]

---

(93) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی دیموکراسی بەو جۆرە خراوەتە نێوان دو جووت کەوانی بچووکەوە.

(94) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No. 19, From Foreign office, S.W.1 14th February, 1946, No. 59 (E 988/19/93), To His Excellency Sir Hugh Stone hewer Bird, Baghdad, P.73.

سەرباری هەموو ئەوانەی گوتمانن باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا ڕاپۆرتەکەی کەپتەن جاکسۆن بە تایبەتی دەنێرێت بۆ خودی وەزیری هەندەرانی وڵاتەکەی سێر ئێرنست بێڤن و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی نامەکەیەتی:

((باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦،

ژمارە ٣١، ٤٦/٤/١٦٦،

سێر ئێرنست بێڤن

١- شەرەفمەند دەبم لەگەڵ ئەم نامەیەمدا وێنەی ئەو ڕاپۆرتەی هـ. م. جاکسۆنی یاریدەری ڕاوێژکاری سیاسیی هێزەکانی بەریتانی لە هەولێرتان سەبارەی بارودۆخی ڕەواندز لە کوردستانی عێراق، بنێرمە خزمەتتان. پێم وایە دوای خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە- ک. م.) لەگەڵم دەبن کە کاپتەن جاکسۆن وێنەیەکی یەکجار باشی بۆ بارودۆخی ئەو ناوچە زۆر بزێوەی وڵات کێشاوە، سەرنجە وردو بێ لایەنەکانی شایانی سوپاسن، گفتوگۆکانیشی لەگەڵ ئاغا کوردەکانی کوردستانی ئێران بایەخێکی زۆریان هەیە.

٢- من بەگشتی لەگەڵ بۆچوونەکانی کاپتەن جاکسۆن دام، چ خۆم و چ ستافەکەشم هیچ دەرفەتێکمان لەکیس نەداوە بۆ فشار خستنە سەر حوکمەتی عێراق دەربارەی ڕادەی بێ ئەندازەی پێویستیی چارەسەرکردنی سکاڵا ڕەواکانی کورد. ئەو سکاڵایانەی کاپتەن جاکسۆن ئاماژەی بۆیان کردووە هەر ئەوانەن کە سەرنجی منیشیان ڕاکێشاوە و هیوادارم هەموو ئەمانە ببنە هاندەری حوکمەتی (عێراق- ک. م.) کە ئاوڕ لە کورد بداتەوە.

٣- ڕاستە کورد هێزێکی گەلێك نوێ لەئاسۆدا وەدی دەکەن (دیارە مەبەستی یەکیەتی سۆڤیەتە- ک. م.) و حەز دەکەن بۆ ئەمیان دەست لە خۆشەویستە کۆنەکەیان هەڵبگرن. ئەوان ناتوانن لەوە بگەن کە حوکمەتی خاوەن شکۆ بێ وچان کار بۆ خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئەوان دەکات بێ ئەوەی هیچ جۆرە پەیمانێکی ئەوتۆیان بداتێ کە پێی جێبەجێ نەکرێت. هەڵبەت بەرهەمی

سیاسەتێکی لەو بابەتە کتوپڕ دەرناکەوێت، تایبەت ئەگەر لەگەڵ گفتە دڵخۆشکەرەکانی (دیموکراتەکانی)[95] ئازەربایجان[96] بەراوردی بکەین، هیچ نەبێت بۆ ئەوانەی کاولکردنی ڕەواندزیان لە لایەن رووسەوە لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمدا لەیاد نییە[97]. باوەڕ ناکەم لە بەشێکی پچووکی کوردستانی عیراق بەولاوە، ئەو بەشەی سوپای عیراق پایزی ڕابردوو لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی شەڕی تێدا کرد، بەو دەردەی ڕەواندز برابێت.

٤- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانی خاوەن شکۆ لە ئەنقەرەو قاهیرەو سەرۆکی بەڕێوەبەرێتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەریتانی لە قاهیرە. هەروەها بەشی سێیەمی ئەم نامەیەم لێرە دایە ڕاوێژکاری سیاسیی سەرەکیی مولحەقی سەربازیی ئەمەریکا، وەك زانیومە ئەویش ناردوویە بۆ واشنتۆن.

سێر شەرەفمەند دەبم لەگەڵ ڕێزێکی زۆرمدا خزمەتکاری هەرە دڵسۆزتان بم.

ئیمزا))[98]

---

(95) وشەی دیموکراتەکان لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوتی پچووکەوە.

(96) لە بەڵگەنامەکاندا لەباتی ناوی کوردستان زوو زوو ناوی ئازەربایجان دووپات دەبێتەوە، بۆیەک لێرەدا ئەوە وەبیر خوێنەری بەڕێز دەهێنینەوە، کە بە نیازی خراپو بۆ نانەوەی دووبەرەکیی نەتەوەیی و ئایینیی لە ڕۆژگاری ڕەزاشای پەهلەوییەوە، بەشێکی بەرفراوانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتی سوونی مەزهەب، بە مەهابادیشەوە، لە رووی کارگێڕییەوە خراوەتە سەر ئازەربایجانی شیعە مەزهەب بۆیەکا، وەك گوتمان، زۆر جاران لە نووسینی ڕۆژئاواییەکاندا ئاماژە بۆ ئەو ناوچانە لە ڕێگەی ئازەربایجانەوە دەکرێت نەك لە ڕێگەی کوردستانەوە.

(97) شایانی گووتنە دیپلۆماسیە ڕۆژئاواییەکان لەم بووارەدا ئەو ڕاستییە لەیاد دەکەن کە جەنراڵ باراتۆڤ (General Baratov)ی سەرکردەی هێزەکانی رووسیا لە کوردستان دایە پاڵ لەشکری سپی (الجیش الابیض) کە گەورەترین دوژمنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و دامەزراندنی یەکیەتی سۆڤیەتو لەشکری سوور (الجیش الاحمر) بوو بۆیەکا وڵاتە سەرمایەدارەکانی ڕۆژئاوا بە هەموو جۆر یاریدەی ئەو لەشکرەیان دەدا.

(98) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No. 19, From British Embassy, Baghdad, 18th January, 1946, No. 31/166/4/46, To: Sir Ernest Bevin, London, P.64.

حوتبەختانە لەگەڵ ئەم نامەیەی باڵوێزی بەریتانی بۆ ئێرنست بێڤن، بەشی سێیەمی ڕاپۆرتەکەی کاپتەن جاکسۆنی لەگەڵدایە ، وەك لە خوارەوە دەیبینین، کاپتن جاکسۆن لەوێدا باسی ڕێگەو بانو کەشو هەوای ڕەواندزیشمان بۆ دەکات.

تێبینییەکانی گەشتێك

جێگری یاریدەری ڕاوێژکاری سیاسیی هەولێر،

((ڕەولندز- ڕایات،

٦-٩ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦.

ڕێگەو بان:

١- هەولێر- باتاس- ڕەواندز- ڕێزان- ڕایات- زینوێ شێخی- گەلاڵە- پێرکوك- جندیان- دیانا- حەریر- هەولێر.

٢- وەزعی ڕێگەی سەرەکیی نێوان هەولێرو ڕایات زۆر باشە، بەلام پێویستە پردی گەلاڵە- ڕایات بێ دواخستن چاك بکرێتەوە، چونکە پەڕینەوەی چەکە قورسەکان لە هێوینی ڕابردوودا لەگەڵ لێشاوی بارانی ئێستە بەشێك لە پردەکەیان داتەپاندووە، چەند شوێنێکی ڕێگەکەیش ئیتر بەرگەی چەکی قورس ناگرێت. تاشە بەردی گەورەیش لە زۆر شوێن کەوتوونەتە ناو گەلیی عەلی بەگو ڕێگەی نێوان دەربەند و ڕایات. بەگشتی نیشانەی هیچ کارێکی چاك کردنی ڕێگەکە وەبەرچاو ناکەوێت.

کەش و هەوا:

١- لەو لای ڕایاتەوەو نزیك حاجی ئۆمەران ڕێگەوبان بەهۆی بەفرەوە گیراوە. لە ساڵە ئاساییەکاندا لە دەربەند بەولاوە جاروبار ڕێگە دەگیرێت.

پلەی گەرما بۆ ئەم وەرزەی ئێستە زۆر بەرزە، تەنانەت لە بەرزایی زینوێ شێخیش هەر بەرزە، لەوێ شەوو بەرەبەیان گەلێك ساردە، بەلام گەرمای ڕۆژ وا لەپیاو دەکات هەست بکات بەهارە نەك زستان، لێزمەی بارانێکی زۆریش گشت ناوچەکەی گرتۆتەوە.

**بارودۆخی سیاسی:**

١- ڕەواندز

أ- تەنها دوو شتی دڵخۆشکەر لە ناوچەی ڕەواندزدا هەیە- کەش‌و هەوو ئاهەنگی ئاشوورییەکان بە بۆنەی جێژنی سەری ساڵەوە. بە ڕاستی، نەك تەنها لای خەڵکی ناوچەکە بەڵکو بەلای حوکمەتی عیراقیشەوە، خۆشیی کەش‌و هەوای ئیمساڵ ڕەحمەتییەکی گەورەیە، ئەوەی تا ڕادەیەك لە ڕەنگدانەوەی قوربانییەکانی شەڕی ئێستەی کەم کردۆتەوە، چونکە بە لایەنی کەمەوە دانیشتووانی دەشتی دیانا دەتوانن لە دەواردا ژیان بەرنە سەر، زۆربەی ئاشوورییەکانی هاودیانیش، هیچ نەبێت لەبەر باران، توانییویانە ژوورێك لە ماڵە ئاوارە بووەکانیان چاك بکەنەوە، هەرچەندە کوردی هاودیان‌و ناوچەکانی دیکەی دەشتی دیانا هێشتا فریا نەکەوتوون شتێکی ئەوتۆ بکەن بۆ ئەوەی خانووبەرەکانیان وا لێ بکەن دەست بدەن بۆ ئەوەی تێیدا بژین. حوکمەتیش برێك گەنمی بۆ ناردوون بەو مەرجەی دوای دروێنەی بەرهەمی داهاتوو بیگێڕنەوە، بەلام کەس تاوەکو ئێستە پارەی قەرەبووی کشتوکاڵ‌و ناوماڵی وەرنەگرتووە هەرچەندە پارێزگاری هەولێر[99](*) گفتی داوە بەم زووانە شتێك لەو قەرەبووەی بڕیار دراوە هەر ئەوەندە لە بەغداوە بگات، دابەشی بکات. ڕێژەی نەخۆشیش لە ناوچەکە لەوە نزمترە کە چاوەڕوان دەکرا، بۆیەکا بە درێژایی دوو حەفتەی ڕابردوو، لە گشت ناوچەی دیانادا، چوار کەس مردوون، دکتۆری ڕەواندزیش لە هیچ کامیاند

---

(99) لەو ساڵانەدا خوالێخۆشبوو سەعید قەزاز پارێزگاری لیوای هەولێر بوو.

(*) ((ناوبراو لە ساڵی ١٩٠٤دا لەدایك بووە، لە ١٩٤٤/٨/١٤دا بۆتە جێگری متەسەڕفی لیوا (پارێزگای هەولێر)، لە ١٩٤٤/٩/١٧دا کراوەتە متەسەڕف، دیارە لەو ساڵانەدا بزووتنەوەکەی بارزان لەگەرمەی بووە، حکوومەتیش چەند کەسایەتییەکی کوردی لەخۆی کۆکردبووەو پلەو پایەی دابوونێ. بۆ زیتر زانیاری لەسەر ئەو پرسە بنۆڕە: سعید قزاز و دوره فی سیاسة العراق حتی عام ١٩٥٩، عبدالرحمن البیاتی، تقدیم د. کمال مظهر، ٢٠٠١. دیارە ئەمڕۆ بەڵگەنامەکان سەلماندویانە کە سەعید قەزاز چ لەڕاپەڕاندنی کاروباری دەوڵەت و وەزیفەکەی و چ لەڕاستگۆیی بۆ کوردایەتی، پیاوێکی بێ غەل و غەش بووەو بەسەربەرزیش چۆتە بەر پەتی سێدارە ـ ع. زەنگەنە)).

ـیـەی پێشکەش نەکردووە، هەر چواریشیان بە زات الرئە، یا بەهۆی نەخۆشیی ـکـە (مەعیدە)ەوە مردوون، دیارە نەخۆشییەکانی گەدە ئەنجامی بێ کەڵکیی ـەـکی خەڵکەکەیە.

ـ- هۆی سەرەکیی پەشێویی گشتیی ناوچەکە لەوانەیە مەجلیسی ـعـەی[100] بێت، کە خەڵکەکە بێ ئەندازە لێی وەڕسن. خەڵکەکە بەگشتی لەو ـیەتی میری نیازی نییە بەم زوانە ئەو حوکمی عورفییە لابەرێت، نەك تەنها ـەر ئەوەی دەیەوێت بە چەپۆکی ئاسنین ناوچەکە دابین بکات، بەڵکو هەمان ـت بۆ ئەوەیش چەند بتوانرێت هێند ئیعادەی ئیعتیبار (بۆ توانای دەوڵەت- ك. ـ کرێتەوەو لەو گۆشە نیگایەشەوە کە بارودۆخەکە تاوەکو ئێستە تەواو ئاسایی ـوتەوە... ئەو بێزارییەی جەماوەریش خەڵکەکە زۆرتر هان دەدات روو بکەنە ـەلات (واتا کۆماری مەهاباد (کوردستان) و یەکیەتی سۆڤیەت- ك. م.).

ج- راستە ئاواتی کوردی ناوچەی ڕەواندز بە براکانی ئەودیو سنوورەوە (واتا کوردستانی ئێران- ك. م.) بەستراوەتەوە، بەڵام ئەوە وا ناگەیێنێت ئەوان ئەو ـەی لەنێوانیاندا هێند خوێندەوارن بتوانن ڕەش‌و سپیی ناو وێنەکان بە ـوەتی لێك جودا بکەنەوە. کەمیی ڕادیۆو ڕۆژنامە هێندەی تر ئەو ئەرکەی دژوار کردووە بۆیەکا ناتوانن لەوە بگەن ڕووداوەکانی ئازەربایجان (مەهاباد) بەرەو کوێ ـچن. هەرچۆن بێت سێ خاڵی سەرەکی لە ئارادان کە زۆرینەی خەڵکی ناوچەکە ـیەخیان پێ دەدەن، ئەو سێ خاڵەیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

یەکەم: یەکێك لە ئامانجەکانی خەباتی ئازەربایجان (مەهاباد) سەربەخۆیی کوردە،

دووەم: یەکێك لە زلهێزەکانی جیهان[101] بە گەرمی پشتی ئەو خەباتەی گرتووە.

---

(100) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ( The Court Martial) کە مەجلیسی عورفی و هەمان کات ـەکەی سەربازیش دەگرێتەوە، دەبێت مەبەستی جاکسۆن ئەو حوکمی عورفییە بێت کە بەهۆی ـووتنەوەکانی بارزانی ١٩٤٣-١٩٤٥ـەوە لە ناوچەکەدا ڕاگەیێنرا.

(101) دیارە مەبەستی یەکیەتی سۆڤیەتە.

سێیەم: مەلا مستەفای بارزان‌و لایەنگرەکانی، کە حوکمەتی عیراق بە یاریدەی هۆزەکانی کورد کردنیە ئەودیو سنوورەوە، ئێستە لەپێناو ئازادیدا بەشدارێکی سەرەکین لەو خەباتەدا.

لەبەر ئەوەیش کە ئەوان دەزانن سنوورەکانی نێوان پارچەکانی کوردستان سنوورێکی دەستکردن، بۆیەکا لەوە دڵنیان ڕۆژێك لە ڕۆژان مەلا مستەفاو کوردی ئازەربایجان (مەهاباد)[102] روو دەکەنە عیراق. وێڕای ئەوەیش ئەو کوردانەی لەودیو سنوورەوە دێن ئەوە دەگێڕنەوە کە بارزانی نەك هەر ئەوەی کردووە بە تەنها یەکێك لە ئامانجەکانی، بەڵکو هەمان کات بۆ سزادانی ئەو کوردانەیش کە ساڵی ڕابردوو خیانەتیان لە پرسی کورد کرد.

د- با ئەوەیش بڵێین ساڵی ڕابردوو هۆزەکانی کورد یاریدەیەکی زۆری حوکمەتی عیراقییان داو لەوانەیشە ئەو کارە دیسانەوە دووپات بێتەوە. بە پێی بۆچوونی من، هەرچۆن بێت، چەند هۆیەك لە ئارادان کە دەبنە کۆسپ لەبەر دەم ڕوودانی شتێکی وادا، هی وەك:

یەکەم: بە پێی بۆچوونی من هیچ گومان لەوەدا نییە کە زۆربەی هەرە زۆری ئەو سەرەك هۆزانەی یاریدەی حوکمەتیاندا خراپترین نموونەی کوردن، لە ناو خەڵکدا خۆشەویست نین‌و ئەوەی پاڵی پێوەناون (بۆ یاریدەدانی حوکمەتی عیراق- ك. م.) بریتی بوو: لە دوژمنایەتیی شەخسییان‌و غیرە کردنیان‌و هەڵپەیان بۆ دەسکەوت، هی وەك شێخ ڕەشیدی لۆلان‌و شێخ ڕەقیبی سورچی‌و ئاغاکانی زێبار، کەس لەم ناوانە شەعبییەتیان نییەو ئاغایانی زێبار چونکە دڵڕەقن هەرگیز لە ناو خەڵکدا خۆشەویست نەبوون، ئەوان ساڵی پاریش بە کردەوە هیچ هەوڵێکیان نەدا بۆ ئەوەی وێنەی خۆیان لای خەڵکی چاك بکەن، ئەوان ئەمە باش دەزانن...[103].

---

(102) لەو شوێنەدا خۆمان ناوی مەهابادمان خستۆتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە.

(103) ڕاستێکەی حەزم نەدەکرد ئاماژە بۆ ناوی کەس بکەم، بەڵام پێم وایە بۆ ئێمڕۆی کورد زۆر پێویستە، بەر لە هەرشت، کەڵك لە وانەکانی مێژووی خۆیان وەربگرن.

دووەم: ساڵی ڕابردوو لەوەی دەکرد سەربەخۆیی کورد هێشتا هیوایەکی زۆر دوور بێت‌و چالاکییەکانی حوکمەتی عیراقیش دژی مەلا مستەفا وەک کۆششی میری بۆ سزادانی بنەماڵەیەکی سەرکێش‌و باوەڕبەخۆ کە هەمیشە لەگەڵ حوکمەتدا ناکۆکن، ئەنجامدار بێت، بەڵام ئیمڕۆکە بارودۆخەکە بە جارێک گۆڕدراوەو پێگەی هەڵوێستی مەلا مستەفا گەلێک پتەوە.

سێیەم: پڕۆپاگەندەی دەزگا چالاکی فەرمییە ناوچەییەکان‌و سوپای عیراق، لە ماوەی ساڵی ڕابردوودا، دیارو وەبەرچاو بوون. بەریتانیاش وەک یەکێک لە زلهێزەکان، لەو ڕۆژەوەی حوکمەتی عیراق دامەزراوە، هەمیشە جێ پێی لە باکووری ئەو وڵاتەدا قایم بووەو کوردیش بە چاوی دۆست‌و پارێزەر سەیریان کردووە، بەڵام لە نێو هۆزەکانی کوردەکانی هەندەراندا ئێستە ئەو پڕۆپاگەندەیەیان دژ دەکرێت کە بەریتانیا هەمیشە هێزێکی گەورە بووە لەپشت حوکمەتی عیراقەوە دژی مەلا مستەفا، بۆ ئەو مەبەستە سوپای عیراق لە لایەن بەریتانیاوە پڕ چەک دەکرێت، فڕۆکەو تۆپ‌و لۆریی ئەو سوپایە هەموویان بەریتانیا داویاننەتە سوپای ناوبراو بۆ لەناو بردنی مەلا مستەفا. بەڵام ئێستا دەوڵەتێکی گەورەی وەک ئەو لە گۆڕەپانەکەدا سەری هەڵداوە کە ئەگەر بە شێوازێکی فەرمیش نەبێت ئەوا بە شێوازێکی تایبەتی پشتی ئاواتەکانی کورد دەگرێت‌و هیچ نەبێت هانیان دەدات.

هـ. ڕەنگبێ ئەوەی لاوی ڕەواندز بیری نەبێت، بەڵام تەمەندارانی ئەو شارە بە ڕق‌و کینەوە هێرشی رووسیان بۆ سەر ناوچەی ڕەواندز و سووتاندن و تاڵانی و کاولکارییەکانیانیان لە یادە کە چۆن یالێکی گەڕیان دوای خۆیان جێ هێشت. بەڵام ئەو ڕاستییە هەڵوێست‌و کارە باشەکانی ئێستای رووس بەرانبەر کوردی ئازەربایجان (مەهاباد) ناسڕێتەوە، هەرچۆن بێت یاریدەی رووس لەوە باشترە کە هیچ یاریدەیەک لە کەس وەرنەگرن. لەگەڵ ئەوەیشدا زاراوی کۆمۆنیست‌و بەلشەفیک لەو زاراوانەن کە پیاوانی هۆزەکان و تەمەنداران دەتۆقێنن، هەرچەندە لەوانەیە تەنها پێویستییان بە چەکی رووس ئەوەیان لەبیر بەرێتەوە.

و- ئەوە هەڵەیە ئەگەر وا بزانرێت هەستێکی فروانی دژ بە بەریتانییەکان (لە ناو کورددا- ك. م.) لە ئارادایە، کوردەکان لەوە دەگەن بێ بەریتانییەکان وەزعیان لە عێراقدا دژوارتر دەبێتو لەوەیش دەگەن کە بەریتانییەکان گەلێك کاری چاکیان لە کوردستاندا کردووە. تا ئیمڕۆکەیش جۆرە هیوایەك هەیە بەوەی بەریتانییەکان مەیلیان بۆ کورد هەبێت، بەڵام ئەو هیوایەی کورد ئێستە تەواو کز بووەو وەك جاری جاران نەماوە. شتێکی سەیر نییە لەناو خوێندەوارانی کورددا بە توندی ڕەخنە لە بەریتانیا بگیرێت چونکە کاتی خۆی زۆر باسی بەیانی ئەتلەسی و مافی نەتەوە پچووکەکانی دەکردو ئێستەیش ئەوانەی لە یاد کردووە وەك ئەوەی هەر نەبووبن. بەڵام عەشرەتییەکان ئەوەیان لەیادە چۆن (کاتی خۆی- ك. م.) ئەفسەرە بەریتانییەکان گیانیان کردەوە بە بەر ڕەواندزی هەڵتەکێنراوو کاول کراودا.

ز- ڕۆژی یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ داواکردنی لەدایك بووانی ساڵی ١٩٢٧ بۆ سەربازیی بووە سەرباری هۆ ڕەشبینییەکانی کورد دوای ڕوودلوە جەرگبڕەکانی پار کە بە جارێك چارەی لەشکری عێراقییان لا ڕەش بووە... تەنانەت دەزگا کارگێڕییە ناوچەییەکانیش بیرەوەریی تاڵیان دەربارەی ئەو ڕووداوانە لە دڵدایە. ئەو بانگهێشتنەی لەدایك بووانی ساڵی ١٩٢٧ هێندەی دیکە قورس هاتە بەر چاو چونکە بەدەلی پەنجا دیناریش[104] پارەیەکی زۆرەو بە هەمووان نادرێت))[105].

بێگومان هەموو ئەمانە گەورەیی کۆماری مەهاباد (کوردستان) و ڕەنگدانەوەی لە بەشەکانی دیکەی کوردستاندا نیشان دەدەن، ئەو بابەتەی لە گەلێك فایلو

---

(104) لە عێراق، لە ڕۆژگاری پاشاییدا، ئەو لاوانەی کاتی سەربازییان دەهاتو لە قوتابخانە نەبوون دەیانتوانی پەنجا دینار بدەنو لەباتی دوو ساڵ تەنها سێ مانگ سەربازی بکەن، ئەوەی پێیان دەگوت بەدەل کە لە (بدل)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، ئەو یاسایەش لەبەر دوو هۆ دانرابوو، یەکەمیان دلنیا کردنی داهاتێك بوو بۆ بودجەی دەوڵەت کە ئەوسا زۆر لاواز بوو، دووەمیشیان بۆ یاریدەدانی کوڕی پارەداران بوو، تایبەت ئەوانەیان کە لایەنگری دەوڵەت بوون.

(105) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No. 19, From British Embassy, Baghdad, 18th January, 1946, No. 31/166/4/46, To: Sir Ernest Bevin, London, PP. 65-70.

ـکـنامەی تردا بە روونی ڕەنگی داوەتەوە، بە ڕادەیەك سەرجەمی بەڵگەنامەکانی
ـیـ ژمارە ٤٥٥٠٣/٣٧١ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی بۆ بابەتی
خۆپیشاندان بۆ پشتگیریی سەربەخۆیی کورد ساڵی ١٩٤٥))[106] تەرخان کراون.

ـو فایلەدا دەیان بەڵگەنامەی بایەخدار دەربارەی کۆماری مەهاباد
کوردستان) و دەنگدانەوەی و پەخشەی ڕێکخراوە کوردییەکانو ڕاپۆرت و نامەی
ـرمەستانی ئینگلیز لە لەندەنو تاران و بەغداو ئەنقەرە هەڵگیراوە، وێڕای
ـرمیەك بەڵگەنامە بە زوبانی فەرەنسی کە مێژووی هەموویان دەگەڕێتەوە
ـومەندی چلەکانی سەدەی ڕابردوو. لە یەکێك لەو ڕاپۆرتانەدا، بە وێنە، ئەم
ـرنەی دەربارەی کوردو کوردستان تێیدا هاتووە:

| | ڕووپێوی گشتی بە کیلۆمەتری چوارگۆشە | ناوچە کوردنشینەکان بە کیلۆمەتری چوارگۆشە ڕێژەیان | کۆی ژمارەی دانیشتووان | ژمارەی کوردو ڕێژەیان |
|---|---|---|---|---|
| تورکیا | ٧٦٠٠٠٠ | ٢٢٠٠٠٠ (٢٩٪) | ١٦٢٠٠٠٠٠ | ٤٠٠٠٠٠٠(٢٥٪) |
| ئێران | ١٦٠٠٠٠٠ | ١٩٠٠٠٠ (١٢٪) | ١٥٠٠٠٠٠٠ | ٣٥٠٠٠٠٠ (٢٣٪) |
| عیراق | ٤٥٠٠٠[107] | ١٠٥٠٠٠ (٢٩٪) | ٣٥٠٠٠٠٠ | ١٠٠٠٠٠٠(٢٨٪)[108] |

لە هەمان فایلدا نامەیەکی فەرمی و نهێنیی کۆنسوڵی گشتیی بەریتانی لە
تەورێز ج. دەبلیو. وڵ (J.W. Wall)ی تێدایە کە ڕۆژی حەوتی مایسی ساڵی ١٩٤٥
ناردوویە بۆ سێر ڕیدەر بۆلادری باڵوێزی بەریتانی لە تارانو ئەمیش ڕۆژی شازدەی

(106) N.A., F.O., 371/45503, Demonstration in favour of Kurdish Independence.

(107) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ژمارەکە بە هەڵە ٣٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە نووسراوە.

(108) N.A., F.O., 371/45503, Demonstration in favour of Kurdish Independence, PP. 10, 19.

هەمان مانگ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیی‌و تێیدا باسی ((ئاهەنگی سەربەخۆیی کورد لە مەهاباد)) دەکات‌و دەڵێت ((هەر بژی ستالین ئازادکەری نەتەوە بچووکەکان)) یەکێك لە دروشمە سەرەکییەکانی ئەو ئاهەنگە بوو.

بەپێی هەمان بەڵگەنامە ئەمانە کوردی بەشەکانی دیکەی کوردستانیان بزوواندووە، بەر لە هەموانیش شارە کوردەکانی تورکیا، تایبەت دیاربەکر، کە زنجیرەیەك خۆپیشاندانی پشتگیرییان ساز کردووەو ((هێزە چەکدارەکانی تورکیا دەسرێژیان لێ کردوون و بەپێی هەواڵەکانی ١٢٠ (بەڵێ تەنها سەدوبیست– ك. م.) ناوداری کورد لەسەر ئەوە گیراون و لەسێدارە دراون))[109].

کاتێك بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە دێنە سەر باسی خودی مەهاباد، هەندێك شت دەگێڕنەوە کە پێم وایە کەسمان چاوەڕوان نەبووین ئەو شتانە لە مایسی ساڵی ١٩٤٥و تەنانەت بەر لەوەیش روویان دابێت، وەك باسی ((خۆ ئامادە کردن بۆ دامەزراندنی لەشکری سەربەخۆی کورد)) و ناوزەد کردنی قازی محەمەد بۆ پۆستی ((سەرەك کۆماری کورد)). هەر لەوێدا بەڵگەنامەکە دەڵێت:

((بەڵام دوو کەس بزوێنەری سەرەکیی رووداوەکانن– خەلیل بلوری‌و عەزیزی فەیزوڵلا بەگی[110]، ئەو دووانەی ڕۆژی پازدەی شوبات ئاژاوەچییانیان هان دا هێرش بەرنە سەر پۆستی پۆلیسی مەهاباد. وەك دەڵێن: ئەو دووانە پیاوانی هۆزەکانی دەوروبەری مەهاباد هان دەدەن بدەنە پاڵ لەشکری سەربەخۆی (کوردستان– ك. م.) دژی فەرمان‌و ئارەزووی سەرۆکەکانی خۆیان، ئەوانەی داوایان لە سەرلەشکری ئێرانی لە تەورێز کرد فریایان بکەوێت، ئەمیش یاریدەرێکی خۆی ناردە مەهاباد بۆ سۆراخی ئەو هەواڵانە، هیوادارم دوای گەڕانەوەی لە نزیکترەوە ئاگاداری هەواڵەکانی مەهاباد بم.

موخبیرێکمان لە ڕەزائییە (کە هەواڵەکەی پێویستیی بە بەدواداچووندا هەیە) دەڵێت سەردارانی شکاك‌و هەرکی‌و بەگزادە چەند کۆبوونەوەیەکیان لە نزیك شار ساز داوەو سوورن لەسەر ئەوەی هاوکاریی کوردی مەهاباد بکەن. وا دیارە ڕەهبەرانی ئەم هەڵوێستە بریتین لە تاهیری کوڕی سمکۆی شکاك‌و ڕەشید بەگی هەرکی‌و سەعید خان

---

(109) Ibid, From: Sir R. Bullard, Tehran, To: Foreign Office, No. 245/90/A-7/45, 16th May, 1945.

(110) گەلێك سوپاسی برای بەڕێز مامۆستا هاشمی کەریمی دەکەم کە چەند ناوو رووداوێکی ناو ئەم بابەتەی بۆ روون کردوومەتەوە.

بەگی برای. هەرچی عەمەر خانی شکاکە (یاریدەری ڕابردووی سمکۆ) وا دیارە خۆی دوورەپەرێز گرتووە.

((وا پێ دەچێت جموجۆڵی کوردی مەڵبەندی ڕەزائییە تا ڕادەیەك بووبێتە هۆی ناڕەزایی تودەییەکانی گوندەکانی ئەو ناوچەیە. ئەو گوندنشینانە، کە هیچیان دژی کوردە شەڕخوازەکان لە لایەن کۆمیتەی ناوچەیی تودەوە بۆ نەکرا، پەنایان بردە بەر پارتی تودە خۆی. ژمارەیەك لە سەرەك هۆزەکانی کورد بۆ ئەم کارە هانیان دان، یەکێك لەوانە زیرۆ بەگی هەرکی بوو.

ڕاپۆرتێکی تر کە لە مەهابادەوە پێمان گەیشتووە، باسی ئەوە دەکات چۆن سێ حەفتە لەمەوبەر کاتێك جێگری کۆنسوڵی سۆڤیەتی لە ڕەزائییەوە هاتۆتە مەهاباد بە بۆنەی کردنەوەی لقی ((کۆمەڵەی ڕووناکبیریی ئێرانی-سۆڤیەتی))یەوە لەوێ گاردی شەرەفی لەشکری سەربەخۆیی تازە دامەزراوی کورد پێشوازیی کردووە))[111].

وەك چاوەڕوان دەکرا بەو شێوازە لایەنەکانی ئابووری و تێکەڵاویی ژیانی ئابووریی پارچەکانی کوردستانو ڕەنگدانەوەی ئەو فاکتەرە لەسەر هەڵوێستی سیاسیی گشت لایەنەکان لەناو دوو توێی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا بە زەقی خۆ دەنوێنن. لەم بووارەدا پەنا دەبەینە بەر بەشێکی کەمی ڕاپۆرتێکی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی کە ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە کۆماری مەهاباد (کوردستان)ـەوە هەیە.

لە هەمان فایلی ژمارە ٣٧١/٥٢٣٦٩ی وەزارەتی هەندەراندا ڕاپۆرتێکی دوورو درێژی بەشی توێژینەوەی ئەو وەزارەتە هەڵگیراوە کە لە حەڤدە خاڵی سەرەکیی پێکهاتووەو لە گەرمەی ڕۆژانی کۆماری مەهاباد (کوردستان)دا نووسراوەو سێ خاڵی کۆتایی ڕاپۆرتەکە بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان کراونو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ئەو سێ خاڵەیە:

((١٥- دوو خاڵ هەن لەوانەیە وا لە پرسی کوردستانی تورکیا بکەن بایەخێکی زۆری بۆ حوکمەتی سۆڤیەتی هەبێت، یەکەمیان بریتییە لەوەی لەو ویلایەتانەدا، کە بە ویلایەتی کوردیی دەژمێردرێن، لەوانەیە نەوت بدۆزرێتەوە.

---

(111) N.A., F.O., 371/45503, Demonstration in favour of Kurdish Independence, PP. 56-58.

کۆمپانیای ستاندەرد ئۆیل[112] لەوە گەیشتووە بۆیەکا هەوڵی داوە مافی دەرهێنانی ئەو نەوتەی بدرێتێ.

١٦) دووەم خاڵیشیان بوونی کوردە لە سایلیزیاو کورداغ (شاخی کورد) لەسەر سنووری نێوان تورکیاو سووریاو لە دووری سی‌و پێنج میل لە بەندەری ئەسکەندەروونەوە، ئەوەی لەوانەیە رووسەکان بیکەنە بیانوو بۆ گەورەکردنی رووپێوی کوردستان بە جۆرێك ئەو بەندەرەیش بگرێتەوە.

ئەم داخوازییە دەشێت شانبەشانی چاوتێبڕینی ئەمەریکاییەکان لە سایلیزیا دابنرێت، تا بەڵکو بخرێتە تای یەك تەرازووەوە لەگەڵ پرۆژەی جۆرجییەکان لەمەڕ شاخی توورووس، لەوانەیشە هیچ کامێکیان سەر نەگرێت.

١٧) زەحمەتە بیر لەوە بکرێتەوە کە لەوانەیە تورك هیچ جۆرە سازشێك لە بواری ئازادیی کوردانددا بکەن، تەنانەت ئەگەرچی تورکیش لەو گەلانە بن بە سروشتو نەریت ئامادە بن لە رێگەی نانی هەنگاوێکی لیبرالییەوە بۆ قازانجی خۆیان بیقۆزنەوە، ئینجا لەگەڵ ئەوەیشدا عەقڵ هەرگیز تەسەوری ئەوە ناکات تورك لەژێر فشاری رووسدا هەنگاوێکی وا لەگەڵ کورددا بنێن‌و تەنانەت ئەگەر لەسەر کاغەزیش ئەوەیان کرد بە کردەوە هیچ ناکەن. ترس لەوەی باری کەمینەیەك بەرەو ئۆتۆنۆمی بچێتو خودموختارییەکەش بەرەو سەربەخۆیی بڕوات ئەوە وەك تیغێکی کوشندەیە ئاراستەی سیاسەتی تورك کردنەکەیان دەکرێت، بۆیەکا بە لایانەوە باشتر وایە شەڕ بکەن وەك لەوەی خۆیان بخەنە گێژاوێکەوە ببێتە هۆی لەدەست دانی بەشێکی زۆری وڵاتەکەیان و دانیشتووانی ئەو وڵاتە.

بەشی توێژینەوە،
وەزارەتی هەندەران،
٩ی مایسی ١٩٤٦))[113]

---

(112) ((Standard Oil Company)) یەکێکە لە کۆمپانیا نەوتییە هەرە کۆن‌و گەورەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو هەموو جیهان، سەرەتای دامەزراندنی دەگەڕێتەوە ساڵی ١٨٦٣، ماوەیەکی زۆر ٩٠-٩٥٪ی نەوتی ئەمەریکای بە دەستەوە بوو، هەر زوویش دەستی گەیشتە کانە نەوتە دەوڵەمەندەکانی رۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست، بە کوردستانیشەوە. بڕوانە:
Internet, B.S. Beth, British oil policy 1919-1939, London, 1985, PP.1-5, 41-44, 93, 103-108, 132 etc.

## چەند نموونەیەکی دەگمەنتر لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بەریتانیدا دەربارەی کۆماری مەهاباد (کوردستان)

بێگومان ئەوانەی تا ئێستا لەم بابەتەدا دەربارەی کۆماری مەهاباد (کوردستان) پێشکەشمان کردوون پەردە لەسەر ڕووی گەلێك ڕووداوی نەزانراوی ئەو کۆمارە لا دەدەن، ئینجا لەگەڵ ئەوەیشدا ژمارەیەکی زۆر فایلی دیکەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی تەرخان کراون بۆ باسی مەهابادو شتی یەکجار حەپەسێنەریشیان تێدا هەڵگیراوە. فایلی ژمارە ٢٥٩٦/١٩٥ یەکێکە لەو فایلانە کە ئەمەی لای خوارەوە پوختەی پێناسەکەیەتی.

ئەم فایلە ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، کە بۆ خۆم ژماردمن دەرچوو ٩٧ لاپەڕەیە، گەلێك لە لاپەڕەکانی هەردووك دیویان نووسراون، دوو نەخشەی گەورەی کوردستانو وێنەی ڕۆژنامەیەکی تێدایە کە وتارێکی لەسەر کورد بڵاو کردۆتەوە. مێژووی بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە چواردەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٦و مێژووی دوا بەڵگەنامەیشی سیو یەکی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵە.

لەسەر بەرگی یەکەمی فایلەکە نووسراوە ((باڵوێزخانەی بەریتانی، ئەنقەرە، ژمارە ١٤، ئەوپەڕی نهێنی، ناوی فایل: کورد و کوردستان، ئەوپەڕی نهێنی)). شایانی باسە لەسەر بەرگی پشتەوەی هەمان فایل جارێکی دیکە بە گەورەیی نووسراوە ((ئەوپەڕی نهێنی))، واتا سێ جار لەسەر هەردووك بەرگی ئەم فایلە ڕستەی ((ئەوپەڕی نهێنی)) نووسراوە.

ڕاستە چەند بەڵگەنامەیەکی ناو ئەم فایلە لە فایلەکانی تری هەمان وەزارەتدا هەن، وەك بەشێك لە ڕاپۆرتەکەی کاپتەن جاکسۆن، بەڵام من بۆ خۆم تا ئێستا لە وێنەی ئەم قەڵغانی (نهێنی)یەم لە هیچ فایلێکی تردا بەدی نەکردووە[114].

لە گەلێك ڕووەوە بەڵگەنامەکانی ناو فایلی ژمارە (٥٢٧٠٢/٣٧١)ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیش بایەخێکی زۆریان بۆ بابەتی کۆماری مەهاباد (کوردستان)

---

(113) N.A., F.O., 371/52369, Eastern 1946, Iraq, File No. 19, The Kurds of Turkey, Research Department, From Foreign office, 29th May, 1946, PP. 26-35.

(114) N.A., F.O., 371/52369, British Embassy, Angora, No.14, Top Secret, Name of File: Kurds and Kurdistan, Top Secret.

هەیە[115]. ژمارەی لاپەڕەکانی ناو ئەم فایلە سەدو حەفتاو دوو لاپەڕەیە، حەڤدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ مێژووی یەکەم بەڵگەنامەی و یەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٧ مێژووی دوا بەڵگەنامەکەیەتی، ژمارەیەك لە لاپەڕەکانی لە هەردووك دیویان نووسراوە، چەند پارچە ڕۆژنامەیەکی تێدا هەڵگیراوە کە وتاریان دەربارەی کورد و کۆماری مەهاباد (کوردستان) تێدایە، هی وەك وتارێکی م. فلیپس پرایس کە بە ناوونیشانی ((ڕێگە بەرەو دیمەشق)) ڕۆژی بیستو شەشی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ لە ڕۆژنامەی ((مانچستەر گاردیان))دا بڵاوی کردۆتەوە[116]. وا دیارە ئەم فایلە لەلایەن توێژەرانو کەسانی ترەوە زۆر بەکار هاتووە بۆیەکا چ بەرگو چ لاپەڕەکانی بەجارێك پەرێشانن.

ئەم فایلە پڕییە لە بەڵگەنامەی بایەخدار دەربارەی ناکۆکییەکانی نێوان قازی محەمەدو جەعفەر پێشەوەریی سەرەك کۆماری ئازەربایجان[117] کە دەیویست کۆماری مەهاباد (کوردستان) بریتی بێت لە خودموختارییەکی ناوچەیی ژێر دەستەی ئازەربایجان، وەك ئەو ڕاپۆرتە گرنگەی جێگری کۆنسوڵی بەریتانی لە تەوریز ڕۆژی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٤٦ ناردوویە بۆ سێر ڕیدەر بۆلارد لە تاران[118].

لە هەمان فایلدا ئەم بەڵگەنامە گرنگەش دەربارەی هەڵوێستی حەمە ڕەشید خانی بانە هەڵگیراوە:

---

(115) N.A.,F.O., 371/52702, Eastern 1946, Persia, File No.104.

(116) Ibid, P.42., M. Philips Price, The Road to Damascus, -(Manchester Guardian), Manchester, 26th January, 1946.

(117) شایانی باسە، بەر لەوەی لەشکری ئێرانی بگاتە تەوریز، جەعفەر پێشەوەری و هاوەڵەکانی هەڵهاتنە ناو خاکی ئازەربایجانی سۆڤیەتییەوە، پاش ماوەیەك پێشەوەری بە کارەساتی ئۆتومبیل گیانی لەدەست دا، دەنگوباسێکی وا بڵاو بۆوە کە باقرۆڤی سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی سۆڤیەتی و یەکێك لە کاربەدەستە هەرە نزیکەکانی ستالین پیلانی وەرگەڕانی ئۆتومبیلەکەی پێشەوەریی دارشتووە، هەمووی چەند ساڵێکی نەخایاند دوای مردنی ستالین کە باقرۆڤ بۆ خۆیشی لەسێدارە درا. باقرۆڤ گەلێك عەزیێتی بارزانییەکانیشی دابوو. لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا بۆ خۆم دەرێژەی ئەم هەواڵانەم لە ئازەرییەکانی باکوو کوردە پەنابەرەکانی وەك دوکتۆر ڕەحیمی قازی و دوکتۆر عەلی گەلاوێژ بیستووە.

(118) N.A.,F.O., 371/52702, Eastern 1946, Persia, File No.104, PP. 35-36.

((بە شفرە،
لە تارانەوە بۆ بەغدا،
سێر ڕ. بۆلارد،
ژمارە ٣،
٣ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦،
وێنەی لێ دراوەتە وەزارەتی
هەندەران، ژمارە ١٤،
حوکمەتی هند،
دایەرەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی
بەریتانی لە قاهیرە.

نیشانە بە بروسکەی ژمارە نەوەتتان. بەپێی ڕاگەیاندنی سەرۆکی ستافی گشتیی سوپای ئێران حەمە ڕەشید (خانی بانە– ك. م.) سنووری بەزاندووەو[119] ئێستا لە مەهاباد لەگەڵ قازی محەمەددا خەریکی پیلان گێرانە.

سەرۆکی ستافی گشتیی سوپای ئێران ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە دەزگا بەرپرسەکانی عیراق ڕایان گەیاندووە کە نەیانتووانیوە حەمە ڕەشید بگرن‌و کە دەربارەی ئەوە لێی پرسرا گوتی ئەو بەو جۆرە ئاگادار کراوە.

تکا لە وەزارەتی هەندەران دەکەم بروسکەی ژمارە سێ‌و ژمارە نۆیشم بنێرن بۆ بەغداو حوکمەتی هند.

وێنەی دراوەتە بەغداو بەپێی ژمارە چواردەی وەزارەتی هەندەران‌و بە لقی دایەرەی تەلەگرافی هند بۆ گەیاندنی بە حوکمەتی هند))[120].

پێم وایە گرنگترین بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە دەربارەی ڕاپۆرتی ئەو کارمەندەی ئیستیخباراتی بەریتانییە، کە بە تایبەتی لە لەندەنەوە ناردوویانەتە سووریاو کوردستانی عیراق تەنها بۆ ئەوەی لە نزیکەوە دەرسی ڕادەی کارتێکردنی

---

(119) ئەو کات حەمە ڕەشید خان دوور خرابۆوە عیراق.

(120) N.A.,F.O., 371/52702, Eastern 1946, Persia, File No.104, Cypher, From Tehran to Baghdad, Sir R. Bullard, No.3, 36 January, 1946, Reported to Foreign Office, No.14, Government of India, British Middle East Office Cairo, P.3.

پڕۆپاگەندەی سۆڤیەتی لەسەر کوردو ئەو هەنگاوانەی پێویستە دەزگا بەریتانییە پەیوەندیدارەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو پڕوپاگەندەیە بینێن. شایانی باسە لە هیچ کام لە بەڵگەنامەکاندا ناوی ئەو کارمەندە نەهاتووە، کە دوور نییە ئەفسەرێکی دەرەجەدار بووبێتو ((رووسیا و کورد))یشی کردۆتە ناونیشانی راپۆرتەکەی[121]. ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوی خاڵە سەرەکییەکانی راپۆرتەکەی ئەو کارمەندەیە کە بە ئیمزاو لێدوانی لیوا ماکنایەوە ڕۆژی بیستو حەوتی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦ نێردراوە بۆ ئەو دەزگایانە:

((نهێنی،

ستافی گشتیی دەزگای زانیاریی

(ئیستخبارات– ك. م.)، سەرکردایەتیی

گشتیی هێزەکانی ڕۆژهەڵاتی

ناوەڕاست،

٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦[122]،

بەڕێوەبەری دەزگای زانیاریی (م. ئای. ٣)،

دایەرەی جەنگ،

لەندەن، س. دەبلیو. ١.

١– ماوەیەکی زۆر نییە کارمەندێکمان ناردۆتە سووریاو باکووری عیراق بۆ ئەوەی دراسەی وەزعی کورد بکاتو بۆ پێشکەشکردنی هەر پێشنیارێکی پێویستی بە بیردا دێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی پڕوپاگەندەی سۆڤیەتی[123]. راپۆرتەکەی هاوپێچی ئەم نامەیەیە.

٢– من نامەوێت دەربارەی راپۆرتەکە، کە سەروبەری راپۆرتێکی سیاسییە، هیچ بڵێم، تەنها ئەوە نەبێت کە لەگەڵ دێڕی یەکەمیدا نیم وەك بنەمایەکی وتووێژ،

---

(121) Ibid, Russia and the Kurds, 10 January, 1946, P.49.

(122) لە باتی ساڵی ١٩٤٦ بە هەڵە ساڵی ١٩٤٧ چاپ کراوە.

(123) دەقی ئینگلیزییەکەی بەم جۆرەیە:

((1-An observer was recently sent into Syria and Northern Iraq to study the Kurdish situation and to make any Suggestions thought necessary to offset Russia propaganda. His report is attached)) (N.A.,F.O., 371/52702, Eastern 1946, Persia, File No.104, P.48).

هەر وەك چۆن لەگەڵ ئەوەیشدا نیم کە ئێستا کاتێکی لەبارە بۆ جێبەجێ کردنی برگەی یەکەمی ((پێشنیارەکانی دەستبەکار بوون)) (مقترحات العمل).

٣- هەرچۆن بێت کێشەی کورد کاتێك بۆ ئێمە دەبێتە دیاردەیەکی ترسناکی گەورە کە رووسیا بیر لەوە بکاتەوە کەڵك لە دەستکەوتەکانی ئازەربایجان وەربگرێت بۆ کارکردنە سەر کوردی عێراق.

رووسیا بانگهێشتی ژمارەیەك لەو سەرکردە (کوردانەی- ك. م.) بۆ شاری باکۆ کردووە کە لە ئێران دەژین، پارەو چەکیشی داوەتە هۆزی جیاواز، زنجیرەیەك راپۆرت ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە هۆزە (کوردەکانی- ك. م.) عێراق بە بەهەشتی سۆڤیەتی لە ئازەربایجانی دراوسێیان گەلێك بەختەوەرن- ئەمەیش هەمان رەنگدانەوەی لەناو کوردی وڵاتەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبێت...

ئیمزا

لیوا گ. ماکناب))[124].

ئەو کارمەندە لە خودی راپۆرتەکەیدا گەورەترین رێبازی بەرەنگاربوونەوەی پلانەکانی یەکیەتی سۆڤیەت لە کوردستاندا لەوەدا دەبینێت (دەستوبرد لە عێراق و تورکیا و سووریا ئۆتۆنۆمی بدرێتە کورد) و وەك دەڵێت ((نوری پاشا (دیارە مەبەستی نوری سەعیدە- ك. م.) ئامادەیە بەیانی ئەو ئۆتۆنۆمییە بداتە کورد))، هەرچی ((سووریاشە گوێ رایەڵە))، بەڵام تورکیا دەبێت ((فشاری بخرێتە سەرو هەڕەشەی ئەوەی لێ بکرێت کە هەڵوێستی (نادیموکراسییانەی ك. م.) دەبێتە هۆی ئەوەی ناوچە کوردنشینەکان بدۆڕێنێت)) ئەوساکە ((ئەویش ناچار دەبێت مل بدات))[125].

---

(124) Ibid, Secret, General Staff Intelligence General Headquarters Middle East Force, 27 January, 1946, Director of Military Intelligence (M. I. 3) The War Office, London S.W.1., Brigader G. Mac nab, P.48.

(125) Ibid, Russia and the Kurds, 10 January, 1946, P.49.

## سەرەنجام

هەموو ئەو بەڵگەنامانەی بۆ نووسینی بابەتی حەوتەمی ئەم کتێبە بەکار هێنراون وەکوو کانیاوێکن لە زەریایەکی بێ سنوور، بۆیەکا زۆر بە دڵنییایەوە دووپاتی دەکەمەوە کە زانکۆکانی کوردستان دەتوانن، بە پشتیوانی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی، ژمارەیەکی زۆر نامەی ماجستێرو دوکتۆرای ڕەسەن بۆ لاپەڕە جیاوازەکانی مێژووی کۆماری مەهاباد (کوردستان) تەرخان بکەن.

لێرەشدا ژمارەیەك بەڵگەنامە دەهێنمەوە کە گشتیان ئاماژە بۆ سەوزبوونەوەی خێرای تووەکانی کۆماری مەهاباد (کوردستان) لەسەر دەستی ڕۆڵەکانی کوردستانی ئێرانی وەك نەمران هەژارو قاسملوو هێمن و زەبیحی و سادقی شەرفکەندی و ڕەحیمی قازی و عەلی گەلاوێژ و غەفوری هەمزەیی و ئەوانی تر دەکەن. بەڵگەنامەکانی ناو فایلی ژمارە (١١٤٨٠٩/٣٧١)ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بۆ چالاکییەکانی ((حیزبی دێمۆکراتی کوردستان))ی ئێران و تایبەت ((کوردستان))ی ئۆرگانی ئەو حیزبە تەرخان کراون.

بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە تیشکی تەواو دەخاتە سەر گشت لایەنەکانی ئەم بابەتە. بەڵگەنامەی ئاماژە بۆکراو باڵوێزی بەریتانی لە تاران ڕۆژی هەژدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٥ ناردوویە بۆ دوگالد ل.ستیوارت لە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن، بەڵگەنامەکە دوو لاپەڕە و پێنج خاڵی سەرەکییە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

((نهێنی،

ژمارە ٥٥/١/١٠١٩،

باڵوێزخانەی بەریتانی، تاران،

١٨ی کانوونی دووەمی ١٩٥٥،

بۆ: دوگالد ل. ستیوارت،

بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن، س. دەبلیو ۱.

خۆشەویستم دوگالد

۱- تکایە ئاماژە بدەنە نامەی دێنس ڕایت (Denis Wright) بۆ فرای (Fry) کە ژمارەکەی ۱۸۲ إی. پ ۱۰۱، ۵٤/۲ و ڕۆژی حەوتی ئابی ساڵی ڕابردوو دەربارەی کوردستان نووسراوە. ماوەیەکی کورت لەمەوبەر لێرە هاوەڵم[126] لە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا چەند وێنەیەکی لە وەرگێڕدرانی تومۆڕکی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی دامێ کە ئۆرگانی ئەو پارتەیە کە پێی دەڵێن (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان). باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ڕێگەی کۆنسوڵخانەکەی تەورێزیانەوە پاش دەرچوونیان بە ماوەیەکی کورت، وێنەی ڕۆژنامەکانیان دەستکەوتبوو. ئەو ڕۆژنامەیە بۆ یەکەم جار ساڵی ۱۹٤٦ پەخش بووە، لەوساوە پچڕ پچڕ مانگی جارێك دەردەچێت.

۲- (کوردستان) لەسەر لاپەڕەی گەورە و بە کوردی و نهێنی چاپو دابەش دەکرێت. ئەمەریکاییەکان بەوەیان زانیوە کە ئەو ڕۆژنامەیە لە مەهابادو سەقز بڵاو دەکرێتەوە، وا پێ دەچێت دەشگاتە باکووری ئەو ناوچانە، بەڵام ئەوان نازانن تیراژی هەر ژمارەیەکی چەندەو تا چ ڕادەیەك کاریگەرە.

۳- ژمارەکانی نووی (کوردستان-ك. م.) تا ڕادەیەکی زۆر پەیڕەوی ڕێبازی کۆمۆنیزمییان دەکرد، باسی کوردستانیشیان، وەك ناوچەیەکی سەربەخۆی هاوشانی ئێران و ئازەربایجان دەکرد. دوازمارەی، کە باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان دەستی کەوتووە، ئەیلوولی ساڵی ۱۹٥٤ چاپ کراوەو گەلێك ئاشکراتر باسی سەربەخۆیی کوردستانێکی (ئازاد لە چەوساندنەوەی ئێران و تورکیا و عیراق) دەکات و یادی (کۆماری دیموکراسیی) کوردیی ساڵی ۱۹٤٦و قوربانییەکانی دەکاتەوەو کەمتر ئاماژە بۆ هاریکاریی لەگەڵ هاوڕێ ئازەری و فارسەکاندا دەکات، بەڵام هەڵبەت خێرو بێرەکانی یەکیەتی سۆڤیەت لە یاد ناکات. وا دیارە

---

(126) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((My opposite number in the United Embassy here...)) سەرەتای ئەو ڕستەیە، واتا my opposite number مانای (ژمارەکەی بەرانبەرم)ـە، ئەوەیش زاراوێکە بۆ واتای (ئەوەی لەو لا کارەکەی وەك کارەکەی خۆم وایە لەم لا) بەکار دەهێنرێت.

ئەمەریکاییەکان زۆر بایەخیان بەم وەرچەرخانە داوە، بەڵام ڕەنگبێ هۆی سەرەکیی ئەوە لەوەوە هاتبێت کە ئەو ژمارەیەی (کوردستان– ك. م.) یادی دامەزراندنی (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) لە ساڵی ١٩٤٦دا[127] دەکاتەوە. هیچ گومان لەوەدا نییە کە دەرچوونی ئەم ژمارەیەی (کوردستان) چەپۆکێکە ئاراستەی ئەو دەستەیە دەکرێت کە دوو مانگێك لەمەوبەر خۆیان ناو ناوە ((چاکسازیکەرانی پارتی تودە)) دژی جیابوونەوە خوازانو ناردبوویان بۆ ڕۆژنامەکانی تاران.

٤– هەمان کات هاوکارە ئەمەریکاییەکەم پێی ڕاگەیاندم کە ئەوان بەڵگەی ناڕاستەوخۆیان لایە دەربارەی ئەوەی ژمارەیەکی کەم لە نوێنەرانی مەلا مستەفای بارزان (بڕوانە نامەی ژمارە ١٠١١٥/١٢/٥٤ی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا کە ڕۆژی یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٤ دەربارەی ئەو بابەتە ناردوویە بۆ مۆسکۆ) دەورو بەری سێ چوار مانگ لەمەوبەر لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە هاتوونەتە ئێران و ماوەیەك لە ناوچە کوردەوارییەکانی باکووری ئێران ماونەتەوەو پێوەندیان بە سەرەك هۆزەکانەوە کردووەو ئینجا چوونەتە عیراق. ئێمە بۆ خۆمان لە تاران هیچمان دەربارەی ئەمە نەبیستووە، بەڵام هیچ شتێك لە ئارادا نییە بۆ ئەوەی وا بە بیردا بێت کە بارودۆخی ناوچە کوردەوارییەکان ئارام نەبێت لەکاتی ئەو ڕووداوەی لە نامەکەی سەرەوەی دێنیس ڕایتدا (Denis Wright) باسی کراوە.

٥– وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانمان لە هەریەك لە ئەنقەرەو بەغداو مۆسکۆو نوێنەرایەتی خاوەن شکۆ لە نیقۆسیا))[128].

پاش ماوەیەك دوگالد ئەم وەڵامە دەنێرێت بۆ ج. ت. فێرنلێی (J.T. Fearnley) لە تاران:

((لە وەزارەتی هەندەرانەوە،

س. دەبلیو ١،

١٦ی مارتی ١٩٥٥،

---

(127) بە هەڵە لە بەڵگەنامەکەدا لەباتی ١٩٤٦ ساڵی ١٩٥٤ چاپ کراوە.

(128) N.A., F.O., 371/114809, Confidential, No. 1019/1/55, British Embassy, Tehran, January 18, 1955, To: Dugald L. Stewart, Eastern Department, London.

كوردستان

ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستان

ژماره إی، پ. ۱/۱۰٦،

نهێنی.

گەلێك سوپاسی نامەی ژمارە ۱۰۱۹/۱/٥٥ی ڕۆژی هەژدەی مارتتان دەربارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) دەکەم.

بەشی توێژینەوەو ڕاگەیاندنی (وەزارەتی هەندەران- ك. م.) حەز دەکات وێنەی ئەو تەرجەمانەی (ناوەڕۆکی ڕۆژنامەی کوردستان- ك. م.) ببینێت ئەگەر لێتان زیادن، وێڕای هەر تەرجەمەیەکی وەك ئەوە لە دواڕۆژدا.

ئیمزا

دوگالد ل. ستیوارت))[129].

لەم بووارەدا ((بەشی توێژینەوە))ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەگاتە ئەو بڕوایەی پێویستییان بەوە هەیە فایلێکی سەربەخۆ بۆ ڕۆژنامە کوردییەکان تەرخان بکەن وەك لەم نامەیەی ئێکلێسی کارمەندی ئەو بەشەوە بە روونی دەردەکەوێت:

(129) Ibid, Foreign Office, S.W.1, March 16, 1955, No. EP 1016/1, Confidential. To: J.T. Fearnley, Esq. Tehran.

((هۆزەکانی کورد

نوێترین ڕۆژنامەم دەربارەی کورد بۆ بەشی توێژینەوە نارد، تکایە هەر ڕۆژنامەیەکتان لایە لەمەڕ کوردی تورکیا و سووریا و عێراق و ئێران بۆمیانی بنێرن بۆ پێکەوەنانی فایلێکی تەواو بۆ هەر بابەتێك و بۆ هەر ساڵێك.

ئیمزا
إی. ئێکلێس
بەشی توێژینەوە
-١ی کانوونی دووەمی ١٩٥٦

وێنەی بۆ:
بەشی باشوور،
بەشی سەوز،
بەشی ڕۆژهەڵات و سووریا و لوبنان))[130].

دوا بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە دەربارەی ڕۆژنامەی ((کوردستان)) وەڵامنامەیەکی باڵوێزخانەی بەریتانییە لە تاران کە ڕۆژی دووی مایسی ساڵی ١٩٥٥ ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن و ئەمەیش دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

((باڵوێزخانەی بەریتانی،
٢ی مایسی ١٩٥٥،
ژمارە ١٠١٩/٣/٥٥،
نهێنی.
دوگالدی خۆشەویست.

١- نامەی ژمارە إی. پ/ ١ی شازدەی مارتتان دەربارەی ڕۆژنامەی (کوردستان)[131]، وا هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەمدا دوو وێنەی وەرگێڕدراوی

---

(130) Ibid, Kurdish Tribes, E. Eccles, Research Department, January 10, 1956, Southern Division, Green Division, Eastern and Levant Division.

تەولوتان بۆ دەنێرم کە هی هەموو ئەو ژمارانەی ڕۆژنامەکەن و لێرە گەیشتوونەتە دەست باڵوێزخانەی وڵاتە یەککگرتووەکان. وەرگێڕانەکە لە هەندێك شوێندا زۆر تەولو نییە، چونکە ئەوانەی لامان کار دەکەن سەرەتا لە کوردییەوە کردوویانن بە فارسی و ئینجا لە فارسییەوە کراونەتە ئینگلیزی.

٢- کونسوڵخانەی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا لە تەورێز لە دوای ئەو ژمارەیەی (کوردستانەوە- ك. م.)، کە ڕۆژی شازدەی ئەیلوولی ١٩٥٤ دەرچووە، ژمارەی دیکەی پێ نەگەیشتووە. بە هەر حاڵ ئەمە وا ناگەیەنێت پەخشی ڕۆژنامەکە دوای ئەو ژمارەیە وەستابێ. هەرچۆن بێت وا پێ ناچێت ئەو هێرشەی دەزگا ئێرانییەکان، دەورووبەری مانگێك لەمەوبەر کردیانە سەر چاپخانەکەی حیزبی تودە لە تەورێز ببێتە هۆی دەرنەچوونی (ئەو جۆرە- ك. م.) ڕۆژنامانە. بەپێی قسەی هاوکارە ئەمەریکاییەکانم دەزگا (ئەمنییەکان- ك. م.) لە کاتی هێرشەکەیاندا پلێتی ناوی ڕۆژنامەی (کوردستان)یان دۆزیوەتەوە، لەوانەیە لەو کاتەدا چاپی ڕۆژنامەکە تەواو بووبێت. بێ گومان ئەو جۆرە چالاکییە نهێنییانە زۆر ئاسانترە لە تەورێز بکرێن وەك لە خودی کوردستان کە شارەکانی لەو بچووکترن.

ئیمزا

ج.ن. فیرنلێی))[132].

دوا بەدوای ئەم نامەیە، وەرگێڕدراوی ئینگلیزیی ناوەرۆکی ئەم ژمارانەی ڕۆژنامەی ((کوردستان)) بەم جۆرە هەڵگێراون:

أ- ژمارەی ڕۆژی یەك شەممەی پازدەی ئۆردیبەهەشتیساڵی ١٣٣٣ (واتا مایسی ساڵی ١٩٥٤) کە بریتییە لە چوار لاپەڕەو نیوی زۆر گەورەو ئەمەی لای خوارەوەیش ناونیشانەکانی ناوەرۆکی ئەو ژمارەیەن:

---

(131) شایانی گوتنە لە هەر شوێنێکی بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلەدا ناوی ڕۆژنامەی ((کوردستان)) هاتووە خەتێك، بە مەبەستی سەرنج ڕاکێشان بەژێر ناوەکەدا هێنراوە.

(132) N.A., F.O., 371/114809, Confidential, No. 1019/1/55, British Embassy, Tehran, May 2, 1955, No. 1019/3/55, Confidential From: J.T. Fearnley, To: Dugald L. Stewart, Esq., Eastern Department, Foreign Office, London.

١- سەروتار (ل١-٢).

٢- گەلانی ئێران هەمیشە لەپێناو جێبەجێ کردنی مافی خۆماڵی کردنی نەوتدا دەجەنگن (ل ٢-٣).

٣- برایەتیی هەمیشەیی نێوان گەلانی کوردستان و ئازەربایجان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ توندوتۆڵتر و ئاگادارتر دەبێت (ل ٣-٤).

٤- هەر شەکاوە بێت ڕۆژی یەکی ئایار- ڕۆژی فیستیڤاڵی جیهان (ل ٤-٥).

ب- ژمارە دووی خوولی دووەم(*)، ڕۆژی یەك شەممەی نۆزدەی خوردادی ساڵی ١٣٣٣ (واتا حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٤) کە بریتییە لە سێ لاپەڕەو نیوی زۆر گەورەو ئەمانەیش ناونیشانەکانی ناوەڕۆکی ئەو ژمارەیەن:

١- وتاری ((لە ڕێگەی دەنگ دانی بڕوا (سیقە) بە حوکمەتەکەی زاهیدی مەجلیس سروشتی ڕاستەقینەی خۆی نیشان دەدات))(ل١).

---

(*) ((بەچاوپۆشین لەو ڕۆژنامەی (کوردستان)ەی کە بەیەك لاپەڕەو وەکو بەشێك لەڕۆژنامەی (ئازەربایجان)ی ئۆرگانی (فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان)ە لەباکۆی پایتەختی ئازەربایجانی سۆڤیەتی جاران بڵاوکراوەتەوە، کە د.کەمال خۆیشی لە ل٢٢٣ی کتێبی (تێگەیشتنی ڕاستی)یەکەیدا باسی دەکات، ئەوەندەی ئاگادارم، دەبێ ڕۆژنامەی (کوردستان)، لەدوای ڕووخانی (جەمهوریەتی کوردستان) و وەستانی ڕۆژنامەکەیان، ئەوە بۆ یەکەم جارە، وەکو خوولی دووەم، جارێکی دیکە لەساڵی ١٩٥٤دا دەست بەبڵاوکردنەوەی دەکرێتەوە، ئەو بەڵگەنامەیەی سەرەوەش زیاتر ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێ. لەم بارەیەوەش، لەگەڵ هاوکارم ڕەفیق ساڵح، لەبابەتێکماندا بەناوونیشانی (ڕابەری ڕۆژنامەنووسیی کوردی) لەژمارە (١١-١٢)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) لەساڵی ٢٠٠٣دا نووسیومانە: (نووسەرانی ئەم ڕۆژنامەیە: غەنی بلوریان، سەدیقی ئەنجیری، عەزیزی یوسفی، عەبدولڕەحمان قاسملوو بوون، چاپخانە: فیرقەی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان، شوێنی دەرچوون: تەورێز، ژمارەکانی: ژمارە (١)ی لە ١٣٣٣/٢/٢٥، هەتاوی (٢٥ی ئاوریلی ١٩٥٤)دا دەرچووە، ژمارەی (٤)ی لە ١٣٣٣/٣/١٦ (٦ی ژوئەی ١٩٥٤)دا دەرچووە، ژمارە (٥)ی پۆلیس دەستی بەسەردا گرتووە). هەر لەوێدا نووسیومانە: (پێشتر جگە لەژمارە ٢٥٧ی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی ئۆرگانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان، کە لەساڵی ١٩٩٨دا بڵاوکراوەتەوە. هیچ سەرچاوەو کەسێکی دیکە باسی ئەم ڕۆژنامەیەی نەکردووە)، پێشم وایە ئەم زانیارییانەی لەبابەتەکەی ئێمەدا هاتووە لەگەڵ ناوەڕۆکی ناو ئەو بەڵگەنامەیە تێکدەکەنەوە ـ ع. زەنگەنە)).

٢- بۆ پێشەوە لەپێناو وەدی هێنانی ئاواتەکانی گەلی ئێراندا (ل٢).

٣- لاپەڕە سێی وەرگێڕدرانی ئەم ژمارەیە تەرخان کراوە بۆ بابەتێکی بایەخدار دەربارەی سیاسەتی شۆڤێنیی فەرمانڕەوایانی ئێران دژی نەتەوەی کورد بەم ناونیشانەوە ((لەناو بردنی نەتەوەیەك)) کە بەم جۆرە دەست پێ دەکات.

((ئیمپریالی و فاشی و دەرەبەگانی حوکمەتی کۆنەپەرست هەوڵ دەدەن نیشانی بدەن کورد نەتەوەیەکی ژیاریی نییەو چییان پێ بکرێت دەیکەن بۆ پیشەکێش کردنی هیواو رووناکیی نەژادی کوردو بەو جۆرە دەیانەوێت داب‌و نەریتمان کوێر بکەنەوە)) (ل٣).

٤-یادی سەرکەوتن بەسەر فاشیزمدا. لەم وتارەیدا رۆژنامەی ((کوردستان)) بە گەرمی یادی نۆی مایسی ساڵی ١٩٤٥ دەکاتەوە کە (رۆژی سەرکەوتنی لەشکری سۆڤێتییە بەسەر فاشیزمدا[133] و کە بووە هۆی رزگار کردنی گشت گەلانی جیهان لەدەست زوڵم و زۆری فاشیستی) (ل٤).

ج- دوای ئەوە لە سێ لاپەڕەو نیوی زۆر گەورەدا وەرگێڕدراوی ئینگلیزیی ئەو ژمارەیەی رۆژنامەی ((کوردستان)) هەڵگیراوە کە رۆژی شازدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٤ دەرچووەو سەرجەمی بۆ یادی نۆیەم ساڵی رۆژی بیست‌و پێنجی شەهریوەری ساڵی ١٣٢٤، واتا شازدەی ئەیلوولی ساڵی ١٩٤٥ کراوە کە لەو رۆژەدا ((حیزبی دێمۆکراتی کوردستان))ی ئێران دامەزرێنراوە. سەرجەمی سێ لاپەڕەی یەکەمی ئەو ژمارەیە بۆ سەروتاری ((کوردستان)) بە بۆنەی ئەو یادەوە تەرخان کراوەو بە وردی باسی خەباتی رەوای نەتەوەی کوردو دامەزراندن و کەوتنی (کۆماری مەهاباد-کوردستان) و لەسێدارە دانی قازی محەمەدو سەیفی قازی و

---

(133) رۆژی نۆی مایسی ساڵی ١٩٤٥ سوپای سووری سۆڤێتی توانیی بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیای هیتلەری بگرێت‌و ئەو رۆژە کرایە جەژنی سەرکەوتن بەسەر فاشیزمداو سەرجەمی چەپڕەوانی جیهان هەموو ساڵ یادیان دەکردەوە. شایانی باسە پێشبڕکێیەکی گەلێك توند لەنێوان هێزە چەکدارەکانی یەکیەتی سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا هەبوو بۆ داگیرکردنی شاری بەرلین، هەرچەندە کەوتنی ئەڵمانیا کۆتایی تەواوەتیی بە جەنگی جیهانیی دووەم نەهێنا.

سەدری قازی و نوشوستیپیەکانی کورد دەکات و بەڵێنی کۆڵ نەدانو تۆڵە سەندنەوە دەدات (ل١-٣).

هەرچی لاپەڕەی چواری ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامەی ((کوردستان))ە تەرخان کراوە بۆ ئەم سێ بابەتە:

١- داوای باربوو کردنی (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) چونکە حیزب لە یاریدەی نیشتمانپەروەران بەولاوە هیچ شك نابات، بۆیەکا داوا لە دڵسۆزان دەکات هەر یەکەیان داهاتی ڕۆژێکیان بۆ حیزب تەرخان بکەن.

٢- سروودی ((ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان)) کە بە سروودی نەتەوەیی کورد وەسفی دەکات، دەبێت ((کوردستان)) لەو ژمارەیەیدا هەموو بەیتەکانی هۆنراوە ناوازەکەی دڵداری بڵاو کردبێتەوە، بەڵام لە وەرگێڕدراوەکەی باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا تەنها چوار دڕێڕی یەکەمی کراوەتە ئینگلیزی.

٣- لەو لاپەڕەیەدا لەژێر ناونیشانی ((هەواڵەکان))دا ((کوردستان)) باسی تەخشان و پەخشانی ((هەتیوەکەی ڕەزا خان)) دەکات، کە دیارە مەبەستی محەمەد ڕەزا شایە، لەوێدا ((کوردستان)) دەڵێت شا کە هاتۆتە مەهاباد تەنها لە شەوێکدا بیستو سێ هەزار تومانی خەرج کردووەو ئەوە بۆتە وێردی سەر زمانی ڕۆژنامە کۆنەپەرستەکانی ئێران[134].

---

(134) N.A., F.O., 371/114809, Confidential, No. 1019/1/55, British Embassy, Tehran, May 2, 1955, From: J.T. Fearnley, To: Dugald L. Stewart, Esquire., Eastern Department, Foreign Office, London.

## داستانەکەی محەمەدی مەولود

حەز دەکەم کۆتایی ئەم بابەتە بە کورتە باسێکی یەکێک لە رۆڵە هەرە دڵسۆزو ـکارەکانی مەهاباد بهێنم کە ناوی محەمەدی مەولودە، لە ساڵی ١٩٦١وە حوکتورە نەسرین فەخری و دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ و من لە نزیکەوە ئەو زاتەمان ناسیو بە دڵ خۆشمان ویستو ڕێزێکی تایبەتیمان لێی دەنا. حوالێخۆشبوو محەمەدی مەولود پیرەکوردێکی ساکارو ڕەشیدو بە جەوهەرو لای خەڵک خۆشەویستو ڕێزدار بووە، هەر زوو هەستی کوردایەتی ڕەسەن پاڵی پێوە ئەوە ببێتە پێشمەرگەیەکی دڵسۆزی کۆماری مەهاباد (کوردستان) و نزیك خودی قازی محەمەد. ئاوا بوونی خۆری ئەو کۆمارە و لەسێدارەدانی پێشەواو هاوەڵەکانی و کردارە چەپەڵەکانی دوژمن ناخی دەروونی خاوێنی دەهەژێنن،



حەمەی مەولوودی: لەساڵەکانی دوایی ژیانیدا. یەکێك بوو لەکەسایەتییە ناودارەکانی کۆماری کوردستان، ساڵی ١٩٧٩ لەتەمەنی (٨٠) ساڵیدا لە (باکۆ) کۆچی دوایی کردووە. کچەکەی لەسەر وەسیەتی باوکی هاتۆتەوە مەهاباد و مشتێ لەخاکەکەی بردووە بۆ (باکۆ) و بەسەر گڵکۆی ئەو گۆڕغەریبەی داکردووە.

((سەرچاوە: ژمارە ٥٩ی گۆڤاری (مەهاباد)ی ٢٠٠٦)).

خۆی لەگەڵ خۆیدا بڕیار دەدات تۆڵەیەك بسێنێت، بیری ساكاری ئەم نەخشەیەی بۆ دادەڕێژێت- ئەو مەلایەی بەر لەسێدارەدانی تەلقینی قازی محەمەدی داوە خۆڵو دۆی بەسەردا بكاتو بە سواری كەرێك چەند بۆی بلوێت هێند شاربەدەری بكات[135]، ئەنجام محەمەدی مەولود پەنا دەباتە بەر وڵاتی سۆڤیەت و لە شاری باكۆی پایتەختی ئازەربایجان تا كۆچی دوایی لە كۆتایی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا بە قەدرەوە دەژیا [*].

---

(135) شایانی باسە محەمەدی مەولود بۆ خۆی زۆر دەگمەن توخنی ئەو باسە دەكەوت، بەڵام گەلێك جار دوكتۆر ڕەحیمی قازی و دوكتۆر عەلی گەلاوێژو كاك عەبدوڵلای برای دوكتۆر مورادو ژمارەیەك ئازەریی وەك دوكتۆر ڕۆنێندێژ ئەم باسەیان بۆ گێڕاومەتەوە، هەروەها بە بۆنەی ساڵ یادی مەهابادەوە پوختەیم لە وتارێكمدا نووسی كە پێم وایە لە ڕۆژنامەی (كوردستان)دا بڵاو كرایەوە، بەو بۆنەیەوە برای بەڕێز مامۆستا عەبدوڵلای حەسەن زادە ئاگاداری كردم كە ئەو مەلایە ناوی مەلا سدیق بووەو پیاوێكی خراپ نەبووە، پێی وابووە بەو كارەی ئەركێكی ئایینی بەجێ دەگەیەنێت، برای بەڕێز مامۆستا هاشمی كەریمیش لەم ڕۆژانەدا لە لەندەن ئەمەی دووپات كردەوەو بەپێی گێڕانەوەی دیموكراتەكانی ئەودیو ساڤاك، بە زۆرو هەڕەشەی كوشتن، گەلێك لە پیاوە ئاینییەكانی مەهابادو دەوروبەریان ناچار كردووە قسەی ناشیرین دژی كۆماری مەهاباد (كوردستان) و پێشەوا بكەن و تەنها مەلایەك زاتی كردووە بەرپەرچیان بداتەوەو لەسەر ئەوە شەهیدیان كردووە.

(*) ((وەكو دەبینن هەر بابەتێك پەیوەندی بەناوەرۆكی بەڵگەنامەكانی بەریتانییەوە هەبووبێت د. كەمال باسیان دەكات و هەندێك ڕوونكردنەوەشیان لەبارەوە دەنووسێتەوە، بەڵام ئەم بابەتەی "محەمەدی مەولوود" لەدوورو نزیكەوە هیچ پەیوەندییەكی بەو بەڵگەنامانەوە نییە كەچی وا لێرەدا جێی كراوەتەوەو لەڕێگەیەوە كۆتایی بەم بابەتە هێنراوە، من پێموایە ئا ئەوەشیان یەك لەو شێوازانەیە كە د. كەمال لەڕێگەیەوە مێژووی لای، تەنانەت خەڵكی ئاسایی خۆشەویست كردووە. بەڵام دڵنیام لەپاڵ ئەو مەبەستەدا د. كەمال دەیەوێ خوێنەران شارەزای هەندێ چەمكی(مێژوو)مان بكات كە نەدەبووایە لەسەر لاپەڕەكان بنووسرابانەوە. من ئەوەندەی سەردێنم و سەردەبەم و بیر لەڕابردووی خۆمان و ئەو عەقلیەتەی دەستەبژێر (سیاسییەكان)ی میللەتەكەی خۆمان، لەبارەی ئەوەی پەیوەندی بەشكستی ڕاپەڕین و شۆڕشەكانیانەوە هەیە دەكەمەوە، ئەوەندەی دیكە غەم دامدەگرێ، تەنانەت هەندێ جاران ورەم دادەبەزێ، نازانم بۆ كە لێیان دەقەومێ چەند پاساوێكی بێ بنەما بۆ تێكشكانەكەیان دێننەوە، ئەوەتا "مەلای خەتێ" بەرامبەر تێكشكانی جوولانەوەكەی پاشای كۆرە قیت كراوەتەوە، "ئێزدین شێر" پاساوی ڕووخانی ئەمارەتی (بۆتان)ە، شكانی شێخ مەحموودی حەفیدیش "مشیری حەمەی سلێمان"ی بۆ قوت كراوەتەوەو ناوەناوە (گوڕەشار) دەكرێتەوە. باش بوو چەند ساڵێك لەمەوبەر د.كەمال خۆی بابەتەكەی ("مشیری حەمەی سلێمان"ی ووژاند و داوای لێبوردنی

ـگیانی کرد. هەندێك هەبوون بۆچوونەکەی دوکتۆریان پێ قبوڵ نەکرابوو، بەڵام تاوەکو ئەمڕۆکەش نەیلتۆلنیوە، جگە لەیاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی، یەك بەڵگەی لەسەر بێننەوە، دیارە بۆچوونەکانی ئەویشیان لەیاداشتێ وەرگرتووە کە بەماوەی پتر لە(٢٥) ساڵ دواتر نووسراوەتەوە، ئەوەش ناکاتە بەڵگەی بنەبڕ. "ئێزدین شێر"یش لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا خۆی شۆڕشی دژی دەوڵەتی عوسمانی کردووە، تەنانەت حاجی قادری کۆیی لەشیعرێکیدا بە(شێر)ی داناوە. "د. جەبار قادر"یش بابەتێکی لەسەر نووسیوەو پێمان دەڵێت: ئەو کاتەی "بەدرخان پاشا" دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاپەڕیوە، ئەو زاتەو خانەوادەکەی هەموویان لای "بەدرخان پاشا" لەزیندان بوون. جگە لەو پاساوی هێنانەوەی بۆچوونەکەی "حاجی قادر"، هەروەها یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی (کوردستان)یش کە باس ـە "بەدرخان" و بنەماڵەی بەدرخانییان دەکات، بەتاقە وشەیەکیش چییە نزیك ئەو بابەتە نەکەوتووەتەوە، ئەو بابەتەشیان تەنیا ئەو بۆچوونەی لەبارەوە لەبەردەستە کە "د. بلەج شێرکۆ" ـەکتێبەکەی (القضية الكردية) دا باسی کردووە، دیارە تاوەکو ئێستا کێشەی ئەمیش یەکلا نەبۆتەوە ـەنێوان سێ کەسان : "جەلادەت بەدرخان و سورەیا بەدرخان و محەمەد عەلی عەونی" کامیان نووسەری ئەو کتێبەن و بەڵگەیەکی ڕاست و دروست لەبەردەستدا نییە هی کامیان بووە.

چەند ساڵێکیش لەمەوبەر لەژمارە(١٢)ی گۆڤاری (هەزار مێرد)دا کاتێ هاوکارم "سەدیق ساڵح" بابەتێکی لەبارەی "سەعید تەتەر" بڵاوکردبۆوە تیایدا ئاماژەیەکی وای دابوو گوایە سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەناوی ئەو زاتە کرابێتەوە کە ناوە ئەسڵیەکەی "مەسعوود" بوو، لەو بابەتەمدا کە بەناونیشانی (کاریزمای کورد مەلا مستەفای بارزانی) نووسیومە، بەتەمابووم ئەو بابەتەی هاوکارم، لەگەڵ چەند بابەتی تۆژەرانی دیکە بۆ دەستخستنی زانیاری لەسەر ئەو پرسانە ئەوسا چوومە لای د.کەمال لەبەغدا، دیاربوو بۆچوونەکەی لێ وەرنەگرتم، بەڵکو ئامۆژگاری کردم ڕاست و دروستی سەربوردەکە لە "مەسعود بارزانی" خۆی بپرسم، ئەوەبوو لەڕێگای "فەیسەڵ دەباغ"ەوە نامەیەکم بۆ جەنابی نووسی، ئەوەندەی نەبرد وەڵامم بۆ هاتەوە کە جەنابی، لەناوی باپیرە گەورەی خۆی زیاتر بەناوی هیچ کەسێکەوە نەکراوە، دیارە سەرچەلەی ئەو زاتە خۆی هەموو گومان و بۆچوونەکانی دیکە وەلا دەنێ. هەر لەو بابەتەی (کاریزمای کورد ...)دا باسی دادگاییکردنی پێشەوای کوردستان "قازی محەمەد" و هاوەڵانی و وەسیەتنامەکەیان کراوە، چونکە لەساڵی ٢٠٠٠دا کە گۆڤاری (خەباتی قوتابیان) دەقی وەسیەتنامەیەکی بڵاوکردەوە گوایە ئەوە هی پێشەوا قازی محەمەد بووە و لەشێوە ئەرشیفی سوپای ئێران چنگ خراوە، زوو بەزوو من، بەباوەڕێکی زۆر پتەوەوە، ئەو بۆچوونانەی ناو وتارەکەی (خەباتی قوتابیان)م ڕەت کردەوە، بەتایبەتی کە دەقی وەسیەتنامەیەکم لابوو، کە بە ئیمزای سەید محەمەدی سەمەدی لە ژمارە (٢٤- ٢٥)ی گۆڤاری (مامۆستای کورد) بڵاوکرابووەوە کە فەرهاد شاکەلی لەسوێد دەری دەکرد.

بەداخەوە ئەوەندەی پێنەچوو کە ناوەڕۆکی هەمان وتار هێنرایە سەر ڕێنووسی لاتینی و لەگەڵ هەمان وتاردا لەدوو تویی کتێبێکدا هەزاران دانەی لێ چاپ کرا، دیارە ئەو کتێبە بڵاوکرابەوە، بەرەو یادی سەد ساڵە بارزانی دەچووین، منیش دەمێك بوو خۆم ئامادە دەکرد و بەدوای هەر بەڵگەنامەیەکدا دەگەڕام

کە لەسەر ئەو زاتە نووسرابێ، دیارە دوای بینینی بەڵگەنامە بڵاوکراوەکەی (**مامۆستای کورد**) بەهیچ شێوەیەك پێم قبووڵ نەدەکراو بڕوام نەدەکرد، جەنابی قازی لەسەرەمەرگدا وەسیەتی ئاوەها بێ ماناى کردبێ و شاڵاویش بباتە سەر میللەتێکی دیکە، بۆیە ئەوەندەی بۆم بلوایا و بۆم بچوویایە سەر بەدوای بەڵگەو ڕای پسپۆر و سیاسییەکان دەگەڕام، بەبیرمە کاتی خۆی لەنووسینگەی هەولێری (**حیزبی دیموکراتی کوردستان**) لەسەر ئەو پرسە قسەم لەگەڵ "**عەبدوڵلا حەسەن زادە**" هەروەها "**کەمالی کەریمی**"ش کردبوو، کە لەسەرەوە د. کەمال لەپەراوێزەکەی خۆیدا شاهێدیەکەی یەکەمیان و چەند کەسێکی دیکەی لەزاریانەوە لەسەر "**مەلا سدیق سدقی**" گێراوەتەوە.

هەروەها پێموانییە د. کەمال مەزهەر ئەو ڕۆژەی کۆتایی ئاداری ٢٠٠١ی لەبیر چووبێ، کە مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی تێدا تیرۆر کرا. ئەوەبوو پاش نیوەڕۆکەی لەسەر ئەو ڕووداوە جەرگ بڕە تەلەفۆنم بۆ جەنابی کردو ویستم هەواڵەکەی پێ بڵێم تا ئەویش لای خۆیەوە دۆست و ئاسیاوانی بەغدای لێ ئاگادار بکات، ئەوەبوو لای ئێوارەش سەردانی جەنابیم کرد. دیار بوو کوردەکانی بەغدا لەسەر ئەو ڕووداوە شلەژابوون، بۆیە شەهلا خانیش ڕێی دانەدەگرت لەگەڵ خوشکی د.کەمال بچنە لای دوکتۆر، کە پێشتر مەوعیدیان بۆ دانابوو، بۆیە هەموو لایەك حەزیان دەکرد تا گەڕانەوەی ئەوان من لەگەڵ مامۆستا بمێنمەوە، پێموایە ئەو ماوەی (٦) سەعاتەی لەوێ ماومەتەوە زێڕینترین کاتمە لەژیانمدا کە هەر هەموویم لەگەڵ بەڕێزیدا بەقسەکردن لەسەر مێژووی هاوچەرخ و نوێ بەسەر بردبێت، هەر ئەوسابوو خۆزگەی ئەوەم دەبرد تەسجیلێکمان لابوایە و ئەو هەموو گفتوگۆیەمان تۆماربکردابا، یەك لەو پرسانەیمێژوومان کە ئەوسا باسمان کردبوو دەقی ئەو وەسیەتنامەی (**مامۆستای کورد**) و وەسیەتنامە ساختەکەی "**م. م. بۆکانی**" ی (**خەباتی قوتابیان**) بوو. هەر لەوێدا باسی ئەو "**مەلا سدیق**"ەشمان کردبوو، بەداخەوە ئەوسا سەرەداوەکان هێشتا ئاڵۆز بوون، بەڵام من هەر وازم لەکردنەوەیان نەهێنا. ئەوەبوو لەساڵی ٢٠٠٧دا، کە دڵنیابووم زۆربەی ناوەڕۆکی ئەو کتێبە بەناونیشانی (**سەرۆك كۆماری کوردستان لەبەردەم دادگای ئێراندا**) بڵاوکراوەتەوە وەکو هەڵبەستراوە، ئەو "م. م. بۆکانی"یەش کە دەستنووسە فارسییەکەی لەگەڵ خۆی هێنابووە کوردستان، تەنیا بۆ ئامانج و مەبەستی خۆی و چەند دەستکەوتێکی ماددی ئەو وەسیەتنامەی هەڵبەستووە. دوای ئەوەی کە هاوکارمان "**مووسا ئەحمەد**"یش، کە ئەو کاتەی (**خەباتی قوتابیان**) بابەتەکەی بڵاوکردۆتەوە ئەو سەرنووسەری بووە، هەموو بۆچوونەکانی سەلماندم. ئەوەبوو بابەتێکم بەناونیشانی (**دلۆڤریکردن و وەسیەتنامەکەی پێشەوا قازی محەمەد...**) بەئیمزای (**کوردێکی یەکڕەنگ**) وەکو (**دیاریی ژمارە**) (١٠)ی (**ڕۆژنامەنووس**) لەساڵی ٢٠٠٧دا لەو گۆڤارەکەدا بڵاوکردەوە، وا لێرەدا لەتەك هەموو ئەو ڕوونکردنەوانەدا ئەو وێنانەی "**مەلا سدیق سدقی**" و "**محەمەدی مەولود**" و فۆتۆی وەسیەتنامەکەی پێشەوا قازیش وەکو دیارییەکی دانسقە دەخەمە نێو ئەم کتێبە. جارێکی دیکەش دەیڵێمەوە هەقە ئێمە لەجیاتی قسەو شیعری درۆی هەڵبەستراو لەسەر سەرکردەو ڕێبەرەکانمان، بەدوای بەڵگەنامەی ڕاست و دروست دا بگەڕێین، ڕووداوەکانی ژیانیایشیان بەتاڵ و شیرینییەوە، وەکو خۆی بنووسینەوە–ع.زەنگەنە)).

# وەسێتنامەی پێشەوا قازی محەمەد

ئامادەکردنی: سەیید محەمەدی سەمەدی

ساڵی ١٩٩٥ چلونۆیەمین ساڵڕۆژی دامەزران و ڕووخانی کۆماری کوردستان لە مەهابادە و چلوهەشتەمین ساڵڕۆژی شەهیدبوونی پێشەوای خۆشەویست و گەورەی کورد قازی محەمەدە. لە ماوەی هەموو ئەم ساڵانەی ڕابوردوودا زۆر کتێب و لێکۆڵینەوە و وتار لەبارەی ئەزموونی کۆماری کوردستان و ژیان و شەهیدبوونی پێشەواوە نووسراوە. لە زۆربەی سەرچاوەکانیشدا باسی وەسێتنامە [یا وەسێتنامەکان]ی قازی کراوە، بەڵام هەتا ئێستا تێکستی ڕاستەقینەی ئەو وەسێتنامەیە لە هیچ کوێیەک بڵاونەکراوەتەوە.
ئێستا بۆ یەکەم جار وەسێتنامەکەی پێشەوا لە مامۆستای کورددا بڵاودەکرێتەوە. سوپاس بۆ برای هێژا مامۆستا سەیید محەمەدی سەمەدی و ئەو بەڕێزانەی کە بۆ ئامادەکردنی ئەم بەڵگە گرنگەی مێژووی تازەی کوردستان هەوڵیان داوە.
خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ئەم بەڵگەنامەیە زۆر شت سەبارەت کۆماری کوردستان، هەلومەرجی شەهیدبوونی پێشەواکانی کۆمار و تەنانەت باری دەروونیی پێشەوا قازی محەمەد دەخاتە ڕوو. هیوادارین بڵاوبوونەوەکەی ببێتە هۆی زیاتر ناسین و ناساندنی ئەو قۆناخەی مێژووی کورد و قووڵکردنەوەی باس و لێکۆڵینەوەکانی پێوەندیدار بە ئەزموونی کۆماری کوردستانەوە، بەتایبەت کە دەزانین ساڵی داهاتوو؛ ١٩٩٦، یادی پەنجایەمین ساڵەی دامەزران و ڕووخانی کۆماری کوردستانە.

مامۆستای کورد

## هەندێ سەرنج و ڕوونکردنەوە:

١- ئەم سەنەدەی لێرەدا بلاودەکرێتەوە بەشێکە لە وەسێتنامەی پێشەوا قازی محەمەد، کە بە خەتتی مەلا صدیق صدقی لە شەوی ١٠-١-١٣٢٦ی هەتاویدا، نیو سەعاتێک پێش شەهید بوونی قازی نووسراوەتەوە و لەژێرەوە ئیمزای مەلا صدیق و قازی محەمەدی پێوەیە. قازی هەمیشە ئیمزای خۆی بە "محمد قاضی" نووسیوە. مامۆستا مەلا سددیقی سدقی ڕۆحانییەکی زۆر بەڕێزی مەهابادی بووە و لە رابوردوودا پێشنوێژ و دەرسبێژی مزگەوتی هەباساغای مەهاباد بووە. لە شەوی لە دار درانی قازیدا بۆ وەسێت کردنی قازی و یارانی، ئەویان هێناوە تا وەسێتەکەیان یادداشت بکا.

ئەسڵی ئەم وەسێتنامەیە لەلای "دۆکتۆر عەبدوڵا ئەبریشەمی" یە. دۆکتۆر ئەبریشەمی پیاوێکی هەڵکەوتووی مەهابادە، زاوای قازی محەمەدە و ئێستا لە تاران دەژی. کاک سەعیدی هومایوون کە خوشکەزای قازییە، بۆ ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی چەند جێگەیەکی ئەو بەڵگەنامەیە یارمەتییان دام. زۆر سوپاس بۆ گەورەیی و پیاوەتیی هەردوو لایان.

٢- [گندمی کە در تثبیت است ]، تثبیت (تەسبیت) ناوی جێگەیەکە و عەمباری دەغڵ و دان بووە.

٣- معینی: محەمەد ئەمینی موعینی: وەزیری کیشوەر لە کابینەی کۆماری مەهاباددا.

٤- [سید سلام نمیدام هشت هزار تومان]، سەیید سەلامی حوسەینی، ئەرباب (خاوەن)ی دێی سەوزی بووە.

٥- باباشێخ: جەنابی حاجی باباشێخ: سەرۆکوەزیرانی حوکوومەتی مەهاباد.

٦- لە دوو جێگەدا ناوی سەروان شەریف هاتووە. ئەم سەروان شەریفە ئەفسەرێک بووە لە پادگانی مەهاباد کە ئەو سەردەمە لە لایەن حوکوومەتەوە وەک وەکیل (پارێزەر)ی بەزۆر دانراو (تسخیری) بۆ پێشەوا قازی دیاری کراوە. پیاوێکی بەڕێز و ڕاستگۆ بووە. پاشتر خاتوو مریەمی کاکاغازادەی خەڵکی مەهاباد بوو بە هاوسەری. زۆربەی ڕووداوەکان لە بارەی قازییەوە و کاروباری بە دادگادانی ئەوی بۆ خەڵکی مەهاباد گێڕابوووەوە و ئاشکرا کردبوو.

٧- [عیالم مادر بچەها ... و ملا عبدالله]، مەبەست مەلا عەبدوڵڵای مودەڕڕیسییە.

٨- [اگر ان پانزده هزار تومان بالا اخذ شد بە هر یک از سعید همایون و میرزا رحیم ... و بە محمد فیروزه خانم]، سەعیدی هومایوونی کەسایەتییەکی بەڕێز و خۆشەویستی مەهابادە (لە بنەماڵەی فەیزوڵڵابەگییە) و خوشکزای پێشەوا قازی محەمەدە. میرزا ڕەحیم، میرزا ڕەحیمی جەوانمەردی قازییە. محەمەدی فەیرووزە خانم کارمەندی ئیدارەی دوخخانییات (کارگێڕیی تووتن)ی مەهاباد بووە، ئارژەنێکی لێهاتوو بووە و پوورزای قازی بووە.

٩- میرزا ڕەحمەت: خوداڵێ خۆشبوو میرزا ڕەحمەتی شافیعی، یەکێک بوو لە کەسایەتییە ناودار و دیارەکانی مەهاباد.

١٠- ئاغڵیان: ناوی دێیەکە لە دەوروبەری مەهاباد.

این وصیتنامه، قاضی در دهم فروردین ۱۳۲٦ بحضور اینجانب محمد صدیق صدقی گفته‌اند:

یک پارچه یا دو پارچه قالی یا قالیچه سید رحیم پسر سید جامی با اسبابهای منند، بدهید بخودش و او هم پولی به من مقروض است، اگر داد خوب و اگر نَداد مختار است.

گندمی که در تثبیت بوده‌است و مال من است اگر دادند بگیرید.

ماشین فورد ٤٦ هم مال شخص خودم است.

موقعی که مرا بازداشت کردند پنجهزار و دویست تومان در جیبم بوده، از من گرفتند و یکصد و پنجاه و سه تومان هم یک فقره و ده هزار تومان هم سروان شریف به نام حق الوکاله از عیال من گرفته ان را هم پس بگیرید.

معینی سه هزار تومان چیزی زیاد یا کم به من مقروض است و او هم چیزی داده‌است و ساعت که به عنوان هدیه برای من اورده داخل دفتر شرکت کرده و من با شرکت طرف نبوده‌ام.

سید سلام نمیدانم هشت هزار تومان یا چیزی کمتر طلب بر سرم دارد، هرچه خودش گفت به او بدهید.

تلفون را برده‌اند تعقیب نمائید.

اتومبیلی که از بابا شیخ گرفته‌اند انهم مال شخصی خودش است.

چهار جیب که بشخص خودم ... و در اختیار من بوده انها هم مال شخص خودم میباشند.

چون سروان شریف زحمت ... در حدود سیصد تومانی به او بدهند.

اگر ان پانزده هزار تومان بالا اخذ شد به هر یک از سعید همایون و میرزا رحیم که خدمت کرده‌اند یک هزار تومان و به محمد فیروزه خانم هم پانصد تومان بدهید.

خواهر خودم هستند غیر از اغلیان که به اسم خودم ثبت شده، در همه، ترکه پدرم حق دارند، ایشان را راضی نمائید.

عیالم مادر بچه‌ها وصی باشد اطفالها سرپرستی بکند و ملا عبدالله ناظر باشد.

مطبعه هم خودم خریده‌ام مال من است.

مام عزیز قرنی اقا کاری که بر سرش امده به خیالش به تحریک من بوده‌است اگرچه بی خبرم، اما کاری بکنید که مرا ازاد نماید.

میرزا رحمت یا دیگری هرچند از کشتن نجاتش دادم اگر از من چیزی در دل داشته باشد ازادم کند.

نوکرها که این مدت خدمت کرده‌اند زحمت با من کشیده‌اند، نیکی به ایشان کرده و ایشان را راضی نمائید.

بعد از ... چند هزار تومان برایم اسقاط و تهلیل نمائید.

شب ۱۰-۱-۱۳۲٦

امضاء، ملا صدیق صدقی و قاضی محمد



مەهاباد – مزگەوتی شادەروێش – ١٣١٥/١٦ی هەتاوی.

لەڕاستەوە: ١- روحانی (رەیسی سەبت و ئەحوال)، ٢- مەلا حوسێن مەجدی، ٣- مەلا عەبدوللا مودەریسی، ٤- میرزا وەهاب قازی (کوڕی قازی مونعیم)، ٥- قازی مونعیم، ٦- شەمسولواعیزین، ٧- قازی محەمەد، ٨- مەلا سەدیق سدقی (ئەو مەلایەی دواتر تەلقینی پێشەوا قازی و هاوەڵانی داوە)، ٩- مەلا ئەحمەدی ماوەرانی، ١٠- مەلا محەمەدی لاهیجانی، ١١- سەدری قازی.

((دیاریی: حاجی محەمەد مەلانی، ژمارە ٦١ی گۆڤاری (مەهاباد)ی نیسانی ٢٠٠٦)).




ئەوە ئەو کتێبەیە کە وەسییەتنامە هەڵبەستراوەکەی

پێشەوا (قازی محەمەد)ی تێدا بڵاوکراوەتەوە

((هاوکارمان (مامۆستا ئەحمەد) کە کاتی خۆی سەرنووسەری گۆڤاری (خەباتی قوتابیان) بووە بەدواداچوونێکی لەسەر بۆچوونەکانی ئێمە لەسەر وەسیەتنامەکەی پێشەوا هەبووە و بەنامەیەك بۆی ناردووین، ئێمەش دەقی نامەکەیمان لە ل(٣٢٦–٣٢٨)ی کتێبی (بستێکی خاکی کوردستان بەهەموو دونیا ناگۆڕمەوە) بڵاوکردۆتەوە – ع.زەنگەنە))

# بابەتی هەشتەم

## پرسی کورد لەنێوان بەرداشی عەبدولکەریم قاسمو بەعسدا، چۆن لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا ڕەنگی داوەتەوە...؟!

## پێشەکی

باوەڕ ناکەم کەس گومان لە بایەخی زۆری ئەم بابەتە بکات، هۆ بزوێنە جیاوازەکانی سەرجەمی رووداوەکانی پێویستییان بە لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی قووڵو بابەتەکییە، تایبەت ئەگەر ئەوەیش لەبەرچاو بگرین کە گشت لایەنە ناوخۆو دەرەکییەکان، لە ئەوپەڕی چەپەوە تا ئەوپەڕی ڕاست، تۆباڵی بەسەرهاتەکانی ئەو قۆناغەیان دەکەوێتە ئەستۆ کە بە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ دەست پێدەکاتو تا ئیمڕۆکەیش بەردەوامە، بەڵام کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٣ ئەڵقەیەکی گەلێك بایەخداری زنجیرەی ئەو مێژووە پێك دەهێنێت، دڵنیام لەوەی کەم رووداوی دیکەی ناوچەکە بەڕادەی ئەو ئەڵقەیە بە قووڵی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا ڕەنگی دابێتەوە، لەو بووارەدا پرسی کوردیش شوێنێکی گەورەو دیاری هەیە.




شعار الجمهورية العراقية

بێگومان شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ، بە هەموو پێودانێك، هەنگاوێكی مێژوویی گەورە بوو بۆ پێشەوە، بەپێی بەندێكی سەربەخۆی دەستووری كاتیی ئەو شۆڕشە كوردو عەرەب بوونە دوو گەلی هاوبەشی عێراق‌و خەنجەری كوردی شانبەشانی شیری عەرەبی دروشم‌و ئاڵای فەرمیی نوێی عێراقیان ڕازاندەوە، یاسای چاككردنی كشتوكاڵ‌و كشانەوە لە پەیمانی بەغداو[1] بلۆكی ئیستەرلینی‌و هەوڵی خۆماڵی كردنی نەوت‌و گەلێك شتی تری وەك ئەوان هەنگاوی گرنگ بوون بۆ پێشەوە ئەگەر بهاتایە وڵات دووچاری گێژاوێكی سەختی ئەوتۆ نەهاتایە وا لە نیشتمانپەروەرێكی گەورەی وەك محەمەد ڕەزا شەبیبی بكات فاتیحا بۆ ڕۆحیانەتی نوری سەعید بنێرێت‌و مەسعوود محەمەدیش، كە یەكێك بوو لە پەرلەمەنتارە هەرە چالاكەكانی بەرەی موعارەزە، وای لێ بێت تا دوارۆژی ژیانی خەون بەوەوە ببینێت ڕەوڕەوەی مێژووی وڵات بگەڕێتەوە ئاستی ڕۆژی سیازدەی تەمموزی ساڵی ١٩٥٨[2].

یەكەم بەرپرسی ئەو وەرچەرخانە عەبدولكەریم قاسمە. كەس لاریی لەوە نییە كە عەبدولكەریم قاسم نیشتمانپەروەرێكی دڵسۆزو پیاوێكی ساكارو بێ ترۆفێزو لەخۆبوردووش بوو، تا كۆچی دوایی كرد چەند ژوورێكی وەزارەتی بەرگریی كردبووە شوێنی ژیان‌و بارەگای كاری ڕۆژانەی‌و[3] دڵنەرم‌و دەست‌و داوێن خاوێن‌و

---

(1) شایانی باسە ئێوارەی ڕۆژی ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩، كە لە هۆڵی كۆلێجی علوم لە ئەعزەمییە ساز كرا، عەبدولكەریم قاسم بۆ خۆی ئامادەی بوو، لەوێ وتارێكی خوێندەوەو تێیدا گووتی: حەز دەكەم بەم بۆنەیەوە ئاگادارتان بكەم كە لەم ڕۆژانەدا مژدەیەكی خۆش بە گەلی عێراق ڕادەگەیێنین، دوایی دەركەوت مەبەستی هەواڵی كشانەوەی عێراق بوو لە ((پەیمانی بەغدا)) كە لەوساوە ناوی بووە ((پەیمانی سێنتۆ)). لەو ئاهەنگەدا بۆ خۆم ئامادە بووم‌و وتارێكیشم دەربارەی بە كوردی بڵاو كردەوە، دوكتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵیش بە بەرگی كوردییەوە عەریفی ئاهەنگەكە بوو، مام جەلالیش سەرپەرشتیی ئاهەنگەكەی دەكرد.
(ئەم وتارەی د. كەمال بەناوونیشانی (نەورۆزی ساڵی ١٩٥٩ لە بەغدا) لە ژمارە (٨)ی گۆڤاری (هیوا)ی ئەو ساڵەدا بڵاوكراوەتەوە—ع. زەنگەنە)

(2) جارەهای جار بۆ خۆم ئەو قسەیەم لە خوالێخۆشبوو مەسعوود محەمەد بیستووە.

(3) بەڕێز فوئاد عارف، كە پێوەندیی زۆر نزیكی بە عەبدولكەریم قاسمەوە هەبوو، شتی گەلێك دلنسقە لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوە و لە یادداشتەكانی خۆشیدا ئاماژەی بۆ هەندێكیان كردووە، كاك فوئاد چەند جارێك لەو ژووری نووستنەی وەزارەتی بەرگری لەگەڵ عەبدولكەریم قاسمدا خەوتووە، دەڵێت ژوورەكە یەك قەرەوێڵەی تێدا بووەو بەزۆر ئەوی لەسەر قەرەوێڵەكەی خۆی نواندووەو بۆ خۆیشی لەسەر ئەرزەكە نوستووە، لەمەدا عەبدولكەریم قاسم تا ڕادەیەك لە ستالینی كردووە، هەرچەندە جیاوازیی نێوانی ئەو دوانە ئاسمان‌و ڕێسمانە. دەربارەی ژیاننامەی ستالین كە جۆرجییەو ڕۆژی بیست‌ویەكی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٨٧٩ لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٢٤وە بووە سكرتێری یەكەمی پارتی كۆمۆنیستی سۆڤیەتی تا كۆچی دوایی كتوپڕی لە پێنجی مارتی ساڵی ١٩٥٣دا بڕوانە:
"The New Encyclopedia Britannica", Volume 28, Chicago, London…., 1988, PP. 193-197.

ئەفسەرێکی لێهاتوو بوو، کوردیشی خۆش دەویست، بەڵام پیاوی سیاسەت و حوکم نەبوو، ئەو دووانە، واتا سیاسەت و حوکم، سەختترین دیاردەو هونەری ژیانن، ماکیاڤێللی واتەنی ئەوی لە عۆدەی ئەو هونەرە نەیەت نابێت توخنی بکەوێت.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم، بۆ پتر روونکردنەوەی مەبەست پوختەی سەرگوزشتەیەکی سەیر دەربارەی عەبدولسەلام عارفی رەهبەری دووەمی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بگێڕمەوە. لیوا ڕوکن دوکتۆر سوبحی نازم، کە تۆژەرە لە کۆلێجی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدا، دەمێکە دەیناسم، تورکمانێکی کەرکووکیی کەڵەگەت و کامڵ و بە توانایە، ساڵی ١٩٦٣ یەکەمی کۆلێجی ئەرکانی عیراقی بووە، بۆیەکا هەڵیانبژاردووە ببێتە گەورە یاوەری عەبدولسەلام عارف، دوای کۆدێتای هەشتی شوباتی ئەو ساڵەو تا کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەی عەبدولسەلام عارف لەو پۆستەدا ماوەتەوە، دوکتۆر سوبحی بە چاوی مام سەیری فەریق عومەر عەلیی کردووە بۆیەکا ڕاوێژی پێی کردووە ئەو کارە بکات یا نا، عومەر عەلی کارەکەی پێناخۆش بووە، بەڵام زانیوییە دوکتۆر سوبحی وەک ئەفسەرێك مافی ڕەتکردنەوەی ئەو فەرمانەی نییە، بۆیەکا پێی گوتووە ئەو پیاوە هەڵەشەیەو شتی سەیری لێ دەوەشێتەوە، لەبەر ئەوە ئامۆژگاریی من ئەوەیە، هەموو شەوێك بەر لە نووستن، سەرنجەکانی خۆت لەبارەی ڕەفتارەکانی بنووسیتەوە. دوکتۆر سوبحی ئەو ئامۆژگارییەی لا پەسەند دەبێت و لە یەکەم ڕۆژی کارەکەیەوە لە دەفتەری تایبەتیدا ئەوەی لە ماڵ و لە کۆشك لەو پیاوەی دیوەو بیستووە هەمووی وەك خۆیان، بە وردی و بێلایەنانە، تۆمار کردوون و دوایی یادداشتێکی گەورەو دەگمەنیان لێ دەرچووە. چەند ساڵێك لەمەوبەر، دوای ئەوەی یادداشتەکەی تەتەڵە کردو بە شێوازێکی نازدار دایڕشتەوە، داوای لە من کرد پێشەکییەکی بۆ بنووسم.

زۆر بە وردی کەوتمە خوێندنەوەی ئەو یادداشتە، بەڕاستی هەرگیز نەمدەزانی و بڕوام نەدەکرد عەبدولسەلام هێند سیفاتی باشی تێدا بێت، هێند دڵ ساف و ساکارو بەوەفا بووبێت بۆ هاوڕێ و برادەرو دراوسێکانی، هەموو ڕۆژ بەر لە دەوام داوای لە یاوەرو یاساوڵەکانی کردووە لە تەختانی عەنتەر چاوەڕێی بن و خۆی بە سەڵتی و بەپێ هاتووەو لای گەلێك دوکاندار لای داوەو ماوەیەکی کورتی لە چایخانەکەی تەنیشت سینەمای ئەعزەمییە لەگەڵ هاوڕێ کۆنەکانی بەرێوتە سەر، یا چۆن ئێوارەیەکیان



کامیل چادرچی

محەمەد ڕەزا شەبیبی زۆر بە تورەیی هاتۆتە سەریو چۆن ئەم لەسەرەخۆ دڵنەوایی کردووەو ساردی کردووەتەوەو دواییش تکای لێی کردووە بەر لەوەی بڕوات پێکڕا نوێژی خەوتنان بکەن، بەو مەرجەی شێخ ببێتە پێش نوێژ، چۆن هەر لە ماڵە کۆنەکەی خۆی لە ئەعزەمییە ژیاوەو قەبوڵی نەکردووە بگوێزێتەوە کۆشکی کۆماریو چۆن ڕێگەی نەداوە منداڵەکانی خۆیان لە کەس بەزیاتر بزانن[4]، یا بهێڵێت هیچ کامیان هیچ جۆرە پۆستێکی دیار وەربگرنو چۆنو چۆنو چۆن... ! ؟

ئینجا، لەگەڵ هەموو ئەوانەو گەلێکی دیکەی وەك ئەوانە، کۆتایی پێشەکییەکەی خۆمم بەوە هێنا کە بەختی ئەو پیاوە نەیهێناوە بۆیەکا تێکەڵی سیاسەت بووەو بووەتە سەرەك کۆمار، چونکە لە بواری کارگێڕیدا تەنها شایانی ئەوە بوو ببێتە سەرۆکی کۆمەڵەیێکی هاریکاریی ئیسلامی (جمعیة تعاونیة إسلامیة).

---

(4) کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو ڕەجاء عەبدولسەلام عارف یەکێك بوو لە قوتابییەکانم لە بەشی فارسیی کۆلێجی زمانەکانی زانکۆی بەغدا کە دوکتۆر ئەمین موتابچی سەرۆکی ئەو بەشە بوو، ڕەجا ەکچێکی تۆغرو ڕێکوپێك بوو، پێم وایە هەر بۆ ئەزیەت دان لەو بەشە وەرگیرا بوو، دەمبیست قوتابییە بەعسییەکان بە پلارو توانج وەڕسیان کردووە، من بۆ خۆم زۆر ڕێزم لێی دەنا.







بۆ هەمان مەبەست پەنا دەبەمە بەر کامیل چادرچی، کە نیشتمانپەروەرێکی ڕەسەنو ئازاو دڵسۆزو دیموکراسیخواز بووە، ڕووناکبیرانی کوردیش بە دڵ خۆشیان دەویست، چونکە کەم ڕەهبەری عەرەب بە ڕادەی ئەو پەرۆشی برایەتیو هاوخەباتیی نێوان کوردو عەرەب بوون، تەنانەت کامیل چادرچی یەکەم کەس بوو، بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بە چەند ساڵێك، هاوبەشیی کوردو عەرەبی کردبووە بەندێکی سەرەکیی پرۆگرامی ((پارتی نیشتمانیی دیموکراسی)) (الحزب الوطني الديمقراطي)[5]، بەڵام ئاخۆ ئەو کامیل چادرچییە گەورەیە چەند لەو دروشمە بەرزانەی پێ جێبەجێ دەکرا ئەگەر لەو ساڵانەدا ببووایەتە سەرەك وەزیران، یا سەرەك کۆماری عیراق ؟.

---

(5) دوکتۆر عادل تەقی بەلداوی، کە یەکێکە لە قوتابییە هەرە خۆشەویستەکانمو ئێستا مێژوونووسێکی ناسراوەو دۆستی کوردیشە، کتێبێکی سەربەخۆی دەربارەی بارزانیی لە بەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی عیراقیدا بڵاوکردۆتەوە، کاتی خۆیشی بە سەرپەرشتیی من هەردووك نامەی ماجستێرو دوکتۆراکەی تەرخان کرد بۆ مێژووی ((پارتی نیشتمانیی دیموکراسی))و ((پارتی نیشتمانیی)) و ڕەهبەرە دیارەکانیان چادرچیو محەمەد حەدیدو حسەین جەمیلو ئەوانی تر، ئەوەی یاریدەی منیشی دا نزیکتر ئاگاداری هەڵوێستە سیاسییەکانی کامیل چادرچی بم.

## کورتە پێناسەیەکی
## فایلەکانی ئەم بابەتە

ناوەرۆکی هەزاران لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی تایبەت وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی ڕۆشنایی تەواو دەخەنە سەر گەلێك لایەنی نەبینراو و کەم زانراوی ئەم بابەتە، کە ڕۆشنبیرو توێژەرو سیاسەتمەدارانی کوردو عەرەبو غەیری ئەوانیش تامەزرۆی زانینیانن. لێرەدا زۆر بە کورتی، بە ڕیزو بەپێی ڕۆژگار، ئاماژە بۆ ناوەرۆکی تەنها حەڤدە فایلی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی دەکەین کە وێنەی سەرجەمیانمان گرتووەتەوەو توێژەران، بەپێی پێویست، دەتوانن کەڵکیان لێ وەربگرن.

**یەکەم- فایلی ژمارە ١٦٤٢٨٢/٣٧١**

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، سەدو پەنجا لاپەڕەیەك دەبێت، بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە نامەیەکی نهێنی باڵوێزی بەریتانییە لە بەغدا، کە ڕۆژی حەڤدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ ناردوویە بۆ هەردووك بەشی ڕۆژهەڵاتو ئابووریی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی بارودۆخی ئەمنیی کەرکوكو دەوروبەری.

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل بریتییە لە نامەی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی بۆ ژمارەیەك لە بەشەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن بە بەرواری بیستو نۆی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ دەربارەی پێوەندی کردنی بەریتانییەکان بە دیپلۆماسییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە لە عیراق دەرحەق هەمان بابەت.

ئەم فایلە پڕییە لە بەڵگەنامەی زۆر بایەخدارو نەزانراو دەربارەی سیاسەتی عەبدولکەریم قاسم لە بواری نەوتدا، کە هەمیشە یەکێك بووە لە هۆ سەرەکییەکانی بایەخدانی گشت لایەنەکان بە پرسی کورد لە مێژووی نوێو تایبەت هاوچەرخدا. یەکێك لە بەڵگەنامە هەرە گرنگەکانی ناو ئەم فایلە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی بیستو نۆ لاپەڕەیی کە لە پەنجاو دوو خاڵ پێکهاتووەو مێژووی

بیستو شەشی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ی بە سەرەوەیەو بریتییە لەڕای هاوبەشی سەرۆکانی ((کۆمپانیای نەوتی عیراق)) و ((کۆمپانیای نەوتی موسڵ)) و ((کۆمپانیای نەوتی بەسرە)) کە بەڕیز ئەمانە بوون– هـ. والدووك (H. Waldook) و س. ب. ر. کووك (S.B.R. Cooke) و ی. لاوتەرپاچت (E. Lauterpacht) وێڕای م. ج. مەستیل (M.J. mustill)[6].

لێرەدا ئەم پرسیارە زانستییە ڕەوایە دێتە پێشەوە: ئایا ((سیاسەتی عەبدولکەریم قاسم لە بواری نەوتدا لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا)) چۆن نامەیەکی دوکتۆرای ڕەسەنو بەکەڵکی لێ دەردەچێت؟.

دووەم– فایلی ژمارە ١٧٠٤٢٨/٣٧١

ئەم فایلەش ژمارەی لاپەڕەی لەسەر نییە، دووسەد لاپەڕە دەبێت، یەکەم بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی د. ك. هاسکێل[7] کە ڕۆژی بیستو دووی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ لە بەغداوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیو پێیان ڕادەگەیەنێت ڕۆژنامەی ((الجمهورية))ی عیراقی لە ژمارەی ڕۆژی بیستو دووی کانوونی یەکەمی ئەو ساڵەیدا ئەو بڕیارەی بڵاو کردۆتەوە کە لە ڕۆژی شەشی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٣وە عەبدولکەریم قاسم، دوای ئەوەی چوار ساڵی وەك عەمید ڕوکن بردووەتە سەر، دەبێتە لیوا ڕوکن.

---

(6) N.A., F.O., 371/164282, Iraq Petroleum Company Limited, Mosul Petroleum Company Limited, Basrah Petroleum Company Limited, Joint Opinion, Messrs. Bischoff and Company, City Wall House, 79/83, Chiswell Street, London, E. C.. 1.

(7) دۆناڵد کیث هاسکێل (Donald Keith Haskell): ڕۆژی نۆی مایسی ساڵی ١٩٣٩ لەدایك بووە، ساڵی ١٩٦١ زانکۆی کامبریجی تەواو کردووە، لەو ساڵەوە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیو بە ڕیز لەم شوێنانە کاری کردووە: بارەگای وەزارەت لە لەندەنو بێروتو بەغداو بەنغازیو طرابلسو سانتیاگوو شوێنی دیکە، دیپلۆماسییەکی سەرکەوتوو بووەو چەند خەڵاتێکی وەرگرتووە. بڕوانە:
"Who's Who 1980", London, 1980, P. 1126.

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل دیسانەوە نامەیەکی هاسکێلە کە ڕۆژی بیستو دووی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ گودچایلد لە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیو تێیدا باسی ئەوە دەکات چۆن مانگرتنی قوتابییە بەعسییەکان بۆتە هۆی دواخستنی ڕۆژی هەڵبژاردنی ئەندامانی نەقابەی مامۆستایان بۆ کۆتایی مانگی شوباتو ڕۆژنامە شیوعییەکانیش زۆر بە توندی دژی ئەو دواخستنەن[8].

### سێیەم- فایلی ژمارە ١٦٤٢٨٤/٣٧١

فایلێکی پچووکە، ئەمەشیان لاپەڕەی لەسەر نییە، بەپێی ژماردنی خۆم پەنجاو تۆ لاپەڕەیە، بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە نامەیەکی فەرمیو نهێنی باڵوێزخانەی بەریتانییە لە بەغدا، کە ڕۆژی بیستو چواری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ بە ئیمزای د. ج. ب. ڕۆبییەوە[9] نێردراوە بۆ د. م. سمیث[10]و بەشی ((خوێندنو کۆمەڵایەتییەکان)) و ((بەشی هەرەوەزی تەکنیکی)) وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن. لەو نامەیەدا، کە لە شەش خاڵ پێکهاتووە، ڕۆبی باسی ئەوە دەکات چۆن سیاسەت باڵی بەسەر گشت بووارەکانی خوێندندا کێشاوەو چۆن کاربەدەستانی عێراقی، لەدوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژەوە، بەچاوی گومانەوە سەیری ئەو بەریتانییانەیان کردووە کە لەبوواری خوێندنو پەروەردەدا کاریان کردووە[11].

---

(8) N.A., F.O., 371/170428, From: D. Haskell, British Embassy, Baghdad, No. 10116/1/63, January 22, 1963, To: D.L.N Godchild, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(9) دۆگلاس جۆن برێت ڕۆبی (Douglas John Breet Robey): ڕۆژی حەوتی ئابی ساڵی ١٩١٤ لەدایک بووە، لەساڵی ١٩٣٧وە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، بە ڕیز لە پەکینو واشنتۆنو پاریس و بەرلینو بەغداو شیکاغۆو نەتەوە یەکگرتووەکان کاری کردووە، ژمارەیەک وتارو کتێبی هەیە. بڕوانە: ((Who's Who 1980)), London, 1980, P.2176.

(10) دەبێت مەبەستی داڤید ماکلیز سمیث ((David Maclies Smith)) بێت کە ساڵی ١٩٠٠ لەدایک بووەو وتارو بەرهەمی زانستیی زۆرە. بڕوانە: Ibid, P. 2364.

(11) N.A., F.O., 371/164284, From: D.J.B. Robey , British Embassy, Baghdad, No. 1741/3/62, Confidential, January 24, 1962, To: D.M. Smith, Esq., Education and

هەرچی دوا بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلەیە، بریتییە لە ڕاپۆرتێکی یازدە لاپەڕەیی کە لە دوازدە خاڵو دوو پاشکۆ پێکهاتووە، ڕۆجەر ئەلێنی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا ڕۆژی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن دەربارەی هەمان بابەتی خوێندنو پەروەردە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمدا[12].

چوارەم- فایلی ژمارە ٣٧١/١٧٠٤٢٩

ئەمەشیان ژمارەی لاپەڕەی لەسەر نییە، دوو سەد لاپەڕە دەبێت، بەڵگەنامەی یەکەمی ڕاپۆرتێکی نهێنی دوو لاپەڕەیی چڕوپڕە، کارمەندی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا، ڕ. دەبلیو. مۆنرۆ (R.W.Monro) ناو، ڕۆژی بیستو دووی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن، دیسانەوە باسی مانگرتنەکەی قوتابییە بەعسییەکانو خۆپیشاندانەکانی لە بەغدا تێدایە، وێڕای بیروبۆچوونی هەردووک ڕۆژنامەی ((الجمهورية))ی میری و ((المواطن))ی سەر بە کامیل چادرچی[13].

دوا بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلەش بروسکەی باڵوێزی بەریتانی لە هۆڵەندەیە، کە ڕۆژی دەی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی لە لەندەن دەربارەی ئەوەی حوکمەتی هۆڵەندی هێشتا بڕیاری خۆی نەداوە دان بە ڕژێمی نوێی عیراقدا بنێت[14].

---

Social Services Department, Department of Technical Co-operation, Foreign Office, London, S.W.1.

(12) Ibid, Form: Roger Allen, British Embassy, Baghdad, No. 81 (1746/11/62), December 1, 1962, To: Foreign Office, London S.W.1.

(13) N.A., F.O., 371/170429, From: R.W. Monro, British Embassy, Baghdad, No. 1016/9/63, Confidential, January 22, 1963, To:D.L. N. Godchild, Eastern, Foreign Office, London, S.W.1.

(14) Ibid, From: The Hague, To: Sir A. Noble, No. 37, February 10, 1963, Foreign Office, London, S.W.1.

شایانی باسە بالۆێزی بەریتانی لە ستۆکهۆڵم وێنەی بروسکەکەی خۆی بە ڕیز داوەتە هەریەك لە بالۆێزخانەکانی بەریتانیا لە تاران‌و واشنتۆن‌و پاریس‌و بۆن‌و ئەنقەرەو ڕۆماو بارەگای ((پەیمانی ناتۆ)) و بەغداو نیویۆرك.

پێنجەم- فایلی ژمارە ۱۷۰٤۳۰/۳۷۱

ژمارەی لاپەڕەی لەسەر نییە، نزیکەی سەدو پەنجا لاپەڕە دەبێت، فایلێکی یەکجار بایەخدارە، سەرجەمی بەلگەنامەکانی ناو ئەم فایلە بۆ یەکەم چوار ڕۆژی دوای کۆدێتای هەشتی شوباتی بەعسییەکان تەرخان کراون، ئەو ڕۆژانەی دیپلۆماسییە بەریتانییەکان، لەو چوار ڕۆژەدا بە پەرۆشەوەو ئان بەئان دووی ڕووداوەکانی عیراق کەوتبوون، بۆیەکا لەم فایلەدا گەلێك هەواڵی بێئەندازە دانسقە دەخوێنینەوە.

بەلگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە بروسکەیەکی بالۆێزی بەریتانییە لە بەغدا کە ڕۆژی دووەمی کۆدێتاکە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی‌و تێیدا وەزارەت لەوە ئاگادار دەکات کە گشت دیپلۆماسییە بەلچیکییەکان لە عیراق سەلامەتن[15].

هەرچی دوا بەلگەنامەی ناو ئەم فایلەیە بریتییە لە بروسکەیەکی بالۆێزخانەی بەریتانی لە تاران، کە ڕۆژی یازدەی شوباتی هەمان ساڵ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی‌و تێیدا دەڵێت ئەم بەیانییە وەزیری هەندەرانی ئێران پێی ڕاگەیاندم کە هەر ئیمڕۆ تاران دان بە ڕژێمی نوێی عیراقدا دەنێت[16].

بەلگەنامەی دووەمی ناو ئەم فایلە بروسکەیەکی نهێنی بالۆێزی بەریتانی لە بەغدا سێر ڕۆجەر ئەلێنە کە ڕۆژی نۆی شوبات ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵی بریندار بوونی دوو بەریتانی کە گوللەی وێڵ بەر

(15) N.A., F.O., 371/170430, From: British Embassy, Baghdad, No.108, 9 February, 1963 To: Foreign Office, London, S.W.1.

(16) Ibid, From: British Embassy, Tehran No.136, 11 February, 1963, To: Foreign Office, London, S.W.1.

لاقیان کەوتووە، یەکەمیان ك. دێڤیسی هەواڵنێری ڕۆیتەرو دووەمیشیان ڕ. برلیئوەیتی ئەفسەری یاریدەری کارگێڕییەو چۆن هەردووکیان گەیێندراونەتە ئەخۆشخانە[17].

هەمان ڕۆژی نۆی شوبات دیسان سێر ڕۆجەر ئەڵین لە بەغداوە بروسکەیەکی پەلەی ناردووە بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن دەربارەی دۆزینەوەی لاشەی هەر یەك لە عەبدولکەریم جەدەو وەسفی تاهیر لەناو داروپەردووی وەزارەتی بەرگریدا، بەڵام هەرچی عەبدولکەریم قاسمو مەهداوی‌و تەها شێخ ئەحمەدە[18] بە زیندوویی دەستگیر کراون‌و دوای ئەوە گوللەباران کراون‌و تەرمەکانیان لە هۆڵی ((ئەنجوومەنی نیشتمانی)) عەرز دەکرێن[19].

ڕۆژی دواتر، واتا دەی شوبات، سێر ڕۆجەر ئێلێن لە بەغداوە بروسکەیەکی ناردووە بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن دڵنیایان دەکات لە وەزعی بەریتانییەکانی بەغداو کەرکووك‌و بەسرە، ئەوەیش بەڵگەنامەی چوارەمی ناو هەمان فایلە.

هەمان ڕۆژی دەی شوبات دیسانەوە سێر ڕۆجەر ئێلێن لە بەغداوە بروسکەیەکی ناردووە بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن‌و تێیدا فەرمانڕەوایانی بەریتانیا لەوە ئاگادار دەکات کە وەزیریی هەندەرانی ڕژێمی نوێی عیراق پێی ڕاگەیاندووە کە حوکمەتەکەی ((هیوادارە باشترین پێوەندیی بە بەریتانیاوە هەبێت‌و نیازییە بە زووترین کات باڵوێزێکی خۆی بنێرێتە لەندەن))[20].

بەڵگەنامەی شەشەمی هەمان فایل بروسکەیەکی پەلەو نهێنی سێر ڕۆجەر ئێلێنە بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی‌و تێیدا دەڵێت:

---

(17) Ibid, From: British Embassy, Baghdad No.139, 9 February, 1963, To: Foreign Office, London, S.W.1

(18) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە هەڵە تاهیر شێخ ئەحمەد (Taher Shaikh Ahmed) نووسراوە.

(19) N.A., F.O., 371/170430, From: British Embassy, Baghdad, No.110, 9 February, 1963 To: Foreign Office, London, S.W.1.

(20) Ibid, From: British Embassy, Baghdad, No.127, 10 February, 1963, To: Foreign Office, London, S.W.1

**((وەزیری هەندەرانی نوێی عیراق داوای لێ کردووم ئیمڕۆ سەعات دوو و نیوی پاش نیوەڕۆ بەکاتی بەغدا بچم بۆلای، پێشنیاریش دەکەم بچم)).**

وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی یەکسەر موافەقەت دەکات، هەمان کات وەزیری هەندەران پێشنیار دەکات **((لە ماوەی بیستو چوار سەعات، یا ئەوپەڕەکەی لە ماوەی چلوهەشت سەعاتدا، حوکمەتی خاوەن شکۆ بە فەرمی دان بە ڕژێمی نوێی عیراقدا بنێت))**[21].

بەڵگەنامەی دواتری ناو هەمان فایل هی سێر ڕۆجەر ئێلێنە کە دوای دیدەنییەکەی لەگەڵ وەزیری هەندەرانی ڕژێمی نوێی عیراقدا یەکسەر ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

**((وەزیری هەندەرانی (عیراق– ک.م.) گەنجێکی سی ساڵان دەبێت[22]، چونکە بڕوانامەی ئەندازیاریی لە لەندەن وەرگرتووە، ئینگلیزییەکی زۆر باش دەزانێت، پێی گوتم کە ژنێکی ئینگلیزی هەبووە، عەصەبییەتی پێوە دیار بوو، بەڵام یەکجار دۆستانە گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم))**[23].

بەڵگەنامەکانی دیکەی ناو ئەم فایلە زۆر بەروونی ڕادەی بەختەوەریی گشت فەرمانڕەوا کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە، لەسەروو هەمووشیانەوە نەتەوەپەرستە

---

(21) Ibid, From: British Embassy, Baghdad No.123, 10 February, 1963, To: Foreign Office, London, S.W.1, Ibid, From Foreign Office, London, To: Baghdad, Cypher, OTP, No. 179, February 10, 1963, Emerency, Confidential.

(22) مەبەستی طالب حسەین شبیبە، دوایی بووە نوێنەری عیراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان، بەر لە کۆچیی دوایی بیرەوەرییەکانی دەربارەی ئەو ڕۆژگارە بڵاو کردوەتەوە.

(*) ((ئەو بیرەوەرییانەی لەم پەراوێزەدا ئاماژەی بۆ کراوە، لەڕۆژنامەی (الزمان)ی چاپی (لەندەن)دا بڵاوکراوەتەوە، (سالح محەمەد ئەمین) بەشی (١٧) و (١٨)، کە تایبەتە بە پرسی کورد، کردوویەتیە کوردی و لەژمارە(٣)ی (باسکاڵ)ی ١٩٩٩دا بڵاوی کردۆتەوە و بەدواداچوونێکیشی لەسەر نووسیوە.

باسکاڵ: گۆڤارێکە تاساڵی ٢٠٠١، (٧)ژمارەی لێ دەرچووە، لەوساوە ژمارەی دیکەی لێ بڵاونەکراوەتەوە، (سەباحی غالب) سەرنووسەری بووە ــ ع. زەنگەنە)).

(23) N.A., F.O., 371/170430 Confidential, From: Sir Roger Allen, British Embassy, Baghdad, Cypher OTP, No.128, February10, 1963, To: Foreign office, Immediat, London, S.W.1.

عەرەبەکان نیشان دەدەن کە بەبۆنەی کەوتنی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسمەوە پێشبڕکێیان بوو لە بوواری پشتگیریو دان پیانادا بە ڕژێمی بەعس. بەپێی یەکێك لە بەڵگەنامەکان سەعات حەوتو نیوی سەرلەبەیانیی ڕۆژی نۆی شوبات شێخی کوێت بروسکەی پیرۆزبایی بۆ عەبدولسەلام عارف ناردووەو لە هەموو کوچەو کۆڵانو شەقامێكو ئێزگەی کوێت بۆتە شاییو هەڵپەڕکێ، هەموویشی بیست ساڵی نەخایاند کاتێك سەدام حسەین سەد قات حەقی ئەو چاکەیەی دانەوە.

**شەشەم- فایلی ژمارە ۱۷۰٤۳۱/۳۷۱**

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، دوو سەد لاپەڕە دەبێت، بەڵگەنامەی یەکەمی بروسکەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانییە بۆ باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا، لە سەعات هەشتو دە دەقیقەی بەیانیی هەشتی شوباتی ۱۹٦۳ بەکاتی لەندەن. دەقی ناوەرۆکی بروسکەکە دەڵێت:

**((حوکمەتی ئەڵمانیای (ڕۆژئاوا- ك. م.) هەواڵی ستافی باڵوێزخانەکەیان لە بەغداو ئەڵمانەکانی دیکەی ئەوێیان لە ئێمە پرسی. تکایە پێوەندیی بە باڵوێزخانەکەیانەوە بکەنو ئەم ڕاپۆرتەیان بگەیێننێ))**[24].

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل بریتییە لە دوو وتار، یەکەمیان وتاری ڕۆژنامەی ((تایمس))ی ڕۆژی دوازدەی شوباتی هەمان ساڵە بە ناونیشانی ((پیاوە نوێکانی عێراق))ەوە[25]، دووەمیشیان وتاری ڕۆژنامەی ((دەیلی مەیل))ی ڕۆژی سیازدەی شوباتی هەمان ساڵە بەناوی (یەکەم هەواڵنێری بەریتانی لە بەغدا)وە[26]، هەردووك وتارەکەش ئاماژەیان بۆ کورد کردووە، لە ((دەیلی مەیل))دا وێنەی ئارثەر کوكو سێر ڕۆجەر ئەلێنی باڵوێزی بەریتانی لە بەغداو وێنەی خۆپیشاندانێکی گەورەی

---

(24) N.A., F.O., 371/170430, Confidential, From:, Foreign office, London, To: Baghadad, Cypher OTP, No.147, February 8, 1963, D.8. 10 p-m.

(25) Ibid, Iraq's New Men, -"The Times", 12 February, 1963.

(26) Ibid, Arthur Cook, First British reporter in Baghdad, The voices of Nasser Speak,- "Daily Mail", February, 1963.

خەڵکی کوێت بەبۆنەی سەرکەوتنی کۆدێتای هەشتی شوباتەوە بڵاو کراونەتەوە (بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٦)).

وێڕای هەموو ئەوانە گەلێك بەڵگەنامەی دەگمەنو بایەخدار دەربارەی ڕووداوو ئاڵو گۆڕو هەڵسوکەوتی ڕەهبەرانی ڕژێمی نوێ لەم فایلەدا هەڵگیراون.

### حەوتەم- فایلی ژمارە ١٧٠٤٣٢/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، نزیکەی دوو سەد لاپەڕە دەبێت، بەڵگەنامەی یەکەمی بریتییە لە نامەیەکی نهێنی باڵوێزخانەی بەریتانی لە کەراچی کە ڕۆژی دوازدەی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی هەواڵی دان پێدانانی پاکستان بە ڕژێمی نوێی عیراقدا، دوا بەڵگەنامەیشی بریتییە لە وتارێکی ئێریك داونتۆن لە ((دەیلی تێلێگراف))دا بەم ناوونیشانەوە: ((جەنگی عیراق دژی کۆمۆنیستەکان))[27].

### هەشتەم- فایلی ژمارە ١٧٠٤٣٣/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، بەڵام فایلێکی زۆر گەورەیە، بە لایەنی کەمەوە سێسەد لاپەڕە دەبێت، سێ لاپەڕەی یەکەمی بریتین لە ژمارەیەك بروسکەی پەلەو نهێنی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن دەربارەی ڕووداوەکانی ڕۆژانی یەکەمی دوای کۆدێتای هەشتی شوباتی ١٩٦٣.

دوای بروسکەکان، یەکەم بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانییە لە ئەنقەرە کە ڕۆژی پازدەی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن، لە خاڵی پێنجەمی نامەکەیدا باڵوێز دەڵێت ((بەپێی بۆچوونی ڕۆژنامە تورکییەکان پێوەندیی تورکیا بە ڕژێمی نوێی عیراقەوە لەجاران باشتر دەبێت))، وێنەی ئەم نامەیە دراوەتە بەغداو دیمەشقو بێروتو عەممانو تارانو قاهیرەو ئەسینا[28].

---

(27) N.A., F.O., 371/170432, Eric Downton, Iraq's "War" on Communists,- "Daily Telegraph", 21 February, 1963.

(28) N.A., F.O., 371/170433, From Ankara, To: Foreign Office, By Bag, No. 10 Saving, February 15, 1963, London, S.W.1.

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل سوپاسنامەیەکی نهێنی ((گ. ف. هیلەر))ە ڕۆژی پێزدەی مارتی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ ((ڕۆجەر ئەلێن))ی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا کە ڕاپۆرتێکی سێ لاپەڕەیی نهێنیی دەربارەی رووداو و ڕابەرانی کودێتای هەشتی شوباتو سەرنجو بۆچوونیانی بۆی ناردووە[29].

یەکێك لە بەڵگەنامە دەگمەنەکانی ناو ئەم فایلە ڕاپۆرتێکی نهێنیی دوو لاپەڕەو نیویە دەربارەی هەڵوێستی ئێزگەی ((پەیکی ئێران)) بەرانبەر کودێتای هەشتی شوبات، ((پەیکی ئێران)) ئێزگەیەکی نهێنیی بوو، پرۆگرامەکانی بە فارسیو ئازەریو کوردی لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە بەخش دەکرد[30]، دەقی وتارەکەی ((پەیکی ئێران)) بەزمانی کوردیی بووە، بەڵام لە فایلەکەدا وەرگێڕانەکەی بە ئینگلیزی هەڵگیراوە. بەکورتی ئەم فایلە پڕییە لە ڕاپۆرتو نامەو بروسکەی یەك لەدوای یەك دەربارەی کودێتاکەی هەشتی شوبات، کە زانیارییەکانی ناو زۆربەیان پێوەندییان بە پرسی کوردەوە هەیە، بۆیەکا سەرچاوەیەکی ڕەسەنو پێویستن بۆ هەمووان، تایبەت بۆ توێژەرو نووسەران.

## نۆیەم- فایلی ژمارە ١٧٠٤٣٥/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، نزیکەی سەد و پەنجا لاپەڕە دەبێت، یەکەم بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە نامەیەکی فەرمیی وەزیری هەندەرانی نوێی عیراق ((طالب حسەین شبیب))ە کە ڕۆژی بیستی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ سێر ((ڕۆجەر ئەلێن))ی باڵوێزی بەریتانی لە بەغداو تێیدا سوپاسگوزاریی ڕژێمی نوێی عیراق ڕادەگەیەنێت بەرانبەر بڕیاری دان پێدانانی حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانی لە ڕۆژی دولزدەی شوباتدا بە ڕژێمی نوێی عیراق[31]. شایانی باسە نامەکەی (طالب شبیب) لەسەر لاپەڕە فەرمییەکانی ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسم چاپ کراوە کە

(29) Ibid, Confidential, EQ 1015, From: G.F. Hiller, Foreign Office, London, March 15, 1963, To: Sir Roger Allen, K.C.M.G, British Embassy, Baghdad.

(30) Ibid, No. EE/1176/A4/1, International Affairs, Middle East, Peyk-e Iran, on the Iraqi Coup d'Etat, Berlin (G D R), in Kurdish.

(31) N.A., F.O., 371/170435, From: Foreign Office, Baghdad February 20, 1963, To: Sir Roger Allen, Embassador of Her British Majesty's Government, Baghdad.

لەلای سەرەوەی بە دروشمە کۆنەکەی ئەو ڕۆژگارە ڕازاوەتەوە کە وێنەی شێری عەرەبو خەنجەری کوردی تێدایە (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٥)).

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل بریتییە لە دوو نامەی نهێنی دەربارەی پرسی کورد بە بەرواری یازدەی نیسانو یازدەی مایسی ساڵی ١٩٦٣، وێڕای دەیان بەڵگەنامەی زۆر بایەخداری دیکە دەربارەی هەمان بابەت.

## دەیەم- فایلی ژمارە ١٧٠٤٣٧/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، نزیکەی دوو سەد لاپەڕە دەبێت، ((پێوەندییەکانی کوردی عێراق)) ناونیشانی یەکەم بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلەیەو بریتییە لە یادداشتێکی دوورو درێژی چوار لاپەڕەیی کە ڕۆژی نۆی مایسی ساڵی ١٩٦٣ کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی ((پێرسی کرادۆك))[32] نووسیوییە[33]. ئەم چوار وتارە گرنگەی خوارەوەیش لە هەمان فایلدا هەڵگیراون:

أ- ((مەترسییەکانی ڕاپەڕین لە عێراق))، ڕۆژنامەی ((یۆرکشایەر پۆست))، پازدەی مایسی ١٩٦٣[34].

ب- ((کورد هەوڵ دەدەن سەرۆك ناسر یاریدەیان بدات، لە هەواڵنێری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستمانەوە، بێروت))، ڕۆژنامەی ((تایمس))، هەژدەی مایسی ١٩٦٣[35].

---

(32) پێرسی کرادۆك (Percy Cradock): ڕۆژی بیستو شەشی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣ لەدایك بووە، لەساڵی ١٩٥٤وە بووەتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، وەك کۆنسوڵو وەزیر موفەوەز لە چینو هۆنگ کۆنگو کوالالامپورو شوێنی دیکە کاری کردووە، ساڵی ١٩٧٦ بووەتە باڵوێزی بەریتانیا لە ئەڵەمانیای ڕۆژهەڵات، کاتێك ئەو نامەیەی لای سەرەوەی نووسیوەو تا ساڵی ١٩٦٦ لە خودی وەزارەتی هەندەران کارمەند بووە. بڕوانە:

((Who's Who 1980)), London, 1980, P. 570.

(33) N.A., F.O., 371/170437, Confidential, Iraqi, Kurdish Relations, P. Cradock, May 9, 1963.

(34)Rising Dangers in Iraq,- ((Yourkshire Post)), 15 May, 1963.

(35) Kurds Seek help of President Nasser, From our Middle East Corresponded, Beirut, -((The Times)), 18 May, 1963.

ج- ((ئامادە بوونی هێزەکانی عیراق بۆ شەڕی کورد))، ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلگراف))، بیستی مایسی ١٩٦٣[36].

د- ((پووچەڵکردنەوەی پیلانەکەی عیراق، سەدو هەشتا گیراو))، ڕۆژنامەی ((ئۆبزێرڤەر))، بیستو شەشی مایسی ١٩٦٣. لە ناوەڕۆکی وتارەکەدا ((ئۆبزێرڤەر)) دەڵێت: شەست کەس لە گیراوەکان ئەفسەرن[37].

**یازدە- فایلی ژمارە ٣٧١/١٧٠٤٣٨**

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، نزیکەی سەدو پەنجا لاپەڕە دەبێت. یەکەم بەڵگەنامەی ناو ئەم فایلە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزی بەریتانی سێر ((ڕۆجەر ئەلێن))ە کە ڕۆژی نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ دەربارەی چالاکییەکانی چەکدارانی کورد لە دەوروبەری کەرکووك ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، پێشنیار دەکات بەریتانییەکانی ئەو ناوچانە بگوێزرێنەوە ناو کەرکووك خۆی، یا بۆ بەغدا[38].

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایلیش بریتییە لە بەیانێکی حەوت لاپەڕەیی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) کە ڕۆژی دەی حوزەیرانی هەمان ساڵ بڵاوی کردۆتەوە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەی جێگری سەرەك وەزیرانو وەزیری ئیرشاد عەلی ساڵح سەعدی هەمان ڕۆژ بەستوویەتیو گەلێك ڕۆژنامەنووسو هەواڵنێری عیراقیو عەرەبو بیانی تێیدا بەشدار بوونو چ ئەمیان کە پێنج لاپەڕەیەو چ ئەویان بۆ سیاسەتی بەعس بەرانبەر پرسی کورد لەو ڕۆژگارە ناسکەدا تەرخان کراون[39].

وێڕای ئەوانە بەشی هەرە زۆری بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە پێوەندییان بە پرسی کوردەوە هەیە لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی بەعسداو بەو جۆرە دەبنە سەرچاوەیەکی بایەخدار بۆ توێژینەوەی پرسی کورد لەو قۆناغەدا.

---

(36) ((Iraqi Troops Massing in case of Kurdish War)), -((Daily Telegraph)), 20 May, 1963.

(37) ((Iraq plot foiled, 180 arrested)), -"The Observer", 26 May, 1963.

(38) N.A., F.O., 371/170438, Confidential, From: Sir Roger Allen, No. 613, June 9, 1963, Cypher OTP, British Embassy, Baghdad, To: Foreign Office, Priority Confidential, London, S.W.1.

(39) Ibid, Sayed Ali Saleh Al-Sa'adi, Deputy Prime Minister and Minister of Guidance, held a Press Conference at 11.30 A.M. at Broadcasting Station, PP.8-12.

### دوازده– فایلی ژماره ١٧٠٤٣٩/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، یەکەم بەڵگەنامەی بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا کە ڕۆژی پازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ بە ناوونیشانی ((هەڵوێستی کورد)) (Kurdish Situation)ەوە ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن.

دوا دوو بەڵگەنامەی ناو هەمان فایلیش بریتین لە دوو نامەی دیکەی هەمان وەزارەت، دەربارەی هەمان بابەت، کە ڕۆژانی سیازدەی تەممووز حەوتی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦٣ ناردوونی بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن. وێڕای ئەوانە زۆربەی بەڵگەنامەکانی تری ناو ئەم فایلە تەرخان کراون بۆ پرسی کوردی عیراق لە دوا قۆناغی یەکەم فەرمانڕەوایی بەعسدا، لەوانە ئیستیقالەکەی فوئاد عارف‌و بابە عەلیی شێخ مەحموودو چالاکییەکانی جەواهیری (بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (٤)– ع. زەنگەنە) لە ڤیەنناو محەمەد سەعید خەفاف لە لەندەن، وێڕای ژمارەیەك ڕۆژنامەی جۆراو جۆر کە هەواڵەکانی کوردستانی ئەو ڕۆژگارەیان بڵاو کردووەتەوە[40].

### سیازدە– فایلی ژمارە ٤٥٢٢٧٨/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەی لەسەر نییە، نزیکەی سەد لاپەڕە دەبێت. لەگەڵ ئەوەیشدا بەڵگەنامەکانی بایەخێکی تایبەتییان هەیە، چونکە زۆربەیان دەربارەی وتووێژی حوکمەتی بەعسن لەگەڵ ڕەهبەرانی کورددا.

بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە نامەیەکی دوو لاپەڕەیی سێر ((ڕۆجەر ئەلێن))ی باڵوێزی بەریتانییە لە بەغدا کە ڕۆژی یازدەی نیسانی ساڵی ١٩٦٣ بە ناوونیشانی ((وتووێژی عیراقیی– کوردی))یەوە ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن[41].

---

(40) لە بەشەکانی دیکەی ئەم بابەتەدا دێینەوە سەر درێژەی ناوەرۆکی ئەم بەڵگەنامانە و وێنەی بەشێکیشیان دەکەینە پاشکۆی ئەم کتێبە.

(41)N.A., F.O., 371/4522787, Confidential, From British Embassy, Baghdad, No. 395, 11 April, 1963, Iraqi- Kurdish Negotiations, To: Foreign Office, London , S.W.1

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل دیسانەوە بریتییە لە نامەیەکی سێ لاپەڕەیی جیرویری نهێنیی سێر رۆجەر ئەلێنی باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا دەربارەی پرسی کورد کە رۆژی پازدەی مایسی هەمان ساڵ ناردوویە بۆ بەشی رۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن‌و وێنەشی لێ داوەتە باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە هەر یەك لە واشنتۆن‌و تاران‌و ئەنقەرەو قاهیرەو بێروت‌و دیمەشق(42).

لەم فایلەدا گەلێك بەڵگەنامەی گرنگی دیکە دەربارەی پرسی کورد لەو رۆژگارەدا هەڵگیراون، لێرەدا سەرنجی خوێنەر بەتایبەتی بۆ بابەتەکانی ناو ئەم پێنج رۆژنامەیەی لای خوارەوەی هەمان فایل رادەکێشین:

أ- ((بڕیاری کوشتنی دوازدە سەربازی عێراقی بە گوللە))، رۆژنامەی ((تایمس))، ٢٢ی نیسانی ١٩٦٣. بەپێی ((تایمس)) ئەو سەربازانە بە کوشتنی عەبدولوەهاب شەواف‌ی رەهبەری یاخیبوونەکەی موسڵی ساڵی ١٩٥٩ تاوانبار کراون(43).

ب- تائێستە لەناو ئەو فایلانەی ئەرشیفی نیشتمانیی حوکمەتی بەریتانیدا، کە بۆ پرسی کورد تەرخان کراون‌و من دیومن، تەنها رۆژنامە بەریتانییەکان هەڵگیراون ئەم فایلە نەبێت کە وتارێکی گەورەی رۆژنامەی بەناوبانگی ((نیویۆرك تایمس))ی ئەمەریکیی دەربارەی ئەو پرسەی تێدا هەڵگیراوە. ((مۆسکۆ پشتگیریی دامەزراندنی دەوڵەتێك بۆ هۆزە کوردەکان دەکات)) ناوونیشانی وتارەکەو ((سێیمۆر تۆپینگیش)) نووسەرییەو بەشی یەکەمی لە عەموودی یەکەمی لاپەڕەی یەکەم‌و بەشەکەی دیکەشی لە عەموودی شەشەمی لاپەڕە شەشی ((نیویۆرك تایمس))ی رۆژی حەوتی مایسی ساڵی ١٩٦٣دا بڵاوکراوەتەوە، کە لە رۆژانی وتووێژی دامەزراندنی ((کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو))دا پێشکەشی کردبوو دەربارەی ئەوەی کوردستانی عێراق هاوشانی وڵاتە عەرەبییەکان بێت‌و بە دەستووری ئەوان یەکێك لە ئیقلیمەکانی ئەو کۆمارە بێت(44).

---

(42) Ibid, Confidential, From British Embassy, Baghdad, No. 522, 15 May, 1963, To: Foreign Office, London , S.W.1

(43) ((12 Iraq Soldiers to be shot)),- "The Times", 22 April, 1963.

(44) Seymour Topping, Moscow Supports State for Iraqi Kurdish Tribes, -"New York Times", 7 May, 1963.

ج– ((ئینسات، رووس پشتگیریی دەوڵەتێکی کوردی دەکەن لەناو کۆماری عەرەبیی یەکگرتووی نوێدا))، ڕۆژنامەی ((تایمس))، ٨ی مایسی ١٩٦٣[45].

د– کلەیر هۆلینگۆث، بەعسییەکان خاڵی پشکنین (سیطرة) دادەنێنەوە، ڕۆژنامەی ((گاردیان))، ١٤ی مایسی ١٩٦٣[46].

هـ– ڕیچارد بێستۆن، ڕژێمی عیراقی لە مەترسیدایە. یاریدەی نا بەدڵی هێزە سەر بە ناسرییەکان)) ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلێگراف))، ٢١ی مایسی ١٩٦٣[47].

چواردە– فایلی ژمارە ١٧٠٤٤٩/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، فایلێکی گەورەیە، ((ڕاپەڕینی کورد: پێکدادان لەگەڵ سوپادا)) ناونیشانی ئەم فایلەیە[48]، واتا گشت بەڵگەنامەکانی ناوی دەربارەی پرسی کوردن لە گەرمەی ڕۆژانی یەکەم فەرمانڕەوایی بەعسی عیراقدا.

بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلەو گەلێك بەڵگەنامەی دیکەشی دەربارەی هەڵهاتنی هەزارەها منداڵو ئافرەتو پیرێژنو پیرەمێردو پەککەوتەی کوردی عیراقن لەژێر فشاری سوپادا بۆ ناو خاکی تورکیا، تایبەت بۆ ناوچە شاخاوییە سەختەکانی هەکاریو هەڵوێستی حوکمەتی تورکیا بەرانبەریان وەك دواییش لەم بابەتەدا بە درێژی باسی دەکەین. لە هەمان فایلدا گەلێك بەڵگەنامەی دیکەی نهێنی و بایەخداری وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی هەڵگیراون، کە بەشی هەرە زۆریان بۆ دارشتنی ناوەرۆکی ئەم بابەتە بەکار دەهێنرێنو دڵنیاین لەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشن.

پازدە– فایلی ژمارە ١٦٤٢٨١/٣٧١

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، بەلایەنی کەمەوە سێسەد لاپەڕە دەبێت. بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە بریتییە لە یادداشتێکی باڵوێزخانەی بەریتانی لە

---

(45) Monitor, Russian Support For Kurdish State in New U.A..R., -"The Times", 8 May, 1963.

(46) Clare Holling worth, Ba,atheists retain control, -"The Guardian", 14 May, 1963.

(47) Richard Beston, Iraq Regime in Danger. Discontent aiding pro- Nasser forces, -"Daily Telegraph", 21 May, 1963.

(48) N.A., F.O., 371/170449, Kurdish Revolt: Conflict with army.

ـغدا، ڕۆژی شازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ ناردوویە بۆ لەندەن دەربارەی ـروبۆخی وڵات لە دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمدا[49]، دوا بەڵگەنامەی ئـو هەمان فایلیش بریتییە لە وتارێکی ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلێگراف)) کە ڕۆژی حەوتی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣، واتا دوای کەوتنی ڕژێمی بەعسی یەکسەر بڵاوی کردووەتەوە[50].

یەکێك لە ڕۆژنامەکانی ناو ئەم فایلە باسی فڕاندنی ((میستەر فرانك گۆسلینگ))ی بەریتانیی تەمەن سی‌و هەشت ساڵان دەکات کە جیۆلۆجییەکی کۆمپانیای نەوتی کەرکووك بووەو وا مەزەندە دەکات ((شاخاوێکان لەنزیك کەرکووکەوە فڕاندبێتیان))[51].

**شازدە– فایلی ژمارە ١٨٦٧٤٨/٣٧١**

ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، فایلێکی زۆر گەورەیە، بە لایەنی کەم سێ‌سەد لاپەڕە دەبێت، بەڵگەنامەی یەکەمی ناو ئەم فایلە بریتییە لە نامەیەکی باڵوێزخانەی بەریتانی لە ستۆکهۆڵمی پایتەختی سویدەوە کە ڕۆژی هەژدەی مایسی ساڵی ١٩٦٦ باڵوێزی بەریتانی ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن، نامەکە دەربارەی وتاری ڕۆژنامەیەکی سویدییە کە ڕۆژێك لەوەوبەر دەرحەق ((کۆمیتەی کوردی – سویدی)) (Swedish Kurd Coommittee) نووسیویە، کۆمیتەی ناوبراو بە دەستووری ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)) هەوڵی داوە پرسی کورد بووروژێنێت‌و ((خاچی سووری سویدی)) قایل بکات یاریدەی لێقەوماوانی کوردی عیراق بدات[52].

دوا بەڵگەنامەی ناو هەمان فایلیش بریتییە لە بەیاننامەی لیژنەی ناوەندیی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) کە ڕۆژی پێنجی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٦ دەرحەق

---

(49) N.A., F.O., 371/164281, Confidential, From: Sir Roger Allen, British Embassy, Baghdad, No. 754, November 16, 1962, Cypher OTP To: Foreign Office, London , S.W.1

(50) Eric Downston, Europeans in Iraq agree to curfew, Daily Telegraph Special Correspondent, Beirut, -"Daily Telegraph", 7 December, 1963.

(51) "Briton Missing in Iraq", -"The Times", 19 December, 1963.

(52) N.A., F.O., 371/186748, From: J.H. Lambert, British Embassy, Stockholm, 18 May, 1966, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

حەوتەمین کۆنگرەی پارتی بڵاوی کردۆتەوە (بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە ١٦)، بەیاننامەکە کە سێ لاپەڕەیە وەك هاوپێچ لەگەڵ نامەیەکی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغداوە ناردوویە بۆ بەشی رۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەنو تێرو تەسەل باسی پرسی ئەوتیش وەك هۆیەکی کاریگەری سیاسی دەکات[53]. شایانی باسە وێنەی ئەم نامەیەی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغداو هاوپێچەکەی دراونەتە هەریەك لە باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە ئەنقەرەو تارانو دیمەشقو عەممانو بەحرەینو بێروتو قاهیرەو جەددەو کوێتو مۆسکۆو تەل ئەبیبو واشنتۆنو نیقوسیاو عەدەن.

وێڕای هەموو ئەوانەی گوتمانن ژمارەیەکی یەکجار زۆر بەڵگەنامەی دەگمەن دەربارەی پرسی کورد لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارفدا لەم فایلەدا هەڵگیراون.

### حەڤدە– فایلی ژمارە ١٨٠٨١٣/٣٧١

ئەمیش فایلێکی زۆر گەورەیە، ژمارەی لاپەڕەکانی لەسەر نییە، بەلایەنی کەمەوە سێ سەد لاپەڕە دەبێت، بەشی هەرە زۆری بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلە دەربارەی پرسی کوردی عیراقن لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارفدا. شایانی باسە ئەو کتێبەی نەتەوەپەرستی عەرەب نەعمان ماهیر کەنعانیی لەو رۆژگارەدا بە ناوونیشانی ((رووناکیی مەشخەڵێك بۆ سەر باکووری عیراق)) بە ئینگلیزی بڵاوی کردۆتەوەو حەفتاو دوو لاپەڕەیە لەم فایلەدا هەڵگیراوە[54].

وێڕای ئەم حەڤدە فایلە دەوڵەمەندو زەنگینو سەنگینەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە دەیان فایلی دیکەی هەمان وەزارەتدا باسو خواسی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژو یەکەم فەرمانڕەوایی بەعسی عیراقو رۆژگاری عەبدولسەلام عارف هاتووەتە پێشەوە کە تایبەت بۆ توێژەرانو سیاسەتمەدارانی کوردو عیراقیو عەرەب کەڵکی زۆریان هەیە، ئەوەی لە دوو توێی ئەم کتێبەیشدا هەستی پێ دەکرێت. دوای ئەم کورتە پێناسەیەی ئەم حەڤدە فایلە دەچینە سەر گێڕانەوەی پوختەی مێژووی پرسی کورد لە رۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمەوە تا کۆتایی رۆژگاریی فەرمانڕەوای عەبدولسەلام عارف لەبەر رۆشنایی بەڵگەنامە نهێنیەکانی حوکمەتی بەریتانیدا.

---

(53) Ibid, Confidential, From: S.L. Eager ton, British Embassy, Baghdad, No. 10114/117/66, 20 December, 1966, Kurdish Affairs, To: D. Montgomery, Esq., Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(54) Naaman M. al- Kanaani, Limelight on the North of Iraq, Baghdad.




وێنەی هەردوو بەرگی کتێبەکەی (نعمان ماهر الكنعاني) کە لەرۆژگاری عەبدولسەلام عارفدا بە ئینگلیزی و عەرەبی لە ساڵی ١٩٦٥دا لە بەغدا چاپکراوە، کتێبەکە ٧٢ لاپەڕەیەو دانەیەکی بە ئینگلیزی لە فایلی ژمارە (٣٧١/١٨٠٨١٣)ی وەزارەتی هەندەرانی حکومەتی بەریتانیادا هەڵگیراوە وێنەی بەرگی پشتەوەی کتێبەکە بریتییە لە پێناسەی دانەر–کەمال مەزهەر.

## دواڕۆژەکانی عەبدولکەریم قاسمو پرسی کورد
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

دیپلۆماسییە بەریتانییەکان، بە وردی‌و هەنگاو بەهەنگاو تاقیبی ئاڵو گۆڕە خێراکانی دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمیان دەکرد، هەواڵو سەرنجو تێبینییەکانی خۆیانیان، یەك لەدوای یەك، دەکردە ڕاپۆرتو یادداشتو دەیاننناردنە دەزگا بەرپرسەکانی هەردوو وەزارەتی هەندەرانو جەنگی بەریتانی لە لەندەن. مولحەقی سەربازیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا ڕۆژی هەژدەی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ یادداشتێکی چوار لاپەڕەیی بۆ یاریدەری وەزیری جەنگ لە لەندەن ناردووە، ناوبراو بەشی هەرە زۆری بەشی یەکەمی یادداشتەکەی تەرخان کردووە بۆ پرسی کورد لە دواڕۆژەکانی فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمداو تەنانەت وشەی ((جاش))یشی[55] بەکارهێناوە، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوی ناوەرۆکی ئەو یادداشتەیە:

((نهێنی،

بەشی یەکەم،

باری سەربازی،

حەرەکاتی کوردی.

١- هەواڵی دیکەی دوای نامەی ژمارە ٢٣، پەرەگرافی یەك. دەنگوباسێك هەیە گوایە ٦٠٠ کەس لەوانەی پێیان دەڵێن یاخیگەر (متمرد) خۆیان داوە بەدەستەوە. هەرچۆن بێت هەموان دەزانن ئەو شەش سەد کەسە یاخیگەر نین، بەڵکو (جاش)ن[56] واتا ئەو عەشایرییانەی سەر بە حوکمەتن، حوکمەتیش بە چاوی یەدەك سەیریان دەکات.

---

(55) ئەمە یەکەم بەڵگەنامەی نهێنیی حوکمەتی بەریتانییە، لەو هەزاران بەڵگەنامانەی من تا ئێستا دیومن، وشەی (جاش) بەکاربهێنێت، وا دیارە ئەوانیش لە زووەوە فێری ئەو وشەیە بوون.

(56) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا، لەنێو دوو جووت کەوانی بچووکدا، نووسراوە جەحش "jahash"، وەك ئاشکرایشە وشەی جاش لە زمانی کوردیدا لە جەحشی عەرەبییەوە هاتووە.

٢- هەواڵی دیکەی دوای نامەی ژمارە ٢٣، پەرەگرافی دوو. دیسانەوە بڕیاری لێبووردن (عەفوات) تا کۆتایی جێژنی قوربان، واتا تا بیستو حەوتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ درێژ کرایەوە.

٣- بەپێی سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو، ڕۆژی دوو شەممەی بیستو هەشتی کانوونی دووەمی ١٩٦٣، بیست برینداری دیکە لە باکوورەوە گەیەنرانە نەخۆشخانەی سەربازگەی ڕەشید (لە بەغدا- ك.م.). بەپێی سەرچاوەیەکی تر هێرشێکی (کورد- ك.م.)، بەڵام بە زیانێکی زۆر، پووچەڵ کرایەوەو بەم جۆرە- یاخیگەران لەژێر ئاڵایەکی سپیدا گوایە بۆ خۆبەدەستەوە دان بەرەوپیری سوپا هاتوون‌و لەپڕ چەکە شاردراوەکانیان دەرهێناوەو کەوتوونەتە دەسڕێژ لە سەربازەکان.

٤- بەپێی سەرچاوەکان، ڕۆژی سیویەکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٣، باری دوو لۆری کوژراوو برینداری سوپا لە باکوورەوە هێنراونەتەوە بەغدا. هەروەها ئەوەیش دەگێڕنەوە چۆن خەبیرێکی رووس، کە لەگەڵ هێزی ئاسمانیی عیراقیدا کار دەکات، کۆتایی کانوونی دووەمی (ساڵی ١٩٦٣- ك. م.) لە ژووری نووستنەکەی لە کەرکووك فڕێنراوە.

٥- ڕۆژی سێی شوباتی ١٩٦٣ سیڤیلێکی بەریتانی، بەناوی میستەر ئارمسترۆنگەوە، کە ئەندازیاری کۆمپانیای نەوتی عیراقی- بەریتانییە، لە کاتژمێری هەژدەو پازدە دەقیقە لەرێگەی نێوان زاب- دووبزدا کەوتوەتە ناو بۆسەیەکی کوردەکانەوەو بریندار کراوە، دوای سێ سەعات قافڵەیەکی سەربازی، لەگەڵ ئوتومبیلێکی فریاگوزاری، گەیشتە لای بریندارەکە.

تەعلیق: وا پێ دەچێت ئەم رووداوە ئەنجامی بێ بەختیی ئەو سیڤیلە بەریتانییە بێت چونکە سەعات هەژدەو چارەکێك تاریکایی دادێت بۆیەکا یاخیگەرەکان زۆر لۆمەیان ناچێتە سەر[57].

---

(57) دوور نییە مەبەستی لەو قسەیەی ئەوە بێت بڵێت پێشمەرگەکان ئەو ئەندازیارە ئینگلیزەیان نەناسیوەتەوە.

٦- شەوی سێ لەسەر چواری شوباتی ۱۹٦۳، کوردەکان دەسڕێژیان لە شەمەندەفەری شەوانەی نێوان کەرکوکو بەغدا کرد، ئەو هێرشە بووە هۆی ئەوەی شەمەندەفەرەکە شەش سەعات دوای کاتی خۆی بگاتە بەغدا. شەمەندەفەرەکە گەیشتبووە دوزخورماتو کاتێك سێ سەد سوارەی کورد ئابلۆقەیان داوەو ژمارەیەك لەو پۆلیسانەیان کوشتووە کە بەرگرییان کردووە، کوردەکان چل پەنجا سەربازێکیشیان لە پاسەوانانی شەمەندەفەرەکە بەدیل گرتووە، ژمارەیەك ئەفسەری سوپاو معاونێکی پۆلیسیش بەدیل گیراون))[58].

بۆ ڕۆژی دواتر هەمان مولحەقی سەربازیی بەریتانی بەشی دووەمی یادداشتەکەی دەنێرێت بۆ جێگری وەزیری جەنگ، ئەم بەشەیان سیازدە لاپەڕەی گەورەیە، بەڵام تەنها ئەمەی لای خوارەوەی، کە لە سەرەتای ئەو بەشەدا هاتووە، پەیوەندی بە شۆڕشی یازدەی (ئەیلول)ی ساڵی ۱۹٦۱و ڕەنگدانەوەکانییەوە هەیەو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((جەنگی دژ بە کورد (لە ڕۆژگاری عەبدولکەریم قاسمدا- ك. م.) هەژدە مانگ درێژەی کێشا بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێکی سەربازی، یا چارەسەرێکی سیاسیی، لێ بکەوێتەوە. سوپا نەیتوانی کورد ببەزێنێت چونکە نە مەشقی تەواوی هەبوو، نە دڵیشی بەشەڕەکەوە بوو. ڕاستێکەشی ڕێگە نەدەدرایە سوپا تەکانی تەواوی خۆی لە هێرشەکانیدا بدات، خۆ ئەگەر هاتوو لەشوێنێك هەنگاوێکی وای نا ئەوا بەلالووتییەوە بۆی لەقەڵەم دەدرا[59]. زیانەکانی سوپا، کە ژمارەیەکی زۆریان (لەلایەن کوردەوە-ك.م.) بە دیل گیرابوون، بوونە هۆی ئەوەی زۆربەی ئەفسەرو دەرجەدارانی سوپا ببنە دوژمنی قاسم))[60].

---

(58) N.A., F.O., 371/170434, Secret, Military Attache, British Embassy, Baghdad, 18 February, 1963, No. MA/I/1/31, Memorandum for the Under Secretary of State, The War Office, London, Part I- Military, Kurdish Op.

(59) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: (( "more often than not received a "bloody nos))

(بلۆدی نۆس)ەکەشی کە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە زاراوەیەو مانای بۆکسێکی خویناوی یا بۆکسێکی خوێن پژێن دەگەیەنێت.

(60) N.A., F.O., 371/170434, Secret, Military Attache, British Embassy, Baghdad, No. MA/I/60/13, 19 February, 1963, Memorandum for the Under Secretary of State, The War Office, London.

بەداخەوە کاڵفامیی عەبدولکەریم قاسم لە بوواری سیاسەتدا گەیشتبووە ئەو ئاستە نزمەی مەرگی بارزانیی لای ببێتە رزگارکەری ڕژێمەکەی لەگشت نەهامەتییەکانی، بۆیەکا بەر لە کۆدێتای هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ هەر ئەوەندەت دەزانی دەزگا فەرمییەکانی ڕاگەیاندن دەکەوتنە جاڕدانی هەواڵی کوشتنی بارزانی. یازدە ڕۆژ بەر لە کەوتنی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم بەغدا بۆ دواجار هەواڵی کوشتنی بارزانیی ڕاگەیاند، ئەو هەواڵەی یەکسەر بەم جۆرەی لای خوارەوە دەچێتە ناو یەکێك لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانییەوە:

((دوێنێ لە بەغدا هەواڵی مردنی ڕەمبەری بەناوبانگی یاخیگەرییەکەی کورد، کە بە ((مەلای سوور)) (الملا الاحمر) ناسراوە ڕاگەیەنرا. بەپێی ئەو هەواڵە (بارزانیی– ك. م.) لەکاتی هێرشێکی سوپای عێراقیدا بە سەختی بریندار بووە، بە برینداری پەنای بردووەتە بەر گوندێك لەناو خاکی تورکیاداو لەوێ گیانی لەدەست داوە)).[61]

دەستوبرد گشت ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی جیهان ئەم هەواڵە بڵاو دەکەنەوە، سیان لەو ڕۆژنامانە– ((تایمس)) و ((سەندێی ئێکسپرێس)) و ((سەندێی تێلگراف)) لە هەمان فایلدا هەڵگیراون[62]، وێڕای دەیان بەڵگەنامەی بایەخداری دیکە دەربارەی هەڵوێستی هەڵەشەی عەبدولکەریم قاسم بەرانبەر کورد.

جگە لەوانە ئەم بەڵگەنامە بەنرخانەی لای خوارەوەیش لە هەمان فایلدا هەڵگیراون:

أ–بەیاننامەی ((پارتی دیموکراتی کوردستان– ناوچەی بەغدا)) کە ڕۆژی پازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢ بڵاو کراوەتەوەو باسی خۆپیشاندانێکی جەماوەری شاری سلێمانی دژی دیکتاتۆرییەتی عەبدولکەریم قاسمو

---

(61) N.A., F.O., 371/170428, Internal Political Situation: military coup and revolution and Kurdish situation, 1963.

(62) Ibid, "Death" Claim by Baghdad, by our Diplomatic Staff, "Sunday Telegraph", London, 30 December, 1962, Kurdish rebel, "Red Mullah" is reported dead, - "Sunday Express", London, 30 Times" London, 1 January, 1963.

دارودەستەکەی دەکات، وێڕای کوشتنی ژمارەیەك جاش کە یەکێکیان ناوی شێخ محەمەد بووە.

ب- نەخشەی کوشتنی زەعیم مستەفا، بەڵام ئەو پێش کات هاتووەتە سلێمانی بۆیەکا نەخشەکە سەری نەگرتووە.

ج- کوشتن‌و بەدیل گرتنی نزیکەی سی‌و شەش سەربازو دوو ئەفسەر.

شایانی باسە لە ناوەندی چلەکانی سەدەی ڕابردووەوە ڕۆژئاواییەکان بە تەوسەوە نازناوی ((The Red Mulla))[*] یان بۆ بارزانی هەڵبژاردبوو بەو نیازەی وای نیشان بدەن گوایا مەلا مستەفا پیاوی ئەڵقە لە گوێی شوورەوییە، جاروبار نەتەوەپەرستانی عەرەبیش ئەو نوقڵەیان دەشکاند.

لە هەمان فایلدا ژمارەیەك بەیاننامەی بەعسی عیراق هەڵگیراوە، کە لە هەموویان سەیرو سەمەرەو سەرنج ڕاکێشتر ئەو وتارەی ((**الاشتراکی**))ی ئۆرگانی بەعسە کە لە ژمارەی مانگی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢یدا بەم ناوونیشانە بڵاوی کردووەتەوە: ((**مەترسییەکانی بزووتنەوەی گومان لێکراوی باکوورو هەڵوێستی قاسم بەرانبەری**))، واتا بەعسییەکان بەر لەوەی دەسەڵات بگرنە دەست بە ماوەیەکی کورت بەو جۆرە دەیانڕوانییە ئەو کوردەی بە چەکەوە بەرەنگاری گەورەترین دوژمنی سەرسەختی ئەوسای بەعس بووەوە !.

دوژمنانی کورد هەمیشە بەندو باڵۆرەی ئەوەیان لێ داوە، تا ئێستەیش بەردەوام لێی دەدەنەوە، گوایە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دەسنێژی ئینگلیزو ئەمەریکایی‌و سایۆنیزم‌و ئێران‌و سۆڤیەت‌و گەلێك لایەنی دیکەن. تا ئێستە لە زمان بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانییەوە ڕادەی بێ‌ویژدانیی ئەو جۆرە بوختان‌و تۆمەتانەمان بەپێی توانا نیشان داوە. ئێستەیش با بزانین ئەو وەزیری هەندەرانەی محەمەد ڕەزا شای پەهلەوی، کە بە خوێنی سەری عەبدولکەریم قاسم تینوو بوو، چی دەربارەی هەڵوێستی ئەو پیاوە بەرانبەر کوردی عیراق دەڵێت. ڕۆژی سێی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ باڵوێزی بەریتانی

---

(*) ((بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەم بۆچوونە بنۆڕە: کتێبی (خناجر وجبال لو قاسم والاکراد)ی ئەحمەد فەوزی- ع. زەنگەنە)).

له تاران نامەیەکی نهێنیی ناردووە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((١- هەڵبەت لێرە (واتا لە تاران- ک. م.) لە نزیکەوە تاقیبی ئاڵوگۆڕەکانی کوردستانی عێراق دەکەن.

٢- لەکاتی گفتوگۆیەکی ئەم دواییانەمدا لەگەڵ وەزیری هەندەرانی (ئێران- ک. م.) وەزیر لە خۆڕا گوتی: ئەو تا ڕادەیەك مەیلی بەلای کۆششی قاسمدا، بۆ دلمرکاندنەوەی یاخیبوونەکەی کورد، دەشکێتەوە، چونکە ئێرانییەکان مەترسییان لە بزووتنەوەیەکی کوردیی جیابوونەوەخواز هەیە کە لەسەر سنووری وڵاتەکەیان لە لایەن بارزانییە مەیلدارەکانی کۆمۆنیستەوە سەرکردایەتیی بکرێت.

ئەمەیش پەیوەندیی هەیە بەو ڕاپۆرتانەوەی پێمان گەیشتوون دەربارەی ئەوەی ئێرانییەکان نیازیان نییە هیچ جۆرە یاریدەیەکی وەك چەکو ئازوقەو شتی دیکە بۆ یاخیبووە (کوردەکان- ک. م.) بنێرن نەبا ببنە هۆی فشار خستنە سەر قاسم. ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین ئێرانییەکان سنووریان لەرووی یاخیگەرە (کوردەکاندا- ک. م.) داخستووە، هەرچەندە هاتوچۆی ئاسایی هۆزەکان لە ڕێگەی سنوورەوە وەك خۆیەتی.

٣- وێنەی ئەم نامەیەمان دەنێرین بۆ هەردووك باڵوێزخانەمان لە بەغداو ئەنقەرە))[63].

هەرچۆن بێت کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە هەبێت کە ڕاپەڕینی نوێی کوردستانی باشوور گشت بەشەکانی دیکەی کوردستانی هەژاندبوو، وا دیارە لە هەمووانیش پتر فەرمانڕەوایانی تورکیای زراوەترەك کردووە، ئەوەی دیپلۆماسییە بەریتانییەکان بە ئاسانی هەستیان پێی کردووەو گەلێك نامەو بروسکەو ڕاپۆرتیان دەربارەی نووسیوە.

بە وێنە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران لە ڕاپۆرتێکی نهێنیی خۆیدا دەڵێت:

((ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەوانیی سووریا دەربارەی کێشەی کورد وای بۆ دەچێت کوردی عێراق و تورکیا و ئێران و سووریا یەکدەگرن و کوردستانێکی سەربەخۆ دادەمەزرێنن))[64].

---

(63) N.A., F.O., 371/163988, Kurdish question in the Middle –East, 962, Confidential, No. 1821/62, British Embassy, Tehran, January 3, 962, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

هەمان ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ ج. ك. كلۆپی باڵوێزی بەریتانی لە مۆسكۆ، بێ ئەوەی ئاگاداری ناوەرۆكی ئەو ڕاپۆرتەی سەرەوە بێت، دەربارەی هەمان بابەت ڕاپۆرتێكی چڕوپڕی یەكجار بایەخداری ناردووە بۆ وەزارەتی هەندەرانی حوكمەتەكەی لە لەندەن، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕاوەكەیەتی:

١- ڕۆژنامەی ((پراڤدا)) ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەم نامەیەكی ئاژانسی تاسی لە بێروتەوە بەم ناونیشانەوە بڵاو كردووەتەوە ((درۆو دەلەسەكانی ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەكان دەربارەی هەڵوێستی كوردی عێراق)) كە پوختەی وتارێكی دوورو درێژی ڕۆژنامەیەكی لوبنانییە بەناوی ((الهدف))ەوە[65].

٢- ماكی وتارەكەی (الهدف- ك. م.) بریتییە لە ناوەرۆكی دیدەنییەكی هەواڵنێرێكی ڕۆژنامەكە لە دیمەشق لەگەڵ (ڕەهبەرێكی كوردی ناسراوی لایەنگری بارزانیدا) كە ناوی نەهێناوە. مەبەستی سەرەكیی نامەكە بریتییە لە بەدرۆخستنەوەی تەواوی ئەو دەنگوباوەی ڕۆژنامەی ((نیویۆرك تایمس)) پەخشی كردووە، گوایە ئامانجی بارزانی یەكخستنی هەموو كوردی عێراق و توركیاو ئێران و سووریایە لە كوردستانێكی سەربەخۆدا. هەمان كات ((پراڤدا)) ئەم تێبینییانەی خوارەوەیشی تۆمار كردووە:

أ- بارزانی تەنها هەوڵ بۆ خودموختاریی كوردی عێراقی، چەسپێنراو لە دەستووری كاتیی عێراقدا دەدات، زووتر قاسم ئەمەی پەسەند كردبوو.

ب- مەبەستی وتارەكانی ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەكان دەربارەی بارزانی نانەوەی پشێوییە لە ناوچەكەدا، تایبەت لە توركیاو ئێران و سووریا.

ج- بەریتانییەكان فشار دەخەنە سەر قاسم بۆ ئەوەی هەڵوێستی لەگەڵ كۆمپانیاكانی نەوت و داوا كردنی كوێتدا بگۆڕێت. ئەو تۆمەتانەی دەیاندایە پاڵ بارزانی دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتێكی كوردی بەشێكن لە فشارو سیاسەتی تەقلیدیی بەریتانییەكان- دابەش بكەو حوكم بكە (فرق تسد- ك. م.).

---

(64) Ibid, Eastern Department, General, No. 1821/3, November 15, 1962.

(65) لای ناوی ((الهدف))ەوە پرسكەیەكی داناوە وەك نیشانەی ئەوەی كە ئەو ڕۆژنامەیە لای ئەوان نەناسراوە.

د- مەبەستی راپۆرتە رۆژئاواییەکان دەربارەی ئەوەی بارزانی داوای یاریدەی ئەمەریکای کردووە شلۆق کردنی جێ پێیەتی. قاسم کاتێك بارزانیی بە پیاوی بەریتانیا لە قەڵەم دا کەوتە هەمان هەڵەوە.

هـ. لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا، کورد دەیانەوێت لەگەڵ قاسمدا بگەنە رێککەوتنامەیەك و بگەرێنەوە دۆخی هاریکاریی کوردو عەرەب (لە پێناو پاراستنی سەربەخۆیی وڵاتەکەماندا).

٣- ماوەیەکە ئەمە یەکەم ئاماژەیە بۆ کێشەی کورد لە رۆژنامە سۆڤێتیەکاندا و هەرچەند ئەو ئاماژە کردنە لە سەرچاوەیەکی دەرەکی وەرگیراوە، بەڵام بڵاوکردنەوەی لە ((پراڤدا))دا بێ هیچ جۆرە رەخنەیەك ئەگەری ئەوە دروست دەکات کە دەبێت ئەو سەرچاوەیە (واتا رۆژنامەی ((الهدف))- ك. م.) زۆر لە سیاسەتی سۆڤیەتییەوە نزیك بێت تا بەو جۆرە بە فەرمیی پشتگیریی لێ بکرێت. ئێمە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەو رۆژنامەیە نازانین کە دەقی وتارەکەی تێدا پەخش بووە تا خەمڵی ئەوە لێ بدەین کە لەوانەیە هەموو کارەکە پلانێکی رێکخراو بێت بۆ دەربرینی مەبەستە (شاردراوەکان- ك. م.) بەم جۆرە.

٤- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانمان لە بەغداو بێروتو دیمەشقو ئەنقەرەو تارانو قاهیرە(66) (*).

بەو جۆرە کورتبینی عەبدولکەریم قاسمو دەستەو دایەرەکەی، هەروەها تەڵەکەبازیی شۆڤێنییە عەرەبەکان، کارێکی ئەوتۆیان کرد پرسی کورد ببێتە یەکێك لە بارە هەرە قورسەکانی سەرشانی رژێمەکەی لەدوا قۆناغی تەمەنیداو بارزانی واتەنی: عەبدولکەریم قاسم ئاسکێك بوو کورد ماندووی کردو بە داخەوە بەعس راوی کرد.

(66) N.A., F.O., 371/163988, Kurdish question in the Middle -East, 1962, Confidential, No. 10213/15/11, British Embassy, Moscow, November 15, 1961, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(*) ((بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (٣). ع. زەنگەنە)).

## سەرەتای حوکمی بەعس

## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

دوای ئەوەی کار لەکار ترازا، ڕۆژی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ کودێتای لقی عیراقی ((پارتی بەعسی عەرەبیی ئیشتراکیی)) سەری گرت، دیپلۆماسییە بەریتانییەکان لەهەر چوار لاوەو ئان بەئان کەوتنە دووی هەواڵەکانی ئەو ڕووداوەو تەتەڵە کردنو لێکدانەوەیان، بەو جۆرە هەزارەها لە نامەو ڕاپۆرتو یادداشتو بروسکەکانیان بوونە گەنجینەیەکی کەم وێنە بۆ لێکدانەوەو تێگەیشتنی هەموو لایەنە نهێنیو شاردراوەکانی کودێتای هەشتی شوبات، وا لەم بەشەدا چەند نموونەیەکی ئەو ڕاستییە دەخەینە بەرچاو.

یەکێك لە بەڵگەنامەکانی ناو فایلی ژمارە ١٧٠٤٣٤/٣٧١ی وەزارەتی هەندەران بەم شێوازەی لای خوارەوە باسی کەوتنی دراماتیکیی عەبدولکەریم قاسممان بۆ دەکات:

((نهێنی،

ژمارە ٦٣/٥٦/١٠١٢٤،

١٥، کورتەیەك.

قاسم بەشێوازێکی سەرنج ڕاکێش و کتوپڕ کەوت. لە سوپا بەولاوە قاسم هیچ هێزێکی ڕێکخراوی وڵاتەکەی لەپشت نەبوو، هەوڵی دەدا هاوسەنگیی تەرازووی هێزی نێوان کۆمۆنیستو نەتەوەپەرستەکان ڕابگرێت و پتر لە هەرشت پشتی بە یاساوڵە تایبەتییەکانی خۆی دەبەست. بەڵام وەك دەرکەوت، سوپا لە سیاسەت دوورە پەرێز نەبوو[67]، ئەوانەیش کە لە دژی وەستان بریتی بوون لە نەتەوەپەرستان، بە بەعسییەکانیشەوە، بۆیەکا کەس نەبوو قاسم پشتی پێ ببەستێت (پەرەگرافی یەکەم و دووەم).

تاوەکو ئێستە بە تەواوەتی ناوی پیلانگێڕەکان نەزانراوە، بەلام وا دیارە بنکەی سەرەکیی بزووتنەوەکەیان حەبانییەیە، وێڕای شانەیەکیان لە ئەبوغرێب.

---

(67) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: ((out the army proved to be not above politics)) کە ئەوەیش لە دەقی ئەو ڕستەیەی عەبدولکەریم قاسم وەرگیراوە کە تا کۆچی دوایی کردبوویە بنێشتە خۆشەی ژێر ددانی– ((الجیش فوق المیول والاتجاهات)).

یەکەم ئامانجی پیلانگێڕەکان گرتنی ئیزگە بوو، هەمان کات هێرشیشیان کردە سەر ئەو فڕۆکانەی لە سەربازگەی (معسکر) ڕەشید بوون، یەکەم هێرشی فڕۆکەیش بۆ سەر وەزارەتی بەرگری لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە ئیزگە کەوتە دەست پیلانگێڕەکان.

ناشزانرێت پیلانگێڕەکان بۆچ لە سەرەتاوە هێرشیان نەبردە سەر ماڵەکەی قاسم، دوور نییە نەیانویستبێت هێزەکانی سوپا هەست بە هیچ بکەن بەر لە گرتنی ئیزگەو هێرشە ئاسمانییەکانی سەر بارەگای وەزارەتی بەرگری (پەرەگرافی سێیەم).

خودی وەزارەتی بەرگریی لێ دەریکەیت ئیتر هیچ کام لە چەکدارەکانی میری بەرهەڵستیی پیلانگێڕەکانیان نەکرد، چەند خۆنیشاندانێکی پەرش‌و بڵاویش ڕێکخرا[68]. بەو جۆرە شەوی هەشت لەسەر نۆی شوبات دەست بەسەر وەزارەتی بەرگریدا گیرا (پەرەگرافی چوارەم).

وا پێ دەچێت قاسم بەرەبەیانی دووەم ڕۆژ لەناو بارەگای وەزارەتی بەرگریدا دەستگیر کرابێت‌و سەعات یەك‌و نیوی دوای نیوەڕۆ کوژرابێت (پەرەگرافی پێنجەم).

گەلێك باسی ئەوە دەکرێت گوایە قاسم بە زەحمەت (یا بە عونف– ك. م.) لابرابێت، لە ڕاستیدا بەرهەڵستی‌و خوێنڕشتنێکی کەم قەوماون، هەرچەندە دوور نییە قاسم زۆر هەوڵی دابێت بە سەرپەرشتیی کۆمۆنیستەکان خۆنیشاندانی جەماوەری ساز بکرێت. کۆمۆنیستەکان دەتوانن ڕۆژێك لە ڕۆژان بەو جۆرە کێشە بنێنەوە، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا یەکێك بوو لە پرنسیپە سەرەکییەکانی سیاسەتی قاسم (پەرەگرافی شەشەم).

قاسم پیاوێکی خوێنڕێژ نەبوو، بەلام تەموح‌و لەخۆبایی‌و خۆپەرست (ئەنانی)و گوومانکەر (شکاك) بوو. ڕەنگبێ هیچ جۆرە ڕەگێکی شێتی لەو پیاوەدا نەبووبێت،

---

(68) چەپڕەوانی کازمییە بەشی هەرە زۆری ئەو خۆپیشاندانانەیان دژی کودێتای هەشتی شوبات ساز کرد، شایانی باسە ئەوساکە تامیر شەهباز حەیدەری، کە لە بنەماڵەی حەیدەرییەکانی هەولێرە، قایمقامی کازم بوو، هەر ئەو ڕۆژە بەند کرا، بەڵام لیوای پۆلیس ئەحمەد ئەمینی هاوڕێی نزیکی، کە دەستڕۆیشتوو بوو، فریای کەوت.

بەلام دەستەوەسان بوو لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو کێشانەی تەنگیان پێ هەڵدەچنی، سەرباری ئەوەیش ڕۆژ بە ڕۆژ قیرسیچمەتر دەبوو. ڕاستێکەی قاسم خۆی لە خۆیدا بەهیچ جۆر کەسایەتییەك نەبوو بایەخێکی ئەوتۆی هەبوویێت، بەلام شێوازی سەرهەڵدانو لەناو چوونی نموونەیەکی ترسناکە (پەرەگرافی حەوتەم)[69].

بەڵگەنامەی یەکەمی ناو هەمان فایل بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی د. ك. هاسکێلی[70] یاریدەری باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا کە ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن، تێیدا باسی دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی ڕژێمی نوێ بەناوی (الجماهیر)ەوە و یەکەم دیدەنیی پەیامنێری ئەو ڕۆژنامەیە لەگەڵ حامیدی برای عەبدولکەریم قاسمو ژمارەیەك وەزیرو بەرپرسیاری ڕژێمی پێشوودا دەکات کە لە (الجماهیر)دا بڵاو کراوەتەوە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((نهێنی،

باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

ژمارە ۱۰۱۲۸/۱/۶۳،

ڕۆژی ۱۹ی شوبات، ۱۹۶۳.

خۆشەویستم گودچایلد.

---

(69) N.A., F.O., 371/170434, Confidential, No. 10124/56/63, 15, Summary.

(70) دۆنالد کیث هاسکێل(*) (Donald Keith Haskell): دیپلۆماسییەکی وریاو چالاك بوو، نۆی مایسی ساڵی ۱۹۳۹ لەدایك بووە، دەرچووی (قوتابخانەی زمانەوانیی پۆرتسمۆث)و زانکۆی کامبریج بوو، لە ساڵی ۱۹۶۱وە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیو بەڕێز لەم شوێنانە کاری دیپلۆماسیی کردووە– بارەگای وەزارەت لە لەندەنو لوبنانو عیراقو لیبیاو کۆمۆنوێلیـث و سانتیاگۆو یابان. بڕوانە:

((Who’s Who 1980. An Annual Biographical Dictionary)), London, 1980, P.1126.

(*) ((پەراوێزی ژمارە (۷)یش هەر باسی ئەم زاتەی کردووە – ع.زەنگەنە)).

١- ژمارەیەك لە یاریدەرو وەزیرانی قاسم، کە ئێستەکە بەندن‌و چاوەڕوانی دادگایکردنن، لەم ڕۆژانەدا دیدەنیی ڕۆژنامەوانییان لەگەڵدا ساز کرا. (الجماهیر) کە یەکەم ڕۆژنامەی عەرەبییە لە دوای شۆڕشەوە (لە عیراق- ک. م.) دەردەچێت، لە ژمارەی ڕۆژی چواردەی شوباتیدا ڕایگەیاند کە هەواڵنێرێکی دیدەنیی لەگەڵ حامید قاسم‌و لیوا (ئەحمەد ساڵح- ک. م) ئەلعەبدی‌و هاشم جەوادو ئیسماعیل عارف‌و تەلعەت شێبانیدا کردووە[71](*).

٢- (میر)[72] حامید قاسم بە درێژی باسی دەسکەوتە حەرامەکانی کرد کە گوتی ئەمانەن: پتر لە سەد هەزار دیناری عیراقیی کاش‌و خانوویەك کە بیست هەزار دیناری عیراقی دەهێنێت‌و سێ ئوتومبیل. هەرچی ئەلعەبدی و سێ وەزیرەکەشە لەناو خۆیاندا پێشبڕکێیان بوو لە تاوانبار کردنی قاسمدا لەسەر ئەوەی (لە ئامانجە سەرەکییەکانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ لای دا) و

---

(71) ئەحمەد ساڵح ئەلعەبدی حاکمی عەسکەریی گشتی‌و هاشم جەواد وەزیری هەندەران‌و ئیسماعیل عارف وەزیری پەروەردەو تەلعەت شێبانی وەزیری پلاندانان بوو.

(*) ((هاشم جواد: لە ٧ی شوباتی ١٩٥٩ تا ٨ی شوباتی ١٩٦٣ وەزیری خارجییە بووە.

ئیسماعیل ئیبراهیم العارف: لە ٢ی ئاباری ١٩٦٠ تا ٨ی شوباتی ١٩٦٣ وەزیری (المعارف) بوو، لەهەمان کاتدا جێگری وەزیری (الارشاد) بوو.

د. طلعة علی محمد الشیبانی: لە ٧ی شوباتی ١٩٥٩دا تا ٨ی شوباتی ١٩٦٣ وەزیری پلاندانان (التخطیط) بوو.

ئەو زانیارییانەی سەرەوەم لەکتێبی (تاریخ الوزارات العراقیة في العهد الجمهوري، ١٩٥٨ – ١٩٦٨، الجزء الخامس، ١٩٦١ – ٨شباط ١٩٦٣) دەرهێناوە، ئەوەی شایەنی باسە کتێبەکە لەئامادەکردنی هەریەك لە(د. نوری العاني و أ. د. علاء الحربي و د. محمد الدلیمي و د. جهاد مجید و د. أحمد الدلیمي والسید کامل جواد) بووە. لەساڵی ٢٠٠٢دا لەبەغدا بڵاوکراوەتەوە – ع. زەنگەنە))

(72) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: "Prince" Hamid Qasim، ناحەزانی عەبدولکەریم قاسم بەڕاست‌و چەپدا پڕوپاگەندەی ئەوەیان بۆ حامید، کە برای عەبدولکەریم قاسمە دەکرد، گوایە ئەو هەلەی قۆستۆتەوەو زۆر زەنگین بووە، هەرچەندە خوا هەڵناگرێت شتی وا لە ئارادا نەبوو، بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ حامید قاسم بازرگانی دانەوێڵە بوو، دوای شۆڕشیش هیچ پۆستێکی وەرنەگرت، نە حامیدو نە ماڵ‌و منداڵی، بە هیچ جۆر خۆیان دەرنەدەخست.

(وەزیرەکان و گەلی) لە ئازادی بێبەش کردبوو. ئیسماعیل عارف ڕایگەیاند ئەو چۆن بێ ئەنجام هەوڵی داوە قەناعەت بە قاسم بکات سەریەستی بداتە وەزارەتی پەروەردە بۆ چارەسەرکردنی مانگرتنەکانی قوتابییان[73]. هەرچی تەلعەت شێبانیشە ئۆبالی (خۆشکردنی ئاگری دووبەرەکیی) خستە ئەستۆی کۆمۆنیستەکانی عیراق، ئەوەی هانی (مەیلە دیکتاتۆرییەکانی) قاسمی دا.

٣- دەربارەی سیاسەتی دەرەوەی قاسم، هاشم جەواد گوتی: ئەو لەو بڕوایەدایە کە ئەو سیاسەتە (خزمەتی پیلانەکانی ئیمپریالیزمی ئەنگلۆ-ئەمەریکایی لە ناوچەکەدا دەکرد). هەرچۆن بێت جەواد ئەم تۆمەتە، کە جێگەی بڕوا نییە، لەو دیدەنییەدا کە ڕۆژنامەنووسە بەریتانییەکان لەگەڵیدا سازیان کرد دووپاتی نەکردووەوە، بەڵام بەو ڕۆژنامەنووسانەی گوت کە ئەو (ڕۆڵی هێوەر کردنەوەی لەنێوان قاسم و جیهانی دەرەوەدا دەبینی)[74]، بە وێنە قاسم کێشەی کوێتی وەها دارِشت کە بیکاتە بیانوو بۆ کشانەوە لە کۆبوونەوەکانی جامیعەی عەرەبیی تا بەو جۆرە خۆی قوتار بکات لە تاوانی ئیسرائیل لە بواری گۆڕینی ڕێڕەوی ڕووباری ئوردوندا.

٤- ژمارەیەك پەیامنێری بیانیش دیدەنییان لەگەڵ ئەو گیراوانەدا کردو بەشێك لە دیدەنییەکەیان لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە لەندەنییەکاندا بڵاوکرایەوە[75]. بەپێی قسەی بینەران هاشم جەواد لە هەر پێنجیان وریاو خوێندەوارتر بوو، هەرچی ئیسماعیل عارف و طەلعەت شێبانیشە خراپ نەبوون، بەڵام ئەحمەد سالح عەبدی لە شێوازی قسەکردنیدا وازیح نەبوو، لەوەی دەکرد ڕووخابێت، هەرچی حامید قاسمیشە لە خۆی پیرتر دیار بوو، یەکجار پیسیش بوو، بەهەر لایەکیشدا دەیڕوانیی هەستت دەکرد تۆقیوە. هەموو ئەمانە لەو وێنانەوە

---

(73) بەعسییەکان لە ڕێگەی زنجیرەیەك مانگرتنی قوتابیانی فێرگەو کۆلێجەکانی بەغداوە ڕێگەیان بۆ بەرپابوونی کودێتای هەشتی شوبات خۆش کرد.

(74) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((He described himself as a "shock- absorber" between Qasim and the outside world)).

(75) لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان بۆ دەکەین.

دیار بوون که له ڕۆژنامەی (الجماهیر)دا بڵاوکرابوونەوە، بەندەکان بیجامەو دسداشەیان لەبەردا بوو، ئەحمەد ساڵح عەبدی لە هەموویان داڕوخاوتر بوو، بەڵام ڕۆژنامەکە هیچ وێنەیەکی حامید قاسمی چاپ نەکردبوو.

٥- ئەوە ماوە بزانین ئایا ئەم هەموو پاڕانەوەیە دادی ئەوە دەدەن ملیان لە پەتی سێدارە رزگار بێت. ڕاپۆرتەکان وا ڕادەگەیەنن بڕیاری خنکاندنی عەبدی دەرچوویێت، بەڵام وا پێدەچێت جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارە دواخرابێت بۆ کاتێکی نادیار، لەوانەیە ڕژێمی نوێش نیازی بێت دادگایکردنێکی شانۆگەرییانە بۆ ئەمانە ڕێك بخات کە مایەی بەزەیین، چونکە لەوانەیە بەو جۆرە ڕەنگدانەوەی خراپی کوشتنە پەلەکەی قاسمو ئەوانی دیکە لە ڕۆژانی یەکەمی شۆڕشدا کەم بکاتەوە.

دڵسۆزتان

ئیمزا

د. ك. هاسکێل))[76].

لاپەڕەی دواتری هەمان فایل بۆ وتارێکی ڕۆژنامەی ((گاردیان))ی بەریتانی تەرخان کراوە کە (کلەیر هۆلینگوورث) بە ناونیشانی ((شۆڕشی چینی ناوەندیی عیراقی))ەوە نووسیویە[77].

بەڵگەنامەیەکی دیکەی ناو ئەم فایلە بریتییە لە نامەیەکی دوورو درێژی (مۆنرۆ)ی کارمەندی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا کە ڕۆژی بیستو شەشی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن، تێیدا بە هەندێك پلارو توانجەوە تیشك دەخاتە سەر گەلێك لایەنی نەزانراوی پەیوەندیی نێوان ڕژێمی نوێی عیراقو شیوعییەکانو یەکیەتی سۆڤیەت، کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕاوەکەیەتی:

---

(76) N.A., F.O., 371/170434, Confidential, From: D.K. Haskell, British Embassy, Baghdad, No. 10128/1/63, February 19, 1963 To: Goodchild, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1

(77) Ibid, Clare Hollingsworth, Iraq's middle- class revolution, -((The Guardian)), 27 February, 1963.

((نهێنی،

لە ڕ. دەبلیوو مۆنرۆوە،

باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

٢٦ی شوباتی ١٩٦٣،

ژمارە ٦٣/٩/١٠١١٣،

بۆ: د. ل. ن. گودچایلد،

بەشی ڕۆژهەلات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن

خۆشەویستم گودچایلد

١- سەر لەبەیانیی ڕۆژی شۆڕش، واتا هەشتی شوبات، هەروەها ئێوارەکەیشی، کۆمۆنیستەکان لە ڕێگەی بەیاننامەوە داوایان لە ئەندامانی حیزبەکەیان کرد چەك بۆ بەرگریی لە ڕژێمی قاسم هەڵبگرن. غەوغا بۆ ماوەیەك بە شەقامەکاندا سووڕانەوەو دوای قەدەغەکردنی هاتوچۆ سوپاو حەرەس قەومی بە تەواوەتی دەستیان بەسەر وەزعەکەدا گرت. لە ئەنجامی ئەمەدا، هەڵبەت وێڕای دوویەرەکیی دوورو درێژی نێوان پارتی بەعسو کۆمۆنیستەکان، ڕژێمی نوێ پەنای بردۆتە بەر زنجیرەیەك کاری هەمەجۆر بۆ لەناو بردنی کۆمۆنیزمی ڕێکخراو لە عیراقدا.

٢- هەرچۆن بێت بەعسییەکان، لە ڕاگەیاندنەکانیاندا بۆ ڕای گشتی، هەوڵ دەدەن هێڵێك بکێشن لە نێوان هەڵوێستیاندا بەرانبەر کۆمۆنیزم بە گشتیو کە لێبووردە دەبن لەگەڵیو ئەوانەی ئیدیعای کۆمۆنیستی دەکەنو بەتوندی دژی شۆڕش وەستانو چەکیان لە ڕوویدا هەڵگرت. لە یەکێك لەو کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییە زۆرانەی لە سەرەتای شۆڕشەوە ساز دەکرێن ئەوە ڕاگەیەنرا کە لەوانەیە تەنها هەشت کەس بە ڕەسمی هەڵواسرابن، لە نیوەی ئەو ژمارەیەش کەمتر کوژرابنو ئەوانی دیکەش گیراون. زۆر لەوە دەکات ئەمە ڕاست بێت، بەڵام

بەپێی قسەیەکی بەرباڵو سەرجەمی ڕەهبەرە گەورەکانی کۆمۆنیست گیراون‌و پەنجاشیان بەبێ دەنگ هەڵواسراون.

٣- نە حوکمەت‌و نە ڕۆژنامەکان ڕێبازێکی توندڕەویان دژ بە کۆمۆنیستەکان پەیرەو نەکردووە، ئەگەر توندڕەوی رووشی دابێت ئەوە ڕەنگدانەوەی ئەو هێرشانەیە کە لەوڵاتی ئەودیو شوورای پۆلایینەوە[78] دەیکەنە سەریان. بە وێنە (الجماهیر)ی یەکەم ڕۆژنامەی فەرمیی شۆڕش، کە ئاشکرایش گوتەبێژی حوکمەتە، دەڵێت: کۆمۆنیستەکان‌و دڵسۆزانی ڕژێمی قاسم دەرفەتی لەباریان بۆ ڕەخساو سامانێکی زۆریان لەسەر حسێبی کۆمەڵ بۆ خۆیان پێکەوە نا. ئەمە بێگومان وایە. هەرچی دەربارەی هێرشی دوژمنانەی ئێزگەی یەکیەتی سۆفیەتە هەمان ڕۆژنامە دەڵێت: بێگومان ئەوە دەبێتە هۆی تێکدانی پەیوەندیی لەگەڵ ولاتە سۆشیالیزمەکاندا، ئەنجامی ئەوەیش یەخەی خۆیان دەگرێتەوە. (الجماهیر) لەم بارەیەوە پرسیار دەکات‌و دەڵێت: ئایا ئەو هێرشە بۆ پاراستنی دەستەیەکی دیموکراتیخوازو نیشتمانپەروەرە ؟. (بۆ خۆیشی وەڵام دەداتەوەو- ك. م.) دەڵێت: کۆمۆنیستەکانی عیراق هەرگیز نە دیموکراتیخوازو نە نیشتمانپەروەر بوون، تایبەت ئەوانەیان کە ملوایان کرد چەك لەرووی ئەو شۆڕشەدا هەڵبگیرێت کە دیکتاتۆرییەتی رووخاند. ئێزگەکانی وڵاتە سۆشیالیزمییەکان، غەیرەز ئەوەی زیان بە خۆیان دەگەیەنن، هیچیان پێ ناکرێت، بێگومان ئەگەر بێت‌و ئەو هێرشانە نەوەستێنرێن ئەوساکە دەبنە هۆی تێکچوونی پەیوەندیی عیراق بە گەلانی وڵاتە سۆشیالیزمەکانەوە.

٤- ڕۆژنامەی (الفجر الجدید)یش لە سەروتارێکی خۆیدا بە ناوونیشانی (درۆکانی ڕادیۆی مۆسکۆو ڕۆژنامە شیوعییەکان)ەوە دەڵێت: شۆڕشی (هەشتی شوبات-ك. م.) بۆ ئەوە هەڵگیرسا تاوەکو عیراق بگێڕێتەوە ناو ڕیزی عەرەب‌و بە یەکجارەکی لە خراپەکاریی کۆمۆنیزم‌و بەدفەڕی گێرەشێوێنەکان رزگاری بکات.

---

(78) شوورای پۆلایین (Iron Curtain) (السور الحدیدي): زاراوێك بوو بە وڵاتە سۆشیالیزمەکان دەگوترا، تایبەت لە دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی ستالیندا، وینستن چەرچلی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا یەکەم کەس بوو ساڵی ١٩٤٦ ئەو زاراوەیەی بەکار هێنا، ئەوەیش بە سەرەتای دەست پێ کردنی جەنگی سارد (الحرب الباردة) لە نێوان بەرەی سۆشیالیزم‌و بەرەی سەرمایەداریدا دەژمێردرێت.

کۆمۆنیستەکان سەنگەری شەڕێکی دڕاویان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، عیراق ئێستا لە جیهان مەعزول نییەو حوکمەتەکەشی هەوڵ دەدات شۆڕش لە گێرەشێوێنەرلن بپارێزێت. ئەم حوکمەتەی ئێستا بۆ ڕزگارکردنی عیراق لە خوێنڕێژەرانی بەعسو لە چەتە پیاوکوژو وڵات فرۆشەکان دروست بووە.

گەلێك سەروتاری دیکەی لەو بابەتە بڵاو کراوەتەوە، وێڕای پڕۆتێستی توندوتیژ دژی ئێزگەی (پەیکی ئێران) چونکە هەوڵ دەدات کورد هان بدات. وەزیری دەوڵەت حازم جەوادیش، کە ئێستە گوتەبێژی حوکمەتە، لە دوا کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانیی خۆیدا زۆر بە ڕەقی دژی کۆمۆنیزم دواو بەشێك لە شریتێکی قاسمی بۆ ئامادەبووان لێ دا کە لە وەزارەتی بەرگری تۆماری کردبوو، قاسم لەو شریتەدا دلوا لە جەماوەر دەکات (دژی شۆڕش- ك. م.) ڕاپەڕن، هەروەها نموونەی ئەو بەیاننامانەی بە سەریاندا دابەش کرد، کە حیزبی شیوعیی ڕۆژی هەشتی شوبات بڵاوی کردبۆوە و تێیدا هانی خەڵك دەدات بۆ بەرگریی چەکدارانە.

٥- گەلێك دیاردە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە تەلەفزیۆنی بەغدا ئێستا هیچ فلیمێك نیشان نادات پەیوەندیی بە کۆمۆنیزمەوە هەبێت، گشت کۆمۆنیستە ناسراوەکانی دەزگاکانی میری، تایبەت ئەوانەیان کە سەر بە وەزارەتی ئیرشادو ئاژانسی هەواڵەکانن، یا بە یەکجاری یا بۆ چەند ساڵێکی دیاری کراو دەستیان لەکار کێشراوەتەوە.

لە ڕێگەی دیدەنییە زۆرەکانمانەوە، لەگەڵ کاربەدەستانی حوکمەتی نوێدا، لەوە گەیشتووین کە چاو بە گشت ڕێککەوتننامە کۆنەکانی (عیراق- ك. م.) لەگەڵ وڵاتە سۆشیالیستەکاندا دەگێڕدرێتەوە، واش پێدەچێت لەگەڵ ئەوەیشدا ڕێککەوتننامە کۆنەکان وەك خۆیان بمێننەوە، بەڵام دەرگەی قۆنتەراتی پڕۆژە نوێکان بۆ هەمووان کراوە دەبێت. گەلێك شت دەربارەی ئاڵوگۆڕەکانی بەسەرهاتی خوێندکارە ئەفەریقاییەکان لە بەلغاریا ڕاگەیەندراوە، بەلام هەمان کات ڕێگە دراوەتە باڵوێزخانەی بەلغاریا (لە بەغدا- ك. م.) کە ئەویش روونکردنەوەی خۆی دەربارەی ئەو بابەتە ڕابگەیەنێت.

بیستو سێی شوبات، کە ڕۆژی یادی دامەزراندنی سوپای رووسییە، تەنها سێ کەسی سیڤیل (لە عیراقییەکان- ك. م.) و دە دوازدە ئەفسەری سوپا هاتبوون، جاران بە لێشاو کۆمۆنیست و تەنانەت خەڵکی لاوەکیش ئەو یادەیان دەکردەوە.

ـە شاری بەغدا دەنگوباوێکی زۆر هەیە دەربارەی ئەوەی دوو سەد تەکنیکییەکی وڵاتە سۆشیالیزمەکان دەگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان، بەڵام تاوەکو ئێستا کەس بە تەولوەتی نازانێت ئەوە ڕاستە یا ڕاست نییە. زۆر نییە وەزیری هەندەرانی عیراق بە جێگری باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای گوتووە کە سەدو پەنجا تەکنیکی سۆڤێتی مانگی حەفتا هەزار دیناری عیراقی لەسەر حوکمەت دەکەون، ئەوەیش بارێکی قورسە بەسەر وڵاتەوە کە بەرگەی ناگرێت. هەمان کات دەنگوباوێکی دیکە بڵاوە، گوایە دەبوو چوار سەد تەکنیکی سۆڤیەتی تر لەم ڕۆژانەدا بگەنە عیراق، بەڵام دوای بەرپابوونی شۆڕش ئەو بڕیارە ئیلغا کرا. بەڕێوەبەری ئوتێلێکی بەغدا، کە زۆر لە نزیکەوە دەیناسم، بە خۆمی گوت ئەو بیستو پێنج تەکنیککارە سۆڤیەتییەی لە ئوتێلەکەی ئەو دەژین لە ڕۆژی شۆڕشەوە (واتا لە هەشتی شوباتەوە–ک. م.) تا بیستی شوبات، ئەو ڕۆژەی کە یەکترمان دی، نەچوونەتە سەر کار.

دوا هەواڵیشم[79] دەربارەی دیدەنیی ئەم دواییانەی باڵوێزی رووسە لەگەڵ وەزیری نوێی هەندەرانی عیراق، لەو کاتەدا باڵوێزی ئیتالیاو چەند کەسێکی دیکە لە ژووری پێشوازی، کە بەرانبەر ژووری وەزیرە، چاوەڕوانی نۆرەی خۆیان بوون گوێیان لێ بووە باڵوێز چۆن بە تووڕەیی بەسەر وەزیری نوێدا دەقیژێنێتو چۆن لە قیژە قیژ نەکەوتووە تا ئەو کاتەی دەستکراوە بە وەرگێڕانی قسەکانی (لە رووسییەوە بۆ عەرەبی– ک. م.)، دواییش باڵوێزی رووسی کە لە ژووری وەزیر هاتووەتە دەرەوە هەڵچوونو تووڕەییو روو گرژییەکی زۆری پێوە دیار بووە.

٦– ئەمانە هەر هەموویان ئاماژە بۆ (وێنەی نوێی) عیراق دەکەن، ئەی ئاخۆ کار بەرەو کوێ دەڕوات، ئەوەیان شتێکی دیکەیە.

ئیمزا

ر. دەبلیو. مۆنرۆ))[80].

---

(79) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: ((Last but not least)) کە دەقاو دەق ((أخيراً وليس آخراً))ی عەرەبی دەگرێتەوە.

(80) N.A., F.O., 371/170434, Confidential, R.W. Monro, British Embassy, Baghdad, No. 10113/9/63, February 26, 1963, To: D.L. N. Good child, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1

ناوەرۆکی بەڵگەنامەی دواتری ناو هەمان فایلْ بۆی هەیە تیشك بخاتە سەر سرووشتی ئەو ڕۆژانەی مێژووی عیراق. ڕۆژی حەوتی مارتی ساڵی ۱۹٦۳ باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا بە شفرە ئەم بروسکەیەی لای خوارەوەی ناردووە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەران لە لەندەن:

((نهێنی،

لە بەغداوە،

بۆ وەزارەتی هەندەران، لەندەن،

بە شفرە، لە: سێر ڕۆجەر ئەلێنەوە،

ژمارە ۲٤۷، ۷ی مارتی ۱۹٦۳.

۱- بێگومان ئەو ڕاپۆرتانەتان دیوە دەربارەی ئەوەی حوکمەت بڕیاری داوە ڕۆژی هەشتی مارت خۆنیشاندانی پشتگیریی (ڕژێمی نوێ- ك. م.) لە بەغدا ساز بکات. ئەم هەنگاوە لە لایەن گەلێك لایەنەوە بە هەنگاوێکی هەڵەشە دادەنرێت‌و زۆر عیراقی بڕیاریان داوە کاتی خۆنیشاندانەکە لە ماڵ دەرنەچن، چونکە دەترسێن ناجەزانی (بەعس- ك. م.) ئەم دەرفەتە بۆ نانەوەی ئاژاوە بقۆزنەوە. وەك هەموو جار هاتوچۆی (ئوتومبیل) لە بەغدا قەدەغە دەکرێت.

۲- لەئیمشەوەوەش هەموو دەزگا فەرمیێکانی باڵوێزخانەکەمان چۆڵ دەکەین‌و تەنها ژمارەیەکی کەم پیاویان تێدا دەمێڵینەوە، لە کۆنسوڵخانەو ماڵی مولحەقی فڕۆکەوانی لە مەسبەح بنکەی هەواڵنێری دادەنێین. لەبەر دوو هۆ پەنا دەبەینە بەر ئەم کارانە، یەکەمیان بۆ ئیحتیاتەو دووەمیشیان بۆ ئامادە بوونە، نەبا هێرش بکرێتە سەر باڵوێزخانەکەمان، بە ماڵ‌و منداڵی دیپلۆماسییەکانی خۆمانیشمان ڕاگەیاندووە لە ماڵ دەرنەچن، هەمان ڕاسپاردەیش دەگەیەنینە بەریتانییەکانی دیکەی ئێرە))[81].

شایانی باس‌و سەرنجە دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی باڵوێزخانەی بەریتانی لە عیراق زۆر زوو لە سروشت‌و نیازی نادیموکراسییانەی ڕژێمی بەعس گەیشتوون، بۆیەکا لە ڕاپۆرت‌و نامەو بروسکە نهێنییەکانیاندا دەستیان لە بەکارهێنانی زاراوەی (شۆڕش) هەڵگرتووە کاتێك باسی ڕووداوەکانی هەشتی شوباتی ساڵی ۱۹٦۳

---

(81) Ibid, Confidential, No. 10124/56/63, 15, Summary.

عیراقیان کردووەو ئیتر هەر بە کۆدیتا ناویان هێناوەو رووی ڕاستەقینەیان بە وردی هەڵسەنگاندووە، ئەوەی توێژەر بە ئاسانی لەو ڕاپۆرتە پێنج لاپەڕەییەی ڕۆژی دووی مارتی ساڵی ١٩٦٣ی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا هەستی پێ دەکات[82].

کاتێك بەعس، لە دوارۆژانی ژیانی یەکەم ڕژێمیدا، گلۆڵەی کەوتە لێژی بە گەرمی کەوتە باسی ((دیموکراسی))و دانی گفتی سازکردنی هەڵبژاردن‌و سەربەستیی حیزبە موعاریزەکان تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ ڕۆژنامەی ((تایمس)) بەم جۆرەی لای خوارەوە باسی کردووە:

((بەغدا گفتی هەڵبژاردن دەدات،

ئازاد کردنی ٢٢٨ بەندکراو،

بەغدا، سیی تەشرینی یەکەم.

سەرەك وەزیرانی عیراق لیوا ڕوکن ئەحمەد حەسەن بەکر ئیمڕۆ ڕایگەیاند هیواداره وڵات بتوانێت بە زووترین کات هەڵبژاردنی گشتیی ساز بکات بۆ دامەزراندنی حوکمەتێکی دیموکراسی لەگەڵ پارتییە موعاریزەکاندا:

لە دیدەنییەکدا جەنەراڵ بەکر ڕایگەیاند ((ئێمە دیموکراسی پەروەرین‌و زۆر بە توندی بڕوامان بە ژیانی دیموکراسی هەیە. هیچ حوکمەتێك نییە بتوانێت لە حوکمدا بمێنێت بێ پشتیوانیی تەواوی گەل لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە)).

بەکر لەسەر قسەکانی ڕۆیشت‌و گوتی: پێویستە پارتییە موعاریزەکان هان بدرێن چونکە دوارۆژی حوکمەتی عیراق لەگەڵ گەل دایە، دیاری کردنی ڕۆژی هەڵبژاردنیش لەسەر ئەوە وەستاوە کەی حوکمەت هەستی کرد کە بارودۆخەکە لەبارە بۆ ئەنجامدانی.

جەنەراڵ لەسەر قسەکانی ڕۆیشت‌و گوتی: هەڵوێستی عیراق لە ئاستی کێشە نێودەوڵەتییەکاندا پێویستە هەڵوێستێکی بێ لایەنانە بێت- ((سیاسەتمان لە بواری کێشە جیهانییەکاندا لە ناخی ویژدانمانەوە هەڵدەقوڵێت‌و لایەنگریی کەس ناکەین)). گووتیشی: گشت وڵاتێکی دواکەوتوو، بەر لە هەر شت، دەبێت بیر لە بەرژەوەندییەکانی خۆی بکاتەوە.

---

(82) Ibid, The Situation in Iraq, 5PP., 2 March, 1963.

## گفتوگۆ دەربارەی یەکیەتی

سەرەك وەزیرانی عیراق ڕایگەیان: یەکیەتیی سوپایی لەنێوان عیراق‌و سووریادا هەنگاوی یەکەمە بەرەو یەکیەتییەکی یەکجارەکیی نێوانیان، هیواشی خواست ئەو یەکیەتییە باڵ بکێشێت بەسەر گشت نیشتمانی عەرەبدا. گووتیشی هیچ مێژوویەکی دیار دەستنیشان نەکراوە بۆ ڕاگەیاندنی یەکیەتیی فیدراڵی، بەلاّم هەردووك حوکمەتی عیراق‌و سووریا لە کێشەکانی ئەم بووارە دەکۆڵنەوە.

کە (ئامادەبوان– ك. م.) لە سەرەك وەزیرانیان پرسی ئایا عیراق نیازی هەیە دەزگاکانی وەك بانك‌و زەمان (ضمان) خۆماڵی بکات، لە وەلاّمدا گووتی: هێشتا بە تەواوەتی لەو بابەتە نەکۆڵراوەتەوە.

(بەکر) ئەو ڕایەشی سەلماند، کە کەسایەتی‌و دەستەو دایەرەی وەك پارتی کۆمۆنیست هەن کە پشتی حوکمەتی ئێستەی عیراق ناگرن، ((بەلاّم (لە وەلاّمدا گووتی– ك. م.) **ڕۆژێك دێت کۆمۆنیستەکان لەوە تێ بگەن کە ئێمە لەپێناو بەرژەوەندیی گەلەکەماندا کار دەکەین، بەر لە هەمووانیش هەژارانی گەل، ئەوساکە ئەوانیش دێنە سەر ڕێ‌و پشتی شۆڕش دەگرن**)).

هەرچی هەواڵی ئازادکردنی دوو سەدو بیست‌و هەشت بەندەکەیشە ئەوە، وەك ڕۆژنامەی ((العرب)) دەڵێت، بەپێی فەرمانی حاکمی سەربازیی گشتیی عیراق لیوا ڕوکن ڕەشید موسلیح ئازاد کراون. دەستەی یەکەمی ئازادکراوەکان ژمارەیان دوو سەد کەس بوو کە ڕۆژی بیستی تەشرینی یەکەم بەردران– ڕۆیتەر))[83].

بێگومان دیاردەیەکی ئاسایی‌و گشتییە ئەگەر دوای بەرپابوونی شۆڕشی (ئەیلوول)ی ١٩٦١ سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە، لە گۆشە نیگای پەندە بەناوبانگەکەی عەرەب خۆیانەوە ((دوژمنی دوژمنم دۆستمە)) (عدو عدوي صديقي)، پەیوەندیی بە دوژمنانی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسمەوە کردبێت، یەکێکیش لەو دوژمنانەی عەبدولکەریم قاسم کە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول بەر لە ڕووخانی ڕژێمەکەی پەیوەندیی نهێنییان پێوەی کردووە سەرکردایەتی لقی

---

(83) Ibid, Baghdad Promise of Election. 228 Prisoners Freed, -"The Times", 31 October, 1963, Iraq "needs a Democracy", Pledge by Premier, ((Yorkshire post)) 31 October, 1963.




عیراقی ((پارتی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیزمی)) بووە کە بارزانییان لەوە ئاگادار کردووە ئەوان پیلانی ڕووخاندنی ڕژێمیان ِدارِشتووەو پەیمانیان داوەتێ کە هەنگاو بە هەنگاو لە هەموو کردارەکانی خۆیان لەو بووارەدا ئاگاداری بکەنەوە، تەنانەت لە ((سەعاتی سفری))ش[84]، واتا لەو ڕۆژەیش کە تێیدا دەستبەکار دەبن، بەڵام ئەوەیان لە سەرکردایەتی کورد شاردۆتەوەو ڕۆژێکی درەنگتریان لە هەشتی شوبات پێ ڕاگەیاندوون، دواتر گەلێك پۆزش‌و بیانووی بەعسیانەیان بۆ هێناونەتەوە، ئەوەیش بووەتە سەرەتای نەخشە گڵاوەکەیان، کە دوا ئامانجی بە عەرەب کردنی نەتەوەی کورد بوو، وەك لە بەشی داهاتووی ئەم بابەتەدا رووی گەلێك لایەنی شاردراوەو بایەخداری لەبەر ڕۆشنایی ژمارەیەك لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا دەخەینە بەرچاو.

---

(84) ((سەعاتی سفر)): زاراوێکی سیاسیی باوە، لە بوواری کاری زۆر گرنگ‌و نهێنیی، وەك جەنگ‌و کودێتا، بەکار دەهێنرێت، بە واتای سەعاتی دەستبەکار بوونەو تەنها ژمارەیەکی یەکجار کەم لە ڕەهبەرو سەرکردەکان بەو سەعاتە ئاشنا دەزانن.

## پرسی کورد و ڕۆژانی دەسەڵاتی یەکەمی بەعس
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

بەعسییەکان سەرەتا خۆیان وا نیشان دا گوایە لەگەڵ کورد نیازیان خاوێنەو ڕژێمەکەیان هەوڵ دەدات لە سنووری عیراقدا چارەسەرێکی دیموکراسییانەی کێشەکەیان بکەن، ئەوەی دیپلۆماسییە بەریتانییەکان، لە ڕۆژی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣وە، بە وردی کەوتنە دووی هەواڵەکانی.

یەکەم گەورە پیاوی کورد، کە ڕۆژی هەشتی شوبات پەیوەندیی بە سەرکردایەتی کودێتاکەوە کردووە فوئاد عارف بووە، بەر لە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بەپێ ڕوو دەکاتە بنکەی سەرکردایەتی، لە نزیک گۆڕەپانی حافز قازیی تووشی لۆرییەکی سەربازی دێتو دەیوەستێنێت، دوای ئەوەی خۆی بە شۆفێرەکەی دەناسێنێت داوای لێ دەکات بیگەیەنێتە ئەو بنکەیە، کە هەست بە دوودڵیی شۆفێرەکە دەکات دەمانچەی لێ دەردەهێنێتو ناچاری دەکات بیگەیەنێت[85].

بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی بەم جۆرەی لای خوارەوە لەو بەشەی فایلی ژمارە (١٧٠٤٣٣/٣٧١)ی خۆیاندا کە ناوی ((کوردو ڕژێمی نوێ))یە[86]، لە زوبان ((هەواڵنێری دەنگوباسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست))ەوە، ئاماژەیان بۆ ئەم دەورەی فوئاد عارف کردووە:

**((فوئاد عارفی وەزیری دەوڵەتو نوێنەری کورد لە حوکمەتی شۆڕشدا ڕایگەیاند کە هیچ جۆرە جیاوازییەك لە نێوان شۆڕشو کورددا نییە، ئێمە نەوەی یەك بنەماڵەو یەك وڵاتین، هەموو شتێکیش بە باشترین شێوازێکی لەبار بەڕێوە دەچێت))**[87].

جەلال تاڵەبانیو ساڵح یۆسفیش، یەکەم دوو نوێنەری شۆڕشن کە دەگەنە بەغدا، زوو زوو ناویان لە بەڵگەنامەکانی ناو ئەم فایلەو گەلێك بەڵگەنامەی دیکەی ناو فایلەکانی تری هەمان وەزارەتدا دووپات دەبێتەوە. لە بەشی ((کورد و ڕژێمی نوێ))ی هەمان فایلدا دەڵێت:

---

(85) چەند جارێك دەقی ئەم قسانەم لە خودی فوئاد عارف خۆی بیستووە.

(86) Kurds and the new regime.

(87) N.A., F.O., 371/170433, Kurds and the new regime.




((جەلال تاڵەبانی و ساڵح یوسفی نوێنەری کوردی ناوچەی سلێمانین کە کەوتووەتە باکووری عیراقەوەو دوێنێ شەو بە فڕۆکەیەکی جەنگی، لە ڕێگەی کەرکووکەوە، گەیشتنە بەغدا. تاڵەبانی هەر دوێنێ لەگەڵ سەرەك كۆمارو (عەبدولسەلام – ك. م.) عارف و سەرەك وەزیران (ئەحمەد حەسەن– ك. م.) بەکر و وەزیری بەرگری ساڵح مەهدی عەمماشدا کۆبووەوە))[88].

دوای ئەمە یەکسەر ناوەڕۆکی بروسکەی دووەمی هەمان بەش هەڵگیراوە، کە بریتییە لە ناوەڕۆکی هەواڵێکی ئیزگەی لەندەن، بە ناوونیشانی ((مستەفا بارزانی شەڕی ڕاگرت)) کە سەعات شەش‌و نیوی ئێوارەی دوو شەممەی دوازدەی شوباتی ۱۹٦۳ بە کاتی لەندەن، ڕایگەیاندووە، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

---

(88) Ibid.


جەلال تاڵەبانی، سەرۆکی وەفدی کوردی

((تاڵەبانی ڕایگەیاند کە لە بەغدا لەگەڵ بەرپرساندا دەستی بە وتووێژی سەرەتایی (تمهیدی) کردووە. دوای ئەوەیش گووتی: مستەفا بارزانیی ڕەهبەری کورد هەر ئەوەندە هەواڵی شۆڕشی چواردەی ڕەمەزانی بیست وەك بەڵگەی خۆشەویستیی بەرانبەر ناسیۆنالیزمی عەرەبیو بۆ دەربڕینی هەستێکی دڵسۆزانە بەرانبەر برایەتی عەرەبو کوردو بۆ بەربەست کردنی لە خۆڕا ڕژاندنی خوێنی نازداری عەرەبو کورد شەڕی وەستاند.

تاڵەبانی هەمان کات گووتی: ((وتووێژی دیکە لەگەڵ بەرپرسانی حوکمەتی عیراقیدا دەکاتو ئێمە لەگەڵ ڕەهبەرانی شۆڕشی عیراقین))[89].

---

(89) Ibid.

((پێویستیی گەیشتن بە ڕێککەوتن)) ناونیشانی بروسکەی سێیەمی ئیزگەی لەندەنە کە پاش تەنها دوو دەقیقە لە پەخشی بروسکەی دووەم ڕایگەیاندووە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوەکەیەتی:

((جەلال تاڵەبانی، کە نوێنەری ((پارتی دیموکراتی کوردستان))ەو سالح یوسفی کە نوێنەری یاخیبوونەکەی کوردە نەتەوەپەرستەکانن، دوێنێ شەو گەیشتوونەتە بەغدا، گوتیان مستەفا بارزانیی تەکیدی بۆ کردوون کە پێویستە لەگەڵ شۆڕشی عیراقیدا بگەنە ڕێککەوتنامەیەکی ئەوتۆ کە گەرانتیی بەرژەوەندییەکانی هەردووک لا، چ عەرەبو چ کورد، بکات))[90].

لە هەمان فایلدا، دوای ئەم هەواڵە گرنگانە، یەکسەر سێ وتاری بایەخداری دوو ڕۆژنامەنووسی ڕۆژئاوایی هەڵگیراون، یەکەمیان وتاری ڕۆژنامەنووسی ئەمەریکایی بەناوبانگ ((دانا ئادەمس شمیدت))ی خاوەنی کتێبی ((گەشتێك بەناو ئازایاندا))یە[91] کە ڕۆژی حەفدەی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ بە ناوونیشانی ((ڕەهبەرە کوردەکان شاخەکان جێ دەهێڵن بۆ کۆبوونەوەی ئاشتی لە بەغدا)) لە ستوونی چوارەمی لاپەڕەی یەکەمو ستوونی چوارەمی لاپەڕەی شەشەمی ((نیویۆرك تایمس))دا بڵاوی کردۆتەوە[92].

هەردووك وتارەکەی دیکەش ((ریچارد بێستۆن)) لە ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلێگراف))دا بڵاوی کردوونەتەوە، ((کورد لە هەڵوێستی هێزەوە سازش دەکەن))

---

(90) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((Mustafa Barzani had stressed to them: the need to reach an agreement with Iraqi Revolution which would guarantee the interests of both the Arabs and the Kurds)) (Ibid).

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت بارزانی لەو جۆرە ڕاگەیاندنانەیدا هەمیشە ناوی عەرەبی پێش ناوی کورد دەخست.

(91) Dana Adams Schmidt, Journey Among Brave Men, Boston, Little Brown, 1964, 289 PP.

شایانی باسە هەر زوو مامۆستا جەرجیس فەتحوڵلا ئەم کتێبەی وەرگێڕایە سەر زوبانی عەرەبیو بڵاوی کردەوە.

* ((هێشتا مامۆستا جەرجیس فەتحوڵلا لەژیاندا مابوو، کە دەزگای (ئاراس) لەهەولێر ئەو کتێبەو چەند کتێبێکی دیکەی لەسەر پرسی کورد دووبارە بۆ چاپ کردەوە- ع. زەنگەنە)).

(92) Dana Adams Schmidt, Kurd Chiefs Leaving Mountains For Peace Meetings in Baghdad, -((New York Times)), February 17, 1963.

((الكرد يساومون من موقع القوة)) ناوونيشانی وتاری یەکەمیانە کە ڕۆژی بیست‌و یەکی شوبات بڵاوی کردۆتەوە[93] و ((کورد هیوادارن بەم زووانە بگەنە ڕێککەوتننامەی ئۆتۆنۆمی))ش ناونیشانی وتاری دووەمیانە کە پاش شەش ڕۆژ لە هەمان ڕۆژنامەدا بڵاوی کردۆتەوە[94].

ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕدراوی هەواڵێکی دیکەی ئەم بووارەیە کە لە فایلی ژمارە (١٧٠٤٤٧/٣٧١)ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا هەڵگیراوە:

((نهێنی، عیراق،

وتووێژ لەگەڵ کورددا.

بەپێی ئەو هەواڵانەی کە ئەمەریکاییەکان لە بروسکەکانی خۆیاندا ڕایانگەندوون، تاهیر یەحیا بە ناوی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش))ەوە بەو دوو نوێنەرە کوردەی ڕاگەیاندووە، کە ڕۆژی هەژدەی شوبات گەیشتوونەتە بەغدا، پرنسیپی ئۆتۆنۆمیی کورد لای حوکمەت پەسەند کراوە، بەڵام تا ئێستا ئەم قسەیە ڕوون نییە کە لە واقیعدا چی ڕادەگەیێنێت.

بەپێی قسەی ئەمەریکاییەکان یەکێك لە کۆسپە گەورەکانی وتووێژ، پرسی ئازادکردنی دیلە کوردەکانە، حوکمەت نایەوێت ئەو بەندە کوردانە ئازاد بکات، کە جۆرێك پەیوەندییان لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا هەبووە، وێڕای ژمارەیەکی زۆر لەو کوردانەی کە لە ڕابردوودا شتێکیان کردووە، تایبەت لە ئەندامانی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)).

ئیمزا

پ. کرادۆك[95]

ڕۆژی ٢٧ی شوباتی ١٩٦٣))[96].

---

(93) Richard in Beston, Kurds Bargaining From Position of Strength, -"Daily Telegraph", 21 February, 1963.

(94) Richard in Beston, Kurds hoping Autonomy Pact Near, -"Daily Telegraph", 27 February, 1963.

(95) پێرسی کرادۆك (Percy Cradock): ڕۆژی بیست‌و شەشی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٣ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٤٥ەوە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، وەك کۆنسوڵ‌و وەزیر موفەوەز، لە چین‌و هۆنگ کۆنگ‌و کوالالامپور‌و شوێنی دیکە کاری کردووە، کاتێك ئەو نامەیەی لای سەرەوەی نووسیوە‌و تا ساڵی ١٩٦٦ لە خودی وەزارەتی هەندەران کارمەند بووە. بڕوانە:
((Who's Who 1980. An Annual Biographical Dictionary)), London, 1980, P.1128.

به دەگمەن هەبوون بڕوا بەم جۆرە گفتو ڕاگەیاندنانەی فەرمانڕەوایانی ڕژێمی نوێی عیراق بکەن، ئەوەتا هەمووی چوار مانگو دوو ڕۆژ بەسەر کۆدێتای هەشتی شوباتدا تێپەڕی کاتێك ڕژێمی نوێ بە فەرمیو بە شێوازێکی دراماتیکی دژی کورد بانگی دەستپێکردنەوەی شەڕی دا، لەو ڕۆژەدا، واتا دەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣، ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) بەیاننامەیەکی حەوت لاپەڕەیی دەربارەی دلسەپاندنەوەی جەنگی بەسەر کورددا ڕاگەیاند، دوا بەدوای ئەوە هەمان ڕۆژ عەلی ساڵح سەعدیی جیگری سەرەك وەزیرانو وەزیری ئیرشاد کۆنفرانسێکی گەورەی ڕۆژنامەوانیی لە بارەگای ئێزگەو تەلەڤیزیۆنی بەغدا بەست کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر ڕۆژنامەنووسو هەواڵنێری عیراقیو عەرەبو بیانیی ئامادەی بوونو دەقی وەرگێڕدراوی بەیاننامەو کۆنفرانسەکە بۆ سەر زوبانی ئینگلیزی لە فایلی ژمارە (١٧٠٤٣٨/٣٧١)ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا هەلگیراونو ئەمەی لای خوارەوەیش پوختەیەکی وەرگێڕدراوەکەی هەردووکیانن:

أ- هەر لە سەرەتاوە بەیاننامەکەی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) دەیەوێت نیازخاوێنی بەعس لەگەڵ کورددا دەرببڕێت، گوایە کۆدێتاکەیان هەوڵی داوە هەموو ئەو دیاردانەی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم ((لە ماوەی چوار ساڵو نیوی)) تەمەنیدا لە ژیانی سیاسیی عیراقدا تێکی دابوو گشتیان چارەسەر بکات، ((تایبەت ئەو بارودۆخە یەکجار نائاساییەی هەوڵی دەدا لەناو عەرەبو کورددا دروستی[97] بکات کە سەدەها ساڵە بە خۆشەویستیو هاوڕێیو هاوچارەنووسیی پێکڕا دەژین))[98](*).

---

(96) N.A., F.O., 371/170434, Confidential, Iraq: Negotiation With the Kurds, From: P. Cradock, To: Good child, February 27, 1963.

(97) سەعات دەی ئەم بەیانییەی ڕۆژی سیی ئابی ٢٠٠٧ بە کاتی لەندەن گەیشتبوومە ئەم ئاستەی پاکنووسی ئەم لاپەڕەیەی کتێبەکەم بکەم کاتێك خاتوو بەیانی کچی کوردی دڵسۆزو ڕەسەن ئیسماعیل حەقی شاوەیسی مامۆستای خۆشەویستم لە سویدەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، دڵنیام لە بەهەشتی ڕازاوەی کوردایەتیدا چاوو دڵە گەورەکەی شاوەیسی کوردستان بەم بەرهەمە دەگەشێتەوە. لە لاپەڕە ١٤٧-١٤٨ و ٢٦٥-٢٦٦ و ٣٤٢-٣٤٤ی کتێبی ((مێژوو))دا بەرز بەرهەمە نایابەکانی شاوەیسم نرخاندووە.

(98) N.A., F.O., 371/170438, Nofication issued by the National Council of Revolutionary Command, P.1.

(*) ((بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (٩). ع- زەنگەنە).

ب- ((لەبەر ڕۆشنایی ئارەزووی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا بۆ نەهێشتنی خێرای ئاسەواری ئەو سیاسەتە جیاوازکارییەی ڕژێمی ڕەشی قاسم لەگەڵ هاوولاتییە کوردەکاندا پەیڕەوی دەکرد، شۆڕش لە لای خۆیەوە دەستپێشکەریی کرد لە وەستاندنی شەڕدا لە باکوورو ئەو بەندییە سیاسییە کوردانەی ئازاد کرد کە لە لایەن قاسمەوە حوکم درابوون، گشت ئەو کاربەدەستو فەرمانبەرو کرێکارانەش، کە لە لایەن دەسەلاتدارە زۆردارەکانی قاسمی (دابەشکەر)ەوە[99] فەسڵ کرابوون، گێڕدرانەوە سەر کارەکانی خۆیان بۆ ئەوەی لەگەڵ برا (عەرەبەکانیاندا - ک. م.) لە بواری پێکەوەنانی کۆمەڵگایەکی شۆڕشگێڕدا بەشداربن.

سەرباری ئەوانە حوکمەتی شۆڕشگێڕ هەموو هەنگاوێکی حازمو خێرای نا بۆ نەهێشتنی ئەو ئابلۆقە ئابوورییەی قاسمی (دابەشکەر) بەسەر ناوچەکانی باکووردا دایسەپاندبوو تا بەو جۆرە ژیانی ئابووری بگەشێتەوەو گشت هاوولاتیان ئاسودە بژین))[100].

ج- ((شۆڕش پەلەی بوو ئەو هاوبرواییەی نێوان عەرەبو کورد، کە ڕژێمی تاوانباری قاسمی (دابەشکەر) خستبوویە مەترسییەوە، بگێڕێتەوە دۆخەکەی جارانی، بۆیەکا وەفدێکی شەعبیی، کە لەم زاتانە- سەید شێخ محەمەد ڕەزا شەبیبی و حسەین جەمیل و فایەق سامەڕائیو فەیسەڵ حەبیب خەیزەرانو دکتۆر عەبدولعەزیز دووریو زەید ئەحمەد عوسمان پێکهاتبوو[101](*)، نارد بۆ گفتوگۆ

---

(99) شایانی باسە لە هەر شوێنێکدا ناوی عەبدولکەریم قاسم هاتووە ئەو وشەی دابەشکەرە بەو جۆرە خراوەتەوە نێوان دوو کەوانی گەورەوە.

(100) N.A., F.O., 371/170438, Notification issued by the National Council of Revolutionary Command, P.1.

(101) هەر هەموویان نیشتمانپەروەر بوونو باش لە سروشتی بەعس تێگەیشتبوون و هەر یەکەیان بە شێوازێك حەزی دەکرد کێشەی کورد ئاشتییانە چارەسەر بکرێت.

(*) ((زەید ئەحمەد عوسمان (١٩٢٤-١٩٧٨): یەکێك بوو لە کەسایەتییە کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسییەکانی شاری هەولێر، لە خانەوادەیەکی ئایینی کۆن و ناسراوی ئەو شارەیە، لە ساڵی ١٩٢٤دا هەر لەو شارەدا لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لەوێ تەواو کردووە، دواتر چۆتە قاهیرە تا لەوێ لە کۆلێژی مافی سەر بە زانکۆی مەلیك فوئاد بخوێنێ، بەلام نەیتوانیوە خوێندن لەوێ تەواو




(دیاریی: ئیحسان موفتی)

---

بکات، بۆیە گەڕاوەتەوە ئێراق و چووەتە کۆلێژی ماف لە بەغدا، لە ساڵی ١٩٥٨دا وەکو نوێنەری هەولێر هەڵبژێردراوە، نوێنەری ئێراقیش بووە لە حوکمەتی فیدراڵی هاشمی لەنێوان ئێراق و ئوردون دا، دوای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بۆتە رکابەر، دوای کودەتای ١٩٦٨ چۆتە پاڵ شۆڕشی ئەیلوول، لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٧٨دا کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی خانەوادەکەیان لە باداوە نێژراوە.
زەید ئەحمەد عوسمان پیاوێکی لیبراڵی بووەو بڕوای بە دیموکراسییەت هەبووە، حەزی بە ڕژێمەکانی ڕۆژئاوا کردووە، لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا جێی متمانەی شۆڕش بووەو بەردەوام بەشداری لەو شاندانە کردووە کە ویستوویانە سەرکردایەتی شۆڕش و حکومەت بەیەک بگەیەنن.
د.کەمال مەزهەر، پێی وایە هەردوو کتێبی: (المجاهد الكردي أمين بروسك ولجنة فلسطين الدولية) و (نضال الأكراد، القاهرة، ١٩٤٦) کە بە ئیمزای (محەمەد شێرزاد) و بەزمانی عەرەبی بڵاوکراونەتەوە، ئەوە هی (زەید ئەحمەد عوسمان)ن، بەتایبەتی ئەو کتێبەی دواییان، لای مێژوونووسان بە سەرچاوەیەکی باشی مێژووی هاوچەرخ دادەنرێت-ع.زەنگەنە))

لەگەڵ نوێنەرانی مستەفا بارزانیو پارتەکەیداو دەربڕینی هەستی پێویستی بەردەوامبوونی پەیوەندی لەگەڵیاندا بۆ بەرپاکردنی ئاشتییەکی هەمیشەیی لە ناوچەکانی باکووردا و پتەوکردنی پەیوەندییە مێژوویەکانی عەرەب و کورد و جێبەجێکردنی ئاواتە نەتەوەییەکانی کورد))... ((لەگەڵ ئەو ڕاستیەشدا کە مستەفا بارزانیو دەستەو دایەرەکەی مافی ئەوەیان نییە نوێنەری گشت کورد بن و لەگەڵ ئەو ڕاستیەش کە بارزانییەکان یەکێك بوون لەو لایەنانەی بە هەموو توانایانەوە پشتی حوکمی فرە دیکتاتۆریی قاسمیان گرتو لە کوشتارە خوێناوییە ترسناکەکانی موسڵو کەرکووك یاریدەیان دا و پشتی سیاسەتی تاوانباری کۆمۆنیستەکانی ناو وڵاتیان گرت کە دژ بە بەرژەوەندیی گەلو ئاواتەکانی لە بواری ئازادیو دیموکراسیدا بوو، وێڕای ڕێبازیی دەرەبەگیانو پەیوەندییان بە ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستانو زایۆنیزمەوەو هەڵوێستو تاوانەکانیان دەرحەق هاووڵاتییە کوردەکانی دیکە))، ئینجا لەگەڵ هەموو ئەوانەیشدا ((بڕوای حوکمەتی شۆڕش بە یەکیەتیو هاوچارەنووسیی عەرەبو کورد روونو ئاشکرا لەوەدا خۆی نواند کە ئاسانکاریی بۆ نوێنەرانی کورد کرد تاوەکو لە وەفدە فەرمیو کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداربن کە دەرسی کاروبارەکانی یەکیەتیی ناوچە عەرەبییەکانیان دەکردو بەو جۆرە مەودا بۆ کورد ڕەخسێنرا تا لە نزیکەوە ئاگاداری ئامادەکاریو ئەنجامەکانی گفتوگۆکانی (پرۆژەی –ك. م.) یەکیەتیی فیدراڵیی نێوان میسر و سووریا و عیراق بن))[102].

د– بەو جۆرە بەیاننامەی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) بە ڕاستو چەپدا باسی دڵفراوانیو دڵسۆزیو لێبووردەییو خۆشەویستیی خۆی بەرانبەر کورد دەکات، بە ڕاستو چەپیشدا باسی سپڵەییو بێ وەفاییو بێگانەپەرستیی شۆڕشی ئەیلوول دەکاتو دوایی لە بیستو سێ خاڵدا ژمارەیەك بەڵگە وەك نموونە بۆ نیازپاکی خۆیو سپڵەیی کورد عەرز دەکات هی وەك ((پەنادانی هەموو ئەو کۆمۆنیستو پیاوکوژانەی لەدەست دادگا مەدەنیو سەربازییەکان هەڵهاتوونو

---

(102) N.A., F.O., 371/170438, Notification issued by the National Council of Revolutionary Command, PP.1-2.

ئاياندائەوە دەست بەرپرسە عێراقییەکان))و ((پشکنینی ئۆتومبیل لەسەر ڕێگە سەرەکییەکانو زەوت کردنو بە تالآن بردنی ماڵو موڵکی خەڵکی)) و ((هێرش بردنە سەر بنکە پۆلیسییە کەلاکانو بەدیل گرتنو زەوت کردنی چەکەکانیان، وێڕای هێرش بردنە سەر بنکە پۆلیسییەکانو تالآن کردنیان))و ((بە نیازی تەگەرە خستنە بەر چالاکییەکانی دەزگاکانی میریو دواخستنی کاری هاوولاتیان هێڵی تەلەفۆنەکانی نێوان شارو قەزاکان دەبڕن))و ((دەستڕێژ لە هێزە چەکدارەکانی (میری- ك. م.) دەکەن)) و ((هاوڵاتیان دەفڕێنن، وەك فڕاندنی قایمقامی مێرگەسۆرو سێ کەس لە ئەندامانی حەرەسی قەومی لە ناوچەی مەخموورو پێنجی دیکەیان لە ناوچەی ئاڵتون کۆپریو پێنجی دیکەشیان لە ناوچەی عەین دبس)) و ((هێرشی سێ سەد کەس لە یاخیگەرانو کۆمۆنیستەکان لە ڕۆژی پێنجی مایسی ساڵی ١٩٦٣دا بۆ سەر گوندی ئیبن ناسرو زەوت کردنی چەكو پارەو پوولو ئازاردانی دانیشتووانی ئاشتیخوازی ئەو گوندە))و ((دەسرێژی ڕۆژی چواردەی مایسی ساڵی ١٩٦٣ی جیابوونەوەخوازان بۆ سەر ئەو هێزانەی سوپا کە لە دەزگای ئەلکتریکی نیشتمانی دبس هێرشی هەردووك شەلاتی جەبار جەباریو عادل عیزەتو پتر لە سێ سەد شەلاتیی دیکە بۆ سەر ناوچەی قەرە حەسەنو تالآنکردنی چەکی دانیشتووانیو کشانەوەیان بەرەو گوندی تەکییەی جەباری، هەموویشیان لە دەستەو دایەرەی بارزانی بوون)) و ((هێرشی ڕۆژی چواری حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ی جیابوونەوەخوازانو کۆمۆنیستە هەڵهاتووەکان بۆ سەر سوارەی سەلاحەددین[103][*] و شەڕ لە نێوانیاندا پتر لە پێنج سەعاتی خایاندو بە

---

(103) میری بە ناوی سەلاحەددینی ئەیوبییەوە ناوی ((سوارەی سەلاحەددین*))ی لەو کوردانە نابوو کە دژی شۆڕشی ئەیلوول هاریکاریی سوپاو پۆلیسیان دەکرد.

(*)((چەکداری هۆزە عەرەبەکانی نزیك سنووری کوردستانیش، کە حکومەت بۆ دژایەتی بزووتنەوەی کورد چەکداری کردبوون، پێیان دەگوترا (فرسان خالد)، بەبیرمە لەناوەڕاستی شەستەکان چەند لۆرییەك لەو چەکدارانە بەناو شاری هەولێردا دەسوڕانەوەو هاواریان دەکرد:(ئەحنەل بەدوو - - - - وێنەل عەدوو)، هەر ئەوسابوو ئەوانە زۆر گوندی کوردیان تالآن کردبوو، هەتا ئەم ساڵانەی دواییش، کە خەڵکی دەشتی هەولێر باسی ئەو ساڵانەیان دەگێڕایەوە بە(ساڵی فەرهوود) ناویان دەهێنا، دیارە

کشانەوەی جیابوونەوەخوازان، کە شازدە کەسیان لێ زامدارو هەژدەیان لێ بەدیل گیرا، کۆتایی هات، هەرچی سوارەکانیشە شێخ سامی عابید غەزالەی سەرەک هۆزی سلێڤانییان لێ کوژرا)) و ((ڕۆژی بیستو هەشتی مایسی ساڵی ۱۹٦۳ کوردەکان هێرشیان هێنایە سەر گوندی زەلکە لە ناوچەی مەیدانو شێخ نوری زەلکەیان کوشتو گوندەکەیان سووتاند لەسەر ئەوەی شێخ نوری قایل نەبوو هەریکارییان لەگەڵ بکات، دانیشتووانی گوندەکەش ناچار بوون پەنا بەرنە بەر پۆستی پۆلیسی مەیدان)) و ((ڕۆژی پێنجی حوزەیرانی ساڵی ۱۹٦۳ جیابوونەوەخوازان دەسرێژیان لەو پۆستانە کرد کە لە شاخی قەرەچۆك تاقیبی ئەو کۆمۆنیستو چڵکاوخۆرو جیابوونەوەخوازانەیان دەکرد کە سەرقاڵی پڕۆپاگەندە بوونو حەرەسە قەومییەکانیان کوشت)) و ((عومەر مستەفای جیابونەوەخواز، کە بە عومەر دەبابە ناسراوە، مەکتەبی پارێزەر کەمال محی الدینی لە کۆیسنجەق کردۆتە دادگەو بڕیاری نایاسایی دژی بێتاوانان دەر دەکات)) و ((دەسرێژی تاوانباران لە هیلیۆکۆپتەرێك، کە بە ئاسمانی چەمچەماڵدا دەفڕیو پێکانی لاقی فڕۆکەوانەکەی)) و ((جیابوونەوەخوازە خۆفرۆشەکان، کە لە خانەقین دادگایەکی بەڕەڵلایان دامەزراندووە، بڕیاری لە سێدارەدانی چوار هاووڵاتیی بێ تاوانی دەرکردووە، بڕیارەکەش بە سەریاندا جێبەجێ کراوە)) و ((ڕۆژی شەشی حوزەیرانی ساڵی ۱۹٦۳ جیابوونەوەخوازان پەلاماری قافڵەیەکی تەجهیزاتیان لە بنکەی پۆلیسی ئەزمڕ داو شەڕێکی قورسی چەند سەعاتی قەوما)) و ((هەروەها ڕۆژی هەشتی حوزەیرانی ساڵی ۱۹٦۳ لە ناوچەی سپیلك هێرشیان کردە سەر قافڵەیەکی ئەو سەربازانەی بۆ حەوانەوە دەچوونو موقەدەمی شەهید

---

چەکدارە کوردەکانیش لەناو خەڵکدا پێیان دەگوترا: جاش یان جاش پۆلیس، هی عەرەبەکانیش پێیان دەگوترا جاشی عەرەب، بۆ زیاتر پشت ڕاستکردنەوەی ئەم بۆچوونانەم تەلەفۆنم بۆ (ممتاز حەیدەری)ی موڵکدارێکی ئەوسای ناوچەکە کرد، ئەویش گوتی: لەبارەی جاشە کوردەکانەوە خەڵك دەیانگوت: لەبرسان و لەترسان کاکە مەبنە فورسان، بەڵام ئەوەی بەبیرم مابێت دەقی شیعرەکە ئاوەهابووە: لەبرسان و لەترسان خەڵك هەمووی بوونە فورسان ــ ع. زەنگەنە)).

عەباس کەمالو سێ سەرباز کوژرانو بیستو سێ نایب زابتو سەربازی دیکە بریندار کرانو ئاگریان لە چوار ئۆتۆمبیلی سوپایی بەردا))[104].

هـ. دوا بەدوای نمایشی بیستو سێ خاڵە پڕ لە ((تاوانەکانی)) کورد بەیاننامەکەی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) بێ کەمو زۆر دەڵێت: ((ئەمانەی گوتمانن شتێکی کەمن لەو ڕووداوە تاوانکاریو چەتەگەرییانەی جیابوونەوەخوازەکان لە ڕۆژانی وتووێژدا کردوویانن، وێڕای کارە نایاساییەکانیان لە بواری هاندانی سەربازو پۆلیسە کوردەکانی ناو ڕیزەکانی سوپاو پۆلیس بۆ ئەوەی بە چەکەکانیانەوە هەڵبێن)).

لەبەر ئەمانەو گەلێك هۆی دیکەی وەك ئەمانە ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دا لە ئیمڕۆوە ناوچەکانی نیشتمان لە پاشماوەی بارزانییەکانو پیاوەکانیان پاك بکاتەوە، هەروەها بڕیاریشی دا هەموو ناوچەکانی باکووری (عیراق– ك. م.) ناوچەی بزووتنەوەی سەربازیی بن)). بەڵام خوا هەڵناگرێت بەخشندەیی بێ ئەندازەو سنگ فراوانیی بێ سنووری ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) بە زەقی خۆی لەو مۆڵەتە بیستو چوار سەعاتیەدا نوواند کە دابوویە شۆڕشگێڕانی کورد بۆ ئەوەی بە چەکەکانیانەوە خۆیان بدەن بە دەستەوە !![105].

و– دوای ئەم هەموو درۆو دەلەسانە نۆرەی جەنابی عەلی سالح سەعدی دێت کە دەڵێن گوایە بە ڕەگەز کوردە، ئەمیش ماوەی پتر لە دوو سەعات تۆمەتەکانی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) دووپات دەکاتەوەو هێرشێکی زۆر دەکاتە سەر بارزانیو تاڵەبانی چونکە هەردووکیان وەك دەفەرمووێت، لە یەك کاتدا گوایە داردەستی دەرەبەگان و کۆنەپەرستانو ئیمپریالسیەکانو کۆمۆنیستەکانو زایۆنیستەکانو هەر بەو جۆرە شێوازەیش وەڵامی گشت پرسیارەکانی ڕۆژنامەنووسو هەواڵنێرەکان دەداتەوە[106] (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە ٨–٩)، هەموو

---

(104) N.A., F.O., 371/170438, Notification issued by the National Council of Revolutionary Command, PP.2-6.

(105) Ibid, P.7.

(106) Ibid, PP. 8-12.

ئەمانەیش گومان لەوەدا ناهێڵن کە کورد بە درێژایی مێژووی نوێو هاوچەرخی خۆی تووشی دوژمنێکی هەزار رووی وەك بەعس نەهاتووە، ئەوەی ئەرکی سەر شانی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوولی هێندەی دیکە سەختو دژوارتر کردو ناچاری کرد پەنا بەرێتەوە بەر چەكو پتر لە جارانیش بایەخ بداتە ڕاگەیاندنو پەیوەندییەکانی بە هێزو وڵاتەکانی دەرەوەی کوردستان.

هەرچی وەڵامی تۆمەتەکانی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) و جێگری سەرەك وەزیرانو وەزیری ئیرشاد عەلی سالح سەعدییە لەو یادداشتە پازدە لاپەڕەییەی جەلال تاڵەبانیدا دەخوێنینەوە کە بە ناونیشانی ((پرسی کوردو بەعس لە عیراق)) بە زوبانی عەرەبی لە فایلی ژمارە (١٧٠٤٤٧/٣٧١)ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا هەڵگیراوە. یادداشتەکە لە سیو نۆ خاڵی سەرەکی پێکهاتووەو دوا خاڵی بە شێوازێکی قووڵ رووی ڕاستەقینەی ڕژێمی بەعسی بەم جۆرە نیشان داوە:

((٣٩- لە بارودۆخێکی وای پڕ لە پیلانو هەڵخەڵەتاندنو درێژدادڕیو غەشو تەڵەکەبازیدا، بەعس رووی ڕاستەقینەی نیازەکانی خۆی دەربڕیی، ڕۆژی ١٠ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ ئینزارێکی دایە هێزە چەکدارەکانی کورد، کە چەکەکانیان بەدەستەوە بدەن، ئەگینا حوکمەت بانگی جەنگی تەفروتونا کردنیان دژ دەدات))[107].

دوو لاپەڕەی دواتری ئەو یادداشتە بۆ پوختەیەکی ناوەرۆکی تەرخان کراوە، ((کارە سەلبییەکانی (بەعس- ك. م.) لە ڕۆژانی وتووێژدا)) ناوونیشانی دوا بەشی ئەو پوختەیەیەو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((ب- کارە سەلبییەکانی (بەعس- ك. م.) ڕۆژانی وتووێژ:

١- جێبەجێ نەکردنی یاسای بەخشینی گشتی (قانون العفو العام) بۆ بەشداربووانی شۆڕشی (کورد- ك. م.).

٢- لانەبردنی بڕیاری حەجزی پارەو پووڵی بەشدارانی شۆڕشی (کورد- ك. م.).

---

(107) N.A., F.O., 371/170447, Kurdish Question and Ba,atheists in Iraq, P.14.

٣- ئازادنەکردنی سێ هەزار بەندکراوی (کورد- ک. م.) کە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی قاسمەوە، وێڕای ئەوانی دیکە[108][*]، لە بەندیخانەکاندان.

٤- گشت ئەفسەرانی کورد، لە ڕۆژانی وتووێژدا، لە سوپا دوور خرانەوە.

٥- دەست کێشانەوەی زۆربەی هەرە زۆری فەرمانبەرە کارگێڕییەکانی کورد لەکار بە شێوازێکی تایبەت.

٦- دانانەوەی ئابلۆقەی ئابووریی لەسەر (کوردستان- ک. م.) بە شێوازێکی خراپتر لە جاران.

٧- دەستکردنەوەی (حوکمەت- ک. م.) بە بزووتنەوە سەربازییەکانی لە نزیک ئەو ناوچانەوەی هێزە کوردییەکانیان کۆبۆتەوە.

٨- ئەو فەرمانڕەوا کارگێڕیانەی دژ بە کوردن، هی وەك بەدرەدین عەلیی موتەسەریفی هەولێرو زەعیم سدیق مستەفا کە خودی عەمماش دەربارەی گووتی تاوانبارێکی ترسناکەو پێویستە لەسەر گشت کارەکانی دادگایی بکرێت، نەگۆڕدران بە فەرمانڕەوای دیکە بەو جۆرەی (کورد- ک. م.) داوای گۆڕینیانی کردبوو.

٩- ڕۆژانی کۆنگرەی کۆیسنجەق فەوجی مەغاویری ئەو ناوچەیە کەوتە شەڕ فرۆشتن بە دانیشتووانی و دەستی کردە سووتاندنی گوندەکانی ئەو ناوە.

١٠- تاوەکو ئێستا هیچ هەنگاوێك بۆ لابردنی ئاسەوارە خراپەکانی (ڕژێمی- ک. م.) قاسم نەنراوە. ((بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە ١٠ - ع. زەنگەنە))

---

(108) بە داخەوە وێنەی چەند شوێنێکی یادداشتەکە بە باشی دەرنەچوون، لەم بەندی سێیەمەی پوختەکەیدا وشەیەکم بۆ نەخوێندرایەوە.

(*) ((بۆ ئاسانکاری بەردەم خوێنەرو توێژەرانمان، هەروەها بۆ بەرچاوڕوونی سیاسییەکانمان، بەپێویستمان زانی دەقی یاداشتی ئاماژە بۆکراو دووبارە بەڕێنووسی نوێ بنووسینەوەو لەگەڵ پاشکۆی ژمارە (١٠) دایبنێین، سوپاس بۆ هاوکارم (ڕەفیق ساڵح)، کە تایپکردنی یاداشتەکەی خستەئەستۆی خۆی، پێشموایە یاداشتەکەمان بەشێوەیەکی ڕاست و دروست نووسیوەتەوە، دەشتوانم بڵێم هەموو کەلەبەرەکانیمان پڕ کردۆتەوە - ع. زەنگەنە)).

١١- فەوجی ئەو جاش پۆلیسانەی قاسم لە خۆفرۆشانی (کورد- ك. م.) دروستی کردبوون تاوەکو ئێستایش بڵاوەیان پێ نەکراوە.

١٢- بەردەوام بوون لەسەر هەڵخەتاندن‌و درێژدادڕی‌و تەڵەکەبازیی بە درێژایی چوار مانگی ڕابردوو[109].

شایانی باسە ئەو فایلەی یادداشتەکەی تاڵەبانیی تێدا هەڵگیراوە یەکێکە لە فایلە گەورەکانی ئەو ڕۆژگارەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی دەربارەی پرسی کورد، بەڵگەنامەکانی لە ڕۆژی بیستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣وە دەست پێ دەکەن تاوەکو بیست‌و حەوتی تەمموزی هەمان ساڵ‌و گەلێك بابەتی گرنگیان تێدایە. بە وێنە بەڵگەنامەی بەر لە یادداشتەکەی تاڵەبانی نامەیەکی نهێنیی (ڕۆدریك پارکێس)ی باڵوێزی بەریتانی لە عەممان هەڵگیراوە کە ڕۆژی دەی تەموزی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ (ڕ. س. کراوفۆرد) لە بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی ئەوەی حسەینی پاشای ئوردون ڕۆژی هەشتی تەمموز داوای کردووە بۆ کۆشك‌و بۆ ماوەی دوو سەعات گفتوگۆیان دەربارەی کێشەی کوردی عیراق کردووە[110].

بەو جۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخی بەعسییەکان لە کوردستان روو لە لێژی دەکات، تەنانەت وەزعەکە دەگاتە ئەو ڕادەیەی ڕۆژی نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ (سێر ڕۆجەر ئێلێن) لەناو چالاکییەکانی ((باندە کوردییەکان))[111] لە دەوروبەری کەرکوك داوا لە وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی دەکات ڕێگەی بدەنێ:

(( أ- یان ژن‌و منداڵی بەریتانییەکان لە کەرکوکەوە بگوێزنەوە بەغدا، یا تەنانەت

ب- هەر هەموو بەریتانییەکانی دەوروبەری کەرکوك[112] بگوێزرێنەوە))[113].

---

(109) N.A., F.O., 371/170447, Kurdish Question and Ba'atheists in Iraq, P.15.

(110)Ibid, Confidential, From: Roderick Parkes, British Embassy, Amman, July 10, 1963, To: R. S. Crawford, Foreign Office, London, S.W.1

(111) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:. ((The Kurdish bands)).

(112) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((A- To arrange evacuation to Baghdad of British wives and families, or even.
B- To withdraw all British personnel from Kirkuk neighborhood)).

لەگەڵ هەموو نوشوستییەکانیو ناوزڕانی و ئابڕووچوونیدا، چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوەی وڵات، ئینجا ڕژێمی بەعس لە دوژمنکارییەکانی خۆی دژی کورد نەکەوت، کار گەیشت بەوەی دەیان هەزار منداڵو ئافرەتو پیرێژنو پیرەمێردی کورد پەرتەوازەو سەرگەردان بنو گەلێکیان ناچار بن پەنا بەرنە بەر خاکی وڵاتە دراوسێکان. ئەمەیش بە ڕوونی لە ناوەرۆکی ژمارەیەك لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانیی حوکمەتی بەریتانیی ئەو ڕۆژگارەدا ڕەنگی داوەتەوە. ڕۆژی بیستو هەشتی ئابی ساڵی ١٩٦٣ باڵوێزخانەی بەریتانیی لە ئەنقەرە، لەندەنی لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە دەورووبەری هەشت سەد بارزانی، بە خۆیانو خاوو خێزانو چەکەکانیانەوە، لەژێر فشاری سوپای عیراقیدا، پەنایان هێناوەتە بەر ناوچەی هەکاری[114] لە ناو خاکی تورکیاداو **((دوای ئەوەی سەربازە تورکەکان پیاوەکانیان چەك کردووە هەموویان ڕاگوێزاونەتە کامپێکی تایبەتی))**. پاش هەشت ڕۆژ بەو بۆنەیەوە ئێرکینی (Mr. Erkin) وەزیری هەندەرانی تورکیا لەبەر دەمی **((ئەنجوومەنیی نیشتمانیی گەورە))**ی وڵاتەکەیدا ڕایگەیاندووە کە بەهۆی هێرشی سوپای عیراقەوە **((شەپۆلی هەڵهاتن لە ناو کوردی عیراقدا دەستی پێکردووە))**.

ئێرکین لە گوتەکەی خۆیدا، بەپێی نامە نهێنییەکەی باڵوێزی بەریتانیی لە ئەنقەرە، ئاماژەی بۆ ئەم خاڵە گرنگەی لای خوارەوەی کردووە:

**((٣- بەر لەوە میستەر ئێرکین دیسانەوە ئەو دەنگوباوەی بە درۆخستەوە کە کۆمۆنیستەکان دەربارەی ئەوەی گوایە حوکمەتەکەی چالاکانە (دژی کورد- ك. م.) یاریدەی حوکمەتی عیراق دەداتو گوایە تەنانەت بۆمبی ناپاڵمیش دەداتە عیراقییەکان))**[115].

---

(113) N.A., F.O., 371/170438, Confidential From: Baghdad, To:. Foreign Office, Cypher OTP, Sir Roger Allen, No. 613, Priority Confidential.

(114) **هەکاری**: یەکێکە لە ناوچە هەرە سەختەکانی کوردستانو هەر لەبەر ئەوەیش لەتورکیا بۆتە یەکێك لە بنکە سەرەکییەکانی **((پارتی کرێکارانی کوردستان))**.

(115) N.A., F.O., 371/170449, Kurdish Revolt, Conflict With army, Inward Saving Telegram From: Ankara, To:. Foreign Office, R. September 6, 1963.

بەڵگەنامەی دواتری ناو هەمان فایل دیسانەوە بۆ بابەتی ئەو پەنابەرانە تەرخان کراوەو زانیاریی زۆرترو گرنگتری دەربارەیان تێدایە. ڕۆژی پێنجی ئەیلوولی هەمان ساڵ باڵوێزی بەریتانی لە ئەنقەرە بروسکەیەك دەنێرێت بۆ وەزارەتی هەندەرانی وڵاتەکەی و تێیدا دەڵێت:

((ڕۆژی چواری ئەیلوول ئیسماعیل ئێرەز (Ismail Erez)ی کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی تورکیا پێی ڕاگەیاندم ئەو پەنابەرە کوردانەی (هاتوونەتە ناو خاکی تورکیاوە– ك. م.) بارزانیی نین، بەڵکو سەر بە هۆزی دیکەی کوردی سەر سنووری تورکیان، زۆربەشیان پیرەمێردو ژنو منداڵن و دەڵێن پیاوەکانیان شان بەشانی بارزانی خەبات دەکەن[116]. ئێرەز گووتی ئەو ناوی تەواوی ئەو هۆزە پەنابەرانە نازانێت، بەڵام بەپێی ڕۆژنامە تورکییەکان نەستووریو ڕێکانین، ژمارەیشیان نەك هەشت سەد کەس بەڵکو خۆی لە هەزارو دوو سەد کەس دەدات، چاوەڕوانیش دەکرێت شەپۆلی کوردە هەڵهاتووەکانی (عیراقی– ك. م.) ڕوو لە بەرزبوونەوە بکات))[117].

ئەو هەواڵە لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامە تورکییەکانیش ڕەنگی داوەتەوە، ڕۆژی بیستو دووی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ باڵوێزخانەی بەریتانیی لە ئەنقەرەوە بە نامەیەکی تایبەتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە پوختەی ناوەڕۆکی بابەتەکانی ڕۆژنەمە تورکییەکان دەربارەی پەناهەندەکانی کورد بەم جۆرەی لای خوارەوە ئاگادار دەکات:

((٢– دوێنێ ڕۆژنامەکانی (تورکیا– ك. م.) ڕایانگەیاند کە کۆمەڵێك پەناهەندەی (نوێی کوردی عیراق– ك. م.) کە ژمارەیان هەزار کەسێك دەبێتو زۆربەیان ژنو منداڵن ڕۆژی بیستی تەشرینی دووەم ڕاگوێزراونەتەوە ماردین بۆ ئەوەی ئاودیوی عیراق بکرێنەوە، دەڵێن ئەم پەناهندانە لە هۆزەکەی کەلحێی سەر بە میرین.

---

(116) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: ((fighting with Barzani)).

(117) N.A., F.O., 371/170449, Kurdish Revolt, Conflict With army, From: British Embassy, Ankara, Department, Foreign Office, London, S.W.1.



٣- بەپێی هەواڵەکان لە ڕۆژی هەژدەی تەشرینی یەکەمەوە ڕەوانەکردنەوەی پەناهەندە (کوردە- ك. م.) عیراقییەکان دەستی پێ کردووە.

وێنەی بۆ باڵوێزخانەکانی بەریتانیا لە بەغداو دیمەشقو تاران))[118].

بەو جۆرە، بەر لە دەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ بە ماوەیەکی زۆر، ڕژێمی بەعس خۆی ئامادە دەکرد یا ئەوەتا سەر بە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول شۆڕ بکات و بە جۆرێك بەچەند مافێکی سەرەتایی گەلێك کەمتر لە خودموختارییەکی رووکەش قایل بێت، یا ئامادە بێ بۆ شەڕی تەفروتوونا کردنی کوردی عیراق، ئەوەی هەموو ڕۆژێك هێندەی دیکە چارەی ڕژێمەکەیانی لای هەرە میانڕەوو دونیادیدە دڵسۆزەکانی عیراق ڕەشتر دەکرد، لە دوو توێی بەڵگەنامە

(118) Ibid, From: British Embassy, Ankara, October 22, 1963, To: Central Department, Foreign Office, London, S.W.1.

نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا توێژەر زۆر بە ئاسانی هەستی پێ دەکات. بە وێنە عەلی حەیدەر سلێمان[119](*) یەکێك لەوانە بووە کە مۆنرۆی کارمەندی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا تەنها دوو ڕۆژ بەر لە بەیاننامەکەی دەی حوزەیرانی

---

(119) عەلی حەیدەر کوڕی سلێمان بەگی ڕەواندزییە، کە بە سیلاحشۆر ناسرا بوو، لە نەوەی میری ڕەواندزە(*)، یەکێك بوو لەو حەفتاو نۆ کوردەی لەسەر ڕاپەڕینی مایسی ساڵی ١٩٤١ گیران، چەند جارێك بووەتە نوێنەری هەولێر لە پەرلەمانی عیراقیداو چەند جارێکیش بووە وەزیر، ساڵی ١٩٢٩ باشترین کتێبی لە سەر مێژووی ئەورووپا بۆ پۆلی سێی ناوەندی دانا.

(*) ((**عەلی حەیدەر سلێمان** (١٩٠٥-١٩٩١): لەبەشێك لەو پەراوێزەی د. کەمال کە وا ئامازەی بۆ عەلی حەیدەر کردووە بەگومان بووم گوایە (**لەنەوەی میری ڕەواندز**) بووبێ، چونکە ئەوەندەی من ئاگادارم و پێشم وایە (**پاشا کۆرە**)ی ڕەواندز وەچەی لەپاش بەجێ نەماوە، بۆیە بەتەما بووم ئەو دارشتنەی د.کەمال بگۆڕم و بیکەمە (**لەخانەوادە یان بنەماڵە، یان ماڵباتی میری ڕەواندزە**)، ئەوەبوو دواتر پەیوەندیم بە مامۆستا (**فەخری سیلاح شۆر**)ەوە کرد کە هەندێ زانیاریی نووسراو وێنەیەکی ناوبراوی بۆ هێنام، لەنووسینەکەدا دەزانین عەلی حەیدەر لە ١٩٠٥/٣/٤دا لەڕەواندز لەدایك بووە، ڕەچەلەکی دەچێتەوە سەر میرەکانی سۆران کە ئەوانیش دەچنەوە سەر عەشیرەتی ڕاوەندی، کە سەلاحەدینی ئەیوبیش یەکێك بووە لەوان. عەلی حەیدەر سەرەتای ژیانی زۆربەی لەبەغدا و مووسڵ و حەڵەب و دێرلزووری سووریە بەسەر بردووە، هەندێ لە قۆناغەکانی خوێندنیشی لەو شوێنانەدا تەواوکردووە، ئەوەندەش کە خۆم لەسەرچاوەکان بەبیرم مابێ، لەساڵی ١٩٢٥-١٩٢٦دا، کە قوتابخانەی لەڕەواندز تەواوکردووە، حوسێن حوزنی موکریانی لەگۆڤاری (**زاری کرمانجی**)دا هەواڵی چوونی بۆ بەیروت بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندن ڕاگەیاندووەو پێشبینی لێهاتوویی و دواڕۆژی کردووە.

عەلی حەیدەر لەساڵی ١٩٣٠دا ژنی هێناوە، کوڕو کچێکی هەبووە، کوڕەکەی ناوی (**عامل**)و کچەکەشی ناوی (**عاملە**) بوو. لەژیانی وەزیفی خۆیدا پلە بەپلە سەرکەوتووە تا دواتر پۆستی چەند وەزارەتێکی وەرگرتووە، لەدوای شۆڕشی چواردەی تەمووزیش جێی متمانەی دەسەڵات و شۆڕش بووە، چەند جارێك کراوەتە باڵیۆزی عیراق، دواتر لەناوەڕاستی شەستەکان ڕۆڵێکی گرنگی لەدانووستانی نێوان حکوومەت و شۆڕشی کورد بینیوە.

ئەوەی شایانی باسیشە لەساڵی ٢٠٠٢دا قوتابییەك، کە پێدەچێ عەرەب بووبێ، بەناوی (**محمود شكحان الدليمي**) بەناوونیشانی (**علي حيدر سليمان، نشاطة الثقافي و دوره السياسي في العراق حتى عام ١٩٦٨**) نامەیەکی ماستەری لەسەر ناوبراو پێشکەش بە زانکۆی بەغدا کردووە، ئای کە بۆ تۆمارکردنی مێژووی خۆمان زۆر بێ خەمین..! وادیارە هەمیشە دەبێ خەڵك بۆمانی بنووسێتەوە... ـ ع. زەنگەنە))

((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) چەند جارێك لەو نامە دووردرێژە سێ لاپەڕەییەی خۆیدا کە ناردوویە بۆ د. ل. ن. گودچایلد لە بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیی دەربارەی پرسی کورد، باسی هەوڵە دڵسۆزەکانی کردووەو سەرئەنجام وەك خۆی بە خودی باڵوێزی بەریتانیی گوتووە هێند وەڕس بووە لە فڕتوفێڵی بەعسییەکان کە لەو لیژنەیەی ڕژێم ناوی لێ نابوو لیژنەی واسیتەی نێوان بەغداو سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول دەست هەڵبگرێت[120].

هەمان بەڵگەنامە، بە هەمان دەستوور، باسی هەڵوێستی بابە عەلیی شێخ مەحموود و محەمەد سەعید خەفاف دەکات، ئەوانیش گەلێك سکاڵای خۆیان لای ئینگلیزەکان کردووە[121] (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە ١٧).

لەو بارودۆخە ناسك و سەختەدا دیاردەیەکی ئاسایی بوو ڕەهبەرانی کورد بێوچان هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی سەرنجی گشت لایەنە کاریگەرە عیراقیو عەرەبو ئەورپاییو ئەمەریکاییەکان بۆ ئەو کردارە ناهەموارانەی بەعس ڕابکێشن. دیتنی موشیر عەبدولحەکیم عامیر لە سەرەتادا، ئینجا دیتنی خودی جەمال عەبدولناصر، لە لایەن تاڵەبانییەوە، یەکێکە لەو پەیوەندییە بایەخدارانەی ئەو ڕۆژگارەی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول، شایانی باسە ڕۆژنامەی ((الاخبار))ی قاهیری بە تایبەتی ئاماژەی بۆ ئەو دوو دیدەنییەی تاڵەبانی کردووە[122].

خۆئامادە کردنی گشت چینو دەستەو توێژەکانی کوردەواریی بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێرشی بەرفراوانی ڕژێمی بەعس بۆ سەر کوردستان بە شێوازێکی تایبەتیی سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەکانی ڕاکێشاوە چونکە لەو بووارەدا کار گەیشتووە بەوەی کوردەکان تەنانەت بە قووڵی دەرسی تاکتیكو شێوازی شەڕی پارتیزانیی یۆگۆسلاڤییەکان دژی نازییەکان بکەنو کتێبی تایبەتیی لەسەر بخوێننەوە[123].

---

(120) N.A., F.O., 371/170438, From: R.W. Monro, British Embassy, Baghdad, NO. 10114/98/63, June 8, 1963, To: D.L.N. Goodchild Esq. Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1., P.1.

(121) Ibid, PP.1,3.

(122) Ibid, P.1.

(123) Ibid, P.2.



باباعەلی شێخ مەحموود

(دیاریی: شێخ مەحموودی شێخ کاوە)

مۆنرۆ لە نۆیەم خاڵی ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت ((وێنەی ئەم نامەیەم ناردووە بۆ هەر یەک (لە باڵوێزخانەکانمان– ک. م.) لە ئەنقەرەو بێروتو قاهیرەو دیمەشقو تارانو واشنتۆنو مۆسکۆ))[124].

دیپلۆماسییە بەریتانییەکان لە عێراق بەر لەوەیش چەند جارێکی دیکە لە نامە نهێنییەکانی خۆیاندا ئاماژەیان بۆ بایەخپێدانی سەرکردایەتیی شۆڕشی ئەیلوول بە ڕاکێشانی سەرنجی ڕای گشتیی جیهانی بۆ پرسی نەتەوەکەیان کردووە. ئەم نامە نۆ خاڵییەی لای خوارەوەی کە هەمان (مۆنرۆ) لەبەغداوە دیسانەوە ناردوویە بۆ (گودچایڵد) لە لەندەن، بایەخی زۆری هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی هەمان بابەت:

---

(124) Ibid, P.3.

((نهێنی،
ژماره ١٠١١٣/٣١/٦٣،
باڵوێزخانەی بەریتانی،
بەغدا،
٥ی مارتی ١٩٦٣.
خۆشەویستم گودچایلد.

١- لە درێژەی نامەی ڕۆژی بیستو شەشی شوباتمدا پێتان ڕادەگەیەنم کە نوێترین هەواڵی پرسی کورد ئەوەیە: سەرەتا وا پێدەچوو گفتوگۆ دەربارەی باش بڕوات بەڕێوە، بەڵام ئێستا، ئەگەر پچڕاندنی یەکجارەکی نەبێت، گەیشتۆتە ئاستی وەستان.

٢- چەند ڕۆژێك لەمەوبەر تاڵەبانی بە هەواڵنێری ڕۆیتەری ڕاگەیاند کە لەگەڵ فوئاد عارفدا پێکرا جەمال عەبدولناصریان لە قاهیرە بە تەنها بینیوەو هەستیان بەوە کردووە کە عەبدولناصر لە کێشەی کورد گەیشتووە. ئەوەی کورد دەیانەوێت ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەییە لە چوارچێوەی عیراقدا کە مافی بەڕێوەبردنی کاروباری خوێندنو ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووریو کارگێڕیی ناوخۆیان بۆ مسۆگەر بکات بە ڕابەریی یەك سەرۆكو یەك سیاسەتی دەرەوە، لەگەڵ سوپایەکی نیشتمانی و یەك هێزی پۆلیسدا کە هی کوردو عەرەب بن. بەپێی قسەی خودی تاڵەبانی، کوردستان دەیەوێت بۆ عیراق وەك ئیسکۆتلەندە وابێت بۆ بەریتانیا، گوتیشی کورد داوای بەشێکی تایبەتیی لە داهاتی نەوت نەکردووە، بەڵام لە بواری ئابووریدا پەیڕەوکردنی هەڵوێستێکی یەکسانیی مەبەستە.

٣- کە ڕۆژی بیستو هەشتی شوبات تاڵەبانیو (شەوکەت- ك. م.) عەقراویم[*] دی ئەوان هیچیان دەربارەی وتووێژ (لەگەڵ حوکمەتی عیراقدا- ك. م.)، یا بوونی تەگەرەیەك لە ڕێگەیدا نەگووت، بەڵام ورەی هەردووکیان بەرز بوو، گووتیشیان نوێنەرانی کورد بۆ وتووێژ تەمسیلی هەموو کوردستان دەکەن چونکە، وەك گووتیان، بەر لە

---

[*] ((ماوەیەك لە دەستەی یەکەمی خاوەنی ئیمتیازو نووسەرانی ڕۆژنامەی (التاخی - برایی)بووە کە یەکەم ژمارەی لە ١٩٦٧/٤/٢٩دا دەرچووە- ع. زەنگەنە)).



ئیبراهیم ئەحمەد (١٩١٤-٢٠٠٠)



هەمزە عەبدوڵلا (١٩١٤- $\frac{١٢}{١٣}$/١٢/١٩٩٨)[*]

شۆڕش بە ماوەیەکی کورت لەگەڵ ئەو هۆزە کوردییانەدا ڕێککەوتبووین کە بەر لەوە هاریکاریی قاسمیان دەکرد، بەو جۆرەیش وەفدی وتووێژی کورد نوێنەری سەرجەمی هۆزە کوردەکانو (پارتی دیموکراتی کوردستان) و لایەنگرانی جارانی قاسمە.

٤- دەربارەی دەسەڵاتی شیوعی لەکوردستاندا، چ تاڵەبانیو چ عەقراوی، گوتیان سەرەتای شەستەکان هێزی کۆمۆنیستەکان (لە ناو پارتیدا- ک. م.) تێکشکێنرا، دوای ئەوەی مەلا مستەفا ژمارەیەکیانی لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزب دوور خستەوە، لەوانە هەمزە عەبدوڵلا و ساڵح حەیدەریو نەژادی ئەحمەدی عەزیز ئاغاو خەسرەو تۆفیق[125] و حەمید عوسمان. بەر لەوە لە بوواری هەوڵی دوورخستنەوەی کوردپەروەرە ڕەسەنەکاندا مەلا مستەفا مەیلی دایە کۆمۆنیستەکان و گەلێك لەو کوردانەی

---

(*) ((لە چاپی یەکەمدا کۆچیی دوایی هەمزە عەبدوڵلامان لە ١٩٩٩/١٢/١٣ نووسی بوو، لێرەدا د.جەمشید حەیدەری ناوەهای بۆ راست کردووینەوتەوە - ع. زەنگەنە)).

(125) خوالێخۆشبوو خەسرەوی تۆفیق ئەفەندیی ئاغا فەتحوڵلا، یەکێك بوو لە برادەرە هەرە نزیکەکانم، ساڵی ١٩٧٤ سەنگەری شۆڕش لە ناوپردان بەیەکەوە کۆی کردینەوە، کوردێکی خوێندەوارو ڕەسەن و چاونەترس بوو، بە ئاگاداریی خۆم لە سەرەمەرگیشدا عەوداڵی هەواڵی یەکریزیی کورد بوو، پشتی بە خاتوو شەهبال ماجید مستەفای هاوسەری زۆر قایم بوو.

((تەجمید))(126)(*) کرد کە کۆمۆنیست نەبوون، لەوانە ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری گشتیی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) و جەلال تاڵەبانی خۆی. کوردی عیراق لەم دواییانەدا لەسەر بە کۆمۆنیزمەوە گۆڕدران بۆ نەتەوەپەرستی رووت، ئەوان حەز دەکەن ڕۆژئاوا پشتی ئاواتەکانیان بگرێت.

---

(126) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: "frozen".

(*) ((ئالێرەدا (ڕاپۆرتنووس)، وەکو هەندێ لە کادیرانی حیزبەکە خۆی، کەوتۆتە هەڵەیەکی زۆر زەق و گەورەوە، دوو ڕووداوی ناو مێژووی "پارتی" تێکەڵ و پێکەڵ کردووە. یەکەمیان لابردنی "برایم ئەحمەد"ە وەکو سکرتێری گشتی ئەوسای پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان بووە، کە ئەم ڕووداوە لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٩دا بووە، هەر لەگەڵ ئەویشدا ئەندامیەتی "تاڵەبانی" هەڵپەسێردراوە، واتە (تەجمید) کراوە، تا لێرەدا ئەو هەڵپەساردنە دەقوزمەوەو لەسەر زاری "ممتاز حەیدەری" ئەو ڕووداوەی ناو حیزبەکانی ئەوساتان بۆ دەگێڕمەوە، ناوبراو دەڵێ: ئەوسا ئێمە لەیەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان بووین، لەلایەن مامۆستا کەمال عەبدولقادر نەشئەتەوە، کە ئەوسا مەسئوولی من بوو لەپارتی، پێمان ڕاگەیەنرابوو کە مام جەلال، پێشمواپە ئەوسا ناوە نهێنییەکەی "شۆڕش"بوو، تەجمید کراوە. بەڕێکەوت یەکێتی لاوانی دیموکراتی عیراقی بۆ سەردانی بارەگای یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانیان دەکرد. مام جەلال و شێخ لەتیف و یەك دوو کەسی دیکەمان لەگەڵ بوو، لەناو مەراسیمەکەدا لەبارەگای لاوان، کە لەنزیك چاپخانەی سەید مەجید بەرزنجی بەرانبەر دائیرەی کارەبا بوو، مام جەلال دەیویست لەکۆبوونەوەکەدا چەند قسەیەك بکات، ئەوەبوو منیش پێیم گووت: بەپێی بڕیاری حیزب تۆ (تەجمید) کراوی، بۆیە لەو کۆبوونەوە حەقی قسەکردنت نییە. ئەویش بەگیانێکی حیزبییانە قەبوڵ کردو گوتیشی باشە قسە ناکەم!).

(ئەو چەند دێڕەی سەرەوەم، کە لە سلێمانی بوو، لەبەردەنگی تەلەفۆنی مۆبایل نووسیوەتەوە).

هەرچی دوور خستنەوەی پێنج کەسەکەی دیکەیە ئەوە لە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩دا بووە، ئەوەبوو لە کۆبوونەوەی هەندێ لە کادیرە پێشکەوتووەکانی پارتی، بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا، بڕیاری دوور خستنەوەی ئەو کەسانە دراوە، ڕۆژنامەی (خەبات)و بارەگاکەیان، کە ئەوسا هەر بارەگای ڕۆژنامەی (خەبات) بووە، لێ سەندراوەتەوەو برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی گەڕاونەتەوە ناو حیزب، ئەوەی شایانی باسە ئەوسا لەکاتی ئەو ڕووداوانە براهیم ئەحمەد لەگەڵ وەفدێکی عیراق لەوڵاتانی باکووری ئەفەریقا بووە، هەموو ئەو پرسانەیشم لەم بابەتەدا باس کردووە کە بەناوونیشانی (دادگاییکردنی خەبات) لەژمارە (٢،٣،٤)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی)ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان لەساڵی ٢٠٠١دا بڵاوکراونەتەوە ـ ع. زەنگەنە)).



سالّح حەیدەری حەمید عوسمان

ئەگەر بێتو ڕۆژئاوا ئۆستی کوردی عیراق بێت ئەوا جارێکی دیکە دەرفەت بۆ کۆمۆنیزم هەڵناکەوێت لە کوردستاندا سەر بەرز بکاتەوە. هەرچۆن بێت کورد زۆر پێویستییان بە یاریدە هەیە، لە هەر کوێیەکەوە بێت، ئەگەر پێویست بکات ئامادەن هاریکاریی شەیتان بکەن بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانیان بگەن. خۆ ئەگەر ڕۆژئاوا یاریدەیان نەدات ئەوساکە ئەوان درێژە بە خەباتی خۆیان دەدەن لەگەڵ یاریدەی (لایەنی دیکە)[127]. پێویست ناکات تورکیاو ئێران مەترسییان (لە شۆڕشی کورد– ک. م.) هەبێت، چونکە کوردی عیراق تەنها بۆ خۆیان بیر لە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی عیراقدا دەکەنەوە، پێویستە ئەوانیش حەز بکەن ئەوەمان بۆ جێبەجێ ببێت. خۆ ئەگەر هاتو کارەکان بە ڕێگەیەکی چەوتدا بڕان بەڕێوە[128] ئەوساکە بێگومان کوردستان دەبێتە کۆریایەکی باکوور ڕۆژهەلات

(127) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

If the west did not help them would continue the struggle with help from ((other)).

(128) دیارە مەبەست هەڵوێستی تورکیاو ئێرانو سووریاو تایبەت وڵاتە ڕۆژئاواییەکانە.



خەسرۆ تەوفیق



نەژاد ئەحمەد عەزیز ئاغا

بەرلینێکی یا کوبایەکی دیکە. بەلام ئەگەر دژانی کۆمۆنیست یاریدەی کورد بدەن ئەوا بەو کارەیان بۆ ماوەی پەنجا ساڵی داهاتوو کۆمۆنیزم لە باکووری (عێراق– ک. م.) بنبڕ دەبێت. ئەمە دەرفەتێکی لەبارە بۆ ڕۆژئاوا هەڵکەوتووە بۆ ئەوەی پەیوەندیی بە کوردەوە چاک بکاتو بەو جۆرە وەرچەرخانێکی مێژوویی بێتە کایەوە.

ئەوان (واتا تاڵەبانیو عەقراوی– ک. م.) ئەوساکە داوایان لێ کردم بە تەحدید پێیان بڵێم سیاسەتی حوکمەتی خاوەن شکۆ لەگەڵ کوردی عێراقدا چۆن بوو، ئایا لەگەڵیان بوو یا لە دژیان بوو، یا بێلایەن بوو ؟. ئەوان وەڵامێکی روونو بێ پێچو پەنایان ویست، وەڵامێکی دوور لە زوبانی ڕازاوەی دیپلۆماسی[129]، هەروەها ویستیان ئەوەیش بزانن ئایا ئێمە دەتوانین ئێرانو تورکیا قایل بکەین کە هیچ کارێکی دوژمنانە دژی بزووتنەوەی خودموختاریو بێوەیی کوردی عێراق

---

(129) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((by working to reforce the partnership of all counrtrymen))

ئەنجام نەدەن‌و ئایا دەتوانین، ئەگەر لە تواناداد بێت، نفوزی خۆمان لەگەڵ حوکمەتی عیراقدا بەکار بهێنین بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی عادیلانەی کێشەی کورد. گووتیشیان هەر یاریدەیەکی مەعنەوی یا مادیی کورد بدەن بە دڵخۆشی وەردەگیرێت. ڕۆژئاوا دەتوانێت سەد دەرسەد لەوە دڵنیا بێت کە کوردی عیراق کۆمۆنیست نەبوون. (تاڵەبانی گووتی- ک. م.) من بۆ بەریتانییەکان باسی سیاسەتی دەستێوەرنەدانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە کاروباری ناوخۆی یەکدیدام کرد، بەڵام ئەوان، دیار بوو، بەو قسانەی من قایل نەبوون. لە کۆتایی دیدەنییەکەدا تاڵەبانی بە گاڵتەوە گووتی: قاسم ئێمە (واتا بەریتانییەکان- ک. م.)ی ناچار کرد پێنج هەزار پاوەن بدەینە کورد، بەڵام کوا ئەو پارەیەی ئێستاکە ئێمە موحتاجی پوولێکین ؟.

لە بیست‌و هەشتی شوباتەوە بارودۆخەکە روو لە خراپ بوون دەکات. تاڵەبانی گەڕاوەتەوە باکوورو بەپێی ڕاپۆرتەکان گوتوویەتی ئامادەیە بچێتەوە بەغدا ئەگەر مەلا مستەفا فەرمانی ئەوەی بداتێ. ڕۆژی شەممە، ڕێککەوتی دووی مارت (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) بەیاننامەیەکی دەرکرد کە تێیدا سووربوونیانی دەربڕیوە لەسەر (نەهێشتنی هیچ پاشماوەیەکی ڕژێمی بێزراوی قاسم... لە ڕێگەی کارکردنەوە بۆ داسەپاندنی هاوبەشیی لەنێو گشت هاووڵاتیاندا.. بۆ مسۆگەرکردنی مافەکانی برا کوردەکانمان... بۆ بنیاتنانەوەی وڵات... بۆ دامەزراندنی حوکمەت لەسەر بناغەی یەکسانی‌و بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی... بۆ مسۆگەرکردنی یاساو نیزام... هتد)[130]. ڕاستە هەموو ئەمانە دیاردەی قێزەونن، بەلام ئاواتی هەمووان ئەوەیە گوێبیستی ڕاگەیاندنی هەواڵی مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەك بن.

ئێمە تاوەکو ئێستا نەمانزانیوە ئەو خاڵانە چین کە بوونەتە کۆسپ لەبەر دەم وتووێژدا. دەنگوباوێك هەیە کە نوێنەرانی جاف[131] و زێباری (ئەوانەی هاریکارییان

---

(130) شایانی باسە ئەو خاڵە یەك لەدوای یەکانە بەو جۆرە لە دەقی بەڵگەنامەکەدا هاتووە.

(131) دیاردەیەکی ئاساییە لە هەل‌و مەرجی وەك کوردستاندا لە نێو سەرکردەی هۆزەکاندا بیروبۆچوونی جیاواز دروست ببێت، ئەگەر بەو گەزەیش هۆزی گەورەی جاف بپێوین دەڵێین گوڵاڵە

لەگەڵ بزووتنەوەکەی بارزانیدا نەکرد) هاتوونەتە بەغدا، لەوانەیە حوکمەت بەوە قایل نەبوویێت کە مەلا مستەفا وتوویژ بە ناوی سەرجەمی کوردستانەوە بکات.
وەزیری هەندەرانی عیراق بە جێگری باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای گوتووە: کورد داوای ئۆتۆنۆمیی تەواو دەکەن، بەڵام بۆ ئەوەی پێمان بڵێن ئەوان مەبەستیان لەو قسەیە چییە. (بەپێی قسەی ئەو- ك. م.) حوکمەت حەز دەکات خودموختارییەکی کارگێڕیو رووناکبیریو ژمارەیەکی عادیل ئەندام لە وەزارەتداو لە حوکمەتی ناوەندیدا بداتە کورد، چونکە ئەوان ناتوانن لەوە پتریان بدەنێ لە ترسی ئەوەی نەبا کەمینەکانی دیکەی وەك شیعەو تەنانەت گاورەکانیش داخوازیی وەك ئەوانەی ئەوان داوا بکەن. وەزیر گوتیشی وا پێ ناچێت بارودۆخەکەی ئێستا باش بێت.
بیستومانە چۆن ئەو ئەفسەرانەی پشتگیریی رژێمی قاسمیان دەکرد سووکایەتییان بە کورد دەکرد، بیستووشمانە پاکسازییەکی زۆر لە ریزەکانی فڕۆکەوانەکاندا دەکرێت هەرچەندە لەبەر دووریی بەئاسانی دەستمان بە بنکە فڕۆکەوانییەکاندا ناگات تاوەکو لە نزیکەوە بزانین شتی وا دوای شۆڕش رووی داوە یا رووی نەداوە، بەڵام هەرچۆن بێت لەوە ناکات وەزعی حوکمەت زۆر باش بێت.

ئیمزا
ر. دەبلیو. مۆنرۆ)).[132]

---

سوورەکەی ئەحمەد موختار جافو جوانڕۆکانو دوکتۆر ئەکرەم جافو ئالاکانی کوردستانو وێنە رازاوەکانی ماڵی بەهێ خانی حامید بەگی جاف کە بە تەمەنی نەوەت سالییەوە بە سەرپەرپێچی لاری رەسەنی کوردەوارییەوە نەك هەموو رۆژ شەقامەکانی لەندەن تەی دەکات، بەڵکو بەر لە زۆربەی گەنجەکان ئامادەی گشت ئاهەنگو کۆڕو خۆنیشاندانەکانی کوردی ئەم وڵاتە دەبێت، ئەمانەیش چەند نموونەیەکی کەمی دەیانو دەیان نموونەی دیکەی وەك خۆیانن.
(132) N.A., F.O., 371/170434, Confidential From: R.W. Monro, British Embassy, Baghdad, No. 10113/31/63, March 5, 1963, To: D.L.N. Goodchild, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

لە هەمان فایلدا وێنەی دوو ڕۆژنامەی لەندەنی هەڵگیراون، کە هەردووکیان بە گومانەوە باسی هەڵوێستی ڕژێمی بەعس دەکەن بەرانبەر پرسی کوردی عیراق لەو ڕۆژگارە ناسکەدا، یەکەمیان ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلێگراف))ە کە ڕۆژی یازدەی مارتی ١٩٦٣ لە زاری ئاژانسی ڕۆیتەرەوە وتارێکی بەم ناونیشانەوە بڵاو کردۆتەوە ((کورد مافە نەتەوەییەکانیان پێ درا– بەپێی ئیدیعای عیراق))[133]. لە وتارەکەیدا ((دەیلی تێلێگراف)) تەنها لە زاری ڕۆیتەرو ئیزگەی بەغداوە دەدوێت‌و نەخشەیەکی باکووری عیراقیشی چاپ کردووە.

وتاری دووەمیان هی ڕۆژنامەی ((گاردیان))ـە، کە ئەویش لەهەمان یازدەی مارتدا وتارێکی درێژی بەم ناونیشانەوە بڵاوکردۆتەوە: ((کوردستان لە عیراقدا))[*] ناوی نووسەرەکەی لەسەر نییە، بۆیەکا دەبێ بەڕاو بۆچوونی ڕۆژنامەکە دابنرێ. ((گاردیان))یش وەك ((دەیلی تێلێگراف)) دوای ئەوەی باسی بەیاننامەکەی ((ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش)) دەکات ئینجا دەڵێت:

((ڕاپۆرتەکان بە ڕوونی بۆمان دەرناخەن ئەم عەرزە چی دەگەیێنێت، یا هیچ نەبێت ئەو کوردەی ڕاپەڕیوە پێی قایلە. جەنەڕاڵ بارزانیی ڕابەریان قایل نییە بەو گفتە غامیزانەی ڕەهبەرانی نوێی عیراق دەربارەی (مافەکانی)[134] کورد دوای ئەوەی هاتنە سەر حوکم دایان. گفتوگۆکانی بەغدا لە نێوان نوێنەرانی جەنەراڵ بارزانی‌و حوکمەتی عیراقیدا گەیشتە لێواری ڕووخان[135] تا وەفدێکی باڵای میری گەیشتە بارەگای جەنەراڵ بارزانی لە شاخەکاندا. ئایا کوردەکان پتر لە خودموختاریی کارگێڕییان دەوێت، یاخود داخوازیی دیکەیشیان هەیە، هی وەك بەشێك لە داهاتی نەوت بە سەرپەرشتیی خۆیان، تەنانەت کشانەوەی هێزە عیراقییەکان لە ناوچە کوردییەکان تاوەکو هێزی کوردییان تێ بچێت.

---

(133) Ibid, Kurds Given "Notional Rights" –Iraq Claim, "Dialy Telegraph", 11 March, 1963.

(*) Ibid ((Kurdstan in Iraq)), ((The Gurdian)), 11 March, 1963.

(134) لە دەقی وتارەکەی ((گاردیان))دا وشەی مافەکان ((rights)) بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچوکەوە.

(135) لە دەقی وتارەکەدا وا هاتووە: ((verge of breaking)).

ئەمە بۆ خۆی کارێکە هیچ حوکمەتێکی عیراقی بەر لەم حوکمەتە نەیکردووە. لەوانەیە کارێکی وا پێویستی بەدەست تێوەردانی ڕەهبەرێکی پان ئەرەبیزم هەبێت[136]. زۆریشی نەبرد دوای ئەوەی وەفدی وتووێژی کورد گەیشتە بەغدا هەتا لەگەڵ وەفدی عیراقدا پێکرا فرین بۆ قاهیرە بۆ بەشداریکردنی ئاهەنگەکانی یادی دامەزراندنی کۆماری عەرەبیی یەکگرتوو. لەوێ هەردووك لا سەرۆك عەبدولناصریان بینی، دەشڵێن هەردووك لا پشتگیرییکردنی ئەویان مەبەست بوو، نەبا دوایی هێرش بکرێتە سەر ڕێککەوتننامەکە، وەك ڕێککەوتننامەیەکی دژ بە خاکی عەرەب. تەنها ئەو عەرەبانەیش دەتوانن هەنگاوێکی لەو جۆرە بنێن کە هیچ گومانێك لە دڵسۆزییان ناکرێت. ئەمەیش خاڵێکە لەو خاڵانەی لە لایەن ئیسرائیلەوە ناخرێتە پشت گوێ.

تەنانەت ئەگەر هەردووك لا (میریو کورد– ك. م.) ڕێك بکەون ئینجا پێمان وا نییە ئیتر هەموو شت دەبڕێتەوە، هەرگیز پەیوەندیی نێوان کوردو عەرەبی عیراق لە ڕۆژانی دوای شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ باشتر نەبووە، بەڵام ئەوە تەنها لە ماوەی سێ ساڵدا تێك نەچوو. گریمان ڕێککەوتنەکە سەری گرت، بەڵام ئەو کێشانەی لێی چاوەڕوان دەکرێن دوور نییە لەخۆی ئاڵۆزتر بن نەك تەنها لە چوارچێوەی عیراقدا، بەڵکو لەنێو دراوسێکانی عیراقیشدا. تەنانەت ئەوە کۆمپانیای نەوتی عیراقیش دەگرێتەوە کە زۆربەی بیرە بەرهەمهێنەرەکانی کەوتوونەتە ناو خاکی کوردەوارییەوە، زۆریش ئاڵۆزو ستەمە لەگەڵ دوو دەسەڵاتدا کار بکەیت، تەجروبەی ئەو کۆمپانیایە لەگەڵ حوکمەتەکەی جەنەراڵ قاسمدا زۆر تاڵ بوو.

کورد لە سووریاو ئێران و تورکیا، ژمارەیەکی کەمیشیان لە یەکیەتی سۆڤیەت هەن. ئەوان بەگشتی دوای تەواوبوونی جەنگی یەکەمی جیهان تووشی خەیبەت هاتوون، چونکە ئاواتەکانیان لە بواری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی

---

(136) مەبەستی جەمال عەبدولناصرە.

شایانی باسە بەعسییەکان جەمال عەبدولناصریان خۆش نەدەویست، هەرگیز ئەوە لەیاد ناکەم کە ئەیلوولی ساڵی ١٩٧٠ عەبدولناصر کۆچی دوایی کرد چۆن بەعسییەکان بە تێلا بەرێوونە گیانی ئەو قوتابییانەی کە ویستیان پرسەیەکی ڕەش بە قاپیی دەرەوەی کۆلیجی ئادابدا هەڵبواسن‌و چۆن پارچە قوماشەکەیان دڕاند.

کوردستان نەهاتنە دی. بە هەر حاڵ کورد، وەك یەکێك لەو کەمینە نەتەوەییە بایەخدارانەی لە لایەن بێگانەوە حوکم دەکرێن، هەمیشە گوماندارن‌و مەیلی شۆڕشیان هەیە. هەڵسوکەوتی فەرمانڕەوایان لەگەڵ کورددا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگۆڕدرێت، تورکیا تەنانەت وەك دەستەیەکی جیاواز دان بە بوونیشیاندا نانێت.

ئێستا وا پێدەچێت یەکێك لە شۆڕشەکانی کورد سەرکەوتبێت، دوای هەژدە مانگ لە شەڕ، حوکمەتێکی عەرەب دانی بە مافی ئۆتۆنۆمییاندا ناوە. تەنانەت ئەگەر کوردەکانی دیکەی ئەودیو سنووریش بە چاوی بناغەیەك بۆ دامەزراندنی حوکمەتێکی یەکگرتووی کوردستان سەیری ئەو حوکمەتە ئۆتۆنۆمییەی باکووری عیراق نەکەن خۆ هیچ نەبێت پێویستە بە چاوی نموونەیەك کە دەشێت بۆ ناوچەکانی خۆیان لاسایی بکەنەوە.

هەرچۆن بێت ئەوانەی تاوەکو ئێستا گووتمانن لایەنی تیۆریی (نەزەریی) بابەتەکەن، تایبەت سەبارەت بە ئەگەری بەرەنگاربوونەوەی فەرمانڕەوا نوێکانی عیراق لەگەڵ مەترسیی (شەڕدا– ك. م.) کە لە ڕاستیدا لەوانەیە شەڕێکی کاولکاریی بێت‌و لەوانەیشە ببێتە هۆی کەوتنی حوکمەت. ئەوان شایانی پیرۆزباییین بۆ ئەو ئازایەتی‌و دووربینییەی لە مامەڵەکردنی کێشەکەدا پەیڕەویان کرد، خۆ ئەگەر هاتو چارەسەرکردنی کێشەکە نەبووە هۆی مسۆگەرکردنی پێکەوە ژیانی برایانەی عەرەب‌و کورد لەژێر سایەی یەك دەوڵەتی عیراقیدا، ئەوا هەر هیچ نەبێت هەنگاوێکی هیوابەخشی چاکترە وەك لە بەردەوامبوونی شەڕ))[137].

لێرەدا پرسیارێکی ڕەوا دێتە پێشەوە: تۆ بڵێی فەرمانڕەوایانی بەعسی ئەوساو دوای ئەوانیش ئەم جۆرە لێکدانەوە قووڵانەی وەك ئەمەی ڕۆژنامەی ((گاردیان))یان خوێندبێتەوە ؟، پێم وایە ئەگەر خوێندبێشیانەوە کەڵکیان لێی وەرنەگرتووە، ئەگینا نەدەبوونە هۆی ئەو هەموو نەهامەتییانەی گەلانی عیراق تووشیان هاتوون !.

---

(137) N.A., F.O., 371/170434, Kurdistan in Iraq ?, -"The Gurdian", 11 March, 1963.

سەرجەمی ئاڵوگۆڕە یەك لە دوای یەکەکانی ئەو ڕۆژگارەی عێراق ئاڵۆزبوونی گێروگرفتە زۆرەکانی ڕژێمی بەعس دەخەنە ڕوو، ئەو ڕاستییەی دیسانەوەو بە ڕوونی ئەوە نیشان دەدەن چۆن ڕژێمی بەعسی هەوڵی دەدا بە بزگورکی پینەو پەرۆ دەلاقەکانی جەستەی ڕژێمەکەی داپۆشێت. بە وێنە ڕۆژی حەوتی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ سێ وەزیری قورسی سەر بە جەمال عەبدولناصر ئیستیقالە دەدەن– ڕەجەب عەبدولمەجید و ناجی طالب و دوکتۆر محەمەد جەواد ئەلعبوسی[138] کە جێگەیان بە چەند کەسێکی وەك حەمید خەڵخالی[139] بەعسی پڕ دەکەنەوە[140].

ئەو جۆرە کردارانە هێندەی دیکە ناحەزانی ڕژێمی بەعسییان هان دەدا بۆ دارشتنی پلانی قوتار کردنی عێراق ڕۆژێك زووتر لە دەست ئەو ڕژێمە. ڕۆژی بیستی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣ حاکمی سەربازیی گشتیی عێراق فەریق ڕەشید موسڵیح بەیاننامەیەك دەربارەی ((دۆزینەوەی تەڵەکەی سیخوڕی لە عێراق)) ڕادەگەیەنێت کە باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغداو ڕۆژنامە بەریتانییەکان گشت هەواڵەکانی ڕادەگەیێنن‌و وا لە خوارەوە چەند نموونەیەك پێشکەش دەکەین‌و سەرەتا بە دەقی وەرگێڕانی نووسینێکی ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلێگراف)) دەست پێ دەکەین:

---

(138) لە ڕێگەی خوالێخۆشبوو مەسعوود محەمەدەوە لە نزیکەوە خوالێخۆشبوو ڕەجەب عەبدولمەجید و ناجی طالب و صوبحی عەبدولحەمیدم ناسی، زوو زوو پێکەوە لە ماڵی ڕەجەب عەبدولمەجید کۆ دەبووینەوە، بەر لەوە دەمزانی ڕەجەب عەبدولمەجید ئەفسەرێکی ئەندازیاری لێهاتوو بووەو یەکەم شانەی نهێنیی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانی ناو سوپای عێراقی ئەو دایمەزراندووە، بەڵام تاوەکو لە نزیکەوە نەمناسی هەرگیز نەمدەزانی چەند پیاوێکی کراوەو خوێندەوارو کوردی خۆش دەوێت‌و لە نزیکەوە پەیوەندیی تایبەتیی بە تاڵەبانییەوە هەیەو بڕوای بەوەیە کورد دەبێت دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێت، خوالێخۆشبوو (دایکی محەمەد)ی هاوسەریشی، کە بە ڕاستی شاژن بوو، کوردی فەیلی بوو.

(139) بیرم دێت حەمید خەڵخال لە ناوەندی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا لە ((دار المعلمین العالیة))دا لەگەڵ ئێمە قوتابی بوو، پێموایە ساڵی ١٩٥٧ زانکۆی تەواو کرد، بەعسییەکی دڵسۆزو بێ وەی بوو.

(140) N.A., F.O., 371/170441, ((The Iraq Times)), Baghdad, October 8, 1963.

((دۆزینەوەی پیلانی سیخوڕانی عیراق،
ڕۆڵی ئەفسەرە دوورخراوەکان،
لە هەواڵنێرمانەوە،
بەغدا،
ڕۆژی یەکشەممە.

حاکمی عەسکەریی گشتیی عیراق فەریق ڕەشید موسڵح ئیمڕۆ (واتا بیستی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣- ک. م.) ڕایگەیاند تۆڕێکی سیخوڕیی دۆزراوەتەوە کە کاریان دەکردو پارەیان دابەش دەکرد دژی کۆماری عیراق‌و گووتی: پیلانگێڕەکان ئەفسەری دوورخراوەی سوپاو (پیاوانی توندڕەوی ڕژێمی) جەنەڕاڵ قاسمن.

هەمان کات فەریق موسڵیح گووتیشی پیلانگێڕەکان ((پەیوەندییان بە بێگانەو ئیمپریالیستیەکانەوە لە ڕێگەی سنوورەوە هەبوو. لە ڕاگەیاندنەکەیدا فەریق ڕەشید موسڵیح گووتی: سەرجەمی بەشدارانی ئەو پیلانە دەستگیر کراون‌و شەوی پێنج شەممەی داهاتوو دەدرێنە دادگای شۆڕش))[141].

((تایمس))ی لەندەنیش کە لە هەمان فایلدا هەڵگیراوە هەمان هەواڵی بەم جۆرەی لای خوارەوە بڵاو کردۆتەوە:

((لە عیراق ئەفسەرە دوورخراوەکان دەستگیر دەکرێن،
لە هەواڵنێری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستمانەوە،
بێروت،
بیستی تەشرینی یەکەم.

دۆزینەوەی پیلانێکی دیکە دژی حوکمەتی بەعس لە بەغدا ڕاگەیێندرا. بە پێی قسەی حاکمی عەسکەریی گشتیی عیراق فەریق ڕەشید موسڵیح، ژمارەیەك ئەفسەری دوورخراوەی سوپا کە لایەنگری ڕژێمی پێشوون‌و سەر بە دەرەبەگەکانن، دەستگیر کران‌و بەم زووانە دادگایی دەکرێن.

(141) Ibid, ((Iraqi Spy plot Discovered)), -((Daily Telegraph)), 21 October, 1963.

**فەریق موسڵیح گووتی پیلانگێڕەکان پارەیان بەشیوەتەوەو لە ڕێگەی سنوورەوە پەیوەندییان بە بێگانەو یاخیگەرانی کوردەوە لە باکووری عێراق کردووە. هەروەها گوتیشی ئەوان دەیانویست (هیلالی خەسیب)[142] دامەزرێنن.**

**بیرۆکەی هیلالی خەسیب بیرۆکەیەکی کۆنەو ئامانجی سەرەکیی بریتییە لە یەکگرتنی عێراق‌و سووریاو لوبنان‌و ئوردون))[143].**

**لاپەڕەی دواتری هەمان فایل بریتییە لە بروسکەیەکی دوورو درێژی کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکەی ڕەشید موسڵح لە ڕۆژی نۆزدەی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣دا، وێڕای گوتەیەکی سەرەك وەزیرانی ئەوسای عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر کە دەربارەی هەمان بابەت لە کوت خوێندبوویەوە. لەم بروسکەیەدا ناوی کورد بەم جۆرە هاتووە:**

**((حاکمی عەسکەریی گشتی گووتیشی: ئێمە بەڵگەی تەواومان بە دەستەوەیە کە ئەندامانی ئەم دەستەیە پەیوەندییان بە یاخیبوونەکەی بارزانییەوە هەبوو، بەڵگەمان بە دەستەوەیە نیشانی دەدەن کە ئەوانە شعوبین و[144] دژی لایەنە عەرەبییەکان کار دەکەن‌و پیلان دژی کۆماری عێراق دەگێڕن. گشت عێراقییەك‌و گشت عەرەبێك ئێستا دژی یاخیبوونەکەی بارزانین چونکە ئەو پیاوە پارچە پارچەبوونی عێراقی دەوێت. ئێمە دەمانەوێت ڕای گشتی لەوە دڵنیا بکەین کە لە پیلانەکەدا ژمارەیەك لە ئەفسەری دوورخراوەی ڕژێمی کۆڕ بە کۆڕو دەرەبەگی بەشدارمان دەستگیر کردووە))[145].**

---

(142) ((هیلالی خەسیب)) (Fortile Crescent) پرۆژەیەکی سیاسیی بوو کە بەشێك لە نەتەوەپەرستانی عێراق‌و سووریا باوەڕیان پێی بوو، کردبوویانە دروشمی ڕۆژانەی خەباتی خۆیان لەپێناو یەکگرتنی سووریای گەورەو عێراقدا، بەعسییەکان بە توندی دژی ئەو پرۆژەیە بوون.

(143) N.A., F.O., 371/170441, ((Ex- Officers held in Iraq)), -((The Times)) 21 October, 1963

(144) ((شعوبي)) زاراوێکی کۆنە بە گەلە موسڵمانەکانیان دەگوت‌و لە سەروو هەموانیشەوە بە فارس، گوایە ئەو نەتەوانە بە درۆ بوونەتە موسڵمان تا لەو ڕێگەیەوە کنە بکەن‌و زەفەر بە ئیسلام بەرن، بەعسییەکان زوو زوو ئەو زاراوەیان لە نووسینەکانی خۆیاندا دووپات دەکردەوەو وەك پلارو توانج دژی هەموان- کوردو فارس‌و عەجەم و شیوعی و تەنانەت بۆ نیشتمانپەروەری وەك کامیل چادرچیش بەکاریان دەهێنا.

(145) N.A., F.O., 371/170441, Arrests of Spies in Baghdad, Experts of report of statement by Gen. Rashid Muslih, Military Governor- General.

بەڵگەنامەیەکی دیکەی ناو هەمان فایل، لە زاری ئێزگەی لەندەنەوە، بەم جۆرەی لای خوارەوە ناوی دەستگیرکراوەکانی تۆمار کردووە: جەنەڕاڵ محەمەد ڕەشید جەنابیو کۆلۆنێل ساڵح مەهدی سامەڕائیو کۆلۆنێل یاسین محەمەد ڕەوفو تۆفیق سوێدیو لوئەی تۆفیق سوێدیو جەمال بابانو ئەحمەد موختار بابانو جەواد عەبدولهادی چەلەبیو فەریق غازی داغستانیو کۆلۆنێل عەلی بەدریو کۆلۆنێل محەمەد شێخ لەتیف و دادوەر جەودەت هندیو شێخ عەلی شەعلانو شێخ طالب سوهێلو[146] لیوا ڕوکن شەمسەددین تۆفیق عەزاویو[147] شێخ ساڵح طەلالو عیسا مەحموود و پارێزەر سدیق عەبدولهادی بەسامو ذەرب قەسسارو جەنەراڵی فرۆکەوان جەسام محەمەد شاهریو صاحیب محەمەد مەلا مەحموود و ژمارەیەکی تر[148]، دووان لە دەستگیرکراوەکان لە ڕۆژگاری پاشاییدا سەرەك وەزیران بوون– تۆفیق سویدیو ئەحمەد موختار بابان، ژمارەیەکیشیان وەزیر بوون هی وەك جەمال بابانو عەبدولهادی چەلەبی، کە ماوەیەکیش سەرۆکی ((ئەنجوومەنی پیران)) (مجلس الاعیان) بوو.

هەرچۆن بێت کورد دەوری لە لاوازکردنی خێرای ڕژێمی بەعسدا کەم نەبوو ، ئەو ڕژێمەی مۆرانە لە هەموو لایەکەوە کنەی دەکرد لە جەستەیداو بە شێوازێکی چاوەڕوان نەکراوو دراماتیکی لە تەمەنی نۆ مانگیدا رووخا.

---

(146) شایانی باسە ژنێکی لوبنانیی هەبوو، سەفییەی کچی کە ئافرەتێکی لێهاتووەو ئێستا ئەندام پەرلەمانە، هاوسەری دوکتۆر بەختیار ئەمینە کە یەکێك بوو لە وەزیرەکانی کابینەکەی ئەیاد عەلاوی.

(147) لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولکەریم قاسمدا دوو دادگای سەربازی هەبوو، سەرۆکی یەکەمیان شەمسەددین تۆفیق عەزاوی بوو کە پیاوێکی کۆنەپەرست بوو، کاری ئەو دادگایە دادگاییکردنی پێشکەوتنخوازەکان بوو، دادگای سەربازیی دووەم بە سەرۆکایەتی عەقید ئیبراهیم غەزالی بوو کە تەرخان کرابوو بۆ دادگاییکردنی کۆنەپەرستەکان، دوای کودێتای هەشتی شوباتی ١٩٦٣ ناچار بوو لە ڕێگەی ئێرانەوە بە قاچاغ پەنا بەرێتە بەر یەکیەتی سۆڤیەت، لەوێ لە نزیکەوە ناسیم، بە پێی توانا خزمەتم کرد، خێزانی لە بنەماڵەی محەمەد مەهدی کوبەیە.

(148) N.A., F.O., 371/170441, BBC Mon Testing, Iraq Plot Trail.

# کەوتنی کتوپڕی ڕژێمی بەعس
# لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی
# حوکمەتی بەریتانیادا

دیپلۆماسییە بەریتانییەکان، وەك چاوەڕوان دەکرا، بە وردی دووی گشت هەواڵەکانی کەوتنی یەکەم ڕژێمی فەرمانڕەوایی بەعسو دیاردەو ئەنجامەکانی ئەو کەوتنە کتوپڕە کەوتن، بۆیەکا ژمارەیەکی یەکجار زۆر نامەو بەڵگەنامە و بروسکەی نهێنیی، وێڕای نووسینی ڕۆژنامە و هەواڵنێرەکان، لە فایلەکانی ئەرشیفی نیشتمانیی حوکمەتی بەریتانیادا، دەربارەی ئەو ڕووداوە، هەڵگیراون و ئەمەی لای خوارەوە چەند نموونەیەکی هەڵبژاردەیانن.

باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا، ڕۆژی سیازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ ئەم نامە ((پەلەو نهێنی))یەی دەربارەی دوورخستنەوەی عەلی ساڵح سەعدیی ناردووە، بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن:

((لە بەغداوە،

بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ڕۆجەر ئەلێن،

ژمارە ١١٧٠،

١٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣،

پەلەو نهێنی.

بۆ ئاگاداری وێنەی ئەم نامەیە نێردراوە بۆ هەریەك لە باڵوێزخانەکانمان لە دیمەشق و بێروت و قاهیرە و عەمان و مەدرید.

١- تاوەکو ئێستا حوکمەتی عیراق هەواڵی دوورخستنەوەی عەلی ساڵح سەعدیی جێگری سەرەك وەزیرانی بۆ ئیسپانیا ڕانەگەیاندووە، ئەوەی شەوی یازدە لەسەر دوازدەی تەشرینی دووەم ڕووی دا. وا دیارە چوار کەسی دیکە لەگەڵ سەعدیدا دوورخراونەتەوە، یەکێکیان وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتییە، وێڕای دوو ئەندامی (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) کەوا پێ دەچێت



ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر

یەکێکیان سکرتێری ئەو ئەنجوومەنە بێت، چوارەمیشیان وەنداوییە کە لەم دواییانەدا لە سەرکردایەتیی (حەرەسی قەومی) دوور خرایەوە.

٢- وا دیارە ئەم کودێتایە لەلایەن سەرەك کۆمار (عەبدولسەلام عارف- ك. م.) و سەرەك وەزیران (ئەحمەد حەسەن بەکر- ك. م.)ەوە بە پشتگیریی میانڕەوەکان ساز کرابێ. گەرچی بەغدا بە شائیعات تەنراوە، بەڵام تاوەکو ئێستا هێمنە. ئیمڕۆ بەیانی ژمارەیەك فڕۆکە بە نزمی بەسەر بەغدادا فڕین، هەروەها وا دیارە ڕەکیتێك یا بۆمبایەك گیراوەتە وەزارەتی بەرگری))[149].

هەمان ڕۆژ، پاش تەنها سێ سەعاتو سێزدە دەقیقە، باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا بروسکەیەکی دیکە دەربارەی هەمان بابەت دەنێرێت بۆ وەزارەتی هەندەران لە لەندەن کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕاوەکەیەتی:

(149) N.A., F.O., 371/170441, From: Baghdad, To: Foreign Office, London, Sir Roger Allen, No. 1170, November 13, 1963, Emergency, Immediate.

((لە بەغداوە،

بۆ وەزارەتی هەندەران،

سێر ڕۆجەر ئەلێن،

ژمارە ١١٧٤،

١٣ی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣،

پەلەو نهێنی.

بۆ ئاگاداری وێنەی ئەم بروسکەیە نێردراوە بۆ هەریەك لە باڵوێزخانەكانمان لە دیمەشق و عەمان و قاهیرە و بێروت.

١- چەند حاڵەتێکی پچووکی تەقە بە چەکی سووکی لێ دەربکەیت، بەغدا هێمنە. قەنناسێك بەرپرسی ئەو هێرشە ئەرزییەی سەعات نۆو چارەك بوو كە لە پەرەگرافی دووی بروسکەی پێشوومدا ئاماژەم بۆی کردبوو، ئەو کەسە دەورووبەری سێ ڕەکێتی گرتۆتە کۆشکی کۆماری و وەزارەتی بەرگری، لەوسایشەوە هیچ جۆرە چالاکییەکی فڕۆکەوانی رووی نەداوە.

٢- ئەو تانکانەی ستۆدیۆکانی ئێزگەی نزیك باڵوێزخانەکەمانیان[150] دەپاراست ئێستە چواردەورەی ناوچەکەیان داوە. سەعات دەو چلوپێنج دەقیقە ئێزگەی بەغدا ڕایگەیاند کە پاش ماوەیەکی کورت سەرەك وەزیران ڕاگەیاندنێك پەخش دەکات، بەڵام پاش تەنها شەش دەقیقە هەموو پەخشی ئێزگە ڕاوەستا، هەرچەندە گوێمان لە دەنگی شەپۆلەکانیەتی.

٣- دەورووبەری سەعات یازدە خۆنیشاندانێکی سێ سەد کەسیی، بە سەرکردایەتیی ژمارەیەك لاوی حەرەس قەومی، بەلای باڵوێزخانەکەماندا بەرەو ستۆدیۆکانی ئێزگە ملیان ناو دروشمەکانی بەعس‌و دروشمە باوەکانی دیکەی وەك ئەوانەی دەربارەی فەلەستینیان دەگوتەوە، جاروباریش هیتافیان دژی حازم جەواد دەکێشا.

٤- لە دوێنێ شەوەوە حەرەسی قەومی بە شەقامەکاندا دەسووڕێنەوە.

---

(150) ستۆدیۆکانی ئێزگەی بەغدا لە کەرخ کەوتوونەتە نزیك بارەگای باڵوێزخانەی بەریتانی لە عێراق و دەنگنێنەرەکانیشی (المرسلات) لە ئەبوغرێب دانراون.

٥- وا دیاره قەدەغە کردنی هاتوچۆ (منع التجول) ئێستا بە تەواوەتی جێبەجێ دەکرێت و هەمووان شەقامەکانیان چۆڵ کردووە، بەڵام بەشێك لە شەقامەکان بەدەست سوپاوەیەو بەشەکەی دیکەشیان بەدەست حەرەسی قەومییەوەن.

٦- بەهۆی وەستانی پێوەندیی تەلەفۆنییەوە ناتوانین پێوەندی بەو بەریتانییانەوە بکەین (کە لە عیراق دەژین- ك. م.) بەڵام لەبەر گەلێك هۆ دڵنیاین لەوەی کەسیان لە ماڵ دەرناچن و هەموویان بێوەین))[151].

باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا، هەمان ڕۆژی سیازدەی تەشرینی یەکەم، ئەم بروسکە سەیرە دەنێرێت بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن:

(( ١- سەعات دوازدەو دەقیقەیەك ئێزگەی بەغدا بەیاننامەیەکی بەناوی سەرەك وەزیران ئەحمەد حەسەن بەکرەوە بڵاوکردەوە، کە تێیدا دەڵێت یەکیەتی ڕیزەکانی حیزبی (بەعس- ك. م.) تەواو تێکشکێنرا، بە ملیۆنەها لە کۆمەڵانی خەڵك پشتگیریی سەرکردایەتیی نوێ دەکەن‌و داوای ڕیشەکێش کردنی کۆمۆنیزم و ئیمپریالیزم دەکەن.

٢- وەزیری بەرگری سالح مەهدی عەمماش، بەناوی ئەحمەد حەسەن بەکرەوە، بەیاننامەکەی خوێندەوە))[152].

دوا دوو بەڵگەنامەی هەمان فایل، کە ڕۆژی نۆزدەی تەشرینی دووەمی هەمان ساڵ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی ناردوونی بۆ باڵوێزی بەریتانی لە تاران، بایەخیان یەکجار زۆرە بۆ لێکدانەوەی دوورخستنەوەی عەلی سالح سەعدی و هەڵسەنگاندنی ڕژێمی فەرمانڕەوایی بەعس، چونکە خودی وەزیر داوا لە باڵوێز دەکات نەسیحەتی محەمەد ڕەزا شای ئێران بکات دوورەپەرێز بێت لە ئاڵوگۆڕەکانی عیراق و دەست نەخاتە ڕووداوەکانی و بەو

---

(151) N.A., F.O., 371/170441, From: Baghdad, To: Foreign Office, London, Sir Roger Allen, No. 1174, November 13, 1963, Emergency, Confidential.

(152) Ibid, From: Baghdad Embassy, To: Foreign Office, London, Sir Roger Allen, No. 1176, November 13, 1963, Confidential.

بۆنەیەشـەوە وەزیـر ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەكـات كـە یەكیـەتی سـۆڤیەتیش ((جارێكا لە دوورەوە)) چاودێری وەزعی عێراق دەكات[153].

نەتەوەپەرستە عەرەبەكانی سەر بە جەمال عەبدولناصرو ژمارەیەكی زۆر كەم لە بەعسییە میانڕەوەكان و ژمارەیەكی لەوانیش كەمتر كەسایەتیی بێلایەن بوونە فەرمانڕەوای نوێی عێراق كە لەناو بەڵگەنامە نهێنییەكانی وەزارەتی هەندەرانی حوكمەتی بەریتانیادا پوختەیەك دەربارەی هەر یەكێكیان هەیە، لەگەڵ بایەخ پێدانێكی تایبەتی بە فرتوفێڵەكانی ساڵح مەهدی عەمماش كە سەرەتا بەو دەست پێ دەكەین.

((لە باڵوێزخانەی بەریتانییەوە،

بەغدا،

٣٠ی كانوونی یەكەمی ١٩٦٣،

لە د. ك. هاسكێلەوە،

بۆ دەبل یو. مارسدین،

بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن.

١- ئەمانەی لای خوارەوە دەربارەی ڕووداوەكانی ڕۆژی هەژدەی تەشرینی دووەمن لە بەغداو ئەو فرتوفێڵانەی لەو ڕۆژەدا دەربارەی چارەنووسی وەزیری بەرگریی پێشوو جەنەڕاڵ عەمماش كەوتنە سەر زاران.

٢- زۆر زوو دەركەوت لەوانەیە ساڵح مەهدی عەمماش نەگیرابێت، ئەگەر وابێت مانای وایە بێگومان لە وڵات دەرچووە. واش بە بیردا دێت كە لەوانەیە وەك باڵوێزی عێراق لە دوورە پایتەختێكی لەبار دانرابێت، بە دەستووری ئەوەی (عەبدولكەریم قاسم- ك. م.) ساڵی ١٩٥٨ لەگەڵ سەرەك كۆماری ئێستە (عەبدولسەلام- ك. م.) عارفدا كردی[154]. تەنانەت ڕاپۆرتی ئەوتۆش هەیە كە

(153) Ibid, From: Baghdad, To: Foreign Office, London, To: British Embassy, Tehran, No. 1455, November 13, 1963, Confidential.

(154) دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨، بە ماوەیەكی كورت، دووبەرەكیی كەوتە نێوان هەردووك سەرۆكی ئەو شۆڕشەوە- عەبدولكەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف، ئەوساكە زۆرینەی

جەنەڕاڵ تاهیر یەحیای سەرەك وەزیران پێی باشە عەمماش بکرێتە (بالوێزی عیراق– ك. م.) لە واشنتۆن چونکە، وەك گوتوویە (ئەمەریکاییەکان هەمیشە بەعسییەکانیان خۆش ویستووە بۆیەکا دەتوانن تەحەمولیان بکەن)[155].

ئیزگەکانی قاهیرە و پاریس و تونس ڕایانگەیاند کە (عەمماش– ك. م.) لە بەغداوە بە فڕۆکەیەکی سەربازیی گەیشتۆتە قاهیرە، ئەوەیش لێرە (واتا لە بەغدا– ك. م.) مەزەندەی خەڵکەکەی دەربارەی چارەنووسی عەمماش پتر لە جاران بەرفراوانتر کرد. یەکێك لەو نوکتانەی دەربارەی ئەمە وا لەسەر زاری خەڵکی دەڵێت: عەمماش بۆ خۆی داوای کردووە، ئەگەر بڕیاری دوورخستنەوە (نەفی)یان داوە ئەوا با بینێرنە قاهیرە، خۆ ئەگەر وا نەبێت ئەوساکە بۆ خۆی دەتوانێت داوای پەنابەریی لەوێ بکات !. هەرچۆن بێت ڕووداوەکان وا نیشان دەدەن لەوانەیە عەمماش لە قاهیرە نیشتەجێ کرابێت. ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییەکانی ئیمڕۆکەیش دەڵێن دوێنێ عەمماش لەگەڵ خێزان و منداڵەکانیدا گەیشتوونەتە ئەوێ، لەوانەیشە بەر لەوە عەمماش گەڕابێتەوە بەغدا بۆ ئەوەی خێزانەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت.

٣– وەزیری ئیرشاد لە کۆنفرانسی ڕۆژنامەوانییەکەی خۆیدا کە ڕۆژی بیستو چواری تەشرینی یەکەم بەستی (بڕوانە نامەی ژمارە ٦٣/١٨٩/١٠١٣ ی ڕۆژی حەوتی تەشرینی یەکەمم) ڕایگەیاند کە جەنەڕاڵ عەمماش کراوەتە بالوێزی عیراق لە قاهیرە، بەڵام ڕۆژی دواتر وەزیری نوێی بەرگری فەریق تکریتی ئەو قسەیەی بە درۆ خستەوە)).

لە دوابەشی نامەکەیدا بالوێزی بەریتانی لە بەغدا ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوە ڕۆژنامەوانییانە دەکات کە هەمان هەواڵیان بڵاوکردۆتەوە، لەوانە ڕۆژنامەی

---

ئەفسەران و جەماوەری عیراق، بە کوردیشەوە، بە دڵو بە گیان لەگەڵ عەبدولکەریم قاسمدا بوون، ئەمیش بۆ چارەسەری کێشەکە بڕیاری دا عەبدولسەلام عارف بکاتە بالوێزی عیراق لە بۆن، ئەو بڕیارە کێشەکەی دژوارتر کرد، عەبدولسەلام یاخی بوو، بۆیەکا درایە دادگا و فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرچوو، بەڵام عەبدولکەریم قاسم بە بڕیارێکی شانۆگەرییانە بەخشیی.

(155) دەقی قسەکەی تایەر یەحیا خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوەو ئەمەیش دەقەکەیەتی:

((It was even reported that General Yahya, the new Prime Minister, favoured his appointment to Washington, Commenting ((the Americans have always liked the Ba'athist, they can have them!))

((العرب))ی ڕۆژی بیست و هەشتی تەشرینی دووەم. لە خاڵی چوارەمینی نامەکەیدا باڵوێزی بەریتانی ئەم تێبینییە وردەی لای خوارەوەی بۆ تۆمار کردووین:

**((بێگومان شتێکی سەرنج ڕاکێشە ئەگەر عەمماش بچێتە قاهیرە، ئەوساکە ئێمەیش بەختەوەر دەبین بزانین ئایا جەمال عەبدولناصر هیچ بایەخێکی پێ دەدات یا نا)).**

باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا، لە دوا خاڵی نامەکەیدا دەڵێت **((وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرمە هەر یەک لە باڵوێزخانەکانمان لە عەمان و بێروت و قاهیرە و دیمەشق و کوێت و واشنتۆن))**[156].

ئەمەی لای خوارەوەیش بریتییە لەو زانیارییانەی لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا، دەربارەی گشت فەرمانڕەوا سەرەکییەکانی ڕژێمی نوێی عێراق هەڵگیراون: ((سەرەک وەزیرانی نوێ تاهیر یەحیا نەتەوەپەرستە، دوور نییە ناصریش بێت، وەک سەرۆک ئەرکانی لەشکر (لە ڕۆژگاری بەعسدا– ک. م.) بووە ڕەهبەری ڕاستەقینەی کۆدێتاکەی ئەم دواییانە. وەزیری بەرگری فەریق ڕوکن حەردان تکریتی بەعسییە، لە شوباتەوە بۆتە فەرماندەی هێزی ئاسمانی، خاڵۆزای سەرەک وەزیرانی ئێستایە.

وەزیری ناوخۆ، لیوا ڕەشید موسڵیح، نەتەوەپەرستە، لەوانەیە دژی بەعس و سەر بە ناصر بێت، حاکمی سەربازیی گشتیی بوو.

وەزیری هەندەران، لیوا صوبحی عەبدولحەمید، دژی بەعسە، لەوانەیە سەر بە عبدولناصر بێت، بەڕێوەبەری بزووتنەوەی سەربازی (مدير الحركات العسكرية) بوو.

وەزیری شارەوانی و کاروباری لادێ، فەریق ڕوکن محەمەد شیت خطاب، بەعسییە، لە حوکمەتی پێشوودا هەمان وەزارەتی بە دەستەوە بوو.

وەزیری پلان دانان (التخطيط)، دوکتۆر عەبدولکەریم ئەلعەلی، هیچ هەڵوێستێکی سیاسیی دیاری نییە، ئەندازیارە.

(156) N.A., F.O., 371/170443, Confidential , From: D.K. Hasskell, British Embassy. Baghdad, No. 10/3/192/63, November 30, 1963, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

وەزیــری كاروبــاری هاتۆچــۆ، فـــەریق عەبدولـــسەتار عەبدوللـــەتیف، نەتەوەپەرستە، لەوانەیـە سـەر بـە بـەعس بێـت، لـە حوكمـەتی پێشوودا وەزیـری كاروباری هاتوچۆو بە وەكالەتیش وەزیری پیشەسازیی بوو.

وەزیری نەوت دوكتۆر عەبدولعەزیز ئەلوتری، هەڵوێستی سیاسیی دیـاری نییـە، لەوانەیە مەیلی بەعسیی هەبێت[157].

وەزیری پیشەسازی عەبدولكەریم كەنوونە، هەڵوێستی سیاسیی دیـاری نییـە، بـەر لـە كـەوتنی بـەعس بـە كـاری مەدەنییـەوە خـەریك بـوو، هـاوڕێی سـەرەك وەزیرانی نوێیە.

وەزیری پەروەردە دوكتـۆر ئەحمەد عەبدولسەتار ئەلجەواری، نەتەوەپەرستە، دایە پاڵ بەعسییەكان، لە حوكمەتی پێشوودا هەمان وەزارەتی بەدەستەوە بوو.

وەزیـری دارایـی، دوكتــۆر محەمــەد جـەواد ئەلعبوســی، وا دیـارە هەڵوێـستی سیاسیی دیاری نییە، ئابووریناسە، مایسی ساڵی ١٩٦٣ وەزیری دارایی بوو، بـەڵام تەشرینی یەكەمی هەمان ساڵ دەستی لە وەزارەت هەڵگرت.

وەزیری داد، كامیل ئەلخەطیب، لەوانەیـە مـەیلیی بەعـسی هـەبێت، پـارێزەرە، تەشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٦٣ كرایە وەزیری داد.

وەزیری تەندروستی، دوكتۆر عیزەت مـستەفا، لـە حوكمـەتی پێـشوودا هـەمان وەزارەتی بە دەستەوە بوو[158].

---

(157) لە بەڵگەنامەكەدا وا هاتووە:

((bue sympathetive to Ba'ath)) وشەی (bue)م لە هیچ فەرهەنگێكدا نەدۆزییەوە، تەنانەت لە ((فەرهەنگی ئینگلیزیی ئەلیكترۆنیی ئۆكسفۆرد)) (Oxford Electronic English Dictionary)یشدا، كە بەرفراوانترین فەرهەنگی ئینگلیزییە، بەڵام بە شێوازی دارشتنی رستەكەدا وا دیارە مەبەستی بێت بڵێت لەوانەیە وەزیری نەوت مەیلی بەعسیی هەبێت، لەوانەیە وشەكە هەڵەی چاپ بێت.

(158) باسی بیروبۆچوونی دوكتۆر عیزەت مستەفای نەكردووە، بەڵام یەكێك بوو لە بەعسییە كۆنە میانرەوەكان،ماڵەكەی لە مەنسوور (شارع الامیرات) لای ماڵی خوالێخۆشبوو رەجەب عەبدولمەجیدەوە بوو، بەپێی قسەی ئەو دوكتۆر عیزەت پیاوێكی قورس و پارەدار بووە، لە دوای كۆدێتای تەممووزی شەست و هەشت تاوەكو ساڵی ١٩٧٣ بۆتە وەزیری تەندروستی، لەو ساڵەدا لەسەر پیلانە گەورەكەی

وەزیری کشتوکاڵ، لیوای فڕۆکەوان عارف عەبدولڕەزاق کە بۆ ماوەی سێ حەفتە دوای شۆڕشی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ فەرماندەی هێزی ئاسمانی بوو، هیچ لە کشتوکاڵ تێ ناگات.

وەزیری ئابووری، دوکتۆر عەبدولعزیز ئەلحافظ، پیاوێکی بەتوانایە، هیچ جۆرە مەیلێکی سیاسیی نییە، ڕاگر (عەمید)ی کۆلێجی بازرگانیی زانکۆی بەغدا بوو.

وەزیری بیناو کارە گشتییەکان، دوکتۆر عەبدولفەتاح ئەلعبوسی، دوور نییە نەتەوەپەرستێکی بێ لایەن بێت، ئەندازیارێکی عیراقیی پیشەییە، ئەندامی (کۆمیتەی کۆمەڵەی ئەندازیاران)ـە.

وەزیری ئیسلاحی زەراعی، دوکتۆر عەبدولصاحیب عەلوان، ڕاگری پێشووی کۆلێجی کشتوکاڵ بوو، هەروەها وەك ڕاوێژکار هاریکاریی لە بوواری دانانی یاسای چاککردنی کشتوکاڵ (قانون الاصلاح الزراعی)دا کردووە، پتر زانایە وەك لەوەی سیاسەتمەدار بێت، نەتەوەپەرستەو لەوانەیە سەر بە بەعس بووبێت.

وەزیری کاروباری وەحدە، دوکتۆر شامیل سامەڕائی، نەتەوەپەرستەو لەوانەیە مەیلی ناصریی هەبێت، فیزیکە.

وەزیری دەوڵەت موسلیح نەقشبەندی، کوردە، بەڵام بەهۆی دووبەرەکیی هۆزایەتییەوە دوژمنی باوەکوشتەی مەلا مستەفا و بارزانییەکانە، پێشینەیەکی ئایینیی هەیە، خاڵۆزای ئەندامی ((ئەنجوومەنی سیادە))کەی ڕۆژگاری قاسم

---

ناظم گزاری بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایش، لە وەزارەت لابراوەو دوکتۆر ریاض حاج ئیبراهیم حسەین جێگەی گرتۆتەوە، دوکتۆر ریاضیش لە بەعسییە کۆنە میانڕەوەکان بووە، کاتی خۆی زۆربەی کۆبوونەوە نهێنییەکانی سەرکردایەتی بەعس لەماڵی ئەو ساز کراوە. لە ڕۆژانی شەڕی ئێران و عیراقدا لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیدا بە مەبەستی بنبڕکردنی بیانووەکانی ئیمام خومەینی زۆر ساویلکانە پێشنیاری کردووە صەدام حسەین بۆ ماوەیەکی کورت بە رووکەش دەست لە پۆستی سەرەك کۆمار هەڵبگرێت و وەك سەرۆکی حیزب وڵات بەڕێوە بەرێت، لەسەر ئەو قسەیەی صەدام فەرمانی داوە سەرەتا زمانی ببڕن و ئینجا بیکوژن. بەر لە کەوتنی ڕژێم چەند جارێك لە پزیشکە کوردەکانم بیستووە کە دوکتۆر ریاض پیاوێکی ڕێکوپێك بووە.

بوو[159]، بۆ خۆیشی لە ڕۆژگاری نوری سەعیددا ئەندامی ((ئەنجوومەنی نوێنەران)) بوو.

وەزیری کارو کاروباری کۆمەڵایەتی (العمل والشؤون الاجتماعیة)، دوکتۆر عەبدولکەریم هانی، لەوانەیە بەعسی بێت، جاران لە وەزارەتی تەندروستی بەڕێوەبەری خزمەتگوزارییە پزیشکایەتییەکان (مدیر الخدمات الطبیة) بوو.

هەر جۆرە ئاڵوگۆڕێك لەم کابینەیەدا ڕووی بدایە باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا یەکسەر بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی دەربارەی ئاگادار دەکرد. بە وێنە هەر ئەوەندە عەبدولمەجید دوجەیلی کرایە وەزیری کاروباری هاتوچۆ یەکسەر باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغداوە ئەم بروسکەیەی لای خوارەوەی ناردووە بۆ لەندەن:

((نهێنی،

لە بەغداوە،

بۆ وەزارەتی هەندەران،

لەندەن.

ڕۆژنامەکانی (عیراق– ك. م.) ئەم بەیانییە ڕایانگەیاند کە عەبدوللەتیفی وەزیری پێشووی کاروباری هاتوچۆ کراوەتە باڵوێز لە دیوانی وەزارەتی هەندەران و لە جێگەی ئەو عەبدولمەجید دوجەیلی دانراوە کە ناصرییەکی میانڕەوەو هەمان کات دژ بە کۆمۆنیزم و بەعسە، دانانیشی لەو پۆستەدا دەستکەوتێکە بۆ سەرۆك عەبدولسەلام عارف))[160].

شایانی باسە جارێکی دیکە لە هەمان فایلدا لیستێکی دیکەی ناوی فەرمانڕەوایانی ڕژێمی نوێ هەڵگیراوە، بەڵام ئەمجارەیان بە ناوی (سەرەك کۆمار فیلد مارشاڵ عەبدولسەلام محەمەد عارف) دەست پێ دەکات کە دەربارەی

---

(159) مەبەستی خالید نەقشبەندییە کە بەر لەوەی ڕژێمەکەی عەبدولکەریم قاسم بروخێت ئەو کۆچی دوایی کرد.

(160) N.A., F.O., 371/170443, Confidential , From: Baghdad Embassy, To: Foreign Office, London, Sir Roger Allen, No. 1283, December 5, 963.

دەڵێت: ((نەتەوەپەرستە، سەرەتای ڕژانی شۆڕشەکەی قاسم ڕکەبەری قاسم بوو، دوای کۆدێتای شوباتی ساڵی ١٩٦٣ هاریکاریی پارتی بەعسی کرد، مەیلی ناصریی هەیە)).

دوا بەدوای ئەوە یەکسەر بەم جۆرە باسی ئەحمەد حەسەن بەکر دەکات: ((جێگری سەرەك کۆمار فەریق ئەحمەد حەسەن بەکر، بەعسییەکی میانڕەوە، لە حوکمەتی پێشوودا سەرەك وەزیران بوو))(161)، دوای ئەوەیش لیستەی ناوی وەزیرەکان وەك خۆی دیسانەوە تۆمار دەکات.

کەوابێت تاکە ((دەستکەوتی)) کورد، لە رووخانی ڕژێمی بەعسی، وەزیرێکی بێ دەسەلات بوو کە هۆی هەڵبژاردنی ئەویش هۆیەکی نابابەتیی شۆڤێنیی زەق بوو بەپێی تەرازووە بێ سەرووبەرەکەی عەبدولسەلام عارف کە نەیدەزانی نەقشبەندییەکان لە ڕۆژگاری خالید نەقشبەندیی گەورەوەو لەژێر فشاری زنجیرەیەك هۆی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی ئاڵۆزو تێکەڵاوەوە لە چوارچێوەی بنەماڵە و تەنانەت کوردستانی نیشتمان و پێوەندیی خوێنەوە دەرچووبوون و ببوونە ڕێبازێکی ئاینیی بەرفراوان و لەوساوە لەژێر پاڵەپەستۆی فشاری زنجیرەیەك هۆکاری بابەتییەوە شوێنپەنجەیان بە بزووتنەوەی رزگاریخوازیی نەتەوەی کوردەوە دیار بوو(162).

پێویستە، لەم گۆشە نیگایەوە، هەڵوێستی ئەو خالید نەقشبەندییە، کە لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە ناوی کەوتۆتە سەر زاران و لەم بەڵگەنامەیەدا ناوی هاتووە، هەڵسەنگێنین. خالید نەقشبەندی دەرچووی کۆلێجی سەربازی بوو، لە ڕۆژگاری پاشاییەوە بووە فەرماندەی سەربازیی حامیەی ڕەواندز، پاشان ڕێبازی کارگێڕیی گرتە بەرو سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو بووە قایمقامی ژمارەیەك قەزای کوردستانی وەك: هەڵەبجە و ڕانیە، دوای ئەوە بووە پارێزگار

---

(161) Ibid, Confidential, From: Baghdad Embassy, To: Foreign Office, London, S.W.1.

(162) بۆ درێژەی ئەو بابەتە بڕوانە: جەعفەر ڕەسوڵ عەلی، سۆفیزم و کاریگەری لە بزووتنەوەی رزگاری- نەتەوەیی گەلی کورددا ١٨٨٠-١٩٢٥، نامەی دوکتۆرا، زانکۆی کۆیسنجەق، ئەیلوولی ٢٠٠٧.



خالید نەقشبەندی

(موتەسەڕف)ی هەولێر، خالید نەقشبەندی پیاوێکی سادەو ساکارو بێ تروفیز بوو، نەزاری کوڕی گەیشتە پلەی عەقید لە سوپای عیراقیدا و یەکێك بوو لەوانەی بە فەرمانی صەدام حسەین لەسێدارە درا، غازیی کوڕیشی، کە کۆلێجی ئەندازیاریی زانکۆی بەغدای تەواو کرد زوو خۆی خانەنشین کرد. هەرچی موسلیح نەقشبەندیشە لە دوا قۆناغی ڕۆژگاری پاشاییدا نوێنەری هەولێر بوو لە پەرلەمانی ئەوسادا[163]. بەڵام لە سەراپای ئەم مێژووەدا تەنها ئەوە سەرەنجی عەبدولسەلام عارفی ڕاکێشاوە کە وەك لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((موسلیح نەقشبەندی دوژمنی باوەکوشتەی مەلا مستەفا و بارزانییەکان بووە)) بۆیەکا بووەتە تاکە وەزیری کوردی ناو یەکەم کابینەی ڕۆژگاری نوێ و ئەوەیش، بێ گومان، هۆی سەرەکیی چارەسەرنەکردنی کێشەی کوردە لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارفدا.

---

(163) دیدەنی لەگەڵ تاهیر شەهباز حەیدەری و شێخ ئەحمەدی شێخ عەبدولقادری نەقشبەندی.

## پرسی کورد لەڕۆژانی فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارف دا
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

ڕاستە عەبدولسەلام عارفی سەرەک کۆمار لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی بەعسدا دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو، تەنها لە بوواری شەڕی کورددا نەبێت کە بە ئارەزووی خۆی هەرچییەکی بویستایە دەیکرد، زوو زوویش سەری هێزەکانی سوپای لە کوردستان دەدا، ئەوەی بە شێوازێکی خەستوخۆڵ لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا ڕەنگی داوەتەوەو وای بە باش دەزانین ئەم بەشەی بابەتەکەمان بە چەند نموونەیەك لە ناوەرۆکی ئەو بەڵگەنامانە دەست پێ بکەین و تیشکیش بهاوێژینە سەر ئەوەی چۆن عەبدولسەلام دەیویست دڵسۆزیی خۆی بۆ یەکیەتی عەرەب لە ڕێگەی سوور کردنی دەستی سەربازە سوورییەکان بە خوێنی کورد بسەلمێنێت.



عەبدولسەلام عارف

ڕۆژی بیستو پێنجی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا ئەم نامەیەی لای خوارەوەی ناردووە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن:

((نهێنی،

لە س.ل. ئێگێرتۆنەوە،

بەغدا،

ژمارە ١٠١١٤/٢٢٩/٦٣،

بۆ میستەر گودچایلد،

بەشی ڕۆژهەڵات،

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن.

بارودۆخی ئێستای شەڕ، دژی کورد، وا نیشان دەدات عیراقییەکان نزیکەی سێ حەفتەیان پێویستە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی خۆیان دژی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) ئامادە بکەن، پارتی ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەری سلێمانی و هەڵەبجەی بە دەستەوەیە. عیراقییەکان ژمارەیەکی زۆر بەتاڵۆنیان گواستۆتەوە کەرکووک و سلێمانی بۆ ئەوەی لەو بزووتنەوانەی لەشکردا بەشداری بکەن کە هەوڵ دەدەن ڕێگەی کەرکووک– سلێمانی– هەڵەبجە پاك بکەنەوە. بەشی زۆری ئەو هێزانە لە باکوورەوە هێنراون.

هەرچۆن بێت کەشوهەوای زستان بەڕێوەیە، تەنانەت لە دەوروبەری زاخۆیش بارانێکی بێ شومار باریوە، پێویستە مانگی داهاتوویش سوپای عیراقی بەشی زۆری هێزەکانی خۆی ڕاگوێزێتە زستانە هەوارەکانی مووسڵ و هەولێر و کەرکووک و سلێمانی، لە ناوچە شاخاوییەکاندا تەنها ئەو پۆستانە دەهێڵێتەوە کە قایمگیرن، گرنگترینیان بامەڕنییە کە کەوتۆتە باشووری زاخۆوە، وێڕای عەقرە کە کەوتووەتە ئەولای باشووری ڕۆژهەڵاتەوە، ئەوە وێڕای بافێستاو سەید صادق و دوکان. وا پێدەچێت کوردەکان چەك و ئازوقەی باشیان هەبێت و وەزارەتی جەنگی (بەریتانی– ك. م.) لەو باوەڕەدایە چەکی کاریگەریشیان، هی وەك بازوکا، دژی

تانك هەیە، بەلام ئەوان لەبەردەم هێرشی فڕۆکەدا بێ دەسەلاتن بۆیەکا، بۆ ئەوەی لە بۆمبابارانی هێزی ئاسمانیی عێراقی خۆیان بپارێزن، پەنا دەبەنە بەر ئەشکەوتەکان.

وا پێدەچێت سوورییەکان چەند شەڕێکی چالاکیان لە دەوروبەری زاخۆ کردبێت، ئەوەیش یاریدەیەکی گەورەیە بۆ عێراقییەکان دژی کورد.

دەتوانین لە ئێستاوە پێشبینی ئەوە بکەین کە لە سەرەتای تەشرینی دووەمەوەو بۆ ماوەی سێ مانگ جۆرە هودنەیەك دروست دەبێت.

ئیمزا

س. ل. ئێگێرتۆن

بیستو پێنجی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣))[164].

ڕۆژی دواتر، واتا بیستو شەشی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣ هەمان دیپلۆماسیی بەریتانی س. ل. ئێگێرتۆن[165] لە بەغداوە نامەیەکی نهێنیی دوورودرێژی سێ لاپەڕەیی ناردووە بۆ دەبل یو. مارسێدن لە بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن دەربارەی ئەو گەشتەی سەرەك کۆمار عەبدولسەلام عارف ڕۆژانی بیستو بیستویەکی تەشرینی یەکەمی سالی ١٩٦٣ کردوویە بۆ کوردستان کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕانی خالە سەرەکییەکانییە:

١- سەرۆك عارف ڕۆژانی بیستو بیستویەکی تەشرینی یەکەم گەشتێکی کرد بۆ ناوچەکانی باکور و باشووری ڕۆژهەلاتی کوردستان کە پڕوپاگەندەیەکی

(164) N.A., F.O., 371/170450, From: S.L. Egerton, Baghdad Embassy, Secret, No. 10114/229/63, October 25, 1963, To: Mr. Godchild, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(165) ستێفن لۆفتەس ئێگێرتۆن (Stephen Loftus Egerton): ڕۆژی بیستو یەکی تەمموزی سالی ١٩٣٢ لەدایك بووە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، لە سالی ١٩٥٢وە بووە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی، لە بارەگای وەزارەت لە لەندەن و لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ژمارەیەك ولاتی عەرەبی کاری کردووە، لە سالی ١٩٦٣وە تاوەکو سالی ١٩٦٧ لە عێراق بالوێز بووە، واتا لە ڕۆژگاری بەعس و عەبدولسەلام و عەبدولڕەحمان عارفدا. بڕوانە:
((Who's Who 1980. An Annual Biographical Dictionary)), London, 1988, P. 770.

یەکجار زۆری بۆی کردووە. وەبیرتان دێنمەوە کە ئەو سەرەتای هێرشی ئەمجارە زوو زوو زیارەتی بەرەکانی شەڕی دەکرد، بەڵام وا بۆ دوو مانگ دەچێت زیارەتی نەکردووە و لە خوتبەکانیدا ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە و مەعزەرەتی هێناوەتەوە و گوتوویە ماوەیەك بەهۆی زیارەتی قاهیرە و دیمەشقەوە گەلێك سەرقاڵ بووە.

٢- ڕۆژی یەکەمی زیارەتەکەی عارف فەریق ڕوکن تاهیر یەحیای لەگەڵ بوو، ئەو ڕۆژە چووە سەربازگەی عاصی[166](*) کە کەوتۆتە نزیك زاخۆوە، لەوێ لیوای سووری فەهد ئەلشاعیر کە بە ((سەرکردەی هێزی یەرمووك)) ناسراوە، لەگەڵ لیوا فەیسەڵ سەرحان ئەلعرسی فەرماندەی لیوای هەشتی سوارەی سوپای عێراقیدا پێشوازییان کرد. هەواڵی ئەم کۆبوونەوەیە سەرنج ڕاکێشە چونکە یەکەم دان پێدانانی فەرمییە دەربارەی بوونی سوپای سووری لە باکووری عێراق. لیوا فەیسەڵ ئەلشاعیریش کەسایەتییەکی ناسراوە، مارت و نیسان ئەندامی وەفدی سووری بوو بۆ گفتوگۆی وەحدە لە قاهیرە.

٣- ئەفسەرو سەربازان لە سەربازگەی زاخۆ پێشوازیی عارفیان کرد، لە دهۆکیش زیارەتی سەربازگەی لیوای چواردەی سوارەی کرد، لەوێ عەمید تەها محەمەد ئەمین پێشوازیی کرد، ئینجا چووە زیارەتی سەربازگەی ئالوکە[167] و چاوی بە بەتالیۆنی دووی لیوای هەژدەی سوارە کەوت کە لیوا نەعیم عەبدولنەبی سەرکردەیەتی، دەڵێن لە ئالوکە لیوا عەبدوڵلا جاسمیش، کە فەرماندەی کەتیبەیەکی تۆپە، لە هەمان سەربازگە پێشوازیی کردووە.

---

(166) دیارە بە ناوی ڕووباری عاصیی سووریەوە ناو نراوە وەك نیشانەیەکی (هاتنە دیی) یەکیەتیی نەتەوەی عەرەب.

(*) ڕاستییەکەی (ئاسیهی)یە کە گوندێکە لە نزیك ڕێگای سێمێل - زاخۆ، لە دەشتی سلیڤانەتی، ڕەنگە کاتی خۆی بۆ تەعریب پێیان گوتبێ: عاصی/ تێبینی: د. عەبدولفەتاح بۆتانی لەسەر چاپی یەکەمی ئەم کتێبە -ع. زەنگەنە)

(167) ئالوکە: ناوی گوندێکە کەوتۆتە ڕۆژئاوای شاری دهۆکەوە، پردی ئالوکەیش کە بەناوی گوندەکەوەیە لەسەر شیوێك دروست کراوە، جۆگە ئاوێکی پێدا دەچێت و ڕێگەی نێوان دهۆك و موسڵی پێدا تێدەپەڕێت، ناوەندی سەدەی نۆزدەمین ناوچەی ئالوکە شەڕێکی مێژوویی گەورەی بە خۆیەوە بینیوە لەنێوان سوپای والیی بەناوبانگی موسڵ مەحموود جەلیلی و سوپای میر زوبێر پاشای بادینی، کە لەسەر کوردانی ئێزیدی هاتۆتە دەنگ و خراپ سوپای والیی موسڵی شکاندووە، ئەوەی لە فۆلکلۆری باوی ناوچەکەدا دەنگی داوەتەوە. بڕوانە: أنور المائی، الاكراد ڤ بهدینان، الموصل، ١٩٦٠.

٤- عارف به فڕۆكه له دهۆكەوه چووه موسڵ و شەوی لەوێ بردە سەر. بۆ سبەینێ، واتا بیستویەکی تەشرینی یەکەم، له کۆلێجی پزیشکیی موسڵ وتارێکی هەست بزوێنی پێشکەشی قوتابییەکان[168] کرد، تێیدا گووتی: پێویستیمان بە هێرشێکی وریایە دژی پیلانگێڕان[169]. دەربارەی وەحدەیش گووتی: هەرچەندە لەولەیە جێگەی داخ بێت بەڵام ((ئەو یەکیەتییەی هەیە لە نێوان سووریا و میسردا لە مەترسیدایە. ئەوەی ئێمە ئێستا عەودالین بۆی یەکیەتییەکی لێکۆڵراوەی تەواوی عەرەبە)). ئەم گوتە توندوتیژە ئاماژە بۆ قۆناغێکی نوێی هێرشی شاردراوەی[170] عارف دەکات لە بوواری ئەو دروشمەیدا کە دەڵێت ((هەموو شتێك بۆ هەموو عەرەب)) (كل شئ من أجل كل العرب).

٥- سەرەك کۆمار لە موسڵەوە بە فڕۆکە چووە کەرکووك، لە فڕۆکەخانە حاکمی عەسکەریی گشتیی باکوور عەمید سەعید فەتحی صقلی و سەرکردەی فیرقەی دوو عەمید شەنشەل پێشوازییان کرد، وێڕای ژمارەیەك لە ئەندامانی سوارەی سەلاحەددین. دوای ئەوە بەناو شاردا گەڕاو چووە زیارەتی سەربازگەی فیرقەی دوو، ئینجا بە فڕۆکە چووە سلێمانی، لێرەش پارێزگارو فەرماندەی لیوای سوارەی بیست عەمید صدیق مستەفا پێشوازییان لێی کرد. سەر لەئێوارەی بیستویەکی تەشرینی یەکەم عارف گەڕایەوە بەغدا.

٦- برای سەرەك کۆمار، عەمید عەبدولڕەحمان محەمەد عارف، کە فەرماندەی فیرقەی پێنجە، لە بەشێکی ڕۆژی دووەمی گەشتەکەی سەرەك کۆماردا لەگەڵی بوو، لە چرکەیەکی بێ ئاگاییدا[171] عەمید بە پەیامنێرێکی ((ئاژانسی هەواڵەکانی عیراق))ی ڕاگەیاند دوای نوێژ بە هاریکاریی نێوان سوپاو سوارەی سەلاحەددین

---

(168) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا هاتووە: ((he gave a pep talk to the students)).

(169) دیارە مەبەستی کوردە.

(170) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی (fence) هاتووە کە بۆ قسەی مەبەستدار بەکاردێت.

(171) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا هاتووە:

((in a rather unguarded moment the Brigadier said to a representative of the Iraq News Agency…))

بەو جۆرەش واتای (زلة لسان) یا کورد واتەنی ((دەمی تەتەڵەی کرد)) دەگەیەنێت.

(قافڵەکە بەڕێکەوتو بێ هیچ جۆرە کۆسپێك نێوان جلەولاو سلێمانیی بڕی و دوای ئەوە لیوای بیستەمین خورپەی خستە دڵی یاخیگەرانەوە)[172]. هەڵبەت بەر لەوە هیچ ئاماژەیەکی فەرمی نەکراوە دەربارەی ئەوەی هیچ کێشەیەك لە ڕێگەی سلێمانی تووشی قافڵەکە هاتبێت، هەرچەندە ئێمە ئەوەمان دەزانی کە ماوەیەك جێ پێی موعارەزە لەوێ قایم بوو[173].

خاڵی حەوتی بەڵگەنامەکە بۆ باسی جێگۆڕکێی ڕۆتینیی هێزەکانی میری لە ناوچە کوردییەکانی ئەو ڕۆژانەدا تەرخان کراوە کە بەشێکی کەرکووکیشی گرتۆتەوە. هەرچی خاڵی هەشتەمیە پەیوەندیی بە زینجیرەیەك لە چالاکییە نهێنییەکانی کوردەوە هەیە کە ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی.

((٨) دوور نییە هەندێك لەو شتانەی[174] ئەمەریکاییەکان پێیان ڕاگەیاندووین شایانی ئەوە بن پێتانی ڕابگەیێنین، چونکە ئەوان لە سەرچاوەیەکی بەرزی ((پارتی دیموکراتی کوردستان))ـەوە وەریان گرتوون. ئەو سەرچاوەیە گوتوویە ورەی شەڕکەرانی کورد (ڕەنگبێت بە پێچەوانەی لادێی و ئافرەت و منداڵانەوە)[175] چ لە باکوور و چ لە باشووری ڕۆژهەڵات بەرزە، کوردەکان لە سێ ناوچەی سەرەکیدا سەنگەری بێ ئەندازە پتەویان ئامادە کردووە، کە دووانیان ئەم ناوچانە دەگرنەوە:

---

(172) ئەوانە قسەکانی عەبدولڕەحمان عارفن بۆیەکا لە دەقی بەڵگەنامەکەدا خراونەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە، هەروەها لە دەقی بەڵگەنامەکەدا هەر بەناوی ئەوەوە دەڵێت ترسی تیرۆری خستە ناو دڵی یاخیگەرانەوە، بەڵام پێم وایە ڕستەکە بەو جۆرەی سەرەوە خۆشتر دێتە گوێ. هەرچۆن بێت ئەم زانیارییە خۆی لە خۆیدا بایەخی زۆرە، چونکە وا دەگەیێنێت پێشمەرگەکانی ناوچەی سلێمانی هەوڵی کوشتنی عەبدولسەلام عارفیان دابێت.

(173) لە بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((though we have known for some time that the supply position there was serious)).

(174) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی (snippets) نووسراوە کە مانای بەشێك دەگەیێنێت.

(175) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووەو خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەیشەوە:

(as opposed, perhaps, to villagers, women and children).

أ) ناوچەی ڕۆژهەڵاتی هێڵی ماوەت- بەرزنجە- هەڵەبجە.

ب) ناوچەی چوارگۆشەی دێلێژە- دەربەندی خان- شێخ بابا (کە زۆر نزیکی خانەقینە)- کفری- دووز.

ج) لە باکووری ڕۆژهەڵاتیش ئەو ناوچە سێ سووچکەیە دەگرێتەوە کە شارەکانی لەژێر دەستی حوکمەتدان، واتا- زاخۆ- عەممادیە- دهۆك. لەولاترەوە بەرەو ڕۆژهەڵات، کوردەکان دان بەوەدا دەنێن کە هێزەکانی میری لە شێروان مەزن و بارزان دەستکەوتیان هەیە.

٩- هەرچی سەبارەت بە ڕێککەوتنی شێخ ئەحمەدی بارزانە لەگەڵ حوکمەتدا[176] (تکایە بڕوانە ئەو نامەیەی ژمارە ٦٣/٢٣١/١٠١١٤ی ڕۆژی دوازدەی تەشرینی یەکەم کە ناردوومە بۆ داڤید گودچایلد) ئەو کوردە گوتوویەتی ئەو کارە بە ئاگاداریی مەلا مستەفا کراوە. هەرچۆن بێت شێخ ئەحمەد تەنانەت تاکە چەکدارێکی کورد چییە لەگەڵ خۆیدا نەیهێناوە. ئەمەریکاییەکان لەو باوەڕەدان کە لە پشت پەردەی هاتنی شێخ ئەحمەددا گەلێك دیاردەی دیکە هەن کە بە چاو نابینرێن و ئەوانیش (واتا ئەمەریکاییەکان- ك. م.) ناتوانن بە وردی ئەو لایەنانە هەڵبسەنگێنن.

١٠- هەمان کات کوردەکان بە ئەمەریکاییەکانیان ڕاگەیاندووە کە عیراقییەکان ڕۆژی پێنجی تەشرینی یەکەم (لە شوێنێك لە دەرەوەی عیراق) پێوەندیی فەرمییان، لەسەر داوای کورد، بە کوردەوە کردووە. لەو کۆبونەوەیەدا عیراقییەکان داوایان کردووە مەلا مستەفا یەکێك بنێرێت بۆ ئەوەی ببێتە نوێنەری خودی ئەو لە هەر وتووێژێکدا بۆ ئەم مەبەستە لە داهاتوودا ساز بکرێت و پێشیان ڕاگەیاندووە سالح یوسفی کە یەکێکە لە ڕەهبەرانی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) ئێستا لە حللە بەندەو هەر ئەویش دەزانێت بارزانیی چ گەرانتییەکی لە حوکمەتی عیراق دەوێت بۆ ڕێککەوتن. نازانم ئەم قسانە چەند ئاو دەکێشن، بەڵام ڕۆژی کۆبوونەوە (لەگەڵ نوێنەری خودی بارزانیدا- ك. م.) بە روونی دیاری کراوە.

---

(176) بەر لەوەو لە هەمان فایلدا بەڵگەنامەیەکی نهێنیی دیکە بۆ باسی هەمان بابەتی هەڵوێستی شێخ ئەحمەدی بارزان تەرخان کراوە.

١١- وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرم بۆ باڵوێزخانەکانمان لە هەریەك لە واشنتۆن و تاران و ئەنقەرە و بێروت و قاهیرە و دیمەشق و کوێت و عەدەن، لەگەڵ ئەم هاوپێچەشیدا وێنەیەکی دیکەیتان بۆ دەنێرم نەبا بۆ کاری دیکە پێویستیتان پێی بێت.

ئیمزا

س. ل. ئێگێرتۆن))[177].

لە هەمان فایلدا و دوای چەند بەڵگەنامەیەکی دیکە، کە دەگەڕێینەوە سەریان، وتارێکی گۆڤاری ((ئیکۆنۆمیست))ی لەندەنی بەم ناونیشانەوە هەڵگیراوە ((ئاشتی لەگەڵ کورددا)) کە ڕۆژی حەڤدەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ بڵاوی کردۆتەوەو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ئەو وتارە بێ لایەن و وردەیە:

((ئاشتی لەگەڵ کوردا

شتی ئەوتۆ لە ئارادان کە وا نیشان دەدەن حوکمەتی عیراق بڕیاری دابێت دەست لە سیاسەتی قڕکردنی یاخیبوونی کورد لە ڕێگەی چەکەوە هەڵبگرێت، ئەو سیاسەتەی تاکە مانگێك لەمەوبەر لەوە دەچوو سیاسەتێکی نەگۆڕی حوکمەت بێت (بڕواننە ئەو ڕاپۆرتەمان کە سەبارەت بە بابەتی ناوبراو لە ژمارە بیستو شەشی ((ئیکۆنۆمیست))دا بڵاومان کردۆتەوە). ئەوساکە یاخیگەرە کوردەکانیش، کە پێیان وابوو شەڕ ڕاناوەستێت، بەڵام لەوە دڵنیا بوون هێزەکانی میری دەرفەتی سەرکەوتنیان کەمە. هەرچۆن بێت لە ماوەی دوو حەفتەی ڕابردوودا ئەم هەواڵانەی لای خوارەوەمان پێ گەیشتوون:

١- پتر لە هەزار کورد، کە لە ماوەی چەند مانگێکدا بەند بوون، دوو حەفتە لەمەوبەر ئازاد کران، بەشی زۆری ئەو بەردراوانە لە سلێمانی بەند بوون.

٢- دەیان کەس لەو کوردە عیراقییانەی لە ترسی گرتن لە دەرەوەی وڵات دەژیان گەڕانەوە عیراق.

---

(177) N.A., F.O., 371/170450, From: S.L. Egerton, British Embassy, Baghdad, No. 10114/237/63, Confidential, October 26, 1963, To: W. Marsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1

٣- له ڕێگەی ژمارەیەك لەو كوردانەی له بەندیخانەی بەغدا ئازاد كران حوكمەت هەستی ئاشتییانەی خۆی بەرانبەر یاخیگەرانی كورد دەربڕی.

٤- بەپێی گێڕانەوەی ئەو عێراقییانەی لەم دواییانەدا گەیشتوونەتە لەندەن شێخ ئەحمەدی بارزان، كه برا گەورەی مستەفا بارزانیی ڕەهبەری یاخیبوونەكەیە، ئێستا به میوانداریی حوكمەت له بەغدایە، لەوانەیە هاتنەكەی بۆ یاریدەدان بێت له بواری وتووێژی بەڵێندراودا.

ڕاپۆرتی هەمەجۆر سەبارەت به هەڵوێستی شێخ ئەحمەد هەیە. ڕۆژی یازدەی تەشرینی یەكەم حوكمەتی عێراق ڕایگەیاند كه شێخ دڵسۆزیی خۆی بۆ حوكمەت دەربڕیوە. ئەم قسەیە ڕاست بێت یا درۆ له سەنگی شێخ وەك ناوبژیكەرێك كەم ناكاتەوە. كاتی خۆی حوكمەتی قاسمیش هەمان دەنگوباوی دەربارەی بڵاو كردەوە. هەرچۆن بێت شێخ ئەحمەد لای كوردەكان هەمیشه وەك پیاوێكی بێ لایەن له هەراكەدا سەیری كراوە، بۆیەكا پێیان وایە ناوبژیكەرێكی لەبارە.

له بەرەی كورددا میانڕەوەكان، كه لەگەڵ وتووێژدان، وردە وردە جێپێیان لەسەر حسێبی توندڕەوەكان كه دژی وتووێژن، پتەو دەبێت. هەرچۆن بێت توندڕەوەكان، وەك بارزانی، ڕۆڵی شێخ ئەحمەد لەم بووارەدا به پێویست نازانن. وێڕای ئەوە توندڕەوەكان، كتوپڕ دەستیان بەسەر ئێزگەیەكی نوێدا گرت، ئەو ئێزگەیە مانگێك لەمەوبەر دامەزرێنراو له بەغداو شارەكانی دیكەی عێراق به باشی دەبیسترێت. ئەو ئێزگەیە ڕۆژانه پرۆگرامەكانی بۆ ماوەی سەعات و نیوێك به كوردی و عەرەبی پەخش دەكات و داوا له عێراقییەكان دەكات بدەنه پاڵ خەباتی كورد لەپێناو ڕوخاندنی ئەو ڕژێمەی بەغدادا كه ئەوان به ڕژێمی فاشستی حیزبی بەعس وەسفی دەكەن.

ڕەنگبێ ئەو هۆ سەرەكییانەی پاڵ به حوكمەتی عێراقەوە دەنێن پێوەندیی به یاخیگەرانی (كوردەوە- ك. م.) بكەن بریتی بن له:

أ-وا دیارە ئێستا حوكمەت هەستی بەوە كردووە كه كاری سەربازیی به تەنها ناتوانێت كۆتایی به بەرگریی كورد بهێنێت. ڕێگه سەرەكییەكانی هاتوچۆی نێوان كەركوك و سلێمانی ئێستاكه به تەواوەتی وان لەژێر كۆنترۆڵی یاخیگەراندا.

یاخیگەران لە شەڕێکدا لە نزیك زاخۆوە، کە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی مووسڵ و حەفتەی ڕابردوو قەوما، پتر لە پێنج سەد کەسیان لە هێزەکانی میری گەمارۆ داو ئەوی کوژرا کوژراو ئەوانی دیکەیشیان بە دیل گرتن.

ب- هێرشەکانی میری بوونەتە بارێکی قورس بەسەر ژیانی ئابووریی (وڵاتەوە- ك. م.). ئەمە یەکێك بوو لەو هۆیانەی وەزیری پێشووی دارایی دوکتۆر ئەلعبوسی ئامادەی بۆ کردن‌و بوونە هۆی ئەوەی خۆی‌و دوو وەزیری دیکە سەرەتای ئەم مانگە دەست لە کورسیی وەزارەت هەڵبگرن.

ج- پەرەسەندنی چالاکییەکانی ناصر چ لەناو ڕیزەکانی سوپادا و چ لە وڵاتدا.

د- (پارتی فاتمی) کە بە نهێنی کار دەکات لەم چەندانەی دواییدا زۆر ناوبانگی دەرکردووە، هەرچەندە شتێکی کەم دەربارەی ئەم پارتیە دەزانین، بەڵام هۆی دەرکەوتنی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دروشمانەی:

١- ئەم پارتە نوێیە داوا لە جەماوەری عیراق دەکات ئەو ڕژێمە بڕوخێنن کە ناوی لێ ناوە دیکتاتۆرییەتی کەمینە[178].

٢- بڵاوکراوەکانی فاتمی وای دەردەخەن ئەو (پارتە- ك. م.) نوێنەری شیعە بێت کە زۆرینەی دانیشتوانی عیراق پێك دەهێنن، کەچی زۆربەی هەرە زۆری فەرمانڕەوایانی حوکمەتی بەعس سوننی مەزهەبن، لەوانە سەرەك کۆمار عەبدولسەلام عارف و جەنەڕاڵ ئەحمەد حەسەن بەکری سەرەك وەزیران و میستەر عەلی سالح سەعدیی جێگری سەرەك وەزیران و جەنەڕاڵ سالح مەهدی عەمماشی وەزیری بەرگری و سەرۆکی سوپای عیراقیی- سووریی یەکگرتوو، وێڕای جەنەڕاڵ تاهیر یەحیای سەرۆکی ئەرکان.

٣- بە گوێرەی چەند ڕاپۆرتێك، کە نازانرێت تا چەند ڕاستن، پارتی فاتمی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی کۆمۆنیستەکان.

هـ- وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەندێك فشاریان خستۆتە سەر ڕەهبەرانی بەعس بۆ ئەوەی بگەنە جۆرە ڕێککەوتنێك لەگەڵ یاخیبووە کوردەکاندا. ئەوە زانراوە کە ئەمەریکاییەکان پێوەندییان هەیە بە هەر ڕەهبەرێکی کوردەوە

---

(178) دیارە مەبەستی سوننەیە.

ـمستیان بیگاتێ چ لە بەغدا یا بێروت یا ژمارەیەك پایتەختی ئەوروپایی بێت. لە
ـێروت مانگی ڕابردوو وەزیری هەندەرانی عیراق طالب شبیب و وەزیری ناوخۆی
عیراق حازم جەوادو براکەی نازم جەواد، کە باڵوێزی عیراقە، لە بێروت گفتوگۆیان
ـەگەڵ میستەر ئارمین مێیەر (Mr. Armin Meyer)ی باڵوێزی ئەمەریکا لە لوبنان
کرد. میستەر مێیەر دڵنیای کردن لە هەستی باش و ئامادەیی ئەمەریکا بۆ
یارمەتیدانی بەعس، مێیەر گفتوگۆی لەگەڵ ئەو کوردە عیراقیانەشدا کردووە کە لە
ـوبنان دەژین و داوای لێ کردوون فشار بخەنە سەر یاخیگەرە کوردەکان بۆ
ـتووێژی ئاشتییانە لەگەڵ حوکمەتی عیراقدا. نیشانەیەکی دیکەی جۆری
بیرکردنەوەی ئەمەریکاییەکان (لەم بووارەدا – ك. م.) لەوەدا وەدی دەکرێت کە
بەشی لێپرسراوی دەوڵەت مانگی ڕابردوو ڤیزەی دایە دوو نوێنەری کورد تاوەکو
بتوانن لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئامادە بن کاتێك پرسی کورد لەبەردەمیدا
تاووتوێ دەکرێ.

ئەمەریکاییەکان هۆی بزوێنی سیاسیی ڕەوا پاڵیان پێوە دەنێت بۆ
ڕێکخستنی حوکمەتی عیراق و کورد، هۆ سەرەکییەکانی ئەو ڕاستییە لەمانەدا
وەدی دەکرێن:

١– بڕوای دەوڵەت کە حوکمەتی بەعسی ئێستە شایانی پشتگیرییە چونکە:

أ– دژ بە کۆمۆنیست و دژ بە سۆڤێتە،

ب– ڕژێمێکی میانڕەوەو تا ڕادەیەك موستەقیرە.

٢– ئەمەریکاییەکان دەیانەوێت کارێکی ئەوتۆ بکەن کوردە یاخیبووەکان بۆ
یارمەتی پەنا نەبەنە بەر کۆمۆنیستەکان و رووسیا، ئێستا ئەمەریکاییەکان ئەو
بیرۆکەیەیان لا پەسەندە کە کورد نیشتمانپەروەرن و حەز دەکەن یارمەتی لە
کۆمۆنیستەکانەوە، یا هەر لایەنێکی دیکەوە بێت، وەربگرن، لە کاتێکدا میستەر
دەلەس[179] کاتی خۆی پێی وابوو بارزانی و پیاوەکانی کۆمۆنیست بوون چونکە
پێوەندییان بە مۆسکۆوە هەبوو.

---

(179) مەبەستی دەلەس (Dulles)ی وەزیری هەندەرانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە.

**٣- ئەمەریکاییەکان حەز دەکەن کۆتایی بە پڕوپاگەندەی سۆڤیەتیی نەك تەنها لەنێو کوردی عیراقدا بهێنن ، بەڵکو هەمان کات لەنێو کوردی ئێرانیشدا کە کوردی عیراق یاریدەیان لێ وەردەگرن.**

**هەرچی بەریتانییەکانە بە دوو دڵیی یاریدەی ئەوە دەدەن ئاشتیی کورد بگاتە هەمان دوا ئامانج**[180].

لە هەمان فایلدا بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی باسی ئەوە دەکەن کە کورد دەتوانن بیرە نەوتەکان و بەربەستەکانی وەك دوکان و دەربەندیخان کاول بکەن، بەڵام، وەك باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی ئاگادار کردووە کورد ((**هیچ کاتێك نایانەوێت لەو بووارەدا زەبری گەورە بووەشێنن**)) نەبا ((**ئەو کارە کار بکاتە سەر هەڵویستی ڕۆژئاوا**))[181].

بەڵگەنامەیەکی بایەخداری دیکەی ناو ئەم فایلە بریتییە لە ڕاپۆرتێکی دەگمەنی باڵوێزخانەی بەریتانی کە ڕۆژی شازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ دەربارەی شەڕە بەناوبانگەکەی چەمی ڕێزان ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەت لە لەندەن و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕدراوی ناوەرۆکەکەیەتی:

**((باڵوێزخانەی بەریتانی،**

**بەغدا،**

**نهێنی،**

**ژمارە ١٠١١٤/ ٢٤٩/ ٦٣،**

**١٦ی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣،**

**لە: إی. ف. گ. ماینارد‌ەوە،**

**بۆ: دەبل یو. مارسدێن،**

**بەشی ڕۆژهەڵات،**

---

(180) N.A., F.O., 371/170450, Extract From (The Economist), London, October 17th,1963, (Peace with the Kurds, PP. 7-8.

(181) Ibid, Secret, From: E.F.G. Maynard, British Embassy, Baghdad, No. 10114/237/63, November 9 and 23, 1963, To: W. Marsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

وەزارەتی هەندەران،

لەندەن.

١- تکایە بڕوانن نامەی ژمارە ٦٣/٢٤٨/١٠١١٤ی ڕۆژی تۆی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣مان دەربارەی ڕووداوەکانی کوردستان.

٢- زۆر نییە، لە پتر لە سەرچاوەیەکەوە، بەوەمان زانی ئەو سەرکەوتنەی چەمی ڕێزان کە حوکمەت باسی دەکات (بڕوانە پەرەگرافی هەشتەمی نامەکەی سەرەوەمان) لە ڕاستیدا شکاندن بووە. ئێمە تاوەکو ئێستا ناتوانین بە وردی شوێنی چەمی ڕێزان لەسەر نەخشە دیاری بکەین، بەڵام چەمەکە بە گەلییەکدا تێدەپەڕێت و ژمارەیەکی زۆر ئەشکەوتی تێدایە کە کوردەکان کردویاننەتە عەماری ئازووقە و شوێنێکی یەکجار سەختەو زۆریش لە ڕێگای سەرەکیی نێوان کەرکووک و سلێمانییەوە دوور نییە. ئەم دەنگوباوە پێوەندیدارە بەوەوە کە حوکمەت هەوڵی دا لەم گەلییەدا بەرەوپێش بچێت، بەڵام بە زیانێکی زۆرەوە ناچاری کشانەوە کرا بەر لەوەی ((سەرکەوتنە))کەیان[182] ڕابگەیەنن. لە ڕێگەی ئەم ڕاگەیاندنەوە میری ویستی پاکانە بۆ ئەو زیانە زۆرە بکات و ئەو خێزانانەی گەڕەکی سەورە[183] کە

---

(182) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وشەی سەرکەوتن (victory) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە کە پێچەوانەی واتای وشەکە دەگەیێنێت، واتا ژێرکەوتن. هەرچی چەمی ڕێزانیشە کەوتۆتە لای چەپی چەمچەماڵەوەو سەرکەوتنی گەورەی پێشمەرگە لەو شەڕەدا دەنگێکی یەکجار گەورەی دایەوەو ڕێزانی وەك ناوی کیژ هێندەی دیکە لەناو کوردەواریدا خۆشەویست کرد.

(183) دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨، عەبدولکەریم قاسم زەویی بەسەر ئەو سەدان خێزانەدا دابەش کرد کە بە بەخێوکردنی گامێش و دروستکردنی قەیماغەوە لە زەلکاوەکانی باکووری شاری بەغدادا ژیانێکی سەختیان دەبردە سەرو لەوساوە ناوی (ثورة- شۆڕش) لەو گەڕەکە نراو دڵنیشتوانیی عەبدولکەریم قاسمیان دەپەرست و بەشی هەرە زۆریشیان سەر بە حیزبی شیوعیی عیراقی بوون، بۆیەکا نەتەوەپەرستە شۆڤێنییەکان بەخوێنی سەریان تینوو بوون. شایانی باسە دوای کودێتای هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٨ بە ماوەیەك بەعسییەکان ناوی گەڕەکی سەورەیان گۆڕی بە شاری سەدام (مدينة صدام).

((ئێستاش لەژێر کاریگەری "ڕەوتی سەدر" ناوی گەڕەکەکەیان لە جیاتی ناوە کۆنەکەی (الثورة) کردۆتە "مدينة الصدر" - ع. زەنگەنە))

کەوتۆتە قەراغ شاری بەغداوە هێور بکاتەوە چونکە دەنگی بێزاریی بەهۆی لەدەستدانی جگەرسۆزەکانیانەوە لە ناویاندا بەرز بۆتەوە.

٣- وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرمە هەر یەك لە باڵوێزخانەکانمان لە واشنتۆن و تاران و ئەنقەرە و بێروت و قاهیرەو دیمەشق و عەدەن و مۆسکۆ و کوێت و عەمان و بەحرەین و نیقوسیا.

ئیمزا

إی. ف. گ. ماینارد))[184]

هەموو ئەمانە پرسی کوردی عیراق بە ڕادەو شێوازێکی نەبینراو دەوروژێنن، ئەو پرسە گەلێك لە جاران زۆرتر سەرنجی ڕای گشتیی جیهان و دەوڵەتە گەورەکان ڕادەکێشێت و روناکبیرە دڵسۆزەکانی کوردیش چالاکانە دێنە دەست، وا لێرەدا لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا تیشك دەخەینە سەر ئەم لایەنە بایەخدارەی مێژووی هاوچەرخی کورد. لەم بووارەدا زوو زوو ناوی دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان و محەمەد سەعید خەفاف و ڕەشید عارف و عیصمەت کەتانی[*] و ئەندامە چالاکەکانی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە

---

(184) N.A., F.O., 371/170450, British Embassy, Baghdad, Confidential, No. 10114/249/63, November 16, 1963, From: , E.F.G. Maynard, To: W. Marsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

(*) ((عیصمەت کەتانی (١٩٢٩ – ٢٠٠١): کوڕی حاجی تەها کوڕی عەبدولعەزیز کەتانییە، لەشاری ئامێدی لەدایك بووە، هەر لەوێش خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە، خوێندنی ناوەندیشی لەسەرەتای چلەکان لەهەولێر تەواو کردووە، دواناوەندیشی لەژێر سایەی مامێکی بەناوی عەلی عەزیز، لەدیوانیە تەواو کردووە، لەبەر زیرەکی و لێهاتوویی و پلە باشی لەخوێندن و بەیەکەم دەرچوونی لەسەر لیواکە نێردراوە بۆ ئەمەریکا و لە (زانکۆی تینۆکس) زانستی سیاسی تەواو کردووە، ناوبراو کاری لەگەڵ هەریەك لەئەمیندارە گشتییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان، یوثانت و کۆرت ڤالت هایم و دیکیولار و پەترۆس غالی و کوفی ئەنان کردووە، زۆر پلەی کاری (UN)ی پێ سپێردراوەو گەلێك لەگرفتەکانی ئەو ڕێکخراوەی چارەسەر کردووە، سەرۆکایەتی کۆنگرەیەکی ئافرەتانی جیهانی لەچین کردووە. وەکو


عیسمەت کەتانی

ئەورووپا)) و کەسانی دیکەی وەك ئەوان زوو زوو لەو بەڵگەنامانەدا دێنە پێشەوەو بەو بۆنەیەوە دیپلۆماسییە بەریتانییەکان دەکەونە باس کردنیان و هەڵسەنگاندنی بیرو بۆچوونەکانیان.

لەم فایلەی بەردەستماندا گەلێك لەو بابەتانە هەڵگیراوە کە پێم وایە لە سەرجەمیان گرنگتر نامەیەکی دانسقەی دوکتۆر کامەران عالی بەدرخانە لەگەڵ نامەیەکی سکرتێری نوێنەرایەتیی بەریتانیا لە نەتەوە یەککگرتووەکان کە دەربارەی

---

جەمال بابان نووسیویە: هەقە کورد سوود لەو کتێبخانە دیبلۆماسییەی وەربگرێت کە بەچەند زمانێك ئێستا وا لەجنێڤ ماوەتەوە. کاتی کۆچی دوایی کرد تەرمەکەی هێنرایەوە زێدی خۆی و لەگوندی (کانی سنج)ی سەر بەئامێدی نێژرا. حکوومەتی عیراق لەهەموان زیاتر سەرپەرشتی پرسەکەی کردبوو، هەر سێ ڕۆژەکە (جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران بۆ کاروباری دەرەوەو وەزیری دەرەوە) ئامادەی پرسەکەی بوونە کە لەمزگەوتی (حاجی مەحموود بنیە)ی بەغدا بۆی دانراوە.
دواتر چلەکەی کە لە ٢٠٠٧/١٢/٧ بووەو لە (هۆڵی شێخ عەبدولقادری گەیلانی) بۆی گێڕدراوە، ناوبراو برا بچووکی د. حەسەن کەتانی و برازای عیززەت عەبدولعەزیزی شەهیدی ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ بووە ـ ع. زەنگەنە))



دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان – ئەو میرەی تا دوا هەناسەی ژیانی وەك مۆم بۆ کوردو کوردستان دەسووتا – کەمال مەزهەر

نامەکەی دوکتۆر کامەران ناردوویە بۆ (بەشی ڕۆژهەڵات)ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و هاوپێچەکانی دوکتۆر کامەرانیشی بۆ ناردووە.

هەموو ئەو بەڵگەنامانە بەسەر یەکەوە دە لاپەڕەن، بەڵام ئەفسوس لەو دە لاپەڕەیە تەنها لاپەڕەی یەکەمیان، کە نامەی سکرتێرە ئینگلیزەکەیە باش چاپکراوەو دەخوێندرێتەوە، ئەوی تری هێند کاڵ چاپکراون کە خوێندنەوەیان بە زەڕەبینە تایبەتییەکانی ئەرشیڤیش یەکجار زەحمەتە، هەرچۆن بێت نامەکەی دوکتۆر کامەرانم وەرگێڕاو توانیشم لە خاڵە گشتییەکانی هاوپێچەکان تێبگەم. جا با سەرەتا بە نامە فەرمییەکەی سکرتێری نوێنەری حوکمەتی بەریتانی لە (کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان) لە نیویۆرك دەست پێ بکەین کە ڕۆژی شازدەی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣ دەربارەی نامەکەی دوکتۆر کامەران بەدرخان ناردوویە بۆ (بەشی ڕۆژهەڵات)ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن و ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوەکەیەتی:

((نوێنەرایەتیی بەریتانیی
لە نەتەوە یەکگرتووەکان،
نیویۆرک،
ژمارە ١٨٢١٥|٧٢|٦٣،
١٦ی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣.
خۆشەویستان

١- هەرچەندە دوور نییە ئێوە ئەم بابەتەتان لە سەرچاوەی دیکەوە پێگەیشتبێت، بەڵام وا وێنەی نامەیەکی ئەمیر بەدرخانتان لەگەڵ دوو هاوپێچی دیکەدا دەربارەی پرسی کورد بۆ دەنێرین.
٢- ئەمە نامەیەکی بڵاو ڕاگەیەندراوە کە بێگومان نێردراوە بۆ گشت باڵوێزخانەکان بۆیەکا هیچ پێناسە و زانیاریەکتان دەربارەی بۆ نانێرین.
٣- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرین بۆ باڵوێزخانەکانمان لە هەر یەك لە بەغداو واشنتۆن.

دڵسۆزی هەمیشەییتان
ئیمزا
سکرتێر))[185].

دوا بەدوای ئەم نامەیە، لە هەمان فایلدا، یەکسەر نامەکەی دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان بە زوبانی ئینگلیزی هەڵگیراوە. وادیارە ڕۆژی چواردەی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣ دوکتۆر کامەران لە ئوتێلی باربیسۆن- پلازای نیویۆرکەوە ناردوویە بۆ باڵوێزخانەکان، لەوانەیشە بۆ شوێنی دیکەشی ناردبێت، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕدراوی ئەو نامە دانسقەیەیە:

(185) Ibid, From: United Kingdom Mission to the United Nations, New York, No. 18215|72|63, October 16, 1963, To: Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

((نیویۆرك،
١٤ی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣،
ئوتێلی باربیسۆن– پلازا،
١٠٦، باخی گشتی،
باشووری نیویۆرك، ١٩،
ژمارەی تەلەفۆن: ٧– ٧٠٠٠.
بەڕێز:
گوتەبێژی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، گەلێك جاران لە ڕێژەیەکی جیهانیدا، بەرگریی لە گەلە چەوساوەکان کردووە، پێم وایە ناشێت ئەم هەڵوێستە گەلی کوردیش نەگرێتەوە.
لەو کۆشەنیگایەوەی کە گەلی کورد لە هەشتی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦١وە خەبات بۆ جێبەجێکردنی ئەو مافە نەتەوەییانەی خۆی دەکات کە حوکمەتی عیراق (بەپێی یاسا– ك. م.) دانی پێدا نابوو[186] بە مافی خۆی دەزانێت جارێکی دیکە ڕوو بکاتە بەڕێزتان و داواتان لێ بکات ئێوەو گشت ڕێکخراوە جیهانییەکان، کارێکی ئەوتۆ بکەن ڕادەیەك بۆ چەوساندنەوەو کوشتاری جەماوەری سیڤیلی کورد دابنرێت و هەنگاوی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی مافە نەتەوەییەکانیان بنرێت.
داواتان لێ دەکەین، بە لایەنی کەمەوە، لیژنەی بەسەرکردنەوەی ڕاستییەکان (لجنة تقصي الحقائق– ك. م.) بنێرن بۆ عیراق وەك چۆن لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا کردووتانە کە گیرۆدەی هەمان کێشەن. وەك دەزانن پرسی کورد پرسێکی نەتەوەییە، پرسی مافی نەتەوەییە، لە لایەکی دیکەوە کارە دڕندەییەکانی سوپای عیراق (دژی نەتەوەی

(186) مەبەستی ئەو بەندەی دەستووری کاتیی عیراقە کە دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ دانی بە مافی گەلی کوردا لە چوارچێوەی عیراقدا نابوو.
((لە دەقی مادەی سێی ئەو دەستوورەدا واهاتووە: يقوم الكيان العراقي على اساس من التعاون بين المواطنين كافة بأحترام حقوقهم وصيانة حرياتهم، ويعتبر العرب والأكراد شركاء في هذا الوطن ويقر هذا الدستور حقوقهم القومية ضمن الوحدة العراقية– ع. زەنگەنە))

کورد– ك. م.) گەیشتوونەتە ڕادەیەك ناکرێت ئیتر بە کێشەیەکی ناوخۆی عێراق لە قەڵەم بدرێت.

با ئاماژە بۆ ئەوەیش بکەم کە پێویستە بڕیارەکانی (ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان) لە یازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦و ساڵی ١٩٤٨ و چواردەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ دا وەبەرچاو بگیرێن.

ئاوڕدانەوەتان لەم بابەتە نێودەوڵەتییە ناسکە لەوانەیە، هەمان کات، ببێتە هۆی ئەوەی حوکمەتی عێراق هەست بەو هەڵوێستە دژ بە یەکەی (موتەناقیزەی) خۆی بکات کە لە لایەکەوە گوایە دژی ڕەفتاری ئیمپریالییەکان دەری دەبڕێت کەچی خۆی، لە لایەکی دیکەوە، گەلێك لەوەیش خراپتر (لەگەڵ گەلی کورددا– ك. م.) دەکات.

حەزم کرد بەڕێزتان ئاگاداری ئەم ڕاستییانە بکەم، وا هاوپێچیش لەگەڵ ئەم نامەیەمدا مەتریاڵی دیکە دەنێرمە خزمەتتان تاوەکو بزانن چی لە کوردستان ڕوو دەدات.

تکا لە بەڕێزتان دەکەم قەبوڵی سوپاسی دڵسۆزانەم بفەرموون بۆ هەر کارێك بۆ گەلی کوردی بکەن.

دڵسۆزتان

ئیمزا

ئەمیر ك. بەدرخان

نوێنەری گەلی کورد

هاوپێچەکان:

١– یادداشت دەربارەی کێشەی کوردستانی عێراق.

٢– وێنەی ڕاپۆرتێکی ئاژانسی هەواڵەکان))[187].

(187) N.A., F.O., 371/170450, New York, October 14, 1963. Bar bison Plaza Hotel, 106 Central Park, South New York 19, Telephone Circle 7-7000m, From Emir K. Badir- Khan Representative of the Kurdish People.

ناوەرۆکی هاوپێچی نامەی یەکەمی دوکتۆر کامەران بەدرخان، کە ناوی لێ ناوە ((یادداشت دەربارەی کێشەی کوردستانی عیراق)) بریتییە لە باسی زنجیرەیەك وتارو موحازەرە و بەراوردکاری و سەرژمێری و بەڵگەنامەی فەرمیی دەربارەی کوردی عیراق لە سییەکانی سەدەی ڕابردووەوە کە هەموویان مافی ڕەوای کورد دەسەلمێنن. هەرچی هاوپێچی دووەمیشە لە زوبان ڕۆژنامە و ئاژانسەکانی هەواڵەوە باسی بارودۆخی کوردستانی عیراق دەکات.

هەرچەندە بەشێکی سەربەخۆی ئەم بابەتی هەشتەمە بۆ چالاکییەکانی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) لەو ساڵانەدا تەرخان دەکەین، بەڵام لێرەدا لەبەر چەند هۆیەك، بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ نامەیەکی عومەر شێخ موس و وەڵامەکانی بکەم کە ئەوانیش لە هەمان فایلدا هەڵگیراون.

ڕۆژی بیستوپێنجی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ عومەر شێخ موس بە ناوی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا– لقی بەریتانیا))وە ئەم نامەیەی لای خوارەوەی ناردووە بۆ شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێـثی دووەم:

((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا–
لقی بەریتانیا،
و. شێخ موس،
شەقامی جێمس ئەڤینیو،
ژمارە ٣٤،
لەندەن، دەبل یو ١٤،
٢٥ی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣.
شاژنی خاوەن شکۆ

ئەو بارودۆخە ترسناکەی حوکمەتی عیراق لە کوردستاندا، بە بۆمبابارانی لادێکان و سووتاندنی بەروبووم و کوشتنی خەڵکی سیڤیل و بەندکردنی هەزارەها کەسی بێ تاوان، دروستی کردووە، پێشێل کردنێکی دڕندەو نامرۆڤانەی پێڕەوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بەندە سەرەکییەکانی مافی مرۆڤن.

حوکمەتەکەتان ڕازی بووە چەکی قورس بداتە حوکمەتی عیراق، ئەو چەکەیش دژی کورد بەکار دەهێنرێت و تەنها بارودۆخەکە دژوارترو هەڕەشەی زۆرتر لە

ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکات و قوڕبەسەریی پتر، چ بۆ کورد و چ بۆ عەرەب، دەهێنێت.

بەناوی ئەو مرۆڤایەتییەوە، کە جەنابتان زۆر ڕێزی لێ دەنێن، تکا لە شکۆدارتان دەکەین داوا لە حوکمەتەکەتان بکەن چاو بەو بڕیارەی خۆیدا بگێڕێتەوەو هەناردنی چەك بۆ عێراق بووەستێنێت.

دڵسۆزتان

سکرتێری (کۆمەڵەی خوێندکارانی

کورد لە ئەوروپا– لقی بەریتانیا)

ئیمزا

و. شێخ موس))[188].

شایانی باس‌و پیاهەڵدانە کە کۆشك و وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی ئەم نامەیەی عومەر شێخ موسیان نەخستۆتە پشت گوێ بەڵکو بە ئەوپەڕی ڕێزو تەقدیرەوە وەڵامی خاوەنەکەیان داوەتەوە، ئەوەی لە ڕێگەی دوو بەڵگەنامەی ناو هەمان فایلەوە بە ڕوونی هەستیان پێ دەکەیت و ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕدراوی هەردووکیانە:

((یادداشت.

١– نامەی هاوپێچ، کە لە لایەن سکرتێری ((کۆمەڵەی خوێندکاران لە ئەوروپا– لقی بەریتانیا)) میستەر و. شێخ موسەوە ئاراستەی شاژن کراوە، بە شێوازێکی فەرمی نێردراوە بۆ وەزارەتی هەندەران بۆ ئەوەی وەڵامی بدرێتەوە.

٢– سەبارەت بە ئەو ڕەخنەیەی خاوەنی نامەکە لە سیاسەتی حوکمەتی خاوەن شکۆی گرتووە کە چەکی قورس دەداتە حوکمەتی عێراق، بەلای منەوە بابەتێکە دەچێتە خانەی بایەخی بەشی سیاسیی وەزارەتی هەندەرانەوە.

ئیمزا

بەشی پرۆتۆکۆڵ

یەکی تەشرینی دووەمی١٩٦٣))[189].

---

(188) Ibid, From: K.S.S.E- U.K Branch, O. Sheikh Mous, 34, St. James Ave, London, W.13, 25th October, 1963, To: Her Majesty.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئامۆژگاریەی سەرەوەدا، وەزارەتی هەندەران ڕۆژی نۆزدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣ ئەم نامە نازداره دەنێرێت بۆ عومەر شێخ موس:

((ژمارە: إی. کیو ١٠١٩|٦٨،

لەندەن، س. دەبلیو. ١،

١٩ی تەشرینی یەکەمی ١٩٦٣.

گەورەم !

بەپێی فەرمانی میستەر بەتلەر (Butler)ی سکرتێر، ئاگادارتان دەکەم ئەو نامەیەی ڕۆژی پازدەی تەشرینی یەکەم ناردبووتان بۆ خاوەنشکۆ شاژن گەیشت و نێردرایە ئەم بەشەی (وەزارەتی هەندەران). ناوەرۆکی نامەکەتان وەبەرچاو گیرا.

سێر

من خزمەتکاری ئەڵقە لەگوێتانم))[190].

سەرەك کۆمار عەبدولسەلام عارف، ڕۆژی بیستو دووی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٣، کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیی فراوان دەبەستێت، بەڵام بەر لەوە، ڕێکخەرانی کۆنفرانسەکە داوایان لە ڕۆژنامەنووسە بیانییەکان کردووە هەر پرسیارێکیان هەبێ بە نووسراوەیی پێشکەشی بکەن، عەبدولسەلام عارفیش وەڵامەکانی بە عەرەبی و نووسراوەیی ئامادە کردووەو ڕۆژی کۆنفرانسەکە وەڵامەکانی خوێندۆتەوە. دوو خاڵی سەرەکی لەو کۆنفرانسەدا سەرنجی پەیامنێری ڕۆژنامەی ((نیویۆرك تایمس))ی ئەمەریکییان ڕاکێشاوە، یەکەمیان بیروبۆچوونی سەرەك کۆمار دەربارەی سیاسەتی بێ لایەن (حیاد)ی وڵاتەکەی. دووەمیشیان دەربارەی ئەوە بووە کە عەبدولسەلام گووتوویەتی حوکمەتەکەی (هەوڵ بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی ئاشتییانە بۆ کێشەی کورد دەدات). ڕۆژی دواتر

---

(189) Ibid, Minutes, H. Bowen, Protocol Department, November 1, 1963.

(190) Ibid, No. EQ 1019|68, London, S.W.1., November 19, 1963, To: Mr. O. Sheikhmous, K.S.S.E. (United Kingdom Branch), 34 St. James Avenue, W. 13.

((نیویۆرك تایمس)) وەڵامەکانی عەبدولسەلام عارفی بەم جۆرەی لای خوارەوە بڵاو کردۆتەوە:

((سیاسەتی من ئەوەیە نە لەمیانو نە لەویان[191] داوای یاریدە نەکەم، بەڵام پێشوازیی هەموو جۆرە یاریدەیەکی بێ شەرتوشرووت دەکەم، یاریدەیەك توخنی سەریەخۆییمان نەکەوێت... هێزە چەکدارەکانی عیراق هەمیشە بەشی زۆری چەکەکانیان لە رۆژگاری رژێمی قاسمەوە لە یەکیەتی سۆڤیەتەوە هاتوون، یەکیەتی سۆڤیەت کەوتە پێشکەشکردنی یاریدەیەکی ئابووریی یەکجار فراوانیش بۆ بەرەوپێشبردنی عیراق، بەڵام لە رۆژگاری بەعسدا هەرچۆن بێت یاریدەی سەربازی و ئابووریی رووسیا تا دەهات کەم دەبۆوە تا گەیشتە ئاستی نەمان. بەریتانییەکان قایل بوون هەندێك چەك بە عیراق بفرۆشن)).

هەرچی دەربارەی کوردە ئەمەی لای خوارەوە وەڵامی عەبدولسەلام عارفە وەك لەو ژمارەیەی ((نیویۆرك تایمس))دا و بەر لە خاڵەکەی دیکە چاپ کراوە[192]:

(( هەمیشە بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو رۆژە بووم تەوقە لەگەڵ هەر دەستێك بکەم بۆ برایەتیمان درێژ بکرێت، ئێمە لەگەڵ برا کوردەکانماندا لەم وڵاتە ماوەیەدا پێکرا ژیاوین. ئێمە خوا یار بێت هەتا هەتایە هەر پێکەوە دەژین)).

وا پێ دەچێت پەیامنێری ((نیویۆرك تایمس)) لە دڵدا گاڵتەی بەم وەڵامەی سەرەك کۆمار هاتبێت، چونکە لەگەڵ تەواو بوونیدا، بۆ خۆی دەڵێت:

((هەر ماوەی گفتوگۆ کردنەکەی لێ دەربکەیت، کە لە هەشتی شوباتەوە تاوەکو دەی حوزەیرانی ئیمساڵی خایاند ئیتر حوکمەتی عیراق لە ساڵی ١٩٦١وە شەڕ لە دژی کورد دەکات))[193].

---

(191) عەبدولسەلام عارف مەبەستی هەردوو بەرەی وڵاتانی سۆشیالیزم و سەرمایەدارییە.

(192) بە داخەوە پەیامنێری (نیویۆرك تایمس) لە راپۆرتەکەی خۆیدا ناوی کوردی وەك (گەلێکی نیمچە کۆچەری نیشتەجێی باکووری رۆژهەڵاتی عیراق) هێناوە، هەرچەندە دانیشی بەوەدا ناوە کە گەلی کورد هەمیشە داوای ئۆتۆنۆمییان کردووە.

(193) N.A., F.O., 371/170450, Minutes, No. EQ 1019/72 (A),- (New York Times), 23 November, 1963.

نەك هەر بەعسییە توندڕەوەکان، بەڵکو بە ڕادەی ئەوانیش، عەبدولسەلام عارف و یاریدەرە نزیکە نەشارەزاکانیشی لەو ڕۆژگارەدا زۆر لووت بەرزانە دەیانڕوانییە پرسی کورد، هەڵبەت ئەوەیش لە هیچ ڕوویەکەوە، نە لە ناوەو نە لە دەرەوەی وڵات، لە قازانجیان نەبوو، ئەو ڕاستییەی دیسانەوە بە ڕوونی ڕەنگیان لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیدا داوەتەوە. هەر ئەو ڕۆژەی ((نیویۆرك تایمس)) وتارەکەی خۆی تێدا بڵاو کردبووەوە، دیپلۆماسییە بەریتانییەکان لە نامە نهێنییەکانی خۆیاندا بەم جۆرەی لای خوارەوەو بە ناوونیشانی ((کورد))ەوە تیشکیان دەهاویشتە سەر گەلێك لایەنی ئاڵۆزی ئەو بابەتە:

((١- میستەر ئیلیتس (Mr. Eilitis) ئیمڕۆ پێی ڕاگەیاندم ئەو کوردانەی کە لێرە پێوەندیی پێیانەوە هەیە پێیان گوتووە لەشکری عێراق لە کوردستان بە ڕەزامەندیی تایەر یەحیا نوێنەرێکیان، کە (قاچاغچییە)[194] ناردۆتە لای مەلا مستەفا و پێشنیاری دەست پێکردنی وتووێژی ئاشتییان عەرز کردووە. لە وەڵامدا مەلا مستەفا گوتوویەتی: پێویستە وتووێژ لە ڕێگەی نوێنەرەکانییەوە لە بەغدا دەستی پێبکرێت (لەوانەیە مەبەستی بەندە کوردەکان بێت)، دەشبێت وتووێژ بە ئاشکرا بکرێت نەك بە نهێنی.

٢- هەروەها میستەر ئێلیتس گووتی: کوردەکان حەز دەکەن ڤیزەیەکی ئەمەریکا بۆ ڕەهبەرێکی کورد بەناوی ئیبراهیم ئەحمەدەوە، کە ئێستا لە بەرەی باشووری شەڕە لە کوردستان، وەربگرن تاوەکو بچێتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، چونکە دەیانەوێت ببێتە لۆبی کورد لە نیویۆرك.

٣- میستەر ئێلیتس گوتوویەتی زەحمەتە بەهۆی باری ناسکی عێراقەوە ڕێگەی ئەو زیارەتە بدەن، هەمان کاتیش پێیان ئاسان نییە ڕەتی بکەنەوە. میستەر جەستیس دۆگلاس (Mr. J. Douglas) ئێستا لێپرسراوی پرسی کوردە.

٤- کوردەکان پێشنیازیان کردووە ئیبراهیم ئەحمەد ڤیزەکە لە لەندەن وەربگرێت. ئەگەر بڕیاری ئەوە درا ئایا دەبێت ئێمە ڕێگەی بدەینێ بێتە ئێرە ؟.

---

(194) مەبەستی لەوەیە شتێکی ئەوتۆ نەکات حوکمەتی عێراقیان لێ بووروژێنێت.

**٥- گووتم من ناتوانم داخوازییەکەی ڕەت بکەمەوە، ئەگەر ئیبراهیم ئەحمەد ملتە کۆنسوڵخانەی بەریتانی و پاسپۆرتێکی دروستی پێ بوو، هەروەها بشزانین کە ڤیزەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایشی پێ دەدرێت، ئەوساکە بە بیری من زەحمەت دەبێت بۆ ئێمە ڤیزەی ترانزێتی پێ نەدەین، هەرچەندە بێگومان دەبێت بەڵێنی ئەوەی لێ وەربگرین کە ئەو ماوەیەی لێرە دەبیاتە سەر باش ڕەفتار بکات.**

**ئیمزا**

**دەبل یو. مۆریس[195]**

**٢٢ی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣)).**

هەر لەژێرەوەی ئەو تێبینییانەی مۆریسدا دوای چوار ڕۆژ دەبل یو. مارسدێنیش تێبینییەکانی خۆی، کە دوو هێندی تێبینییەکانی مۆریس دەبن، بەم جۆرەی لای خوارەوە تۆماری کردوون:

**((دەربارەی برگەی چوارەم و پێنجەمی تێبینییەکانی میستەر مۆریس دەڵێم سێ کەس لە گوتەبێژانی کورد- تاڵەبانی و میر بەدرخان و شەوکەت عەقراوی ئیمساڵ داوای ڤیزەی بەریتانییان لێ کردین. هۆکانی هەڵوێستی ئەوسای ئێمە لە ملن یا نەدانی ڤیزەی بەریتانی پێیان هاوسەنگ بوون. هۆ دژەکان بریتی بوون لەوەی کە دانی ڤیزە پێیان موجازەفەیە چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی چالاکیی لە خاکی ئێمەدا دژی حوکمەتی عیراق، ئەوەیش دەبێتە مایەی ناڕەزایی عیراقییەکان. لە لایەکی دیکەوە ئەگەر ئێمە ڕێگە نەدەینە ئەو گوتەبێژانە ئەوساکە**

---

(195) سێر ویلیی مۆریس (Sir Willie Morris): ڕۆژی سێی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ لەدایك بووە، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆردە، لە ساڵی ١٩٤٧وە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی و لە گەلێك وڵاتی عەرەبیی وەك میسرو سعودییە و یەمەن، وێڕای حەبەشە کاری کردووە، لەنێوان ساڵانی ١٩٦٠-١٩٦٣ دا بۆتە سەرۆکی بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی. بڕوانە:
((Who's Who 1980. An Annmual Biographical Dictionary)), London, 1980, P. 1816.

دەبینە تاکە وڵات لەو بووارەدا و وا دەردەچێت کە ئێمە بەشدارێکی سەرەکیین دژی کوردو ئەوەیش پتر بابەتی دانی چەك بە عیراقییەکانمان لێ دەوروژێنێت، وێڕای ئەوەی لەوانەیە لە پەرلەمانیشدا ڕەخنەمان لێ بگیرێت ئەگەر هاتوو بەوە زانرا کە نەمانویستووە گوێ بدەینە پرسی کورد. خاڵێکی دیکە کە پێویستە وەبەرچاو بگیرێت بریتییە لەوەی کە کوردەکان دەتوانن زیانی زۆر گەورە لە (کۆمپانیای نەوتی عیراق) بدەن، ئەو کاتەیش کارێکی بێ عەقڵی دەبێت ئەگەر موجازەفەی ئەوە بکەین سزایان بدەین چونکە بەو جۆرە پاڵیان پێوە دەنێین ئەوانیش دەستبەرداری ئەو سیاسەتەی ئێستایان بن کە توخنی دەزگاکانی نەوت ناکەون.

من بۆ خۆم لایەنگری ئەوەم کە:

أ- ڤیزە بدرێتە ئەو گوتەبێژانەی کورد کە سومعەیان باشە.

ب- پێویستە ئەوەی لە تواناادا بێت بیکەین، بەڵکو گفتێکی نافەرمیش لەو گوتەبێژانە وەربگرین کە ڤیزەیان دەدرێتێ هیچ چالاکییەکی ئاشکرای جەماوەریی نەکەن.

ج- نابێت ڕێگە بدرێت هیچ جۆرە دیدەنییەکی فەرمی لەگەڵ ئەو گوتەبێژانەدا بکرێت، باشتر وایە ڕێگە بدرێتە بەرپرسێکی پچووك لە دەرەوەی بارەگای وەزارەتی هەندەران بیانبینێت و گوێ بگرێت لەوەی دەیانەوێت بیڵێن(196).

من لەو بڕوایەدا نیم ڕووداوەکانی ئیمڕۆی عیراق لەوە بچێت ببنە هۆی ڕوودانی وەرچەرخانێك لە پێوەندیی نێوان حوکمەتی عیراق و کوردا. پێمان وایە حوکمەتی عیراق ئێستا پتر لە هەرشت حوکمەتێکی سەربازییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا لەوانەیە کە کێشەی کورد لە وەرزی زستاندا، بەهۆی کزبوونی شەڕەوە کەمتر خۆ بنوێنێت، ئینجا میری دەست لە هەڵوێستی ڕەقی خۆی هەڵناگرێت و ئامادە نییە، بەپێی ئەو مەرجانە نەبێت کە ئاسان نییە مەلا مستەفا پێیان قایل بێت، وتووێژ

---

(196) تاڵەبانی لە دانیشتنێکدا باسی ئەوەی کردووە چۆن لەو ساڵانەدا دیپلۆماسییەکی بەریتانی لە گازینۆیەك لە دەرەوەی بارەگای وەزارەتی هەندەران لەگەڵی دانیشتووەو باسی کێشەی کوردیان کردووە، دوور نییە ئەوە بەپێی پێشنیارێکی وەکو ئەوەی سەرەوەی مارسدێن بووبێت.

بكات. لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا وا چاوەڕوانم ئەو نوێنەرە کوردانەی داوای ڤیزەیان لێمان کردووە تا ڕادەیەك ڕێکوپێك ڕەفتار بکەن، هەڵوێستمان بەرانبەریان پێویستە هەر بەو جۆرە بێت کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێی داوە.

بەجیا تێبینییەکانی خۆم دەربارەی بابەتی پێوەندییە گشتییەکانی ئێستای کوردی عیراق دەردەبڕم.

ئیمزا

دەبلیو. مارسدێن))[197].

لە هەمان فایلدا بەڵگەنامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا هەڵگیراوە، باسی ئەو گفتوگۆ سەیرەی نێوان خودی باڵوێزو وەزیری بەرگریی نوێی عیراق حەردان تکریتی دەکات کە دەربارەی کێشەی کورد لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٣دا لە کاتێکدا هەردووکیان پێکڕا بە تەنها کۆبوونەتەوە، ئەمەیش دەقی وەرگێڕاوەکەیەتی:

((نهێنی،

لە بەغداوە،

بۆ وەزارەتی هەندەران،

بە شفرە،

بۆ لۆرد ڕۆجەر ئەلێن،

ژمارە ١٠١٣،

یازدەی کانوونی یەکەمی ١٩٦٣.

بروسکەی ژمارە ١٠١٣ی یازدەی کانوونی یەکەمی ١٩٦٣ دەنێرین بۆ واشنتۆن و تاران و قاهیرە.

١-ئەم بەیانییە چوومە سەردانی حەردان تکریتی وەزیری بەرگری و لێم پرسی: ئایا باری هێرش بۆ سەر کورد لە چیدایە ؟. لە وەڵامدا گوتی: باش دەڕوات بەڕێوە، ماوەتەوە سەر تەنها چەند دەستەیەك لە یاخیگەران.

---

(197)N.A., F.O., 371|170450, Minutes, Confidential, Kurds.

له وەڵامدا پێم گوت: لەگەڵ ڕێزمدا، بە لایەنی کەمەوە پێنج مانگ دەبێت، من هەمان وەڵام لە سەرچاوەی فەرمیی جیاوازەوە دەبیستم. دوای ئەوە لێم پرسی ئایا هیچ ئەگەرێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نییە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ مەلا مستەفادا ؟.

تکریتی گوتی: ئەو پێی وایە ڕێککەوتن لەگەڵ مەلا مستەفادا ئێستا مومکینە، مەلا مستەفا بۆ خۆیشی داوایەکی وای کردووە. لە وەڵامدا بە تکریتیم گوت: من زۆر بەختەوەرم بەوەی قسەیەکی وا لەو دەبیستم هەرچەندە ناشزانم مەرجەکانی کورد بۆ ڕێککەوتنێکی لەو بابەتە چین. وەزیر گوتی: ئێستاکە هیچ پرسێکی دامەزراندنی حوکمەتێکی کوردیی جودا لە ئارادا نییە، کورد ئەمانەیان دەوێت:

أ- دروستکردنەوەی گوندەکانیان.

ب- چەککردنی هێزەکانی میری و سووارەکانی کورد.

ج- ڕێگە بدرێتە هەموو کوردەکان بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان.

د- پێویستە یاریدەی تایبەتی کورد بدرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەی خوێندن بە زمانی کوردی و ئەو جۆرە بابەتانە.

وەزیر گوتی: هیچ جۆرە کۆسپێك لەبەردەم چارەسەرکردنی خاڵی یەکەم و چوارەمدا نییە، هەرچی دووەمیشە پێویستە چەکی هەردووك لا بە خێرایی دابماڵرێت، بەڵام خاڵی سێیەم بە هیچ جۆر هەنگاوێکی لەبار نییە، چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی ڕووبەڕوو بوونەوە (هەراوبگر) (بەڵام من بە تەواوەتی لێم ڕوون نەبوو مەبەستی وەزیر ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ حوکمەتە[198] یان لەنێو هۆزە کوردەکان خۆیاندا).

٢- تکریتی وای نیشان دا کە ئەو زۆر ئاگاداری مەودای پێویستی کۆتایی هێنانی شەڕە لە باکوور. پێم گوت ئێستاکە گەلێك کەس لە بەغدا پێم دەڵێن کاتی ئەوە هاتووە کۆتایی بەو شەڕە بهێنرێت و من بۆ خۆم لەو بڕوایەدام ئەگەر حوکمەت بتوانێت کارێکی وەها جێبەجێ بکات ئەوساکە زۆر لە پایەو مەقامی خۆی بەرز دەکاتەوە.

---

(198) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت ((vis-à-vis)) کە زاراوەیەکە واتای ڕووبەڕوو یا بەرانبەر بەیەکتر دەگەیێنێت.

٣- جەنراڵ تکریتی گەلێك گەشبینە دەربارەی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەو بەوەی کە ئەوە ئاوات و خۆزگەی گشت ئەو کاربەدەستانەیە کە من لەم بارەیەوە دواندومن.

٤-وەزارەتی هەندەران با ئەم نامەیە بنێرێت بۆ واشنتۆن و تاران و قاهیرە، وێڕای ئەو بروسکانەم کە ژمارەکانیان پەنجاو نەوەت و سێ سەدو بیست و چوارن[199].

باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغدا، پاش تەنها سێ ڕۆژ، دیسانەوە دێتەوە سەر باسی شەڕە بەناوبانگەکەی چەمی ڕێزان و پێوەندیی نێوان ڕژێمی عەبدولسەلام عارف و کورد، ئەمەی لای خوارەوە دەقی وەرگێڕدراوی ئەو بەڵگەنامە دوورو درێژەیە کە سەرجەمی خاڵەکانی بەڵگەی سەلمێنەری بایەخدانی زۆری ئەمەریکایی و ئینگلیزەکانن بە ڕووداوو ئاڵوگۆڕەکانی کوردستانی عیراق لەو قۆناغەدا:

((باڵوێزخانەی بەریتانی،

بەغدا،

ژمارە ١٠١١٤|٢٥٧|٦٣،

١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٣،

نهێنی

١- تکایە بگەڕێنەوە بۆ ئەم نامانەم: ژمارە ١٠١١٤|٢٥٥|٦٣ ی ڕۆژی حەوتی کانوونی یەکەم و ژمارە ١٠١١٤|٢٥٥|٦٣ ی ڕۆژی سیی تەشرینی دووەم، کە هەردووکیان لەمەڕ ڕووداوەکانی کوردستانن.

٢- ئێستا هەواڵی ئەو شەڕەی چەمی ڕێزانمان پێگەیشت، کە واتایەکی مێژوویی روونی هەیە، وێڕای ئەوەش تیشك دەخاتە سەر هەڵوێستی ئێستای حوکمەتی عیراق بەرانبەر کێشەی کورد. سێ ڕۆژ لەمەوبەر گوتەبێژێکی فەرمیی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بە ئەندامێکی باڵوێزخانەی ئەمەریکایی (لە بەغدا- ك.م.) ڕاگەیاندبوو کە سوپای عیراق لە شەڕی چەمی ڕێزاندا دوو هەزار کەسی لێ

(199)N.A., F.O., 371|170450, Confidential, From: Baghdad Embassy, To: Foreign Office, Cypher OTP, To: Lord Roger Allen, No, 11, 1963, Addressed to Foreign Office telegram No. 1031 of December 11.

کوژراوەو ئەو لە دیقەتی ئەو قسەیە گەلێك دڵنیا بوو. ئەمەریکاییەکان لە سەرچاوەیەکی دیکەوە پێیان گوتراوە کە ئەو ژمارەیە لەوانە نییە لە هەزار کەس تێپەڕێت. هەوڵم دا ئەم ژمارانە هەڵسەنگێنم و بەراوردیان لەگەڵ ئەو ژمارەیەدا بکەم کە کوردێك داوییە بەدانێس[200]، ئەویش هەزارو شەش سەد کەسە، ئەو ژمارەیەی کە بەر لە ئێستا من ئاماژەم بۆی نەکردووە، بەڵام دانێس پێی وایە لەوانەیە ئەو ژمارەیە ڕاست بێت. ڕۆژنامەی (خەبات)ی نهێنی لەو ژمارەیەی خۆیدا، کە مانگی تەشرینی یەکەم دەرچووە و زۆر نییە دانێس دانەیەکی لێی پێگەیشتووە، دەڵێت: زیانی ئەو هێزەی حوکمەت، کە ڕۆژی یەکی تەشرینی یەکەم هێرشی پێ کردە سەر چەمی ڕێزان، دەگەیشتە سی هەزار (٣٠٠٠٠) کەس، بەڵام ئێمە پێمان وایە ئەو هێزە لە چوار لیوا پێکهاتبوو کە ژمارەیان ڕەنگبێت بگاتە دوازدە هەزار کەس. کوردەکان دەڵێن دوای حەفتەیەك لە شەڕی قورس، کە بوونە هۆی کوشتن و بریندار کردنی ژمارەیەکی زۆری دوژمن، پێشمەرگە لە چەمی ڕێزان کشانەوە (پێمان گوترابوو کوردەکان بەر لە کشانەوەیان بەشی زۆری ئازووقەو کەلوپەلی خۆیان گواستبۆوە شوێنی دیکە). بەپێی قسەی ڕۆژنامەی (خەبات) لەو شەڕەدا یازدە تانك یا زرێپۆش پێکراون. ڕۆژنامەکە لە سەری دەڕوات و دەڵێت: ڕۆژی حەڤدەی تەشرینی دووەم کوردەکان توانییان چەمی ڕێزان بگرنەوە. ئەو کوردەی پێوەندیی بە ئەمەریکاییەکانەوە هەیە ئیدیعا دەکات کە سوپای حوکمەت زۆر بەرگریی نەکردووەو چوار سەد کەسیشیان لێ بەدیل گیراوە.

٣- بەپێی قسەی یەکێك، کە پێوەندی بە سوپاوە هەیەو جێگەی متمانەیە، کە دوێنێ لێیم پرسی، لە وەڵامدا گوتی: ناتوانم دەربارەی زیانەکانی سوپای عیراق لە (چەمی ڕێزان- ك.م.) ژمارەیەکی دیارت پێ بڵێم، بەڵام دڵنیام کە زیانەکانی سوپا گەلێك گەورە بوون[201].

---

(200) لە بەڵگەنامەکەدا ناوی دانێس (Danes) ئاوەها بە ڕووتی هاتووە، بێ ئەوەی ئاماژەی بۆ کاری، یا پێناسەکەی کرابێت، بۆیەکا بێ سوود هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ناسینەوەی، لەوانەیشە ناوی خوازراو (موستەعار)ی کارمەندێکی باڵوێزخانەی بەریتانی بێت لە بەغدا.

(201) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە. ((but they were very heavy)).

٤- له شەڕێکی لەو جۆرەدا ڕێی تێناچێت زیانەکانی سوپای میری هێند گەورە بووبن کە بگەنە نەك دوو هەزار بەڵکو هەزار کەسیش، لەوانەیە ئەو زیانانە ئەوپەڕەکەی دوو سەد یان سێ سەد کەس بن. پتر لەوەیش کوردەکان کەڵك لە دەنگوباوێکی وا گەورە کراو دەبینن چونکە ئەوە بۆ ئەوان لەناو ڕیزەکانی سوپای میریدا باش ڕەنگ دەداتەوە کە خۆی لە خۆیدا گەلێك گیرۆدەی دەستی سەرماو سۆڵەو ئەو ڕاستییەی کە هیچ نیشانەیەکی تەواوبوونی ئەم شەڕە لە ئاسۆدا بەدی ناکەن. دوور نییە ئەمە خۆی لە خۆیدا بووبێتە هۆی ئەوەی گەلێك ڕاپۆرتمان پێ بگات کە باسی ئەگەری دەستپێکردنەوەی وتووێژ لەگەڵ کورددا دەکەن. دوێنێ دوو سەرچاوەی جیاواز، بەڵام هەردووکیان جێگەی باوەڕن، پێیان ڕاگەیاندم کە لەم هەلومەرجە نوێیەدا کوردەکان وای بەباش دەزانن کە خودی سەرەك وەزیران بۆ وتووێژ بچێتە کوردستان. دەشڵێن گوایە لەوانەیە وەزیری هەندەرانی عیراق لە قاهیرە پێوەندیی بە شەوکەت عەقراوییەوە، کە نوێنەری کوردە لە قاهیرە، کردبێت، دەشڵێن ئیبراهیم ئەحمەدی سکرتێری گشتیی (پارتی دیموکراتی کوردستان) دوای ئەوەی گەیشتە قاهیرە ئەویش داویەتە پاڵ عەقراوی. دەڵێن ئامانجی سەرەکیی ئەم هەواڵانە پتەوکردنی هەڵوێستی (بەرەی- ك. م.) ناصر- عارفە لە عیراق. هەمان کات وا باوە ماجید مستەفا، کە یەکێکە لە وەزیرە کوردەکانی ڕۆژگاری پاشایی، پاڵێوراوە بۆ پۆستی جێگری سەرەك کۆمار ئەگەر بێتو بتوانێت کێشەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکاندا بڕەوێنێتەوە (ئیگێرتۆن بە جیا ڕاپۆرتێکتان دەربارەی ئەم بابەتە پێشکەش دەکات). هەروەها چەند چیرۆکێکمان دەربارەی ئەوە بیستووە کە حوکمەت گەلێك بەپەرۆشە بۆ ئەوەی بابە عەلی مستەفا[202]ی وەزیری کشتوکاڵ لە ڕۆژگاری بەعسدا ببێتە ناوبژیکەر (لەنێوان میری و کورددا- ك. م.). بابە عەلی یەکێك بوو لە بەشدارانی وتووێژی حوزەیرانی ئیمساڵ لەگەڵ کورددا و وەك دەڵێن ئەو بە هیچ جۆر نایەوێت جارێکی دیکە ئەو تاقیکردنەوەیە دووپات بکاتەوە. هەرچۆن بێت بەپێی قسەی کوردە ئاگادارەکان نە ماجید مستەفا و نە بابە عەلی لای کورد پەسەند نین.

---

(202) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە، ئەوەیش تێکەڵکردنێکی بێمەبەستە لەنێوان بابە عەلی کوڕی شێخ مەحموود و عەلی مستەفادا.

٥- کوردەکـان، بـەپێی قـسەی ئـەو کـوردە پێوەندیـدارە لەگـەڵ ئەمەریکاییەکانـدا، خۆیـان بـۆ بزووتنەوەیـەکی دیکـەی دژ بـە حوکمـەت ئامـادە دەکەن، واش پێدەچێت یەکێك لە هـەنگاوەکانی (ئـەم نەخشەیە- ك. م.) هێرش بردنە سەر خودی شاری کەرکوك بێت. وەك دەشڵێن کوردەکان داوایەکی میرییان بۆ ئاگربەست لەکاتی وتووێژدا ڕەت کردۆتەوە. ئەو کوردە (پێوەندیدارە- ك. م.) بە وردی بە باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی نەگوتووە کە کوردەکـان نیازیانـە لـەم بارەیەوە چی بکەن، بەڵام ئەوەی لەم بـووارەدا سـەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیـە کـە ڕۆژنامەی (خەبات) لەو ژمارەیەی تەشرینی دووەمیدا قسەیەکی جـەلال تاڵـەبانیی وەرگرتـووە کـە گوایـە کوردەکـان خـەریکی دامەزرانـدنی هێـزی فیـدائین (بـۆ پاککردنەوەی شارەکان لە بوواری خۆ ئامادەکردندا بۆ ئازاد کردنی گشت عـێراق). ئێمە گومان دەکەین کورد بتوانن هیچ شارێك، تەنانەت سلێمانیش، ئـازاد بکـەن، بەڵام دوور نییە ئەمە نیمچە ئاماژەیەك بێت بۆ ئەو هێرشانەی لەوانەیە بکرێن.

٦- ئەو کوردە پێوەندیدارە بە ئەمەریکاییەکانـەوە، چ لـە هەڵوێستی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا و چ ئێمـەش (واتـا بەریتانییـەکان- ك. م.) گـەلێك ناڕازییە، ئەو زۆر بەتونـدی ڕەخنـەی لـە ئەمەریکاییـەکان گـرت چـونکە ڤیزەیـان نەدایە نوێنەرانی کورد تاوەکو ئامادە بن لە نەتەوە یەکگرتووەکان لـە نیویـۆرك و ئاماژەی بۆ گـەلێك نموونـە کـرد، هـی وەك هەڵوێستی ئەمەریکاییـەکان بەرانبـەر کاپتەن گالڤۆی دوژمنیان[203]، هەرچی هۆی ڕقیشیانە بەرانبەر بە ئێمە (مەبەستی حوکمەتی بەریتانییە- ك. م.) لەوەوە هاتووە کە ئێمە چەك دەدەیـن بـە سـوپای عێراق. لەم چەندانەی دواییدا هەستم بـەوە کـردووە کوردەکـانی بەغـداش لەسـەر ئەوە هەستی دوژمنایەتییان بەرانبەرمان پەرەی سەندووە. ئەوان ئـەو هۆیانـەیان بە لاوە پەسەند نین کە دەبنـە کۆسپ لەبـەردەم دەسـتێوەردانمان لـە کاروبـاری سیاسیی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، پێیان وایە چونکە کورد زۆریان بەدەست دڕندەیی حوکمەتی عیراقەوە چێشتووە بۆیەکا پێویستە ڕێگەیەك بدۆزرێتـەوە بـۆ

---

(203) کاپتەن گالڤۆ (Captain Galvo): دەریاوانێکی چەتەو ڕێگری پورتوگالی بوو، لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، لە نزیك ڕۆخەکانی بەرازیلەوە ژمارەیەك سیڤیلی ئەمەریکایی بەدیل گرتووە، لەگەڵ ئەوەیشدا حوکمەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا توندڕەو نەبووە لەگەڵیدا.

یاریدەدانیان. هیچ شتێك قەناعەتیان پێ ناكات كە ئێمە ئەدەبییەن مەجبوور نین یاریدەیان بدەین، لەگەڵ ئەوەیشدا وردە وردە خەریكە دەركی ئەوە دەكەن كە روودانی ئەو شتە لە ڕاستیدا گەلێك دوورە[204]. هەرچۆن بێت ئەو ڕقە بەرانبەر ئێمە لەوانە نییە، هیچ نەبێت لەم قۆناغەدا، ببێتە هۆی ئەوەی وەرچەرخانێكی گەورە لە هەستیاندا بەرانبەر رووس روو بدات.

كوردەكان دالدەی ژمارەیەكی دیاریان لە كۆمۆنیستەكان داوە، بەلام بەپێی قسەی ئاگاداران ئەوان نە ڕێگەی چەك هەلگرتن نە بەكار هێنانی چەكیان نەداونەتێ چونكە بڕوایان پێیان نییە. پێمان وایە ئەمە تاوەكو ئێستاكەیش لە ئارادایە، بەلام رووسەكان گەلێك هەوڵ دەدەن خۆیان لە كورد نزیك بخەنەوە هیچ نەبێت لە ڕێگەی پشتگیریی ئەدەبییانەوە، ئەوەیش لەوانەیە لەگەڵ كاتدا ببێتە هۆی ئەوەی تا ڕادەیەك جێ پێی خۆیان بكەنەوە بەو مەرجەی شەڕ لە كوردستاندا نەوەستێت.

٧- وێنەی ئەم نامەیەم دەنێرم بۆ باڵوێزخانەكانمان لە هەریەك لە واشنتۆن و تاران و ئەنقەرەو بێروت و قاهیرە و دیمەشق و مۆسكۆ و عەمان و بەحرەین و عەدەن و نیقۆسیا.

ئیمزا

إی. ف. گ. ماینارد))[205].

هەمان ڕۆژی چواردەی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٦٣ ماینارد ئەم نامەیەشی، دەربارەی وتووێژی حوكمەتی عەبدولسەلام عارف لەگەڵ سەركردایەتیی شۆڕشی كورددا، ناردووە بۆ بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە لەندەن:

---

(204) مەبەستی ئەوەیە بڵێت كوردەكان خەریكە لەوە تێ بگەن كە لە داهاتووشدا لەوانە نییە حوكمەتی بەریتانی بتوانێت دەستی یاریدە بۆ كورد درێژ بكات.

(205)N.A., F.O., 371|170450, Confidential, From: E.F.G. Maynard, British Embassy, Baghdad, No. 10114\257\63, December 14, 1963, To: W.Marsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

((نهێنی،
باڵوێزخانەی بەریتانی،
بەغدا،
ژمارە ١٠١١٤|٢٦١|٦٣،
١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٣.

١- تکایە بگەڕێنەوە بۆ نامەی ڕۆژی چواردەی کانوونی یەکەمم کە دەربارەی رووداوەکانی کوردستانە.

٢- ئیمڕۆ لە بەغدا هەر باسی ئەوەیە کە گفتوگۆ لەگەڵ کورددا هەنگاوی باشی بەرەوپێش ناوە، گوایە کێشەکە لە ماوەی یەك حەفتەدا چارەسەر دەکرێت. هەرچەندە ئەمە بەلای ژمارەیەك لەو کوردانەی ئێمە پێوەندیمان پێیانەوە هەیەو بڕوایان بە هەموو شتێك نییە ڕێی تێ دەچێت، بەڵام بەلای ئێمەوە کەمێك ترش و خوێ بەو باسەوە کراوە. دوور نییە ئەو زیارەتەی شێخ ئەحمەدی بارزان، لەژێر چاودێریی میریدا، بۆ بەغداد و کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرەك وەزیراندا بووبێتە هۆی ورووژاندنی ئەم مەسەلەیە. هەروەها ئەوەیشمان بیستووە کە ساڵح عەبدوڵڵا یوسفی لە بەندیخانە ئازاد کراوەو گەڕاوەتەوە کوردستان. یوسفی کە بەرپرسیاری بەغداو باشووری عیراقە لە (پارتی دیموکراتی کوردستان)دا تاکە ئەندامیی سەرەکیی وەفدی وتوویژی کوردی بوو کە لە بەغدا مابۆوە کاتێك حوکمەت شەڕی هەڵگیرساندەوە بۆیەکا گیرا. دەڵێن بەعسییەکان ئەو ڕۆژانە دڕندانە ڕەفتاریان لەگەڵ کردووە. بەپێی دەنگوباوێك، کە وا پێدەچێت ڕاست بێت، لەکاتی ئامادەکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیەی کە دەبێت لەلایەن حوکمەت و مەلا مستەفاوە ئیمزا بکرێت وا بە باش زانرا ساڵح یوسفی بمێنێتەوە نەبا حوکمەت دەربارەی وتووێژ پێویستیی پێی بێت، ئەوساکە هەموو کات دەتوانێت قسە لەگەڵ ئەو بکات چونکە یوسفی زۆر باش ئاگاداری بیروبۆچوونەکانی مەلا مستەفایە. ئەمە ڕاست بێت یا نا، ئازاد کردنەکەی یوسفی لە بەندی نیشانەیەکی مژدەدەرە.

٣- شتێکی ئەوتۆ ئاگادار نین دەربارەی پێوەندیی نێوان هەردووك باڵی نێو پارتی، بەڵام ئەو کوردانەی لێرە پێوەندیمان پێیانەوە هەیە دەڵێن پێویست ناکات

بایەخێکی زۆر بەو ڕاپۆرتانە بدرێت کە باسی ناکۆکیی نێوان مەلا مستەفا و حیزب دەکەن، چونکە هەردووک لایان بەرانبەر حوکمەتی عیراق لە بەرەیەکدان. گومان لەوە دەکەین وتووێژی نێوان کورد و حوکمەت بگاتە ئاستی وتووێژێکی بەرفراوان. زۆر لەوە دەکات شەپۆلێکی گەشبینیی عەرەبیی تەقلیدی لە ئارادا بێت بێ وەبەرچاو گرتنی ڕاستییەکان (حەقیقەتەکان). زەحمەتە ئەوە بزانرێت حوکمەت تا چ ڕادەیەک ئامادەیە ئەو مەرجانە پەسەند بکات کە لەوانەیە کورد داوایان بکەن وەک کەمترین گەرانتیی بۆ دوارۆژیان.

٤- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرم بۆ هەریەک لە باڵوێزخانەکانمان لە واشنتۆن و تاران و ئەنقەرەو بێروت و قاهیرە ودیمەشق و مۆسکۆ و کوێت و عەمان و بەحرەین و عەدەن و نیقۆسیا.

ئیمزا

إی. ف. گ. ماینارد))[206].

تارانیش، بە پیشەی هەمیشەیی خۆی، بێ ئەندازە عەودالی گشت هەواڵەکانی عیراقی ئەو ڕۆژگارەو تایبەت پێوەندیی نێوان حوکمەت و کورد بوو، چەندیش بۆی بلوایە هەوڵی دەدا لە هەزار سەرەوە دەست وەرداتە سەرجەمی ئاڵوگۆڕ و ڕووداوەکانی عیراقەوە، ئەو ڕاستییەی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانی کەم تیشکیان نەخستۆتە سەرو گەلێک جار لە دووتوێی ئەم بەرهەمەدا هەستمان پێی کردووە. ئەم بەڵگەنامەیەی لای خوارەوەیش بریتییە لە نامەیەکی نهێنیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە تاران کە ڕۆژی دوازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ ناردوویە بۆ بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی بەریتانی دەربارەی بیروبۆچوونی محەمەد ڕەزا شاو حوکمەتەکەی لەم بووارەدا:

((١- دوێنێ وەزیر موفەوەزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە تاران پێی گوتم کە سەرەک وەزیرانی ئێران پێی ڕاگەیاندووە کە ئەو لەو بڕوایەدایە تا

(206) Ibid, Confidential, From: E.F.G. Maynard, British Embassy, Baghdad, No. 10114/261/63, To: W. Mardem, Eastern Department Foreign Office, London, S.W.1.s

ڕادەیەك ڕاستیی لەو ڕاپۆرتانەدا كە لە بەغداوە گەیشتوونەتە حوكمەتی ئێران، وەدی دەكرێت دەربارەی ئەوەی مەلا مستەفا خەریكە لەگەڵ حوكمەتی ناوەندیدا جۆرە ڕێككەوتنێك ببەستێت و حوكمەتیشی لەوە ئاگادار كردووە. ئەمە شتێكی سەرنج ڕاكێشە لەبەر ڕۆشنایی ئەو هەواڵەی لەو بروسكەیەی باڵوێزخانەی (بەریتانی– ك. م.)دا هاتووە كە ژمارەكەی ١٣٠١ و ڕۆژی یازدەی كانوونی یەكەم لەوێوە نێردراوە بۆ وەزارەتی هەندەران.

٢– ئێمە لێرە شتێكی ئەوتۆمان نییە بیخەینە سەر ئەمە جگە لەوەی حەفتەی ڕابردوو موسافیرێكی عیراقی كە جێگەی بڕوایەو تاڵەبانیی دیوە نەك مەلا مستەفا، ئەو دەڵێت تاڵەبانی وای نیشان داوە لەوە نیگەرانە كە بزووتنەوەی كوردی وا لێكبدرێتەوە كە بزووتنەوەی شەرواڵ لە پێ و كڵاو لەسەری هۆزایەتیی[207] بێ، نەك وەك بزووتنەوەیەك كە هەستی ڕووناكبیران و شارەزایانی كورد دەربڕێت. تاڵەبانی بێ ئەندازە لە كاربەدەستانی حوكمەتی بەریتانیش ناڕازییە لەسەر ئەوەی ڤیزەی بەریتانییان نەداوەتێ. دەڵێن ئەو گوتوویە كورد بەشێك نین لە وڵاتە ژێردەستە (موستەعمەرە)كانی بەریتانیا، ئەگینا دەیانتوانی داوای یاریدەی نێو دەوڵەتی بكەن، ئەو بارودۆخەی ئەوانی تێدان بۆتە هۆی خستنە پشت گوێی پرسی نەتەوەییان.

٣– بەپێی ڕاپۆرتەكان تاوەكو ئێستەیش پێوەندییەكی هەست پێكراو لەنێوان كوردستانی ئێران و كوردستانی عیراقدا هەیە، زۆربەی پەنابەرەكانی دیوی عیراق پەنابەری چەكدار نین، هەروەها وا دیارە ئازووقەیەكی زۆر لێرەوە بۆ كوردەكانی عیراق دەچێت و بەشی هەرە زۆری بریتییە لە شەكرو نەوت و ئەو جۆرە شتانە، وێڕای ژمارەیەكی كەم لە تفەنگی چیكی. حەفتەی ڕابردوو كاتێك شا قسەی لەگەڵ یەكێكی سەر بە ئێمە دەكرد[208] گوتی ئەو هیچ كۆسپێك ناخاتە بەردەم ئەوەی

---

(207) مەبەستی لەوەیە بزووتنەوەی كوردایەتی بخرێتە چوارچێوەی وێنەیەك، یا قاڵبێكی پاشكەوتووەوە.

(208) لە دەقەكەیدا وا هاتووە: ((Speaking last week to an informant of ours)) كە واتای موخبیرێك، یا سیخوڕێكی ئێمە دەگەیێنێت.

برێك یاریده بۆ كوردەكانی عیراق بچێت، بەپێی بیری ئەو باشترین چارەسەری ڕاستەقینەی كێشەكە ئەوەیە كە كوردی عیراق بگەنە جۆرە ڕێككەوتنێك لەگەڵ حوكمەتی بەغدادا. دیار بوو شا مەترسیی لەوە نییە كورد نەتوانن خۆیان لەبەردەمی هێرشی سوپای عیراقدا بگرن، بەڵكو لەوەیە چەندەی كێشەكە درێژە بسێنێت، هێند پتر دەرفەت بۆ دەست تێوەردانی لایەنێكی سێیەم دەڕەخسێت.

٤- وێنەی ئەم نامەیە دەنێرمە بەغداو قاهیرە و دیمەشق.

ئیمزا

هـ. فلیپس))[209].

دوا سێ بەڵگەنامەی ناو هەمان فایل بۆ دوو بروسكەی ژمارەیەك لە سەرەك هۆزانی بادینان و دیدەنیی ڕادیۆو تەلەڤیزیۆنی بەغدا لەگەڵیاندا تەرخان كراون، كە ناوەڕۆكیان جارێكی دیكە كورتبینی عەبدولسەلام عارف و دەستەو دایەرەكەیمان نیشان دەدەن كە چۆن وەك جاری جاران هەوڵ دەدەن لەسەر گشت پەتەكان یاری بكەن، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەكانیانە:

((ب٧٣

سەرۆكانی كورد لە تەلەڤزیۆنی بەغدادا،

ڕادیۆی بەغدا.

ئیمشەو چوار كەس لە براكانمان، كە سەرۆكی هۆزە كوردییەكانن، بە دەنگ بانگەوازەكەی سەرەك كۆمار عارفەوە هاتوون، چەكەكانیان داناو دڵسۆزیی خۆیانیان بۆ حوكمەتی نیشتمانی دەربڕی و لە تەلەڤزیۆنی بەغداشدا نیشان دەدرێن)).

بروسكەی دووەمیان بەم جۆرەی لای خوارەوە پتر ڕۆشنایی دەخاتە سەر ئەم بابەتە:

---

(209) N.A., F.O., 371/170450, From: H.Phllips, British Embassy, Tehran, No. 18…/63, December 12, 1963, To: W. Morris, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1.

((سەرۆکەکانی کورد لە ڕادیۆو تەلەڤیزیۆنی بەغدادا:

ئیمشەو ڕادیۆی بەغدا دیدەنیی تەلەڤزیۆنی بەغدای لەگەڵ سێ سەرۆکی هۆزە کوردەکاندا نیشان دا، ئەوانەی بە دەنگ داواکەی سەرەك کۆمار عارفەوە هاتوون و لەگەڵ چوار سەد کەس لە پیاوەکانیان تەسلیمی حوکمەت بوون.

ئەو سێ کەسە ئەمانەن: عەبدولواحیدی حاجی مەلای سەرەك هۆزی مزوری و ئەبوبکر عەبدی ئەزیدکیی کوڕی سەرەك هۆزی ئەزدیکی و عەبدی ئاغای ئەزدیکی، ئەفسەری ناوچەی دهۆك عەبدولکەریم تکریتیشیان لەگەڵ هاتبوو.

هەواڵنێرەکە گوتی: سەرەك هۆز یونس محەمەد کە لە هۆزی ئەزدیکییە، سەرەك هۆز حیکمەت عابد، کە لە هۆزی مزورییە، ئەوانیش هاتبوونە ستۆدیۆی تەلەڤیزیۆنی بەغدا.

ئەو سێیانەی یەکەم کە قسەیان کرد داوایان لە کوردەکان کرد ئەوانیش هەمان ڕێگە بگرنە بەرو بارزانییان تاوانبار کردو گوتیان ئەو گفتەی عەبدولسەلام عارف دابووی دەربارەی ئەوەی لەوانە خۆش بێت کە خۆیان دەدەن بە دەستەوە ڕاست و دروستە)).

شایانی باسە وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی ئەم هەواڵەی لە ڕێگەی ئینساتی ((ئیزگەی بی. بی. سی))یەوە وەرگرتووە[210].

بەو جۆرە ڕژێمە لاوازەکەی عەبدولسەلام عارف دووی کڵاوی بابردوو کەوتبوو، لە کاتێکدا دەیتوانی لە ڕێگەی عەقڵەوە کورد بکاتە دۆستێکی نزیکی خۆی و جێ پێی ڕژێمەکەی لەو ڕێگە دروستەوە قایم بکات، ڕادەیەکیش بۆ ئەو کێشانەی دیکە دابنێت کە لە ڕۆژانی کۆدێتای هەشتی شوباتەوە زۆرینەی گشت چین و توێژەکانی وڵات، بە عەرەب و کورد و تورکمان و کلدان و ئاشووری و شیعە و سوننەو عیسابیەوە، گیرۆدەیان ببوون. بەڵگەنامەیەکی نهێنیی یەکجار دانسقە و گرنگی حوکمەتی بەریتانی زۆر بە وردی باسی لایەنە جیاوازەکانی گشت ئەو کێشانەمان بۆ دەکات کە حوکمەتەکەی عەبدولسەلام عارف گیرۆدەیان ببوو، وا لە خوارەوە خاڵە سەرەکییەکانی ئەو نامەیە تۆمار دەکەین.

---

(210)Ibid, Kurdish heads to appear on Baghdad T.V., B.B.C. Monitor 2250, 2/12 ND., December 2, 1963.

بالۆیزی بەریتانی، لە خاڵی یەکەمی نامەکەیدا بەم جۆرە باسی ململانێی رژێمەکەی عەبدولسەلام عارفمان لەگەڵ پاشماوەکانی ((حەرەسی قەومی))دا بۆ دەکات کە هەزار تاشە بەردی دابوو بە پشت گشت دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی هیتلەرو مۆسۆلێنیدا. عەبدولسەلام دەیویست بە زووترین کات دەزگاکانی ئەو رێکخراوە چەك بکات، چونکە زۆر باش دەیزانی لە یەکەم دەرفەتی رەخساودا رووی ئەو چەکانە دەکەنە رژێمە لاوازەکەی خۆی. لەگەڵ ئەوەیشدا عارف دەرەقەتی فرتوفێڵی بەعسییەکان نەهات بۆیەکا ناچار بوو چەند جارێك مۆڵەتی تەسلیم کردنی چەکی ((حەرەسی قەومی)) درێژ بکاتەوە. دەربارەی ئەمە بالۆیزی بەریتانی لە خاڵی سێیەمی نامەکەیدا دەڵێت:

((لەگەڵ هەموو هەڕەشەکانی حوکمەتدا ئینجا گومان لەوە ناکرێت کە ژمارەی ئەو چەکانەی حەفتەی رابردوو تەسلیم کراون زۆر کەمەو ژمارەیەکی زۆر لە چەکی سووك، کە رەنگبێ ژمارەیان لە بیست هەزار تێپەڕ بکات، تەنها لە بەغدا لەژێر خاکدا یا لە زێرابەکاندا، حەشار دراون، بۆیەکا ئەو دواڕۆژەی کە لە خاڵی دووەمدا باسیمان کردووە وەك دواکاتی تەسلیمکردنی چەك دوێنێ شەو درێژ کرایەوە تا رۆژی پێنجی کانوونی یەکەم))[211].

خاڵی سێیەمی نامەکەی بالۆیزی بەریتانی بۆ بابەتی نەقابەکان و خاڵی پێنجەمیش بۆ بابەتی ((هێزە چەکدارەکانی میری)) تەرخان کراون، باسی کۆششی زۆری رژێمەکەی عەبدولسەلام عارفیش دەکات بۆ پاککردنەوەی ئەو دوو دەزگایە لە بەعسییەکان، تایبەت لەناو ریزەکانی سوپادا کە وەك دەڵێت:

((رژێمی عارف دەیەوێت سوپا لە سیاسەت دوور بخاتەوەو ئەو کۆسپانەیش دەستنیشان بکات کە وان لەبەردەم جێبەجێ کردنی ئەو ئاواتەدا، هی وەك بوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەری بەعسی و ناصری لەناو سوپادا و وەرگرتنی سێ سەد قوتابیی بەعسی لە کۆلێجی سەربازیی عیراقیدا بەر لە کەوتنی بەعس بە ماوەیەکی

---

(211) N.A., F.O., 371/170443, Confidential, From: S.L. Egerton, British Embassy, Baghdad, November 30, 1963, To: W. Morsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1., P.1.

کورت و ئەوەی کە لە گشت وڵاتە عەرەبییەکاندا سوپا بەشێکی گرنگی دانەبڕاوی ژیانیی سیاسییە))[212].

خاڵی شەشەم و حەوتەمی نامەکە بۆ بابەتی ((زانکۆی بەغدا و قوتابییەکان)) تەرخان کراون و گەلێك سەرنجی وردیان تێدایە، بۆیەکا پێویستە زۆرتر تیشك بخەینە سەر لایەنە سەرەکییەکانی ئەم دوو خاڵە چونکە شاگردانی دەزگا بەرزەکانی خوێندن لە عیراق، لە ڕۆژگاری عوسمانییەکانەوە[213]، ڕۆڵی دیاریان لە ڕووداوە مێژووییە هاوچەرخەکانی عیراقدا هەبوو، ئەو ڕاستییەی بەعسییەکان بە قووڵی دەرکیان پێ کردبوو، بەڵام بەداخەوە بە ڕێگەیەکی گەلێك چەوت و هەڵەیاندا برد.

باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا، لە نامەی ژمارە ٦٣/١٨٨/١٠١٣ ی ڕۆژی بیستو سێی تەشرینی دووەمیدا، بەشی ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لەوە ئاگادار کردووە کە بڕیارە زانکۆو پەیمانگا بەرزەکان تاوەکو ڕۆژی هەینیی بیستو دووی تەشرینی دووەمی ١٩٦٣ دابخرێن، بەڵام ((وا چاوەڕوان دەکرا ڕۆژی دواتر خۆنیشاندانی گەورەی قوتابییە (بەعسییەکان– ك. م.) دەست پێ بکات. دوای ئەوە گوتیان بڕیارە بیستو هەشت یا بیستو نۆ یا سیی تەشرینی یەکەم خۆنیشاندانی گەورە ساز بکرێت، بەڵام گوایە حاکمی عەسکەریی گشتی، دوای ئەوەی ئەو هەواڵەی بیستووە، گوتوویەتی ئەو فەرمانی داوە بە هێزە سەربازییەکان تەقە لە هەر کەسێك بکەن کە گوێڕایەڵی فەرمانی قەدەغەکردنی هەر کۆبوونەوەیەك نەبێت کە لە پێنج کەس تێپەڕ بکات. ڕۆژی بیستو نۆی تەشرینی دووەم دیسانەوە هەواڵێکمان بیست گوایە ڕەهبەرانی بەعس لە بەغدا بڕیاریان داوە داوای سازکردنی خۆنیشاندان بکەن))[214].

---

(212) Ibid, P.2.

(213) مەبەستمان مانگرتنە بەناوبانگەکەی قوتابخانەی بەرزی ماف (حقوق)ـە لە بەغدا دژی والیی توندڕەوی بەناوبانگ جەمال پاشای سەفاح لە ساڵی ١٩١١دا.

(214) N.A., F.O., 371/170443, Confidential, From: S.L. Egerton, British Embassy, Baghdad, November 30, 1963, To: W. Morsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1., PP. 2-3.

لێرەدا باڵوێزی بەریتانی لە عیراق ئاماژە بۆ ڕاستییەکی بایەخدار دەکات کاتێک دەڵێت:

((هیچ کاتێك ئاسان نەبووە تەقدیری مەودای هێزی بەعس لەنێو ڕیزەکانی قوتابیان و مامۆستایاندا بکرێت، سەیر ئەوەیە هیچ کاتێك ئەوان بە ژمارە زۆر زۆر نەبوون، بەڵام ڕێکخستنەکەیان یەکجار توندو تۆڵبووە بۆیەکا دەنگیان لە ڕەنگیان دیارترە[215]. هەمان کات زۆربەی هەرە زۆریان سەر بە عەلی سالح سەعدی بوون، لەو بڕوایەشدا نیم حازم جەواد و طالیب شبیب سەنگێکی ئەوتۆیان لەناو قوتابیاندا هەبێت))[216].

خاڵی هەشتەمینی نامەکەی باڵوێزی بەریتانی، کە بۆ بابەتی دەزگا کارگێڕییەکان تەرخان کراوە، زانیاریی بایەخدارو وردی تێدایەو بەم جۆرە دەست پێ دەکات:

((ڕژێمی نوێ لەم بووارەدا کێشەیەکی گەورەی هەیە چونکە کارمەندە ناوەندییەکانی دەزگا کارگێڕییەکانی لەلایەن بەعسییەکانەوە باش هەڵبژێردرابوون، ڕەهبەرانی هەژدەی تەشرینی دووەم (واتا کۆدێتاکەی عەبدولسەلام عارف– ك. م.) لەوانەیە ناوەکانیشیان بزانن و ڕقیشیان لە هەموویانە، بەڵام بێ ئەوان ناتوانن کاری دەوڵەت بەڕێوەبەرن. تا ئیمڕۆ، ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین، ژمارەیەکی زۆر کەم لە بەعسییە ناسراوەکان، کە لە پلەی بەڕێوەبەری گشتیدان (مدیر عام)، لەسەر کارەکانیان لابراون و خەڵکی دیکە لە جێگەیان دانراون. گەورەترین ئاڵوگۆڕ لە وەکالەی ئەنبای عیراقیدا کراوە بەوەی شازل طاقەی سەرۆکی لابراوە (دەربارەی شازل طاقە بڕوانە نامەی ژمارە پ. ١٦٧٢/٤/٦٣ م کە ناردوومە بۆ جۆن درینکول John Drinkall)، شازل طاقەش دراوەتە دادگەو جارێکا ئەفسەرێك

---

(215) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((they were vocal)) کە پێموایە بە کوردییەکی (دەنگیان لە ڕەنگیان دیارترە) پڕ بەپێستییە.

(216) N.A., F.O., 371/170443, Confidential, From: S.L. Egerton, British Embassy, Baghdad, November 30, 1963, To W. Morsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1., P.3.

له جێگەکەی دانراوە. شازل طاقە، وەك شەفیق کەمالیی بەڕێوەبەری گشتیی لە وەزارەتی ئیرشاد، پیاوی عەلی سالح سەعدی بوون، وا دیارە شەفیق کەمالیش لابراوە[217]. دەنگوباوێکی زۆر هەیە دەربارەی پاکسازیی لە وەزارەتی ئیرشادا، بەڵام لەوە ناکات ئەو کارە بە ڕێکوپێکی ببرێتە سەر))[218].

خاڵی نۆیەمی نامەکەی باڵوێزی بەریتانی بۆ بابەتی دەزگای پۆلیسی عیراقی تەرخان کراوەو دەڵێت: ((لەدەزگای پۆلیسدا بەڕێوەبەری گشتی ئەحمەد ئەمین[219] کە بەعسییەکی فەناتیك بوو بەرەبەیانی ڕۆژی هەژدەی تەشرینی دووەم دەستی لەکار کێشرایەوە، ناتوانم لەوە بەولاوە ئاماژە بۆ بەعسیی ناسراوی دیکە بکەم لە دەزگای ناوبراو دوور خرابێتەوە، بەڵام لیوا پۆلیسێکی هاوڕێم، کە کاتی خۆی ئەحمەد ئەمین لە خۆڕا دەستی لەکار کێشابۆوە، پێی وایە گێڕانەوەی بۆ سەر کارە کۆنەکەی خۆی گەلێك زەحمەتە))[220].

باڵوێزی بەریتانی لە بەغدا، لە دوا دوو خاڵی نامەکەیدا، زۆر بەوردی دەکەوێتە هەڵسەنگاندنی گشت دیوە چاوەڕوانکراوەکانی ڕەفتاری ((پارتی بەعس)) دوای

---

(217) شەفیق کەمالی و شازل طاقة هەردووکیان ئەدیب بوون. شەفیق کەمالی، لە ڕۆژگاری صەدام حسەیندا، کرایە بەڕێوەبەری گشتیی دەزگای ((افاق عربية)) کە گۆڤارێکی بە هەمان ناوەوە دەردەکرد، دەڵێن کاتی خۆی لەسەر قسەیەك دەرمانخوارد کرا. شازل طاقەیش کرایە باڵوێزی عیراق لە یەکیەتی سۆڤیەت، بەڵام زۆری نەبرد کۆچی دوایی کرد.

(218) N.A., F.O., 371/170443..., P.3.

(219) لە پەراوێزی شەستو هەشتی ئەم بابەتەدا ئاماژەم بۆ ئەوە کردووە کە ئەحمەد ئەمین هاوڕێیەکی زۆر نزیکی تایەر حەیدەرییە، لە ساڵی ١٩٩٢وە منیش لە ڕێگەی کاك تایەرەوە لە نزیکەوە ناسیم. ئەحمەد ئەمین زۆر لە ئەحمەد حەسەن بەکر نزیك بووە. چەند جارێك لە خۆیم بیستووە چۆن بەکر، کە سەرەك کۆمار بوو، لەوە دڵنیا بوو صەدام حسەین بەوردی تاقیبی گشت حەرەکات و سەکەناتێکی دەکات، بۆیەکا، چ لە ماڵەوەو چ لە بارەگای سەرەك کۆمار، هەر کاتێك ویستبێتی قسەیەکی تایبەتی، یا سکاڵایەکی دڵی خۆی، بۆ ئەحمەد ئەمین بکات، بە بیانووی پیاسەوە بردویەتە حەوشەو لەوێ قسەکەی بۆی کردووە.

(220) N.A., F.O., 371/170443, Confidential, From: S.L. Egerton, British Embassy, Baghdad, November 30, 1963, To W. Morsden, Eastern Department, Foreign Office, London, S.W.1., P.3.

کەوتنی ڕژێمەکەی، کە یەکێکیان ئەگەری نزیککەوتنەوەیە لە ((پارتی کۆمۆنیستی عێراقی))، یا لە ناصرییەکان و سوورییەکان کە لەوانەیە، وەك دەڵێت، دروشمی ((سووریا بۆ سوورییەکان)) بەرز بکاتەوە، واتا ((سیاسەتێکی نوێی تا ڕادەیەك گۆشەگیر بگرێتە بەر))[221].

بەو جۆرە ڕژێمەکەی عەبدولسەلام عارف و ناحەزەکانی کەوتبوونە ناو گێژاوی گەردەلولێکی سەیرو کەم وێنەوە، بەڵام خوا هەڵناگرێت پیاوەکە بۆ خۆی بێ ئەندازە بە پەرۆشی دەسەڵات بوو، تەنانەت ((وەحدەی عەرەب))یش، کە کردبوویە وێردی سەر زوبانی و دروشمی یەکەمی دیدەنی و خوتبەو سەرجەمی ڕاگەیاندنەکانی، لە ناخی دەروونیدا داردەستی یەکەمی بوو بۆ وەدەست هێنان و پاراستنی دەسەڵات. بۆ دیاریکردنی ناوەرۆکی ئەم بۆچوونە بە پێویستی دەزانم بۆ مێژوو پوختەی ئەم سەرگوزشتە سیاسییەی لای خوارەوە تۆمار بکەم کە لە خودی دوکتۆر خەیرەددین حەسیبم[222] بیستووە.

بەر لە کەوتنی ڕژێمەکەی صەدام حسەین، بە ماوەیەکی کورت، دوکتۆر ومیض جەمال عومەر نظمی، بەبۆنەی سەردانی دوکتۆر خەیرەددین حەسیبی هاوڕێ و هاوبیریەوە دانیشتنێکی گەورەی لە ماڵی خۆیان ساز کردبوو، ژمارەیەك پیاوی سیاسیی وەك نەصیر کامیل چادرچی و مامۆستای زانکۆی وەك دوکتۆر سەعد ناجی جەوادی[223] بانگ کردبوو، لە کورد هەر سەلاح سەعدوڵلاو منی لێ بووین. یەکێك لەو

---

(221) Ibid, PP. 3-4.

(222) دوکتۆر خەیرەددین حەسیب: لە بنەماڵەیەکی موسڵاویی ناسراوە، ناصرییەکی دڵسۆز و یەکێك لە عێراقییە هەرە نزیکەکانی سەرۆك جەمال عەبدولناصر بوو، لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی عەبدولسەلام عارفدا وەزیری وەحدە بوو، دەمێکە لە بێروت نیشتەجێیە و وەك سەرۆکی (مرکز دراسات الوحدة العربية) لە بواری فیکریدا چالاکییەکی وەبەرچاو دەنوێنێت، پێوەندیی نزیکی لەگەڵ تاڵەبانی و فوئاد عارفدا هەیە.

(223) دوکتۆر سەعد ناجی جەواد: مامۆستایەکی کۆلێجی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی بەغدایە، نامەی دوکتۆراکەی، کە دەربارەی مێژووی هاوچەرخی پرسی کوردە لە عێراق، لە بەریتانیا تەواوی کردووە، ناجی جەواد الساعاتیی باوکیشی دۆستێکی ناسراوی کوردە.

شتانەی دوکتۆر خەیرەددین حەسیب لەو دانیشتنەدا بە درێژی گێڕایەوە دەربارەی هەڵوێستی عەبدوسەلام عارف بوو لە بوواری پرۆژەی یەکگرتنی میسرو عیراق و سووریادا. لە کۆبوونەوەکانی قاهیرەدا دەربارەی ئەو بابەتە دوکتۆر خەیرەددین حەسیب یەکێك دەبێت لە ئەندامانی وەفدی عیراقی بە سەرۆکایەتی خودی عەبدولسەلام عارف. جەمال عەبدولناصر، بە دووربینی خۆی، هەستی بە دوودڵیی عەبدولسەلام عارف کردووە کە وادیارە حەزی نەکردووە بە هیچ جۆر پۆستی سەرەك کۆماری لەکیس بچێت بۆیەکا عەبدولناصر بە تایبەتی ئەو ڕاستییەی بە دوکتۆر خەیرەددین گوتووەو داوای لێ کردووە بە شێوازێکی دیپلۆماسیی کۆتایی بە وتووێژەکانی قاهیرە بهێنن، عەبدولسەلام بە ئەوپەڕی خۆشییەوە، وەك مژدە ئەو بڕیارەی قۆستۆتەوە[224].

پێویستە لەو گۆشە نیگایەوە گشت هەڵوێست و هەنگاوە سیاسییەکانی عەبدولسلام عارف هەڵبسەنگێنرێن، لە سەرو هەمووشیانەوە هەڵوێست و کردارەکانی لەگەڵ کورددا کە بەپێی ئاگاداریی وردی دیپلۆماسییە بەریتانییەکان سەرکردەکانیان ئامادەی ڕێککەوتن بوون لەگەڵیدا، تەنانەت دەقی ناوونیشانی بەڵگەنامەی یەکەمی ناو فایلی ژمارە (٣٧١|١٧٠٤٥٠)ی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی، کە ڕۆژی دوازدەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٣ی بە سەرەوەیە، بەم جۆرەیە: **((ئەگەری ڕێککەوتنی مەلا مستەفای بارزان لەگەڵ حوکمەتی مەرکەزیدا))**[225].

هەڵوێستی ڕاڕاو هەلپەرستی ڕژێمەکەی عەبدولسەلام عارف سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردی ناچار کرد، وێڕای پتەو کردنی سەنگەرەکانی لە ناوەوەی کوردستاندا، دیسانەوە پەنا بەرێتەوە بەر ڕای گشتیی جیهانی و دەوڵەتە گەورەکان و نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر حوکمەتی عیراق دەست لە هەڵوێستی

---

(224) تەنانەت دوکتۆر خەیرەددین حەسیب ئەوەیشی گێڕایەوە چۆن عەبدولسەلام عارف لە خۆشیدا شەهییەی کراوەتەوە، هەرچەندە پارێزیشی هەبووە، بە دڵ مریشکێکی سوورەوەکراوی لەبەر چاوی خۆی خواردووە.

(225) N.A., F.O., 371|170450, Eastern Department, Iraq, No. 1821|63, Confidential, Possibility of Mulla Mustafa reaching agreement with the Central Government.


General Mustapha Barzani

بارزانی کە هەردوو ڕژێمی بەعس و عەبدولسەلام عارف بەخوێنی سەری تێنوو بوون، کەچی ئەوان مردن و ئەویش زیندوو– کەمال مەزهەر

توندڕەوانەی خۆی بەرانبەر بە کورد هەڵبگرێت و بە شێوازێکی دیموکراسییانە چارەسەری کێشەکەیان لە چوارچێوەی عیراقدا بکات و ڕێگەش نەدەنە هیچ دەوڵەتێك یارىدەی سەربازیی عیراق بدات، چونکە هەر چەکێکی کە دەیدرێتێ دڵڕەقانە بۆ کاولکردنی کوردستان و قڕکردنی گەلەکەی بە کاری دەهێنێت.

پێمان وایە یەکێك لە نموونە زیندووەکانی ئەم بووارە نامەیەکی بارزانییە کە ڕۆژی پازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٦ بە زوبانی عەرەبیی لە ڕێگەی باڵوێزی بەریتانییەوە لە تاران ناردوویە بۆ هارۆڵد ویلسنی سەرەك وەزیرانی بەریتانی[226] و

(226) هارۆڵد جەیمس ویلسون (Harold James Wilson): ڕۆژی یازدەی مارتی ساڵی ١٩١٦ لەدایك بووە، لە بنەماڵەیەکی ناسراو نەبوو، دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆرد بوو، زۆر زیرەك و لێهاتوو بوو، چەند جارێك بووە ئەندامی پەرلەمان، سەرۆکی ((پارتی کرێکاران)) بوو، یەکێکە لە دیپلۆماسییە هەرە بەناوبانگەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، دوو جار بووە سەرەك وەزیرانی بەریتانیا، جاری

دەقەکەی لە فایلەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا هەڵگیراوەو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((شکۆمەند میستەر ویلسنی سەرەك وەزیرانی وڵاتی یەکگرتووی خاوەن شکۆ.

لە ڕێگەی بەڕێز باڵوێزی وڵاتی یەکگرتووی خاوەن شکۆی ڕێزدار لە تاران.

بەختەوەرم ئەم نامەیە ئاراستەی ئێوەی شکۆمەند بکەم بەو هیوایەی وێنەی ئەم جەنگەتان بۆ بکێشم کە لە نیشتمانەکەماندا، کوردستانی عیراق، بەرپا کراوە. بەڕێزتان ئاگادارن کە گەلی کورد، نزیکەی چوار ساڵە، لەلایەن سێ ڕژێمی دیکتاتۆریی سەربازیی، یەك لە دوایەکەوە، هێرشی ڕەگەزپەرستیی شۆڤێنیی دەکرێتە سەر.

مەودای ئەو جەنگە لە مەودای جەنگی جیهانیی یەکەم زۆرترە و هەمووی بەسەر یەکەوە چەند مانگێکیش لە مەودای جەنگی جیهانیی دووەم کەمترە. چەکە کاولکاری و بکوژو هەڵتەکێنەرەکانی فڕۆکە و تانك و تۆپەکانی حوکمەتی عیراقیی، کە لە جەنگە دوژمنکارییەکەیدا دەیکاتە سەر گەلی کوردی بێوەی، گەلێك لەو چەکانەی لە هەردووك جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمدا بەکار هێنراون نوێترو کاولکەرترن. بەڕێزتان و گەلەکەتان، کە سەرگەردانی و نەگبەتییەکانی جەنگی جیهانیتان دیوە دەتوانن لەوە بگەن نیشتمانەکەمان گیرۆدەی چ کارەساتێك و گەلەکەمان تووشی چ دەردو ئازارێك هاتوون.

سەریاری جەنگ، کە بە تەنها خۆی نەهامەتییە، گەلە بێ وەیەکەشمان گیرۆدەی سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستیی قێزەون و کرداری زۆرداری و کۆمەڵکوژی و تالانی و ڕاگواستن و دەربەدەری و سوتاندنی کێڵگەو خەرمان و گوندەکانیان و کاول کردنی ماڵەکانیان بەسەر خانەوادە منداڵ و پیرێژن و پیرەمێردەکانیاندا، وێڕای زەوت کردن و ئەتککردنی ئافرەتەکانیان هاتوون.

ئەوەیش کە پاڵم پێوە دەنێت ئەم نامەیە بنێرمە خزمەتتان شووڵ لێ هەڵکێشانی ئەم دواییانەی حوکمەتی عیراقییە لە ڕەفتارە دوژمنکاری و کاولکارییەکانیدا کە بوونەتە هۆی پەرتەوازەبوونی دەیان هەزار هاوڵاتیی کورد، دوای سووتاندنی گوندەکانیان و تالانکردنی

---

یەکەم لە دەی تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٤وە تاوەکو نۆزدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٠ و جاری دووەمیش لە چواری مارتی ساڵی ١٩٧٤وە تاوەکو پێنجی نیسانی ساڵی ١٩٧٦، ڕۆژی بیستوسێی مایسی ساڵی ١٩٩٥ کۆچی دوایی کرد. بڕوانە:
((Oxford Dictionary of National Biography)), Volume 59, Oxford University Press, 2004, PP. 554-555.

کەلوپەلەکانیان و بەو جۆرە جەنگەکە دیسانەوە چۆوە قۆناغی تەفروتوناکردن بە نیازی قڕ کردنی گەلی کورد دوای ئەوەی حوکمی دیکتاتۆریی سەربازیی نەیتوانی شۆڕشی کورد لەناو بەرێت. هەموو ئەمانەیش کە دەرحەق گەلەکەمان دەکرێن لەبەر ئەوەیە دەیەوێت زوبانی زگماك و نەریت و پێناسەی نەتەوەیی خۆی بپارێزێت، ئەوپەڕی دلخوازیی گەلەکەمان بریتییە لە دان نان بە مافە ڕەواکانیدا لە چوارچێوەی کۆماری عیراقدا، ئەوەی گشت یاسا دەوڵەتییەکان دانی پێدا دەنێن و لەگەڵ هەڵوێستی زانراوی وڵاتەکەتان و حوکمەتەکەتاندا بەرانبەر ئازادیی و مافی چارەنووسیی گەلاندا دەگونجێت.

ئەوەیش کە حوکمەتی عیراقی دەیەوێت پرسی کورد بکاتە کێشەیەکی ناوخۆ لە بنەماوە پووچەڵە، چونکە گەلی کورد نەتەوەیەکە زوبان و نەریت و دیاردە تایبەتییەکانی خۆی هەیە، وێڕای ئەوەی ((کۆمەڵەی گەلان)) (عصبة الامم)، ئەوانەی ئیمڕۆکە کورد داوای دەکەن، ئەو کردنیە مەرجی ئەو بڕیارەی ڕۆژی شازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٥ی کە کوردستانی باشووری پێ خرایە سەر عیراق. جگە لەوە ساڵی ١٩٦٣ حوکمەتی عیراقی سوپایەکی بیانیی هێناوە بۆ شەڕی کورد کە ئەویش سوپای سوورییە. بەردەوامبوونی جەنگیش لە کوردستاندا هەڕەشەیە لە ئاشتیی ڕۆژهەڵاتیی ناوەڕاست و ئەوەیش هێمنی و بەرژەوەندییە یاساییەکانی دەوڵەتان لە ناوچەکەدا دەخاتە مەترسییەوە.

بۆیەکا بە ناوی خۆم و بەناوی گەلە زۆرلێکراوەکەمانەوە داوا لە شکۆمەندتان دەکەم چەك نەدەنە حوکمەتی عیراق و فریای گەلی کوردی گیرۆدەبووی ئەم جەنگە بکەون و کاریگەریی فراوان و هەوڵی پیرۆزتان بخەنە گەڕ بۆ چارەسەرێکی ئاشتییانەی پرسی کورد لەسەر بنەمای جێبەجێ کردنی مافە نەتەوەییە ڕەواکانی گەلەکەماندا.

تکایە سوپاس و تەقدیرم قەبوڵ بفەرموون.

دڵسۆزتان

مستەفا بارزانی

سەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕشی کوردستانی عیراق

١٩٦٦|١|١٥ ئیمزا))[227]

(227) N.A. F.O، 371|186747.،، -، ((سیادة المستر ولسن رئیس وزراء المملكة المتحدة الموقر، بواسطة سعادة سفير المملكة المتحدة بطهران المحترم، من المخلص مصطفى البارزاني رئيس مجلس قيادة الثورة لكردستان العراق، ١٩٦٦|١|١٥)).



عەبدولڕەحمان عارف

لە هەمان بوواری هەوڵ داندا بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ڕای گشتیی جیهان بۆ دەردەسەرییەکانی گەلی کورد ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)) لەو ساڵانەدا ڕۆڵێکی یەکجار گەورەی بینی، ئەو ڕاستییەی دەیان بەڵگەنامەی دەگمەنی ناو فایلەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی تیشکیان خستۆتە سەر لایەنە جیاوازاکانی بەشێوازێك کە بە دڵنیاییەوە دەڵێین بوونەتە سەرچاوەیەکی ڕەسەنی کەم وێنە بۆ تێگەیشتنی دەوری مێژوویی ئەو ڕێکخراوە کوردییە لەو قۆناغە چارەنووسییەی کورددا.

---

شایانی باسە لەناو فایلەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانیدا ژمارەیەك نامەی دیکەی لەو بابەتەی بارزانیی هەڵگیراوە. بڕوانە: پاشکۆی ژمارە(١٢-١٣-١٤).

## چالاكییەكانی (كۆمەڵەی خوێندكارانی كورد لە ئەوروپا) دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەكانی حوكمەتی بەریتانیادا

بێگومان ((كۆمەڵەی خوێندكارانی كورد لە ئەوروپا)) وەرچەرخانێكی گەورە بوو لە بوواری چالاكیی فیكری و سیاسیی چاپووكی ڕووناكبیرانو خوێندكارانی كورددا تایبەت لە شەستەكانی سەدەی ڕابردوودا، ئەوەی تاوەكو ئێستا چەند جارێك ئاماژەمان بۆ لایەنو دیاردە بینراوەكانی كردووە. ئامانجی كۆمەڵەكە بریتی بوو لە كۆششی ڕێكوپێك بۆ ناساندنی ڕای جیهانی پێشكەوتوو بە ڕەوایی پرسی كورد. هەر لە سەرەتاوە ((كۆمەڵەی خوێندكاران)) بە پێویستی زانی گۆڤارێك بە زوبانی ئینگلیزی بەناوی ((كوردستان))ەوە دەر بكات. ((**سكرتێری كۆمیتەی دەركردنی گۆڤار**)) عومەری قازی[228][*] ڕۆژی بیستوسێی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٨ لە لەندەن بەیاننامەیەكی بە كوردی و عەرەبی بڵاو كردەوە كە لە سەرەتاكەیدا دەڵێت:

**((ئەی خوێندكاری كوردی خۆشەویست هەموومان ئەزانین كە یەكێك لە ئامانجە پیرۆزەكانی كۆمەڵە خۆشەویستەكەمان گەیاندنی مێژوو و وێژەو زانستی كوردە بە**

---

(228) **عومەری قازی**: خزمی نزیك و زاوای پێشەوا قازی محەمەدە، مرۆڤێكی كوردپەروەری خاوێن و دڵسۆزە. كاتی خۆی لیسانسی لە زانكۆی تاران وەرگرتووە، دەمێك ساڵە لە سوید دەژی، هاوسەرەكەی بە پیلانێكی دوژمن شەهید كراوە.

[*] ((ئەو ناوەی (عومەر قازی) ئاماژە بۆ كراوم لەنێوان (عومەری قازی) و (ئەمیری قازی) بۆ یەكلا نەكرایەوە، بەڵام ئەوەندەی بەبیرم بێ، (عیفەتی) هاوسەری (ئەمیری قازی) لەڕۆژی ١٩٩٠/٩/٦دا لەشاری (ڤیستەرۆس)ی وڵاتی سوید بەنامەی تەقینەرەوە گیانی خۆی لەدەست دا، لەنێو ئاپۆرەی زیاتر لە (٢٠٠٠) كەسی كوردی دەرەوەدا تەرمەكەی بەخاك سپێردرا، تەنانەت (شێركۆ بێكەس) ی شاعیر بەم بۆنەیەوە شیعرێكی خوێندۆتەوە، دیسان ئەوەی بەبیرم بێت یەك لەژمارەكانی گۆڤاری (بەربانگ)ی ئەوسا بەبۆنەی ڕووداوەكەوە، ڕیپۆرتاژێكی بەوێنەوە بڵاوكردۆتەوە ـ ع. زەنگەنە))

میللەتانی تر))[229]. هەر لەو ساڵەیشدا سەلاح سەعدوڵڵا، کە ئەندامێکی خوێندەوارو چالاکی کۆمەڵەکە بوو، لە لەندەن کتێبێکی ئینگلیزی بەناوی خواستەنیی (س.س. گاڤان) و ناونیشانێکی سەرنج ڕاکێش: ((کوردستان. نیشتمانێکی دابەشکراوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست))ەوە بڵاو کردەوە[230]. پاش ساڵێك عیصمەت شەریف وانلیش، کە لاوێکی چالاكو ئیشکەر بوو، لە پاریس ناملکەیەکی سی لاپەڕەیی دەربارەی پرسی نەتەوەیی کورد لە ئێران بڵاو کردەوە[231]. کە کۆمەڵە خۆی گرت دامەزرێنەرانی هەوڵیان دا خۆیان بە کاربەدەستە ئەورووپییەکان بناسێنن. لە یەکێك لە فایلەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیدا ئەم نامەیەی لای خوارەوەی عیصمەت شەریف وانلی، کە ڕۆژی بیست و پێنجی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦١ ناردوویە بۆ سەرەك وەزیرانی بەریتانی، هەڵگیراوە:

**((لۆزان،**

**٢٥ی کانوونی دووەمی ١٩٦١،**

**ژمارە ب/٨٤٠.**

**ڕێزدار سەرەك وەزیرانی بەریتانیای گەورە**

**لەگەڵ نەوازشی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا.**

**ئیمزا**

**عیصمەت شەریف وانلی**

**سەرۆکی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا**

**ئەدرێسی کۆمەڵە**

[232]((Switzerland, Lausann, Avenu Dicknes, 10))

---

(229) دیوێکی بەیاننامەکە بە کوردی و دیوەکەی دیکەی بە عەرەبی بە ڕۆنیۆ چاپ کراوە.

(230) S.S. Gavan, Kurdistan. Divided Nation of the Middle East, London, 1958.

(231) I.C. Vanly, Aspects de la question nationale Kurde en Iran, Paris, 1959, 30 PP.

(232) N.A., F.O., 371/157404, Kurdistan question in Middle East, 1961, To: His Excellency the Prime Minister of Great Britain, London, From: Ismet cheriff- Vanly, President of the Kurdish Students Society in Europe, No. B/840, 25th January, 1961, Lausanne, Switzerland.



د. ئیحسان فوئاد

شەستەکانی سەدەی ڕابردوو ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) کۆنفرانسی ساڵانەی خۆی لە یەکێك لە شارە ئەوروپییەکان، تایبەت لە ئەڵمانیا دەبەست، ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارانی کورد لە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکانەوە، بە وڵاتە سۆشیالیزمەکانیشەوە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك کۆدەبوونەوەو بە دەم سروود و هەڵپەڕکێوە گەلێك وتارو شیعری نیشتمانیی بەسۆزی تێدا دەخوێندرایەوە.

یەکێك لە کۆنفرانسەکانی کۆمەڵە هەستی دوکتۆر ئیحسان فوئادی(*)، بەداخەوە کەم بەرهەمی، وەها بزوواند هۆنراوەیەکی نازدار پێشکەش بکات کە تێیدا بە سۆزەوە ڕوو دەکاتە پێشمەرگەی کوردستان و پێی دەڵێت:

---

(*) ((د. ئیحسان فوئاد (١٩٣٦-٢٠٠٨): لە ١/٧/١٩٣٦دا لە شاری هەولێر لە دایك بووە، لە ١/٦/٢٠٠٨دا لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کرد، لە ژمارە ٩٧ ڕۆژنامەی (بەدرخان)ی ڕێککەوتی ڕۆژی یەکشەممەی٨/ ٦/٢٠٠٨ مەلەفێکی لەسەر ژیانی بڵاوکراوەتەوە، ئێمەش لەوێدا لە ژێر ناوونیشانی (گەورەم، چیت لە بارەوە بنووسم...؟) بەشداریمان تیادا کردووە و زۆر لە وردەکارییەکانی ژیانیمان باس کردووە–ع زەنگەنە).



محەمەد مەهدی ئەلجەواهیری

پێشمەرگەکەی مەرگ بەزێن　　　تانکی دوژمن هەڵتەکێنە
من گیانی خۆم دایە دەست تۆ　　　تۆش ئازادیم بۆ بسێنە

شایانی باسە سەرانی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) شاعیری گەورەی عەرەب و دۆستی نزیکی کورد محەمەد مەهدی جەواهیریی بانگ دەکەن بۆ یەکێك لە کۆنفرانسەکانیان و لەوێ قەسیدە هەمیشە زیندووەکەی ((کردستان او موطن الابطال)) دەڵێت: کە بەم بەیتە دەستی پێی کردووە:

قلبي لكردستان يهُدى والفمُ　　　ولقد يجودُ بأصغريه المُعدمُ

بەم بەیتەش کۆتایی پێی هێناوە:

شعبٌ دعائمُهُ الجماجمُ والدمُ　　　تَتَحطمُ الدُنيا ولا يتحطمُ

ئەندامانی ((كۆمەڵەی خوێندكاران)) لە كۆنفرانسەكانیاندا، بە پێی بۆچوونی خۆیان، گفتوگۆیان دەربارەی بارودۆخی هەموو پارچەكانی نیشتمان دەكرد. هەمان كات، سەركردەكانی كۆمەڵە، پێوەندییان بە سیاسەتمەدارو بەرپرس و رۆژنامەنووسانی ئەوروپایی و ئەمەریكایی و نەتەوە یەكگرتووەكان و ئاگادارانی كێشەی كوردی، وەك ئەدمۆندسەوە، دەكرد، بە هەمان دەستوور و لە سنووری تواناادا پێوەندییان بەو كوردە ناسراوانەیشەوە هەبوو كە لە ئەوروپا دەژیان، هی وەك تۆفیق وەهبی و دوكتۆر كامەران عالی بەدرخان و محەمەد سەعید خەفاف و دوكتۆر ئەكرەم جاف و دوكتۆر عیصمەت كەتانی، كە لە سەرەتادا رۆڵی گەورەی لە دامەزراندنی كۆمەڵەدا بینی بوو، ئەوەی لەناو بەڵگەنامە نهێنییەكانی وەزارەتی هەندەرانی حوكمەتی بەریتانیدا رەنگی داوەتەوە، وەك دوایی لە شوێنی خۆیدا باسی دەكەین.

زۆر زوو گۆڤاری ((كوردستان)) وەك ئۆرگانی ((كۆمەڵەی خوێندكارانی كورد لە ئەوروپا)) لەدایك بوو، گۆڤارێكی وەرزیی دەوڵەمەند و ڕازاوە بوو، جێگەی لە كتێبخانەی مێژوونووسیی كورددا دیارە.

دوای شۆرشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ی عیراقی و دانانی رژێمی نوێی ئەو وڵاتە بە مافەكانی گەلی كورددا لە چوارچێوەی عیراقدا، دەرفەتێكی نوێ بۆ هیواو ئاواتەكانی سەرجەمی كوردی جیهان رەخسا، هەرچی خوێندكارانی كوردی عیراق لە ئەوروپا هەبوون ئیتر هەر هەموویان بە ئاشكراو بێ ناوی خواستەنی هاتنە گۆرەپانی خەباتی رووناكبیری و سیاسیی كوردایەتییەوە، بەلام خۆری ئەو بەهارە خۆشەی كورد زوو ئاوا بوو، بۆیەكا دەبوو ((كۆمەڵەی خوێندكارانی كورد لە ئەوروپا))یش خۆی لەگەڵ ئەركەكانی قۆناغی نوێدا بگونجێنێت. كاتێك بارودۆخی كوردستانی عیراق تەواو گرژ بوو و ساردی كەوتە نێوان رەهبەری شۆرش عەبدولكەریم قاسم و ((پارتی دیموكراتی كوردستان))ەوە خوێندكارە چالاكەكانی سویسرە دەكەونە خۆو كۆتایی تەمموزی ساڵی ١٩٦١ ((كۆمیتەی پارێزگاریی مافی نەتەوەی كورد)) دادەمەزرێنن، كە هەر زوو سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەكان رادەكێشێت و دەكەونە كۆكردنەوەی زانیاریی وردو دانسقە دەربارەی، ئەو زانیارییانەش رەنگێكی خەستو خۆڵیان لەناو بەڵگەنامە نهێنییەكانی وەزارەتی هەندەرانی

بەریتانیدا داوەتەوە. یەکێك لە ڕاپۆرتە هەرە گرنگەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لەم بووارەدا بریتییە لەم ڕاپۆرتەی دەقی وەرگێڕاوەکەیتان پێشکەش دەکەین:

((وەزارەتی هەندەران،

نهێنی،

**کۆمیتەی پارێزگاریی مافی نەتەوەی کورد.**

**١- ئەمە هەر هەمان کۆمیتەی پارێزگاریی کوردستانە، کۆتایی تەمموزی ساڵی ١٩٦١ لەلایەن ژمارەیەك کوردی نیشتەجێی سویسرەوە، بە هاندانی دیپلۆماسیی عیراقی لە جنێڤ عیصمەت کەتانی[233] دامەزرێنرا. عیصمەت کەتانی خۆی لە عیصمەت شەریف وانلی نزیك خستەوەو داوای لێی کرد ئەو کۆمیتەیە دابمەزرێنێت.**

**٢- کاکڵەی (نەواتی) ڕاپەڕێنەری ئەم کارە نزیکەی بیستو پێنج کەسی خوێن گەرم بوون کە کۆتایی ساڵی ١٩٦٢ لە لۆزان گردبوونەوە. ئەمانە پێوەندییەکی توندوتۆڵیان بە کۆمۆنیستەکانەوە هەبوو، دەوروبەری بیستوپێنج لە سەدی (٢٥٪) ئەندامانی کۆمیتە کۆمۆنیست بوون، ڕەنگبێ زۆربەی ئەندامانی کۆمیتە حەز بە کوردستانێك بکەن کە شیوعی نەبێت، بەڵام ئەو هەموو کۆمەکەی لە بلۆکی سۆڤێتییەوە (بۆ کورد- ك. م.) دێت بۆتە هۆی پەرەسەندنی ژمارەی ئەوانەی لەو باوەڕەدان کە تاکە هیوای کورد یاریدەی کۆمۆنیستە.**

---

(233) عیصمەت کەتانی، لە بنەماڵەیەکی ناسراوی ئامێدییە، دیپلۆماسییەکی بەناوبانگە، تەها کەتانیی باوکی عیصمەت پیرێکی تۆغرو دونیادیدە و کامڵو زۆر لایەنگری بارزانیی بوو، بارزانیش زۆر ڕێزی لێ دەنا، خزمی نزیکی عیزەت عەبدولعەزیزی ئەفسەرە کە دایە پاڵ ڕاپەڕینی بارزانی و کۆماری مەهاباد (کوردستان) و حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧ لەسەر ئەوە لەگەڵ خەیروڵلا عەبدولکەریم و مستەفا خۆشناو و محەمەد قودسی لەسێدارە درا. حەسەن و کەمالی برایانی عیصمەت، کە هەردووکیان کۆچی دواییان کردووە، لە خوێندەوارە دیارەکانی کوردستانی باشوور بوون.

**((لەدوای بەیانی ١١ی ئاداری ١٩٧٠، پێمولیە لە ساڵی ١٩٧٣ بوو ئەو زاتە بووە سەرۆکی ساڵانەی جمعیة الامم، ئەوەبوو ڕۆژنامەی "الثورة"ی حیزبی بەعس هەواڵەکەی بڵاوکردبۆوە و نووسیبووی: وهو اول عربي عراقي يحتل هذا المنصب الكبير، ڕۆژی دواتریش ڕۆژنامەی (التآخي) لەژێر ناونیشانی: دبلوماسي عراقي كردي يتولى منصباً رفيعاً في الأمم المتحدة، لە سەری نووسیبوو. بتڕوە: ل٤٥٢-٤٥٣ی ئەم کتێبە و ژیاننامەکەی بە تێروتەسەلی بخوێنەوە- ع. زەنگەنە)).**

**٣- لە ماوەی نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩٦٢دا عیصمەت شەریف وانلی و حەسەن سلێمان زەهاوی و ژمارەیەکی دیکەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوبراو زیارەتی مۆسکۆ و وڵاتانی ئەو بەرەیەیان کرد بۆ گەورەکردنی پرسی کورد و وەدەست هێنانی یاریدەی ماڵی بۆ مەلا مستەفا و دە هەزار دۆلارێکیان بۆ ئەو مەبەستە لە حوکمەتە کۆمۆنیستەکان دەستکەوت.**

**٤- هەرچەندە ئەم کۆمیتەیە هەرگیز پرۆگرامێکی فەرمیی ڕانەگەیاندووە، بەڵام بە هەڵوێستەکانیدا زۆر زۆر دیارە نەتەوەپەرستە و شوباتی ساڵی ١٩٦٣ ڕایگەیاند کە ئەو دژی هەر ڕێککەوتننامەیەکە لەگەڵ بەغدادا مۆر بکرێت ئەگەر خودموختارییەکی وەهای تێدا نەبێت ((مافی ئەوە بدات لەشکری کورد بمێنێت و هێزەکانی عێراق لە ناوچە کوردییەکان بکشێنەوەو بەشێك لە داهاتی نەوتی عێراق بدرێتە کورد))[234]. وانلی ئاماژەی بۆ ئەم خاڵانە لە ڕێگەی ئێزگەی بەرلینەوە[235] کردو ئەوەیشی ڕاگەیاند ئەگەر بێتو حوکمەتی عێراقی لە ماوەی دوو حەفتەدا ئەم داوایانە پەسەند نەکات ئەوساکە ((کۆمیتەی پارێزگاری)) داوا لە بارزانی دەکات حوکمەتێکی کوردی دابمەزرێنێت و فەرمان بداتە لەشکری شۆڕش شەڕ هەڵبگیرسێنێتەوە تاوەکو کوردستان ئازاد دەکرێت.**

**٥- ئاژانسی تاسی (سۆڤیەتی- ك. م.) بە زوبانی ئینگلیزی ئەو قسانەی ((کۆمیتەی پارێزگاری مافی نەتەوەی کورد))ی ڕاگەیاندبوو کە کۆمیتە ڕۆژی شازدەی ئەیلوول بڵاوی کردبۆوەو تێیدا بەعسییەکانی بە هەڵگیرسێنەری ((شەڕێکی چەوسێنەرو نەگریس))[236] تاوانبار کردبوو، وێڕای ئەوەی گاڵتەی بە دەستێوەردانی سوورییەکان هاتبوو، هەمان کات کۆمیتە داوای پشتگیریی جیهانی بۆ کورد کردبوو))[237].**

**بەو جۆرە چالاکییەکانی عیصمەت شەریف وانلی سەرنجی دیپلۆماسییە بەریتانییەکان ڕادەکێشێت و دەکەونە کۆکردنەوەی زانیاریی دەربارەی ئەسڵ و فەسڵی و ئەم ڕاپۆرتە وردەی لای خوارەوەی لەسەر دادەنێن کە لەوانەیە دایك و باوکی وانلی پتر لەوەیان لەمەڕ کوڕەکەی خۆیان نەزانیبێت:**

---

(234) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێو دوو جووت کەوانی پچووکەوە.

(235) ئەوساکە بەرلین پایتەختی ئەڵمانیای دیموکراسی بوو کە بەشێك بوو لە بەرەی سۆشیالیزمی.

(236) دیسانەوە لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێو دوو جووت کەوانی پچووکەوە.

(237) N.A., F.O., 371|170450, Secret, The Committee for the Defence of the Kurdish Peoples Rights.



عیصمەت شەریف وانلی/ لە ئەرشیفی د. مارف خەزنەدار وەرگیراوە

((وەزارەتی هەندەران،

نهێنی،

عیصمەت شەریف وانلی.

١- ڕۆژی بیستو یەکی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ لە دیمەشق لەدایك بووە. تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ گەیشتۆتە لۆزان و دەستی کردووە بە خوێندنی زانستی سیاسی و نامەیەکی دەربارەی پرسی کورد نووسیوە. لە ساڵی ١٩٤٩وە بووە برادەری خوێندکارە کوردە کۆمۆنیستەکان بەڵام بێ ئەوەی ئەوساکە بۆ خۆی توخنی کاروباری سیاسی بکەوێت، بۆیەکا پتر بە ((پێشکەوتنخوان))[238] دادەنرا نەك کۆمۆنیست.

٢- ساڵی ١٩٥٨ بووە نوێنەری ((لاوانی دیموکراتی کوردستانی باشوور)) لە حەوتەمین کۆبوونەوەی ئامادەیی فیستڤاڵی لاوانی جیهان و ساڵی ١٩٥٩یش وەك سەرۆکی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) هەڵبژێردرا، ساڵی ١٩٦٠ دیسانەوە لە کۆنفرانسی کۆمەڵە لە بەرلین بۆ هەمان پۆست هەڵبژێردرایەوە، لەو

---

(238) لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا وشەی پێشکەوتنخوازەکە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە.

کۆنفرانسەی کۆمەڵەیشدا کە مانگی ئابی ساڵی ١٩٦٣ لە میۆنیخ بەسترا وەك سەرۆکی کۆبوونەوەکان ناو دەبرا.

٣- لە دوای کەوتنی ڕژێمی قاسمەوە ژمارەیەك خوتبەی دژی کارە دڕندەکانی بەعسی عیراق داوەو هەستو سۆزی پێزانینی بۆ پشتگیری کردنی سۆڤیەت لە خەباتی کورد لەپێناو خودموختاریی نەتەوەییدا دەربڕیوە))[239].

لەو ڕۆژەوەی هەردووك ڕژێمی بەعس و ڕژێمی عەبدولسەلام عارف بەربوونەتە گیانی کورد، پرسی نەدانی چەك لەلایەن حوکمەتە ڕۆژئاواییەکانەوە بە عیراق بووە یەکێك لە ئەرکە پەلەکانی سەرشانی ڕەهبەران و دەزگا و ڕێکخراوە کوردییەکان، بارزانی و تاڵەبانی و دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان دەیان جار لە نامەو دیدەنییەکانیاندا ئاماژەیان بۆ ئەو بابەتە کردووە. تەنانەت بڕیار وابوو تاڵەبانی بە ناوی کوردەوە گەشتێك بۆ وڵاتە ڕۆژئاواییەکان بکات بۆ عەرزی ئەو بابەتە لەسەر ڕای گشتی و فەرمیی ئەو وڵاتانە و نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆیەکا بەریتانییەکان گەلێك دوودڵ بوون لەوەی ڤیزەی پێ بدەن، ئەو ڕاستییەی بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی چەند جارێك بە تایبەتی ئاماژەیان بۆی کردووە. لێرەدا وەك نموونە دەقی وەرگێڕانی ڕاپۆرتیی کارمەندێکی ئەو وەزارەتە بەناوی دەبلیو. مۆریس (W. Morris)ەوە پێشکەش دەکەین کە ڕۆژی حەڤدەی ئەیلولی ساڵی ١٩٦٣ لە پاریسەوە ناردوویە بۆ وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی سەبارەت بە ئەو کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەی ڕۆژێك لەوەوبەر تاڵەبانی لەوێ سازی کردبوو:

((چەك بۆ عیراق:

١- دوێنێ نوێنەری کورد تاڵەبانی[240] لە پاریس کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانیی ساز کردو لەوێ بەریتانیای بەوە تاوانبار کرد کە چەك دەداتە عیراق بۆ بەکار هێنانی لەو جەنگەدا کە لەگەڵ کورددا دەیکات، چەکەکەش (وەك گووتی- ك. م.) فڕۆکەو تانکی سووکی تێدایە. ڕۆژنامەی (دەیلی ورکەر) ئیمڕۆکە ئەو هەواڵەی قۆستەوە، هەروەها ڕۆژنامەی (مانچستەر گاردیان)یش دەربارەی هەمان بابەت پرسیاری

---

(239)N.A., F.O., 371|170450, Secret, Ismet Sharif Vanly.

(240) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: (the Kurdish Emissary Talabani) واتای تەواوی وشەی (Emissary) نێردراو بۆ ئەرکێکی گرنگ (مبعوث لاداء مهمة دقيقة) دەگەیێنێت.

ئاراستەی (بەشی هەواڵ)[241] کردووە، ئەوڕۆ بەیانی چاوەڕوانی پرسیاری دیکەیش دەربارەی هەمان بابەت لە ڕۆژنامەکانی دیکە دەکرێت.

٢- ئەوەی کە فەریق حەردان تکریتی بۆ تەواوکردنی مامەڵەی کڕینی فڕۆکەکان ڕۆژی بیستی ئەیلوول دەگاتە ئێرە بۆتە هۆی پتر ئاڵۆزکردنی دەنگوباوی ئەم هەواڵە، هەرچەندە تاوەکو ئێستا شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم زیارەتە نەگوتراوە. بەڵام وای بۆ دەچین کە زۆر لەوانەیە هاتنی تکریتی و مەبەستی ئەو هاتنەی حەفتەی داهاتوو دەنگ بداتەوە.

٣- مانگی مایسی ڕابردوو (بەشی هەواڵ) ڕۆژنامەکانی ئاگادار کرد کە ئێمە بڕیاری تەواومان داوە چەك بدەین بە عێراق، ئەوەی بە کارێکی ئاسایی لە قەڵەم دەدرێت، ئێمە وەك تەقلیدێك هەمیشە چەکمان داوەتە عێراق تەنها بە حوکمەتەکەی قاسم نەبێت، هەرچی حوکمەتی عێراقی ئێستایە بێگومان سیاسەتی پێچەوانەی سیاسەتی قاسمە کە بێ سنوور پشتی بە سەرچاوە کۆمۆنیستەکان بەستبوو.

٤- ئەگەر ڕۆژنامەکان ئیمڕۆ پرسیاریان دەربارەی لێدوانەکەی تاڵەبانی کردو وەك چاوەڕوان دەکەین پێمان بڵێن سیاسەتی ئیمڕۆمان وەك سیاسەتی مایسی ڕابردوومان نییە کە (کاتی خۆی- ك. م.) شەرحمان کرد، لە حاڵەتێکی وادا دەتوانین چۆن ئەوسا گوتمان ئێستەش بڵێین داواکردنی چەك لەلایەن عێراقییەکانەوە داوایەکی ئاساییە.

٥- خۆ ئەگەر هاتوو باسی ئەوە هاتە گۆڕێ کە لەوانەیە پرشکی ئەو هەنگاوە ئەو جەنگەیش بگرێتەوە کە لەگەڵ کورددا دەکرێت ئەوساکە پێویستە (بەشی هەواڵ) لە وەڵامدا بڵێت ئەو کارە پێوەندیی بە سیاسەتی ناوخۆی حوکمەتی عێراقەوە هەیە، هەرچەندە ئێمە هەمیشە بە روونی گوتوومانە هیواداریین چارەسەرێکی ئاشتییانە (بۆ کێشەی کورد- ك. م.) بدۆزرێتەوە. دوور لەوەیش کە دەربارەی ئەم بابەتە گوتراوە پێویستە (بەشی هەواڵ) بڵێت هەموو جۆرە چەکێك وەك دیاریدەیەکی ئاسایی دەبێتە هۆی بەهێزبوونی توانای سەربازیی هەر حوکمەتێك بە کاری سەربازییەوە تێگلابێت، بەڵام مەبەست لەو چەکەی ئێمە دەیدەینە حوکمەتی عێراق ئەوە نییە تایبەت تەرخان بکرێت بۆ بەکارهێنانی لە جەنگی دژ

---

(241) ((بەشی هەواڵ)) (News Department) یەکێکە لە بەشە سەرەکییەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی.

بە کورددا، وێڕای ئەوەی ڕژێمەکەی قاسمیش بە چەکی سۆڤێتی شەڕی کوردی دەکرد.

٦- ئەگەر دوای گەیشتنی فەریق حەردان پرسیار دەربارەی زیارەتەکەی کرا پێویستە (بەشی هەوال) بگەڕێتەوە سەر ڕوونکردنەوەکەی پێشووی و بڵێت تکریتی لێرەیە بۆ گفتوگۆ دەربارەی کڕینی چەك لەبەر ڕۆشنایی ئەو سیاسەتەدا کە لە سەرەوە روون کرایەوەو نەشبۆتە عورف و عادەت درێژەی ئەو کڕین و فرۆشتنە پەخش بکرێت. هەروەها (بەشی هەوال) ئەوەیش ڕوون بکاتەوە کە ڕاستە سیاسەتی هەناردنی چەك لەلایەن حوکمەتی خاوەن شکۆوە دیار دەکرێت، بەلام سەردانەکەی تکریتی لە ڕاستیدا بۆ وتووێژە لەگەڵ کۆمپانیا ئەهلییەکاندا.

ئیمزا

دەبل یو. مۆریس

١٧ی ئەیلوولی ١٩٦٣))[242].

هەڵبەت دەبوو ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)) بایەخێکی تایبەتی بەم بابەتە بدات و ڕەهەبەرەکانی، پتر لە هەرلایەنێکی دیکەی کورد، کەڵك لە نووسینەکانی ڕۆژنامە ئینگلیزییە بەناوبانگەکان وەربگرن بۆ نیشاندانی گشت لایەنە ناهەموارەکانی سیاسەت و ڕەفتارە نامرۆڤییەکانی هەردووك ڕژێمی بەعس و عەبدولسەلام عارف بەرانبەر بە کورد. لەم بووارەدا وابزانم سەرۆکی لقی بەریتانی ((کۆمەڵەی خوێنکارانی کورد لە ئەورووپا)) محەمەد سالح قەرەداغی بۆڕی هەموانی داوە، ئەوەی بە ئاسانی لەنێو بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەو ڕۆژگارەی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیدا هەستی پێ دەکەین، پێمان وایە ئەم نموونانەی لای خوارەوەیش بەڵگەی سەلمێنەری تەواوی ئەم بۆچوونەن:

لە فایلی ((شۆڕشی کورد: شەڕ لەگەڵ سوپادا)) کە بەر لە ئێستا ئاماژەمان بۆی کردووە بەیاننامەیەکی پێنج لاپەڕەیی قەرەداغی کە ڕۆژی بیست و نۆی حوزەیرانی ١٩٦٣ پەخش کراوەو هەڵگیراوە. ((پێشێل کردنی پەیڕەو (میساق)ی نەتەوە یەکگرتووەکان لەلایەن حوکمەتی عێراق))ەوە ناوونیشانی ئەو بەیاننامەیە کە دوای هێنانەوەی چەند خاڵێکی پەیڕەوی ناوبراو بە چڕوپڕی

---

(242) N.A., F.O., 371/170449, Kurdish revolt: Conflict with army, Confidential, Minutes: Arms for Iraq.

باسی جوگرافیای کوردستان و سروشتی کۆدێتای هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ی کردووەو ئینجا بە پشتیوانیی سێ ڕۆژنامەی هەرە بەناوبانگی بەریتانیا- ((تایمس)) و ((گاردیان)) و ((دەیلی تێلگراف)) باسی ڕەفتارە درندەکانی سەرکردەکانی ئەو کۆدێتایەی دژی کورد کردووەو لە زوبان ((گاردیان))ەوە ئەوەیشی تۆمار کردووە کە ((سەرانی بەعس سەد هەزار پاوەن خەڵاتیان تەرخان کردووە بۆ ئەو کەسەی ڕەهبەری کورد جەنەڕاڵ بەرزانیی بە زیندوویی یا مردوویی بەخسیر بکات))[243].

هەمان کات محەمەد ساڵح قەرەداغی بە پشتیوانیی ڕۆژنامەی ((سەندەی تایمس))ی ڕۆژی دووی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ەوە خاڵی چوارەمی بەیاننامەکەی تەرخان کردووە بۆ باسی ئەوەی چۆن سەرکردایەتیی شۆڕشی کورد ((بێ غەلو غەش کەوتە وتووێژ لەگەڵ سەرانی ڕژێمی بەعسدا)) و ((ئەو سێ هەزار دیلە کوردەی لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی قاسمەوە گیرابوون بەعسییەکان ئازادیان نەکردن هەرچەندە کوردەکان ئەو دوو هەزار عێراقییەی دەستگیریان کردبوون هەموویان ئازاد کردن))[244].

قەرەداغی لە خاڵی شەشەمی بەیاننامەکەیدا لە زاری ژمارە بیستی مایسی ساڵی ١٩٦٣ی ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلیگراف))ەوە ئەم هەواڵە سەیرو سەمەرەیەی پەخش کردووە کە پڕ بەپێستی توندڕەوە بەعسییەکانە:

((وەزیر و ئەفسەرە پلەدارەکانی حوکمەتی عێراق لەکاتی وتووێژی ئەم چەندانەی دوایی (نێوان نوێنەرانی حوکمەت و کورددا- ك. م.) بە ئەوپەڕی لەخۆبایی بوونەوە گوتویانە ئەوان دەتوانن لەماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا کێشەی کورد چارەسەر بکەن و هەتا هەتایە ڕادە بۆ ئەو کێشەیە دابنێن))[245].

---

(243)N.A., F.O., 371/170449, Kurdish revolt: Conflict with army, Confidential, Minutes: Arms for Iraq, Appleal by the K.S.S.E. (U.K. Branch) on account of the violation of the charter of the U.N. by the Government of the Republic of Iraq, PP. 1-2.

(244) Ibid, P.2.

(245) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((Ministers and senior army officers at the time of the negotiator had been heard boosting that they could end the Kurdish problem in a few days and solve this problem once and for all)), Ibid, P.3.

لە خاڵی حەوتـەمی بەیاننامەکەیدا، محەمـەد سـاڵح قـەرەداغی ئـەوجا لـە زاری ژمـارەی ڕۆژی دوازدەی حـوزەیرانی سـاڵی ١٩٦٣ی ڕۆژنامــەی ((تــایمس))ــەوە پوختەی ئەو پرۆژەیەی بڵاو کردۆتـەوە کـە حوکمـەتی عـێراق بـەناوی ((ئیـدارەی لامرکزی))یەوە ڕایگەیاندو دەبـوو بـەپێی نـاوەرۆکی عـێراق لـە ڕووی کارگێڕییـەوە دابەش بکرێـت بەسـەر ئـەم شـەش ناوچـەیەدا: موسـڵ و کـەرکووك و سـلێمانی لـە باکوورو بەغدا و بەسرە و حیللەیش لە باشوور کە هەریەکەیان گوایە دەبێـت مـافی ئۆتۆنۆمیی خۆیانیان هەبێت و تەنها لە ناوچـەی ئۆتۆنـۆمیی سلێمانیـشدا خوێنـدن تەنها لە شەش پۆلی سەرەتاییدا بە کوردی بێت[246].

ئـەو پرۆژەیـەی بەعسییەکان، بێگومـان، وەڵامێکـی سـەقەت بـوو بـۆ پـرۆژەی شۆڕشی کورد دەربارەی خودموختاریی کوردستانی باشوور، وێڕای ئـەوەی یـەکێك لە ئامانجە سەرەکییەکانی دابڕینـی یـەکجارەکیی کـەرکووك و دەوروبـەری بـوو لـە کوردستان.

بەیاننامەکەی لقی بەریتانیای ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کـورد لـە ئـەوروپا)) بـە پشتیوانیی ڕۆژنامە ئینگلیزییەکان لە چەند خاڵێکی دیکەدا باسی ئەو بارودۆخە بێ ئەندازە سەختەی کوردی عیراق لەژێر سایەی حوکمـەتی بەعـسدا دەکـات، لەوانـە قەدەغە کردنی ڕۆژنامـەوانیی و چاپەمەنیی بـە زوبـانی کـوردی و گرتنـی هـەزاران کورد و عەرەب کە بەپێی ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلگراف)) خۆی داوە لە چوار هـەزار کـەس. ئینجـا بەیاننامەکـە باسـی ئـەوە دەکـات چـۆن بـەپێی ڕاگەیانـدنی خـودی ئیزگەی بەغدا، وێڕای ئیزگەی لەندەنیش، پتر لـە سـەد عـەرەب و کـورد لەسـێدارە دراون، جگـە لـە دانـانی دادگەیـەکی سـەربازی بـۆ دادگـاییکردنی ((یـاخیبووانی کورد)). لێرەدا محەمەد ساڵح قەرەداغی لە زار ڕۆژنامەی ((دەیلی تێلگرافــ))ــەوە دەڵێت ڕۆژی سیازدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ حوکمەتی عیراق بە فەرمی بڕیـاری داوە ((مەرگ سزای هەر کەسێك بێت پشتگیریی بارزانی بکات)).

لە کۆتایی بەیاننامەکەیدا، کە وێنـەی لێ نـاردووە بـۆ گـەلێك ڕۆژنامـە، محەمـەد ساڵح قەرەداغی دەڵێت:

((بـەناوی هــەزاران قوربـانیی کـوردەوە لێتــان دەپاڕێمــەوە داوا لـە حوکمـەتی بەریتانی بکەن چاو بە بڕیارەکەیدا بخشێنێتەوە و چەك نەداتە عیراق، چونکە ئەوان

(246) Ibid, P.4..

(بەعسییەکان– ک. م.) دژی کورد و عەرەب وەك یەك بەکاری دەهێنن و ئەوساکە بەریتانییەکانیش بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ بەشداری تاوانەکەیان دەبن[247].

ئێمە گەلێك منەتباری بە دەنگەوە هاتنی خێرلو بەویژدانتانین بۆ ئەوەی شەڕی قڕ کردنی کوردو دلنی چەك (لەلایەن بەریتانیاوە– ک. م.) بە حوکمەتی عێراق بووەستێنرێت.

ئیمزا

محەمەد سالح قەرەداغی

سەرۆکی لقی بەریتانیای ((کۆمەڵەی

خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا))،

بیستو نۆی حوزەیرانی ساڵی ۱۹٦۳))[248].

لە هەمان فایلدا، لە بریتی دانەیەك، دوو دانە لە نامەیەکی دیکەی محەمەد سالح قەرەداغی هەڵگیراون کە ڕۆژی چواردەی ئەیلوولی ساڵی ۱۹٦۳ ناردوویە بۆ ڕۆژنامەکان تاوەکو لە ڕێگەیانەوە ڕای گشتیی بەریتانی دژی حوکمەتی بەعس بووروژێنێت، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ئەو نامەیەیە:

((محەمەد سالح قەرەداغی

سەرۆکی لقی بەریتانیای

(کۆمەڵەی خوێندکارانی

کورد لە ئەورووپا)،

۱٤ی ئەیلوولی ۱۹٦۳.

خۆشەویست جەنابی سێر !

بە درێژایی چوار مانگی ڕابردوو حوکمەتی عێراق شەڕێکی بەربەریی قڕکردنی (جینۆساید) دژی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دەکات. حەفتا هەزار کەس لە سوپای عێراق بۆ ئەم شەڕە کاولکاری و دوور لە بەزەییە تەرخان کراون، وێڕای هێزی ئاسمانی کە کەوتۆتە وێرانکردنی گوندە کوردنشینەکان و بەربوونەتە گیانی پیرەمێردو پیرێژن و زارۆکانی کورد.

---

(247) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((for they are used against the Kurds and Arabs alike, Britain although indirectly must share their guilty)), Ibid, P.5.

(248) Ibid, P.5.

به ناوی مافی مرۆڤ و هەزاران قوربانیی بەسەزمانی کوردەوە تکاتان لێ دەکەین دلوا لە نوێنەرتان لە نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن پشتگیریی خەباتمان لەپێناو خودموختاری لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا بکات. لە تەك نامەکەمدا ئەم دوو هاوپێچەی خوارەوە دەنێرمە خزمەتتان:

١- نامیلکەیەك دەربارەی کورد و کوردستان،

٢- داخوازییەك لەلایەن (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)وە.

ئیمزا

دڵسۆزتان

محەمەد ساڵح قەرەداغی))[249].

لە لاپەڕەی دواتری هەمان فایلی وەزارەتی هەندەرانداو یەکسەر دوای ئەو نامەیەی سەرەوەی محەمەد ساڵح قەرەداغی وێنەیەکی ڕازاوەی دەستەیەك قوتابیی کورد کە زۆربەیان بەرگی کوردییان لەبەردایە هەڵگیراوە[250] بە زوبانی ئینگلیزی لەژێر وێنەکەدا نووسراوە ((دەستەیەك لە ئەندامانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا بە بەرگی نەتەوەییەوە دەست لەناو دەستدا بەرەو یەکیەتی)). لە هەمان لاپەڕەی ناو ئەو فایلەدا و لە سەروو وێنەکەوە بەجیا نووسراوە: ((نابێت هیچ لەسەر ئەم لاپەڕەیە بنووسرێت)). بە داخەوە کەسانی ناو وێنەکەم نەناسیوەتەوە، ئەوەیش سەرنجی ڕاکێشام کە کیژە کوردێکیان لە نێودا نییە.

وا دیارە ئەم چالاکییانە دەوری باشیان لە بواری ڕاکێشانی سەرنجی ڕای گشتیی ئەورووپیدا بەلای پرسی کورد و ڕیسوا کردنی ڕژێمە شۆڤێنییەکانی عەرەبدا بینیوە، بۆیەکا ڕۆژنامەی ((الجهاد)) بۆ هاوسەنگیی و پاکانە کردن بۆ کارەکانی ڕژێمی عێراق لە کوردستانی باشووردا سەرەتای ئەیلوولی ١٩٦٣ ڕاپۆرتێکی دروستکراوی زۆر سەیری لە شوێنێکی دیاری لاپەڕەی یەکەمیدا بڵاو کردۆتەوە کە گوایە ((لە لەندەن سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو لە سەرکردایەتیی شۆڕشی کورددا

---

(249) Ibid, Admiralty House, Whitehall, S.W.1., Date 19th September, 1963.

(250) گەلێك مەبەستم بوو ئەو وێنە نازدارە وەك خۆی لەم کتێبەدا بڵاو بکەمەوە، ئەوەی پێویستی بە حەفتەیەك و نۆ پاوەن بوو چونکە دەبوو لە دەرەوەی ئەرشیڤی نیشتمانیی بۆ خۆیان وێنەکەی لەسەر بگرنەوە، چونکە نابێت تەنانەت وێنەیەکیش چییە، بە دەستی کارمەندێکی فەرمی نەبێت، لە ئەرشیف بچێتە دەرەوە. (مەبەستی ئەو وێنەیەیە کە لە لاپەڕەی دواتر دانراوە- ع. زەنگەنە)



محەمەد سەعید خەفاف

ڕۆژی یەکی ئەیلوول بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی ڕاگەیاندووە و دەڵێت ڕەهبەری شۆڕش مەلا مستەفای بارزان وەك سەرۆکی ئەو دەوڵەتە نەوزەت کراوە تا ئەو کاتەی ئەنجوومەنێکی نیشتمانی، دوای تەواو بوونی کۆششی ئازاد کردنی خاکی کوردستان، هەڵدەبژێردرێت. ئەم ئەنجوومەنەیش لە نوێنەرانی کوردی تورکیا و ئێران و عیراق و کوردە دوورخراوەکانی ئەورووپا پێکهاتووەو بۆ ئەم مەبەستە ئەنجوومەنێکی وەزیران لە پازدە ئەندام و دە باڵوێزی گەڕۆك[251] دامەزێنرا))[252].

بەڵام بەپێی هەمان بەڵگەنامە ((سکرتارییەتی لیژنەی بەرگری مافی کورد لە ئەورووپا)) ڕایگەیاندووە: ((کە ئەو هیچ هەواڵێکی دەربارەی ئەوەی دەگوترێت

---

(251) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: .((and ten Roving Ambassadors were appointed)).

(252)N.A., F.O., 371/170449, Kurdish revolt: Conflict with army, The Arab World, September 9, 1963, Weekend's Main News and Trends, Has Kurdish State been Proclmted ?, Mr. Goodchild, Eastern Department, Foreign Office.

سەبارەت دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد لە عیراق پێنەگەیشتووەو شتێکی لەو بابەتە لەگەڵ سیاسەتی بزووتنەوەی کورددا ناگونجێت، چونکە ئەوپەڕی ئامانجی ئەو بزووتنەوەیە بریتییە لە خودموختاریی (کوردستانی باشوور– ك. م.) لە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقیدا... ڕۆژنامەی ((الندا ))ی ئۆرگانی کۆمۆنیستەکان، کە لە بێروت دەردەچێت، بڵاوی کردۆتەوە کە سکرتارییەتی کوردی ڕاپۆرتەکانی لەندەن دەربارەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی لە عیراق بە درۆ دەخاتەوە))[253].

وا دیارە لەناو کوردیشدا ساختەچیی ئەوتۆ هەبوون کە ویستویانە دەرفەتی باری نالەباری کورد بۆ قازانجی خۆیان بقۆزنەوە. لەناو هەمان فایلدا ئەم هەواڵە سەیرە دەخوێنینەوە:

((بەپێی ئاژانسی هەواڵە عەرەبییەکان لە بێروت دەستەیەك ساختەچی (عصابە) بە سەرۆکایەتی محەمەد حەمید ئەلشەریف ناوێکەوە، بەناوی سەرکردەی شۆڕشی کورد بارزانییەوە، باربوویان لە کوردی لوبنان کۆکردۆتەوە کە هەر یەکەیان لە دە تا بیست لیرەیان داوە، ئەلشەریف و تاقمەکەی بەند کران بۆ دادگایکردنیان))[254].

کەوابێت بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی ئاوێنەیەکی بێ غەلوغەشو بایەخدارن بۆ بینینی گەلێك لایەنی کەم زانراوی چالاکییەکانی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)) و ئەو کوردە خاوێن و دڵسۆزانەی ئەوسای لەندەن کە لەپێناو گەلە ستەمدیدەکەیاندا پەنایان بردۆتە بەر گەلێك کەسایەتیی بەریتانی. لەم بووارەی دواییشدا بە پێویستی دەزانم دەقی وەرگێڕاوی بەڵگەنامەیەکی زۆر دەگمەنی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی دەربارەی هەڵوێستێکی محەمەد سەعید خەفاف پێشکەش بکەم.

ڕۆژی بیستو سێی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣، واتا لە گەرمەی دەسەڵاتی ڕژێمی یەکەمی بەعسدا، (محەمەد سەعید خەفاف) بە تایبەتی زیارەتی (دەبل

---

(253) Ibid.

(254) ((نووسەر خۆی لە دەستنووسەکەیدا، دەقی ئەم پەراوێزەی دیار نەکردووە، بە مەزەندەی من لەوانەیە ئەمیش (Ibid) بوو بێت– ع.زەنگەنە)).



وێنەی (کۆمبس) کاتێ باڵوێزی بەریتانیا بووە لەئەندەنووسیا- ك. م.

یو. ئای. کۆمبس)[255] ی لـە مـاڵەکەی خۆی کردووە چونکە وەك بازرگانێکی نـاسراوو خوێندەوار لـەو کـاتـەوەی (کـۆمبس) لە بـەغدا سکرتێری بـازرگـانیی

(255) سێر ویلیس کۆمبس (Sir Willis Combs): ڕۆژی شەشی مایسی ساڵی ١٩١٦ لە شاری مێلبۆرن (Melbourne) لەدایك بووە، لە بنەماڵەیەکی نیوزیلەندییە، دەرچووی زانکۆی کامبریجە، لە نێوان ساڵانی ١٩٤٠ و ١٩٤٦ دا چۆتە ڕیزی سوپای بەریتانییەوە، لە ساڵی ١٩٤٧وە بۆتە کارمەندی وەزارەتی هەندەران و هەر ئەو ساڵە بۆتە سکرتێری دووەمی بازرگانیی باڵوێزخانەی بەریتانی لە پاریس و نۆدی نەخایاندووە هەر لەوێ بۆتە سکرتێری یەکەم و تا ساڵی ١٩٥١ لەوێ ماوەتەوەو لەو ساڵەدا گوێزراوەتەوە هەمان پۆست لە ڕیو دی جانیرۆ، لە ساڵی ١٩٥٣یشدا بۆتە سکرتێری یەکەمی بازرگانی و کونسوڵی ولاتەکەی لە پەکین، دوای ئەوە چەند ساڵێك لە بارەگای وەزارەت لە لەندەن کاری کردووە تا لە ساڵی ١٩٥٩دا بۆتە کونسوڵی بازرگانیی لە باڵوێزخانەی بەریتانی لە بەغداو ساڵی ١٩٦٥ بۆتە باڵوێزی بەریتانی لە ڕانگون و دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٠وە تا ساڵی ١٩٧٥ بۆتە باڵوێزی بەریتانی لە ئەندەنوسیا، ئەمەیش ئەدرێسێتی: Sunest, Wadhurst Park, wadhurst, East Sussex.

بڕوانە: ((Who's Who 1980.An Annual Biographical Dictionary)), London, 1980, P. 526.



وێنەی کۆمبس لەناو پاشماوە ڕۆمانییە دێرینەکانی شاری بەعلەبەگدا، لەدوا ساڵەکانی ژیانیدا – کەمال مەزهەر

باڵوێزخانەی بەریتانی بووە جۆرە هاوڕێیەتێکی برایانەی دوور لە مەبەست لە نێوانیاندا دروست بووەو[256] ویستوویەتی لە ڕێگەی ئەوەوە بە ڕاشکاوی ڕەوایی پرسی کورد و دڵنیایی خۆی لەوەی حوکمەتی بەریتانی نیازییە یاریدەی کورد بدات ڕابگەیێنێت، (کۆمبس)یش بۆ ڕۆژی دواتر ئەم نامەیەی لای خوارەوە دەربارەی پوختەی ئەو دانیشتنە بە شێوازێکی فەرمیی دەنێرێت بۆ سەرۆکی بەشی ڕۆژهەلاتی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی:

---

(256) سێر ویلیس کۆمبس پێوەندیی لەگەڵ محەمەد سەعید خەفافدا یەکجار نزیک بووە، چەند ساڵێك هاتوچۆ لەنێوان خێزانی هەردووکیاندا بەردەوام بووە، وەك دەڵێت پیاوێکی دونیادیدەو یەکجار سادەو بێ ئەندازە دڵسۆزو خاوێن بووە، بەدڵ کوردی خۆشویستووە، مەبەستی سەرەکیی کاك محەمەد سەعید لە دیدەنیی ئەو ڕۆژەی لەگەڵ کۆمبسدا هاندانی بەریتانییەکان بووە بۆ ئەوەی دەستی یاریدە بۆ شۆڕشی کورد درێژ بکەن.

(دیدەنیی لەگەڵ محەمەد سەعید خەفاف ڕۆژی بیستویەکی ئەیلوولی ٢٠٠٧ لە لەندەن).

((نهێنی،

یادداشتێکی فەرمیی.

١- کوردێکی عیراقی، بە ناوی محەمەد سەعید خەفافەوە، دوێنێ هاتە ماڵی خۆمان بۆ لام. خەفاف بازرگانێکی ناسراوی بەغدایەو من لەو کاتەوەی کۆنسوڵی بازرگانی بووم لەوێ زۆر لە نزیکەوە ناسیم. خەفاف پێی گوتم هەرچەندە ئەو لە ساڵی ١٩٤٨وە توخنی سیاسەت نەکەوتووە(257)، ئەوەی من پێم وایە ڕاست دەکات، بەڵام بە ناچاری بۆتە ئەندامی لیژنەی کوردیی بۆ وتووێژ لەگەڵ حوکمەتی عیراقیدا. زۆری نەخایاند دوای ئەوەی وتووێژەکە رووخا بۆ ڕۆژێك لە لایەن پۆلیسی عیراقەوە گیراوەو هەرچەندە لەوە نەترساوە تووشی هیچ جۆرە گێرەو کێشمەیەکی گەورە بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بڕیاری داوە بۆ ماوەیەك عیراق بەجێ بهێڵێت.

بەو جۆرە لە پێنجی حوزەیرانەوە هاتۆتە لەندەن و ئەگەر بتوانێت نیازییە لێرە بمێنێتەوە تا ئەو کاتەی بارودۆخەکە هێمن دەبێتەوە، ماڵ و منداڵەکانیشی تاوەکو ئێستا هەر لە بەغدان.

٢- وا دیارە پێوەندیی بە تەها مەعروفەوە(258) هەیە کە پێم وایە کارمەندی باڵوێزخانەی عیراقی بوو لە لەندەن تا ئەو کاتەی لە لایەن قاسمەوە دەستی لەکار

---

(257) محەمەد سەعید خەفاف: لە منداڵییەوە کوردایەتی لە کەللەی داوە، لە پۆلی دووی ناوەندییەوە بۆتە ئەندامی ((پارتی هیوا)) و بۆچوونەکانی ڕەفیق حیلمی کاریان تێی کردووە، دوایی بۆتە ئەندامی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) و بەرپرسی لقی بەغدا بۆ ماوەیەك، پێوەندیی هاوڕێیەتی و فیکریی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەددا هەبووە، تەنانەت لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بۆ خۆی پێشنیاری کردووە ئەو نامەیەی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) ویستوویەتی بینێرێت بۆ ئەو ئەفسەرە کوردانەی سوپای عیراق کە دابوویانە پاڵ کۆماری مەهاباد (کوردستان) ئەو بیگەیەنێت بەڵام ئیبراهیم ئەحمەد، لەبەر تەمەنی، ڕێگەی نەداوە، لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردووەوە دەستی لە حیزبایەتی، نەك کوردایەتی، هەڵگرتووە (هەمان دیدەنیی).

شایانی باسە محەمەد سەعید خەفاف کوڕی حاجی ئیبراهیم ئاغایە کە باوو باپیرانی لە بنەماڵە ناسراوەکانی سلێمانین، لە بنەڕەتدا لە قەلاچوالانی پایتەختی میرنشینی بابان ژیاون و دوای ئەوەی سلێمانی بۆتە ((دار الملکی بابان)) باوو باپیرانی حاجی ئیبراهیم ئاغایش هاتوونەتە سلێمانی.

(258) مەبەستی تەها محیی الدین مەعروفە، کە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانییە، ناوی حاجی مەلا محیالدینی باوکی چەند جارێك لەو بەڵگەنامە نهێنییانەی حوکمەتی بەریتانیدا هاتووە، کە باسی

کێشرایەوە. هەمان کات خالید شاویی مولحەقی بازرگانیی باڵوێزخانەی عیراقیشی لە لەندەن دیوە کە چەند ساڵێکە هاوڕێی یەکترین.

٣- وەك کوردێك میستەر خەفاف بەرانبەر پرسی کورد هەمان ڕێبازی باوی گرتۆتە بەر، بەڵام پێم وایە پێویستە ئاماژە بۆ بیرۆکەیەك بکەم کە لە مێشکیدا چەسپاوە، بەپێی قسەی ئەو حوکمەتی خاوەن شکۆی (بەریتانی- ك. م.) دەیەوێت یاریدەی کورد بدات، ئەو یاریدەیەش (بەلای ئەوەوە- ك. م.) پێویستە فڕۆکە و فڕۆکەوانیش بگرێتەوە. منیش پێم گوت هەرچەندە ئەوە کاری من نییە بەڵام شتێکی لەو بابەتە بە هیچ جۆر لەوانە نییە روو بدات. میستەر خەفاف گوتی ئەو تێ دەگات کە لەوانەیە من نەزانم، بەڵام ئەوەی پێی گوتم تەواو ڕاستە. (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە ١٨).

ئیمزا

دەبل یو. ئای. کۆمبس

٢٤ی حوزەیرانی ١٩٦٣

بەشی ڕۆژهەلات))[259].

بەو جۆرە کوردە دڵسۆزەکانی ئەو ڕۆژگارە، لە هەر شوێنێك بووبن، چاکی کوردایەتییان لێ کردووە بە لاداو بەپێی تواناو شێوازی سەنگینی خۆیان وەك ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) ئەوانیش پشتی شۆڕشی نەتەوەکەیانیان گرتووە، بەڵام کۆمەڵە وەك هەر دەزگایەکی دیکەی قوتابیان لە جیهاندا دەنگی زوڵاڵتر بووە، ئەوەی بە ئاسانی لە ڕێگەی خوێندنەوەی خێرای دوا ژمارەی گۆڤاری ((کوردستان))ەوە بە روونی هەستی پێ دەکەین.

---

شەڕی بەردەرکی سەرا دەکەن (بڕوانە بابەتی پێنجەمی ئەم کتێبە)، تەها محی الدین یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ((پارتی دیموکراتی کوردستان)) لە عیراق، تەنانەت ساڵی ١٩٤٧ وەك نوێنەری پارتی بەنهێنی لە ناوچەی (بستان الخس)ی بەغدا لەگەڵ فەهدی سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی عیراقدا کۆبۆتەوە.

(259) N.A., F.O., 371/170435, Confidential, Minutes, W.I. Combs, June 24, 1963, Eastern Department.

## ژمارەیەکی دانسقەی گۆڤاری (کوردستان) و ئاوا بوونی خۆری درەوشاوەی کۆمەڵەی خوێندکاران

بەر لە ئێستا ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە گۆڤاری ((کوردستان)) وەك ئۆرگانێکی وەرزیی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) زۆر زوو لەدایك بوو. ژمارە سیازدەی ((کوردستان)) کە ساڵی ١٩٦٩ لە لەندەن بە سەرپەرشتیی دارا عەتتار چاپ کراوە ئەو ژمارە دانسقەیەی ئەو گۆڤارە بوو. ناوەرۆکی ئەو ژمارەیە دەوڵەمەندیی و ڕازاوەیی ((کوردستان)) دەسەلمێنن، دوای سەروتاری دارا عەتتار[260] ئەم وتارەی سەردار ئاراراتی چاپ کراوە (نا دەستووریی مامەڵەی کورد لە تورکیا) کە لەبەر ڕۆشنایی پێنج بەندی سەرەکیی دەستووری تورکیای کەمالیدا ڕادەی نایاسایی ڕەفتارەکانی ئەنقەرە بەرانبەر کورد نیشان دەدات[261]. دوا بەدوای ئەو وتارە هەر پازدە بڕیارەکانی دوازدەمین کۆنگرەی کۆمەڵە لە بەلگراد (کانوونی دووەمی ١٩٦٩) لەگەڵ سوپاس و ئاواتدا بڵاو کراونەتەوە[262]، ئینجا بە ڕیز باسی چالاکییەکانی کۆمەڵە لە هەر یەك لە یەکیەتی سۆڤیەت و سویدو پۆڵۆنیا و ئەڵمانیای دیموکراسی و بەریتانیا و بەرلین دەکات[263]، دوای ئەوە دێتە سەر باسی چالاکییەکانی خوێندکارانی کورد لە فێستیڤاڵی جیهانیی سۆفیادا، کە لە نێوان ڕۆژانی بیستو هەشتی تەممووز شەشی ئابی ساڵی ١٩٦٨دا، لە بەلغاریا ساز کرا[264].

---

(260) Editorial, Kurdistan Politics in Perspective, (Kurdistan, Vol. III, Annual Journal of K.S.S.E., London, 1969, PP.4-7).

(261) Sardar Ararati, Unconstitional Treatment of the Kurds in Turkey,- ((Kurdistan)), Vol. XIII, PP. 1,8.

(262) Ibid, PP. 9-10.

(263) Ibid, PP. 11-12.

(264) Ibid, PP. 15-16.




VOL.
XIII

ANNUAL JOURNAL OF K.S.S.E

1969

دوا بەدوای ئەوانە ئەم ژمارەیەی ((کوردستان)) ئەم وتارە زانستییە بەنرخەی تۆفیق وەهبیی بڵاو کردۆتەوە: ((پاشماوەی میثراییەکانی حەضەر و کوردستانی عیراق و پاشماوەکانیان لە یەزیدیزمدا. یەزیدییەکان شەیتانپەرست نین))[265].

(265) Taufiq Wahby, The Remaints of Mithraism in Hatra and Iraqi Kurdistan and its Traces in Yazidizm: The Yazidis are not Devil- Worshippers, ((Kurdistan)), Vol. III. PP. 18-19, 25-30.

**دوای ئەوە وتارە ڕۆمانسییەکەی لۆرد کیلبراکێنی[266] ئایرلەندەیی ((عیشقی من بۆ کوردستان)) دوا ژمارەی گۆڤاری ((کوردستان))ی ڕازاندۆتەوە. شایانی باسە لۆرد کیلبراکێن، کە ئەندامی ((پارتی کرێکاران)) و پەرلەمانی بەریتانی و**

---

(266) ناوی تەواوی **لۆرد کیلبراکێن جۆن ڕایمۆند گۆدلییە-** John Raymond Godley Kilbrackenـە، ڕۆژی حەڤدەی تەشرینی یەکەمی سالّی ١٩٢٠ لەدایك بووە، لە ئایرلەندەی باکوور دەژیا، ماجستێری لە زانکۆی ئۆکسفۆرد وەرگرتووەو دواییش هەمان زانکۆ دوکتۆرای فەخریی داوەتێ، کیلبراکێن سەرەتا فڕۆکەوان بوو (١٩٤٠-١٩٤٦) و گەیشتە پلەی نەقیبی فڕۆکەوانیی دەریایی بەریتانی و فەرماندەی هەردووك تیپی ٧١٤ و ٨١١ی ئەو هێزە، دوای جەنگی دووەمی جیهان دەستی لە کاری سەربازیی هەلّگرت و بووە پەیامنێری ژمارەیەك لە ڕۆژنامە بەریتانییە بەناوبانگەکان، وەك ڕۆژنامەی **((دەیلی میرەر))** (Daily Mirror) لە نێوان سالآنی ١٩٤٧ و ١٩٤٩داو ڕۆژنامەی **((سەندەی ئێکسپرێس))** (Sunday Express) لە نێوان سالآنی ١٩٤٩ و ١٩٥١دا، دوای ئەوە لە نێوان سالآنی ١٩٥١ و ١٩٩٦دا وەك ڕۆژنامەنووس و وێنەگرێکی سەربەخۆ کاری کردو گەلێك لە گۆڤار و تەلەڤزیۆنەکانی بەریتانیاو ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ولآتانی دیکە بەرهەمە ناوازەکانیان بلآو دەکردەوە، لە سالّی ١٩٤٠وە ژمارەیەك کتێبی بلآو کردۆتەوە، هی وەك: **((تەنانەت با بۆ سەعاتێکیش بێت))** (Even For An Hour) کە بریتییە لە هۆنراوەکانی، **((ئەوەی دواترم پێ بلّێ))** (Tell Me The Next One)، **(نامەکانی بەرەبەیانی نیوزیلەندە)**، (Letters From Early New Zealand)، **((ژیان وەك لۆردێك))** (Living Like a Lord)، **((لۆردێك لەپشت پەردەوە))** (A Peer Behind the Curtain)، **((وەستا فێڵبازەکەی))** (The Master Forger)، **((کەشتیی ئایرلەندی و ئەسپی بوراق))** (Shamrocks and Unicorns)، **(ڤان مێگێرن)** (Van Megeren) ژمارەیەکی دیکە لەو کتێبانەی وا دیارە هەموویان بەرهەمی ڕەخنەئامێزی دیاردە نالەبارەکانی کۆمەلّ بوون، سالّی ١٩٥٣ کیلبراکێن بووە ئەندامی **((پارتی لیبرالّ))** و لە سالّی ١٩٦٦یشەوە بووە ئەندامی **((پارتی کرێکاران))** و نوێنەری لە پەرلەماندا. لۆرد کیلبراکێن عاشقی کوردو کوردستان بوو، سالّی ١٩٦٦ دوو جار زیارەتی ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستانی باشووری کردو لە سالّی ١٩٧٥وە بۆ ماوەی پازدە سالّ ئەندامی **((کۆمەلّەی دۆستایەتیی بەریتانی- کوردی))** بوو، بە داخەوە ڕۆژی چواردەی ئابی سالّی ٢٠٠٦ کۆچی دوایی کرد، ئەمەیش ناونیشانی جۆنی کوڕییە بۆ ئەو کوردانەی ڕێگەیان دەکەوێتە ئایرلەندەی باکوور، یا هەر کوردێك مەبەستی بێت:

Killegar, Co. Leitrim, Ireland. T. and Fax: (49) 433430.

بڕوانە:

((Who's Who 1966. An Annual Biographical Dictionary)), London, 1966, P.1693, ((Who was who 1897-2006)), London, 2006, Kilbracken.



عاشقە گەورەکەی کوردستان لۆرد کیلبراکێن (ساڵی ١٩٦٦) بەجل و بەرگی کوردییەوە — کەمال مەزهەر.

سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان

دوکتۆرای شەرەفی زانکۆی ئۆکسفۆردو خاوەنی ژمارەیەك کتێب بوو، دوو جاران زیارەتی ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستانی کردووەو بە جلوبەرگی کوردییەوە چۆتە ناو پێشمەرگە و بەرەکانی شەڕەوەو سەری لە قوتابخانەکانی ناوچە ئازادکراوەکان و ئیزگەی ((دەنگی کوردستان)) داوەو لە نزیکەوە شمشاڵ ژەن‌و شوانی نۆ ساڵانی کوردی بە پەستەکەوە دیوە، هەموو ئەوانەیش بەسەر یەکەوە، وێڕای شاخی ڕەنگاوڕەنگی کەم هاوتای کوردستان وێنەی ئەو عیشقە پیرۆزەیان لەو دڵە گەورەیەدا کێشاوە[267].

---

(267) Lord Kilbracken, Kurdistan Man Amour, ((Kurdistan)), Vol. XIII, 1969, PP. 20-24.




خوێندکارانی کورد لەئەورووپا بەشداری نۆیەم فیستیڤاڵی جیهانی لاوان و قوتابیان دەکەن کە لە بیست و شەشی تەموزەوە تاوەکو شەشی ئابی ساڵی ١٩٦٨ لە سۆفیای پایتەختی بولگاریا ساز کرا.

سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان — کەمال مەزهەر.

لە راستەوە بۆ چەپ: حوسێن فەقێ ئەحمەد بارزانی، ؟ ، د. وەهبیە شەوکەت، برای جەلال دەباغ، جمشید حەیدەری، جەوهەر شاوەیس (برای نوری شاوەیس)




خوێندکارانی کورد لە لەندەنی بەناوبانگ و قەشەنگ بە بڕواوە ناوی کوردستان بەرز دەکەنەوە — کەمال مەزهەر. سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان.

ئینجا دوا ژمارەی ((کوردستان)) وتارێکی ئەدمۆندسی دووبارە کردۆتەوە کە چەند مانگێك لەوەوبەر بەم ناونیشانەوە ((**شەڕی کورد لە عیراق: پێشینە دەستوورییەکانی**)) لە ژمارەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٨ی ((**گۆڤاری جیهانی ئیمرۆ**))ی لەندەنیدا بڵاوی کردۆتەوە[268].

هەمان ژمارەی ((کوردستان)) پێنج لاپەڕەی خۆی بۆ ژمارەیەك بەڵگەنامەی مێژوویی زۆر بایەخدار تەرخان کردووە. یەکەم بەڵگەنامەیان نامەیەکی بارزانییە بۆ جەنەراڵ دیگۆلی سەرۆکی فەرەنسی کە شوباتی ساڵی ١٩٦٨ بۆی ناردووەو بە سۆزێکی زۆرەوە گلەیی لێ کردووە چونکە پێی سەیرە پیاوێکی وا گەورە، کە فەرەنسای لەدەست داگیرکەر قوتارکرد، ئاوڕ لە دەردو ئازاری گەلی کورد نەداتەوەو بە یەك چاو سەیری کوردو ڤێتنامییەکان نەکات، وەك موسڵمانیش کۆتایی نامەکە بە ئایەتێکی پیرۆزی قورئان دەهێنێت و هیوای ئەوە دەخوازێت جەنەراڵ دیگۆل و فەرەنسا ببنە مژدەدەری بەهەشتی رزگاریی لە ئاسمانی کوردستاندا، ئەوەی ڕای گشتیی فەرەنسی دەبزوێنێت و وا لە ژمارەیەك کەسایەتیی ناسراوی ئەو وڵاتە دەکات داوا بکەن ئەگەر هاتوو فەرەنسا چەکی دایە عیراق مەرجی ئەوەی بۆ دابنێت ڕوی ئەو چەکە نەکرێتە کورد[269](*).

بەڵگەنامەی دووەمی ((کوردستان)) ئەو یادداشتەیە کە دوکتۆر کامەران عالی بەدرخان ڕۆژی پازدەی تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٨ وەك ((**گوتەبێژی ئەنجوومەنی شۆڕشی کورد لە کوردستانی عیراق**)) پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردووە لە نیویۆرك[270]. دوای تەنها سێ ڕۆژ دوکتۆر کامەران نامەیەك دەربارەی هەمان بابەت دەنێرێت بۆ خودی یو. ثانتی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕۆژی شازدەی مایسی ساڵی ١٩٦٩یش نامەیەکی دیکەی بۆ دەنێرێت[271].

---

(268) C.J. Edmonds, The Kurdish War in Iraq: The Constitutional Background, -(Kurdistan), Vol.XIII, 1969, PP. 31-34.

(269) "Barzani writes to do Gaulle", (Kurdistan), Vol.XIII, 1969, P. 35.

(*) ((دڵنیام ئەم نامەیەی بارزانی بۆ (دیگۆل) دواتر کاریگەری خۆی بووە. بۆ پتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنۆڕە: بەرگی دووەمی کتێبی بیرەوەرییەکانی موحسین دزەیی – ع. زەنگەنە)).

(270) ((Memorandum on the Kurdish Question presented to the United Nations in November 1968)), -(Kurdistan), Vol.XIII, 1969, PP.36-37.

(271) Ibid, PP. 37-38, 41.



دوای دامەزراندنی لقی پۆلۆنیای (کۆمەڵەی خوێندکاران) لە ساڵی ١٩٦٢دا خوێندکارانی کوردی ئەو وڵاتە زوو زوو بەو جۆرە دەڕژانە سەر شەقامەکانی وارشاوی پایتەخت — کەمال مەزهەر

**سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان**




خوێندکارانی کوردو هاوڕێ دڵسۆزە سوێدییەکانیان بەو پەڕی بڕواوە ناوی کوردستان لەسەر شەقامەکانی شاری ستۆکهۆلمی پایتەخت بەرز دەکەنەوە — کەمال مەزهەر. سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان

دوا لاپەڕەی ئەم بەشەی گۆڤاری ((کوردستان)) تەرخان کراوە بۆ دوو بەڵگەنامەی دیکەی زۆر دەگمەن لە هەمان بوواردا، وێڕای نامەیەکی کۆمەڵە خۆی بۆ سەرەك کۆماری سووریا. ڕۆژی پازدەی مایسی ساڵی ۱۹٦۹ لە ((ئەنجوومەنی لۆردان))ی بەریتانی لە گەرمەی گفتوگۆی بەکارهێنانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ هێزی ئاسمانیی بەریتانی لە ڤێتنام هەمان عاشقی کوردستان لۆرد کیلبراکێن وەستایانە ئەو هەلەی قۆستۆتەوە بۆ ووژاندنی پرسی کورد. بەر لەوەیش ڕۆژی بیستوحەوتی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٦۸ (م.ڕوایس) لە پەرلەمانی فەرەنسیدا مەسەلەی بەکارهێنانی چەکی فەرەنسی دژی کورد دەوروژێنێت، لە وەڵامیدا درۆو دەلەسەکانی عەبدولسەلام عارف باس دەکرێت کە شوباتی ساڵی ۱۹٦٦، لە کاتی زیارەتەکەی پاریسیدا، چۆن باسی ((برا)) کوردەکانی کردبوو. دوا بەڵگەنامەیش نامەکەی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا))یە بۆ سەرەك کۆماری سووریا نورەددین ئەتاسی بە بەرواری بیستودووی تەشرینی دووەمی ساڵی ۱۹٦۸ دەربارەی ژیانی سەختو نالەباری نیو ملیۆن کوردی ئەو ولاتە[272].

دوا بابەتی دوا ژمارەی ((کوردستان))ی ئۆرگانی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا)) خشتەیەکە دەربارەی گرنگترین ڕووداوی کوردستان، لە ساڵی ۱۸۳٤وە تاوەکو مارتی ساڵی ۱۹٦۹، لەگەڵ ناوی ژمارەیەك سەرچاوەی هەڵبژاردە بە گەلێك زوبان دەربارەی مێژووی کوردو کوردستان[273][*].

ئەم پوختەیەی ناوەڕۆکی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری ((کوردستان)) نیشانە و بەڵگەی سەلمێنەرە بۆ ڕۆڵو سەنگی ((کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا))، بۆیەکا دەبوو بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانی لە گەلێك

---

(272) Ibid, P. 39.

(273) Ibid, PP. 40-44.

(*) ((لەبەر گرنگی ناوەڕۆکی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری کوردستان، ئەگەر بمێنین تەواوی لاپەڕەکانی لە ژمارەی داهاتووی گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان وەکو (دیاریی ژمارە) بلاودەکەینەوە–ع. زەنگەنە)).

((دواتر تەواوی لاپەڕەکانی لە ژمارە (١٤)ی گۆڤاری ئاماژە بۆ کراو بلاوکرایەوە – ع. زەنگەنە)).

رووەوە بایەخ بدات بەو دیاردە نوێیەی ژیانیی سیاسیی و فیکریی هاوچەرخی کوردو بەو جۆرە سەرچاوەیەکی ڕەسەن و دەگمەن پێك دەهێنن بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیی گشت لایەنە فیکریو سیاسی و چالاکییەکانی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا) و دیسانەوە بە دڵنیاییەوە دەڵێین دەتوانرێت نەك تەنها دەربارەی کۆمەڵە خۆی نامەیەکی دوکتۆرای گەورە بنووسرێت، بەڵکو هەمان کاتو بە هەمان دەستوور دەتوانرێت دوو نامەی ماجستێری ڕێکوپێکیش دەربارەی گۆڤاری ((کوردستان))ی ئۆرگانی کۆمەڵە بنووسرێت، یەکێکیان لە بواری مێژووداو ئەوی دیکەشیان لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا. هەڵبەت ئەو خوێندکارانەی کارێکی زانستیی نایابی وەها دەگرنە ئەستۆ دەتوانن لە ڕێگەی ئەم ناوە بەڕێزانەی لای خوارەوە گەنجینەیەکی دەوڵەمەند لە زانیاریی بایەخدارو ڕەسەن بۆ کارەکەیان وەدەست بهێنن:

عیصمەت شەریف وانلی و دارا تۆفیق (نووسینەکانی)، دوکتۆر کەمال فوئادو دوکتۆر وریا ڕەواندزی و نورەددین زازا (نووسینەکانی)، عومەر شێخ مووس و سەلاح سەعدوڵلا (نووسینەکانی) و دوکتۆرە نەسرین فەخری و دوکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ و دوکتۆر کاوس قەفتان و د. مارف خەزنەدار و د. جەمشید حەیدەری و دوکتۆر ئیحسان فوئاد و هاواری کاکە زیاد و دارا عەتتار و سیامەند صەمەد بەنا و جەوهەر صدیق شاوەیس و کەسانی دیکەی وەك ئەوان، وێڕای ئەوەیش ڕۆژنامەی ((خەبات- النضال)) ساڵی ١٩٦٠ بە عەرەبی و ((التآخي)) دووجار هەر بە عەرەبیو هەر سێ جارەکەیش بە ناونیشانی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)وە وتاریان بڵاو کردۆتەوە[274]، دوور نییە لەم بووارەدا وتاری دیکەش هەبێت کە دەچنە خانەی سەرچاوەی بەکەڵك و پێویستەوە[*].

---

(274) بڕوانە: ((خەبات- النضال))، بغداد، ٧ مارت ١٩٦٠، ((التآخي))، بغداد، ١٤ اب و ٢ ايلول ١٩٧٣.

(*) ((لەژمارەکانی (٤،٣،٢)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی)دا، وەکو لەپەراوێزێکی پێشووشدا ئاماژەم بۆ ئەم بابەتە کردووە، بابەتێکم بەناونیشانی (دادگاییکردنی خەبات) بڵاوکردۆتەوە، زۆربەی ناوەڕۆکەکەی لەبارەی (کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا) بووە، کاتی خۆی (خەبات) خۆیشی هەر لەسەر ئەو کۆمەڵەیە، کە ئەوسا بۆ بەشداریکردن لەکۆنگرەی قوتابیانی جیهان سەردانی بەغدایان کردبوو، دراوەتە دادگا، چونکە لەئەنجامی مشت و مڕ لەسەر هەبوونی کورد وەکو نەتەوە، سەرنووسەری



زانـا و سیاسـەتمەداری ناسـراوی کـورد
مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ. خوێندکارانی
کورد لەئەورووپاو تایبەت لە لەندەن تا کۆچی
دوایی خۆی و خاتوو ئاسیای هاوسەری کە
دەورو خولیان بوون — کەمال مەزهەر.
سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان

---

(خەبات)، کە برایم ئەحمەد بوو، سەروتارێکی بەناوونیشانی (الأمة الكردية والمادة الثانية من الدستور)ی نووسیبوو. هەروەها لەژمارە (٦)ی گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس)ی ساڵی ٢٠٠٥دا بابەتێکمان بەناوونیشانی (ڕۆژنامەگەری خوێندکارانی کورد لەدەرەوەی کوردستان) بۆ نەوزاد عەلی ئەحمەد بڵاوکردۆتەوە، وەکو لە خۆیشیم بیستووە، بەم زووانە وەکو کتێب بڵاودەکرێتەوە.

لەژمارە (٢ – ٣)ی گۆڤاری (هاڤیبوون)ی ساڵی ١٩٩٨دا، (د.کەمال فوئاد) بابەتێکی بەناوونیشانی (چەند زانیارییەك لەبارەی بزووتنەوەی خوێندکارانی کوردەوە لەهەندەران) بڵاوکردۆتەوە، هەر (د.کەمال فوئاد) لەسەرەتای حەفتاکاندا نامیلکەیەکی لەسەر کۆمەڵە لەلایەن (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) بۆ بڵاوکراوەتەوە. لەساڵی ١٩٦٨یشدا، کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد، نامیلکەیەکیان بەناوونیشانی (اضواء على الحركة الطلابية في الخارج) لەپراگ بڵاوکردۆتەوە. ئەوە جگە لەوەی گۆڤاری (ژیانی نوێ)ی ساڵی ١٩٦٠ لەسلێمانی چەند نامەیەکی بەرپرسانی ئەو ڕێکخراوەی وەکو خۆی بڵاوکردۆتەوە.

هەرچی ئەو بابەتانەی (التآخي)یە کە د.کەمال ئاماژەی بۆی کردووە، ئەوە بەبۆنەی بەستنی کۆنگرەی شازدەمی کۆمەڵەکە بووە، (دارا تۆفیق و سەلاح سەعدوڵڵا) و چەند کەسێکی دیکە بابەتیان بەم بۆنەیەوە نووسیوە، لەکۆنگرەکەشدا محەمەد مەحموود عەبدولڕەحمان "سامی" وتارێکی درێژی بەناوی "پارتی دیموکراتی کوردستان" خوێندۆتەوە، ـ ع. زەنگەنە))



پارێزەرانی کوردو کوردستان لەبنکەیەکی نزیك شاری سەربەرزی ڕەواندز – کەمال مەزهەر.
سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان.



هێڵی پێشەوەی بەرەی شەڕ: پێشمەرگەیەك، لە فەرماندە خۆجێیەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە دووربین سەیری شاری ڕەواندزو هێزەکانی سوپای عێراق لە نزیك ئەم شارەوە دەکات. سەرچاوە: گۆڤاری کوردستان.

# بابەتی نۆیەم

## پرسی کورد لەنێوان دوو دژە تەوەری ئیمام خومەینی و صەدام حسەیندا
## لەبەر ڕۆشنایی بەڵگەنامە نهێنییەکانی حوکمەتی بەریتانیادا

## کورتە رووتکردنەوەیەک

پێموایە پێشتر، لە شوێنی دیکەی ئەم بەرهەمەمدا، ئاماژەم بۆ ئەوە کردووە، کە سەرەتا لە کارمەندانی فەرمیی بەریتانی بەولاوە کەس مافی ئەوەی نەبووە بەڵگەنامە هەڵگیراوەکانی ناو ((ئەرشیڤی نیشتمانیی)) بەریتانی ببینێت، چونکە ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەنامانە بە سەرنجو راپۆرت و کارە نهێنییەکانی کاربەدەستە بەریتانییەکان تەنراون، واتا ئەو شتانەی کە لە هەموو وڵاتێک بەنهێنی دەوڵەت ((أسرار الدولة)) دادەنرێن و کەسی دیکە بۆی نییە بیانبینێ. دوای کۆششێکی زۆر لەلایەن توێژەرو پسپۆڕو پەرلەمانتارو ڕۆژنامەنووسانی ئەم وڵاتە خۆیان، بڕیار درا دوای تێپەڕبوونی پەنجا ساڵ (نیو سەدە) بەسەر هەر بەڵگەنامەیەکدا ڕێگە بدرێتە هەمووان ببینن، تەنها ژمارەیەکی کەم لەو بەڵگەنامانە نەبێت کە یەکجار نهێنین و لەوانەیە کار بکەنە سەر پێوەندییە دیپلۆماسییەکانی حوکمەتی بەریتانی، یا ببنە هۆی ناوزڕاندنی بنەماڵەی پاشایانی ئەم وڵاتە، کە بەچاوی سیمبوڵی نیشتمانیی سەیر دەکرێن. پاش ماوەیەک ئەو پەنجا ساڵە کرایە چل ساڵو ئێستایش سی ساڵە، لە ساڵی دوو هەزارو حەوتیشدا، واتا ئەو ساڵەی من دەستم دایە دانانی ئەم کتێبە، توێژەران مافی ئەوەیان هەیە تەنها ئەو فایلانە ببینن کە مێژوویان دەگەڕێتەوە پێش ساڵی ١٩٧٢.

ڕۆژێکیان وا ڕێککەوت ئەو باڵوێزە یابانییەی لە تەنیشت منەوە کاری دەکردو ببووینە برادەر یەکێک لەو فایلانەی ئەو ڕۆژە کاری تێدا دەکرد هی ڕووداوەکانی دە دوازدە ساڵ پاش ساڵی ١٩٧٢ بوو. کە پرسیم گووتیان: بەڵێ شتێکی کەم لەو فایلانەی هیچ جۆرە نهێنییەکی دەوڵەتیان تێدا نییە بینینیان قەدەغە نییە، ئەوە وەک هەمووان پرسی کوردیش دەگرێتەوە. بەو جۆرە ژمارەیەک ڕاپۆرتی بەنرخم دەستکەوت کە دوای ساڵی ١٩٧٢ نووسراون و پێوەندییان بە کوردەوە هەیە، یا سەرجەمی ناوەڕۆکیان بۆ ئەو پرسە تەرخان کراوە، وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا دەیانبینین.



شاپوور بەختیار



محەمەد ڕەزا شا

**یەکەم: کەوتنی شای ئێران و گەڕانەوەی ئیمام خومەینی**

کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە دڵی سەرجەمی ڕۆڵە دڵسۆزەکانی کورد لە ڕەزا شای بکوژی سمکۆی شکاك و محەمەد ڕەزاشای بکوژی پێشەواو هاوبیرەکانی پڕ بوو لە هیواو ئاواتی ڕوخانی ڕۆژێك زووتری ڕژێمی پەهلەوی لە ئێران، بۆیەکا شۆڕشی ئیسلامیی ئێرانی مژدەدەرێکی پڕ لە هیوا بوو بۆ کوردیش کە بە دڵ پشتگیرییان کردو قوربانییان لە پێناویدا دا، تەنانەت ڕۆژنامە بیانییەکانیش باسی ئەوەیان دەکرد چۆن کیژو لاوی کوردی کەرمانشا و سنە و مەهاباد و شارە کوردییەکانی دیکە، بە بەرگی کوردی ئاڵواڵا و چەپڵەڕێزانەوە، پێشوازییان لە کەوتنی ڕژێمی پەهلەوی و گەڕانەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی دەکرد[1]، بە داخەوە

---

(1) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: أمل عباس جبر البحراني، الثورة الاسلامية في ايران. دراسة تأريخية في أسبابها و مقدماتها و وقائعها، اطروحة دكتوراه، جامعة المستنصرية، بغداد، ۲۰۰۷.

(شایانی باسە ئەم نامەیە بە سەرپەرشتیی من ئامادەکرا و پلەی ئیمتیازی پێدرا. وەك گووتیشمان سەرەتا گەلی کورد بە گەرمیی پشتگیریی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و گەڕانەوەی سەرکردەی ئەو شۆڕشە ئایەتوڵڵا خومەینی کرد، لەم بووارەدا تەنانەت کار گەیشت بەوەی سەرکردایەتیی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی ئێران سەرەتای کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۷۹ ئامادەیی تەواوی خۆی بە سەرکردایەتیی شۆڕشی ئیسلامیی ڕابگەیێنێت دەربارەی ئەوەی هەر چەکێکیان پێویستە بۆ




دواتر ئەو بەهارە خۆشەی کورد دیسانەوە بووە خەونێك لە ڕابردوو. لایەنێکی ئەم ڕاستییە، لە ڕاپۆرتێکی نۆ لاپەڕەیی فایلی ژمارە (٩٣/٩٧٣)ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیدا ڕەنگی داوەتەوە کە بەم ناونیشانەوەیە:

**((خشتەی ڕۆژانەی ڕووداوە سەرەکییەکانی ئێران دوای ڕۆیشتنی محەمەد ڕەزاشا پەهلەوی ڕۆژی شازدەی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ و گەڕانەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی لە مەنفاوە "یەکی شوباتی ١٩٧٩- پێنجی مایسی ١٩٨٠" ))**[2]، **ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی (بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (١٩) ناوەڕۆکەکەیەتی:**

---

مسۆگەرکردنی سەرکەوتنی شۆڕش ئەوان ئامادەن پێشکەشیان بکەن، وێڕای ئەوە هەر لەو دەوروبەرەدا بروسکەی پشتگیرییەکەی بارزانی بۆ ئایەتوڵڵا خومەینی و خۆ ئامادەکردنی بۆ گەڕانەوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە لە هەر چوار لاوە دەنگی دایەوە).

(2) N.A., F.O., 973/93, Chronology of the principal events in Iran following shah (Muhammad) Reza Pahlavi's departure on 16 January 1979 and Ayatollah Khomeni,s subsequent return from exile (1 February 197- 5 May 1980), 9PP.

((١٩٧٩

**یەکی شوبات:** گەڕانەوەی ئایەتوڵلا خومەینی لە فەرەنسەوە بۆ ئێران.

**سێی شوبات:** خومەینی داوا لە حوکمەتەکەی دوکتۆر بەختیار دەکات واز لە کار بهێنێت[3].

**پێنجی شوبات:** خومەینی مەهدی بەزرگان دیاری دەکات بۆ پۆستی سەرەك وەزیرانی حوکمەتێکی کاتی.

**نۆ تا دەی شوبات:** کوشتار لە فرۆکەخانە سەربازییەکانی تاران و هێرشی سەربازە یاخیبووەکان و چەکدارە سیڤیلەکان بۆسەر پۆلیسخانە و سەربازگەکان.

**یازدەی شوبات:** ئیستیقالەی دوکتۆر بەزرگان و کابینەکەی.

**دوازدەی شوبات:** دوای چوار ڕۆژ پێکدادان لەگەڵ هێزە سەربازییە یاخیبووەکان لە تاران فەرمان درایە هێزەکانی سوپا بگەڕێنەوە سەربازگەکانیان. ئەو وەزیرو ئەفسەرانەی لە ماوەی چەند حەفتەی ڕابردوودا بەند کرابوون دەدرێنە دادگە ئیسلامییەکان بۆ دادگاییکردنیان.

**چواردەی شوبات:** حوکمەتی بەریتانی ئیعتیراف بە حوکمەتی بەزرگان دەکات.

**پازدەی شوبات:** دادگەی ئیسلامیی یەکەم بڕیاری لەسێدارەدانی ئەو کەسایەتییە سەربازی و سیڤیلانەی دەرکرد کە بەرپرسی تاوانەکانی ڕۆژگاری شابوون.

---

(3) مەبەست شاپوور بەختیارە، کە ئەندامی ((بەرەی نیشتمانی)) بوو. کاتێك محەمەد ڕەزا شا گلۆڵەی کەوتە لێژی داوای لە کەریم سنجابیی بە ڕەسەن کوردی کرد وەزارەتێکی نوێ دابمەزرێنێ، بەڵام ئەو قایل نەبوو ئەرکێکی وا بە فەرمانی شا قەبووڵ بکات، ئەوسا شا داوای لە شاپوور بەختیار کرد وەزارەتی نوێ دابمەزرێنێ، کە بەختیار قایل بوو (بەرەی نیشتمانی) یەکسەر بڕیاری دەرکرد بەختیاری لە ڕیزەکانی خۆی دەرکرد، هەرچۆن بێت شاپوور بەختیار ڕۆژی سی‌ویەکی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧ وەزارەتی نوێی دامەزراند. دوای گەڕانەوەی ئایەتوڵلا خومەینی بە ماوەیەکی کورت بەختیار ناچار بوو دەست لەکار هەڵبگرێت و بە نهێنی هەڵبێت و بۆ پاریس بچێت.

**حەڤدەی شوبات:** سەرۆکی ((ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین)) (منظمة تحرير فلسطين) یاسر عەرەفات سەردانی تاران دەکات[4].

**شەشی مارت:** حوکمەت ڕایگەیاند شاو خێزانەکەی بە غیابی دادگایی دەکرێن وەك ڕێگەیەك بۆ حەجزی پارەوپولیان لە هەندەران.

**دوازدەی مارت:** ئێران و پاکستان کشانەوەی خۆیان لە پەیمانی سێنتۆ ڕادەگەیێنن. کشانەوەی تیپی سەربازیی ئێرانی لە هێزەکانی ئاشتیپارێزی نێوان ئیسرائیل و سووریا.

**شازدەی مارت:** خومەینی فەرمانی لەسێدارەدان قەدەغە دەکات و داوای لە دادگاکانی شۆڕش کرد جارێکا هەموو بڕیارێکی دیکە لەو بارەیەوە بووەستێنن. هەڵگیرسانی شەڕی قورس لەنێوان هێزەکانی حوکمەت و شۆڕشگێڕانی ناوچەکانی کوردستان و تورکمان[5].

**سیی مارت:** شا لە مەراکیشەوە دەچێتە باهاما.

**سیی- سیویەکی مارت:** دەنگدانیی نیشتمانی- دەنگدانی بەن شومار بۆ کۆماری ئیسلامی.

**حەوتی نیسان:** لەسێدارەدانی سەرەك وەزیرانی پێشوو (ئەمین) هوەیدا. وەزیری داد دەست لەکار دەکێشێتەوە.

---

(4) فەلەستینییەکان، بەهۆی هەڵوێستی شاوە، بە گەرمی پێشوازییان لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئیسلامی کرد، تەنانەت، بەپێی گەلێك سەرچاوە، ژمارەیەکیان بە چەکی خۆیانەوە بەشدارییان لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سەرکردایەتیی شۆڕشدا کرد، بۆیەکا دوای گەڕانەوەی ئایەتوڵلا خومەینی لە پاریسەوە، بە ماوەیەکی کورت، کاتێك لایەنگرانی دەستیان بە سەر باڵەخانەی مەڵبەندی ئیسرائیلی لە تاران گرت، تەختەی ناوی مەڵبەندەکەیان داگرت و لە جێگەی ئەو تەختەیەکی دیکەیان بەم ناونیشانەوە هەڵواسی: ((باڵوێزخانەی فەلەستین))، کەچی دواتر یاسر عەرەفات لە هەموو روویەکەوە پشتی صەدام حسەینی دەگرت.

(5) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

((Serious fighting between Government forces and insurgents in Kurdistan and Turkoman provinces)) (N.A., F.O., 973/93…., P.1)

**شازدەی نیسان:** ڕەهبەری پارتی تودە (كۆمۆنیست)ی ئێران كەیا نوری لە مەنفاوە دەگەڕێتەوە.

**پێنجی نیسان:** شەڕێكی گشتیی لە نەغەدەی ئازەربایجان[6] پێنج سەد كوژراوی لێ كەوتەوە.

**حەوتی مایس:** باڵوێزەكانی ئێران لە وڵاتە ڕۆژئاواییەكان[7] بانگكرانەوە.

**سیی مایس:** لە هێزەكانی سوپا و میلیشیای ئیسلامی لەگەڵ عەرەبی ئێراندا لە خورمشەهر پێكدا دەدەن، بەپێی ڕاپۆرتەكان هەشتا كوژراو هەیە.

**چواری حوزەیران:** فڕۆكەكانی عیراقی بۆمبابارانی گوندە كوردییەكانی ڕۆژئاوای ئازەربایجان دەكەن.

**هەشتی حوزەیران:** خۆماڵیكردنی بانكە ئێرانی و بیانییەكان.

**دەی حوزەیران:** شا لە باهاماوە دەچێتە مەكسیك.

**سیازدەی حوزەیران:** حوكمەتی ئێرانی هاتوچۆ لە ناوچە سنوورییەكاندا قەدەغە دەكات و عیراقیش بە هەناردنی چەك بۆ عەرەبی خۆزستان تاوانبار دەكات.

**پازدەی حوزەیران:** پڕۆژەی دەستووری كۆماری ئیسلامیی نوێ پەخش كرا.

**بیست و پێنجی حوزەیران:** خۆماڵیكردنی كۆمپانیاكانی دراو (**شركات الصیرفة**)و تەئمین.

**بیست و نۆی حوزەیران:** پتر لە پەنجا هەزار ئەندامی موجاهیدینی خەڵك، كە ڕێكخراوێكی ماركسییە، لە زانكۆی تاران دژی مەلاكان مان دەگرن.

**پێنجی تەمموز:** خۆماڵیكردنی كارگە پیشەسازییە سەرەكییەكان.

---

(6) لە دەقی بەڵگەنامەكەدا وا هاتووە، ئەگینا نەغەدە شارێكی كوردستانیی ڕەسەنەو لەڕووی كارگێڕییەوە سەر بە ئازەربایجانی باشوورە. Ibid, P.2 .

(7) لە دەقی بەڵگەنامەكەدا دەڵێت: ((Iranian Ambassadors recalled from overseas)). وشەی (oversea)یش (پشت دەریاكان– ما وراء البحار) دەگەیێنێت كە مەبەست وڵاتە ڕۆژئاواییەكانە.
Ibid, P.2.

**ناوەندی تەمموز– دووی ئاب:** دوای شەڕێکی سەخت لە کوردستان بە پەلە هێزێکی سەربازیی نێردرایە سەربازگەی مەریوانی سەر سنوور کە لە لایەن هۆزە کوردەکانەوە ئابڵوقە دراوە.

**سێی ئاب:** پارتی کۆماریی ئیسلامیی سەر بە خومەینی زۆرینەی ئەو حەفتاو سێ هەڵبژێردراوەی ئەنجوومەنی شارەزایانی هەڵسەنگاندنی پرۆژەی دەستووری وەدەست هێنا.

**دوازدە تا چواردەی ئاب:** شەڕو پێکدادان لەنێوان گروپە چەپڕەوو ڕاستڕەوەکانی تاران.

**هەژدەی ئاب:** هێزەکانی سوپا لەکاتی هێرشیاندا بۆ سەر کورد شاری پاوەی سەر سنووریان گرت و سنوورە نزیکەکانی عێراقیان داخست.

**ناوەندی ئاب:** گەلێك لە یاخیبووەکانی کورد لە پاوەو کەرمانشەهر لەسێدارە دران، بەڵام شەڕ نەوەستاوە.

**بیستو هەشتی ئاب:** خومەینی ئاگربەسی ((نافەرمیی))[8] لەگەڵ یاخیگەرانی کورددا پەسەند ناکات. لەسێدارەدانی ژمارەیەکی دیکە لە یاخیگەرانی کوردو تورکمان.

**دەی ئەیلوول:** ئایەتوڵڵا تاڵەقانی، کە دووەم مەلای ئێرانە (دوای خومەینی– ك. م.) لە تاران، کۆچی دوایی کرد.

**سیازدەی ئەیلوول:** ئەنجوومەنی شارەزایان ئەو پێشنیارەی دەستووری دەربارەی پێزانینی توانای خوداوەندیی خومەینی پەسەند کرد[9].

**سێی تەشرینی یەکەم:** ڕێگە درایەوە ڕۆژنامەی ((مردم))ی ئۆرگانی پارتی تودە (کۆمۆنیست) کە دەربچێتەوە.

---

(8) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی نافەرمیی ((unofficial)) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە. Ibid, P.3.

(9) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

((Assembly of Experts approved Constitional proposal to invest Supreme power in Khomeini)), Ibid, P.3.

**چوار تا هەشتی تەشرینی یەکەم:** پێکدادان لەنێوان یاخیگەرانی کوردی مەهابادو هێزە سەربازییەکانی میری. پەنجا کەس لە ئەندامانی پاسەوانی شۆڕش (حەرەسی خومەینی– ک. م.) لە بۆسەیەکدا کوژران.

**بیستوسێی تەشرینی یەکەم:** شا لە مەکسیکەوە چووە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ تەداوی.

**بیستو چواری تەشرینی یەکەم:** کۆمیتەیەکی وەزیران هاتنە سنە بۆ وتووێژ لەگەڵ کورددا.

**چواری تەشرینی دووەم:** دوای ئەو خۆنیشاندانانەی لە تاران لە ئەنجامی ڕەخنە گرتنی خومەینی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەسەر ئەوەی پەنای داوەتە شا، قوتابییانی ئێرانی باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانیان داگیر کردو ئەندامانی باڵوێزخانەکە وەک بارمتە (رهائن) گلدرانەوە.

**پێنجی تەشرینی دووەم:** باڵوێزخانەی حوکمەتی بەریتانی لە تاران بۆ ماوەی شەش سەعات لەلایەن قوتابییانی ئیسلامی و پاسەوانانی خومەینییەوە داگیر کرا، هەمان ڕۆژ حوکمەتی ئەمریکا ڕایگەیاند ڕێگە نادات شا تەسلیمی ئێران بکرێت. حوکمەتی ئێران یەک لایەنی بانگی هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی ئاشتیی ساڵی ١٩٢١ی لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیەتدا و پەیمانی بەرگریی هاوبەشی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا ڕاگەیاند.

**شەشی تەشرینی دووەم:** حوکمەتی بازرگان ئیستیقالەی کرد. خومەینی بڕیاری دا ئەنجوومەنی شۆڕش حوکمی ئێران بکات و هەڵبژاردنیش دوا بخرێت.

**هەشتی تەشرینی دووەم:** قوتابییە مانگرتووەکانی (ناو باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە تاران– ک. م.) داوای ((ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین))ی قەبوڵ نەکرد کە دەیویست بکەوێتە نێوان ئەوان و ئەمەریکاییەکان. هەمان ڕۆژ سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای لە حەرەسی خومەینی کرد گەرانتی ئازادکردنی بارمتەکان بدات. یەکەم هەنگاوی دیپلۆماسیی باڵوێزانی وڵاتە ئەندامەکانی ((بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپی)) لە تاران دەربارەی بارمتەکانی باڵوێزخانەی وڵاتە یەککگرتووەکان.

**دەی تەشرینی دووەم:** خومەینی جارێکی دیکە داوای کرد شا بنێردرێتەوە ئێران.

**یازدەی تەشرینی دووەم:** نوێنەرانی ڤاتیکان و سوید و سووریا و فەرەنسە و جەزائیر سەر لە بارمتە ئەمەریکاییەکان دەدەن. کوردەکان هێرشێکی فراوانی دیکە دەست پێ دەکەن و هێرش دەکەنە سەر (هێزەکانی میری– ک. م.) لە سنە و سەقز.

**دوازدەی تەشرینی دووەم:** سەرۆك کارتەر فەرمان دەدات هاوردنی نەوتی ئێران بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوەستێنرێت. هەر حەفتاو پێنج نوێنەرە دیپلۆماسییە بیانییەکان لە تاران داوایان کرد ئەو داوایەی ئێران دەربارەی تەسلیم کردنەوەی شا جێبەجێ بکرێت. سێیەم داوای بالۆێزانی ولاتە ئەندامەکانی ((بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپا)) لە تاران دەربارەی بارمتەکانی بالۆێزخانەی ئەمەریکی.

**چواردەی تەشرینی دووەم:** پارەوپوولی حوکمەتی ئێران لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەجمید کرا، ئەنجوومەنی ئاشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای ئێران بۆ وتووێژ ڕەت دەکاتەوە.

**پازدەی تەشرینی دووەم:** ئەنجوومەنی شارەزایان دوا پرۆژەی دەستووری (نوێی ئێران– ک. م.) پێشکەش دەکات.

**نۆزدە– بیستی تەشرینی دووەم:** سیازدە کەس لە بارمتەکانی (ناو بالۆێزخانەی– ک. م.) ولاتە یەکگرتووەکان ئازاد کران و گەڕانەوە ولاتی خۆیان. هەمان ڕۆژ خومەینی ڕایگەیاند زۆربەی بارمتەکانی دیکە وەك سیخوڕ دەدرێنە دادگە.

**بیستی تەشرینی دووەم:** بالۆێزانی ولاتانی ناو ((بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپا)) لە تاران گرتنی بارمتە ئەمەریکاییەکان و هەڕەشەی ئێران دەربارەی دادگاییکردنیان بە وەژێر پێنانی یاسا نێو دەولەتییەکان دادەنێن.

**بیستو دوو تا بیستو سێی تەشرینی دووەم:** خومەینی هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر بێتو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هێرش بێنێتە سەر ئێران ئەوساکە ئەو ناتوانێت ڕێگە لە قوتابییەکان بگرێت بارمتەکان نەکوژن. سەرۆك کارتەر

قسەی دەربارەی ((ئەو ئەنجامە هەرە خراپانە))[10] کرد کە لە ئازاردانی هەرکام لە بارمتەکان دەکەوێتەوە.

**بیستو چواری تەشرینی دووەم:** دەرچوونی چوارەم پرۆتێستی بالۆێزانی وڵاتانی ناو (بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپا) لە تاران.

**بیستو هەشتی تەشرینی دووەم:** (بەنی سەدر) کرایە وەزیری دارایی و سادق قوتبزادەیش کرایە وەزیری هەندەران.

**بیستو نۆی تەشرینی دووەم:** داوای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەربارەی پێشکەش کردنی ئێران بە ((دادگای دادوەریی نێو دەوڵەتی)) (محکمە العدل الدولی) لە لاهای. سەرۆکانی وڵاتانی ناو ((بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپا)) کە لە (دبلن) کۆبوونەتەوە داوای ئازاد کردنی بارمتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکەن.

**یەك تا چواری کانوونی یەکەم:** ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای ئازادکردنی بارمتەکان دەکات بێ هیچ جۆرە دواخستنێك. ئێران داوای دوکتۆر ڤالد هایمی (سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان- ك. م.) بۆ زیارەتی ئێران قەبوڵ ناکات.

**سێی کانوونی یەکەم:** دەرچوونی پێنجەمین پرۆتێستی بالۆێزانی وڵاتانی ناو ((بازاڕی ئەورووپایی)) (دەربارەی بارمتە ئەمەریکاییەکان- ك. م.)

**شەشی کانوونی یەکەم:** چەکدارە ئازەرییەکان دەست بە سەر ئێزگەو تەلەڤزیۆنی تەورێزدا دەگرن.

**حەوتی کانوونی یەکەم:** ئەو دەسەڵاتەی دەستووری نوێ داویيە بە خومەینی و مەلاکان لە ڕێگەی ڕیفیراندۆمەوە پەسەند کرا.

**سیازدەی کانوونی یەکەم:** ئەنجوومەنی ((پەیمانی ناتۆ)) داوای ئازادکردنی بارمتە ئەمەریکاییەکان بێ دواخستن دەکات.

---

(10) لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا ئەو ڕستەیە بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچووکەوە.



جیمی کارتەر



ئەبولحەسەن بەنی سەدر

پـازدەی کـانوونی یەکـەم: شـا لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکاوە چـووە پەنـەما. دەرچـوونی فـەرمانی ((دادگـای دادوەریـی نێـو دەوڵـەتی)) بـۆ ئێـران[11] دەربارەی ئازادکردنی بارمتەکان و دانەوەی باڵوێزخانەکەیش بە کارمەنـدانی وڵاتـە یەکگرتووەکان.

حەڤـدەی کـانوونی یەکـەم: تاتـچەری (سـەرەك وەزیرانـی بـەریتانی- ك. م.) لەکاتی سەردانیدا لە واشنتۆن کارتەری دڵنیا کرد کـە حوکمـەتی بـەریتانی پـشتی بریـاری نەتـەوە یـەکگرتووەکان دەگرێـت دەربـارەی سـزادانی ئـابووریی ئێـران. ((ئەنجوومەنی شۆڕش)) ڕۆژی بیـستو پێنجـی کـانوونی دووەمـی بـۆ هەڵبـژاردنی سـەرەك کۆمـارو ڕۆژی پـازدەی شوباتیـشی بـۆ هەڵبـژاردنی ئەنـدامانی پەرلـەمان دەستنیشان کرد.

هەژدەی کانوونی یەکەم: وەزیرانی هەندەرانی وڵاتانی ناو ((بـازاڕی هاوبەشـیی ئـەورووپا)) پـشتگیریی خۆیانیـان بـۆ سیاسـەتی فـشاریی دیپلۆماسـیی ئەمـەریکا لەپێناو ئازادکردنی بارمتەکاندا ڕاگەیاند.

---

(11) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت فەرمانی داوەتە ئێران:

((Interim decision of ICJ ordered Iran to release hostages and return Embassy to US jurdiction)) (N.A., F.O., 973/93, Chronology..., P.5).

نۆزده تا بیستو دووی کانوونی یەکەم: لە زاهیدان شەڕ لەنێوان حەرەسی خومەینی و هۆزە بلوجییەکاندا هەڵگیرسا.

**بیستو پێنجی کانوونی یەکەم:** لە کریسمس ((جێژنی سەری ساڵ))دا پیاوانی کڵێسە (لە تاران– ك. م.) سەریان لە بارمتەکان دا.

**بیستو هەشتی کانوونی یەکەم:** ئێران هێرشی یەکیەتی سۆڤیەتی بۆ سەر ئەفغانستان تاوانبار کردو ئەو کارەی وەك هێرش بردنە سەر گشت وڵاتە موسڵمانەکان لە قەڵەم دا.

**١٩٨٠**

**یەك تا چواری کانوونی دووەم:** دوکتۆر کۆرت ڤاڵد هایم زیارەتی تاران دەکات و دەگەڕێتەوە بێ ئەوەی خومەینی ببینێت.

**چوارو پێنجی کانوونی دووەم:** لە قوم و تەورێز لایەنگرانی خومەینی و شەریعەتمەداری، کە پیاوێکی میانڕەوە، پێکدا دەدەن.

**شەشی کانوونی دووەم:** سوونە و شیعە موسڵمانەکانی (بەندەر لەنگە) شەڕیان دەبێت. عیراق هێرش دەکاتە سەر سەربازگە سنوورییەکانی ئێران.

**حەوتو هەشتی کانوونی دووەم:** لایەنگرانی شەریعەتمەداریی بنکەی حەرەسی خومەینی لە تەورێز گوللەباران دەکەن.

**سیازدەی کانوونی دووەم:** یەکیەتی سۆڤیەتو ئەڵەمانیای ڕۆژهەڵات دەنگ بۆ بڕیاری ((ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان)) دەربارەی سزادانی ئابووریی ئێران دەدەن.

**حەڤدەی کانوونی دووەم:** ((دادگای دادوەریی نێو دەوڵەتی)) داوای لە ئێران کرد بەرگریی لە خۆی پێشکەش بکات (ئێران وەڵامی نەبوو)[12]. قوتبزادە گوتی ئێران حەز دەکات وتووێژ لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، دەربارەی تەسلیم کردنەوەی شاو گێڕانەوەی پارەکانی ئێران، بەرانبەر ئازاد کردنی بارمتەکان بکات.

---

(12) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:
((ICJ invited Iran to present her defence (not taken up)) (Ibid, P.5).

**هەژدەی کانوونی دووەم:** پێکدادانی گشتیی لە کوردستان لەنێوان ڕێکخراوی جاش و پێشمەرگەی کورددا[13].

**بیستی کانوونی دووەم:** دادگاکانی شۆڕش لەسەر دەرکردنی بڕیاری لەسێدارەدان بەردەوامن.

**بیست‌و سێی کانوونی دووەم:** لە تاران خومەینی برایە نەخۆشخانە.

**بیست‌و شەشی کانوونی دووەم:** دادگایی کردنەکانی بنکەی ئاسمانیی تەورێز تەواو بوون، چوار ئەفسەر لەسێدارە دران.

**بیست‌و نۆی کانوونی دووەم:** ئاشکرا بوو ئەو شەش کارمەندەی باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە لە چواری تەشرینی دووەمی (ساڵی ١٩٧٩وە– ک. م.) خۆیان لە بارەگای باڵوێزخانەی کەنەدا لە تاران شاردبۆوە (باڵوێزخانەی ناوبراو ڕۆژی بیست‌و هەشتی کانوونی دووەم داخرا) توانیویانە هەڵبێن.

**سیی کانوونی دووەم:** دووبەرەکیی لە کامیاران و کوردستان و خۆنیشاندانەکانی دژ بە حوکمەت لە ئەسفەهان بەردەوامن. شەڕو پێکدادان لەنێوان گروپە جیاوازەکانی زانکۆی تاران قەوما.

**سیی‌و یەکی کانوونی دووەم:** داواکاری گشتی فەرمانی گرتنی شای ئیمزا کرد.

**یەکی شوبات:** نرخی بەرمیلێك نەوتی خاوی ئێرانی لە دوو پاوەن و نیوەوە گەیشتە سی‌و یەك پاوەن.

**دووی شوبات:** دادگای شۆڕش پێشنیاری نەتەوە یەکگرتووەکانی دەربارەی ڕۆڵی شا پەسەند کرد.

**سێی شوبات:** بەپێی ڕاپۆرتەکان لە شەڕی نێوان کوردو سوپادا هەشتا کوژراو کەوتەوە.

**چواری شوبات:** بەنی سەدر ، وەك یەکەم سەرەك کۆماری ئێران، سوێندی خوارد. خومەینی، کە هێشتا هەر لە نەخۆشخانەیە، هێرشی یەکیەتی سۆڤیەتی بۆ سەر ئەفغانستان تۆمەتبار کرد.

---

(13) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە، دوور نییە هەڵەیەکی تێکەوتبێت:
((Intercommunal clashes in Kurdistan between Jash,ha (Labour) organisation and Kurdish Peshmerga)) (Ibid, P.5).

**پێنجی شوبات:** سەرەك كۆمار بەنی سەدر، وەك سەرۆكی دادگای شۆڕش، هەڵبژێردرا (تا كاتی هەڵبژاردنی مەجلیس).

**هەشت تا دوازدەی شوبات:** شەڕو پێكدادانی سەخت لە گۆن ئابادو توركمان.

**یازدەی شوبات:** ئەو قوتابییانەی بارمتە ئەمەریكاییەكانیان گرتووە دەڵێن ئەو بارمتانە تەنها بە فەرمانی خومەینی بەردەدرێن. سەرەك كۆمار بەنی سەدر گوتی بارمتەكان لە ماوەی ((دە ڕۆژدا)) ئازاد دەكرێن ئەگەر بێتو لیژنەیەكی نێودەوڵەتی تۆماری كردارەكانی شا هەڵبسەنگێنێت و وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكایش دان بە بەرپرسیی خۆی لە ((تاوانەكانیدا))[14] لە ئێران بنێت.

**دوازدەی شوبات:** بەپێی ڕاگەیاندنی وەزیری بەرگری ئێران نرخی كەلوپەلی پێویست (بۆ سوپای ئێران– ك. م.) دەگاتە سی (٣٠) بلیۆن پاوەنی ئیستەرلینی چونكە ئەو كەلوپەلانەی هەن بەهۆی نەبوونی سپێرەوە لەكار كەوتوون.

**سیازدەی شوبات:** سەرەك كۆمار بەنی سەدر ڕایگەیاند: نەخشەی ئازادكردنی بارمتەكانی مۆر كردووە. دوویەرەكیی نێوان سەرەك كۆمارو ئەو قوتابییانەی بارمتەكانیان دەستگیر كردووە پەرە دەسەنێت.

**چواردەی شوبات:** ئێران، دوای لافاوەكانی خۆزستان، داوای كۆمەكی فریاگوزاریی دەكات. (دواترحوكمەتی بەریتانی، ماوەیەك لە ڕێگەی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە، دە ملیۆن پاوەنی بەخشی بە ئێران).

**نۆزدەی شوبات:** خومەینی وازی لە پۆستی سەركردەی باڵای هێزە چەكدارەكان هێنا بۆ سەرەك كۆمار.

**بیستی شوبات:** (لیژنەی دەرخستنی ڕاستییەكان) (لجنة تقصي الحقائق)ی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان[15] كە لە نوێنەرانی ڤەنزوێلا و جەزائیرو سووریا و سەریلانكا و فەرەنسا پێكهاتووە بۆ هەڵسەنگاندنی سكاڵاكانی ئێران دامەزرێنرا.

---

(14) لە دەقی بەڵگەنامەكەدا بەو جۆرە وشەی تاوانەكان "crimes" خراوەتە نێوان دوو جووت كەوانی پچووكەوە. Ibid, P.6.

(15) لە دەقی بەڵگەنامەكەدا وا هاتووە:
((UN Commission Enquiry (comprising Venezuela, Algeria, Syria, Sir Lanka and France) set up to investigate Iranian grievances)) Ibid, P.6.

**بیستو یەکی شوبات:** دەستە جیاوازە موسڵمانەکان لە گەلێك شاری سەرەکیی ئێراندا بەربوونەتە گیانی یەکدی.

**بیستو سێی شوبات:** ((لیژنەی دەرخستنی ڕاستییەکان)) گەیشتە تاران. خومەینی ڕایگەیاند پەرلەمان، دوای هەڵبژاردنی، چارەنووسی بارمتەکان دەستنیشان دەکات. ئایەتوڵلا بەهەشتی کرایە سەرۆکی دادگای باڵا.

**بیستو نۆی شوبات:** ئێزگەی ڕادیۆی عیراقیی لەسەر سنوور (لەلایەن ئێرانەوە– ك. م.) کاول کرا.

**یەکی مارت:** ((حیزبی دیمۆکراتی کوردستان)) پێشنیاری نوێ، دەربارەی خودموختاریی کورد، پێشکەش بە سەرەك کۆمار بەنی سەدر دەکات.

**دووی مارت:** خومەینی لە نەخۆشخانە دەرچوو.

**پێنجی مارت:** ئەو بۆڕییە نەوتانەی غاز دەگەیێننە ناو خاکی سۆڤیەتەوە لە ساوەی نزیك تارانەوە تەقێنرانەوە.

**شەشی مارت:** بەرهەمی ڕۆژانەی نەوتی ئێران لە ڕۆژگاری شادا پێنج ملیۆن بەرمیل بوو، ئێستا دوو ملیۆن بەرمیلە.

**حەوتی مارت:** ڕاگەیێندرا کە لە دواڕۆژدا خومەینی حوکم تەنها دەربارەی بابەتە ئاینییەکان دەدات. قوتبزادەی وەزیری هەندەران هێرشی بردە سەر بارمتەکان و باڵوێزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان.

**هەشتی مارت:** قوتابییەکان بەرگریی لە قوتبزادە دەکەن و دەڵێن دەست هەڵناگرین.

**یازدەی مارت:** ((لیژنەی دەرخستنی ڕاستتیەکان))ی نەتەوە یەکگرتووەکان، دوای ئەوەی زانیاریی پێویستی کۆکردەوە، نەیتوانی بارمتەکان ببینێت و ئێرانی جێهێشت. ڕاگەیاندنە جیاوازەکانی خومەینی و قوتابیە دەستگیرکەرەکانی بارمتەکان و دادگای شۆڕش و قوتبزادە پاشاگەردانییەکی ئەوتۆیان دروست کردووە کەس نەزانێت چارەنووسی بارمتەکان لەدەست کێدایە.

**چواردەی مارت:** لە قۆناغی یەکەمی هەڵبژاردنەکانی پەرلەماندا ((پارتی کۆماری ئیسلامی)) زۆرینەی دەنگی وەرگرت. ئەو سکاڵایانەی دەربارەی ناخاوێنی

هەڵبژاردنەکە پێشکەش کران گشتیان لە لایەن خومەینییەوە ڕەت کرانەوە. ڕۆژی چواری نیسان بۆ قۆناغی دووەمی هەڵبژاردن دەستنیشان کرا.

چوار تا شازدەی مارت: خۆنیشاندانی چوار هەزار بێ کارەی خوزستان گەلێك کوژراوی لێ کەوتەوە.

هەژدەی مارت: وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا داوای لە ((دادگای دادوەریی نێو دەوڵەتی)) کرد ئێران تۆمەتبار بکات چونکە نەیتوانیوە فەرمانی دادگا بۆ ئازاد کردنی بارمتەکان دەربکات. دوا بەدوای سەرنەکەوتنی وتووێژی دوو لایەنە دەربارەی نرخی غازی ئێران یەکسەر هەناردنی غازی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت وەستاند.

بیستی مارت: ڕاگەیاندنی لێخۆشبوون لەو کارمەندانەی ڕژێمی شا کە تاوانەکانیان گەورە نین. قوتابییە دەستگیرکەرەکانی بارمتەکان ڕایانگەیاند: تاوەکو ئەو ڕۆژەی شۆڕشی ئێران بە تەواوی ئامانجەکانی دەگات[16] ئەو بارمتانە ئازاد ناکرێن.

بیستو سێی مارت: شا بۆ عیلاج لە پەناماوە چووە میسر.

بیستو پێنجی مارت: داوای ئێران بۆ تەسلیم کردنەوەی شا ئیمڕۆکە درایە حوکمەتی پەناما. سەرەك کۆمار بەنی سەدر ڕایگەیاند ئێران هەرگیز دەست لە دورگەی هرمز هەڵناگرێت ((دورگەی ناوبراو لە ساڵی ١٩٧١وە لە لایەن ئێرانەوە زەوت کراوە)).

بیستو پێنجی مارت: سەرەك کۆمار کارتەر داوای لە تاتچەر کرد حوکمەتە ئەوروپییەکان هان بدات بۆ کارێکی هاوبەش (دژی ئێران– ك. م.) لەسەر بارمتەکان.

---

(16) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت:

((Student captore now said that hostages would not be released until completion of the Iranian Revolution)).

واتا: ((قوتابییە دەستگیرکەرەکان ئێستا دەڵێن بارمتەکان ئازاد ناکرێن تا ئەو کاتەی شۆڕشی ئێران تەواو دەبێت))

(Ibid, P.7).

سی‌و یەکی مارت: دەڵێن هێزەکانی عیراق هێرشیان هێناوەتە سەر سەربازگەی خوسرەویی (ئێرانی– ک. م.) کە کەوتۆتە سەر سنوور.

یەکی نیسان: سەرەک کۆمار بەنی سەدر دژی ئەگەری گواستنەوەی بارمتەکانە بۆ بەندیخانەکانی حوکمەتی ئێران. سەرەک کۆمار کارتەر بڕیاری سزادانی ئێرانی دواخست.

شەشی نیسان: ڕوودانی کاولکاریی دیکە لە دەزگا نەوتییەکانی عەبادانـدا. ئیمڕۆ بیست کەس لە پیاوانی کڵێسە (کە یەکێکیان کاپوسیی Capussi ڕەهبەری ئەرتەدۆکسە یۆنانییەکان بوو) زیارەتی بارمتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانیان کرد.

حەوتی نیسان: خومەینی ڕایگەیاند: هیچ جۆرە ئاڵوگۆڕێک لە وەزعی بارمتەکاندا ناکرێت و هەر لە دەست قوتابییە دەستگیرکەرەکانیاندا دەمێننەوە.

ئیمڕۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێوەندیی دیپلۆماسیی لەگەڵ ئێراندا پچڕاندو بڕیاری سزادانی ئێرانی دەرکرد. هەر ئیمڕۆیش ئەندامانی باڵوێزخانەی ئێرانی لە بەغدا داوایان لێ کرا بگەڕێنەوە ئێران. چەند هەزار موسڵمانێکی شیعەی ((ئێرانی))[17] لە عیراق دوور خرانەوە.

هەشتی نیسان: خومەینی لە ڕێگەی ڕادیۆی تارانەوە گەلی عیراقی هان دا بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی صەدام حسەین.

نۆی نیسان: دیپلۆماسییە ئێرانییەکان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایان جێهێشت.

دەی نیسان: وەزیرانی هەندەرانی وڵاتانی ((بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپا)) لە لیشبونەی (پایتەختی پورتوگال– ک. م.) لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە باڵوێزەکانیان (لە تاران– ک. م.) خودی سەرەک کۆمار بەنی سەدر ببینن، بڕیاری سزادانی ئێرانیشیان دواخست.

---

(17) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی ئێرانی (Iranians) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچووکەوە وەک گاڵتە پێ کردن بەوەی کە ئەو دوورخراوانە بە ئێرانی لە قەڵەم دەدەن، چونکە ئەوانە کوردە فەیلییەکان بوون کە لە دێرزەمانەوە لە زێدی باووباپیرانی خۆیاندا دەژیان و لەبەر ئەوە دوور نەخرانەوە چونکە شیعەن، بەڵکو لەبەر ئەوە دوور خرانەوە چونکە کورد بوون.

**یازدەی نیسان:** قوتبزادە بە باڵوێزانی وڵاتانی ((بازاڕی هاوبەشیی ئەوروپا))ی ڕاگەیاند: سزاکانی ئەمەریکاییەکان دژی وڵاتەکەی دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئازادکردنی بارمتەکاندا.

**دوازدەی نیسان:** باڵوێزانی وڵاتانی ((بازاڕی هاوبەشیی ئەوروپا)) لەگەڵ یاباندا پێنجەم داوا دەربارەی ئازادکردنی پەلەی بارمتەکان دەدەنە سەرەك کۆمار بەنی سەدر.

**چواردەی نیسان:** تاتچەر بایەخی پشتگیریی کردنی نێودەوڵەتیی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دووپات کردەوەو پەیمانیشی دا کە حوکمەتی بەریتانی بە گەرمی پشتی ئەمەریکا بگرێت.

**پازدە تا بیستو دووی نیسان:** تەشەنە سەندنی هێرشێکی بەرفراوان بۆ سەر زانکۆکانی ئێران، چەند کەسێك کوژران و هەزار کەسێکیش بریندار بوون، ئۆباڵی ئەو هەراوبگرە دەکەوێتە ئەستۆی بەرەی ئیسلامی. سەرەك کۆمار بەنی سەدر ڕایگەیاند تەحەدا کردنی دەسەڵاتی شەرعی وڵات بەرەو ((کەشو هەوای کۆدێتا دەبات)).

**حەڤدەی نیسان:** سەرەك کارتەر بڕیاری دا سزا ئابوورییەکانی سەر ئێران زۆرتر بکاتو هەڕەشەشی کرد کە دوور نییە هەنگاوی داهاتووی وڵاتەکەی ئابلۆقەدان، یا هەر کارێکی سەربازیی دیکە دژی ئێران بێت. هێرشە ئاسمانییەکانی ئێران بۆسەر گوندە کوردییەکان بوونە هۆی ئەوەی تۆپی ئینزارەکانی تورکیا بکەونە کار[18].

**حەڤدە تا بیستو سێی نیسان:** گەرم بوونی شەڕ لە بەرەی کوردستاندا[19].

**بیستی نیسان:** دوا بەدوای کۆمپانیای نەوتی بەریتانی کۆمپانیای شێلی یابانیش بڕیار دەدات ئیتر نەوتی خاو لە ئێران نەکڕێت دوای بەرزکردنەوەی نرخی هەر بەرمیلێك نەوتی ئێرانی بۆ سیو پێنج پاوەنی ئیستەرلینی.

---

(18) دیارە مەبەستییە بڵێت هێرشی فڕۆکەکانی ئێرانی بۆ سەر گوندە کوردییەکان هێند بەرفراوان و توندو تیژ بوون کە تەنانەت تۆپی ئینزارەکانی ناو سنووری تورکیاش کەوتوونەتە ئیش.

(19) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت (لە بەرەی کوردیدا) on Kurdish front کە دیارە مەبەستی بەرەی شەڕە لە کوردستان.

بیستو دووی نیسان: حوکمەتانی ((بازاڕی هاوبەشیی ئەورووپی)) بڕیار دەدەن لە ڕۆژی حەڤدەی مایسەوە سزا ئابوورییەکانی سەر ئێران پەسەند بکەن ئەگەر هاتوو هیچ جۆرە بەرەوپێش چوونێك لە بوواری ئازاد کردنی بارمتەکاندا ڕوو نەدات.

بیستو چواری نیسان: یەکیەتی سۆڤیەت و ئێران ڕێککەوتننامەیەکی بازرگانییان مۆر کرد بەرانبەر سزا ڕۆژئاواییەکان. ڕاگەیاندنی بەرفراوان کردنی هاریکاریی لە بوواری وزەدا لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا، هەروەها لە بوواری بازرگانیی نەوتیشدا لەگەڵ ڕۆمانیادا. هەمان ڕۆژ هێزی ئاسمانیی ئێران هێرشی کردە سەر پێشمەرگەکانی کورد[20] لە ناوچەی سنە.

بیستو پێنجی نیسان: سەرنەگرتنی هەوڵی سەربازیی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ئازاد کردنی بارمتەکان بەهۆی هۆکاری تەکنیکییەوە لە بیابانەکانی تەبەسی[21] ئێرانیدا. دوای ماوەیەك لە تاران لاشەی هەشت کوژراوی ئەمەریکایی عەرز کران کە لە ئەنجامی پێکدادانی دوو فڕۆکە، لە فڕۆکە بەشدارەکانی ئەو کارەدا، گیانیان لەدەست دابوو. ڕاگەیاندنی دەست لەکار کێشانەوەی سایرۆز ڤانسی وەزیری دەوڵەتی ولاتە یەکگرتووەکان کە بەو موجازەفەیە قایل نەبوو.

بیستو شەشی نیسان تا سێی مایس: لەو ماوەیەدا قوتبزادە زیارەتی هەر یەك لە سووریاو لوبنان و کوێت و ئیماراتی عەرەبیی یەکگرتووی کرد بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی شۆڕشی ئێرانیی ئیسلامی و داواکردنی پشتگیریی عەرەب.

بیستو حەوتی نیسان: لەگەڵ ئەوەیشدا کە سەرەك کۆمار بەنی سەدر بڕیاری ئاگربەسی ڕاگەیاند، شەڕو پێکدادان لە کوردستان نەوەستا (لە پێکدادانی ئەم دواییانەدا سێ سەدو حەفتاو پێنج سەربازو پێنج سەد کورد کوژران).

---

(20) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت:

((Kurdish guerrillas in Sanandaj attacked by Iranian Air Force))

کە دیارە مەبەستی پێشمەرگەیە. بڕوانە: N.A., F.O., 973|93, Chronology..., P.9.

(21) بیابانی تەبەس کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە، لەنێوان خۆراسان و کرمان و سیستان و بلوجستاندا، یەکێك لە شارە کەمەکانی ئەو بیابانە ناوی تەبەسە، فڕۆکە زۆر بە ئاسانی دەتوانێت لەو بیابانەدا بنیشێتەوە.

بیست و نۆی نیسان: هەوڵی کوشتنی قوتبزادە لە کوێت. بەحرەین باڵوێزی خۆی لە تاران دەکێشێتەوە دوای ئەوەی ئێران بەحرەینی بەوە تۆمەتبار کرد کە لە موغامەرە سەرنەکەوتووەکەی وڵاتە یەکگرتووەکاندا دەستی هەبووە.

سێی نیسان تا پێنجی مایس: دەستەیەك چەكدار، کە دەڵێن عەرەبی خۆزستانن، باڵوێزخانەی ئێرانیان لە لەندەن داگیر کردو داوای ئازاد کردنی نەوەتو یەك بەند کراو لە عەبادانو داننانی حوکمەتی ئێران بە مافە نەتەوەییەکانی کەمینەکانی ئێران دەکەن بەرانبەر ئازادکردنی دەوروبەری بیست کارمەند و میوانی باڵوێزخانەی ئێران لە لەندەن. دوای ئەوەی چەکدارەکان دوان لە بارمتەکانیان کوشت هێزە تایبەتییەکان[22] هێرشیان کردە سەر باڵوێزخانەکە و ئەو نۆزدە کەسەیان ئازاد کرد کە مابوون (یەکێکیان پۆلیسێکی بەریتانی بوو)، زۆربەی چەکدارەکانیش کوژران[23].

دووەم- راپۆرتێکی سەربەخۆ دەربارەی کێشەی کورد- مارتی ساڵی ١٩٧٩

دوای ئەو پانۆراما قەشەنگە بەرفراوانەی کە وێنەی یەك لەدوای یەکی رووداو و بەسەرهاتەکانی دوا ڕۆژانی ژیانی سیاسیی و دەربەدەریی محەمەد ڕەزاشاو گەڕانەوەی ئیمام خومەینی لە پاریسەوە بۆ تاران و کێشە نوێکانی ئێرانی، بە کێشەی کوردیشەوە، بە وردی بۆ کێشابووین، دێینە سەر ناوەڕۆکی فایلێکی دیکەی وەزارەتی هەندەرانی حوکمەتی بەریتانی کە بۆ هەمان قۆناغ تەرخان کراوە، بەڵام ئەمیان بریتییە لە ڕاپۆرتێکی چوار لاپەڕەیی و خشتەیەکی سەربەخۆ

---

(22) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت: ((SAS stormed the Embassy)) واتا هێزە تایبەتەکان (قوات خاصة)، ئەوانەی هێرشیان کردە سەر باڵوێزخانەکە (ل٩).

(23)N.A., F.O., 973|93, Chronology of the principal events in Iran following Shah (Muhammad) Reza Pahlavi,s departure on 16 January 1979 and Ayatollah Khomeni,s subsequent return from exile (1 February 1970- 5 May 1980), P.9.

که سەرجەمیان تەنها بۆ بابەتی ((کێشەی کورد)) تەرخان کراون کە لە مارتی ساڵی ١٩٧٩دا ئامادە کراوە[24].

وا دیارە ئەو جۆرە راپۆرتانە بەشێکن لەو فایلانەی لە ساڵی ٢٠١٤وە دەخرێنە بەر دەست خوێنەران، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ شتێکیان تێدا نییە پێوەندیی بە سیاسەتی حوکمەتی بەریتانییەوە هەبێت، یا لەوانە بێت زیان بە بەرژەوەندییەکانی ئەو حوکمەتە بگەیێنێت بۆیەکا لەو فایلە دەری دەهێنن و دەیخەنە ناو فایلێکی نوێوەو ژمارەیەکی نوێشی دەدەنێ، بەڵام لە ژێدەری لاپەڕەی یەکەمی ئەو جۆرە راپۆرتانەدا ئەم ڕستەیەی لای خوارەوە دەنووسن:

((ئەم بەڵگەنامەیە بۆ کاری پەلەی گشتیی ئامادە کراوە. بەهیچ جۆر نابێت وەها لێکبدرێتەوە، یان بەجۆرێك ئاماژەی بۆ بکرێت کە بیروبۆچوونی حوکمەتی (بەریتانی– ك. م.) دەردەبڕێت))[25]. ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕاوی ئەو راپۆرتەیە:

((ژمارەی گەلی کورد ڕەنگبێت ئێستا دەورووبەری دە ملیۆن کەس بێتو ڕێژەیەکی وەبەرچاو لە هەر یەك لە تورکیاو ئێران و عیراق پێکدەهێنن، ڕێژەیەکی لەوە کەمتریش لە هەریەك لە سووریا و یەکیەتی سۆڤیەت و لوبنان هەن. کورد زۆربەیان لە ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژهەڵاتی تورکیا و دەوڵەتە دراوسێکانیدا دەژین، لەوانەیش ئەرمەنستان و جۆرجیا و ئازەربایجانی سۆڤیەت (بڕوانە خشتەکەی لاپەڕە چوار – واتە لاپەڕە (٥٩٧)ی ئەم کتێبە– ع.زەنگەنە). زۆربەی هەرە زۆریان موسڵمان و سوننی مەزهەبن.

کورد وەك گەلێکی لە هۆز پێکهاتووی خاوەن نەریت و زوبانی خۆی بەلایەنی کەمەوە سێ هەزار ساڵ دەبێت لەم ناوچەیەدا دەژین، لەگەڵ ئەوەیشدا تاوەکو

---

(24)N.A., F.O., 973|32, Background Brief, Foreign and Commonwealth Office, London, March 1979, The Kurdish Problem, 4+1 PP.

لەدەقی بەڵگەنامەکەدا راماتووە: (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە ٢٠)

(25) This paper has been prepared for general briefing parposes. It is not and should not construed or quoted as an expression of Government pdicy (Ibid, P.1).

دوادواکانی سەدەی نۆزدە لای ڕەهبەرانی کورد بیرۆکەی یەکیەتیی کورد لە چوارچێوەی یەك دەوڵەتدا دروست نەبوو بوو، بەڵام لەوساوە هەوڵی هەمەجۆر بۆ گەیشتن بەو ئاواتە دراوە. یەکێك لە کۆسپە هەرە سەرەکییەکانی پێکەوەنانی یەکیەتی نەتەوەیی لەو بابەتە بریتییە لەوەی زوبانەکەیان لە دوو زاراوی سەرەکیی پێکهاتووە، دووەم کۆسپیش لە هەمان بوواردا بریتییە لەوەی لە سەدا هەشتاو پێنجی (٨٥٪) کورد نەخوێندەوارن، جیاوازیی هۆزایەتیش کۆسپێکی دیکەی یەکگرتن بوو.

لە سەدەی حەڤدەوە تاوەکو سەدەی بیست سێ لەچواری کورد کەوتبوونە ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانییەوە، ئەوانی دیکەشیان کەوتبوونە ژێردەستی ئێرانی سەفەوییەوە. لەو ماوەیەدا یەك لەدوای یەك کورد ڕاپەڕینی هەڵگیرسان، تایبەت دژی تورکیا لە سالانی ١٨٢٦ و ١٨٣٦ و ڕۆژانی جەنگی رووسیی- تورکیی لە سالانی ١٨٥٣- ١٨٥٦دا.

لەگەڵ بەزینی تورکیادا لە سالانی جەنگی یەکەمدا گشت نەتەوە ژێردەستەکانی (ناو دەوڵەتی عوسمانی- ك. م.) چاوەڕوانی ئەوەبوون بە سەربەخۆیی بگەن: ((پرۆگرامی ویدرۆ ویلسنی سەرەك (کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا- ك. م.) دەربارەی ئاشتیی جیهان)) کە سالی ١٩١٨ ڕایگەیاند دەڵێت گشت کەمینە ناتورکەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانی پێویستە (دەرفەتی تەواوی بەرەوپێشچوونی ئۆتۆنۆمییان بۆ برەخسێنرێت)[26]. بەپێی

---

(26) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((President Woodrow Wilson's "Programmed of the World's Peace" of 1918 said that the non- Turkish minorities of the Ottoman Empire should be assured of an "unmolested opportunity of autonomous development)) (Ibid, P.1).

مەبەستی ڕاپۆرتەکە چواردە بەندە بەناوبانگەکەی ویدرۆ ویلسنە کە یەکێك بوو لەو هۆیانەی پاڵیان بە کوردیشەوە نا بۆ وەدی هێنانی ئاواتی سەربەخۆیی، تەنانەت شێخ مەحموود لە کاتی دادگایی کردنەکەیدا لە بەغدا لە لایەن بەریتانییەکانەوە، دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی سالی ١٩١٩ی و بەخسیر کردنی، هەر چواردە بەندەکەی سەرەك ویدرۆ ویلسنی لەسەر لاپەڕەیەکی قورئان نوسیبووەو وەك گولەبەند لەسەر قۆلی گرێی دابوو، لەو کاتەدا زۆر تورە دەبێتو نەقیانەکەی هەڵدەکات و

(پەیمانی سیڤەر) کە ئابی ساڵی ١٩٢٠ لەنێوان دەوڵەتە هاوپەیمانەکان و سوڵتاندا مۆر کرا دان بە دامەزراندنی دەوڵەتێك لە کوردستان[27] و دەوڵەتێکیش لە ئەرمەنستان نراوە، وێڕای دامەزراندنی سێ دەوڵەتی عەرەبیی لە هەر یەك لە حیجاز (کە دوایی بووە عەرەبیی سعودی) و سوریا و عێراق. سێڤەر چەند مەرجێکی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دانابوو، هی وەك ئارەزووی زۆرینەی کورد دەربارەی ئەوەی لە ناوچەیەکی جودا (سەربەخۆ)دا بژین و (ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان)یش دان بەوەدا بنێت کە کورد شایانی ئەوەن سەربەخۆ بژین[28].

پەیمانی سێڤەر هەرگیز لەلایەن (ئەنجوومەنی نیشتمانی تورکی)یەوە دانی پێدا نەنراو ساڵی ١٩٢٢یش سوڵتانی عوسمانی لەسەر تەخت لابراو دوا بەدوای ئەوە

---

لاپەڕەکە دەردەهێنێت و دەیدات بە رووی دادوەرە بەریتانییەکەدا و بە فارسی پێی دەڵێت: ((پەدەر سوخت (ناجسن) من بە پشتی ئەم قسانە بانگی سەربەخۆییم دا))(*). بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە ئەو بابەتەی دەربارەی بەندەکانی ویدرۆ ویلسن لەو کتێبەم دایە کە ساڵی ١٩٧٨ بە ناونیشانی ((أضواء علی قضایا دولیة))ەوە بڵاوم کردۆتەوە.

(*) (ئازاد عەبدولواحید)ی هاوکاریشمان لەبارەی ئەو ڕووداوانەی ناو هۆڵی ئەو دادگایەی شێخ مەحموودی تێدا موحاکەمە کراوە، بۆی گێڕاوینەتەوە کاتی خۆی لەگفتوگۆیەکدا لەگەڵ خوالێخۆشبوو (مەحموود شەوقی) کە شەش ساڵ لەبزووتنەوە سیاسی و چەکدارییەکەی شێخ مەحموودی حەفیدا بووە وتوویە: لەپاش بەدیل گرتنی شێخی حفید لەشەڕی دەربەندی بازیاندا ڕەوانەی شاری بەغدای دەکەن تا بدرێتە دادگا. لەبەغدا گرینهاوس لەدادگاییکردنێکی ڕووکەشانەدا لەبەردەمی دادگا ئامادەی دەکەن، کاتێ دەیبەنە ناو هۆڵی دادگاوە تەماشا دەکات ئەو کەسانەی کە لەناو هۆڵەکەدا ئامادە کرابوون بۆ ئەوەی لەدژی ئەو شایەدی بدەن، زۆربەیان کەسانی نزیکی خۆی و خەڵکی شارەکەی بوون، بۆیە کاتێ لێیان ورد دەبێتەوەو دەیانناسێتەوە پێیان دەڵێ: (دینی نوێتان پیرۆزبێت...!)-ع.زەنگەنە)).

(27) هەرسێك بەندی ٦٢ و ٦٣ و ٦٤ی (پەیمانی سێڤەر) بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ تەرخان کراون.

(28) بۆ درێژەی ئەو باسە بڕوانە: کمال مظهر، نظرة جدیدة إزاء معاهدة سیفر والمسألة الکردیة، ترجمة: محمد الملا عبدالکریم، ((الثقافة الجدیدة)) (مجلة)، بغداد، العدد ٥٢، ١٩٧٣.

شایانی باسە سێڤەر هێند لای کورد خۆشەویستە کە دایك و باوکانی کورد کردوویانەتە ناوی کوڕ و کچەکانیان، یەکێك لەوانە سێڤەری مەحموود زامدارە.

مستەفا کەمال ئەتاتورك کۆماری ئەرمینیا کە (بەپێی پەیمانی سیڤەر– ك. م.)(*) دامەزرێنرا بوو لەناوی بردو ئاواتی سەربەخۆیی کوردیشی وەچاڵ نا[29]. جارێکی دیکە هەرگیز ئەو پرسە (مەسەلەیە) بەشێوازێکی جیدی نەهێنرایە پێش.

لەم ساڵانەی دواییدا بزووتنەوە نەتەوەییەکانی کورد، لە هەریەك لە عیراق و ئێران و تورکیا، بە شێوازێکی گەلێك دوور لەیەکتر بەڕێوە دەچوون، هەرچەندە چالاکیی زۆر لە بەزینی سنوور لە ئارادایە و تەنها کوردی عیراقیش هێند توانایان هەبوو ببنە هەڕەشەیەکی گەورە بۆ حوکمەتی ناوەندی. کورد هەمیشە خۆیان لە کاری تیرۆرستی دوورەپەرێز گرتووە، لەو جۆرە کارانەی ژمارەیەك لە ئەندامانی (ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین) (منظمة تحریر فلسطین) ئەنجامی دەدەن.

## تورکیا:

دوای ڕاپەڕینە کوردییەکانی بیست و سییەکانی (سەدەی ڕابردوو– ك. م.) فەرمانڕەوایانی تورك بەتوندی کەوتنە بەرهەڵستیکردنی هەموو جۆرە هەستو پێناسەیەکی جوداخوازیی کورد. ساڵی ١٩٦٧ لە تورکیا بە شێوازێکی نهێنی (پارتی دیموکراتی کوردی)(**) دامەزرێنرا کە بیروبۆچوونی سۆشیالیزمیی بەهێز

---

(*) ((وەکو دەبینین د.کەمال لەزۆر شوێنی ئەم کتێبەدا ناوەکە وەکو (سێڤەر) ئاوەها بە(ێ)ی کراوە گۆ دەکات، هەرچی لای کوردەکانی باکوورە ئەوا بە "سیوەر" گۆی دەکەن، لای خەڵکی ئێمەش (ی)ەکە کراوە نییە، واتە نیشانەی (٧)ی لەسەر دانانرێ، وەکو "سیڤەر"ی مەحموود زامدار.

لێرەدا گرفتێکم لەسەر ئەو پرسە هەبووە، تایپیستەکانمان بەردەوام (٧)ەکەیان لەسەر یای "سێڤەر" دانەدەنا، ئێمەش حەزمان کردووە ناوەکان ، وەکو چۆن د.کەمال گۆی کردوون، ئاوەها وەکو خۆیان بیاننووسینەوە. لەزۆر شوێن و جێگەی دیکەی ئەم کتێبەدا گرفتی ئاوەهامان هەبووە، تەنانەت تایپیستەکان بەردەوام وشەی (عیراق) یان بە (عێراق) دەنووسییەوە، دەیان بەڵکو سەدان جار ( ˇ )ەکەمان لادەبرد کەچی ئەوان دواتر هەر وەکو خۆی دەیاننووسییەوە–ع. زەنگەنە))

(29) یەکێك لە ڕۆژنامە توندڕەوەکانی کەمالییەکان کاتی خۆی وێنەیەکی کاریکاتێریی بڵاو کردبۆوە کە بریتی بوو لە گۆڕێك لەسەر کێلەکەی نووسرابوو ((دەوڵەتی کوردستان)). بڕوانە: الدکتور بلەچ شیرکوە، القضیة الکردیة، القاهرة ١٩٣٠.

(**) ((ناوی دروستی (پارتی دیموکراتی کوردستان لە تورکیا)یە، لە لاپەڕەکانی دواتردا پەراوێزێکی دیکەی بۆ دەنووسین – ع.زەنگەنە)).

بوو وه هاوپه‌یمانی (پارتی کرێکارانی تورك) بوو كه ڕێكخراوێكی نهێنی نییه‌و ئه‌مه‌یش بووه هۆی په‌ره‌سه‌ندنی فشاری سه‌ربازیی بۆ سه‌ر ناوچه كوردییه‌كان. له‌م ساڵانه‌ی دواییدا تا ڕاده‌یه‌ك ئه‌و فشاره سه‌ربازییه كه‌م بۆوه‌و ئه‌وه‌یش بووه هۆی سه‌رهه‌ڵدانی چالاكییه‌كی كه‌می كوردایه‌تی. به‌ڵام كورد هه‌میشه هێزێكی ئاماده‌ی ئاژاوه بوون.

## ئێران:

كوردی ئێران، به پێچه‌وانه‌ی كوردی ئیمپراتۆریی عوسمانییه‌وه، دوای جه‌نگی یه‌كه‌می جیهان به شێوازێكی ڕاسته‌وخۆ نه‌بزوێنران بۆ ئه‌وه‌ی بیر له دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی سه‌ربه‌خۆ بكه‌نه‌وه[30]. هه‌رچۆن بێت نزیكی كوردی ئێران له یه‌كیه‌تی سۆڤیه‌ته‌وه ده‌رفه‌تی ئه‌وه‌ی بۆ ڕه‌خساندن له زوویه‌كه‌وه پێوه‌ندیی به ئایدۆلۆجیای سۆڤیه‌تییه‌وه بكه‌ن و ساڵانی ١٩٠٥ و ١٩١٨یش ئه‌نجوومه‌نی سۆڤیه‌تی كورت ته‌مه‌ن له چه‌ند ناوچه‌یه‌كی كوردنشینی ئێراندا دابمه‌زرێنن[31]. ساڵی ١٩٤١یش، دوای داگیركردنی ئێران له‌لایه‌ن به‌ریتانی و سۆڤیه‌تییه‌كانه‌وه، چ ئه‌و كوردانه‌و چ ئه‌و ئازه‌رییانه‌ی له ناوچه‌ی ژێر ده‌سه‌ڵاتی سۆڤیه‌تدا بوون توانییان چالاكانه فه‌رمانڕه‌وایی خۆیان بكه‌ن، به پێچه‌وانه‌ی ئه‌و ناوچه‌یه‌وه كه

---

(30) مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئێران وه‌ك توركیا به‌شداری جه‌نگی یه‌كه‌می جیهان نه‌بوو بۆیه‌كا شتێكی وه‌ك (په‌یمانی سیڤه‌ر) له ئارادا نه‌بوو بۆ هاندانی كوردی ئێرانیش بۆ ئه‌وه‌ی هه‌وڵی دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تێكی سه‌ربه‌خۆ بده‌ن.

(31) له ده‌قی به‌ڵگه‌نامه‌كه‌دا وا هاتووه:

((Their Proximity to the Soviet Union, however, gave them early contact with Soviet ideology and short- Lived Soviets were set up in parts of Kurdish Iran in 1905 and 1918)) (N.A., F.O., 373/32, Foreign and Commonwealth Office, The Kurdish Problem, March 1979, P.2).

پێموایه مه‌به‌ستی ئه‌نجوومه‌نه‌كانی ڕۆژگاری شۆڕشی ده‌ستووریی ئێران (١٩٠٥–١٩١١) و دوای شۆڕشی ئۆكتۆبه‌ری ساڵی ١٩١٧یه.

لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیدا بوو چونکە هێزە ئێرانییەکان لێرە ئازاد بوون بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان داسەپێننەوە. کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥ دوو کۆمار لە ناوچەی دەسەڵاتی سۆڤیەتیدا دامەزرێنران: کۆماری دیموکراسیی ئازەربایجانی (ئێران)[32] و کۆماری کوردیی مەهاباد[*]. هەرچۆن بێت دوای کشانەوەی

---

(32) لە دەقی بەڵگەنامەکە خۆیدا وشەی ئێران بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە .(ibid, P.2)

[*] ((ئەوی ڕاستی بێت (کۆمار) لە ١٩٤٦/١/٢٢دا دامەزراوە، نەوەك لەساڵی ١٩٤٥، وەکو لەم بەڵگەنامەیەدا هاتووە، لەلایەکی دیکەوە وەکو دەبینن نووسراوە: (کۆماری کوردیی مەهاباد)، (د. کمال)یش لەهەموو نووسینەکانی خۆیدا (کۆماری مەهاباد)ی نووسیوە، تەنانەت لەبەرگی دووەمی ئەو کتێبەیدا کە بەناونیشانی (چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد)ە، کە لەئامادەکردنی من بووە، لە ل(٤٠٠، ٤٣٦، ٤٥٠)دا هەمان دەستەواژەی چەندجار بەکارهێناوە، بیرمە جارێکیان لەکاتی ئامادەکردنی کتێبەکەدا خۆم گەیاندە بەغداو ئەو پرسیارەم لێی کرد، باسی ئەوەشم بۆی کرد کە ناوە دروستەکەی بەزاراوەی ئەمڕۆ دەبێ (کۆماری کوردستان) بێ، لەئەسڵیشدا ئەو ناوە (جەمهوری کوردستان) بووە نەوەك (کۆماری مەهاباد). ئەوسا جەنابی وای وەڵام دامەوە کە دەستەواژەکەی ئەویش ڕاستە، دیارە ئەوسا باسی ئەوەم بۆی کردووە کە ئەو (کۆماری مەهاباد)ە لەگەڵ بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی ولیام ئیگلتن و ئارشی ڕۆزفلت لە شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان کەوتۆتە سەر زاران، ئەگینا ئەوەندەی من ئاگادارم و سەرنجم داوەتێ تا کۆتایی شەستەکان هەر زاراوەی (کۆماری کوردستان) بەکاربراوە، هەموو بەڵگەنامەو گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاوکراوەو بەیاننامەکانی سەردەمی کۆمار، دواتریش هەموو بڵاوکراوەکانی دواتری ئەم دیوو ئەو دیوی سنوور ئەوانەش کە لەشاخ بڵاوکراونەتەوە، هەتا ئەو چاوپێکەوتنانەش کە لەدوای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لەگەڵ مەلا مستەفای بارزان کراوە، هەروەها ئەو چاوپێکەوتنە تایبەتییەش کە لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان کراوەو بەدوو ئەلقە لەڕۆژنامەی (ئازادی)ی ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە، هەر ئاوەها ناویان بردووەو ناوی (کۆماری مەهاباد) لەئارادا نەبووە. بەداخەوە (عەقید بەکر عەبدولکەریم)ی بەشدارێکی کارای کۆمار، کە بیرەوەرییەکانی خۆی لەدووتوێی کتێبێکدا لەهەولێرو سلێمانی چاپ کردووە، ناوی (گەشتێك بەکۆماری مەهاباد)ی لەسەر کتێبەکەی داناوە کە بەم دواییانە چاپی کردووە، با خوێنەر و تۆژەران لەلایان (عەجیب و غەریب) نەبێت ئەگەر بڵێم زۆربەی ئەو بیرەوەرییانە پێشتر لەساڵی ١٩٦٠دا بەپتر لە (٣٠) ئەلقەو بەزنجیرە لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی (دەنگی کورد)ەکەی عومەر جەلال حەوێزی و بەئیمزای (ب. ئەلوەن) بڵاوکراونەتەوەو ئەو

**هێزەکانی سۆڤیەت (لە ئێران– ك. م.) لە مایسی ساڵی ١٩٤٦دا یەکیەتی سۆڤیەت هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ ئەوەی رێگە نەداتە ئێرانییەکان هەردووك کۆماری ئازەربایجان و مەهاباد لە کانوونی یەکەمی ١٩٤٦دا لەناو بەرن و ڕەهبەرەکانیان لەسێدارە بدەن[33]. بەوجۆرە شا بەردەوام بوو لە فشار خستنە سەر نەتەوەپەرستانی کوردو (پارتی دیموکراتی کورد)ی قەدەغە کرد کە داوای خودموختاریی لە چوارچێوەی ئێرانێکی دیموکراسیدا دەکرد بێ توخن کەوتنی**

---

ناونیشانە نامۆیەی لەسەر نەبووە، ئەوەتا خوالێخۆشبوو مەحموودی مەلا عزەتیش، کە شارەزایەکی مێژووی کۆمارە، کاتی خۆی و لەساڵی ١٩٧٠دا، بابەتەکانی خۆی لەبارەی کۆمارەوە لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (ڕزگاری) بڵاودەکردەوە، ناوی (**کۆماری مەهاباد**)ی بۆ دانابوو.

دواتریش هەر ئەم ناوونیشانەی دابووە کتێبێکی خۆی کە بە دوو بەرگ لە شاخ بڵاوکراوەتەوە، ئەوە بوو لە دوای راپەڕین هەستی بەم هەڵەیەی خۆی کردبوو بۆیە لەسەر لاپەڕەکانی یەك لە ژمارەکانی گۆڤاری (**ئاران**)، کە لەدوای ڕاپەڕین لەچەمچەماڵ دەردەچوو، بابەتێکی بڵاوکردبۆوەو رەخنەی لە خۆی گرتبوو، ئەوەبوو دواتر ئەم بابەتە لە ژێر ناوونیشانی: (**ناوی مێژوویی قەوارەکەو ریشەی ناوی قەوارەکە**) بۆتە بەشێکی گرنگی لاپەڕە (١٤٦–١٥٤) ئەو کتێبەی کە بەناوی (**جەمهوریەتی کوردستان**) لە ساڵی ٢٠٠١دا لەلایەن دەزگای سەردەم لە سلێمانی بڵاوکراوەتەوە، بەپشت بەستن بەم بۆچوونانە هەموو (**کۆماری مەهاباد**)ەکانی نێو ئەو کتێبەی بەردەستتانم لەم کتێبەدا کردبووە (**کۆماری کوردستان**)، دواتر بەبیرم هاتەوە کە جارێکیان دکتۆر کەمال خۆی ئامۆژگاری کردبووم کە بۆچوونەکانی خۆم بکەمە پەراوێزێکی ئەم کتێبە، بۆیە لە تەك ناوی (**کوردستان**)ی نێو دوو کەوانە لە هەر شوێنێك کە ناوی (**کۆماری کوردستان**)م دانابوو، دووبارە (**کۆماری مەهاباد**)م دانایەوە، دیارە مامۆستای خۆشەویستیشم لەو هەڵەبژێرییەی کە خۆی کردبووی هیچ لارییەکی لەم کارەم نەبووە، تەنیا لەیەك شوێندا ڕاپسپاردبوو کە بکرێتەوە (**کۆماری مەهاباد**) ئەویش لە دووتوێی بەڵگەنامەیەکدا بووە، دیارە بەڵگەنامەش، وەکو مامۆستا بۆی نووسیوم، بەهیچ شێوەیەك نابێ دەستکاری بکرێ، تەنانەت وابزانم ئەمڕۆکە هیچ ئاستەنگێکی سیاسیش لەپێش بەکارهێنانی ئەم ناوە مێژووییە نییە، بەڵگەشمان بۆ ئەو بیروبۆچوونە ئەوەیە کە لەکۆماری ئێرانی ئیسلامیدا رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان زۆر ئاسایی ئەم ناوە لەسەر لاپەڕەکانیان بەکاردەبەن – ع. زەنگەنە)).

(33) ئەوی ڕاستی بێت ڕەهبەرانی کۆماری مەهاباد (کوردستان) لەسێدارە دران، هەرچی ڕەهبەرانی کۆماری ئازەربایجان بوون هەڵهاتنە ناو خاکی یەکیەتی سۆڤیەت.

دەسەڵاتی حوکمەتی ناوەندی چ لە بوواری سیاسەتی دەرەوەداو چ لە بوواری دانانی پلانی درێژخایەنی ئابووریداو چ لە بوواری بەرگری (سوپا)دا.

دوای کەوتنی ڕژێمی شا پرسی پێوەندیی دواڕۆژی کوردی ئێران بە حوکمەتی ئیسلامیی نوێوە هاتە گۆڕێ. لە دەستووری نوێی ئێراندا پێویستە حوکمەت بە وردی ئاگای لەوە بێت کە نموونەیەکی نوێ (سابیقەیەك) نەیەتەوە کایەوە لە ڕێگەی دانی ئیمتیازەوە بە کورد وەك تاکە کەمینەیەك لەناو هەمواندا بە تورکمان و ئەفغان و بلوچ و ئازەری و عەرەبی ئێرانەوە. زۆری نەبرد دوای وەرگرتنی دەسەڵات لە شوباتی ساڵی ۱۹۷۹دا کاتێك حوکمەت وەفدێکی ناردە (کوردستان-ك. م.) بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە (لتقصي الحقائق) لە ناوچە کوردییەکان (کوردستان)[34] دوای ئەوەی ئەو ڕاپۆرتانە گەیشتن کە باسی خۆپیشاندانی کوردو پێکدادان لەنێوان هۆزە کوردەکاندا (کە لەلایەن ڕەهبەری کوردی عیراقەوە جەلال تاڵەبانییەوە قیادە دەکرێن)[35] لەگەڵ لایەنگرانی حوکمەتی نوێدا دەکەن. وەفدەکە شێخ عیززەددینی حسەینیی[36] بینی کە ڕەهبەرێکی ئاینیی مەهابادە.

شێخ تەکیدی ئاواتی ئۆتۆنۆمی کوردی کرد لەگەڵ جێهێشتنی سیاسەتی دەرەوەو کاروباری سەربازیی و دانانی نەخشەی پلانی ئابووریی وڵات بۆ حوکمەتی ناوەندی. ئەمیر ئینتیزامی نوێنەری سەرەك وەزیرانیش تەکیدی کرد هەرچۆن بێت حوکمەت ڕێگە نادات هیچ پارچەیەکی ئێران جیابێتەوە.

---

(34) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە: ((Kordestan))

(35) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((... following reports of Kurdish demonstrations and of clashes between Kurdish tribesmen (led by the Iraqi Kurdish leader Jalal Talabani) and supporters of the new government)) (N.A.,F.O., 373/32, Foreign and Commonwealth Office, The Kurdish Problem, March 1979, P.2).

(36) شێخ عیززەددینی حسەینی: خەڵکی بانەیە، مەلایەتیی لە مەهابادو بۆکان تەواو کردووە و دوای ئەوە بۆتە ئیمام جومعەی مەهاباد، هەستی کوردایەتیی هەمیشە بەهێز بووەو لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی محەمەد ڕەزا شایشدا وەك نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز ڕەفتاری کردووە، دوای کەوتنی ڕژێمی پەهلەوی لە مەهاباد دەفتەر (مەکتەب)ێکی سەربەخۆی دامەزراندووەو گەلێك مەلاو فەقێ و ڕووناکبیری لە دەور کۆبۆتەوە، ئەندامی لیژنەی وتووێژ بوو لەگەڵ حوکمەتی ئیسلامیدا، دانووی لەگەڵ ڕژێمی نوێی ئێراندا نەدەکولا بۆیەکا پەنای بردە بەر سویدو لەوێ دەژی.



(حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) کە رادیکاڵترەو ئێستا لەلایەن ئابووریناس عەبدولڕەحمان قاسملووەوە[37] بۆ یەکەم جار لە گۆڕەپانی کاردا ڕەهبەریی

---

(37) خۆشبەختانە لە ساڵی ١٩٥٩وە دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملووم لە نزیکەوە ناسیو تەنانەت یەکێك لە وتارە زووەکانم لە ڕۆژنامەی ((ژین))دا دەربارەی ئەوە، لە ژیاندا کەم کەسی وەك ئەو زیرەکو وریام دیوە، هەردووك زاراوی کوردی و زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبی و ئازەری و چیکی و سلۆڤاکی و رووسی و فەرەنسی و ئینگلیزی دەزانی، لە رێگەی ئەوەوە ڕۆژنامەنووسی فەرەنسی کرێس کۆچێرا ((مۆبیك))ی دۆستی دڵسۆزی کوردم ناسی، قاسملوو نامەی دوکتۆراکەی کە ساڵی ١٩٦٣ پێشکەشی زانکۆی پراغی کرد دوای تەنها یەك ساڵ ((بنکەی بڵاو کردنەوەی سیاسی))ی لە براتیسلاو بە زوبانی سلۆڤاکی و ناوونیشانی ((کوردستان و کورد))ەوە بڵاوی کردەوە، دیسان لە چیکۆسلۆڤاکیا ساڵی ١٩٦٥ بە زوبانی ئینگلیزیش بڵاو کرایەوەو لە لەندەنیش بنکەی بەناوبانگی کولینز چاپی کردەوە، ساڵی ١٩٦٨ لە بەغدا هەمووی و ساڵی ١٩٧٠یش لە بێروت پوختەیەکی بە عەرەبی بڵاو کرایەوەو ساڵی ١٩٦٩ لە وارشاو بە زوبانی پۆڵۆنی چاپ کراو دوای هەمووانیش نۆرەی زوبانی کوردی هاتو ئەوە بوو مامۆستا عەبدوڵلای حەسەن زادە ساڵی ١٩٧٣ کردییە کوردییەکی پاراوو ڕەوان و

دەکرێت و بەر لە سیودوو ساڵ لەلایەن قازی محەمەدی (سەرۆکی کۆماری کوردستانی ئەمەن کورتەوە) دامەزرێنراوە، دەڵێت ئایەتوڵڵا خومەینی وتووێژی لەگەڵ یەکێکی وەك ئەحمەدی موفتیزادەی[38] سنەیە[39]. بەپێی راپۆرتەکانی عەلی هومام قازی[40](*) کە رەهبەرێکی دیکەی کوردە دەڵێت: هەرچەندە کوردی ئێران داخوازی جیابوونەوەیان هەڵنەگرتووە، بەڵام ئەگەر بێت و جارێکی دیکە داواکانیان دەربارەی دامەزراندنی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیی دیموکراسییەوە پشت گوێ بخرێت، ئەوساکە ئەو کارە دەبێتە هۆی دروستبوونی گێرەوکێشمە.

---

((بنکەی پێشەوا))یش لە کتێبێکی چوار سەد لاپەڕەییدا بڵاوی کردەوە، چەند جارێك ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی و بیانییەکان ئەو بەرهەمەی قاسملوویان بەرز نرخاندووە، خوالێخۆشبوو لە گشت بەرهەمەکانیدا هەمیشە وەستایانە هەوڵی دەدا دیاردە مێژووییەکانی کورد تێکەڵ بە باری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی بکات. ((مێژووی سیاسی و بەرهەمە زانستییەکانی دوکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملوو)) ناونیشانێکی سەرکەوتووی نامەیەکی دوکتۆرای ڕەسەن و پێویستە.

(38) ئەحمەدی موفتیزادە: لە بنەماڵەیەکی بەناوبانگی سنەیە، مەلایەکی باسەوادو شارەزا بوو، لەناو فەقێ و مەلایانی سنەو دەوروبەریدا لایەنگری زۆر بوو، دژی ڕژێمی پەهلەوی بوو و بە گەرمی پشتی شۆڕشی ئیسلامی گرت، ئەندامی لیژنەی وتووێژ بوو، بەڵام هەمان کات مەیلی بەلای وەهابییەکاندا دەشکایەوە، ئەوەی دڵی تارانی لێ کرمێ کردو بووە هۆی بەند کردنیو دەوروبەری دە ساڵ لە زینداندا مایەوە تا بەهۆی نەخۆشییەوە ئازاد کراو زۆری نەخایاند کۆچی دوایی کرد.

(39) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا دەڵێت:

((...has been negotiating whith the conservative secondery- level leader, Ahmed Muftizadeh of Sanaadaj)).

دەقی وەرگێڕانی وشەی (Conservative) موحافیز (محافظ) دەگەیەنێت. بڕوانە:

N.A., F.O., 372/32, Foreign and commonwealth office, The Kurdish prablem, March 1979, P. 2.

(40) لە بنەماڵەی پێشەوا دوو عەلی ناو هەیە، یەکیان عەلی کوڕی پێشەوا قازی محەمەدە کە ناسراوە بە ((کوڕی ڕەش))، ئەویدیکەشیان عەلی کوڕی سەدری قازییە. هەرچی عەلی هومامی قازییەکە ناوی لە بەڵگەنامەکەدا هاتووە، بۆمان ساغ نەبۆوە کێیە..!

(*) ((بێ دوودڵی دەڵێم مەبەست لەم ناوە هەر عەلی کوڕی پێشەوا قازی محەمەدەو کەسێکی دیکە نییە، لەم بارەیەوە بەڵگەی راست و دروستم لەلا هەیە –ع.زەنگەنە)).

**عیراق:**

کوردی عیراق، کە نیشتەجێی ناوچە شاخاوێکانی باکووری- ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتەن، لەوانەیە یەك لە پێنجی دانیشتوانی پێك بهێنن، لەو ڕۆژگارەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی کۆتایی هات کەوتوونەتە گێژاوی خەباتەوە لەگەڵ حوکمەتی بەغدادا. عیراق، بە پێچەوانەی وڵاتانی دراوسێیەوە، لەنێوان هەردووك جەنگی جیهانیدا چ لەژێر سایەی قەیمومەتی بەریتانیداو چ لەو ڕۆژگارەوەی بۆ خۆی بووە دەوڵەتێکی سەربەخۆی نوێ لەبەردەم (کۆمەڵەی نەتەوەکان)دا ڕوو بەڕووی ژمارەیەك ئەرکی دەستووریی بووەتەوە کە دەبوو جۆرە ئۆتۆنۆمییەك بداتە کورد. بەڵام هەرچۆن بێت فەرمانڕەوایانی عیراق سڵیان لەوە دەکردەوە ئەگەر بێتو خودموختارییەکی بەرفراوان بدەنە کورد ئەوساکە ئەوە ببێتە هۆی جیابوونەوە، بەو جۆرەیش ناوچە سەرەکییەکانی وەبەرهەمهێنانی نەوت، کە لە دەوروبەری کەرکووکدان، بکەونە مەترسییەوە، چونکە کەرکوك بۆ خۆی کەوتۆتە ناوچەی کوردەوە[41]. ساڵەها شەڕو پێکدادان لەنێوان کوردو هێزە عیراقییەکاندا بەردەوام بوو. (پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق) دەیگوت ئەو خەبات تەنها لەپێناو ئۆتۆنۆمیدا بۆ کوردستان ناکات، بەڵکو هەمان کات خەبات بۆ ئازادی و دیموکراسی بۆ گشت عیراق دەکات. باڵی سەربازیی پارتی پێشمەرگەیە کە ژمارەیان لە گەرمەی خەباتدا لە پەنجا هەزار کەس تێدەپەڕێت.

دوویەرەکیی ئێرانی- عیراقیش ئەم بارودۆخەی هێندەی دیکە ئاڵۆز کرد. تاوەکو ساڵی ١٩٧٥ شا چەك و یارمەتیی ماڵیی دەدایە کوردی عیراق، بەڵام دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ هەڵوێستی ئێران بووە هۆی هەرەسهێنانی شۆڕش. لەوانەیە عیراق لەناو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرفراوانترین ئۆتۆنۆمیی دابێتە ناوچە کوردنشینەکانی، هەرچەندە بەپێی (پارتی دیموکراتی کوردستان) نزیکەی چارەکە ملیۆن کەسێك لە زێدی خۆیان ڕاگوێزراون بۆ دروستکردنی

---

(41) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((The Iraqi authorities, however, fear that by giving too much autonomy to the Kurds they could risk the secession of Iraq's main oil producing areas around Kirkuk, which fall within the Kurdish area)) (N.A., F.O., 372|32, Foreign and Commonwealth Office, The Kurdish Problem, March 1979, P.3).

ناوچەیەکی چۆڵ[42] لەنێوان سنووری عیراقدا لەگەڵ تورکیا و ئێران. هەروەك چۆن لەگەڵ تورکیادا، بە هەمان دەستوور حوکمەتی عیراق دەبێت ئاگاداری ئەگەری ڕەنگدانەوەی ڕووداوە نوێکانی ئێران بێت. لەگەڵ بەردەوامبوونی بزووتنەوە ئاساییەکانی هێزە کوردییەکانی ناوچە سنوورییەکاندا بۆچوونێك لەناو بەشێك لە کوردی ئێراندا دروست بووە، کە ئەوان دەتوانن هەلی لاوازبوونی حوکمەتی ئێران بقۆزنەوە بۆ هاندانی کوردەکانی دراوسێیان بۆ وەدی هێنانی ئەم پرۆسەیە، یا بۆ پەرەپێدانی کۆششی خۆیان لەپێناو وەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانتردا.

## یەکیەتی سۆڤییەت:

کورد لەناو یەکیەتی سۆڤیەتدا کەمینەیەکی پچووکتر پێك دەهێنن، بەلام وەك نەتەوەیەکی سۆڤیەتی دانیان پێدا نراوەو هەندێك مافی ڕووناکبیرییان پێ دراوە. بەلام کاربەدەستە سۆڤێتییەکان بە ئاشکرا حەز بە بیرۆکەی پان- کوردیی کوردستانی سەربەخۆ ناکەن، یا تەنانەت بە ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانتری کورد لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئێستادا، کوردەکانی سۆڤیەت پەیوەندییەکی کەمیان بە کوردی وڵاتەکانی دیکەوە هەیەو زۆر تێکەڵی ئاواتی بەرفراوانتری نەتەوەیی نەبوون. بەپێی ئەوەش هەڵوێستی کاربەدەستە سۆڤیەتییەکان بەرانبەر ڕێکخراوە کوردییەکانی وڵاتە دراوسێکان دەگۆڕدرێت. کاتێك بەرژەوەندییە کوردییەکان لەگەڵ سیاسەتی سۆڤیەتیدا بە باشی یەکدەگرنەوە، وەك پشتگیریی گرتنی پارتە کۆمۆنیستەکان دژی بزووتنەوە سیاسییەکانی دیکە، ئەو کاتە ڕووس لەژێر پەردەوە یاریدەی (کورد- ك. م.) دەدەن. ئەمە لە عیراقدا وا بوو، لەوێ سۆڤیەتییەکان پێوەندییان بە ڕەهبەرانی کوردەوە هەبوو و دوای کەوتنی کۆماری تەمەن کورتی مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٧وە تاوەکو گەڕانەوەی بۆ عیراق لە ساڵی ١٩٥٨دا پەناگەیان دایە مەلا مستەفای بارزان (بارزانیی لە مەنفا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕۆژی یەکی مارتی ساڵی ١٩٧٩ کۆچی دوایی کرد). بەلام دوای ئەوەی کوردی عیراق قایل نەبوون بچنە ناو ئەو (بەرە نیشتمانی)یەی

---

(42) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:
((to create a free zone along Iraq's frontiers with Turkey and Iran)) (Ibid, P.3).

ئەمەوزی ساڵی ۱۹۷۳ دامەزرێنرا پاریدەی سۆڤیەتی (بۆ کورد– ك. م.) رووی لە کزی کرد. رووسەکان لە ئێران ئاگاداری ئەوەبوون سازشی پێوەندییان بە شاوە لەگەڵ پشتگیریی ئاشکرای کوردی ئێراندا نەکەن[43]. لە کاتێکدا پاریدەی نەتەوەیی سۆڤیەت بۆ هێزە شۆڕشگێڕە کوردییەکان بەگشتی کەم بوو، بەلام رووس هیوادار بوون بتوانن لە رێگەی پێوەندیی دوورو درێژیانەوە بە ڕەهبەرە کوردەکانەوە تا ڕادەیەك کار بکەنە سەر رووداوەکان ئەگەر هەوڵی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی لە ئێران یا لە هەر شوێنێکی دیکە سەری گرت.

## سووریا:

کوردی سووریا کەم دەرفەتی ئەوەیان هەبووە هەستی خۆیان دەربارەی خودموختاری دەرببڕن و فەرمانڕەوایانی سووریا ڕێبازی بە زۆر کردنە عەرەبیان لە ناوچە کوردییەکاندا گرتە بەر. لەم ساڵانەی دواییدا نەتەوەپەرستیی کورد لە سووریا دیاردەیەکی زیندوو نەبوو. لەنێوان ساڵانی ۱۹۷۵ و ۱۹۷۸ دا سوورییەکان پاریدەی چالاکییەکانی جەلال تاڵەبانییان لە عێراق دەدا، بەلام لەژێر سایەی نزیککەوتنەوەی ئەم دواییانەی نێوان عێراق و سووریا ئەو پاریدەیە وەستێنرا. هەرچی کوردی لوبنانیشە بۆ خۆیان پەنابەرن و بنکەیەکی ناوچەییان نییە، لەگەڵ ئەوەیشدا رێگەیان پێ دراوە پتر لە ولاتەکانی دیکەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست هەستی خۆیان دەرببڕن و ئەنجام دابەش بوون بەسەر ئەو پارتییە (لوبنانییانەدا– ك. م.) کە لە گۆڕەپانی سیاسەتدا کار دەکەن، هەرچەندە لەوانەیە هەر کاتێك بێت لەو ولاتە دوور بخرێنەوە.

## خشتە:

لەبەر ئەوەی بە دەگمەن سەرژمێریی دەکرێت زەحمەتە مەزندەیەکی تەواو و ڕێکوپێکی ژمارەی کورد بکرێت، هەمان کاتیش جیاوازییەکی زۆر لەنێوان ئەو ژمارانەدا هەیە کە ڕەهبەرانی کورد دەیانڵێن و ئەوانەدا کە (فەرمانڕەوایانی ئەو

---

(43) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((In Iran the Russians were careful not to compromise their relations with the shah by openly supporting the Iranian Kurds)) (Ibid, P.3)

ولاتانە– ك. م.) دەیانڵێن کە کەمینە کوردەکانیان تێدا دەژین. ئەم خشتەیەی لای خوارەوە دوا مەزەندەیەکە کە لەبەر دەستدایەو ئامـاژەی هـەردووك مەزەندەی نزمو بەرز دەکات:

| | کەمترین | زۆرترین | کۆی ژمارەی دانیشتوانی وڵاتەکە |
|---|---|---|---|
| تورکیا | ٣٢٠٠٠٠٠ | ٨ ملیۆن | ٣٥٦٦٦٥٠٠ |
| ئێران | ١٨٠٠٠٠٠ | ٥ ملیۆن | ٢٨٤٤٨٠٠٠ |
| عیراق | ١٥٥٠٠٠٠ | ٢,٥ ملیۆن | ٩٤٩٨٠٠٠ |
| سووریا | ٣٢٠٠٠٠ | ٦٠٠٠٠٠ | ٦٢٩٤٠٠٠ |
| یەکیەتی سۆڤیەت (ئەرمەنستان و جۆرجیا و ئازەربایجان) | ٨٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠٠ | ١٣١٣٢٠٠٠ |
| لوبنان | ٤٠٠٠٠ | ٧٠٠٠٠ | ٢٦٤٥٠٠٠ |

سەرچاوە: ((کورد)) (دەستەی مافی کەمینەکان)، ١٩٧٥))[44].

دوا بەدوای دەقی ناوەرۆکی ڕاپۆرتەکە بەشی هەرە زۆری لاپەڕەی چوارەمی بۆ ئەو خشتەیەی سەرەوە دەربارەی ژمارەی کورد تەرخان کراوە (بڕوانـە: پاشـکۆی ژمارە ٢٠).

(44) Ibid, P.4.

**سێیەم– ڕاپۆرتێکی سەربەخۆی دیکە دەربارەی کێشەی کورد– حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٣**

هەرچەندە جۆرە وێکچوون و دووپات کردنەوەیەکی ئاسایی لەنێوان ناوو ڕووداوەکانی ناو ڕاپۆرتی دووەم و ئەم ڕاپۆرتەدا هەیە، بەڵام بە پێویستمان زانی دەقی ئەم ڕاپۆرتەیش وەك خۆی پێشکەش بکەین، چونکە جیاوازیش لەنێوان ناوەڕۆکی هەردووکیاندا زۆرە، هیچ نەبێت لەبەر ئەوەی ئەمیان چوار ساڵ و سێ مانگ دوای ئەویان نووسراوە. شایانی باسیشە ڕاپۆرتی ئەمجارەمان تەتەڵە کراوە چونکە لە سەری نووسراوە ((Reviced))، لە پەراوێزی لاپەڕەی یەکەمیشیدا هەمان ڕستە دووپات کراوەتەوە کە دەڵێت:

(ئەم بەڵگەنامەیە بۆ کاری پەلەی گشتیی ئامادە کراوە، بە هیچ جۆر نابێت وەها لێکبدرێتەوە، یا بە جۆرێك ئاماژەی بۆ بکرێت کە بیروبۆچوونی حوکمەتی (بەریتانی– ك. م.) دەردەبڕێت).

ڕاپۆرتی سێیەممان لە حەوت لاپەڕە پێکهاتووەو لاپەڕەی شەشەمی خشتەیەکی سەرژمێریی کوردەو لاپەڕەی حەوتەمیشی نەخشەیەکی کوردستانە، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانی ناوەڕۆکی ئەو ڕاپۆرتەیە:

((کێشەی کورد.

کورد، کە ژمارەیان نزیکەی دە ملیۆنە، بەشێکی بایەخدار لە دانیشتووانی تورکیا و ئێران و عیراق پێکدەهێنن. ئەوان لە سووریا و یەکیەتی سۆڤیەت و لوبنانیش هەن. بە شێوازێکی سەرەکی کورد نیشتەجێی ناوچە شاخاورییەکانی تورکیا و دەوڵەتەکانی دەوروبەرین. زۆرینەی کورد موسڵمانی سوونەن، بەڵام لە ئێران ژمارەیەك کوردی شیعەش هەن. کورد، وەك گەلێکی لە هۆز پێکهاتووی خاوەن کولتوورو نەریت و زوبانی خۆی، بە لایەنی کەمەوە سێ هەزار ساڵە هەن، لەو ماوەیەدا نەریتێکی سەربەخۆیی زۆر بەهێزی پێکەوە ناوە. لەنێوان سەدەی حەڤدەو بیستدا سێ لەچواری گەلی کورد لە لایەن عوسمانییەکانەوە و ئەوانی دیکەیشی لە لایەن ئێرانەوە حوکم دەکران. گەلێك ڕاپەڕینی کوردیی یەك لەدوای یەك، تایبەت دژی عوسمانییەکان، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمیندا بەرپا بوون، بەڵام تەنها لە دوا قۆناغی سەدەی نۆزدەمیندا ڕەهبەری کورد عوبەیدوڵلا

بیرۆکەی گەلێکی یەکگرتووی لە دەوڵەتێکدا هێنایە کایەوە[45]. کورد هەوڵی هەمەجۆرەیان بۆ دروستکردنی یەکیەتیەکی نەتەوەیی لە بارودۆخی جیاوازیی و دووبەرەکیی هۆزایەتیدا داوە، ئەو جیاوازی و دووبەرەکییەی حوکمەتە ناوەندییەکان هەمیشە دەیانقۆستنەوە. هەمان کات تەشەنەسەندنی نەخوێندەواری و ئەوەی زوبانی کوردی لە دوو زاراوی سەرەکیی پێکهاتووە، وێڕای جیاوازیی نێوان (بیرو بۆچوونی– ك. م.) ڕەهبەرە دەرەبەگە موحافیزەکان و باڵی چەپڕەوو ڕادیکاڵی کورد بوونەتە کۆسپ لەبەردەم پتەوکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورددا.

هەر کە تورکیا لە جەنگی یەکەمی جیهاندا ژێرکەوت بابەتی سەربەخۆیی (گەلانی ناو ئەو وڵاتە– ك. م.) هاتە گۆڕێ. (پەیمانی سیڤەر) کەساڵی ١٩٢٠ لەنێوان هاوپەیمانەکان و حوکمەتی سوڵتاندا بەسترا، بە دەستووریی دامەزراندنی سێ دەوڵەتی عەرەبیی لە حیجاز (دوایی خرایە سەر عەرەبیی سعوودی) و سووریا و عیراق، کوردیش بۆ یەکەم جارو دواجار دەرفەتی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆیان بۆ هاتە پێش. تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ لە تورکیا سەڵتەنەت لابراو دوای ئەوە دامەزراندنی کۆماری تورکی کۆتایی بە ئاواتی کوردستانێکی سەربەخۆ هێنا. (پەیمانی لۆزان)ی ساڵی ١٩٢٣ کە تورکیا مۆری کرد، ئاماژەی بۆ کوردستان نەکردو چەسپاندنی سنووری نوێی نێوان نەتەوەکان بووە هۆی دروستبوونی کۆسپی دیکە لە بەردەم ئاواتەکانی کورددا.

---

(45) ڕاستە شێخ عوبەیدوڵلای نەهری ساڵی ١٨٨٠، بۆ یەکەم جار، دروشمی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردو جیابوونەوەی کوردی، هەم لە دەوڵەتی عوسمانی و هەم لە ئێران، بەرز کردەوە، بەڵام بەدرخانی گەورەیش، بەر لەو بە لایەنی کەمەوە بە سێ دەیە (عقد)، دروشمی سەربەخۆیی بەرز کردبۆوەو کارگەی دروستکردنی چەکیشی دامەزراندبوو، وێڕای ئەوە زۆربەی هەرە زۆری ئیمارەتە کوردییەکان نیمچە سەربەخۆ بوون، لە دانی باجێکی دیاریکراوی کەمو لەکاتی جەنگدا ژمارەیەك چەکدار بەولاوە هیچ شتێکی دیکە ئەو ئیمارەتانەی نە بە ئەستەمووڵەوەو نە بە ئەسفەهان و تارانەوە نەدەبەستەوە، ئەو ڕاستییە مێژووییەی لە ئەدەبی کوردیشدا بە ئاشکرا ڕەنگی داوەتەوە، ئەوەتا شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە بیری بوو کە سلێمانی ((دار الملکی بابان)) بوو، ((نە یەخسیری عەجەم نە سوخرەکێشی ئالی عوسمان بوو)).

لەم ساڵانەی دواییدا ئامانجەکانی هەریەك لە بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کورد لە عیراق‌و ئێران و تورکیا بە شێوازێکی سەربەخۆ لە یەکدی بەرەوپێش دەچوون، هەرچەندە چالاکیی لەنێوان سنوورەکاندا هەر بەردەوام بوو. کورد هەرگیز پەنایان نەبردۆتە بەر تیرۆری نێو دەوڵەتی وەك ئەمرازێکی سەرنج ڕاکێش بۆ پرسی گەلەکەیان.

ئێران:

بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی، بەپێی (پەیمانی سیڤەر)، ناوچە کوردنشینەکانی ئێرانی نەدەگرتەوە[46]. لە بیستەکان و سییەکانی (سەدەی ڕابردوودا– ك. م.) زنجیرەیەك ڕاپەڕینی کوردی لە ئێران بەرپا بوو، بەلام ڕەزاشا زۆر بە توندی دایمرکاندنەوە. ساڵی ١٩٤١ داگیرکردنی خاکی ئێران لەلایەن یەکیەتی سۆڤیەت و بەریتانیاوەو لابردنی ڕەزاشا لەسەر تەخت بوونە هۆی نەمانی دەسەلاتی حوکمەتی ناوەندی لە سەرجەمی ناوچەکانی ئێراندا. لە ئازەربایجان و کوردستان، کە کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی سۆڤیەتەوە، دروشمی ئۆتۆنۆمی لە لایەن سۆڤیەتییەکانەوە هان دەدرا، ئەوەی ڕێگەی خۆش کرد بۆ دامەزراندنی کۆماری ئازەربایجانی دیموکرات و کۆماری مەهابادی کوردیی لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥دا. قایل نەبوونی هێزەکانی یەکیەتی سۆڤیەت لە باکووری ئێران بکشێنەوەو وەك بەپێی بەندی داگیرکردنی ناوچەکە دەبوو بیکەن بووە هۆی ڕوودانی یەکەم کێشەی نێو دەوڵەتیی لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا دوای تەواو بوونی جەنگی دووەم، لەو بووارەیشدا ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا زۆر بە گەرمی پشتی حوکمەتی ناوەندیی تارانی دەگرت. مایسی ساڵی ١٩٤٦ هێزەکانی سۆڤیەت ناچار

(46) ئێران وەك تورکیا لە بەرەی جەنگی یەکەمی جیهاندا بەشدار نەبوو هەرچەندە شای قاجارو زۆربەی گەلی ئێران بە دڵ لایەنگری ئەڵەمانیاو هاوپەیمانەکانی بوون، بەلام دەوڵەتی عوسمانی یەکێك بوو لەو دەوڵەتە شەرکەرانەی پێیان دەڵێن ((دەوڵەتانی ناوەند)) (دول الوسط)،ئەڵەمانیا و لایەنگرانی کە دژی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەجەنگین سەرئەنجام جەنگیان دۆڕاندو زنجیرەیەك پەیمان لەنێوان هاوپەیمانەکان و ئەواندا بەسترا کە لایەنێکی سەرەکیی ناوەرۆکیان بۆ دابەش کردنی ولاتە ژێر دەستەکانیان تەرخان کرابوو، ئێران بە دەوڵەتێکی بێ لایەن لەو جەنگەدا دەژمێردرا بۆیەکا کەس مافی یاسایی نەبوو دەست بۆ خاکی ئەو بەرێت.

بوون لە باکووری ئێران بکشێنەوە بەرانبەر ئیمتیازی نەوتی سەراخ کە کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوە، ئەو ئیمتیازەی دوایی پەرلەمانی ئێرانیی تازە هەڵبژێردراوی ساڵی ١٩٤٧ پەسەندی نەکرد. کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٦ سوپای ئێران ئەو ناوچانەی داگیر کردەوە کە بە دەست سۆڤیەتییەکانەوە بوون و بەو جۆرە ڕژێمەکەی پێشەوەری[47] لە ئازەربایجان و ڕژێمە کوردییەکەی مەهاباد رووخان. قازی محەمەدی سەرەک کۆماری مەهابادی کوردیی لەسێدارە دراو شانبەشانی کەوتنی کۆماری مەهاباد حوکمەتی ناوەندی دەستی گرتەوە بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستانی ئێراندا.

(حیزبی دێمۆکراتی کوردستان)[*] ساڵی ١٩٤٥ لە لایەن قازی محەمەدەوە دامەزرێنرا. ئەوساکە ئەو پارتییە ڕادیکاڵترین و بەهێزترین دەستەیان لەناو هەموو نەتەوەپەرستانی کورددا پێک دەهێناو ڕەهبەریی هێزی پێشمەرگەی دەکرد. (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) لەو قۆناغەدا لە رووی ئایدۆلۆجیاوە سەر بە یەکیەتی سۆڤیەت بوو، هەر ئەویش یاریدەی دەدا، بەڵام حیزبی ئێستا دەڵێت پێوەندیی لەگەڵ پارتی (توودە)ی ئێرانیی کۆمۆنیستدا پچڕاندووە. تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨١ (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) دایە پاڵ (ئەنجوومەنی

---

(47) مەبەستی جەعفەر پێشەوەریی سەرەک کۆماری ئازەربایجانی ئێرانە کە لەگەڵ کۆماری کوردستان پێکرا دامەزرێنران، پێشەوەری و هەزاران ئازەریی دیکە پەنایان بردە بەر خاکی شووروەی بۆیەکا محەمەد ڕەزاشا نەیتوانی، وەک ڕەهبەرانی کورد، زەفەریان پێ بەرێت.

(*) ((د. کەمال لە چەندین نووسینی پێشووتری ئەو ناوەی بە (پارتی دیموکراتی کوردستان) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، دیارە، لەم کتێبەشدا چەندین جار هەر ئاوەها دووبارە کرابۆوە، ئەوەبوو جارێکیان بە تەلەفۆن لەگەڵ بەڕێزیدا رەخنەم لەسەر ئەو کارەی لێی گرت کە نابێ ئەو ناوە بەم شێوەیە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی، بەتایبەتی کە لە ئەدەبیاتی هەموو حیزبە کوردییەکاندا ناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بۆ (پارتی)یەکەی عیراق بەکار دەبردرێ، هەرچی پارتییەکەی دیوی ئێرانیشە ئەوا هەمیشە لەسەردەمی کۆمارەوە، دواتریش بەشۆڕشگێڕو نا شۆڕشگێڕییانەوە و خوای دەکرد چەند پارچە دەبوون، هەر پێی گووتراوە (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان)، ئەوەبوو دوای چەند رۆژێك هەر لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا، جەنابی دوکتۆر ئەو رەخنەیەی لێ قبوڵ کردم، وەکو دەبینن ناوەکانی ئەو حیزبە لە هەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا هاتبێ بەم شێوەیەی سەرەوە نووسیومەتەوە نەوەك (پارتی دیموکراتی کوردستان) — ع. زەنگەنە)).

بەرگریی نیشتمانی) کە مەسعوود ڕەجەوی لە پاریس دایمەزراند، ڕەجەوی ڕەهبەری (موجاهیدینی خەڵك)ە کە لە مەنفا دەژی. بە سەرکردایەتیی ڕەهبەری ئێستای عەبدولڕەحمان قاسملوو (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) دەستبەرداری دروشمی کوردستانی گەورەی پێکهاتوو لە ناوچە کوردنشینەکانی تورکیاو سووریا و عیراق و ئێران و یەکیەتی سۆڤیەت بوو، ئەو دروشمەی کورد گەلێك بڕوای پێیەتی، قاسملوو دروشمی میانڕەوی ئۆتۆنۆمیی ناوچەیی لە جێگەی ئەو دروشمە بەرز کردۆتەوە. (کۆمەڵە) کە دەستەیەکی بچووکی مارکسی- ماوییە هاوپەیمانی (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان)ە، وێڕای شێخ عیززەددینی حسەینیش کە سەرکردەیەکی ئایینی کوردە و ڕێکخراوێکی نەتەوەیی بەڕێوە دەبات، هەروەها دەستەیەکی چەپڕەوی دیکە کە لە پیاوی ئایینیو نەتەوەیی پێکهاتووە، گشت ئەم ڕێکخراوانە داوای ئۆتۆنۆمی دەکەن و کاروباری پێوەندیی لەگەڵ هەندەرانو بەرگری و نەخشە دانانی ئابووری بۆ حوکمەتی ناوەندی جێ دەهێڵن.

شوباتی ساڵی ١٩٧٩، لەگەڵ کەوتنی ڕژێمی شادا، کورد داوای مافەکانی خۆیانیان لە کۆماری ئیسلامیی تازە دامەزرێنراو کرد. ڕەهبەرانی ڕژێمی نوێی ئێران بۆ هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە وەفدێکیان ناردە ناوچەی کوردی، دوا بەدوای ئەوە بەپێی ڕاپۆرتەکان خونیشاندان و پێکدادان لەنێوان هێزەکانی کورد و لایەنگرانی حوکمەتی نوێدا قەوما. وتوویژ لەنێوان هەردووك لادا پچڕاو ئابی ساڵی ١٩٧٩ ئایەتوڵلا خومەینی فەرمانی لەناوبردنی یاخیگەرانی کوردی دەرکرد. تەشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨١ بۆکان، کە دوا شاری کوردی بوو بەدەست نەتەوەپەروەرانی کوردەوە، لەلایەن هێزەکانی میرییەوە داگیر کراو لەوساوە سوپای ئێران توانیی کوردەکان ناچار بکات پەنا بەرنە بەر ناوچە شاخاوێکان. هێرشێکی چڕی هێزەکانی میری، لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٢و سەرەتای ساڵی ١٩٨٣دا، بووە هۆی داگیرکردنی ڕێگەی ستراتیجیی نێوان پیرانشارو سەردەشت، بەو جۆرەیش چ (حیزبی دێمۆکراتی کوردستان) و چ (کۆمەڵە) لەو هێڵە دابڕدران کە لە ڕێگەیەوە یاریدەی عیراقیان پێ دەگەیشت، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا کارەساتێکی گەورە بوو و بەپێی ڕاگەیاندنی ڕادیۆی بەغدا دوکتۆر قاسملووی ناچار کرد داوای یاریدەی نێودەوڵەتی دژی حوکمەتی ئێرانی بکات.

لەبەر ئەوەی یاخیبوونی کورد دەبێتە هۆی خەریکبوونی هێزەکانی میری لەبریتی بەکارهێنانیان دژی عیراق، بۆیەکا حوکمەتی ئێران پتر بایەخ بەو یاخیبوونە دەدات وەك لە گشت سەرپێچیەکانی کەمینەکانی دیکەی ناو ئەو وڵاتە.

**عیراق:**

کوردی عیراق لە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری– رۆژهەڵاتدا دەژین و نزیکەی لە سەدا بیستی دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێك دەهێنن، زۆرینەی دانیشتووانی عیراق عەرەبن، کوردیش، لەو کاتەوەی دەوڵەتی عوسمانی ڕوخا، بوونەتە بەشێکی حوکمەتی بەغدا. بە پێچەوانەی دراوسێکانییەوە، عیراق وەك دەوڵەتێك کە لەنێوان هەردووك جەنگی جیهانیدا کەوتبووە ژێر سایەی قەیمومەتی بەریتانییەوە و ئینجا بەهۆی مەرجەکانی سەربەخۆییەوە کە (کۆمەڵەی گەلان) بۆی دانابوو جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی دابووە کورد. کاربەدەستانی عیراق لەوە سڵ دەکەنەوە کە ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان ببێتە هۆی دابڕینی ناوچە نەوتییەکانی دەوروبەری کەرکووك. شەڕ (لەنێوان میریو کورددا– ك. م.) زوو زوو دەقەوما، لە هەموویشیان بەرفراوانتر ئەو شەڕانە بوون کە لە ساڵی ١٩٦١ەوە هەڵگیرسان، ئەو کاتەی مەلا مستەفای بارزان بانگی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی دا[48]، ئەو شەڕەیش ساڵی ١٩٧٠ وەستێنراو تاوەکو ساڵی ١٩٧٤ ئاشتییەکی لاواز لەنێوان هەردووك لادا بەردەوام بوو.

(پارتی دیموکراتی کوردستانی عیراق)، کە دوای بەرپابوونی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨[*] دروست بوو، دەیگووت ئەو تەنها لەپێناوی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان خەبات ناکات، بەڵکو هەمان کات خەبات لەپێناو ئازادی و دیموکراسیدا بۆ گشت

---

(48) ئەوساکە کورد لە خودموختارییەکی مەودا تەسك لە چوارچێوەی عیراقێکی دیموکراتی یەکگرتوودا بەولاوە هیچی دیکەی داوا نەدەکرد.

(*) ((ڕاستییەکەی (پارتی دیمۆکراتی کوردستان) لە ساڵی ١٩٤٦ دامەزراوە نەوەك لەساڵی ١٩٥٨دا، وەکو لەم بەڵگەنامەیە واهاتووە، بەڵام لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨دا بەئاشکرا کاری کردووە، واتە لە ساڵی ١٩٦٠دا، دوای ڕاگەیاندنی یاسای کۆمەڵەکان، مۆڵەتی ڕەسمی وەرگرتووە و دەبێ لەبەر مۆڵەت وەرگرتنی ئەو ماوەیە بووبێ زۆربەی سەرچاوە بیانییەکان وا ئاماژەی بۆ دەکەن لەدوای ١٩٥٨ دامەزرابێ– ع. زەنگەنە)).

عیراقــیش دەکــات. کوردەکــان هاوپــەیمانن لەگــەڵ پارتییــە ئۆپۆزســیۆنە عیراقییەکاندا، بە حیزبی شیوعیی عیراقییەوە. لە سەرەتای دامەزراندنیدا (پارتی دیموکراتی کوردستان) بەرگریی لە کۆمۆنیزم و هەروەها لە ناسیۆنالیزمی کوردی دەکـرد[49]، بـەڵام دوایـی لـەژێر سـەرکردایەتی مـەلا مـستەفادا بیروبۆچـوونی رادیکـاڵیی پـارتیی لەبـەردەم هۆزایەتیـدا، تایبـەت هۆزایـەتیی بارزانییەکانـدا، پاشەکشێی کرد. ئێستا (پارتی دیموکراتی کوردستان) بـە رەهبـەریی هـەردووك کوڕەکانی مەلا مستەفا[50] گەورەترین و پڕچەکترین رێکخراوی کوردییە، ژمارەی پێشمەرگەکانی دەوروبـەری بیـست هـەزار شـەڕکەری ئامـادەن بـۆ راگەیانـدنی ئەرکەکانیان (بەپێی هەندێك سەرچاوە ژمارەیـان خـۆی لـە چـل هـەزار دەدات). دووەمین گـەورەترین دەسـتەی کـوردی (یـەکێتی نیـشتمانیی کوردسـتان)ە کـە جەلالەددین تاڵەبانی[51] ساڵی ١٩٧٥ دایمەزراند، یەکێتی رێکخراوێکی مارکسییە و لەرووی سیاسەتیشەوە لە هەمووان خـەباتگێڕترن، لیبیـا و سـووریا یاریـدەی یـەکێتی دەدەن. لـەنێوان سـاڵانی ١٩٧٦ و ١٩٨٠دا شـەڕ لـەنێوان (پـارتی دیموکراتی کوردستان) و (یـەکێتی نیـشتمانیی کوردسـتان)دا لەسـەر دەسـەڵاتی ناوچەیی قەوما. رێکخراوە کوردییەکانی دیکـە بـریتین لـە (پـارتی سۆشـیالیزمی کـوردی)[*] کـە سـاڵی ١٩٧٩ بـە نـاوی ((پـارتی سۆشـیالیزمی یـەکگرتووی کورد))[**]ەوە دامەزراو یەکێك بوو لەو رێکخراوانەی بیانییان بۆ پارە

---

(49) مەبەستی ئەو رۆژگارەیە کە باڵی چەپڕەو (هەمزە عەبدوڵلا و هاوبیرەکانی) بەر لە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ باڵادەست بوو لە سەرکردایەتیی ((پارتی دیموکراتی کوردستان))ی عیراقدا.

(50) دیارە مەبەستی خوالێخۆشبوو ئیدریس و مەسعود بارزانییە.

(51) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە نووسراوە جەلالەددین تاڵەبانی "Jalal al Din Talabani"، ئەوەیش یەکەم جارە لەو بەڵگەنامە نهێنییانەی حوکمەتی بەریتانیدا کە من تاوەکو ئێستا دیومن ناوی تاڵەبانی بەو جۆرە بێت. بڕوانە:
N.A., F.O., 973/319/, The Kurdish Problem, June 1983, Reviced, P.3.

(*) ((راستتر ناوەکەی (حیزبی سۆشیالیستی کوردستان) بووەو کورت کراوەکەیشی (حسك) بووە– ع. زەنگەنە))

(**) ((پێموایە لێرەدا دەبێ نووسەری راپۆرتەکە ناوەکەی لەگەڵ (پاسۆك) لێ تێکچووبێ– ع. زەنگەنە)).



ئیدریس بارزانی – مەسعوود بارزانی

دەفراند، وێڕای (پارتی دیموکراتی گەلانی عێراق)(*) کە ساڵی ١٩٨١ دامەزرێنراوە.

ساڵی ١٩٦٨ بەپێی یاسا لە عێراق دان بە نەتەوەی کورددا نرا، وا چاوەڕوان دەکرا لە ماوەی چوار ساڵی دوای ئاگربەسی ساڵی ١٩٧٠ وتووێژی دووقۆڵی بە دامەزراندنی ڕژێمێکی ئۆتۆنۆمیی پەسەند کۆتایی بێت، بەلام مارتی ساڵی ١٩٧٤ پرۆژەیەکی ئۆتۆنۆمیی ناتەواو ڕاگەیەنراو لە هەولێر تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤ ئەنجوومەنێکی (یاسادانان)ی بێ دەسەلات کرایەوە. کورد هیچ کام لەم کارانەی لا پەسەند نەبوو، وێڕای ئەوەی بە لایانەوە نوێنەرایەتی کورد لە حوکمەتی ناوەندیدا زۆر کەمو لاواز بوو. شەڕی ئاشکرا لەنێوان هەردووک لادا هەلگیرسایەوە. ئێران ئەم هەلەی بۆ ئالۆزکردنی بارودۆخی عێراق قۆستەوەو کەوتە یاریدەدانی مادیی کورد.

---

(*) ((ڕاستتر ناوەکەی (پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان)) بووە، کە شەهیدی دەستی تیرۆر (سامی عەبدولڕەحمان) پێشڕەوایەتی دەکرد، دوای ڕاپەڕین لەگەڵ (پاسۆک) چوونە ناو (پارتی دیموکراتی کوردستان) – ع. زەنگەنە)).

مارتی ساڵی ١٩٧٥ ئێران و عێراق ڕێککەوتننامەی جەزائیریان مۆر کرد، عێراق بەپێی ناوەڕۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیە داواکانی ئێرانی دەربارەی سنوور بەرانبەر وەستاندنی یاریدەدانی کورد پەسەند کرد، لە ئەنجامی ئەوەیشدا بە خێرایی یاخیبوونەکەی کورد هەرەسی هێنا. دوا بەدوای ئەوە حوکمەتی عێراق پڕۆژەیەکی ئاوەدانیی لە ناوچە کوردنشینەکاندا دەست پێ کردو کەوتە دابەش کردنی زەوی‌و ڕێگە درایە چل هەزار کوردێك لەوانەی بە زۆر ڕاگوێزرابوونە باشوور بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٠یش هەڵبژاردنێکی نوێی (ئەنجوومەنی یاسادانان)ی ناوچەی کوردستانی ئۆتۆنۆمی کرا.

جەنگی نێوان ئێران و عێراق دەرفەتی ئەوەی بۆ کورد ڕەخساند جارێکی دیکە چەك لەرووی حوکمەتی ناوەندیدا هەڵبگرنەوە. ئیلغای ڕێککەوتننامەی جەزائیر لەگەڵ ئێراندا دەرفەتی ئەوەی بۆ کورد ڕەخساند بتوانن لەنێوان سنووری هەردووك وڵاتدا بێن‌و بچن‌و ئێرانیش دەستی یاریدەی بۆ درێژ دەکردن. ساڵی ١٩٨١ بەرەیەك لەنێوان ڕێکخراوە کوردییە جیاوازەکان، کە یەکێکیان (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوو، لەگەڵ (پارتی دەعوە)ی شیعەی شەرکەرو ژمارەیەك کەسایەتیی مونشەقی عێراقیدا دامەزرا، لەو بارودۆخەی حوکمەتدا، کە بوواری ئەوەی نەبوو هێزی تەواو بنێرێتە باکوور، ڕژێم ناچار بوو بکەوێتە گفتوگۆ. بەو جۆرە ڕێگە درایە هێزە کوردییەکان لەناو خاکی کوردستاندا کار بکەن، کوردە بەندەکان ئازاد کران و تەمموزی ساڵی ١٩٨٢ بەخشینی گشتیی بۆ ئازاد کردنی گشت بەندەکان ڕاگەیەنرا، تەنها ئەوانە نەبن کە لەسەر تاوانی کوشتن یا فڕاندنی بیانی گیرابوون.

**تورکیا:**

وێڕای خستنە پشت گوێی ئاواتە نەتەوەییەکانی کورد ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە دامەزراندنی ڕژێمی کۆماریی کەوتنەوە هەستی ئایینی کوردیان برینددار کرد. بڕیاری لابردنی خەلافەت لە مارتی ساڵی ١٩٢٤دا و بانگ دانی فەرمانڕەوایی عیلمانیی نوێ لە ساڵی ١٩٢٥دا بوونە هۆی بەرپا بوونی یەکەم یاخیبوونی(*)

---

(٥) ((ئاماژەیە بۆ بزووتنەوەکەی شێخ سەعیدی پیران – ع.زەنگەنە)).

گەورەی کورد (لە ڕۆژگاری کۆماریدا– ک. م.). حوکمەتی تورکیا هەرگیز دانی بەوەدا نەناوە کە کورد نەتەوەیەکی جیاوازن، یاخود کەمینەیەکن لە تورکیاداو بەو پێیەش هەمیشە بە توندی دژی هەموو جۆرە بانگەوازێکی پێناسەی جودایی بوون. بزووتنەوە (کوردییەکانی– ک. م.) سیییەکانیش بە توندی لێدران. دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کورد)(*) بە نهێنی لە ساڵی ١٩٦٧دا کە بۆچوونێکی سۆشیالیزمیی بەهێزی هەبوو، وە هاوپەیمانی (پارتی کرێکاران) بوو کە ئەوساکە بە ئاشکرا کاری دەکرد، ڕێگەیان بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی سەربازیی لە ناوچە کوردییەکاندا خۆش کرد. لەوەیش بەدواوە حەفتاکانی (سەدەی ڕابردوو– ک. م.) بەهۆی ڕاگەیاندنی حوکمی عورفییەوە ئاشووبو ئاژاوە ناوچە کوردییەکانی، وەك ناوچەکانی دیکەی تورکیا، گرتەوە. هەرچۆن بێت هەوڵەکانی پارتی کۆمۆنیستی تورکیی نهێنی و ئیزگەکەی لە ئەڵەمانیای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ماندانی ڕقو کینەی کورد لەدەست سەرکوتکردنی سەربازی و ڕەفتاری درندانە لە ناوچە کوردییەکاندا سەرکەوتنێکی کەمی وەدی هێنا. کۆمەڵگای کوردی هەرچەندە بەهۆی نەریتە باوەکانی تۆڵە سەندنی خوێنو قاچاغچێتییەوە هەمیشە هەوارگەی ئاژاوە بووە، بەڵام وا دیارە باری ئاسایشی ناوچەکە دوای کۆدێتا سەربازییەکەی ساڵی ١٩٨٠ بەرەو باشی دەچێت. کوردی تورکیا هەرچەندە هەمیشە هێزێکی بەردەوامی ئاژاوە بوون، بەڵام وا پێ دەچێت زۆربەیان ئامادە نەبن دووی چالاکییەکانی ئەو چەند چەپڕەوە بکەون کە وان لە ڕیزەکانیاندا، یا نەتەوەپەرستیی کوردی ئێرانو عیراق قەبووڵ بکەن.

---

(*) ((ئەو ناوە دەبێ (پارتی دیموکراتی کوردستان لەتورکیا) بێ، لەساڵی ١٩٦٥دا دامەزراوە، هێندەی پێنەچوو ناکۆکی کەوتبووە نێوانیان، ئەوەبوو لەژێر هەمان ناودا بوو بەدوو پارتی و بەهەمان ناو کاریان دەکرد، لەساڵی ١٩٧١دا، کە حوکمی عورفی لەتورکیا دامەزرا، سەرکردایەتی هەردوو لایان هاتنە کوردستانی عیراق، لەو نێوەندەدا هەندێ لە سەرکردایەتییان کوژران، "دوکتۆر شڤان" یەکێك بوو لەکوژراوان، پاش نەمانی حوکمی عورفی لەساڵی ١٩٧٣دا جارێکی دیکە کەوتنەوە کارکردن. هەڤاڵانی "سەعید ئاڵچی" بەناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان تورکیا) دەستیان بەکار کردەوە، هەڤاڵانی (دکتۆر شڤان)یش بەناوی (پارتی دیموکراتی کوردستان لەتورکیا) کاریان دەکرد.

بۆ زیاتر زانیاری لەسەر ئەم باسە بنۆڕە: کوردستانی تورکیا، ١٩٨٣، نووسینی: دلاوەر، وا پێدەچێت کاتی خۆی ئەو نامیلکەیە لەشاخ بڵاوکرابێتەوە ـ ع. زەنگەنە)).

## کوردی یەکیەتی سۆڤیەت:

کورد لەناو یەکیەتی سۆڤیەتدا یەکێك لە کەمینە هەرە بچووکەکانی ئەو وڵاتە پێك دەهێنن، بەڵام وەك نەتەوەیەك ئیعترافیان پێ کراوەو تا ڕادەیەك مافی ڕووناکبیرییان پێ دراوە، هی وەك ئیزگەو پەخش کردنی ڕۆژنامەی کوردیی. کوردی سۆڤیەت پێوەندییەکی ئەوتۆیان بە کوردی دەوڵەتە دراوسێکانی (یەکیەتی سۆڤیەتەوە– ك. م.) نییەو تێکەڵی ئەو خەباتەیان نین کە لە پێناوی ئاواتە فراوانەکانیاندا دەیکەن[52]، ئەوەیش یاریدەی سۆڤیەتی داوە لە هەر کوێ بێت پشتگیریی چالاکییە کوردییەکان بکات، تایبەت ئەوانەیان کە لەگەڵ سیاسەتی سۆڤیەتیدا بگونجێن، وەك پشتگیریی کردنی پارتییە کۆمۆنیستە ناوچەییەکان لەلایەن کوردەوە. ئەمە لە عیراقدا بە ڕوونی هەستی پێ دەکرا، لەوێ ڕووسەکان ساڵەهای ساڵ پێوەندییان بە سەرکردە کوردەکانەوە هەبوو، لە ساڵی ١٩٤٦وە تاوەکو گەڕانەوەی دوای بەرپابوونی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ مەلا مستەفا لەوێ پەنابەر بوو. بەڵام ئەو پشتگیریی کردنەی یەکیەتی سۆڤیەت، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٢وە پێوەندیی لەگەڵ عیراقدا باش بوو، کەمێك ڕووی لە نشێوی کرد.

---

(52) ئەم بابەتە ناو زۆر دەکێشێت و پێویستیی بە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی دوورو درێژە، بەڵام زۆر بە کورتی دەڵێم ئەو کوردانەی سۆڤیەت وەك هەر کوردێکی دڵسۆزی دیکە بۆ کوردو کوردستان بە پەرۆش بوون و بە پەرۆشن: خوالێخۆشبووان دوکتۆر قەناتی کوردۆو جاسمێ جەلیل و عەرەبی شامۆ و دوکتۆر عەسکەروف شامیل سەلیم ئۆغلو و دوکتۆر حسەین عەلی شانۆف (کورد ئوغلو) و لە زیندووانیش، خوا تەمەنیان درێژ بکات، دوکتۆر ئۆردیخانی جەلیل و دوکتۆر جەلیلێ جەلیل و جەمیلەی جەلیلی مۆسیقا ژەن و دوکتۆر شاکرۆی خدۆی مەحموود[*] و دوکتۆر کەرەم ئەنقۆسیی خەڵکی تبلیسی پایتەختی جۆرجیا و گەلێکی دیکە. هەرگیز فرمێسکەکانی خوالێخۆشبوو هەژاری موکریانیی شاعیر لەیاد ناکەم کاتێك چاوی بە کوردی ئەلەگەزی ئەرمەنستان کەوت هەڵیدەڕشتن.

(*) ((لەنێو ئەو ناوانەی لەم پەراوێزەدا لەسەرەوە وەك زیندوو ناویان هاتووە، ئێستا دووانیان کۆچی دواییان کردووە، یەکێکیان د.ئوریخانی جەلیلە، لە ٢٠/١٠/٢٠٠٨دا لە سانت پترسبورگ کۆچی دوایی کرد، (ئازاد عوبێد)ی هاوکارم ئەو ڕۆژەی بۆ دیارکردووم، ئۆردیخان کوردناسێکی کارامە بووە لە پەرتوانامەی وەرگرتووەو کاری کوردناسی کردووە، برای د. جەلیلێ جەلیلە. ئەوەی دیکەشیان د. شاکرۆ خدۆیە و لە ١/٢ /٢٠٠٧دا کۆچی دوایی کردووە — ع.زەنگەنە)).

بارودۆخی بگۆڕی کێشەی کورد دەرفەتی ئەوەی بۆ سۆڤیەت ڕەخساند کەی بیانەوێت بە بیانووی هەڵوێستیانەوە بەرانبەر بە کورد فشار بخەنە سەر ئەو حوکمەتانەی ئەوان ڕقیان لێیان دەبووەوە. سۆڤیەت لە ئێران پشتگیریی خەباتی کوردیان لەپێناو خودموختاریدا کرد، بەڵام هەرچۆن بێت ئاگاداری ئەوەیش بوون پێوەندییان لەگەڵ حوکمەتی شادا تێک نەدەن بەهۆی یاریدەدانی ئاشکرای کوردەوە[53]، بە هەمان دەستوور خۆیشیان لەوە دەپارێزن سەرکردە ئیسلامییەکانی ئێستای ئێران بتوانن تۆمەتی ئەوەیان بدەنە پاڵ کە بە چەك و پارەو زانیاریی سەربازیی یاریدەی کورد دەدەن.

**کوردی سووریا و لوبنان:**

کوردی سووریا دەرفەتی کەمیان بۆ داواکردنی ئۆتۆنۆمی بۆ ڕەخسا، سیاسەتی کاربەدەستانی سووریا لە بوواری بە عەرەب کردندا ناوچە کوردنشینەکانیشی گرتۆتەوە. لەم چەند ساڵانەی دواییدا ناسیۆنالیزمی کوردیی لە سووریا پرسێکی زۆر وەبەرچاو نەبوو، هەرچەندە کورد دژی سیاسەتی بە عەرەب کردن لەو وڵاتەدا وەستاون. سوورییەکان پشتی خەباتی جەلالەددین تاڵەبانی لە عیراق دەگرن.

هەرچی کوردی لوبنانە زۆربەیان پەنابەرن، بەڵام ئەوان ئازادیی دەربڕینیان لە کوردی گشت وڵاتەکانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆرترەو دەنگیان لە ڕێگەی شەبەنگە بەرۆژێکی سیاسییەوە خۆ دەنوێنێت[54]. هەرچۆن بێت کوردی لوبنان هەمیشە مەترسیی ئەوەیان هەیە لەو وڵاتە دوور بخرێنەوە))[55].

---

(53) لە دەقی بەڵگەنامەکە وا هاتووە:

((however, they were careful not to compromise their relations with the Shahis government by giving overt support to the Kurds)) (N.A., F.O., 973/319, The Kurdish Problem, June 1983, Reviced, P.5).

(54) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((They have been allowed a greater degree of self-expression than in other Middle Eastern countries, and are represented across the political spectrum)) (Ibid, P.5),

دوا وشەی ئەو ڕستەیەیش، واتا (spectrum) مانای شەبەنگە بەرۆژە (طيف شمسي).

(55) N.A., F.O., 973/319, The Kurdish Problem, June 1983, Reviced, PP. 1-5.

لە لاپەڕە شەشی ئەم ڕاپۆرتەیشدا خشتەیەکی سەرژمێریی کورد بڵاو کراوەتەوە کە لە گەلێك ڕووەوە جیاوازیی لەگەڵ خشتەی ڕاپۆرتی دووەمدا هەیەو ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی وەرگێڕانەکەیەتی:

((خشتە. گەلێك زەحمەتە ژمارەی دروستی کورد وەدەست بکەوێت، بە دەگمەن سەرژمێرییان کراوەو جیاوازییەکی زۆریش هەیە لەنێوان ئەو ژمارانەی سەرکردە کوردەکان دەیانڵێن و ئەوانەی حوکمەتانی ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدا دەژین دەیانڵێن. ئەم خشتەیەی لای خوارەوە دوا خەمڵاندنی ژمارەی کوردە بە هەردووك پێوانەی زۆرو کەمەوە کە دەستمان پێیدا ڕاگەیشتووە:

| وڵات | بەلایەنی کەمەوە[*] | بەلایەنی زۆرەوە | کۆی دانیشتووانی وڵاتەکان (بەپێی دوا سەرژمێری کە دەستمان کەوتووە) |
|---|---|---|---|
| تورکیا | ٣٢٠٠٠٠٠ | ٨ ملیۆن | ٤٥ ملیۆن (ساڵی ١٩٨١) |
| ئێران | ١٨٠٠٠٠٠ | ٥ ملیۆن | ٣٤ ملیۆن (ساڵی ١٩٨٠) |
| عێراق | ١٥٥٠٠٠٠ | ٢,٥ ملیۆن | ١٢,٢ ملیۆن (ساڵی ١٩٧٧) |
| سووریا | ٣٢٠٠٠٠ | ٦٠٠٠٠٠ | ٨,٩٨ ملیۆن (ساڵی ١٩٨٠) |
| یەکیەتی سۆڤیەت (ئەرمەنستان و جۆرجیاو ئازەربایجان) | ٨٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠٠ | ٣,١٦ ملیۆن (ساڵی ١٩٨١) |
| لوبنان | ٤٠٠٠٠ | ٧٠٠٠٠ | |
| کۆی هەردووك ژمارەی کورد | ٦٩٩٠٠٠٠ | ١٦٤٧٠٠٠٠ | |

١) بەپێی سەرژمێری ساڵی ١٩٦٥ ژمارەی کوردزوبانی تورکیا ٢,٢ ملیۆن بوون.

(*) سەرچاوە: ((کورد، ئامادە کردنی (دەستەی مافی کەمینەکان)، ١٩٨١))[56].

لاپەڕە حەوتی ڕاپۆرتەکە تەرخان کراوە بۆ نەخشەکە. (بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (٢١).

(56)Ibid, P.6.

**چوارەم- شارِاپۆرتی ڕاپۆرتان:**

لێرەدا دەگەینە سەر شاڕاپۆرتی ڕاپۆرتەکان کە بریتییە لە پوختەیەکی وردی مەینەتییەکانی کوردو خەباتی بێ وچانی مانو نەمانیان لە بەرەنگاربوونەوەی فڕتوفێڵە شەیتانییەکانی صەدام حسەیندا[57].

ڕاپۆرتی ئەم جارەمان بریتییە لە شەش لاپەڕە[58] دەربارەی ((کێشەی کورد لە عیراق))[59] کە مایسی ساڵی ١٩٩٢ نووسراوەو سەرەتای ڕاپۆرتەکە بە ڕایەکی تاڵەبانی دەست پێ دەکات کە لە نیسانی ساڵی ١٩٩١دا گوتویەتی:

((کێشەی کورد بریتییە لە هەڵهاتن لەدەست دێوەزمانی تەفروتونا کردن و کۆمەڵکوژی (جینۆساید) و ڕاگواستن)) (جەلال تاڵەبانی، ڕەهبەری یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، نیسانی ساڵی ١٩٩١)[60]، ئەمەی لای خوارەوەیش دەقی (بنۆڕە: پاشکۆی ژمارە (٢٢) وەرگێڕاوی ڕاپۆرتەکەیە:

---

(57) لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی (صەدام حسەین)دا ژمارەیەکی کەم لە مامۆستایانی زانکۆی بەغدا، کە هاوبیر بووینو بڕوامان بە یەکتر هەبوو، جاروبار لەناو خۆماندا سکاڵامان لە دەست وەزعەکە دەکردو باسی پیلانگێڕیی صەدام حسەینمان دەکرد، زوو زوو دوکتۆر ئیبراهیم داقوقی، کە ڕووناکبیرێکی تورکمانیی پێشکەوتنخوازو دۆستی نزیکی کوردە، لای دوکتۆر ئەمین موتابچی و من دەیگوت صەدام حەفتەیەك بەر لە شەیتان لەدایك بووە، منیش لە وەڵامدا پێم دەگوت: دوکتۆر بیکەرە مانگێك. پێم خۆش بوو کە ئەم ڕاپۆرتە پتر لە جارێك ئاماژەی کردووە بۆ فڕتوفێڵەکانی (صەدام حسەین)کە لە هەمووان زۆرتر کورد گیرۆدەی هاتبوون.

(58) بە دەستووری ڕاپۆرتەکانی پێشووی ئەم بابەتە لە پەراوێزی لاپەڕەیەکی ئەم ڕاپۆرتەیشدا هەمان تێبینی نووسراوە کە ((ئەم بەڵگەنامەیە بۆ کاری پەلەی گشتیی ئامادە کراوە و بە هیچ جۆر نابێت وەها لێکبدرێتەوە، یان بەجۆرێك ئاماژەی بۆ بکرێت کە بیروبۆچوونی حوکمەتی (بەریتانی- ك. م.) دەردەبڕێت)).

(59) N.A., F.O., 973/689, Background Brief, Foreign and Commonwealth Office, London, May 1992, The Kurdish Problem in Iraq, 6PP.

(60) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا وا هاتووە:

((The Kurdish Problem is the problem of escaping the gangers of annihilation, of genoside, of deporation)) (Jalal Talabani, Leader of the Patriotic Union of Kurdistan, April 1991) (Ibid, P.1).

((کورد کە ژمارەیان لە پازدە ملیۆن تێدەپەڕێت وەك گەلێکی عەشرەتیی خاوەن کولتورو نەریت و زوبانی خۆیانن و بە لایەنی کەمەوە سێ هەزار ساڵە هەن، بەڵام لەگەڵ ئاواتی زۆری رزگار بونیان لە داگیرکەری بیانی هەرگیز لەژێر ئاڵای یەك سەرۆکدا کۆنەبونەتەوە. کورد بە زۆری لە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری عیراق و باکووری ڕۆژئاوای ئێران و باشووری- ڕۆژهەڵاتی تورکیا دەژین. ژمارەیەکی کەمتریان لە سووریا و دەوڵەتەکانی ناوچەی قەفقاسی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران و لوبنان دەژین. زۆرینەی کورد موسڵمانی سوننی مەزهەبن، بەڵام ژمارەیەکی کەم شیعەی کوردیش لە ئێران و لەوەیش کەمتر لە عیراق هەن. دووبەرەکیی هۆزایەتی لەنێو کورددا هەمیشە قووڵ بووە، ئەوەی حوکمەتە ناوەندییەکان هەمیشە لەگەڵ جیاوازیی سیاسیی نێوان سەرەك هۆزە موحافیزەکان و چەپڕەوە ڕادیکاڵەکاندا دەیانقۆزنەوە. کۆسپێکی دیکەی گەورە لەبەردەم یەککگرتنی ڕیزەکانی کورددا تەشەنەسەندنی نەخوێندەواری و جیاوازیی دیالێکتەکانی زمانەکەیانە.

**ئاواتی ئۆتۆنۆمی:**

زۆربەی کورد، بە درێژایی سەدەکانی حەڤدە تا بیست، لەلایەن ئیمپراتۆریی عوسمانییەوە حوکم دەکران، هەرچەندە بەشێکی وەبەر چاویشیان لە ئێرانن. دوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئیمپراتۆریەتە پاش تەواو بوونی جەنگی یەکەمی جیهان بەپێی (پەیمانی سێڤەر)ی تەسدیق نەکراو لەنێوان هاوپەیمانان و سوڵتانی عوسمانیدا مافی ئۆتۆنۆمی درایە ناوچە کوردنشینەکان لەگەڵ ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆدا. لەگەڵ ئەوەیشدا پەیمانی ناوبراو لەلایەن تورکیای کەمال ئەتاتورکەوە زیندەبەچاڵ کراو چواری تەمموزی ساڵی ١٩٢٣ پەیمانیی ئاشتیی لۆزان لەنێوان هاوپەیمانان و تورکیادا جێگەی گرتەوە، ئەو پەیمانەی هیچ ئامارەیەکی بۆ کوردستان تێدا نەبوو. دوای ئەوە کوردستان دابەش بوو لەنێوان تورکیا و وڵاتی فارس (ئێران) و هەردووك دەوڵەتی تازە دامەزرێنراوی سووریا و عیراقدا. بەڵام تا ئەو لیژنە تایبەتییەی (کۆمەڵەی گەلان) پێکیهێنابوو

بڕیاری نەدا کە ویلایەتی موسڵ، بە زۆرینەی کوردەکەیەوە، دەبێت بخرێتە سەر عێراق سنووری نێوان تورکیا و عێراق بەپێی پەیمانی بەریتانی- تورکی- عێراقیی پێنجی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٦ دەستنیشان نەکرا.

شەستەکان و حەفتاکانی (سەدەی بیستەم- ک. م.) (پارتی دیموکراتی کوردستان) بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزان (شۆڕشێکی- ک. م.) دژی حوکمەتی بەغدا بەرپا کرد لەپێناو خودموختاریی کوردی عێراقدا. یاخیبوونی کورد لە ساڵی ١٩٦١وە دەستی پێ کردو بە درێژایی شەستەکان شەڕی گەرم لەنێوان هەردووك لادا بەرپا بوو، هەرچەندە ساڵی ١٩٦٨ حوکمەت دانی بە بوونی نەتەوەیی کورددا لە دەستووری کاتیی عێراقیدا نابوو، بەڵام دەسەڵاتدارانی عێراق ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە لەوانەیە سەرکەوتنەکانی کورد ببنە هۆی داگیرکردنی ناوچەی کانە نەوتەکانی دەوروبەری کەرکووك. مانگی مارتی ساڵی ١٩٧٠ ڕێککەوتننامەیەکی پازدە خاڵی لەنێوان سەرکردایەتی کوردو (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش) (مجلس قيادة الثورة)دا مۆر کرا (ئەوساکە[61] صەدام حسەین جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕش بوو، بەڵام یەکەم دەسەڵاتداری ناو ڕیزەکانی پارتی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیزم بوو، ساڵی ١٩٧٩ بووە سەرەك کۆمار). (ناوەرۆکی سەرەکی ئەو ڕێککەوتننامەیە-ک.م.) کە دەبوو لە ماوەی چوار ساڵدا جێبەجێ بکرێت بریتی بوو لە:

* کورد بەشداریی تەواو لە دەزگا مەدەنییەکانی میری و سوپادا بکاتو یەکێك لە جێگرانی سەرەك کۆماریش کورد بێت.

* دە بێت فەرمانبەرانی کورد ئەو ناوچانە بەڕن بەڕێوە کە زۆرینەی دانیشتوانیان کوردن.

* دەبێت ڕێژەیەکی عادیلانە لە داهاتی ئابووریی وڵات بدرێتە ناوچە کوردییەکان.

* دان بە نەتەوەی کوردو کوردیی وەك زمانێکی فەرمیی ناوچە کوردنشینەکاندا دەنرێت، هەروەها زمانی عەرەبیش.

* پێویستە سەرژمێرییەك بکرێت بۆ دیار کردنی ئەو ناوچانەی زۆرینەیان کوردن.

---

(61) ئەو ڕستەیە لە بەڵگەنامەکە خۆیدا بەو جۆرە خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە.

دواییش دەرکەوت ڕێککەوتننامەی مارتی ١٩٧٠ پاشکۆ (پرۆتۆکۆڵ)ێکی نهێنی لەگەڵدا بوو دەربارەی هێزە چەکدارەکانی کورد (پێشمەرگە) و چەك داماڵینی ئەو کوردانەی دژیانن (واتا جاشەکان– ك. م.) و مافی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بۆ کارکردنی ئازاد لە ناوچە کوردنشینەکاندا و جێبەجێ کردنی سەرژمێرییەکە لە ماوەی ساڵێکدا. دوای تێپەڕ بوونی چوار ساڵ بەسەر مۆرکردنی ڕێککەوتننامەکەدا حوکمەت یەك لایەنیی یاسایەکی ئۆتۆنۆمیی ڕاگەیاند و گوایە ڕێککەوتننامەکە بەو جۆرە جێبەجێ کرا، بەڵام لە ڕاستیدا لەو کارەیدا سەرکەوتوو نەبوو.

تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٤ لە هەولێر (ئەنجوومەنی یاسادانان) دامەزرێنرا، بەڵام کورد چ ئەمەو چ بڕیارەکانی دیکەی میرییان ڕەت کردەوە چونکە داواکانیانی وەبەرچاو نەگرتبوو، تایبەت ئەوانەیان کە پێوەندییان بە نوێنەرایەتی کوردەوە لە حوکمەتدا هەبوو. کوردێك کرایە جێگری سەرەك کۆمار[62]، بەڵام دەسەڵاتی کەمەو لەلایەن کوردیشەوە بەچاوی نوێنەری ڕاستەقینە سەیر ناکرێت. هەروەها هیچ هەنگاوێکیش لە بواری سەرژمێری کردنەکەدا بۆ دیاری کردنی ئەو ناوچانەی زۆرینەیان کوردن نەنرا. بەو جۆرە شەڕ دەستی پێ کردەوەو ئێرانیش ئەو دەرفەتەی قۆستەوە بۆ لاواز کردنی ڕژێمەکەی صەدام حسەین لە ڕێگەی یاریدەدانی مادیی کوردەوە. حوکمەتی عیراقی دەستی کردە ڕاگواستنی دەیان هەزار کورد لە زێدی خۆیان تایبەت بۆ ناوچەکانی باشووری عیراق، وەك دەڵێن سەدان گوندیش کاول کران بەپێی سیاسەتی (الارض المحروقة)[63] تا جارێکی دیکە دانیشتووانی ئەو گوندانە نەتوانن بگەڕێنەوە ناویان. ڕژێم دەیەویست لەو ڕێگەیەوە توانای بنەمای پێشمەرگەی کورد هەڵتەکێنێت و هەستی یەکیەتی نەتەوەیی لای کورد بسڕێتەوە تاوەکو ڕێگە خۆش ببێت بۆ پەرەسەندنی هەستی یەکیەتیی نیشتمانیی عیراقی (شعور الوحدة الوطنية العراقية) لە ڕیزەکانیاندا.

---

(62) مەبەست تەها محي الدين مەعروفە.

(63) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا واهاتووە ((Scorched earth policy)) کە دەقاو دەق (سياسة الارض المحروقة) دەگەیێنێت، پێم وایە لە کوردیدا زاراوێکی وامان نییە.

سالّی ۱۹۷٥، که ڕێککەوتننامەی جەزائیر مۆر کرا[64]، شا بەرانبەر جێبەجێ کردنی عیراق بۆ داخوازییە سنوورییەکانی ئێران لە یاریدەدانی کوردی عیراق وەستا، ئەوەی بووە هۆی هەرەس هێنانی یاخیبوونەکەی کورد. دوابەدوای ئەوە حوکمەتی عیراق پرۆژەیەکی ئاوەدانیی لە ناوچە کوردنشینەکاندا دەست پێ کردو کەوتەوە دابەش کردنی زەوی‌و ڕێگە درا بە چل هەزار کوردێك لەوانەی بەزۆر ڕاگوێزرابوونە باشوور بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، ئەیلوولی سالّی ۱۹۸۰یش هەلّبژاردنێکی نوێ بۆ دانانی پەنجا ئەندامی (ئەنجوومەنی یاسادانان)ی ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کورد کرا.

سالّی ۱۹۷٥ پارتێکی سەرەکیی موعاریزی کوردیی دیکە بە ڕەهبەریی جەلال تالّەبانی بە ناوی (یەکێتی نیشتمانیی کوردستان)ەوە دامەزرا، لەبەر ئەوە ئەندامانی بەشێك بوون لە (پارتی دیموکراتی کوردستان). (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) سەیری خۆیان وەك پارتییەکی چەپڕەوترو شارستانیترو مۆدێرێنتر (نوێخوازتر) دەبینی وەك لە (پارتی دیموکراتی کوردستان). لە دوا سالآنی حەفتاکانی (سەدەی ڕابردوودا– ك. م.) (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) مەیلی بەلای بەغدادا دەشکایەوە، بەلآم هەر ئەوساکە شان بەشانی (پارتی دیموکراتی کوردستان) چەکیان دژی هەلّگرت کاتێك دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان عیراق و ئێرانیان بەدەرفەت زانی بۆ دامەزراندنی ئەو ئۆتۆنۆمییەی خۆیان دەیانویست. تەمووزی سالّی ۱۹۸۳ (پارتی دیموکراتی کوردستان) توانیی، بە یاریدەی ئێران و شیعە یاخیبووەکانی عیراق، ناوچە شاخاوییەکانی حاجی ئۆمەران، کە شەش کیلۆمەتر لە سنوورەوە دوورەو هەشت سالّ لەوەوبەر لە کیسیان چووبوون، ئازادیان بکەنەوە.

---

(64) وەك قوتابیی زانکۆ، لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا، ئاگاداری ئەوە بووم چۆن نیشتمانپەروەرانی کورد بەپێی توانا پشتی خەباتی گەلی جەزائیریان دەگرت، بەلآم دوای ڕێککەوتننامەی جەزائیری سالّی ۱۹۷٥ بومیدیانی سەرەك کۆماری ئەو ولآتە بە ڕادەیەك لەبەرچاوی کورد کەوت کە مردنەکەیان بە تۆلّەی کورد لە قەلّەم دەدا، گەلێك جار لە خەلّکی دلّپڕی سادەی کوردم دەبیست دەیانگووت: خواوەندی گەورە لە ئاهی کورددا بومیدیان و شای بردەوە، ماوەتەوە سەر صەدام حسەین.

## تەکتیکەکانی صەدام:

لە قۆناغە دژوارەکاندا صەدام حسەین هەوڵی دەدا لە ڕێگەی وتووێژەوە کورد دڵنیا بکات، ئەو وتووێژەی هەر کات بۆ ئەم لا یا ئەولا دەستی نەدەدا دەوەستا: گفتوگۆ لەگەڵ (یەکێتی نیشتمانیی کوردستان)، کە یەکێکە لە دوو دەستە سیاسییە هەرە بەهێزەکەی کورد، کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣ دەستی پێکرد (واتا لەو کاتەدا کە عیراق کەوتبووە گێژاوی ئەوەوە چۆن بتوانێت سەرچاوەی یاریدەی سەربازی وماڵی بۆ جەنگەکەی لەگەڵ ئێراندا بدۆزێتەوە)، بەڵام ئەو گفتوگۆیە پاش چەند مانگێکی کەم ڕوخا، هەرچەندە بە شێوازێکی پچڕ پچڕ تاوەکو کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٥ بەردەوام بوو.

(یەکێتی نیشتمانیی کوردستان) داوای دەکرد ئەو هەشت هەزار خێزانە کوردەی ڕاگوێزرابوونە باشوور بگەڕێنەوە زێدی باووباپیرانیان و گشت بەندە سیاسییەکان ئازاد بکرێن و هێزەکانی ئاسایشی ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەدەست ئەوانەوە بێت و سەرجەمی ناوچە نەوتییەکانی دەوروبەری کەرکووك بخرێنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی و ڕێژەیەکی دیاریکراو لە داهاتی نەوت بدرێتە ئەو ناوچەیە. هەروەها داواشی دەکرد (جاش)[65] واتا ئەو هێزە نافەرمییانەی (دەستەی سووکەڵە- الافواج الخفيفة)یان پێك دەهێناو کاریان بۆ حوکمەتی بەغدا دەکرد حەل بکرێن. جاشایەتی بووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە هۆزەکانی باکووری عیراق ببنە یاریدەری فەرمیی ڕژێم لە ساڵانی جەنگی نێوان عیراق و ئێراندا.

بەهۆی نزیککەوتنەوەی نێوان (پارتی دیموکراتی کوردستان) و (یەکێتی نیشتمانیی کوردستان)ەوە ساڵی ١٩٨٧ هەنگاوی باشی بەخۆیەوە بینی لە بواری یەك ڕیزیی هێزە سیاسی و سەربازییەکانی کورددا، دواجاریش لە دروستبوونی بەرەی نیشتمانیی یەکگرتووی کوردستاندا کە پێنج پارتیی سەرەکیی کورد لەژێر سایەیدا کۆبوونەوە. بەڵام ساڵی ١٩٨٧ هەر ئەوەندە فشاری ئێران بۆ سەر باشووری عیراق کەم بۆوە صەدام حسەین ڕووی کردە باکوور بۆ سزادانی کورد

---

(65) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە هاتووە: "jash".





صەدام حسێن

لەسەر هاریکارییان لەگەڵ ئێراندا. عەلی حەسەن مەجیدی[66] ئامۆزای صەدام، کە بووە وەزیری جەنگ، جێبەجێ کردنی ئەو سیاسەتە تۆقێنەرەی گرتە ئەستۆ. وا مەزەندە دەکرێت تەنها ساڵی ١٩٨٨ سێ هەزار گوندی کورد کاول کرابێت. نزیکەی لە سەدا سیی (٣٠٪) ناوچە کوردنشینەکان کەسیان تێدا نەهێڵرا. گەلێك کوردی وەك ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی هۆزی بارزان بە خۆفرۆش دانران و لەناو بران، کوردی دیکە ڕاگوێزرانە کامپە زۆرەملێیەکان لە باشووری عێراق. دواتر زۆربەی کوردی گوندە کاولکراوەکان ڕاگوێزرانە کامپەکانی باکووری عێراق، چونکە لەو کامپانەدا ئاسانتر دەستی حوکمەتیان دەگەیشتێ وەك لە گوندەکانی ناوچە شاخاوییەکاندا. پتر لە شەست هەزار سەرباز تەرخان کران بۆ هێرشێکی دڕندانە دژی چەکدارە یاخیگەرو سیڤیلەکان، کەوتنە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژیان کە هەڵەبجە یەکێك لەو کارەساتانەی کیمیاباران بوو کە دەنگێکی زۆری دایەوە، لە هەڵەبجە نزیکەی پێنج هەزار کەس، کە زۆربەیان ئافرەتو منداڵ بوون، بە گاز خنکان. بەپێی ژمارەیەك ڕاپۆرت دەیان گوندی دیکە کیمیاباران کرانو هەزاران کەس بەگاز خنکان.

---

(66) لەناو کورددا هەر بە عەلی کیمیاوی ناسراوە.

ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٨ (نیشتەجێ کردنەوە)[67] هێندەی دیکە پەرەی سەند. هێزە چەکدارەکانی عیراق ناوچەیەکی ئارام (ئەمنی) (security zone)یان بە پانایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لەسەر هەردووك سنووری تورکیا و ئێران دروست کرد، ساڵی دواتر نزیکەی سێ سەد هەزار کەسی ئەو ناوچەیە ڕاگوێزران و دەزگاکانی میری دەیانگوت گوایە ئاسانکاریی باشتریان بۆ دەکرێت.

بەو جۆرە لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا هەزاران کورد ((ون))[68] بوون. بەپێی ڕاپۆرتێکی ((ڕێکخراوی عەفوی نێودەوڵەتی)) گروپە بێ لایەنەکانی مافی مرۆڤ کە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٠ ڕایانگەیاندووە لە ساڵی ١٩٨٨وە ژمارەی لەناوبراوان و لەسێدارە دراوانی کورد ڕووی لە زێدەبوون کردووە. ژمارەیەك لەو قوربانییانە بریتین لەو کوردانەی بەپێی زنجیرەیەك بڕیاری لێبووردنی حوکمەتەوە گەڕابوونەوە.

تەنانەت ئەو کوردانەی عیراق کە زۆر فشاریان نەدەخرایە سەر جیاوازگەریی مافی سیاسیی و ئابووری دەیگرتنەوە. پاڵێوراوانی هەڵبژاردنی ((ئەنجوومەنی یاسادانان)) لە لایەن میرییەوە دەستنیشان دەکران و خودی ئەنجوومەنەکەیش یەکێك بوو لە بووکە سەماکەرەکانی ڕژێمی صەدام[69].

تاوەکو دۆزینەوەی نەوت لە باشووری عیراق لە ساڵی ١٩٦٩دا، باکووری عیراقی کوردیی بە بەرهەمی نەوتو کشتوکاڵەوە سەرچاوەی بەشی هەرە زۆری سامانی عیراق بوو، تاوەکو ئێستایش هەر لەوێ بەشێك لە نەوتی عیراق وەبەرهەم دەهێنرێت.

---

(67) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بەو جۆرە وشەی نیشتەجێ کردنەوەکە ((resettlement)) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی پچوکەوە کە دیارە گاڵتە پێکردنە بەو زاراوەیەی بیووە وێردی سەر زوبانی عەلی حەسەن مەجیدو یاوەرو هاوڕەوشتانی.

(68) لە دەقی بەڵگەنامەکەدا بە هەمان جۆر وشەی ون بوونەکە ((disappeared)) خراوەتە نێوان دوو جووت کەوانی بچوکەوە کە دیسانەوە گاڵتە پێکردنێکی ئاشکرایە بە ڕەفتارو کردارەکانی ڕژێمی بەعس لەگەڵ کورددا.

(69) لە دەقی ڕاپۆرتەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

((and the Council is widely viewed as a puppet of Sadams regime))

وشەی ((puppet))یش دەقاو دەق بووکەسەماکەرەیە.



کیمیایی بۆ..!؟

ڕژێم هەوڵی دا لە ڕووی ئابوورییەوە ناوچە کوردنشینەکان ناچار بکات پشت بە بازاڕی بەغدا ببەستن و چالاکیی ئابووریی ناوچەیی (کوردستان– ک. م.) هەڵتەکێنێت. حوکمەت نەیدەویست سەرژمێری بکات چونکە لەوە سڵی دەکردەوە کوردو (تورکمانیش)[70] زۆرینەی دانیشتوانی کەرکووکی خاوەن نەوت دەربچن و بەو جۆرەیش هۆکانی ئەوەی کەرکووك بخرێتە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمیی کورد بەهێزتر دەبوون. حوکمەت گەلێك خێزانی عەرەبی عێراق و (تەنانەت لە خێزانی نەتەوەکانی دیکەشی) لە باشوورەوە هێناوەتە کەرکووك بۆ کەم کردنەوەی ڕێژەی کوردو تورکمان (ئەو تورکمانانەی کەمینەیەکی ناوچەیین کە چەند سەدەیەك لەمەوبەر هاتوونەتە ئێرە)[71].

---

(70) لە دەقی ڕاپۆرتەکەدا بەو جۆرە ناوی تورکمان خراوەتە نێوان دوو کەوانی گەورەوە. بۆ درێژەی بابەتی تورکمانی کەرکووك و دەوروبەری بڕوانە: كمال مظهر أحمد، كركوك و توابعها. حكم التأريخ والضمير. دراسة وثائقية عن القضية الكردية في العراق، الجزء الاول، ص ٨٣–٩٤.

(71) لە دەقی ڕاپۆرتەکەدا بەم جۆرە هاتووە:

**ئاڵوگۆڕەکانی ئەم دواییانە:**

دوای هێرشی سەر کوێت لەلایەن عیراقەوە لە ئابی ساڵی ۱۹۹۰داو ڕاووداوونانی سوپای عیراق لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە، ناوچەیەکی فراوانی شیعەنشینی باشووری عیراق، تایبەت لە دەوروبەری بەسرە، وێڕای ناوچەیەکی شیعەنشینی فراوانی نێوان بەسرەو بەغدا کۆتایی شوباتی ساڵی ۱۹۹۱ دژی حوکمەتی ناوەندی یاخی بوون. صەدام حسەین پاشماوەکانی سوپای ئاراستەی ئەو ناوچانە کرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی بارودۆخەکەو هەمان کاتیش دەستی کردە کێشانەوەی هێزی دیکە لە بنکەکانی باکوورەوە. گروپە ناحەزە کوردەکانی ڕژێم ئەمەیان بە دەرفەت زانی بۆ بەرپاکردنی یاخیبوون، ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە پشتگیرییان کردن‌و جاشەکان و سەرکردەکانیشیان بڕیاریان دا لە ڕژێمی بەغدا هەڵگەڕێنەوە[72].

شان بەشانی گیرۆدە بوونی ڕژێم لە هەر چوار لاوە کورد پێشکەوتنی گەورەی هێنایە دی، دەستیان گرت بەسەر گەلێك ناوچەی باکووری ڕۆژهەڵاتی عیراقدا بە شارە گەورەکانی وەك هەولێرو سلێمانی و دهۆك و بۆ ماوەیەکیش کەرکوك. بەڵام دوای ئەوەی حوکمەت توانیی یاخیبوونەکەی باشوور سەرەونگوم بکات هێزەکانی ئاراستەی باکوور کرد. دەرفەتی بەرهەڵستی کردنی (ئەو هێرشە– ك. م.) بە چەکی سووك کارێکی ئاسان نەبوو، بۆیەکا میری تاوەکو سێی نیسان توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر زۆربەی باکووردا داسەپێنێتەوە. بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە ناچار بوون لەژێر فشاری چڕی هێزەکانی میری بە هیلیکۆپتەرو تانك‌و ڕۆکێت‌و تۆپی قورس ماڵەکانیان چۆڵ بکەن.

نزیکەی ملیۆن و نیوێك کوردو عیراقیی دیکە ماڵ‌و حاڵی خۆیان جێهێشت‌و پەنایان بردە بەر ناوچە شاخاوێکانی عیراق‌و تورکیا و ئێران و ژیانێکی یەکجار سەختیان دەبردە سەر، ڕۆژانە گەلێکیان لە سەرمانا ڕەق هەڵدەهاتن و لەبرساناو

---

((and Turcomans (a regional minority which moved into the area some centuries ago) )).

(72) دەمێکە پرۆژەیەکی زانستیم بە دەستەوەیە بۆ هەڵسەنگاندنی جاشایەتی لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورددا، ڕۆژانی ئەو ڕاپەڕینەی کوردستان لە سلێمانی بووم، بەچاوی خۆم دەمدی ئەوانەی ناونراون جاش چۆن بە گەرمی ڕووی چەکەکانیان ئاراستەی بنکەکانی ڕژێمی صەدام حسەین دەکرد.

لەبەر هۆی دیکە دەمردن، شەوانە جیهانیش لە ڕێگەی تەلەڤزیۆنەوە ئەو مەینەتییەیان بەچاوی خۆیان دەبینی[73]. کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەستوبرد کەوتە خۆو لەسەر پێشنیاری سەرەك وەزیرانی بەریتانی (پەناگەی ئەمین) (الملجأ الامن)[74] دانراو ژمارەیەك هەوارگە (مخیم) لە باکووری عیراق بۆ لێقەوماوان، تایبەت هی کورد، دروست کران و پاراستنیان لە هێرش دابین کرا. نەتەوە یەکگرتووەکان تیمێکی فریاگوزاریی دامەزراند، کە لە نزیکەی نۆسەد کەس پێکهاتبوو، بۆ دابەش کردنی خۆراك و چاککردنەوەی پرۆژەکانی ئاوو تەندروستی و ئاوەڕۆو بەو جۆرەیش هەزاران کەس لە مەرگ قوتار کران.

هێزە ئاسمانی و ئەرزییەکانی بەریتانیا و دانیمارك و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و تورکیا و فەرنسا پاراستنی ئەو پرۆژانەیان گرتە ئەستۆ، ئەمەیش چارەسەرێکی کاتیی بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێویستییە پەلەکانی پەنابەرەکان. ئامانجی سەرەکیی ئەم کارانە ئەوەبوو لێقەوماوەکان لە دواڕۆژی خۆیان دڵنیا بن تاوەکو دوایی بتوانن لە شاخەکانەوە بگەڕێنەوە سەر ماڵو حاڵی خۆیان. عیراقییەکان یادداشتێکیان لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا مۆر کرد دەربارەی ڕێگەدان بە دامەزراندنی (پەناگەی ئەمین) و کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩١ ماوەی کارپێکردنی ئەو یادداشتە بۆ شەش مانگی دیکە درێژ کرایەوە.

لە مارتی ساڵی ١٩٩١ەوە ڕژێمی عیراقی دەستپێشکەریی کرد بۆ دەست پێکردنەوەی وتووێژ لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا و پێشنیاری کرد ئۆتۆنۆمی لەسەر بنەمای ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٧٠ بدرێتە کورد. صەدام حسەین دەرکی ئەوەی کردبوو کە لەو کاتی لاوازییەدا پێویستە لەگەڵ کورددا ڕێك بکەوێت. شەرمەزاریی پەناگە ئەمینەکانی لێقەوماوانی کورد پاڵی دەنا بە صەدام حسەینەوە هەوڵ بدات نەتەوە یەکگرتووەکان قایل بکات واز لە بڕیارەکانی دەربارەی سزا دانی عیراق بهێنێت، هیوایشی وابوو هێزە نێودەوڵەتییەکانی پاراستنی باکوور دەست لە

---

(73) لە فەرهەنگی سیاسی هاوچەرخی کوردیدا ئەو کارەساتە کەم هاوتایەی مێژوو ناونراوە: ((کۆچ و ڕەوی ملیۆنی)).

(74) کارەساتە دڵتەزێنە کەم وێنەکانی کوردستان بوونەتە هۆی دارشتنی زاراوی نوێ لە بواری مێژوونووسیی و سیاسیی جیهانیدا، هی وەك ((پەناگەی ئەمین)).

کارەکانیان هەڵبگرن و هەوڵی دەدا بگاتە ڕێککەوتننامەیەك بەپێی مەرجەکانی خۆی لەگەڵ کورددا.

ڕەهبەرانی کورد پێشنیاری دەستپێکردنەوەی وتووێژیان پەسەند کرد بەو جۆرە وتووێژ لە بەغدا دەستی پێکردەوە. (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بە پەرۆشتر بوو بۆ ئەو وتووێژە. بەپێی تەکتیکی صەدام دەبوو فشاری سەربازی و ئابووری لەسەر کورد بەردەوام بێت لەکاتی وتووێژ لەگەڵ ڕەهبەرانی سیاسیی کورددا کە بێگومان دەیویست لەو ڕێگەیەوە ناچاریان بکات یا بگەڕێنەوە باوەشی حوکمەت، یا بە ئۆتۆنۆمییەکی نیوەو نیوەچڵ قایل بن.

پایزی ساڵی ۱۹۹۱، کاتێك بەغدا بەشێك لە ئابڵۆقە ئابوورییەکانی خستەوە سەر ناوچە کوردنشینەکان، مەسعوود بارزانی گفتوگۆی وەستاند، بەڵام هەمان کات (پارتی دیموکراتی کوردستان) ڕایگەیاند ئامادەیە بێتەوە سەر مێزی وتووێژ کاتێك میری ئەو ئابڵۆقە ئابوورییە دەوەستێنێت. مووچەی زۆربەی کارمەندە کوردەکانی باکوور وەستێنرا، فەرمانبەرە گەورەکانی وەك پارێزگا و پاشماوەکانی سوپای عیراقی لەگەڵ دەستپێکردنەوەی ئابڵۆقە ئابوورییەکەدا ناوچەکەیان جێ هێشت، مووچەی تەقاویتی و گشت پرۆژە خزمەتگوزارییە گشتییەکانی (ئەو ناوچانە– ك. م.) وەستێنران[75]. هەروەها بەغدا بە ڕێژەیەکی زۆر هەناردنی خۆراك و سووتەمەنیی بەپێی نرخی میری بۆ ناوچە کوردنشینەکان کەم کردەوە. سوپای عیراقی گشت ئەو ڕێگە و بانانەیان بە خاڵی پشکنین تەنین کە دەچوونە باکوور، هەموو ئوتومبیلێك دەپشکنن و خواردەمەنی و سووتەمەنی و کەلوپەلی دیکە زەوت دەکەن، بۆیەکا سەردارە کوردەکان ناچارن ئەو هەنگاوانە بنێن کە پێویستن بۆ پێکەوەنانی ئابوورییەکی سەربەخۆ، دەستوبرد خاڵی پشکنین لەلایەن کوردیشەوە دانران، تایبەت ئەو ئوتومبیلانەی لە تورکیاوە دێن و ئەوێ دەبڕن[76]. عیراقییەکان

---

(75) ئەو بارودۆخە ناهەموارە ژمارەیەکی زۆر کوردی دیکەی عیراقیان ناچار کرد لە برسانا پەنا بەرنە بەر وڵاتە ڕۆژئاواییەکان.

(76) ئەو خاڵی پشکنینانە لەلایەن کوردەوە دوای ئەوە دامەزرێنران کە ڕژێمی بەعس شوولی لێ هەڵکێشاو کار گەیشت بەوەی دەیان ئوتومبیلی بەمین چێنراو (سيارات مفخخة) بنێرنە شارەکانی کوردستان، تەنانەت بەشێك لەو ئوتومبیلە بەمین چێنراوانە لە تورکیا و سووریاوە دەهاتنە کوردستانی باشوور.

به پێچەوانەی بەندەکانی بڕیاری ژمارە ٦٨٨ی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ڕەفتار دەکەن کە دەبێت دەست لە چەوساندنەوەی کورد هەڵبگرن و هاریکاریی دەزگا مرۆڤییەکان بکەن. پۆلیسی عیراقی لە باشوور تەنانەت لە جارانیش خراپتر ڕەفتار لەگەڵ شیعەکان دەکەن.

مانگی مایسی (ساڵی ١٩٩٢– ك. م.) هەڵبژاردنی ناوچەیی لە باکووری عیراق بۆ دەستنیشانکردنی ڕەهبەرێکی کوردی و ئەنجوومەنێکی نوێنەران دەکرێت بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری یەکخستنی پێشمەرگە لەژێر سەرکردایەتییەکدا. بەو بۆنەیەوە (پارتی دیموکراتی کوردستان) ڕایگەیاند کە هەڵبژاردنەکە لەبەر ڕۆشنایی ڕێککەوتننامەی مارتی ساڵی ١٩٧٠دا ڕادەگەیێنرێت بۆ دەستنیشان کردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی نەك حوکمەتێکی جیاواز.

ئاواتی صەدام حسەین ئەوەیە کوردی باکووری عیراق بهێنێتەوە ژێر ڕکێفی حوکمەتی ناوەندی بێ دەست تێوەردانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بەڵام هاوپەیمانان بنکەیەکی ئاسمانییان لە باشووری تورکیا هەیە بۆ پاراستنی دانیشتووانی باکووری عیراق، نەتەوە یەکگرتووەکانیش بەردەوامە لەسەر سەرفی بەشی زۆری خەرجی ئەو کارانە لە عیراق‌و بەریتانییەکانیش لە نیسانی ساڵی ١٩٩١وە پەنجا ملیۆن پاوەنی ئەو خەرجە دەدەن))[77].

لە کۆتاییشدا دەڵێم نازناوی ((شا ڕاپۆرتی ڕاپۆرتان)) پڕ بەپێستی ئەم دوا ڕاپۆرتەیە، نرخی بێ ئەندازە بەرزی ئەم ڕاپۆرتە لەوەوە هاتووە کە دانەرانی وەك مێژوونووسێکی کوردی بێ لایەن، یان بە دەستووری پێشکەوتنخوازێکی ڕەسەنی عیراقیی وەك دادوەر زوهێر کاظم عەبود عەوداڵی ڕاستییەکانن، پێم وا نییە کەسمان لەو بڕوایەدا بووبین کە ڕۆژئاواییەکان بەم ڕادەیە بە پەرۆشن بۆ دەربڕین‌و تۆمار کردنی ڕاستییەکان وەك خۆیان چۆنن بەو جۆرە. بریا کاتی خۆی دەقی ئەم ڕاپۆرتە دەست دادوەر ڕەوف ڕەشیدو مودەعیی گشتی جەعفەر موسەوی و جێگری مودەعیی گشتی مونقیز ئەلفرعەون دەکەوت تاوەکو کاتی دادگایی کردنی صەدام حسەین و عەلی حەسەن مەجیدو دەستەو دایەرەکەیان پێشکەشیان دەکرد.

---

(77) N.A., F.O., 973/687, Background Brief, Foreign and Commonwealth Office, London, May 1992, The Kurdish Problem in Iraq, PP. 1-6.

# شاهیدی بێدەنگیی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد

مێژوونووسەکان دەڵێن: (مێژوو) بەبێ هەبوونی بەڵگەنامەی نووسراو جێی متمانەو بڕوا نابێت، ئەگەر جاران ئەو بۆچوونە پاساوی خۆی هەبووبێ، ئەوا لەئەمڕۆی سەردەمی ئینتەرنێت و تەکنۆلۆژیا ئەوە قوڵتر بۆتەوە. لەم سەردەمەی ئێمەشدا (وێنە) جۆرێکی دیکەیە لە بەڵگەنامە، بەڵکو لەزۆر لایەنەوە لەبەڵگەنامەی نووسراو پڕ وردەکارترەو تەنانەت تێیشی دەپەڕێنێت.

ئەوەتا کاتی خۆیشی (شەرەفخانی بەدلیسی) کە کتێبی (شەرەفنامە)کەی نووسیوە کۆمەڵێك تابلۆی لەگەڵ داناوە. وادیارە مێژوونووسانمان ئەوسا هەستیان بەبایەخی ئەو تابلۆیانە نەکردبوو و درەنگتر تێیگەیشتوون، بۆیە نەیانخستبووە دووتوێی لاپەڕەکانی وەرگێڕاوی (شەرەفنامە)کەی هەژار و چاپە عەرەبییەکەی محەمەد عەلی عەونی و دواتریش چاپی یەکەمی عەرەبییەکەی مەلا جەمیل رۆژبەیانی، ئەوەبوو دواتر (عەبدولڕەقیب یوسف) کارێکی زۆر باشی کرد کە ئەم میناتۆرانەی پەیداکردن، لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەك و لێکدانەوەی تابلۆیەکان هەمووی چاپ کردن. دیارە بیانییەکان، بەماوەیەکی زۆر بەر لەئێمە، هەستیان بەگرنگی و بایەخی وێنە کردووە، هەر بەنموونە (مێجەر نۆییڵ) بەدەیان وێنەی کوردانی لەگەڵ ڕۆژانەکانی داناوە، هەروەها ئەرشیفخانەی بەریتانیاش، وەکو دکتۆر کەمال لەم کتێبەدا ئاماژەی بۆ کردووە، پتر بایەخی بەوێنە داوە، هەر بیانییەکانن، لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا، بەر لە خۆمان، بایەخیان بەوێنەی کوردان داوە. ئەوەتا بەم دواییانە (سۆزان مەیسیلاس)ی ئەمەریکی لەژێر ناوونیشانی (کوردستان لەسێبەری مێژوودا) کتێبێکی وێنەداری پڕ گرنگی لەسەر کورد دەرکردووە.

لەئەمڕۆی ئێمەدا نامەی ماستەرو تێزی دکتۆراکان، لە هەر بوارێکی مێژوودا بن، بایەخێکی باش بە (وێنە) دەدەن. کاتی خۆیشی من، لەکاتی ئامادەکردنی بەرگی دووەمی کتێبی (چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد)، هەوڵم دابوو زۆرترین ژمارەی وێنە، بەپێی پێویست، بەسەر لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا دابەش بکەم، ئەوەبوو وێنەکان شوێنی خۆیان گرت.

لەم کتێبەشدا ئەوەندەی بۆم چووەتە سەر درێغیم لەدانانی (وێنە) لە ناوەوەی کتێبەکەدا نەکردووە، لەبەر هەندێ هۆو هۆکار هەر ئەوەندەشم بۆ کراوە. بەڵام هەندێ جار لەکاتی گەڕان و پشکنین و نیش کردندا مرۆڤ هەندێ سەرچاوەی دیکەی دێتە بەردەست، بەدەست خۆی نابێت کە حەز بکات بیانخاتە بەردەست هەموو لایەك. ئەوەبوو چەند ڕۆژێك بەر لە چاپکردنی کتێبەکە بۆ هەندێ پرسی ئەم کتێبەو مێژووی بنەماڵەی بەدرخانیان سەردانی (سینەمخانی جەلادەت بەدرخان)م کرد. هەر زوو ئەلبوومێکی تایبەتی دامێ، کە لەلایەن (پەرلەمانی تورکیا)وە چاپکرابوو، کاتێ ناوونیشانەکەیان بۆ کردمە کوردی ئاوەها دەرچوو: (شاهێدی بێدەنگی بەری (١٥٠) ساڵان)، بەڕاستی ناوونیشانێکی سەرنج ڕاکێش و پڕ بەپێستی خۆی بوو، وێنەو باسی، (٥) یان (٦)، لە دوا

سوڵتانەکانی عوسمانی و خانەوادەو دەست و پێوەندەکانیان تێدابوو. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو وێنەی (مستەفا کەمال ئەتاتورك)ی گورگەبۆری تورکەکانیشی لەخۆ گرتبوو. ئەوەی لەم ئەلبوومەدا بۆ من شایانی لێ وردبوونەوەبوو (١٢) وێنەی تایبەت بەهەندێ لە کەسانی خانەوادەی بەدرخانیان بوو، لەوانە عەلی شامیل و عەبدولڕەزاق بەدرخان ...

تەنانەت وەکو (سینەمخان) بەهاوکاری کچێکی قوتابی خەڵکی باکوور، بەناوی (میدیا)، هەندێ لەپەراوێزی وێنەکانی لەتورکییەوە بۆ کردمە کوردی، وادیاربوو باسی کوشتنی ئەو (ڕەزوان) پاشایەی تێدابوو کە لەسەر ئەم کارە لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمید گەورەو بچووکی بەدرخانییەکان سرگونی (تەرابلووسی ڕۆژئاوا) کران، هەروەها باسی (خالیدە ئەدیب)ی بەناوبانگی تێدا بوو، دیارە عەلی شامیل (زڕ باوك)ی خالیدە بووە، لای من هەبوونی ئەم وێنانە لەم ئەلبوومەدا لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێ هەقە کورد لەمەودوا چاو بەڕابردووی خۆیدا بگێڕێتەوە و زۆر پرسیار لەبارەی خۆیەوە بکات. بەنموونە ئایا زیان و قازانجیان چەند بووە کە بەردەوام لەدەسەلات دڕدۆنگ و دوور بوونە؟ بەرمەکییەکان، ئەگەر کورد بووبن، ئایا کارێکی باشیان کردووە ، کە ببوونە پشت و پەنای عەباسییەکان یان خراپ ؟ باشە دەستەو تاقمی هەر نەتەوەیەك ئەگەر لەدەسەلات نزیك بووبن، ئایا بۆ نەتەوەکەی خۆیان باش بووە یان خراپ؟ ئایا ئەوە کارێکی باشە کە هەندێکمان کلتووری سەلاحەددینی ئەیوبی و عوسمانی و ئێرانی بەهی خۆمان نازانین؟ لەو پرسیارانە زۆرن و وەڵام و لێکدانەوەی تایبەتییان دەوێت...! تەنانەت لەپاڵ ئەم پرسیارانە من لای خۆمەوە زۆر جاران گومان لەئازایەتی خۆمان دەکەم، پێم وایە ئەوە ناکا ئازایەتی کورد هەر ئەشقیا بن و لەپەنا بەرد و کەپکە شاخان ئینجا بوێرن تەقە لە دوژمنانیان بکەن و لەولاوەش خێروبێری وڵاتی خۆیانیان بۆ جێبێڵن. ئەگەر بڕە دەسەڵاتێکیشیان بدەنێ، ئاگایان لەخۆیان و دەوروبەرەکەیان نەمێنێت...!.

دوا بەدوای ئەم وێنانەی سەرەوە چەند وێنەیەکی (شێخ سەعیدی پیران)یشم چنگ کەوتن، کەوا دیارە کاتی خۆی (مالمیسانژ) برادەرێکی خۆی بە ناوی ((سەعید ئایدۆکموش)) لەمزایەدەیەکی ئەورووپا لەتورکانیان کڕیوەتەوە، لەوێنەکاندا دیارە گەرماو گەرم دوای گرتنی ئەو زاتە لەلایەن جەندرمەی تورکانەوە گیراوە.

لەبەرئەوەی بابەتی هەشتەم درێژترین و چڕوپڕترین بابەتی ئەم کتێبەیەو پێویستی بەدانانی کۆمەڵێك وێنەو بەڵگەنامە دەکرد، بۆیە بۆ ئەمیش هەندێك وێنەی دانسقەو دەگمەن بۆ هێماکانمان داناوە، هەرچەندە کاتی خۆی مەلا مستەفای بارزانی چەند جارێك شای ئێرانی لەنزیکەوە بینیوە، بەداخەوە هیچ وێنەیەکم چنگ نەکەوت کە لەگەڵ شای ئێران و پاشاکانی عیراق و سەرۆك وەزیرانی ئەوسا گیرابێ، بۆیە هەر بەوەندە وازدێنم با وێنەکان خۆیان بەبێ دەنگی بدوێن.



وێنەیەك بۆ یادگاری لەچەپەوە:

١) بینباشی سەعید

٢) متەسەڕفی میدلی سەمتە غالب پاشا

٣) عەبدولڕەزاق بەدرخان

٤) قایمقام بەدرخان

٥) قایمقام جەمیل (مێرێ خۆشکاوانە)




عەبدولڕەزاق بەدرخان، برازای عەلی شامیل پاشا، لەگەڵ مرۆیەکی سەر بە ڕەزوان پاشا بووە ناخۆشییان، لەو نێوەدا ڕەزوان پاشا لەنزیك ماڵی عەلی شامیل کوژرا، ئەوەبوو ئەوانەی ڕەزوان پاشایان کوشت تەسلیمی عەلی شامیل کران. عەبدولڕەزاق بەدرخان تەدەخولی کرد و ئەوانەیان بەرەڵلا کرد، لەبەر ئەمە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هەموو خانەوادەی بەدرخانیانی سرگونی (تەرابلوسی ڕۆژئاوا) کرد.



ەتیشی ئەنقەرە ئەمین عالی بەدرخان لەگەڵ کوڕی وی سورەیا لەقوتابخانەی سولتان
گەڵ هەردوو کوڕەکەی دیکەی جەلادەت و کامەران.




**سورەیا بەدرخان قوتابی قوتابخانەی مەکتەبی سولتان**



میقداد میدحەت لەسەیرانگای باخچەی کارتال لەنزیک ئەستەنبۆل

۲ – فەرمیدوون ۳ – عەبدولڕەحمان (ئاگادارین ئەو کەسە خاوەنی ڕۆژنامەی کوردستان نییە – ع. زەنگەنە)

بێ ژمارەکە خوالێخۆشبوو عەلی سالحە، هەردووەکەی دیکە برای ژنی میقداد میدحەتن



دوو لەزارۆکەکانی عەلی شامیل پاشا



دووی زارۆکی دیکە لەزارۆکەکانی عەلی شامیل پاشا.



زاڤایێ عەلی شامیل ناڤی وی یوسفە




حسێن ناوێك زاوای متەسەرفی یوزغادە کەنزیکی ماڵباتی بەدرخانیانە




وێنەیەکی دیکەی عەلی شامل




یەك لەخانەوادەی بەدرخان بەجلی نیشتمانییەوە




ناوو بەرگی یەکەمی ئەلبووم: شاهیدی بێدەنگی بەری ۱۵۰ سالان



بەرگی دووەمی ئەلبووم: وێنەکانی سەرای دۆلمە باخچە



شێخ مەحموود دوای بەخسیرکردنی لە شەڕی دەربەندی بازیان



**دانیشتووان:** (فەیسەڵ – مندالّ)، ئەحمەد عوسمان هەولێری (موتەسەریف)، شێخ مەحموود، شێخ محەمەد غەریب

**راوەستاوان:** شێخ نووری شێخ محەمەدی قازانقایا، شێخ رەشیدی شێخ عەلی سەرکار، ماجد مستەفا، کەریم جاو، رەزا بەگی ئیسماعیل بەگ، فەهمی سەعید



**ڕیزی پێشەوە:** سەید محەمەد جەباری عەبدوڵلا عادیل، حامید بەگی جاف، عیزەت بەگی وەسمان پاشا، شێخ مەحمود، حاجی مەلا سەعیدی کەرکوکی زادە، ئەحمەد موختار جاف، سەید نووری نەقیب



سمکۆی شکاک و هاوەڵاکانی



شێخ سەعید و چەند هەڤالێن خوە پشتی کو هاتن گرتن، د ناڤ مەفرەزەیا زیا بەگ دە. (فرقا ١٢)، جی: دیاریەکر، سال: ١٩٢٥



شێخ سەعید و هەڤالێن خوە پشتی کو هاتن گرتن، لەگەڵ مەفرەزەیا زیا بەگ، جی: نێزی دیاریەکر، ل بەر پرا دجلێ، سال: ١٩٢٥



دەما سەرهلدانا شێخ سەعید، مەحکومێن پێشین ل بەر سێپێیان، جێ: دیاربەکر، سال: ١٩٢٥

ئەو سێ وێنەیەی پێشووی شێخ سەعید و هاوەڵانی سەعید ئایدۆکموش لەمزایەدەیەکی تورکان کڕیویەتەوەو "مالمیسانژ" لەوی خواستۆتەوە.



شێخ سەعیدی پیران لە بەندیخانەدا



حەپسەخانی نەقیب و شێخ قادری هاوسەری، دوو لە چالاکەکانی راپەڕینی بەر دەرکی سەرا سلێمانی



ساتەکانی پێش راپەڕینی بەر دەرکی سەرای سلێمانی



ئیحسان نووری پاشا و یەشار خان، دوو لە خەباتگێرانی شۆڕشی ئارارات

سەرچاوە: کوردستان لە سێبەری مێژوودا، سوزان



مەلا مستەفای بارزان (بەجلی جەنەڕالییەوە)- پێشەوا قازی محەمەد



**دانیشتوان لە ڕاستەوە:** قادر ئەحمەد پاشا، تەتەر مەحموود زێباری، عەلی مەحموود

کاکەخان، مەلا مستەفای بارزان، سالّح بەگی خۆشناو، فەتاح ئاغای هەرکی

**وەستاوان لە ڕاستەوە:** ١- ڕەشاد موفتی، ٤ -مەلا خالید **(باوکی بارزان مەلا خالید)**، ٦- هەمزە حەسەن،

٧- فرۆکەوانێکی کورد، ٨- محەمەد ئەمین میرخان، ٩- عەزیز ئاغای زراری، ١٠- ساکۆ کانی لنج. ١٩٤٤/٤٣



۱۹٤٦/۱/۲۲ ڕۆژی ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان لە مهاباد




هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە مهاباد



دەستەی مامۆستایانی سەردەمی کۆماری کوردستان لە مهاباد



پێشەوا قازی محەمەد و یاوەرانی لەسەردەمی کۆماری کوردستان



پێشەوا قازی محەمەد لە نووسینگەی خۆی لەسەردەمی کۆماردا



پێشەوا لە نێوان هەردوو شاعیر هێمن و هەژار لەسەردەمی کۆماردا



پێشەوا قازی محەمەد ١٩٤٧/٣/٣١



عیزەت عەبدولعەزیز　مستەفا خۆشناو　خەیروڵڵا عەبدولکەریم　محەمەد قودسی

لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧دا لە بەغدا لە سێدارە دران



بەر لە ساڵی ١٣٠٦ی هەتاوی/ ١٩٢٨ی زایینی - مهاباد

لە راستەوە بۆ چەپ: ١- ؟ ٢- مەلا حسامەددین شەفیعی. ٣- قازی شێخ محەممەد موحسن قازی موکری. ٤- مەلا سەدیق سدقی (ئەو مەلایەی لە شەوی خنکاندن تەلقینی قازی محەممەدی دا و وەسیەتی بۆ نووسیوەتەوە) ٥- مەلا عەبدوڵڵای مودەڕیسی.



برایم ئەحمەد - جەلیل هۆشیار / بەندیخانە، کۆتایی چلەکان



لای چەپ بۆ ڕاست: کەمال فوئاد (سکرتێری کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا)، عیسمەت شەریف وانلی (سەرۆکی کۆمەڵە)، ئەوەی هەرە دوایی، لای ڕاست، جەودەت خەزنەدارە
(وێنەکە لە ڕۆژی ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٠ لەکاتی کۆنگرەی شەشەمی یەکێتی قوتابیانی جیهانی لە بەغدا گیراوە)



لەڕاستەوە بۆ چەپ: مارف خەزنەدار، عیسمەت شەریف وانلی، کاوس قەفتان.
(پێش دەرگای سەرەکی ئامۆژگای فێرکردنی زمانی ڕووسی بۆ بێگانان، لەهاوینی ساڵی ١٩٦٠ دا، بەبۆنەی هاتنی عیسمەت شەریف بۆ مەسەلەی خوێندکارانی کورد، گیراوە).



**لەڕاستەوە بۆ چەپ:** مارف خەزنەدار، عیزەددین مستەفا ڕەسول، کەمال مەزهەر، ڕەحیمی قازی، کاوس قەفتان، ؟ بابان.

(ئەم وێنە دەگمەن و دانسقەیە، لەناو باخچەی پێش بەشی ناوخۆی قوتابیان لەڕۆژی یەکشەمووی ١٩٦٠/٦/١ لەمۆسکۆ گیراوە).



بەشدارانی وەفدی خوێندکارانی کورد لەکۆنگرەی قوتابیانی جیهانی، لەساڵی ١٩٦٢ دا، بەشداربووانی وەفدەکە لەڕاستەوە بۆ چەپ بەپێی دانیشتن ئەمانەن:

عیسمەت شەریف، کەمال فوئاد، ئیحسان فوئاد، مارف خەزنەدار. **(وادیارە ئەندامی کۆنگرە کاوس قەفتان دەمی گرتنی وێنەکە لەوێ ئامادە نەبووە).**



ئەم دوو وێنەیە لەهاوینی ساڵی ١٩٦٠ دا کۆمەڵێك لەبەشداربووانی کۆنگرەی خوێندکارانی کورد لەئەورووپای بۆ ئەرشیف کردووین. بەداخەوە لەمارف خەزنەدار **(کەسی دووەمی لای ڕاست)** زیاتر ئەوانی دیکەمان نەناسییەوە.





**کۆمەڵێك لە ئەندامانی کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا.**

**لەڕاستەوە بۆ چەپ: میران فوئاد مەستی، مارف خەزنەدار، سەلاح فەرەج، تەلعەت نادر، ئەمین جەلال بەرزنجی (١٩٣٩ – ١٩٦٨)، کاوس قەفتان.**

**(لەڕۆژی ١٩٦٠/٥/٨ دا لە چەریۆمشیکینیکایا گیراوە).**



**جەلال تاڵەبانی، دووەم کەس لەلای چەپەوە، لە فیستیڤاڵی پێنجەمی لاوان و خوێندکاران لە وارشۆ – ١٩٥٥**



دوو وێنەی فیستیڤاڵی شەشەمی لاوان و خوێندکاران لە مۆسکۆ – ١٩٥٧
لە هەردوو وێنەکەدا لەلای چەپەوە دووەم کەس جەلال تاڵەبانی لە وێنەکەی سەرەوەدا
لەلای راستەوە: قەدری جان، ئۆمەری دزەیی





عەبدولکەریم قاسم – مەلا مستەفای بارزان (٧/١٠/١٩٥٨)



مستەفا بارزانی لە نێوەڕاستی پیاو ماقوڵانی شاری هەولێر لە دوای هاتنەوەی لە یەکێتی سۆڤییەت، ئەوانەی ناسراونەتەوە لەلای راستەوە: جەلیل هۆشیار، عیزەدین فەیزی، موسا سەمەد، گیوی موکریانی / ١٩٥٨



له چەپەوە (**ڕیزی پێشەوە**): مەلا مستەفای بارزان، جەمال عەبدولناسر، نووری ئەحمەد تەها، ساڵح میران، ؟

له ڕاستەوە (**ڕیزی دواوە**): ئەسعەد خۆشەوی، سادق بابۆ بارزانی، برایم ئەحمەد، میرحاج ئەحمەد



**له ڕاستەوە بۆ چەپ**: عەبدوڵڵا ئەلحەدیسی، فەوزی جەمیل سائیب، (**لە پشت ئەوانەوە وێنەگر عەبوش**)، باباعەلی شێخ مەحمودی حەفید (**وەزیری ئەشغال**)، بارزانی مستەفا، خالید ئەلنەقشبەندی (**ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی**)، له سەیرانێکی ناوچەی عەزیزیەی پارێزگا (**لیوا**)ی کوت، له کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٥٨دا.

(**دیاریی**: موئەیەد عەبدولغەفار ئەلنەقشبەندی، ژمارە (٢٠)ی گۆڤاری (**دهۆک**)ی حوزەیرانی ٢٠٠٣).



Mustafa Barzani (second from right) on a visit to the pyramids, Egypt, 1958.

مەلا مستەفای بارزان و یاوەرانی لەکاتی سەردانی ئەهرامەکانی میسر/ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨



لیوا روکن عەبدولکەریم قاسم و مسعود بارزانی
(لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا)



شێخ ئەحمەدی بارزانی و مەلا مستەفا بارزانی
بەغدا - کانوونی یەکەمی ١٩٥٨



Mustafa Barzani after his return to Iraq from the Soviet Union, his son Idrees is seated to his right, 1958.

بارزانی لەدوای گەڕانەوەی لە یەکێتی سۆڤییەت/ مێرد منداڵەکەی لای چەپ ئیدریس بارزانییە، ئەوەی لای راستیش: شێخ خالد بارزانی



Mustafa Barzani (centre) on a visit to an establishment in the Soviet Union/1960

بارزانی لەکاتی سەردانی یەکێك لە دامەزراوەکانی یەکێتی سۆڤییەت لە ساڵی ۱۹٦۰دا



مەلا مستەفای بارزان لە سەردەمی دانوستانی ١٩٦٤ لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی عیراق تاهیر یەحیادا



لە راستەوە:

باباعەلی شێخ مەحموود، مەلا مستەفای بارزان، فوئاد عارف، تاهیر یەحیا ١٩٦٤



**له ڕاستەوە:** تاهیر یەحیا، مەلا مستەفای بارزان، ئەوەی لە پشتییەوە وەستاوە نوری شاوی پاشان موحسین دزەیی



مەلا مستەفای بارزان — تاهیر یەحیا لە (ناوەڕاست)، لەلای ڕاستەوە: عەبدولکەریم فەرحان **(وەزیری کشتوکاڵ)**، لای چەپەوە: وەزیرێك



له راسته‌وه: ١–٣ (نه‌ناسراون)، ٤– مه‌لا مسته‌فای بارزان. ٥– تاهیر یه‌حیا. ٦– عه‌لی حه‌یده‌ر سلێمان
٧– جه‌لال تاڵه‌بانی. (دیاریی: فه‌خری سیلاح شۆر)



له‌لای چه‌پی مه‌لا مسته‌فای بارزانییه‌وه: تاهیر یه‌حیا، سه‌رهه‌نگ روکن: ئیبراهیم فه‌یسه‌ڵ ئه‌نساری، سه‌رهه‌نگ: عه‌زیز چه‌له‌بی

له‌لای راستییه‌وه: عه‌بدولره‌زاق سه‌ید مه‌حموود (مته‌سه‌ریفی سلێمانی) – خه‌له‌کان، ١٩٦٤



عەزیز شەریف – مەلا مستەفای بارزان



مەلای مستەفای بارزان و کامیل چادرچی، ئەوەی جل سپیەکە هەمزە عەبدوڵلایە



جەلال تاڵەبانی سەرۆکی وەفدی کوردی لەگەڵ سەیدا ساڵح یوسفی بۆ دانوستان لەگەڵ

حکوومەت بەرەو بەغدا دەچن





له راسته‌وه: ؟ ئه‌حمه‌د حه‌مه‌ده‌مین دزه‌یی، جه‌لال تاڵه‌بانی، عه‌لی عه‌سکه‌ری، ئیبراهیم ئه‌حمه‌د، کاکه زیادی کۆیه، عومه‌ر ده‌بابه/ نیسانی ١٩٦٤



له راسته‌وه بۆ چه‌پ: ساڵح یوسفی، جه‌لال تاڵه‌بانی، عه‌گید سدیق، شاخه‌وان نامیق (شوان). رانیه شوباتی ١٩٦٤.

(دیاریی: د. عه‌بدولفه‌تاح بۆتانی، ژماره (٢٠)ی گۆڤاری (دهۆك)ی رێکه‌وتی حوزه‌یرانی ٢٠٠٣).




**ڕۆڵەکانی دوارۆژ لە یەکێك لە قوتابخانەکانی سەردەمی شۆڕشی ئەیلولدا**



**لە ڕاستەوە بۆ چەپ: سەرهەنگ سالم (فەرماندەی مەوقعی سلێمانی)، مەلا مەعصوم خدر (باوکی دکتۆر فوئاد)، مەلا مستەفای بارزان، پەیامنێری گۆڤاری (روزالیوسف)ی میسری جلال الکشك، مەسعود بارزانی، لوقمان بارزانی، شوباتی ١٩٦٤ ڕانیە.**

**(دیاریی: میقداد هورەیی، ژمارە ٢٠ی گۆڤاری (دهۆك)ی حوزەیرانی ٢٠٠٣).**



Mustafa Barzani with Kurdish warriors in Rania. His son Masoud Barzani is standing to his right, 1964.

بارزانی مستەفا لەگەڵ پێشمەرگەکان لە شاری رانیە/ لەگەڵ مەسعود بارزانی لەلای راست. ساڵی ١٩٦٤ رانیە.



Mustafa Barzani (foreground), with the Kudish Representative in Europe, Kurdistan, 1964.

بارزانی مستەفا لەگەڵ عیسمەت شەریف وانلی، نوێنەری شۆڕشی کورد لە ئەوروپا، ساڵی ١٩٦٤





یاری شەترەنج لەگەڵ ڕۆژنامەنووسی ئەڵەمانی (دیشنەر)

ڕاوەستاوان: ئەسعەد خۆشەوی و ئیدریس بارزانی



مەلا مستەفای بارزان و سەرۆك كۆماری عێراق عەبدولڕەحمان عارف / ١٩٦٦



مەلا مستەفای بارزان و عەبدولڕەحمان عارف - بەرزێوە / ١٩٦٦



بارزانی مستەفا لەکاتی گفتوگۆیەکی رۆژنامەوانی لەگەڵ پەیامنێری

ئاژانسی دەنگرباسی عیراقی لە ساڵی ١٩٦٦دا

Mustafa Barzani in an interview with an Iraqi journalist, Kurdistan, 1966.



Mustafa Barzani with the Iraqi Defence Minister, Kurdistan, 1966.

مەلا مستەفای بارزان و لیوا روکن شاکر

مەحموود، وەزیری بەرگری پێشووی

عێراق. ساڵی ١٩٦٦



1970. March, 10. Mulla Mustafa Barzani and Saddam Hussain just before the signature of the II of March Agreement.

۱۹۷۰-مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حوسێن پێش مۆرکردنی ڕێکەوتنی ۱۱ ئادار



دیاریی: د. جمشید حەیدەری






**مەلا مستەفای بارزان – کەمال جان پۆلاد**



**مەلا مستەفای بارزانی و**

**پریماکۆف**



بارزانی و پیاوی ئایینی

مەسیحی قەشە یوسف

پەری لە ۱۹٦۷دا

Mustafa Barzani with
a Christian priest,
Kurdistan, 1967.



1979. March, 5 . Burial of Mulla Mustafa Barzani in Shino, Iran.

١٩٧٩- ڕێ و ڕەسمی ناشتنی مەلا مستەفا لە شنۆ





A group of members of the Kurdish students society in their National dress hand in hand for unity.

بنۆڕە پەراوێزی ژمارە (٢٥٠)ی لاپەڕە (٥٠١)ی ئەم کتێبە







**بە کامێرای کریس کۆچێرا**

د. کەمال مەزهەر، لەگەڵ هەر پۆستەیەکی بەشەکانی ئەم کتێبەدا، هەر جارەو کۆمەڵێك بەڵگەنامەی بۆ ناردووین، لەسەر هەموو لاپەڕەکانی ژمارە و کۆدی بەڵگەنامەکانی بە دەستی خۆی نووسیبون، تەنانەت هەندێکیان روون کردنەوەی، بە زمانی کوردی، لەسەر داناون و بەتەلێك لە بەڵگەنامەکەی بەستاون، بەداخەوە یەك لە هەڵەکانی من لە ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا ئەوەبووە، هەموو بەڵگەنامەکانم، لەگەڵ دەقی ناوەڕۆکی بەشەکانی کتێبەکە بۆ لەبەر گرتنەوە ناردە سلێمانی، دیارە ئەو کەسەی بەڵگەنامەکانی سکان کردووە، لەکاتی لەبەر گرتنەوەدا، بەبێ مەبەست، هەمووی تێکەڵ و پێکەڵ کردوون، ئەوەبوو کە هاتینە سەر نەخشەسازی کتێبەکە هەر پەڕەو بەڵگەنامەیەکمان لەلایەك دەدۆزییەوە، لەکاتی ماوەی دوو مانگێك خەریك بووین تا ئەوەندەمان لێ هەڵێنجاون، ئەوەش دوای ئەوەی هەموو بەڵگەنامەکانمان رێکخستەوەو دووبارە سکانمان کردۆتەوە، لەوانەیە بەقەد ئەو ژمارەیەشمان لەلا ماوەو دیارە هەندێك لە بەڵگەنامەکانیش دیار نەماون، بەنموونە شتێکی نۆبێل، شتێکی عەزمی بەگی بابان، شتێکی حەپسەخانی نەقیب... هتد. دیارە د. کەمال لە کاتێکدا ئەوانەی هەموو بۆ نووسیووم، ئەوەتا دوای ماندووبوونێکی زۆر ئێمە هەر ئەوەندەمان بۆ رێکخراوەتەوە، پێمان وایە کتێبەکەش وەکو خۆی هەر ئەوەندە لە بەڵگەنامە ئۆریژناڵەکان هەڵدەگرێ، ئومێدەوارین د. کەمال دانەی دیکەی لە ونبووەکانی لەلا مابێ، هەر تۆژەر یان نووسەرێك بیەوێت کار لەسەر ئەم بەڵگەنامانەدا بکات، ئەوا بەدڵفراوانییەوە لە خزمەتی دادەبین و تەنانەت بەڵگەنامەکانی دیکەشیان دەخەینە بەردەست.

ع. زەنگەنە

## پاشکۆی ژماره (۱)

نامەکەی شێخ مەحموود دوای دامرکاندنەوەی شەڕی بەردەرکی سەرا، بڕوانە:ل (۱۹۸)

( C o p y. ) 25

17-9-20. To: His Excellency the High Commissioner for 'Iraq.

After Compliments,

No doubt Your Excellency well knows the present state of administrative affairs in Kurdistan and especially the outrages which have taken place in Kurdistan. The atrocities that were perpetrated by the Arabs in Suleimani have had no precedent in Kurdistan, and after such state it must be evident to Your Excellency how quite impossible it has become for the Kurds and the Arabs to live together. The Kurds always and without conditions are obedient to the British Government now and in the future. The Kurds, as in duty bound, have never been lacking or late in showing their friendship for and obedience to the British in the past nor will they do so in the future. But with great regret this friendship and obedience has hitherto only brought trouble on the Kurds and given advantage to the Arabs.

According to the letters and messages of condolence I have received, I understand that the hopes of our neighbour Kurds have changed into despair, while from all sides of this Kurdistan I receive incessant information that the Kurds are bereft of patience after this outrageous use of arms against our Kurds by the Arabs.

In the name of this Aryan nation, the Kurds as a whole request that you will liberate and separate them from the Arabs. They strongly and definitely ask that they may only remain under the protection of the British.

(Signed) M a h m o u d.

## پاشکۆی ژمارە (٣)

نامەیەکی نهێنی بایەخداری باڵوێزی بەریتانی لەمۆسکۆ دوای کودیتاکەی هەشتی شوباتی ١٩٦٣ بە سیانزە ڕۆژ کە لەبابەتی هەشتەمدا ئاماژەی بۆ کراوە، شایانی باسە ڕۆژئاواییەکان هێشتا لەسروشتی کودیتاکە تێنەگەیشتبوون. بنۆڕە: ل(٣٧٦).

ئەم بەڵگەنامەیە لەفایلی ژمارە (١٧٠٤٣٣/٣٧١)ی وەزارەتی هەندەرانی بەریتانیادا هەڵگیراوە.



PERSONAL AND CONFIDENTIAL



British Embassy,

MOSCOW.

February 21, 1963.

Dear George

Thank you very much for your letter of February 14, which I was very pleased to get. I am naturally following the news from Iraq as closely as I can from the newspapers and I hope that you will copy anything of interest from Baghdad to me which I would not see in the normal course of events. The Iraqi Ambassador here is very pleased and neither he nor the U.A.R. Ambassador show the slightest concern about the number of communists, etc., who have been shot. But neither the Iranian nor the Syrian Ambassador like it very much. They are clearly afraid of the longer-term effects on Iraq and the surrounding countries. I hope that the present régime will soon settle down and stabilise things. I know none of the soldiers excepting Naji Talib, but the civilians are all reasonably sensible people and it is encouraging to see that Wattari is now Minister of Oil. I am not surprised to see that Mahdawi and Mohamed Amin, Taha Sheikh Ahmed and Jalal Augati were guilty, but I was surprised that they had it in for Abdul Majid Jalal, the head of Security. My impression was that he was from time to time involved in plots against Qasim and the Security was sufficiently friendly to us to tip us off every now and again when there was something on foot against us. I only hope that Tariq al Qadi is all right. This particular plot looks, from the scanty information I have, as if it were one which was beginning in my time. I remember particularly our information about Taher Yahia and the suggestion that they had the Habbaniya Air Squadron with them.

2. You probably know that two of Qasim's men got away. I gather that he told Hashim Abdul Jabbar to get out of the country, that Vienna was too hot for him owing to the opposition of the Iraqi students and that he is now in Sofia. Khadhim, the old Iraqi Military Attaché in Moscow, also got away and is now in London.

3. The attack on the Iraqi Government's action against communists is now in the form of a direct attack by the Party here, but I hear that the Soviet Ambassador in Baghdad has pointed out that it is a Party and not a

/governmental

G.F. Hiller, Esq., C.M.G., O.B.E.,
Foreign Office,
London. S.W.1.

PERSONAL AND CONFIDENTIAL





governmental attack. So I presume the Soviet Government are still prepared to get on as best they can with the Iraqi Government and keep on their technical aid, etc. This is what I should expect. But of course I have no detailed information on this.

4. I may add that Adzhubei, the Chief Editor of Izvestiya and Khrushchev's son-in-law, asked me, half jocularly, what part we had in the new Iraqi revolution. So I naturally replied that I was personally responsible for it, as I had been for all recent revolutions in Iraq including that of 1958.

Yours ever.

Humphrey Trevelyan.

## پاشکۆی ژمارە (٤)

هەردووک یاداشتەکەی لیژنەی باڵای (حركة الدفاع عن الشعب العراقي) بەئیمزای جەواهیری دژی تاوانەکانی ڕژێمی بەعس و لەدووەمیاندا بەتایبەتی ئاماژەی کردووە بۆ ڕەفتارە نامرۆڤانەکانی ئەو ڕژێمە لەکوردستان، بارەگای لیژنەکەش لە ڤیەننای پایتەختی نەمسا بووە. بنۆڕە: ل(؟)

HIGH COMMITTEE
The Movement of Defending Iraqi People • حركة الدفاع عن الشعب العراقي

Postamt Wien 64 : Postfach 220
WIEN — AUSTRIA

---

Your Excellency,

Following the Coup d'etat of 8th February in Iraq and the seizure of power by force and violence Iraqi citizens, inside the country and abroad, have been subject to a form of oppression hardly matched in history. The present government has tortured to death citizens inside Iraq, persecuted those abroad regardless of their political beliefs, withdrawn the passports of some of them, halted the stipends of students and prevented their people back home from sending them means of support etc.

The High Committee for the Defence of the Iraqi People appeals to you to extend a helping hand to the victimized Iraqi students studying in your country or to those Iraqi citizens who have found refuge and protection under your laws, by permitting them to continue their studies or medical treatments, etc. We appeal to you to give them every possible help until this black cloud hanging over the Iraqi people will be dispersed. The Iraqi people will never forget this kindness.

Please accept the Committee's thanks and deepest respect.

High Committee
THE MOVEMENT OF DEFENDING IRAQI PEOPLE

CHAIRMAN
Mohamed Mahdi Al Jawahiri



HIGH COMMITTEE
Movement of Defending Iraqi People • حركة الدفاع عن الشعب العراقي
اللجنة العليا

Postamt Wien 64 : Postfach 220
WIEN — AUSTRIA

---

Your Excellency,

The coup d'etat of 8th February in Iraq revealed its non-democratic and illegal methods from the very first day. It seized power by sword and fire, vainly trying to impose its will on the people by terror, torture and murder. The number of those who have lost their lives under torture and in prison has reached an unbelievable figure.

The tyranical despotic junta which seized power in Iraq, with every passing day, discloses new methods of oppression and cruelty. The Iraqi people have begun to rally their forces to defend their freedoms and their lives, since no one in the world can remain silent in the face of such violence and brutality. But the more intensive becomes the struggle of the Iraqi people, the more ferocious and barbaric is the response of those in power.

The Iraqi people, in general, are outraged and are struggling against this regime. Recently, war has been declared against the Kurdish people in Iraqi Kurdistan in order to impose on them conditions which contravene the legitimate demands of the sector of the Iraqi people. The rulers of Iraq are not even ashamed to officially announce that they would annihilate every Kurdish village that fired a shot, that is,

